# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی بیست و چوارەم

سوورەتەکانی

(ص) و (الزمر) و (غافر)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# صٓ و الزُّمَر و غافِر

نووسینی : عەلی باپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز
٨٤٠ لاپەڕە
١٧* ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَـنْ يَهْدِه اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاَّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فَإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ اللَّـهِ، وَخَيْرَ الهَـدِيِ هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُـلُّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دوایـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ: خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبــەر ﷺ هــاوەڵانی بەڕێـزی فێــردەکرد، پێــش هـــەر قسـەیەکی گرنـگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازیکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتـارە، هـەرکام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـە: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطَبـراني: (٢٤١٤) هێنـاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیـش - کـە وەك باسـکردنی چاکـەی خـوا (التحدّث بنعمـة اللّـه) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم کردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاکـەی لەگـەڵ کـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کردوومـو، بـەر لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵیی یـەوە هیدایـەتی داوم، کـە قورئـانی بەڕێـزو پێـز لەبـەر بکـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان و تێوەڕامـانی ئایەتـە پڕ بەرەکەتـەکانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هــەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـب و نامیلکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، کـە دیـارە هــەر ئەمـەش شـتێکی سروشـتییە؛ ئاخـر ئایـا ئیسـلام بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبـەر ﷺ، کـە ئەویـش هــەر ڕوونکردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێکـردن و کارپێکردنیـەتی، شـتێکی دیکەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجا لەمێـژ سـاڵیش بـوو، کـە بـراو خوشـکانێکی دڵسـۆزی نزیـك و ناشـنام، داوایـان لێدەکـردم کـە دەسـت بکـەم بـە دانـانی تەفسـیرو لێکدانەوەیـەکی قورئـان، هــەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمــەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو کارە گـەورەو گرنگـە بکـەم، بەڵکـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هــەرساڵە هــەندێکی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشـدا، هــەتا دەرفەتێـکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتوانـم خێرایـی تێـدا بکـەم و خۆمـی بـۆ یەکلایـی (متفـرّغ) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگـەر تەمـەن بەبەریـــەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێکدانەوەیەشـــم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسـیــرانەی کـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خــودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هــەندێکی هــەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّـر بَعْضُهُ بَعْضَـاً)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونکە پێغـەمبـەری خـــواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئـــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە موسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردار بوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوونەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیم، یان خوێنــەر پێویسـتی پێی نیـە، لە کاتێکدا دەیــەوێ لە قورئان تێبگات و، بزانێ خوا (تبارك وتعالـی) ڕاستەوخۆ چی پێ فـەرمووە؟!

ئنجا هــەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح ســووك و گورج و گۆڵ و دڵسـۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سـەر کاغـەزو، پاشان تایپکردن و دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سـەرجـەم ئەم زنجیـرە دەرسە، کە لە ئەسـڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هـەروەها هەڵسا بە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سـەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیـرەوە کێشـاوە، خـوا بە باشـترین شـێوە پاداشتی بداتەوەو، هـەر صالح و ساغ و سەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنج و لاوانـە لە کوڕان و کچـان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات .

شـایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیـرەماندا، باسی بەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکە هــەر ســوورەتێك بۆخـۆی شـتێکی سـەربەخۆیـەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سـەرجەم قورئـان بۆ سـی (٣٠) بەش (جـزء) و شەسـت (٦٠) (حـزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێنـدنی قورئـان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگـەکانی ئەم تەفسـیرەشـدا، دیسان حیسـاب بۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بە گوێرەی سـوورەتەکان، بەرگـەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئەو بـرا دڵسـۆزە ئێسـتاش پاش تەواوکردنی زۆربەی قورئان، لێبڕاوانە بەردەوامە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنـان بەردەوام بێ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسـیرە سـەرگەرمی کارەکەی بێ .

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

**ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکاریم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرجەم دەرسەکانە.**

سُبۡحَانَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلَامٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ، وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَالَمِينَ .

**دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢**

**٢٠١١/٦/٢٧**

**هەولێر**

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحمدللـه رب العالمیـن وصلـوات اللـه وسـلامه وبركاتـه علـى محمـد وآلـه أجمعين، مـن الصحـب والأزواج والقرابتـه والتابعيـن لهـم بإحسـان إلـى يـوم الدين.

بەڕێـــــزان!

ستایشـی شایسـتە بـۆ خـوای بەخشـەر کـە یارمەتـی دایـن ئـەم بەرگـی بیسـت و چوارەمـەش بخەینـە بەردەسـتی ئێـوەی خۆشەویسـت.

**ئەم بەرگەش هەرکام لە سوورەتەکانی:**

(ص و الزمـر و غافـر) ی گرتوونـە خـۆی کەبەشـێکی جوزئـی (٢٣) و بەشـی زۆری جوزئـی (٢٤) پێـك دێنـن.

لـەم بەرگەشـدا وێـڕای تەفسـیری ئایەتەکانـی هەرسـێك سـوورەتەکە بەپێـی نەخشـەی خۆمـان و بـە حـەوت قۆنـاغ، چەنـد کورتـە باسـێکی گرنگیـش لەبـەر تیشـکی هەندێـک لـە ئایەتەکانـدا خراونـەڕوو، بـەم شـێوەیە:

**یەکەم: لە سوورەتی (ص)دا:**

١- سەرنجێکی گرنگی لە بەسەرهاتەکەی داوود.

٢- دە (١٠) هەڵوەستە لەبەرانبەر بەسەرهاتەکەی داوود دا.

٣- چەند سەرنجێك لەبارەی ئەو تاقیکردنەوەی سولەیمانەوە.

٤- پرسیارێك و وەڵامەکەی لەبارەی داوایەکی سولەیمانەوە.

٥- یازدە هەڵوەستە لەبەرانبەر بەسەرهاتی یەیوب دا.

دووەم : لە سوڕەتی (الزمر) دا:

١- کورتە باسێك لەبارەی جەستەی مرۆڤەوە.

٢- قوڵە باسێك لەبارەی ترس و ئومێدەوە.

٣- کورتە باسێك لە بارەی زانیاریی و زانایان و پایە و پێگەیانەوە.

٤- نۆ ڕاستیی گەورە و گرنگ لە ئایەتەکانی لە ئایەتەکانی (١٧ و ١٨)ی (الزمر)دا.

٥- کورتە باسێك لەبارەی دە (١٠) لە سیفەتەکانی قوڕئان و خوێنەرانیەوە.

٦- کورتە باسێك لە بارەی نووستن و وەرگرتنی.

٧- کورتە باسێك لەبارەی ئایەتی (٥٣) وە کە ئومێد بەخشترین ئایەتە.

٨- چەد سەرنجێك لەبارەی لە چەنگ گرتنی خواوە بۆ زەوی و پێچەوانەوەی ئاسمانەکان بەڕاستی.

٩- چوار فەرمووده لە بارەی بەهەشت و بەهەشتییەکانەوە.

سێیەم: لە سووڕەتی (غافر) دا:

١- کورتە باسێك : نۆ لە هۆیەکانی لێخۆشبوونی خوا لە مرۆڤ.

٢- کورتە باسێك لە بارەی عەرشەوە.

٣- سەرنجدان لە چەند شوێنەوارێکی گەلە پێشکەوتوەکان.

٤- پرسیارێك و وەڵامەکەی دەربارەی دروستکرانی کۆشکێکی بەرز بۆ فیرعەون.

٥- کورتە باسێك : لێزانیی و حیکمەتی پیاوە بڕوادارە بەرگرییکارەکەی لە مووسا.

٦- کورتە باسێك دەربارەی سەرخستنی خوا بۆ پێغەمبەر و بڕواداران.

٧- قسەیەکی کورت لە بارەی فەلسەفە و بوونناسییەوە.

کەواتـە بیسـت و یـەك (٢١) کورتـە باسـمان لـەم بەرگـەدا هێنـاون و، هیواداریشـم ئـەم بەرگـەش لەلایـەن عەودالانـی قـووڵ تێکەیشـتنی فەرمایشـتی کۆتایـی خـوا و دوا نوسـخەی هیدایەتـی شیفابەخشـی وەك شایسـتەیەتی بخوێنرێتـەوە و باشـترین بەهـرەی لێوەربگیـرێ.

٢٣ / ٢ / ١٤٤٢ ك

٣٠ / ٩ / ٢٠٢١ ز

هـــەولێر

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٧)ی موحەڕڕەمـی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٩/١٦) زایینـی، خـوا پشـتیوان بێـت دەسـتدەکەین بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (ص).

## پێناسەی سووڕەتی (ص) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە نـاوی (سُورةُ صَاد)ە، بـە یەکەمیـن پیتـی سـەرەتای سـووڕەتەکەوە ناونـراوە، کـە بریتیـە لـە پیتـی (ص)، سـێ سـووڕەت هـەن، کـە سـەرەتایەکەیان بـە یـەک پیـت دەسـت پێـدەکات، ئەوەیـان یەکێکـە لـەو سـێ سـووڕەتە، دوایـی سـووڕەتی (ق) دێ، دواییـش سـووڕەتی (ن)، واتـە: بـە یەکەمیـن پیتـی سـەرەتاوە ناونـراون، هەروەهـا سـووڕەتەکانی: (طـس)و (یـس)و (طـە) (حم)ەکانیـش بـە دوو پیتەکانـی سـەرەتایان ناونـراون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان ئـەم سـووڕەتە مەککەییە، وەک (السـیوطي)، لـە کتێبەکەی خـۆی (الإتقَـان فِي علـومِ القُـرآن)دا، هێناویەتـی و زانایانـی دیکەش باسـیان کردوە.

### سێیەم: ڕیزبەندیی:

ئـەم سـووڕەتە لـە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (تَرتیـب النُّـزول)دا، ژمـارە: (٣٨)ەو، لـە موصحەفیشـدا هـەر ژمـارە (٣٨)ە، ئـەم سـووڕەتە لـە پێـش سـووڕەتی: (الأعـراف)و دوای سـووڕەتی: (القمـر) دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بۆ ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە، زانایان چەند ڕایەکیان دەربڕیون:

هەندێکیــان گوتوویانــە: (٨٥) ئایەتــن و، هەندێکیــان گوتوویانــە: (٨٦)ن و، هەندێکیــان گوتوویانــە: (٨٨)ن، بــەڵام زیاتــر ڕای ســێیەم تەبەننیــی کــراوە، کــە ســەرژمێری زانایانــی کووفەیــە، پێشــتریش گوتوومانــە: ڕاجیایی لــە ژمــارەی ئایەتەکاندا، دەگەڕێتــەوە ســەر کورتیــی و درێژیــی ڕســتەکان، بــە پێــی ڕاجیایــی زانایــان.

## پێنجەم: نیوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

لــە ڕووی نیوەڕۆکــەوە ئــەم ســووڕەتەش هەمــان نیوەڕۆکی ســووڕەتە مەککەییەکانی دیکــەی هەیــەو، لــە زۆر ڕووەوە دەشــوبهێتە ســووڕەتی (**الصافــات**)ەوەو، پانتاییەکــی باشــی ئــەم ســووڕەتی (صــاد)ەش، بــۆ گێڕانــەوەی بەســەرهات و ئامــاژە پێکــردن و ناوهێنانــی نــۆ (٩) لــە پێغەمبــەران، تەرخانکــراوە، کــە بریتیــن لــە: (داوود، ســولەیمان، ئەیــووب، ئیبراهیــم، ئیســحاق، یەعقووب، ئیســماعیل، ئەلیەســەع، **ذو الكيفــل**)، ئەوانەی ســووڕەتی (**الصافات**)یــش بریتــی بــوون لــە: (نــووح، ئیبراهیــم، ئیســماعیل، ئیســحاق، مووســا، هــاڕوون، ئیلیــاس، لــووط، یونــووس)، ئەوانیــش بریتــی بــوون لــە نــۆ (٩)، بــەڵام لــەم ســووڕەتەدا، خاڵــی جەخــت لەســەر کرانــەوە بابەتــی وەحیــی و پێغەمبەرایەتییــە، هەرچەنــدە باســی خــوا بــە یەکگرتــن و، ڕۆژی دوایــی و ســزاو پاداشــتیش هــەر هەیــە، وێــڕای ئامــاژەدان بــە بەســەرهاتی ئــادەم ﷺ و ئیبلیــس.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

١- بەسەرهاتی دادوەریی کردنی داوود ﷺ لە نێوان دوو برای ناکۆک (**خصم**)دا، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، لە شەش ئایەتەکانی: (٢١ - ٢٦)دا.

٢- هەروەها بەسەرهاتی ڕانوێنرانی ئەسپە ڕەسەنەکان، لەسەر سولەیمان ﵇ و، تاقیکرانەوەی سولەیمان بە فڕێدانی جەستەیەک بۆ سەر کورسییەکەیشی، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، یازدە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٤٠).

٣- بەسەرهاتی ئەییووب ﵇ لەم سووڕەتەدا، چوار ئایەتی بۆ تەرخانکراوە، ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٤)، کە ئەم بەسەرهاتە تەنیا لێرەو لە سووڕەتی (الأنبياء)دا هاتوە، بەڵام لەوێ تەنیا دوو ئایەتی بۆ تەرخانکراون: (٨٣ و ٨٤).

٤- تەعبیری: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ ٧٥﴾، واتە: چی ڕێگرت بوو کە کڕنووش بەری بۆ شتێک کە من بە دوو دەستی خۆم هێناومەتە دی؟! تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٥- تەعبیری: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٨٧ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ٨٨﴾، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوەو ئیعجازێکی مەزنی مێژوویی تێدایە، کە دوایی باسی دەکەین.

٦- چەند تەعبیرو وشەیەک تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، من یازدە (١١) تەعبیرو وشەم هێناون، کە تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون:

١- ﴿وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ﴾، ٢- ﴿فَوَاقٖ﴾، ٣- ﴿قِطَّنَا﴾، ٤- ﴿وَٱلۡإِشۡرَاقِ﴾، ٥- ﴿تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ﴾، ٦- ﴿نَعۡجَةٞ﴾، ٧- ﴿ٱلۡخُلَطَآءِ﴾، ٨- ﴿ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ﴾، ٩- ﴿ضِغۡثٗا﴾، ١٠- ﴿مَرۡحَبَۢا﴾، ١١- ﴿ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ﴾.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ چەند دەرسێك:

دەرسی یەکەم: لە ئایەتەکانی: (١ - ١٦) پێک دێ، واتە: شازدە (١٦) ئایەتی سەرەتای ئەم سووڕەتە دەگرێتە خۆی، ئەو (١٦) ئایەتەش وەک پێشەکیی وان بۆ ئایەتەکانی دیکە، هەرچەندە تەوەری سەرەکییان باسی قورئان و پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە ﷺ، بەڵام خوا بە یەکگرتن و چارەنووسی گەلانی بێبڕوایانی پێشوو و، ڕۆژی دوایش ئاماژەیان پێکراوە.

دەرسی دووەم: لە ئایەتەکانی: (١٧ - ٢٩) پێک دێ، واتە: سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی و، هەمووی تەرخانکراوە بۆ باسی داوود ﷺ کە پێغەمبەرێکی حوکمڕان بووەو، نیعمەتەکانی خوا لەسەری و ڕووداوێکی سەرسووڕهێنەری، کە بریتی بووە لە پەلەکردنی لە دادوەرییەکدا کە هاتۆتە پێشی و، تێیدا نەپێکاوە، ئنجا بە هۆیەوە تووشی گلەیی لێکران بووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ لای خواو پەشێمان بۆتەوە.

دەرسی سێیەم: لە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٤٠) پێک دێ، واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی (سولەیمان)و نیعمەتەکانی خوا لەسەری و، تاقیکرانەوەی سولەیمان و لێ دەرچوونی و، گەڕانەوەی بۆ لای خوا سبحانه وتعالى.

دەرسی چوارەم: لە ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٨) پێک دێ، واتە: هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە باسی ئەییووب ﷺ کراوە، لە چوار ئایەت داو، چوار ئایەتەکەی دیکەش، ئاماژەیەک بە بەشێک لە سیفەتەکانی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب کراوەو، ناوی هەر کام لە: ئیسماعیل ئەلیەسەع و ذە لکیفل، هێنراوەو ستایش کراون.

دەرسی پێنجەم: لە ئایەتەکانی: (٤٩ - ٦٤) پێک دێ، واتە: شازدە (١٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی سەرەنجامی هەر کام لە پارێزکاران و یاخییان و لادەران کراوە، کە پارێزکاران لە بەهەشتی خوادان و، نوقمی نازو نیعمەتەکانی خوا دەبن، بە پێچەوانەوەش: یاخییەکان لە دۆزەخدا دەبن و دووچاری مەینەتیی و سزاو ئازارێکی زۆرو بێ ڕەزا دەبن.

دەرسی شەشەم و کۆتایی: کە لە بیست چوار (٢٤) ئایەت پێک دێ، کە ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی (ص)ن، ئایەتەکانی (٦٥ - ٨٨)، تێیاندا باسی بەسەرهاتی ئادەم ﷺ و ئیبلیس کراوە و، زۆربەی ئایەتەکان بۆ ئەو بەسەرهاتە تەرخانکراون.

لـە کۆتاییـش دا خـوا ﷻ چەنـد ڕێنماییەکـی زۆر گـەورەو گرنـگ بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ ڕادەگەیەنـێ، دیـارە پێغەمبەریـش سـەر مەشـقی هەمـوو ئۆممەتەکـەی و تێکـڕای ئیماندارانـەو، ئـەو ڕێنماییانـە بـۆ هەمـوو لایـەک زۆر پێویسـتن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـازدە (١٦) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی (١ - ١٦)، کـە تێیانـدا باسـی قورئانـی بیرخـەرەوەو خـاوەن ڕێـزو حورمـەت کـراوەو، هەڵوێسـتی نەرێنییانـەی بێبڕوایـان لـە بەرانبەریـدا، خراوەتـەڕوو.

هەروەهـا باسـی یەکدی هانـدانی کافرەکان بۆ بەرهەڵسـتیی کردنـی خوابەیەکگرتن و، سـوور بـوون لەسـەر بتپەرسـتیی و، تانـەدان لـە پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺو، تۆمەتبارکردنـی بـە درۆو جـادوو کـراوەو، بەرپەرچـی ددان شکێنیشـیان دراوەتـەوەو بـاسی سـزای توندیشـیان کـراوە.

لـە کۆتاییشـدا ئامـاژە بـە گـەلانی پێشـووی بێبـڕواو چارەنـووسی شـوومیان کـراوەو، هەڕەشـە لـە بێبڕوایانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺو ڕۆژگارەکانـی دیکـەش کـراوە، کـە هەمـان چارەنـووس یەخەیـان دەگـرێ، ئەگـەر بێـت و هەمـان هەڵـەی گەلانـی پێشـوو دووبـارە بکەنـەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ۝٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن
قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ۝٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ
هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ
مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ۝٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ
ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ۝٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ
بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ۝٨ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ۝٩ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ ١٠ جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ
مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ١١ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ١٢ وَثَمُودُ وَقَوۡمُ
لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ١٣ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ
عِقَابِ ١٤ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ١٥ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل
لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ١٦ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. صاد، سوێند بە قورئانی خاوەن ناوبانگ و بیرخەرەوە (١) (تۆمەتەکانی کافران ڕاست نین)، بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان لە خۆ پێزۆریی و دووبەرەکیی دان (٢) (ئایا نازانن!) لە پێش واندا (خەڵکی) زۆر سەدەمان فەوتاندوون (کاتێک سزایان بۆ هات)و هاواریان کرد (کە خوا دەربازیان بکات)، بەڵام (کاتەکە) کاتی قوتار بوون نەبوو؟! (٣) سەریشیان سوڕما کە لە خۆیان وریا کەرەوەیەکیان بۆ هات و، بێبڕوایەکان گوتیان: ئەم (کەس)ە، جادووگەرێکی درۆزنە (٤) ئایا (سەرجەم) پەرستراوەکانی کردوونە یەک پەرستراو؟! بێگومان ئەمە شتێکی یەکجار سەیرە! (٥) سەرکردەو دەستڕۆیشتووەکانیان دەرپەڕین (دەست بەکار بوون و بە خەڵکەکەیان گوت:) کە (لەسەر حاڵی خۆتان) بەردەوام بن و لەسەر پەرستراوەکانتان خۆڕاگربن، بە دڵنیایی ئەوە شتێکە دەویسترێ (و پیلانێکە لە دژمان دەگێڕدرێ) (٦) ئەمەمان لە ئایینی (کۆمەڵی) دواییدا نەبیستوە، ئەمە تەنیا هەڵبەستراوە (بە ناوی خواوە) (٧) ئایا (قورئانی) بیرخەرەوە لە نێو (هەموو)ماندا دابەزیوەتە سەر وی (موحەممەد)؟! (نەخێر هیچکەس لەو شایستەتر نیە)، بەڵکو ئەوان

لـە بـارەی (قورئانـی) بیرخـەرەوەی منـەوە لـە دوو دڵییـدان، بەڵکـو جـارێ ئـازاری منیـن نەچێژتـوە (بۆیـە هەڵوێسـتیان وایـە) ﴿٨﴾ یـان ئـەوان عەمبارەكانـی بەزەیـی پـەروەردگری زاڵـی بەخشـەرتیان لـە لان (تاكـو بـە ئـارەزووی خۆیـان پلـەی پێغەمبەر یەتیـی ببەخشـن)؟! ﴿٩﴾ یـان ئایـا موڵكـی ئاسـمانەكان و زەوی و ئـەوەی لـە نێوانیـان د یـە، هـی ئەوانـە؟! ﴿١٠﴾ (ئەگـەر وایـە) بـا بـە ڕێگابەكانـی (ئـسمانان) دا بـەرز بنـەوە (تاكـو لەوێـوە كاروبـار هەڵسـووڕێنن) ﴿١١﴾ ئەوانـە سـەربازێكی تێكشـكاون لـەولاوە لـە حیزبـەكان(ی ئەهلـی كوفـر، ئەوانـە تاكـە بـە درۆدانەرنـی پێغەمبـەران نیـن، بەڵكـو) لـە پێـش وانیشـدا گەلـی نـووح و (گەلـی) عـادو (گەلـی) فیرعەونـی خـوەن گوڵمیخیـش (بـە پەیامـی خـوا) بێبـڕوا بـوون و بـە درۆیـان دانـ ﴿١٢﴾ هەروەهـا (گەلـی) ثەمـوودو گەلـی لـووط و هاوەڵانـی باخەكـەش (خەڵكـی مەدیـەن، پەیامـی خوایـان بـە درۆ دانـا)، ئەوانـە حیزبـە (بێبـڕوا)كان بـوون ﴿١٣﴾ هیـچ كامیـان نەبـوو مەگـەر پێغەمبـەرانی بـە درۆ دانـاو، سـەرەنجام سـزای منیـان لەسـەر چەسـپا (كـە هـەر كەسـێك بێبـڕوا بـێ، دەبـێ سـزا بـدرێ) ﴿١٤﴾ ئـا ئـەو (بێبڕوای)انـەش تەنیا چاوەڕێـی هاڕژنێـك دەكـەن، كـە یـەك تـاو وەخرانـی نیـە ﴿١٥﴾ (بێبڕوایـەكن هێنـدە بێبـاك بـوون لـە سـزای خـوا، گاڵتەیـان پێدەهـات و) گوتیشـیان: پەروەردگـرمـان! پەلـە بكـە لـە هێنانـی سـزای خۆمـان بـەر لـە ڕۆژی لێپرسـینەوە ﴿١٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡعِزَّةُ): (العِزَّةُ: حَالَةٌ مَانِعَةٌ لِلإِنْسَانِ مِنْ أَنْ يُغْلَبَ، وَقَدْ تُسْتَعَارُ لِلحَمِيَّةِ وَالأَنَفَةِ المَذْمُومَةِ)، (عِزَّة): حاڵەتێکە ڕێ دەگرێ لەوەی مرۆڤ تێبشکێ و، جاری واشە داخوازرێتەوە بۆ دەمارگیریی و لووتبەرزیی خراپ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِ...﴿٢٠٦﴾﴾، واتە: بە گوناهەوە عیززەت گرتی، ئەگەرنا، ئەگەر عیززەت بە گوناهەوە نەبێ، سیفەتێکی باشە، واتە: مرۆڤ هەوڵبدات بەرانبەرەکانی بەسەریدا زاڵ نەبن و زەبوونی نەکەن.

(وَشِقَاقٍ): (أي: مُخَالَفَة)، (شِقَاق) ئەوەیە: دوو کۆمەڵ یان زیاتر، هەر کامێکیان لە (شِقْ)ێکدا بن، (شِقْ) یانی: لا، واتە: ناکۆکیی و دووبەرەکیی.

(لَاتَ): (أي: لَيْسَ، أَوْلَا حِيْنَ، وَالتَّاءُ زَائِدَةٌ فِيْهِ كَمَا زِيدَت فِي ثُمَّةَ وَرُبَّةَ)، (لات): هەمووی بە مانای (لَيسَ)یە، یاخود (لات) (أي: لَا حِيْنَ)، واتە: کات نیە، (تا)یەکە زیاد کراوە، وەک چۆن لە (رُبَّة)و (ثُمَّة)دا زیاد دەکرێ، کە خراوەتە سەر: (ثُمَّ) و (رُبَّ).

(حِينَ مَنَاصٍ)، واتە: کاتی دەرباز بوون، (نَاصَ إِلى كَذَا: رَجَعَ إِلَيْهِ، وَالمَنَاصَ: المَلجأ)، (نَاصَ إِلى كَذَا): واتە: پەنای پێبرد، (مَنَاص)یش بە مانای شوێنی دەرباز بوون و، پەناگە دێ.

(عُجَابٌ): (العَجَبُ وَالتَعَجُّبُ: حَالَةٌ تَعْرِضُ لِلإِنْسَانِ عِنْدَ الجَهْلِ بِسَبَبِ الشَّيءِ، عُجَاب مِثْلُ طُوَال: لِلمُبَالَغَة)، (عَجَب) و (تَعَجُّب) حاڵەتێکە بۆ مرۆڤ دێتە پێشێ بە هۆکاری ئەوەی شتێک نازانێ و، (عُجَاب) وەک (طُوَال) بۆ زێدەڕۆییە، واتە: زۆر سەرسووڕمان.

(وَٱنطَلَقَ): (انْطَلَقَ فُلَانٌ: إِذَا مَرَّ مُتَخلِّفاً)، ئەگەر دواکەوتیێ لە شتێک و ڕا بکات، (إِنْصَرَفَ وَمَشَى)، دەرچوو و ڕۆیشت، بۆیە من وشەی (دەرپەڕی)یم، بەکارهێنا بۆ کەسێک کە کت و پڕ بڕوات، کە لە کوردییدا دەڵێین: دەرپەڕین.

(ٱخۡتِلَٰقٌ ): (اخْـتِرَاعُ الكَـذِبِ الَّـذِي لَا شُـبْهَةَ لِصَاحِبِـه)، (اخْتِـلَاق): هەڵبەسـتنی درۆیەکـە، کـە خاوەنەکـەی نیمچـە بەڵگەیەکیشـی نیـە.

(ٱلۡأَسۡبَٰبِ ): (جَمْـعُ السَّـبَب: الحَبْـلُ الَّـذِي يُصْعَـدُ بِـهِ النَّخْـلُ، وَسُـمِّيَ كُلُّ مَـا يُتَوَصَّـلُ بِـهِ إِلَى شَيْءٍ، سَبَبَاً)، (أَسْبَاب) کـۆی (سَـبَب)ە، لـە ئەصڵـدا وشـەی (سَـبَب) لـە زمانـی عەرەبیـی دا بـۆ ئـەو گوریـس و پەتـەی پێـی سـەردەکەون بـۆ سـەر دارخورمـا، تاکـو بەرەکـەی بچنـن، یـان تـۆوی نێرەکـە لـە مێیەکـە بکـەن، بـەکار هێـنراوە، دوایـی هـەر شـتێک ببێتـە هـۆکار بـۆ ئامانجێـک پێـی گوتـراوە: (سَـبَب).

(ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ): (أَوْتَـاد) کـۆی (وَتَـد)ە، (وَتَـد) یـان (وتِـد) بـە مانـای گوڵمیـخ و سـینگ، دێ، (وَتَدتـه أَتِـدُهُ وَتْـداً)، دامکوتـا، دایدەکوتـم، داکوتـان، گوڵمیـخ و سـینگ کـە دادەکوترێ لەمـلاولای چـادرو ڕەشـماڵ، یاخـود ئاژەڵێکـی پـێ دەبەسـترێتەوە بـۆ ئـەوەی نـەڕوات.

(فَوَاقٍ ): یـان (فُـوَاق): (مَـا بَـيْنَ الحَلْبَتَـيْن)، مـاوەی نێـوان دوو دۆشـینی ئاژەڵێـک، پێـی دەگوتـرێ: (فُـوَاق)، واتـە: ئێسـتا ئـەو گامێـش و مانگایـە، یـان ئـەو حوشـترە، یـان ئـەو مـەڕو بزنـە، دەدۆشـن، دەبـێ ماوەیـەک لێـی بوەسـتن، تاکـو گوانـی پـڕ دەبێتـەوە لـە شـیر، ئنجـا ئـەو ماوەیـەی لێـی ڕادەوەسـتن، پێـی دەگوتـرێ: (فَـوَاق) یـان (فُوَاق)، وەک دواتـر باسـی دەکـەن، هەروەهـا (فَـوَاق) بـە مانـای گەڕانـەوەش دێ و، بـە مانـای ئاسـوودەییش دێ.

(قِطَّنَا ): (القِـطُّ: النَّصِيـبُ، الصَّحِيْفَـةُ المَكْتُوبـة، أَصْـلُ القِـطّ: الـشَّيء المَقْطُـوع طُوْلاً)، (قِـط): بـە مانـای پشـک و بـەش دێ و، بـە مانـای لاپەڕەیـەک دێ، کـە ئـەو پشـک و بەشـەی تێـدا نووسـراوە، بـە مانـای نووسـراویـش دێ، وشـەی (قِـط) لـە بنچینـەدا ئـەو شـتەیە کـە بـە بـاری درێژییـدا دەبـڕدرێ و، دەقڵیشـێنرێ لـە سـەرەوە بـۆ خـوارێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتانـە، کـە خـوا تییانـدا دەفەرمـوێ: ﴿صٓۚ
وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ۝٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ
فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ۝٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ
كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ
ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ۝٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ
هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ۝٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ
عَذَابِ ۝٨﴾.

شـارەزایانی قورئـان زۆریـان لـەو بـارەوە قسـە کـردوە، بـەڵام مـن هەوڵمـداوە ئـەوەی لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـترە، هەڵبەتـە هەندێـک لـە زانایـان هیـچ کام لـەو ڕیوایەتانەیـان لـە ڕووی سـەنەدەوە بـە ڕاسـت دانەنـاوە، بـەڵام بەشێکیشـیان ئـەوەی کـە ئێسـتا دەیهێنـم بـە ڕاسـتیان دانـاوە، یاخـود بـە لای کەمـەوە سـەنەدەکەیان بـە بـاش دانـاوەو، زۆریـش تیشـکمان بـۆ دەخاتـە سـەر نیوەڕۆکـی ئـەو ئایەتـە موبارەکانـەو، ئەمـەش دەقـی ئـەو گێردراوەیـە:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهُـمَا، قَـالَ: لَـمَّا مَـرِضَ أَبُـو طَالِـبٍ، دَخَـلَ عَلَيْـهِ رَهْـطٌ مِـنْ قُرَيْـشٍ، فِيهِـمْ أَبُـو جَهْـلٍ، فَقَـالَ: إِنَّ ابْـنَ أَخِيـكَ يَشْـتُمُ آلِهَتَنَـا، وَيَفْعَـلُ وَيَفْعَـلُ، وَيَقُـولُ وَيَقُـولُ، فَلَـوْ بَعَثْـتَ إِلَيْـهِ فَنَهَيْتَـهُ! فَبَعَـثَ إِلَيْـهِ، فَجَـاءَ النَّبِـيُّ ﷺ، فَدَخَـلَ الْبَيْـتَ وَبَيْنَهُـمْ وَبَيْنَ أَبِي طَالِـبٍ قَـدْرُ مَجْلِـسِ رَجُـلٍ، قَـالَ: فَخَشِيَ أَبُـو جَهْـلٍ إِنْ جَلَـسَ إِلَى جَنْـبِ أَبِي طَالِـبٍ أَنْ يَكُـونَ أَرَقَّ لَـهُ عَلَيْـهِ، فَوَثَـبَ فَجَلَـسَ فِي ذَلِـكَ الْمَجْلِـسِ وَلَـمْ يَجِـدْ رَسُـولُ اللهِ ﷺ مَجْلِسًـا قُـرْبَ عَمِّـهِ، فَجَلَـسَ عِنْـدَ الْبَـابِ، فَقَـالَ لَـهُ أَبُـو طَالِـبٍ: أَيِ ابْـنَ أَخِـي! مَـا بَـالُ قَوْمِـكَ يَشْـكُونَكَ، يَزْعُمُـونَ أَنَّـكَ تَشْـتُمُ آلِهَتَهُـمْ وَتَقُـولُ وَتَقُـولُ! قَـالَ: وَأَكْثَـرُوا عَلَيْـهِ مِـنَ الْقَـوْلِ،

وَتَكَلَّمَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم، فَقَالَ: يَا عَمُّ، إِنِّي أُرِيدُهُمْ عَلَى كَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ يَقُولُونَهَا، تَدِينُ لَهُمْ بِهَا الْعَرَبُ، وَتُؤَدِّي إِلَيْهِمْ بِهَا الْعَجَمُ الْجِزْيَةَ، فَفَزِعُوا لِكَلِمَتِهِ وَلِقَوْلِهِ، فَقَالَ الْقَوْمُ: كَلِمَةً وَاحِدَةً؛ نَعَمْ وَأَبِيكَ عَشْرًا، فَمَا هِيَ؟ فَقَالَ أَبُو طَالِبٍ: وَأَيُّ كَلِمَةٍ هِيَ يَاابْنَ أَخِي؟ قَالَ: لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ.» فَقَامُوا فَزِعِينَ يَنْفُضُونَ ثِيَابَهُمْ، وَهُمْ يَقُولُونَ: ﴿أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ۝٥﴾ قَالَ: وَنَزَلَ فِيهِمْ: ﴿صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ۝٢ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ۝٣ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ۝٥ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ۝٦ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْـَٔاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ۝٧ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ۝٨﴾)[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێک ئەبوو تاڵیب نەخۆش بوو، کۆمەڵێک لە قوڕەیش کە ئەبوو جەهلیان لە نێو دابوو، هاتن سەردانی ئەبوو تاڵیبیان کرد، ئەبوو جەهل گوتی: برازایەکەت قسە بە پەرستراوەکانمان دەڵێ و، ئاوا دەکاو ئاوا دەکاو، ئاوا دەڵێ و ئاوا دەڵێ، ئەگەر بە دوایدا بنێری و ڕێگریی لێ بکەی لەوەی دەیکات و دەیڵێ، ئەویش بە دوایدا نارد، پێغەمبەریش ﷺ هاتە ژوور، ئنجا لە لای ئەبوو تاڵیب بە ئەندازەی پیاوێک شوێنی دانیشتن هەبوو، ئەبوو جەهل ترسا، پێغەمبەر ﷺ لە پاڵ مامی دابنیشێ، (لەبەر ئەوەی نەخۆش بووە، یان وەک ڕێزو حورمەت گرتنێک، بە ئەندازەی شوێنی پیاوێکیان هێشتۆتەوە)، ئەمەش هۆکاری نەرمیی و سۆزی مامی بێ بۆی، بۆیە هەڵساو خۆی لەو شوێنە دانیشت و، پێغەمبەریش ﷺ هاتە ژوور، هیچ شوێنی نەبینی دابنیشێ لە نیزیک مامی، بۆیە لە لای دەرگایەکە (کە بۆشاییەک

---

(١) أخرجه: أحمد: ج١، ص٢٢٧، وأبو يعلى: ٢٨٥٣، والترمذي: ٣٢٣٢، والنسائي في التفسير: ٤٥٦، والحاكم وَصَحَّحَهُ: ج٢، ص٢٣٢، وفتح القدير للشوكاني: ج٤ص٥.

هەبوو) دانیشت، ئەبوو تالیب پێیگوت: ئەی برازام! بۆچی خەڵکەکەت سکاڵاو گلەییت لێ دەکەن و، پێیان وایە تۆ قسە بە پەرستراوەکانیان دەڵێی؟ فلان شتە دەڵێی و فلان شت دەڵێی و، لەو بارەوە زۆریان قسە لەگەڵ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ قسەی کردو فەرمووی: من تەنیا یەک وشەم لێیان دەوێ، با ئەو وشەیە بڵێن، عەرەب دێتە ژێر ڕکێفیان، (هۆزو تیرەکانی عەرەب)و (ئەگەر) غەیری عەرەبیش (بڕوا بەو وشەیە نەهێنن، ئەو کاتە) دەبێ سەرانە بدەن، ئەوانیش ڕاچڵەکین بۆ قسەکەی و گوتیان: تەنیا یەک وشە؟! ئێمە دە (١٠) وشەشت بۆ دەڵێین، سوێند بە بابت! (ئەو کات سوێندیان بە بابیان خواردوە)، دوایی گوتیان: ئەو وشەیە چییە، کە ئێمە بیڵێین، تۆ لێمان ڕازی دەبی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا إله إلا الله) [واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە] ئیدی هەڵسان بە داچڵەکاویی و ئەو جلەی لەبەریان بوو، ڕایان تەکاندو، دەیانگوت: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ﴾، ئایا هەموو پەرستراوەکانی کردنە یەک پەرستراو؟! بە ڕاستیی ئەمە شتێکی زۆر سەیرو سەرسووڕهێنەرە، ئیدی لەو بارەوە ئەم هەشت ئایەتە موبارەکە دابەزین: ﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ٨ ﴾.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: ئەم شازدە (١٦) ئایەتە، کۆمەڵە بابەتێکی چڕو پڕیان گرتوونە خۆیان، کە دەتوانین بڵێین: یازدە (١١)ن:

١- پێناسەی قورئان: ﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴾، قورئانی خاوەن بیرخەرەوە، یاخود قورئانی خاوەن شەرەف و پێگەی بەرز.

٢- هەڵوێستی نەرێنیی کافرەکان.

٣- سەرنجڕاکێشانیان بۆ مێژوو و هەڕەشەیەکی پەنهان لێیان، کە سەرنجی مێژووی گەلانی پێشووی فەوتاو بدەن، ئەگەر بێت و وەک ئەوان بکەن، بە مەرەدی وانیش دەچن.

٤- تۆمەتبار کردنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ بەوە کە جادووگەرەو، درۆزنە.

٥- سەرسوڕمانیان لە خوا بە یەکگرتن (توحید).

٦- هاندانی سەرانیان بۆ خەڵکەکەیان، کە بەردەوام بن لەسەر پەرستراوەکانیان و، گوێ بە ئەو پەیامە تازەیە نەدەن، کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی.

٧- هێنانەوەی دوو بیانووی پووچ.

٨- بەرپەرچدانەوەی بیانووەکانیان.

٩- سەرنجڕاکێشانیان جارێکی دیکە بۆ مێژووی گەلانی پێشووی یاخیی و لادەرو تاوانبار، کە چییان بەسەر هاتوە!

١٠- هەڕەشە لێکرانیان.

١١- بێ باکیی دەربڕینیان و، پەلە کردنیان لە هاتنی سزای خوای دادگەری کارزاندا.

خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، واتـە: ئـەو كارە دەست پێدەكـەم بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، كاتێـك مـرۆڤ ئـەو ڕستە موبارەكـە دەڵـێ، دەبـێ چـوار واتـای بنەڕەتیـی بـە عەقڵ و هۆشـی خۆیـدا بێنـێ:

١- بە ناوی خوا دەست پێ دەكەم، نەك بە ناوی خۆم، یان هەر شتێكی دیكە.

٢- ئەو كارە بۆ ڕازیی كردنی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەو كارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەو كارە بە یارمەتیی و هاوكاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەك بە شان و شەوكەتی خۆم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ صٓۚ ﴾، (ص) پیتێكـە لـە پیتـەكان لـەو بیسـت و هەشـت پیتـەی كـە زمانـی عەرەبیـی پێـك دێنـن، وەك پێشـتریش چەنـد جـار باسـمان كـردوە، بیسـت و نـۆ سـوورەت لـە قورئانـدا، بـەو پیتانـە دەسـت پێ دەكەن، سـێ سـوورەتیان بـە پیتـی تـاك، دەسـت پـێ دەكـەن، كـە ئەمـە یەكێكیانـە، دوایـی سـوورەتی (ق)، دوایـی سـوورەتی (ن)، كـە بـە سـوورەتی (القلـم)و سـوورەتی (نوون)یـش نـاسراوە، ﴿ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴾، سـوێند بـە قورئانـی خـاوەن بیرخـەرەوە، یاخـود خاوەنـی شـەرەف و ڕێـز، یاخـود سـوێند بـە قورئانـی خـاوەن بەرنامـە.

﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ﴾، ئـەوەی بێبڕوایـەكان لـە بـارەی قورئـان و موحەممـەدەوە ﷺ دەیڵێـن، ڕاسـت نیـە، بەڵكـو ئەوانـەی بێبـڕوان و لـە خۆبایـی بـوون و خـۆ پـێ زۆرن و، لـە ناكۆكیـی و دووبەرەكیـی دان، واتـە: خـۆ پـێ زۆر بوونیـان بـە ناهـەق و، دووبەرەكیـی و ناكۆكیـی كردنیـان لەگـەڵ خـواو بەرنامـەی خـوادا، وای لێكـردوون قورئـان بـەوە تۆمەتبـار بكـەن كـە دەیڵێـن و، موحەممـەد ﷺ بـەوە تۆمەتبـار بكـەن كـە لـە بارەیـەوە گوتوویانـەو دەیڵێـن، ﴿ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ ﴾، لـە پێـش وانـدا چەنـد سـەدەمان فەوتانـدوون، (قَـرن) بـە مانـای (سـەدە) یـەو مەبەسـت پێـی كەسـانێكە كـە لـە ماوەیەكـی دیاریكـراودا پێكـەوە دەژیـن، (يَعيشُـون فِي زَمَـنِ مقْتَرِنـين)، (قَـرن) واتـە: خەڵـك كـە لـە كاتێكـدا دەژیـن، ئنجـا

هەندێک گوتوویانە: (قَرن) حەفتا (٧٠) ساڵە، هەندێک گوتوویانە: (قَرن) سەد (١٠٠) ساڵەو، هەندێک گوتوویانە: پەنجا (٥٠) ساڵە، خوا دەفەرموێ: زۆرمان لە سەدەکان فەوتاندوون، لەسەر یاخیی بوونیان، ﴿فَنَادَوا﴾، ئنجا هاواریان کردە خواو بانگیان کرد، ﴿وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾، بەڵام کاتی دەرباز بوون تێپەڕیبوو.

﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنۡهُمۡ﴾، سەریان سوڕما کە لە خۆیان هۆشیار کەرەوەو بیرخەرەوەیەکیان بۆ هات [کە موحەممەدە ﷺ] ﴿وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ﴾، لێرەدا: (وَضعَ المُظْهَرْ موضِع المُضْمَرِ)، دەکونجا بڵێ: (وَقالُوا: سَاحِرٌ كذّاب)، وەک چۆن فەرموویەتی: ﴿وَعَجِبُوٓاْ﴾، بەڵام لێرەدا بۆ ئەوەی کوفرەکەیان زیاتر دەر بخرێ، فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، گوتیان: (کافِرون) کۆی (کافر)ە، (کافر) لەسەر کێشی (فاعِل)ە، واتە: داپۆشەر، ئەوانەی کە هەق دادەپۆشن و هەقیان بۆ دێ و ڕەفزی دەکەن، ئا ئەوانە گوتیان: ﴿هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ﴾، ئەمە جادووگەرێکی درۆزنە، درۆزن ئەو کەسەیە کە زۆر درۆ بکات، دوور لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ژیانیدا پێش پێغەمبەرایەتییش، قسەی ناڕاست و درۆی بە دوو لێودا نەهاتوە، بە بەڵگەی ئەوە کە نەیارەکانی هێندە متمانەیان پێی هەبوو، کاتێک ئایەتێکی بۆ دەخوێندنەوەو شتێکی پێ ڕادەگەیاندن، دڵنیابوون کە ئەو شتە ڕوو دەدات، هەروەها سپاردەکانی خۆیان بەو دەسپاردن، هێندە متمانەیان پێی هەبوو، کاتێک ئەو شتێکی فەرمووبایە، دەیانزانیی ڕاستە، دەیانگوت: موحەممەد ﷺ وایگوتووەو ڕاستە!

﴿أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًا﴾، ئایا هەموو پەرستراوەکانی کردنە یەک پەرستراو، کە خوایە ﷻ؟!، ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ﴾، بە ڕاستیی ئەمە شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە.

﴿وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ﴾ دەستڕۆیشتووانێک لەوان دەرپەڕین و بەخێرایی ڕۆیشتن، (مَلأ) وشەیەکە تەعبیری پێ دەکرێ لە خەڵکی دەستڕۆیشتوو، حوکمڕان و بڕیار

بە دەست لە نێو کۆمەڵگادا، ئنجا چونکە عەرەب بە گشتیی و قورەیش بە تایبەت، قەوارەیەکی سیاسییان نەبووە، ئەگەرنا خەڵکی میسر سەرۆکەکەیان پێی گوتراوە: فیرعەون و، خەڵکی ڕۆم گەورەکەیان پێی گوتراوە: هیرەقل و، خەڵکی فارس بەرپرسیان پێی گوتراوە: کیسراو، خەڵکی (حەبەشە) سەرۆکیان پێی گوتراوە: نەجاشیی، ئەمانە هەموویان نازناوی پادشایەتیی و حوکمڕانیی بوون، بەڵام گەلی عەرەب قەوارەیەکی سیاسییان نەبووە، بۆیە سەرۆکیان، دەستڕۆیشتووەکان و بڕیار بە دەستەکان بوون، ئەوانەی عەقڵ و چاویان پڕ کردوون لە ترس و سام، هەڵبەتە بۆ گەلانی عادو سەموودو، مەدیەن و گەلی فیرعەونیش هەر (مَلأ) بەکارهاتوە، چونکە حوکمڕانەکە هەبووە، بەڵام کۆڕێک هەبووە ڕاوێژی پێکردوون، ئەگەر بە ڕواڵەت و بۆ خۆڵ کردنە چاوی خەڵکیش بێ! ﴿أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ﴾، بە خەڵکەکەیان گوت: بەردەوام بن و خۆڕاگربن، لەسەر پەرستراوەکانتان، ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ﴾، بێگومان ئەوە شتێکە دەویسترێ، واتە: ئەوە پیلانێکە لە دژمان دەگێڕدرێ و لە خۆتان وریا بن! ئەو کار بەدەستە ملهوڕانەی حوکمی ئەو خەڵکەیان کردوە، زانیویانە مەسەلەکە چییەو موحەممەدیان باش ناسیوەو، باش حاڵیی بوون و، ئەوان زیاتر لە قسەکان تێگەیشتوون، هەروەک جارێک پێغەمبەر ﷺ دەچێتە لای یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان، کە پەنای بدات و ڕێگای بدات لە نێو عەشیرەتەکەی دا بانگەواز بۆ لای خوا بکات، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی ئیسلامی بۆ دەکات، دەڵێ: (إِنَّ هَـٰذَا الدِّينَ يَخَافُهُ المُلُوك) واتە: ئەم ئایینە حوکمڕانەکان لێی دەترسن و شوێنی حوکمڕانەکان لێژ دەکات، ئەوەی ئەوان داگیریان کردوە لە دەسەڵات و سامان، دەیگێڕێتەوە بۆ خاوەنە شەرعییەکانی، بەڵام ئەو بڕیار بەدەستانە ویستوویانە خەڵکەکە چەواشە بکەن.

﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْـَٔاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ﴾، ئنجا بەڵگە دێننەوەو دەڵێن: ئەمەمان لە دوا ئاییندا نەبیستوە، دوا ئایین کە لە نێو خۆیاندا باو بووە،

دەبێ مەبەستیان ئایینی ئیبراهیم بێ ﷺ کە پێی گوتراوە: (الحنيفيّة)، کە درۆیان کردوەو وا نەبووە، بناغەو نیوەڕۆکی ئایینی ئیبراهیم و ڕێبازی ئیبراهیم یەکتاپەرستیی و تەنیا خوا پەرستیی بووە.

یان مەبەستیان بە: ﴿ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾، نەصرانییەت بووە، ئەوەمان لە ئایینی کۆتایی دا، کە لە دوای ئەو هیچ کتێبی دیکە دانەبەزیون و لە دوای وی کە عیسایە، هیچ پێغەمبەرێک نەهاتوە، شتی وامان نەبیستوە، ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ﴾، ئەمە تەنیا هەڵبەستراوە، واتە: بە ناوی خواوە هەڵبەستراوە.

﴿أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا بیرخەرەوە (ذِکر) بۆ سەروی دابەزێنراوە؟! واتە: ئایا ئەو لە هەمووان شایستەترە؟! ﴿بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ﴾، خوای بەرز بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: بەم شێوەیە نەبووە کە ئەوە لە دوا ئایین دا نەبوو بێ، چ مەبەستیان ئەوەبێ کە لە نێو ئەواندا باو بووە لە ئایینی ئیبراهیم، چ مەبەستیان پێی ئایینی نەصرانییەت بێ، ئەوە ڕاست نیەو، هۆکار ئەوەیە کە ئەوان لە بەرانبەر یادو بەرنامەی من، لە دوو دڵییدان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿مِّن ذِكۡرِيۚ﴾، مەرج نیە تەنیا قورئان بگرێتەوە، واتە: لە هەموو پەیامەکانی من لە گومان و دوو دڵیی دان، بڕوایان بەوە نیە کە خوا ﷻ کتێبی دابەزاندوەو، پەیامێکی بۆ پێغەمبەران ناردوە، لە بنەڕەتدا لەوەدا دوو دڵن، ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾، بەڵکو جارێ سزاو ئازارمیان نەچێشتوە، بۆیە وا بێ باکن.

﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ﴾، یان ئایا عەمبارەکانی بەزەیی پەروەردگاری زاڵی بەخشەر، لەلای وانن، (تاکو بە کەیفی خۆیان ببەخشن؟! فلانکەس بکەنە پێغەمبەرو فلانکەسی نەکەنێ!؟).

﴿أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ﴾، یان ئایا حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لە نێوانیان دایە، لە بەردەستی ئەوان دایە؟ ﴿فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي

ٱلۡأَسۡبَٰبِ ﴾، ئەگەر وایە با بە هۆکاران سەرکەون بەرەو ئاسمان، ئنجا لەوێوە حوکم بکەن و بڕیار بدەن، بەسەرخەڵکی دا.

﴿ جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾، ئەوانە چەند سەربازێکن لەوێ تێکشکاون لە حیزبەکان، واتە: سەرەنجام تێکدەشکێن، ئەوانیش لە گەلە ملهوڕە پێشووەکان زیاتر نین، ئنجا خوا شەش کۆمەڵە لەوانەی فەوتاون و فڕێدراونە زبڵدانی مێژوو، بۆیان بە نموونە دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ ﴾، لە پێش واندا گەلی نووح پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، ﴿ وَعَادٞ ﴾، گەلی عادیش کە پێغەمبەرەکەیان ناوی هوود ﷺ بوو، ﴿ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ﴾، هەروەها فیرعەونی خاوەن گوڵمیخ کە خەڵکی چوار مێخە دەکێشا، ئەگەر بیویستبایە کەسێک ئەشکەنجە بدات، گوڵمیخێکی لەسەر ئەو لەپە دەستەو، یەکێک لەسەر ئەو لەپە دەستەی دیکەی و، دووانیشی لەسەر دوو پێیەکانی دادەکوتان و بەدیوارەوە دەیکردە ڕەسم، تاکو گیانی دەردەچوو، کە ئەوە پیسترین شێوازی ئەشکەنجەیە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ ٱلۡأَوۡتَادِ ﴾، ئەو هەڕەمانەن کە دروستیان کردوون لە میسڕ، هەرکامیان گۆڕێکە بۆ یەکێک لە فیرعەونەکان.

﴿ وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ ﴾، هەروەها گەلی سەموود، کە پێغەمبەرەکەیان صالح ﷺ بووە و، گەلی لووط، کە پێغەمبەرەکەیان لووط ﷺ بوو، ﴿ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ﴾، هاوەڵانی باخەکە، یان درەختە گەورەکەش کە خەڵکی مەدیەنن، ئەوانە هەموویان پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، پێغەمبەری گەلی مەدیەن شوعەیب ﷺ بووە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ﴾، ئا ئەوانە حیزبەکانن، واتە: ئەو حیزبانەن کە دژی خواو پەیامەکەی و پێغەمبەرانی خوا بوونە.

﴿ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ ﴾، هیچ کامیان نەبووە، مەگەر پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، ﴿ فَحَقَّ عِقَابِ ﴾، سزایەکەی منیش لەسەریان چەسپا، ﴿ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ﴾، بێبڕوایانی ڕۆژگاری تۆش (ئەی

موحەممەد ﷺ!) بەس چاوەڕێی هاڕژێنێک دەکەن، کە دوای فوو کردنە (صور) بۆ جاری یەکەم دێتە دی ﴿مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ﴾، کاتێک فووی پێدا دەکرێ، بە ئەندازەی نێوان دوو دۆشینی پێناچێ، کە هەموویان لە بەین دەچن و دەفەوتێن.

﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾ هەروەها گوتیان: پەروەردگارمان! ئەندازە سزای خۆمامان بە پەلە بۆ بێنە، پێش ڕۆژی لێپرسینەوە.

کە ئەوان بڕوایان بە ڕۆژی لێپرسینەوە نەبووەو بە توانج وایانگوتوە، واتە: ئەگەر ڕۆژی لێپرسینەوە هەیە، تۆ پێش ئەوە، ئێمە سزا بدە، ئاوا بێباک و بێ منەت بوون!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەی قورئان و خستنە ڕووی هەڵوێستی خراپی کافرەکان بە گشتیی لە بەرانبەر پێغەمبەردا ﷺو سەرسام بوونیان بە خوا بە یەکگرتن و، لابردنی پەرستراوە ساختەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴾، (ص)، پیتێکە لە بیست و هەشت پیتەکە، ﴿ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴾، سوێند بە قورئانی خاوەن بیرخەرەوە، یاخود سوێند بە قورئانی خاوەن پێگەو پایەی بەرز، لێرەدا سوێند لەسەر خوراوەکە، یان وەڵامی سوێندەکە فرتێنراوە، کە پیتی (ص) دەلالەتی لەسەر دەکات، واتە: سوێند بە قورئانی خاوەن بیرخەرەوە، یان خاوەن ناوبانگ، ئەم قورئانە هەر دابەزێنراوی خوایە، چونکە لەو پیتانە پێک هاتوە، کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن و پێیان دەدوێن و پێیان دەنووسن، کە چی ناتوانن وێنەی ئەو قورئانە، یان دە سوورەتی، یان سوورەتێکی بێنن، کەواتە: بزانن، ئەو قورئانە دابەزێنراوی خوایە، یاخود وەڵامی سوێندەکە، ئەوە دەلالەتی لەسەر دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴾، واتە: ئەو قورئانە بیرخەرەوەیە، بەڵام بێبڕوایان، پەسندی ناکەن و لێی بەهرەمەند نابن،

ئەگەرنا لە ڕاستیی دا مادام ئەو قورئانە بیرخەرەوەیە، بۆ ڕاستییەکانی کە مرۆڤ ئەگەر لە ڕێگای وەحییەوە نەبێ پەییان پێ نابات، کەواتە: بزانن ئەو قورئانە دابەزێنراوی خوایە.

٢)- ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ﴾، بەڵکو ئەوانەی بێبڕوا بوون، لە خۆ پێ زۆریی و دووبەرەکییدان، لێرەدا عیززەت خوازراوەتەوە بۆ خۆ پێ زۆریی و مەزنگیریی و دەمار زلیی، (شِقاق) واتە: دژایەتیی کردنی هەق، یانی: لەبەر خۆ پێ زۆریی و بۆ ئەوەی ئەو بازاڕەی هەیانە کە بریتیە: لە خۆ سەپاندن بەسەر وڵات داو قۆرخکردنی دەسەڵات و سامانی خەڵک، بە بیانووی ئەوەوە کە ئێمە ئەشرافین و، ئێوە ڕەش و ڕووتن، یان بە بیانووی ئەوەوە کە دەستەڵات میراتگریی و بنەماڵەییە، یان بە بیانووی ئەوەوە کە ئێمە سامانمان هەیەو ئێوە هەژارن، یان ئێمە عاقڵین و ئێوە بێ عەقڵن، کە ئەو بیانووانە هەموویان پووچن و دەرخەری واقیعی کۆمەڵگایەکی ئەخۆشن، ئنجا بۆ ئەوەی ئەوەیان لێ تێکنەچێ، بۆیە لەگەڵ قورئان دا ئاوا مامەڵە دەکەن، تاکو بازاڕەکەیان لێ تێک نەچێ، لەبەر خۆ پێ زۆر بوون و دووبەرەکیی هەق، بۆیە بەو جۆرە مامەڵە دەکەن لەگەڵ قورئان دا، چونکە دەزانن ئەگەر ئەوەی قورئان دەیڵێ بچەسپێ، هەموو خەڵک تەبا دەبن، ئەو کاتە ئەو سیستمی خۆ فەرزکردن و قۆرخکردنی سامان و دەسەڵات، ڕیشەکێش دەکرێ و، هیچ کەس بیانووی نابێ خۆی بەسەر خەڵکدا فەرز بکات، دەسەڵات و سەروەت و سامانیان لێ قۆرخ بکات و بیخاتە بن دەستی خۆی، بۆیە دەفەرموێ: بەڵکو ئەوانەی بێبڕوان لە خۆ پێ زۆر بوون و لە دووبەرەکیی هەقدان، ئەوەیە وایان لێ دەکات، ڕقیان لە قورئان و موحەممەد ﷺ بێ، نەک لەبەر ئەو قسانەیان کە دەیانڵێن، کە: گوایە قورئان جادوویە، یان لەبەر ئەوە بێ کە موحەممەد ﷺ شتێکی هێناوە کە لەگەڵ هەق و مەنتیق دا ناگونجێ، یان لەبەر ئەوە بێ کە جادووگەرە، یان درۆ دەکات! دوور لەو پێغەمبەرە ﷺ، ڕاستگۆو ڕەوشت بەرزو مەزنە، لەبەر هیچ کام لەو هۆکارانە نیە.

٣)- ﴿ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ ﴾، زۆرمان لە پێش واندا لە سەدەکان، فەوتاندووون.

(كَـمْ اسْـمٌ حَـالٌ فِي عَـدَد كَثِـيْرٍ، (مِـنْ قَـرْنٍ) تَمِيْـز الإِبْهَـامِ الغُـمِّ، وَالقَـرْنُ: الأُمَّـةُ)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ كَمْ أَهْلَكْنَا ﴾، (کم) (كَمْ الخَبَرِيـة)ی پێدەڵێـن واتـە: زۆرمـان فەوتاندوون لـە پێش وانـدا، لـە سـەدەکان، ﴿ مِن قَرْنٍ ﴾، ئەمـە تایبەتمەندیـی و ڕوونکەرەوەیـە بـۆ ئـەو تەمومـژەی کە لـە ژمارەکـە دا هەیـە، ﴿ كَمْ أَهْلَكْنَا ﴾، زۆر، ﴿ مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾، لـە پێشـدا کـە دەفەرمـوێ: زۆرمـان لـە پێش وانـدا، بـەڵام کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِّن قَرْنٍ ﴾، ئەمـە ڕوونکـەرەوەی ئـەو تەمومـژەی کـە لـە: ﴿ كَمْ أَهْلَكْنَا ﴾دا، هەیـە، واتـە: سـەدان لـە کۆمەڵگایـەکان، (قَرْن)یـش بـە مانـای (أُمَّـة) کۆمەڵـگا دێ، لەبـەر ئـەوەی لـە کاتێکـی دیارییکـراودا پێکـەوە دەژیـن، واتـە: جیلێـک، کۆمەڵێـک.

٤)- ﴿ فَنَادَوا وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴾، (کاتێک کە سزایان بۆ هات)، هاوارو بانگیان کرد، بەڵام کاتێ دەرباز بوون نەبوو، بە دڵنیاییەوە بانگی خوای پەروەردگاریان کردوە، یاخود بانگی یەکدییان کردوە، ﴿ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴾، بەڵام ئەو کاتە کاتی دەرباز بوون نەبوو، (حِيْن) بە مانای کات دێ، (مَنَاص)یش، بە مانای دەرباز بوون و، هەڵاتن و ڕزگار بوون دێ، پێشتر باسمان کرد: (لات) (لا)یەو (ت)ەکە زیاد کراوە، ئەگەرنا دەڵێن: بە مانای (لَيسَ)دێ، هەندێکی دیکەش دەڵێن: بە مانای ڕۆیشت و تێپەڕیی، دێ، یانی: کاتی دەرباز بوون، ڕۆیی.

٥)- ﴿ وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾، سەریان سوڕما کە لە خۆیان هۆشیارکەرەوەو ترسێنەرێکیان بۆ هات، کە موحەممەدە ﷺ پێیان سەیر بوو کە لە خۆیانە و، لە کۆمەڵگای خۆیانە، پێیان وا بووە ئەگەر پێغەمبەر بێ، دەبێ لە نێو ڕۆم و فارس دا بێ، خۆیان لەوە پێ کەمتر بووە، پێغەمبەریان لە نێو دابێ.

یاخـود: سـەریان سـوڕما کـە لـە خۆیانـە، پێیـان سـەیر بـوو کـە مرۆڤـان پێغەمبەرێکیـان بـۆ بـێ، (عَجِبُـوا)، (العَجَـبُ: إِنْفِعَـالٌ فِي النَّفْـس يَنْشَـأُ عَـنْ عِلْـم بِأَمْـرٍ غَـيْرِ مُتَرَقَّـبٍ وُقُوْعـه)، واتـە: هەڵچوونێکـە لـە دەروونـدا لـە زانیارییەکـەوە پەیدادەبـێ بـە شـتێک کـە چـاوەڕوان نەکـراوە، ئـەو شـتە ڕوو بـدات، بۆیـە گوتـراوە: (إِذَا ظَهَـر السَّـبَب بَطَـلَ العَجَـب)، واتـە: هـەرکات هـۆکار دەرکـەوت، سەرسـوڕمان نامێنـێ، زۆر کـەس بـە هـۆی نەزانینـی هۆکارەکـەوە، سـەری سـوڕمێنێ.

٦)- ﴿ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: ئەوە جادووگەرێکی درۆزنە، وەک پێشتریش گوتمان: (وُضِعَ الظَّاهِرُ مَوْضِعَ الْمُضْمَر لقَصْدِ وَصْفِهِمْ بِالْكُفْرِ)، بۆیە ناوی ئاشکرا لەجێی ڕاناو دانراوە، چونکە وویستراوە بە کوفر ناوزەد بکرێن، فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: ئەوە جادووگەرێکی درۆزنە، ئەگەرنا دەگونجا بفەرموێ: (وَقَالُوا)، وەک چۆن لە پێش ئەودا فەرموویەتی: ﴿ وَعَجِبُوٓا ﴾، بەڵام ئەوانەی ئەو سەرسوڕمانەیان گرتوە، لەبەر کوفرەکەیانە، ئەو قسەیە دەکەن و ئەو سەرسوڕمانەیان تووش بووە.

کە دەڵێن: ﴿ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾، (هَـٰذَا) ئەم ناوی ئامـاژە (إسـم إشَـارَة)یە، بـە دڵنیاییـەوە بـۆ بـە کەمدانانـە، ئەگەرنـا دەیانتوانـی بڵێـن: موحەممـەد، یـان بڵێـن: ئەو پیـاوە، بـەڵام کـە گوتوویانـە: (هَـٰذَا)، ئـەوە بـۆ بـە کـەم تەماشـا کردنـە، بەڵام کەسـێک لـەلای خـوا زۆر بـێ، بـە کـەم سـەیرکردنی نەیارەکانـی بـە تایبـەت کـە بێبـڕواو بـێ ئینصـاف بـن، زیانـی پـێ ناگەیەنـێ، ﴿ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ﴿١٨﴾ ﴾الحج، واتـە: کەسـێک خـوا بـێ ڕێـزی بـکات، هیـچ ڕێـز لێگرێکـی نابـێ، بـە پێچەوانـەوەش هـەر کەسـێک خـوا ڕێـزی لـێ بگـرێ، بـە هیـچ کـەس سـووک نابـێ و، ئەگـەر خـوا گـەورەی بـکات، بەکـەس بچـووک نابـێ.

٧)- ﴿ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ﴾، گوتیان: ئایا هەموو پەرستراوەکانی کردن بە یەک پەرستراو؟! {کە خوایە ﷻ} هەڵبەتە ئەو وای لێ نەکردوون، بەڵکو لە واقیع دا وان، چونکە بێجگە لە خوا، یان مرۆڤە، وەک هەموو مرۆڤەکان، یان لە خوار مرۆڤەوەیە، کە شتەکانی دیکەن، یان جندن، کە لە خوارەوەی مرۆڤەوەن، یان فریشتەن، کە فریشتەکانیش هەرچەندە پاک و بێ گوناهن، بەڵام خوا ﷻ بە هەموو فریشتەکانی فەرمووە: کڕنووشی ڕێز گرتن بۆ ئادەم ببەن، کەواتە: لە خوا ﷻ بێتە خوار: هەمووی دروستکراوی خوایەو، هیچ کام لە دروستکراوەکانیش شایانی پەرستران نین، چونکە یان وەک مرۆڤن یان لە خوار مرۆڤن.

٨) ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ [گوتیان: ئایا پەرستراوەكانی كردنە یەك پەرستراو؟!] بەڕ ستیی ئەوە شتێكی زۆر سەیرە، (عُجَاب) (الَّذِي يُتَعَجَّبُ مِنْهُ كَثِيراً، مِثْلُ طُوَال: المُفْرِط فِي الطُّول، وَكُرَام: كَثِيرُ الكَرَم، والكفر يجعل الإنسانَ يرى المنطقي عجيباً، وغير المنطقي عادياً !!)، (عُجَاب) شتێكە سەر لە بەرانبەریدا زۆر سوور بمێنێ، صیغەی (طُوالٌ) وەک: (نَخْلَةٌ طُوالٌ)، (رَجُلٌ طُوالٌ) ، واتە: زۆر درێژ كە زێدەڕۆیی كرد بێ لە درێژییدا، (كُرَام) واتە: زۆر خاوەن بەخشندەیی، (كِرَام) كۆی (كَريم)ە، واتە: بەخشندەكان، بەڵام (كُرَام) واتە: زۆر خاوەن بەخشندەیی، هەر لەسەر كێشی (طُوال)، گوتوویانە: ئەوە شتێكی زۆر سەیرە كە یەک پەرستراو بپەرسترێ، ئەوە شتێكی زۆر جێی سەرسوڕمانە! بەڵام بەڕاستیی ئەوە شایانی سەرسوڕمانە، كە كوفر و لە مرۆڤ دەكات، شتی لۆژیكیی پێ سەیر بێ، بەڵام شتی نالۆژیكیی پێ ئاسایی و یـ سایی بێ، لە ڕاستییدا ئیمان گەورەترین شتی ئەرێنیی و چاک، كە لە مرۆڤ پەیدای دەكات، ئەوەیە: بیركردنەوەی مرۆڤ ڕاست دەكاتەوە، كە شتەكان وەک خۆیان ببینێ، كوفریش یەكەمین شوێنەواری خراپ كە لە مرۆڤ دا پەیدای دەكات، ئەوەیە: چەشمەندازی تێک دەدە ت و، بەرچاویی لێڵ دەكات و، شتەكان وەک خۆیان نابینێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**دەرپەڕینی دەستڕۆیشتووەکانیان بۆ هاندانی خەڵکەکەیان و دەست هەڵنەگرتن لە پەرستراوەکانیان و، هێنانەوەی چوار جۆرە پاساوو، بەرپەرچدانەوەیان و پووچەڵکردنەوەی بیانوو و پاساوەکانیان و، هەڕەشەلێکردنیان و، بێبایەخ پێشاندانیان لە بەرانبەر سزاو تۆڵەی خوادا:**

﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا
سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ
فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ
﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا
هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ ﴾، دەستڕۆیشتووەکانیان دەرپەڕین، (**الإنْطِلَاقُ: مِنْ أَفْعَالِ الشُّرُوعِ**)، (**إنطلاق**) لە کردەوەکانی دەست پێکردنە، (**المَلَأ: سَادَةُ القَوْمِ**)، (**مَلأ**) واتە: گەورەکان و بڕیار بەدەستان و دەستڕۆیشتووانی خەڵکەکە، (**إنطِلاق**)، لە کوردییدا دەبێتەوە بە دەرپەڕین، ئەوەیە کە ئینسان بە خێرایی لە شتێک ڕاپەڕێ، ئنجا دەستڕۆیشتووەکانیان ڕاپەڕین بە گورج و گۆڵیی و گوتیان:

٢)- ﴿ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ﴾، کە بەردەوام بن و خۆڕاگر بن لەسەر پەرستراوەکانتان، خەڵکەکەیان تیژ دەکردو هانیان دەدان، کە لەسەر بتپەرستیی و پابەند بوونیان بە پەرستراوە ساختەکانیان، بەردەوام بن، بۆ ئەوەی گوێ بۆ بانگەوازی خوا بە یەکگرتن نەگرن، ئنجا وشەی: (**اصبروا**) لە: ﴿ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ﴾دا (**ضُمِّنَ مَعْنَى اعْكُفُوا**)، واتە: پابەندبن بە پەرستراوەکانتانەوە، (**اصبِروا**) واتە: خۆڕاگربن و پێیانەوە پابەند

بن، چونکە (صَبر عَلَیه) مانای خۆڕاگریی دەگەیەنێ و، بە مانای پێوە پابەند بوونیش دەگەیەنێ، بە هۆی (عَلَی)وە، کە بەرکاری پێ خواستوە.

٣)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە شتێکە دەویسترێ، ئەمە پاساو هێنانەوەیە بۆ ئەوەی لە ڕستەی پێشێ دایە، کە گوتیان: ﴿ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ﴾، ئەمە شتێکە دەویسترێ، واتە: پیلانێکە لە دژمان دەگێردرێ.

٤)- ﴿ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ ﴾، ئەمەمان نەبیستوە لە کۆمەڵە خەڵکی دوایی دا، ئنجا (مِلّة) دەگونجێ مەبەست پێی کۆمەڵە خەڵکێک بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی ئایینێک بێ، کە کۆمەڵە خەڵکێک تەبەنییان کردوە، (الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ)ش دەگونجێ مەبەست پێی ئایینی نەصڕانیی بێ، کە لە لایەن نەصڕانییەکان تەبەنیی کرا بوو، لەوێدا شتی وا نەبووە، کە بە داخەوە دوای بەرزکردنەوەی عیسا ﷺ و لە دونیادا نەمانی، ئایینەکە گۆڕدراو سیانیی (تثلیث)ی تێخرا: (الأب، والإبن، والرُّوح القُدُس) واتە: ئەو خوا بە یەکگرتنە لە نێو دوا ئاییندا نەمان بیستوە.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: مەبەست لە (المِلَّةُ الأخِرَة) واتە: دوا پشت و دوا جیلی خۆیان کە پێیان وا بووە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن ﷺ، ئەو ئایینەی کە پێیان گوتوە (الحنیفیة)، پاک و بێگەرد، کە بە دڵنیاییەوە پێشتر باب و باپیریان لەسەر ئایینی ئیبراهیم بوون، بەڵام دوایی لایان داوە بۆ هاوبەش دانان و بتپەرستیی.

٥)- ﴿ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴾، ئەمە بەس شتێکە هەڵبەستراوەو، درۆیەکی داتاشراوە.

٦)- ﴿ أَأُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِن بَيْنِنَا ﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا بیرخەرەوە بۆ ئەو دابەزێنراوە؟ واتە: لە کاتێکدا ئێمە هەین، ئەو هەڵبژێردراوە بەسەر ئێمەدا؟ ئەمە وەک ئایەتی (٣١)ی سوورەتی (الزُخرف)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: (گوتیان:) دەبووایە ئەم قورئانە لەسەر پیاوێک لە دوو پیاوی دوو شارە گەورەکە دابەزیبایە، کە (طائف)و (مکّة) بوون، پێیان وا بووە: چونکە موحەممەد ﷺ لە ڕووی ماددییەوە توانایی باش نیە، شایستەی ئەو پۆستە نیە، وایانزانیوە: کێ

پارەی زۆر بێ، دەبێ پێگەی بەرزتر بێ! بێ ئاگا لەوەی زۆرجار پارەی زۆر لەسەر حیسابی ڕێزو حورمەت و دیوی مەعنەویی مرۆڤ پەیدا دەبێ، زۆر کەس ئابڕوو و ڕێزی دنیاو قیامەتی خۆی لەسەر پارە دادەنێ، لەسەر کۆکردنەوەی سەروەت و سامان دادەنێ، حەڵاڵ و حەرام ڕەپێچەک دەدات و، حەیاو حورمەتی خۆی پێدەدات!

بۆیە خوا ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوە بەوە کە دەفەرموێ:

٧)- ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّن ذِكْرِي﴾، بەڵکو ئەوان لە دوو دڵییدان لە بەرنامەو یادی من، واتە: لەبەر ئەوە نیە کە موحەممەد ﷺ کەم و کوڕییەکی تێدا بێ و شایستەی ئەوە نەبێ، بەڵکو ئەوان دانوویان لەگەڵ بەرنامەو یادی من دا ناکوڵێ، چ لەگەڵ ئەو بەرنامەیەی کە بە موحەممەددا ﷺ ناردوویەتی! چ یادی خواو بەرنامەی خوا بە گشتیی! یانی: هەر بە گشتیی بڕوایان بەوە نەبووە، خوا ﷻ پەیام و بەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤەکان بنێرێ، بۆ ڕێکخستنی ژیانیان، ئەوان جۆرێک لە عەلمانییەتیان تەبەننیی کردوە، سیکۆلاریزم دەڵێ: خوای مافی ئەوەی نیە دەستوەرداتە ژیانی بەشەر، بەشەر بۆ خۆیان ژیانی خۆیان ڕێک دەخەن، ئنجا خوا دەفەرموێ: هۆکاری لاملییان لە پێغەمبەر ﷺو، هۆکاری بێبڕواییان بە پەیامی من ئەوەیە، کە لە دوو دڵییدان لە بەرانبەر پەیامەکەی مندا، نەک لەبەر ئەوەی موحەممەد ﷺ شایستە نیە.

٨)- ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ﴾، بەڵکو جارێ سزای منیان نەچێژتوە، ئەو (بَلْ)انە، هەموویان بۆ (إِضْرَاب)ن، یانی: گواستنەوە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی سەرتر، بەڵکو هێشتا سزای منیان نەچێژتوە.

وشەی (لَمَّا)ش - لێرەدا - بۆ لابردنی شتێکە کە ئەگەری هەبێ ئەو شتە ببێ، بەڵام جارێ نەهاتوە، واتە: جارێ سزای منیان نەچێژتوە، بەڵام چاوەڕێ دەکرێ سزای منیان بۆ بێ، ئەگەر سزای منیان بچێژتبایە، ئاوا بوێرو بێ باک و بێ منەت نەدەبوون، لە بەرانبەر من و پەیامەکەم و ئەو هەڕەشانەدا کە لێیان دەکەم، بە هۆی گوێ نەگرتن لە پەیامەکەی منەوە.

٩)- ﴿ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ﴾، یان ئایا عەمبارەكانی بەزەیی پەروەردگاری زاڵی بەخشەرت لەبەر دەستی واندان؟ تاكو بە كەیفی خۆیان بیدەن بە كەسێک و، نەیدەن بە كەسێكی دیكە؟! ئەمەش گواستنەوەیەكی دیكەی سێیەمە.

١٠)- ﴿ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ﴾، ئەمەش گواستنەوەی چوارەمە بۆ شتێكی دیكە: یان ئایا حوكمی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیشیان هی ئەوانەو، ئەوان حوكمڕان و خاوەنن؟! ئەگەر وایە:

١١)- ﴿ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ ﴾، ئنجا با بە هۆكارەكان سەربكەون و بەرزبنەوەو هەڵكشێن بۆ ئاسمان، كە بە تەئكید ئەمە فەرمانێكی دەستەوەستانكەر (أمر تعجيزي) ە، پێشتریش گوتمان: (أَسبَاب) كۆی (سَبَب)ە، (سَبَب)یش ئەو پەت و گوریسە بووە، كە پێیدا سەركەوتوون بۆ سەر دارخورما، بۆ چنینی بەرەكەوی بۆ متووربە كردنی.

١٢)- ﴿ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٌ مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾، ئەوانە سەربازانێكی كە من لەولا تێشكاون لە حیزبەكان، (ما) لە (جُندٌ مَا)دا: (حَرْفٌ زَائِدٌ يُؤَكِّدُ مَعْنَى مَا قَبْلَهُ، فَهِيَ تَوْكِيدٌ)، پیتێكی زیادكراوە مانای پێشەوە جەخت دەكاتەوە، كە بریتییە لە: بێبایەخ و كەم پێشاندانیان، كە دەفەرموێ: (مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ) ئەو سەربازانە لە حیزبەكانن، لەو حیزبانەی بە درێژایی مێژوو دژی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بوون و دژی پەیامی خوا بوون، بەڵام سەرەنجامیان فڕێ درانە زبڵدانی مێژوو بووە، كە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾ (أي: أَيْ الجَمَاعَاتُ المخَالِفَةُ للأَنْبِيَاء)، ئەو كۆمەڵانەی سەرپێچییكارو ناكۆک بوون لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام).

## سەرنجدانێکی وردتر لەو ئایەتانە:

ئێستا با سەرنجێکی وردتر لەم ئایەتە موبارەکانە بدەینەوە:

١)- (إبنُ العَجيبة) لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: کە گوتوویانە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ﴾، پێنج واتای بۆ لێکدراونەوە، کە بە بۆچوونی من هەر پێنجیان گونجاون، بەڵام کامیان لە کامیان گونجاوترە؟ شوێنی هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنە:

یەکەم: (مَا سَمِعْنَاهُ مِنْ مُحَمَّد مِنَ التَّوْحِيدِ وَنَفِي الشِّرْكِ، يُرَادُ إنفاذُهُ مِنْ قِبَلِ مُحَمَّد، فَلَا رَجْعَةَ عَنْهُ)، ئەوەی لە موحەممەدمان بیستوە، لە خوا بە یەککرتن و لابردنی هاوبەش بۆ خوا دانان، ئامانجێکە لە لایەن موحەممەدەوە دەویسترێ جێبەجێ بکرێ و لێی ناگەڕێتەوە، واتە: ئەو ئەو زۆر سەرسەختە لە دەست گرتن بە خوا بە یەککرتنەوە، نەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! ئێوەش دەست بە پەرستراوەکانی خۆتانەوە بگرن!.

دووەم: (هَذَا شَيءٌ يُرِيْدُهُ اللهُ، فَلَا مَرَدَّ لَهُ) ئەوە شتێکە خوا دەیەوێ و بەرپەرچدانەوەی بۆ نیە.

(بەڵام من پێم وایە ئەم مانایەیان دوورە).

سێیەم: (هَذَا شَيءٌ مِنْ نَوَائب الدَّهْرِ)، ئەمە بەڵایەکەو بە ملماندا داهاتوە، ئامانج لەوەش ئەوەیە کە ئێمە تووشی زیان ببین، بۆیە دەبێ خۆ ڕابگرین بۆ ئەو بەڵایەو، شانی بدەینە بەرێ.

چوارەم: (دِيْنُكُمْ يُرَادُ وَيُطْلَبُ أَخْذُهُ مِنْكُم)، ئایینەکەتان دەویسترێ لێتان وەربگیرێ و لێتان تێک بدرێ.

وەک چۆن فیرعەون کاتی خۆی کە مووسا ﷺ چوو بۆ لای خەڵکی میسر گوتی: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ٢٦﴾غافر، واتە: من دەترسێم ئایینەکەتان لێ تێکبدات، یاخود ئاشووب و ئاژاوە لە نێو وڵاتدا پەیدابکات، یانی: دینتان تێکبدات، یان ژینتان، یانی: فیرعەون دین و ژینی

---

(١) البَحر المَديد في تَفسيرِ كِتابِ الله المَجيد: ج٦، ص٢٠٣.

خەڵکەکەی زۆر چاک ڕەتیو هێناوە! کە دینەکەیان بریتی بوو لە پەرستنی فیرعەون، کە دەیگوت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي﴾القصص، یان دەیگوت: ﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾النازعات، ژینەکەشیان ئەوە بووە کە سوخرەبێکاریان پێکراوە، بە تایبەت نەوەی ئیسرائیل و، خەڵکەکەی دیکەش هەمووی بە چاوی کۆیلە سەیر کراون!

پێنجەم: (مَا مُحَمَّد يَفْعَلُه، شَيءٌ يُتَمَنّى وَيُرِيدُهُ كُلُّ أَحَدٍ)، ئەوەی موحەممەد دەیکات، شتێکی خوازراوەو، هەموو کەس دەیەوێ.

ئەویش ئەوەیە کە خۆیتان بەسەرتان دا فەرز بکات و بسەپێنێ، بە بیانووی هێنانی ئایینی خوا بە یەکگرتنەوە!

٢)- ئەگەر سەرنجی قسەکانی کافرەکان بدەین، دەبینین چوار بیانوویان هێناونەوە، گوتوویانە:

١- ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ﴾، ئەمە کارێکە دەویسترێ، بەو چەند واتایەی لێکمان دایەوە.

٢- ﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾، ئەوەمان لە ئایینی ئیبراهیم، یاخود دوا کۆمەڵگا و جیلی خۆمان نەبیستوە، یان: دوا ئایین و پەیامی خوا، کە بۆ نەصرانییەکانیان هاتوە، شتی وای تێدانیە.

٣- ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ﴾، ئەوە بەس هەڵبەستراوە.

٤- ﴿أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَا﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا پەیامی خوا بۆ سەر وی دابەزێنراوە؟ کە شایستەش نیە.

٣)- ئنجا خوای پەروەردگار لە بەرانبەر ئەو چوار پاساوەدا، کە هەموویان قسەی هیچ و بۆشن:

أ- کە گوتوویانە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ﴾، بێگومان موحەممەد ﷺ نەیویستوە زیانیان لێ بدات، ویستوویەتی دەربازیان بکات لە دنیادا، لە کۆیلایەتیی و چینایەتیی و، لە

خۆسەپاندنی هەندێک بەسەر کۆمەڵێکداو، لە قۆرخکردنی سامان لە لایەن هەندێکەوە، لەوە دەربازیان بکات و، نیعمەتەکان بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی خۆیان کە خەڵکە.

ب- کە گوتوویانە: ﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ﴾، ئەوەش درۆ بووە، هەم ئیبراهیم ﷺو، هەم عیسا ﷺو هەم پێغەمبەران لە ئایینی خۆیان دا، خوا بە یەکگرتنیان هێناوە، هیچ کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بێجگە لە خواپەرستیی، شتێکی دیکەی نەهێناوە.

ج- کە گوتوویانە: ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ﴾، ئەمە شتێکی هەڵبەستراوە، هەڵبەتە موحەممەد ﷺ هەتا گەیشتووەتە تەمەنی چل (٤٠) ساڵیی، هیچی نەفەرمووە، لە دوای چل ساڵییەوە فەرموویەتی: (من نێردراوی خوام)، ئنجا ئەگەر هەڵبەست بووایە، زووتر هەڵیدەبەست!، پاشان موحەممەد ﷺ هیچ شتێکی لێ دەرنەکەوتوە لە پێش تەمەنی چل ساڵیی دا، تاکو خوا پابەندی کردوە بەو ئایین و پەیامەوە.

د- پاشان کە دەڵێن: ﴿أَأُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِن بَيْنِنَا﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا (ذِکر) بۆ وی دابەزێنراوە؟! بەڵێ، ئەو کات و دواتر و ئێستاش و هەتا دنیادنیایە نەک تەنیا لە نێو کۆمەڵگای عەرەبدا، بەڵکو لە نێو هەموو مرۆڤایەتیی دا وەك موحەممەد  شایستەی تێدا نەبووەو نابێ، هەر پێغەمبەرێک لە ڕۆژگاری خۆیدا، شایستەترینی کۆمەڵگای خۆی بووە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾الأنعام، واتە: خوا دەزانێ پەیامی خۆی لە کوێدا دادەنێ.

ئنجا خوای کاربەجێ چوار جۆرە وەڵامیان دەداتەوە:

١- ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّن ذِكْرِي﴾، بەڵکو ئەوان لە دوو دڵییدان لە یادی من و بەرنامەی من، کە پێیان وانیە خوای دادگەر پەیامێکی نارد بێ، بۆ ڕێکخستنی ژیانی بەشەر، یاخود لەو پەیام و بەرنامەی بە موحەممەددا ﷺ نێردراوە، لە دوو دڵیی دان، نەک موحەممەد ﷺ کەم و کوڕییەکی هەبێ و شایستە نەبێ.

٢ ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ﴾ بەڵکو جارێ سزاو ئازارو تۆڵەی منیان نەچێژتوە، بۆیە وا بێ منەت و بێ باکن.

٣- ﴿أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ﴾ ئایا عەمبارەکانی بەزەیی پەروەردگاری باڵادەستی بەخشەر لە لای وانن، تاکو بە کەیفی خۆیان بدەن بەوو نەیدەن بەوی دیکە؟! نەخێر!.

٤- ﴿أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ﴾ یان ئایا حوکمی ئاسمان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان لەبەر دەستی وانە؟! ئەگەر وایە با سەربکەون! کە بە دڵنیاییەوە ئەوە بە توانجەوە فەرمان پێکردنە، زانایان دەڵێن: (أمرٌ لِلتَّعْجِيز)، فەرمانە بۆ دەستەوسان کردن، واتە: ئێوە بچنە سەرێ، بڕیار بۆ خەڵکی بدەن داخۆ چی بکرێ و چۆن بکرێ؟

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**سەرنجڕاکێشان بۆ مێژووی شەش لە گەلانی پێشوو، کە پەیامی خوایان بە درۆ داناوەو، خواش سزای داون و، هۆشداریی دان بە بێبڕوایان، کە ئەوانیش تەنیا چاوەڕێی هاڕژن و دەنگێکی بێبڕەزا دەکەن، کە یەک تاو زیاتری پێ ناچێ و پێی ناوەخرێ:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ ﴾، لە پێش واندا گەلی نووح بە درۆیان دانا.

لێرەدا بەرکار (**مفعول بە**)ی (**كَذَّبَتْ**)، فڕتێنراوە، چونکە لە دواییدا ڕوونی دەکاتەوە، ئەوەی بە درۆیان داناوە چییە؟ ئەویش هەر لە فەرمایشتی خوادا کە دەفەرمووێ: ﴿ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ ﴾، واتە: هیچ کامیان نەبووە، مەگەر هەموو پێغەمبەرانی بە درۆ داناون، ئنجا بە دڵنیاییەوە هەر کامیان لە ڕۆژگاری خۆیدا پێغەمبەرێکی بە درۆ داناوە، بەڵام بۆیە خوا دەفەرمووێ: هیچ کامیان نەبووە، مەگەر پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، چونکە کەسێک پێغەمبەرێک بە درۆ دابنێ، وەک ئەوە وایە هەموویانی بە درۆ دانابێ، چونکە پەیامی پێغەمبەران هەمووی وەک یەکێکە، لە نێوەڕۆک و جەوهەردا یەکێکە، لە هێڵە گشتییەکانی دا یەکێکە.

٢)- ﴿ وَعَادٌ ﴾، گەلی (عاد)یش، وەک پێشتر گوتمان: گەلی (عاد) پێغەمبەرەکەیان ناوی (هود) بوو، ئێمە بەسەرهاتی (عاد) و گەلەکەیمان لە سوورەتی (هود)دا بە درێژیی هێناوە.

٣)- ﴿وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ﴾، هەروەها فیرعەونی خاوەن گوڵمیخان، یان: خاوەن قەڵاو کۆشکان: ئەویش پێغەمبەرانی بە درۆ دانان، ئەو مووساو هاڕوونی (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە سەردەمی خۆی دا بە درۆ دانان، ئەوانیش دوو نموونە بوون لە پێغەمبەرانی خوا، وشەی (ذُو)، واتە: خاوەن، (أَوْتَاد)، کۆی (وَتِد) یان (وَتَد)، بە مانای سینگ و گوڵمیخ، دێ، (عُودٌ غَلِيظٌ لَهُ رَأْسٌ مُفَلْطحٌ يُدَقُّ فِي الأَرْضِ لِيُشَدَّ بِهِ الطُّنُبُ)، دارێکی چڕەو سەرێکی پانی هەیە، لە زەویدا دەچەقێنرێ تاکو ئەو پەتەی لە ڕەشماڵێک بەستراوە پێی ببەسترێتەوەو، جار وایە وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە.

١- مەبەست لە خاوەن سینگ و گوڵمێخ (ذو الأوتاد) دەگونجێ ئەوەبێ کە فیرعەون سینگ و گوڵمیخی بەکار هێناون بۆ ئەشکەنجە دان و ئازاردانی خەڵک، لە کوردەواریی خۆماندا دەگوترێ: «فڵان کەسیان چوار مێخە کێشا»، فیرعەون عادەتی وا بووە بە دار خورمایەکەوە، یان بە دیوارێکەوە کەسێک ویستبی بیکوژێ بە ئەشکەنجەدان، چوار مێخەی کێشاوە، واتە: بزمارێک لە سەر دەستێک و، بزمارێک لە سەر دەستەکەی دیکەی، بە هەمان شێوەش لە سەر پێیەکانی و، کردوویەتی بە ڕەسم تاکو گیانی دەرچووە!!

٢- واتایەکی دیکەی: (أَوْتَاد)، ئەوەیە کە خوازراوەتەوە بۆ ئەو حوکمڕانیی و دەسەڵاتەی کە فیرعەون فەڕزی کردوە.

٣- واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە مەبەست پێی بینا بەرزەکانن، ئەو هەڕەمانەی کە بە (أَهرَام) کۆدەبێتەوە، کە وەک گۆڕ بۆ فیرعەونەکان، دروستکراون.

شایانی باسە: ئەو فیرعەونەی کە لەو ئایەتەدا مەبەستە، فیرعەونێکە کە لەگەڵ مووسا و هاڕووندا ڕووبەڕوو بۆتەوەو پێی گوتراوە: (مَنفَتاح الثَّاني)، کە بەنوو ئیسرائیل لە ڕۆژگاری ئەودا لە میسر دەرچوون، ئەویش لە پادشاکانی خێزانی نۆزدەیەمە، لە ڕیزبەندیی ئەو خێزانانەدا کە حوکمڕانیی میسریان کردووە، ئەو خێزانی نۆزدەیەمە، ناسراو بوونە بەوەی کە بینایان زۆر دروست کردوون، ماوەی حوکمڕانییەکەیان (١٤٧) ساڵ بووە، لە ساڵی (١٤٦٢)ی پێش زایین تاکو (١٢٨٨)ی پێش زایین، کتێبە مێژووییەکان وا دەڵێن.

٤)- ﴿ وَثَمُودُ ﴾، هەروەها گەلی (ثمود)یش بە درۆیان دانا، (پەیامی خوا)، گەلی (ثمود) کە پێغەمبەرەکەیان ناوی صاڵح ﷺ بوو، ئێمە بەسەرهاتی صاڵح و گەلەکەیمان لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا، بە تەفصیڵ باسکردوە.

٥)- ﴿ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴾، هەروەها گەلی (لوط)یش، پەیامی خوایان بە درۆ دانا، گەلەکەی (لووط) هەر بە ناوی خۆیەوە ناونراوە، ئەگەرنا لووط خۆی خەڵکی عێراق بووەو لە ئووری کلدانییان نیشتەجێ بووە، چونکە برازای پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷺو غەریب بووە لەو شوێنەی کە بۆی چووە، کە فەڵەستین و شام بووە، بەسەرهاتی لووط ﷺ و گەلەکەیشمان لە تەفسیری سوورەتی (هود) دا هێناوە.

٦)- ﴿ وَأَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ﴾، هەروەها هاوەڵان، یاخود خاوەنانی باخەکە، یان درەختە چڕو پڕەکە، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی شوعەیب بووە، هەم بە (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)و، هەم بە خەڵکی (مَدْيَن)یش ناسراون، ئنجا ئایا خەڵکەکە خەڵکی شاری مەدیەن بوونەو، گەلەکەش هەر پێی گوتراوە: مەدیەن و ئەو باخەشیان هەر هەبووە؟ هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ئەوانە دوو گەل بوون و تاکە پێغەمبەرێک کە بۆ دوو گەلان نێردرا بێ، شوعەیب بووە، هەم بۆلای خاوەنانی باخەکە (أصحاب الأيكة) نێردراوەو، هەم بۆ لای خەڵکی (مدين)یش، ئێمە بەسەرهاتی شوعەیب و گەلەکەیمان لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا بە درێژیی هێناوە.

٧)- ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴾، ئا ئەوانەن ئەش کۆمەڵەکان. (التَّعْرِيفُ فِي الأَحْزَابِ لِلقَصْرِ أَي: هُمُ الَّذِينَ بَلَغُوا الكَمَالَ فِي الحِزْبِيَّةِ المَذْمُومَةِ ضِدَّ الأَنْبِيَاءِ)، (أحزاب) ئەلیف و لامی ناساندنی لەسەرە، ئا ئەوانەن حیزبەکان! ئەمە مانای کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: هەر ئەوانەن کە لە کۆبوونەوەدا لە دژی پێغەمبەران گەیشتبوونە لووتکە، یانی: هەر ئەوانە حیزب و تاقمی تێرو تەواو بوون لە دژایەتیی کردنی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

٨)- ﴿ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ ﴾، هیچ کامیان نەبوو مەگەر پێغەمبەرانی بەدرۆ دانان.

ئەم (إِنْ)ە، لابەرە (نَافِية)یە، واتە: (ما كُلٌّ)، تەنوینی سەر (كُلٌّ) قەرە بوویە بۆ پاڵوە لادراو (مُضَافٌ إِلَيه) کە بریتیە: لە (هُم) واتە: (ما كُلُّهُم إلاّ كَذَّبَ الرُّسُلَ)،

هیـچ کامیـان نەبـوون، مەگـەر پێغەمبەرانیـان هەموویـان بـە درۆ دانـاون، لێـرەدا ﴿ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ ﴾ هـەم بـەرکار (مفعـول بـە)ی (كذبـت) لە: ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ ﴾، هـەم هـی هـەر پێنجەکـەی دیکـە: (وعـاد) و (ثمـود) و (فرعـون ذو الأوتـاد)و (قـومُ لـوط) و (أَصْحَـابُ لَئيْكَـةِ)، بـەرکاری (كَـذَّبَ) ڕوون دەکاتـەوە، کـە بریتـی بـووە لـە بـە درۆ دانانـی پێغەمبـەران و، ئـەو پەیامـە خواییـەی پێیـان دا نێـردراوە.

٩)- ﴿ فَحَقَّ عِقَابِ ﴾، ئنجا سزای منیان لە سەر چەسپا، ئەم (ف)یە، دەگونجێ:

أ- بۆ تەعقیب بێ، یانی: یەکسەر دوای ئەوەی پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، سزای منیان لەسەر چەسپی، ﴿ عِقَابِ ﴾، لە بنەڕەت دا (عِقَابِي)یەو (ي)کە لادراوەو و کەسرە لە شوێنی دانیشتوە، (أي: ثَبَتَ وَوَجَب عِقَابِي عَلَيْهِم)، چەسپاو و پێویست بوو سزای من لەسەریان.

ب- دەشگونجێ (ف)یەکە بۆ بە دواداهاتن (فَاءُ التَّعقِيب) بێ.

ج- دەشگونجێ (فاءُ الجزائية) بێ، واتە: لە سزای ئەوەدا کە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، سزای منیان لەسەر پێویست بوو.

١٠)- ﴿ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾، تا ئەوانەش {ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری موحەممەد ﷺ لە عەرەب و غەیری عەرەب، هی ڕۆژگارەکانی دیکەش} ئەوانە هەموویان چاوەڕێ ناکەن، مەگەر یەک هاڕژن، یەک دەنگی گەورە، ﴿ وَمَا يَنظُرُ ﴾، (مَا يَنْظُر) بە پێی سیاق دەگونجێ بە مانای: تەماشا ناکەن و، دەشگونجێ بە مانای چاوەڕێ ناکەن، بێ، بەڵام لێرەدا بە مانای چاوەڕێ کردنە، واتە: ئەوانە چاوەڕێ ناکەن بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بە پلەی یەکەم، ﴿ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾، جگە لە هاڕژنێکی گەورە، دەنگێکی گەورە، کە لە دوای فووکردنی یەکەمی ئیسرافیل بە (صور)دا پەیدا دەبێ،

١١)- ﴿ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴾، یەک تاو ناوەخرێ. (فَوَاق) خوێندراوەتەوەو (فُوَاق)یش خوێندراوەتەوە، هەم بە سەر، هەم بە بۆر، (الْفَوَاقُ وَالفُوَاقُ: إِسْمٌ لِمَا بَيْنَ حَلْبَتَي حَالِبِ

**النَّاقَة، وَرَوْعَتَي فَصِيلِهَا، وَاللَّبَنُ المُجْتَمِعُ فِي تِلْكَ الحِصَّةِ يُسَمَّى: الفِيقَة وَالجَمْعَ: أَفَاوِيق)**، **(فَوَاق)** و **(فُوَاق)** ناون بۆ ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان دوو دۆشین، دۆشینی حوشتر، (دەشگونجێ غەیری حوشتریش بێ، مەڕ بێ، بزن بێ، مانگا بێ، گامێش بێ)، هەروەها بەو ئەو دوو مژینەش دەگوترێ کە بەچکەکەی دەیمژێ، [کە بەچکەی حوشتر پێی دەگوترێ: **(فَصيل)** و، کارو بەرخ، کە بزن و مەڕ دەمژن و، گۆلک و پاڵاخ، کە مانگاو گامێش دەمژن، ئنجا ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان ئەو دوو مژینانەوە کە جارێک مژێکی لێدەدات، قومێکی لێدەدات، دوایی ماندوو دەبێ و دەمی لێدەکاتەوە، دوایی دووبارە دەمی بۆ دەباتەوە، ئەو ماوەیە پێی دەگوترێ: **(فُوَاق)**، هەروەک کەسێکیش کە گوانەکەی دەدۆشێ، ڕایدەگوشێ تاکو شیری لێ بێتە خوار، دوایی بەری دەدات تاکو شیری تێبێتەوە، ئەو ماوەیەش پێی دەگوترێ **(فُوَاق)** و **(فَوَاق)**] ئەو شیرەش کە کۆدەبێتەوە لەو کاتەدا پێی دەگوترێ **(فِيقَة)** کە بە **(أَفَاوِيق)** کۆدەکرێتەوە.

**(أَي: لَيسَ بَعْدَهَا إِمْهَالٌ بِقَدَرِ الفَوَاقِ أو الفُوَاق)**، دوای ئەوەی ئەو هاڕژن و چریکەیە دێ، مۆڵەت نادرێن بە ئەندازەی مژ لێدانێک، یان بە ئەندازەی دادۆشینێک، واتە: ماوەیەکی کەمیشی ناکەوێتێ، دوای ئەو چریکەیە، یەکسەر لە بەین دەچن، یاخود: هاتنی ئەو دەنگ و چریکەیە، ماوەکەی زۆر زۆر کەمەو لە چاو تروکانێکدا ئەوە دەقەومێ، پێشتریش باسمان کردوە لە تەفسیری سوورەتی **(الأعراف)**دا، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسێک پارووی بەرز کردۆتەوە بۆ زاری، ناگا پاروەکە بخاتە دەمی، دنیای بەسەردا کاول دەبێ.

١٢)- ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا ﴾، (بێبڕوایەکان) گوتیان: پەروەردگارمان! پشک و بەشی خۆمانمان لە سزا بۆ پێشبخە، **(القِطُّ: القِسْطُ مِنَ الشَّيءِ، وَقِطْعَةُ الوَرَقِ الَّتِي يُكْتَبُ عَلَيْهَا العَطَاءُ لأَحَدٍ)**، **(قِطٌ)** بە بەشێک لە شتێک دەگوترێ، هەروەها بە پارچە کاغەزێک دەگوترێ کە بەخششێکی بۆ کەسێک لێ دەنووسرێ **(أَي: نَصِيبَنَا مِنَ العَذَاب)** بەشی خۆمان لە سزا، بە پەلە بۆمان بێنە.

١٣)- ﴿قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾، پێش ڕۆژی لێپرسینەوە، کە ئەمە گێڕانەوەی قسەی وانەو خوا ﷻ قسەکەیان دەگێڕێتەوە، کە گاڵتەیان بە زیندووبوونەوەو سزاو پاداشت کردوە، گاڵتەیان بە هاتنی قیامەت کردوە، بۆیە وا بەبێ باکیی گوتوویانە: پەروەردگارمان! بەش و پشکی ئێمە لەو سزایەدا هەیە، پێش قیامەت بۆمان بێنە، پێش ڕۆژی لێپرسینەوە بۆمان بێنە، واتە: بڕوامان نیە کە ببێ، بۆیە وا بە بێمنەتیی و بە ملهوڕیی تەحەددایان کردوە کە نەخێر ڕاست نیە! ئەگەر هەیە بیهێنە، وەک لە جێی دیکەش زۆریان واگوتوە.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی پارمەتییـمان بـدات پەنـد وەربگریـن لـە گەلـە ملهـوڕەکان، لـە گەلـە یاخییـەکان، کـە پەیامـی خوایـان کـە بـە پێغەمبەرانـدا (عَلَيۡهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) ناردوویەتـی، بەدرۆیـان داناوەو، سـەرەنجام خۆیان تووشـی ڕۆژڕەشـیی کـردوە، خۆیـان تووشـی ژیـن تاڵیـی دنیـاو شـپرزە حاڵیـی قیامـەت کـردوە، خـوا ئێمـە لـەوە بپارێـزێ و، خـوا پارمەتییـمان بـدات بـە دڵ و گیـان هەوڵبدەیـن بە عەقڵ و هۆش زیاتـر لـە پەیـام و بەرنامـەی خـوا تێبگەیـن و، بـە دڵ و دەروون زیاتر ئـەو پەیامە قبووڵ بکەیـن، پەسـندی بکەیـن، وەریبگریـن، تامـی لێبکەیـن و، بـە زمـان دانـی پێدابنێیـن، بیگەیەنیـن، ڕوونـی بکەینـەوەو، بـە ئەندامەکانیشـمان جێبەجێی بکەین، هـەم لە ژیانی تاکیـی خۆمـان دا، هـەم لـە ژیانـی خێزانییـمان دا، هـەم لـە ژیانـی کۆمەڵایەتییـمان دا و، هـەم لـە ژیانـی سیاسـییماندا، بێگومـان خـوا ﷻ هەمـوو پێغەمبەرانـی (عَلَيۡهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) نـاردوون و هەمـوو پەیامەکانـی خـۆی دابەزانـدوون، بـۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان ڕێـی ڕاسـت بگـرن و، سـەرەنجام بەختـەوەری دنیـاو سـەرفرازی ڕۆژی دوایـی بـن، ئەگەرنا خـوا ﷻ نـە بـە بەندایەتیـی و چاکـەی مرۆڤـەکان سـوودێکی پێدەگات، نـە بـە هـۆی گوناهـو تـاوان و لادانیشـیانەوە زیانێکـی پێـدەگات، ئـەوە مرۆڤەکانـن کـە ئەگـەر ڕێـی خـوا بگـرن، خۆیـان بەختـەوەرو بەهرەمەنـد دەبـن و، ئەگـەر لـە ڕێـی خـواش لابـدەن، خۆیـان زەرەرمەنـدو ژیـن تـاڵ و بەدحـاڵ دەبـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنۡ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سـێزدە (١٣) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١٧ - ٢٩)، کـە تەرخانکـراون بـۆ باسـکردنی ژمارەیـەک لـە نیعمەتـەکانی خـوا ﷻ لەسـەر داوود ﷵ و، بەسـەرهاتێکی تایبـەتی داوود کـە تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوەو، مایـەی مشـت و مـڕی زۆری نێـوان زانایـان بـووە، بـە بۆچوونی مـن، بەهـۆی کارتێکراوبـوونی هەندێکیان و، کەوتنـە ژێـر کاریگەریـی هەندێـک قسـەو قاڵـی جوولەکـەو نەصرانییەکانـەوە، کـە پوختـەی بەسـەرهاتەکەش کێشـەی خـۆ بردنـە لای داوودی دوو کـەسی ناکۆکـە، کـە خۆیـان بـە بـرای یەکدیـی ناسـاندوەو، دوای خسـتنە ڕووی کێشـەکە لەلایـەن دەعواکـەرەوە، بـە شـێوەیەکی ورووژێنـەر، یەکسـەر داوود هەڵچـوەو، بڕیـاری ستەمکاربوونی بەسـەر بابـای دەعـوا لەسـەردراودا داوەو، بـەو بۆنەیەشـەوە خـوا ﷻ ئامۆژگاریـی و لۆمـەی داوودی کـردوە، کـە لـە دادوەرییـدا دەبـێ وریابـێ و، شـوێن سـۆزو نـارەزوو نەکـەوێ، نەگەرنـا لـە ڕاسـتە ڕێ لا دەدات.

﴿ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ١٧ إِنَّا سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ
يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ ١٨ وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ ١٩ وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ
ٱلۡحِكۡمَةَ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ ٢٠ ۞ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ ٢١ إِذۡ
دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا
بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ٢٢ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ
وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ٢٣ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ
وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ
مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ ۩ ٢٤ فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ

وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم
بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَـٰطِلًا ۚ
ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ إِلَيْكَ
مُبَـٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَـٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٢٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد ﷺ!) لە بەرانبەر ئەوەدا کە بێبڕوایان دەیڵێن (لە قسەی پووچ و خراپ) خۆڕاگربەو، یادی بەندەکەمان داوودی خاوەن توانا بکە، بێگومان ئەو زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا) ﴿١٧﴾ ئێمە چیایەکانمان بۆ داوود ملکەچ کردبوون، ئێواران و دەمەو خۆرهەڵات (خوا) بە پاکگرتنیان لەگەڵدا دەکرد ﴿١٨﴾ هەروەها باڵندەکانیشمان (بۆ داوود ڕام و دەستەمۆ کردبوون و) کۆکراوەبوون و، هەرکامیان زۆر بۆ لای داوود گەڕاوە بوو (فەرمانبەرو ملکەچی بوو) ﴿١٩﴾ هەروەها حوکمڕانییەکەیمان بەهێز کردبوو و، حیکمەت و قسە ڕوونییمان پێدابوو ﴿٢٠﴾ ئایا هەواڵی (خەڵکە) ناکۆکەکەشت بۆ هاتوە؟ کاتێک وەسەر دیواری میحرابەکە(ی داوود) کەوتن ﴿٢١﴾ کاتێک (کت و پڕ) لە داوود وەژوور کەوتن، ئەویش بە هۆی (کت و پڕ وە ژوور کەوتنی) وانەوە، داچڵەکی، (ئەوانیش) گوتیان: مەترسە، دوو کەسی ناکۆکین، یەکمان ستەمی لەوی دیکەمان کردوە، ئنجا تۆ بە هەق دادوەرییمان لە نێوان دا بکەو، لامەدەو بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان بکە ﴿٢٢﴾ (یەکیان گوتی:) ئەمە برامە، نەوەدو نۆ مەڕی هەن و،

منیش یەک مەڕم هەیە، کەچی پێیگوتم: مەڕەکەت بخە ژێر ڕکێفی من و، لە دواندنیش دا بەسەرم دا زاڵ بوو ﴿٢٣﴾ داوود گوتی: بە دڵنیایی بە داواکردنی پێدانی مەڕەکەت، کە بیخاتە گەڵ مەڕەکانی، ستەمی لێکردووی و زۆرێک لە مرۆڤە تێکەڵەکانیش ستەم و دەستدرێژیی لەگەڵ یەکدیی دا دەکەن، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوون و، ئەوانیش کەمن، داوود (پاش دادوەرییە بە پەلەکەی) زانی کە ئێمە تاقیمان کردەوە، (بۆیە) یەکسەر داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کردو، بە ڕکووع دا کەوت و گەڕایەوە (بۆ لای خوا) ﴿٢٤﴾ ئێمەش لەو (هەڵوێستە هەڵەیە)ی لێمان بووری و، بێگومان لە لای ئێمەش نیزیکیی و سەرەنجامێکی هەرە چاکی هەیە ﴿٢٥﴾ ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لە زەویی دا، ئنجا بە هەق و دادگەرانە دادوەریی لە نێوان خەڵکدا بکەو، شوێن ئارەزوو و سۆز مەکەوە، ئەگەرنا لە ڕێی خوا ونت دەکات (ولات دەدا)، مسۆگەر ئەوانەی لە ڕێی خوا ون دەبن (ولا دەدەن) ئازارێکی توندیان هەیە، (لە ڕۆژی دوایی دا) لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لە بیرچووەو لێی بێ ئاگابوون ﴿٢٦﴾ ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیشیانمان پووچ (و بێ حیکمەت) دروست نەکردوون، ئەوە (کە گەردوون بێ حیکمەت و ئامانجە) گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوابوون، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان لە ئاگر(ی دۆزەخ) ﴿٢٧﴾ یان ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوون، وەک تێکدەران و خراپەکاران لە زەوی دا دادەنێین؟ یان ئایا پارێزکاران وەک تاوانباران دادەنێین؟ (ئەگەر ڕۆژی دوایی نەبێ مانای وایە ئەو جۆرە کەسە جیاوازانە، وەک یەک دانراون!) ﴿٢٨﴾ (ئەم قورئانە) کتێبێکە بۆ لای تۆمان دابەزاندوە، بە پێزو بەرهەمدارە (دامانبەزاندوە) تاکو لە ئایەتەکانی ڕامێنن و، تاکو خاوەن عەقڵانیش (بەهۆیەوە هەرچی ڕاستیی پێویستیانە) بیریان بکەوێتەوە (و پەند وەربگرن) ﴿٢٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ذَا ٱلۡأَيۡدِ): (أي: ذَا قُـوَّةٍ)، واتــە: خـاوەن هێـز، (ذَا) واتــە: خـاوەن، (أيـد) واتــە: قـووەت، هێـز، (أيـد) كـۆی (يَـد)ە، (أيْـدِي) واتـە: دەسـتەكان، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی هێـزە، چونكـە هەمـوو كـەس دەسـتی هـەن، بـەس هەمـوو كـەس ئـەو هێـزو پێـزەی نیـە، كـە پێویسـتیەتی بـۆ ئەنجامـدانی كارەكانی.

(أَوَّابٌ): (الأوَّابُ: كَالتـوَّابِ، وَهُـوَ الرَّاجِـعِ إلَى اللَّـهِ بِتَرْكِ المَعَـاصِي)، دەڵـێ: (أوَّابٌ) وەک (تـوَّاب)ە، كـە بریتیـە: لـە گـەڕاوە بـۆ لای خـوا، بـە واز لێهێنـانی گوناهـان.

(بِٱلۡعَشِيِّ): (العَـشِيُّ: مِـنْ زَوالِ الشَّـمْسِ إلَى الصَّبـاحِ)، (عَـشِيّ) لـەو كاتـەوە كـە خـۆر لـە نێوەڕاسـتی ئاسـمان لادەدات تاكـو بەرەبەيـان، پێـی دەگوتـرێ: (عَـشِيّ).

(وَٱلۡإِشۡرَاقِ): (الإشْرَاقُ: وَقْـتُ الإشْرَاقِ)، كاتی خــۆر هەڵاتنــە، دەگوتــرێ: (شَرَقَــتِ الشَّــمْسِ شُرُوقَــاً، أي: طَلَعَــت)، خۆرەكــە هــەڵات، كاتــێ خــۆر دەردەكــەوێ.

(ٱلۡحِكۡمَةَ): (إصَابَــةُ الحَــقِّ قَــوْلاً وَعَمَــلاً، أو حَقائِــقُ القُــرآن)، كــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَءَاتَيۡنَـٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ ﴾، حیكمـەت بـە موتڵەقیـی كـە دێ، واتـە: پێـكانی هـەق بـە قسـەو بـە كـردەوەو، لـە قورئانـدا زۆرجـار بـە مانـای ڕاسـتییەكانی قورئـان هاتـوە، ئەگـەر تەماشـای ئایەتـەكانی سـوورەتی (الإسراء)یـش بكەیـن، بۆمـان دەردەكـەوێ حیكمــەت واتــە: خــۆ بژاركــردنی مــرۆڤ لــە ڕەوشــت و ئــاكارە خراپــەكان و، خــۆ ڕازاندنــەوە بــە سـیفەتە بــەرزو ئــاكارە جوانــەكان.

(وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ): (فَصْـل) واتـە: لێـک جیاكردنـەوە (خِطَـاب) یـانی: دوانـدن، (مَـا فِيـهِ قَطْـعُ الحُكْـمِ، وَحكـمٌ فَيْصَـلٌ: الـكَلامُ البَـيِّنُ، الفَصْـلُ: إبَانَـةُ أحَـدُ الشـيئين)، دەڵـێ: ﴿ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ ﴾، شــتێكە كــە بڕیــاری یەكلایــی كــەرەوەی تێدابــێ، (وَحُكـمٌ

فَیْصَل) واتە: قسەیەکی ڕوون، (فَصْل): بریتیە لە لێک جیاکردنەوەی دوو شتان لە یەکدی، یاخود شتێک لە دوو شتەکان.

(اُلْخَصْمِ): (الخَصْمُ: مَصْدَرُ خَصَمتُهُ، أي: نَازَعْتُهُ خَصْمَاً)، (خَصْم)، چاوگە، لە (خَصَمتُهُ)ەوە هاتوە، (خَصَمتُهُ) واتە: ناکۆکییم لەگەڵدا کرد، یانی: (نَازَعْتُهُ)، ئنجا (خَصم) چاوگە، بەڵام لێرەدا بە مانای کۆمەڵە خەڵکێکی ناکۆک بەکارهاتوە.

(تَسَوَّرُواْ): (السُّورُ: الحَائِطُ، وَتَسَوَّرَ: صَعِدَ السُّورَ)، (سُور)، بە مانای دیوار دێ، یان دیواری حەوشە، یان هەر دیوارێک کە دەکرێ، وەک پەرژینێک، ئنجا (تَسَوُّر) بریتیە لەوەی بەسەر ئەو دیوارە بکەوی (وەسەر کەوتن).

(اُلْمِحْرَابَ): (المَسْجِدُ، أي: صَدْرُ المَجْلِسِ)، (مِحْرَاب) هەم بە مانای مزگەوت هاتوە، هەم بە مانای پێشەوەی کۆڕو مەجلیسێک هاتوەو، بە مانای ژوورێکی تایبەتیش هاتوە، کە مرۆڤ خوا پەرستیی تێدا بکات.

(فَفَزِعَ): (الفَزَعُ: إنْقِبَاضٌ وَنِفارٌ يَعتَرِي الإنْسَانَ مِنَ الشَّيءِ المُخِيفِ)، (فَزَع): بریتیە لە داچڵەکینێک و ڕێک هاتنێک، کە بەسەر مرۆڤدا دێ، لە ئەنجامی شتێکی ترسناکدا.

(وَلَا تُشْطِطْ): واتە: لامەدە، (الشَّطَطُ: الإفرَاطُ فِي البُعدِ، وَشَطَّتِ الدَّارُ وَأَشَطَّ، يُقَالُ فِي المَكَانِ وَفِي الحُكمِ)، (شَطَط): بریتیە لە زێدەڕۆیی کردن لە دوورکەوتنەوەدا، دەگوترێ: (شَطَّتِ الدَّارُ)، واتە: ماڵەکە (خانووەکە) دوور بوو، ئەمە هەم لە شوێندا بەکاردەهێنرێ، شوێنەکە دوور بێ، هەم لە حوکم و بڕیاردا، (أَشَطَّ فِي حُكمِهِ) واتە: لە بڕیارەکەیدا لە حەق دوور کەوتەوە.

(أَكْفِلْنِيهَا): واتە: بە منی بسپێرە، (الكَفَالَةُ: الضَّمَانُ، أكْفِلنِيهَا، أي: اجْعَلنِي كِفْلاً لَهَا، وَالكِفْلُ: الكَفِيلُ)، کەفالەت، واتە: (ضَمان) یانی: وەئەستۆ گرتنی شتێک، (أكْفِلنِيها): واتە: منی بکە بە (كِفل)، (كِفل)یش، بە مانای کەفیل دێ، (كِفل)یش کەسێکە کارێکی پێ سپێردراوە، یان کارێکی بە ئەستۆ، یان کەسێکی بە ئەستۆوە گرتوە، من کەفیلی تۆم، واتە: من کاری تۆم بە ئەستۆوە گرتوە.

(وَعَزَّنِى): (عَـزَّنِي فـي الخِطَـاب: أَي غَلَبَنـي، عَـزَّ عَـلَيَّ كَـذَا: صَعُـبَ)، (عَـزَّنِي فـي الخِطَـاب)، واتـە: لـە دوانـدن دا بەسـەر منـدا زاڵ بـووە، دەگوتـرێ: (عَـزَّ عَـلَيَّ كَـذَا)، واتـە: ئـەو شـتە لەسـەر مـن قورسـەو زەحمەتـە.

(ٱلْخُلَطَآءِ): (جَمْـعُ خَلِيـط: وَهُـوَ الصَّدِيـقُ، أَوِ المُجَـاوِرُ، أَوِ الشَّرِيـكُ، وَخَلِيـط لِلْوَاحِـدِ وَالجَمْـع)، وشـەی (خُلَطَـاء) كـۆی (خَلِيـط)ە، (خَلِيـط) هـەم بـە مانـای بـرادەر دێ، هـەم بـە مانـای دراوسـێ دێ، هـەم بـە مانـای هـاو شـەریک و هاوبـەش دێ، (خَلِيـط) بـۆ تـاک و بـۆ کـۆش بـەکاردێ.

(لَزُلْفَىٰ): (الزُّلْفَـةُ: المَنْزِلَـةُ وَالحُظْـوَةُ)، وشـەی (زُلْفَـى) و (زُلْفَـة) هەردووکیـان بـە مانـای پێگـەو بـە مانـای پشـک و بـەشی چـاک، دێـن.

(يَضِلُّونَ): واتــە: ون دەبــن، (الضَّـلاَلُ: العُـدُولُ عَـنِ الطَّرِيـقِ المُسْـتَقِيم، وَيُضَـادُّهُ الهِدَايَـة)، (ضَـلال): بریتیـە لـە لادان لـە ڕێـی ڕاسـت و، پێچەوانـەو دژەکـەی بریتیـە لـە هیدایـەت، هیدایـەت واتـە: ڕێـی ڕاسـت دۆزینـەوە.

(بَٰطِلًا ): (البَاطِـلُ: نَقِيـضُ الحَـقِّ، وَهُـوَ مـا لا ثَبَـاتَ لَـهُ عِنْـدَ الفَحـصِ، وَقِيـلَ لِلشُّجَاعِ بَطَـل، تَصَـوُّراً لِبُطْـلاَنِ دَمِـهِ)، (باطِـل) دژو پێچەوانـەی هەقـە، کـە بریتیـە لـەوەی کاتێک دەپیشـکنی، چەسـپاویی نیـەو شـتێکی بۆشـە، بۆیـەش بـە بابـای ئـازا گوتـراوە: (بَطَـل) یـانی: خوێنـی خـۆی کردۆتـە کاسـەوە، خوێنـی خـۆی بـە تـاڵ کـردوەو دەربەسـتی خـۆی نیـە، ئنجا ئینسـان ئەگـەر لـە مردنـێ نەترسـا، ئـازا دەبـێ.

(لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ): (التَّدبِـيرُ: التَدَبُّـرُ، التَّفَكُّـرُ فِـي دُبُـرِ الأُمُـورِ)، (لِيَدَّبَّـرُوا)، واتـە: بـۆ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە، ڕامێنـن، (تَدبِـير)و (تَدَبُّـر)، بریتیـە لـە بیـر کردنـەوە لـە سـەرەنجامی کارەکان، کۆتاییەکەیـان (التَّدَبُّـرُ: التَّفَكُّـرُ وَالتَّأَمُّـلُ الَّـذِي يَبْلُـغُ بِـهِ صَاحِبُـهُ مَعرِفَـةَ المُـرَادِ مِـنَ المَعـانِي)، هەروەهـا (تَدَبُّـر) بـە مانـای بیـر کردنـەوەو ڕامانێکـە کـە خاوەنەکـەی بەهۆیـەوە دەگاتـە مەبەسـت لـە تێگەیشـتنی واتـاکان.

(وَلِيَتَذَكَّرَ): (التَّذَكُّرُ: إِستِحْضَارُ الذِّهْنِ مَا كَانَ يَعْلَمُهُ، وَهُوَ مَنسِيٌّ، واستِحْضَارُ مَا شأْنُهُ أَنْ لاَ يَغْفَلَ عَنْهُ)، (تَذَكُّرُ): بریتیە لەوە زەین شتێک کە زانیویەتی، بەڵام لە بیری چۆتەوە، وەبیری خۆی بێنێتەوەو ئامادەی بکات، هەروەها بریتیە لەوە کە شتێک کە دەبێ لێی بێ ئاگا نەبێ، هەمیشە ئاگای لێی بێت و لەبیری نەچێ و لە زەین و یادی دابێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

شایانی باسە: ئێمە بەسەرهاتی داوود، هەروەها هی سولەیمانی کوڕیشیمان سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە دوو پێغەمبەری حوکمڕان بوون، لە سوورەتی (الأنبياء)دا، بە درێژیی باس کردوە، هەڵبەتە لە سوورەتی (سبأ)یشدا، جارێکی دیکە ئاوڕمان لەو دوو بەسەرهاتە داوەتەوە، بۆیە درێژەو تەفصیلی بەسەرهاتی داوود ﷺ کە لە سوورەتی (الأنبياء)دا کردوومانە، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە و، ئێستا تۆزێک بە خێرایی بەسەر مانای گشتیی ئەم سێزدە ئایەتە موبارەکەدا تێدەپەڕین، کە تەوەری سەرەکییان گێڕانەوەکەی بەسەرهاتی داوود ﷺە، هەروەها باسکردن و خستنە ڕووی چەند نیعمەت و چاکەیەک کە خوا ﷻ بە داوودی داون.

سەرەتا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکات، لە میانی ئەویشدا ڕوو لە هەموو ئەوانە دەکات، کە بە دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکەون:

لە شازدە ئایەتی پێشوودا، لە ئایەتەکانی: (١ - ١٦)، لەم سوورەتی (ص)دا، کە لە دەرسی پێشوودا باسمان کردن، کۆمەڵێک قسەی بێسەرو بەرو، تۆمەت و گومانی خراپ و بڕووبیانووی کافرەکان باسکران.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، لەسەر ئەوەی دەیڵێن خۆڕاگربە، واتە: خۆت شلوێ مەکە، با هاوسەنگییت تێک نەچێ،

زۆر نارەحەت مەبە، ئەو قسانەی ئەوان دەیکەن، هیچ نین، تۆ لە واقیعدا چۆنی، هەروا دەمێنی، ئەوانیش کە قسەکەیان هیچ بنەمایەکی نیە، وەک بڵقی سەر ئاو دەڕوات، ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ﴾، یادی بەندەی خۆشمان داوود بکەوە.

## یازدە سیفەتی گرنگ و گەورەی (داوود ﷺ):

ئەم چوار ئایەتە: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿١٩﴾ وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ ﴿٢٠﴾﴾، لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا، یازدە (١١) سیفەت لە سیفەتە سەرەکییەکانی داوودو، یازدە نیعمەت لە نیعمەتە گەورەو بەرزەکانی خوا کە بە داوودی داون، خراونە ڕوو:

سیفەتی یەکەم: سەرەتا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ﴾، یادی بەندەی ئێمە داوود بکەوە، یادی بکەوە، واتە: بزانە ئەو چۆن بووە، چەند خۆڕاگر بووەو، چەند پشوو درێژ بووەو، سیفەتە چاکەکانی چی بوون، تۆش لە سیفەتە باشەکانی داوود ﷺ بەهرەمەندبە.

کەواتە: یەکەمین سیفەت کە خوا ﷻ داوودی پێ مەدح دەکات، لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا، ئەوەیە کە داوا لە پێغەمبەری خاتەم دەکات: چاو لە داوود بکات، ﴿ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ﴾، لە بەرانبەر ئەوەدا کە دەیڵێن خۆڕاگربەو یادی بەندەکەمان داوود بکەوە، ئنجا ئەوە سیفەتێکی گەورەو گرنگە بۆ داوود کە خوا بە پێغەمبەری خاتەم بفەرموێ: یادی داوود بکەوەو، خۆڕاگربە لەسەر قسەو قاڵی ناحەزەکانت، یانی: تۆش وەک داوود خۆڕاگربە.

سیفەتی دووەم: کە مەدحێکی گەورەی داوودی تێدایە، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ﴾، بەندەکەی ئێمە داوود، خوا ﷻ لە مەقامی زۆر مەدح دا، کە

باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەكات، وەسفیان دەكات بە بەندە (عبد): ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا ...﴿١﴾﴾الإسراء، ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ ...﴿١﴾﴾الكهف، لێرەش: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ﴾، كەواتە: سیفەتی دووەم لێرەدا كە باسكراوە، وەك مەدح بۆ داوود، ئەوەیە كە خوا بە بەندەی خۆی، یانی: بەندەیەكی دانستەو هەڵبژاردەی خۆی وەسفی دەكات.

سیفەتی سێیەم: ﴿ذَا ٱلۡأَيۡدِ﴾، خاوەن هێز، ئنجا ئەو خاوەن هێزە، هەندێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان بەهێزی جەستەیان لێكداوەتەوەو، پێیان وابووە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ...﴿١٠﴾﴾سبأ، ئاسنیشمان بۆ نەرمكردبوو، داوود هێندە بەهێز بووە، ئاسنی نووشتاندۆتەوە!

دەڵێم: ڕاستە كە دەفەرموێ: ﴿ذَا ٱلۡأَيۡدِ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی هێزی جەستەییش بێ، بەڵام بێگومان لێرەدا زیاتر مەبەست پێی هێزی مەعنەوییە، چونكە هەیە لە ڕووی جەستەوە بەهێزە، بەڵام كە غیرەت و جەهەرەكەی نەبوو لە دەروونیدا، هێزی جەستەیی شەفاعەتی بۆ ناكات، پاشان مەسەلەی نەرمكرانی ئاسن بۆ داوود، وەك پێشتر لە تەفسیری: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ...﴿١٠﴾﴾سبأ، لە تەفسیری سوورەتی (سبأ)دا، باسمان كرد، مەبەست پێی ئەوە نەبووە كە زۆر بەهێز بووەو ئاسن لە دەستی دا نەرم بێ، بەڵكو مەبەست پێی حاڵەتێكی تایبەتییە، كە موعجیزە بووە بۆ (داوود ﷺ)، ئەگەرنا خەڵكی دیكەش ئەگەر بەهێز بێ، وەك داوود كە ئاسنی لەبەر دەستدا نەرم دەبێ! بەڵام نا، مەبەست پێی نەرم كردنێكی تایبەتە، كە پێچەوانەی حاڵەتی ئاسایی ئاسنەو، ئەوكاتەش و لەو حاڵەشدا، ئەوە بۆ داوود دەبێتە موعجیزە.

سیفەتی چوارەم: ﴿إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر گەڕاوە بوو، (آبَ) یانی: (رَجَعَ)، (آیب)، یانی: (رَاجِع)، (أَوَّاب)، یانی: زۆر گەڕاوە، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە، هەمیشە لە خزمەت خوادا بوو، ئەگەر كەم و كوڕییەكی لێ ڕوودابایە، یان لە ئیجتیهادێكدا نەیپێكابایە، زوو دەگەڕایەوە بۆ لای خوا.

سیفەتی پێنجەم: ﴿ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ ﴾، ئێمە چیاکانمان ملکەچ کردبوون، دەستەمۆ کردبوون، لەگەڵیدا، چیاکان لەگەڵیدا دەستەمۆ و ملکەچ بوون.

سیفەتی شەشەم: ﴿ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴾، [ئێمە چیاکانمان لەگەڵیدا دەستەمۆو ملکەچ کردبوون] کە بە ئێواران و دەمەو خۆرهەڵات لەگەڵیدا خوایان بە پاک دەگرت.

سیفەتی حەوتەم: ﴿ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ﴾، باڵندەکانیش کۆکرابوونەوەو، خڕکرابوونەوە، واتە: بۆ داوود کۆدەکرانەوە بە شێوەیەکی تایبەت، نەگەرنا خەڵکی دیکەش دەتوانێ باڵندان، دانیان بۆ ڕۆ بکات و کۆیان بکاتەوە، نا، یانی: بەحاڵەتێکی موعجیزەیی، باڵندەکانی بۆ کۆدەکرانەوە.

سیفەتی هەشتەم: ﴿ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، واتە: هەر کامیان، هەر کام لە باڵندەکان، یاخود هەر کام لە چیاکان و لە باڵندەکان، زۆر بۆ لای داوود دەگەڕانەوە، (لَهُ) واتە: بۆ داوود، دەشگونجێ بگوترێ: ﴿ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، هەرکامیان زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە، بەڵام بەپێی ئەو بنەمایە کە ڕاناو دەبێ بۆ نزیکترین باسکراو بچێتەوە، (أَنْ يَرْجِعَ الضميرِ إِلَى أَقْرَبِ مَذْكُورٍ)، نزیکترین باسکراویش داوود ﷺ، واتە: زۆر بۆ لای داوود دەگەڕانەوە، فەرمانبەری بوون و لە قسەی دەرنەدەچوون، باڵندەکانیش و چیایەکانیش، داوود چ موناجات و زکرێکی کردبایە، لەگەڵیاندا دەگوتەوە.

سیفەتی نۆیەم: ﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ ﴾، حوکمڕانییەکەشیمان بەهێز کرد، داوود خوا ﷻ توانایەکی زۆری داوەتێ، لە توانای بەشەریی و توانای ماددیی و، توانای سیاسیی و هەواڵگریی (مخابرات)ی، دەوڵەت و حوکمڕانیی بەچی بەهێز دەبێ؟ بەهێزی سەربازیی و، هێزی ئابووریی و، هێزی موخابەڕاتیی و، هێزی ڕێک و پێکیی و چاک ئیدارەدان، یانی: لە هەموو ڕوویێکەوە، حوکمڕانییەکەیمان بەهێزوپێز و تۆکمە کرد بوو.

سیفەتی دەیەم: ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ﴾، حیکمەتیشمان پێدابوو، حیکمەت زۆر واتای هەن، بەڵام دەگونجێ بگوترێ: پێکانی هەق بە قسەو بە کردەوە، (**إصابة الحق قولاً وعملاً**) واتە: زانیاریی بە سوودو تێگەیشتنێکی قووڵمان پێدابوو، وێڕای کردارو ئاکاری ڕێک و ڕاست.

سیفەتی یازدەیەم: ﴿وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ﴾، هەروەها دووان و قسە کردنێکی ڕوونمان پێدابوو، کە هەموو کەس لێی تێ بگات، وتەکانی ڕەوان و ڕوون بوون، واتایەکی دیکەی: ﴿وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ﴾، واتە: توانایەک کە بتوانێ دادوەریی لە نێوان خەڵکدا بکات و، کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات، (**فَصل**) بە مانای لێک جیاکردنەوەیە، (**خِطاب**)یش، یانی: دواندن.

ئنجا دوای خستنە ڕووی ئەم یازدە سیفەت و نیعمەت و چاکەیەی کە خوا بە داوودی داون و خوا ﷻ داوودی پێ جوان کردوون و پێی ڕازاندوونەوە، لەو شەش ئایەتەی دوایی دا، دێتە سەر خستنە ڕووی ئەو بەسەرهاتەی کە مشت و مڕێکی زۆری لە نێوان ڕوونکەرەوانی قورئاندای لێکەوتۆتەوە، دەفەرموێ:

﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ﴾، ئایا هەواڵی ناکۆکەکانت پێگەیشتوە؟ ئەوانەی پێکەوە مشت و مڕ و ناکۆکییان بوو، ﴿إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ﴾، کاتێک کە بەسەر دیواری میحڕابەکەدا سەرکەوتن، سەرکەوتنە سەر دیواری میحڕابەکە، چونکە (میحڕاب) واتە: ژوورێکی تایبەت کە داوود خوای تێدا پەرستوە، یاخود پەرستگا، ﴿إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ﴾، یادبکەوە! کاتێک کە لە داوود وە ژوور کەوتن، ﴿فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ﴾، ئەویش بەهۆیانەوە داچڵەکی و ترسی ڕێنیشت، چونکە ئەو هەموو ئێشکچیی و پاسەوانەی هەبن، دوو کەسیش بەسەر دیواردا بێن و لەبەر دەمیدا قووت ببنەوە! ئاهەقی نەبووە دابچڵەکێ و، لەوانەیە گومانی ئەوەی لێ کردبن کە بۆ کوشتنی هاتوون و پیاو خراپ بن، کە جارێ هیچ قسەیان نەکردوە! ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ﴾، بۆیەش گوتیان: مەترسە، ﴿خَصۡمَانِ

بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، ئێمـە دوو کـەسی پێکـەوە ناکۆکیـن، هەندێکـمان سـتەممان لـە هەندێکـمان کـردوە، یەکێکـمان سـتەمی لـە یەکێکـمان کـردوە، ﴿ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ ﴾، تـۆش بـە هـەق و ڕاسـتیی دادوەرییـمان لـە نێوانـدا بکـە، ﴿ وَلَا تُشْطِطْ ﴾، لـە هـەق دوور مەکـەوەوەدو لامـەدە، ﴿ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴾، ڕێنماییـمان بکـە بـۆ ڕێـی ڕاسـت.

ئنجـا دوای ئـەو پێشـەکیی و زەمینـە خۆشـکردنە، دەسـت دەکـەن بـە خسـتنە ڕووی کێشـەکەیان:

﴿ إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً ﴾، بێگومـان ئەمـە برامـە، (واتـە: بـرای دایـک و باببیمـە) و نـەوەدو نـۆ سـەر مەڕیـشی هەیـە، ﴿ وَلِيَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، منیش یـەک سـەر مـەڕم هەیـە، ﴿ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا ﴾، گـوتی: مەڕەکـەی خۆشـت بـدە بـە مـن، بـا لای مـن بـێ و، لـە ژێـر چاودێریـی منـدا بـێ و، بیخەمـە گـەڵ ئـەو نـەوەدو نـۆ مـەڕەو، ببنە سـەد، تـۆش هیـچ مـەڕت نەبـن، ﴿ وَعَزَّنِي فِي ٱلْخِطَابِ ﴾، لـە دواندنیشـدا بەسـەرمدا زاڵ بـوو.

﴿ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ﴾، (داوود) فەرمـووی: بـە دڵنیاییـی سـتەمی لێکـردووی کـە داوای مەڕەکـەی لێکـردووی، کـە بیخاتـە گـەڵ مـەڕەکانی خـۆی، ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، زۆرێـک لـە تێکەڵەکانیـش، ئەوانـەی پێکـەوە تێکـەڵ دەبـن، وەک شـەریک، دراوسـێ، خـزم و کـەس و ... هتـد، هەندێکیـان سـتەم لـە هەندێکیـان دەکـەن، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ﴾، جگـە لەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێنـرێ) و، کـردەوە باشـەکانیان کـردوون، ئەوانیـش کەمێکـن، ﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ ﴾، داوود بـۆی دەرکـەوت کـە ئێمـە تاقیـمان کردۆتـەوە، بەچـی بـۆی دەرکـەوت؟ دوایـی لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر، گرنـگ ئەوەیـە شـتێکی بینیـوە، یـان هـەر بـۆ خـۆی بیـری کردۆتـەوە، کـە زوو بڕیـاری داوەو دادوەریـی کـردوە، بـەس بـە بیسـتنی قسـەی داواکارو گوێـی لـە داوا لەسـەر لێکـراو نەگـرت، زانی کـە پەلـەی کـردوە، ﴿ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ ﴾، ئنجـا داوای لێبـوردنی

لـە پـەروەردگاری کـرد، ﴿ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴾، بـە ڕکووعـدا کـەوت و گەڕایـەوە، (خَرَّ)، یـانی: (سَقَطَ)، ڕکووعیـش بریتیـە: لـە چەمانـەوە، ﴿ وَأَنَابَ ﴾، گەڕایـەوە بـۆ لای خـوا، هەندێکیـش گوتوویانـە: ﴿ وَخَرَّ رَاكِعًا ﴾، واتـە: کڕنـووشی بـرد، بـەڵام بۆیـە وایفەرمـووە، چونکـە مـرۆڤ کـە بـە پێوەیـە، بـەر لـەوەی بکاتـە کڕنـووش بـردن، دەکاتـە حاڵـەتی چەمانـەوە، دوایـی دەچـێ بـۆ کڕنـووش، ڕواڵـەتی ئایەتەکـەش هـەر ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە چووەتـە ڕکـووع و، گەڕاتـەوە بـۆ لای خـوا.

﴿ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ﴾، ئێمـە لـەوە لێـی بوردیـن، چاوپۆشـییمان لێکـرد، لـەو هەڵوێسـتەی، ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾، بـە دڵنیاییـش بـۆ وی لـەلای ئێمـە هەیـە نیزیکییـەک و، باشـترین سـەرەنجامیش.

ئنجـا هـەر پەیوەسـت بـەو بابەتـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئـەی داوود! ئێمـە تۆمـان گێـڕاوە بـە جێنیشـین لـە سـەر زەوی، ﴿ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ ﴾، بۆیـە دادوەریـی لـە نێـوان خەڵکـدا بکـە بـە هـەق و بـە ڕاسـتیی و، شـوێن ئـارەزوو مەکـەوە، ﴿ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، چونکـە شـوێنکەوتنی ئـارەزوو، لـە ڕێـی خـوا لات دەدات، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی لـە ڕێـی خـوا ون دەبـن و لا دەدەن، سـزایەکی سـەختیان هەیـە، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە ڕۆژی لێپرسـینەوەیان فەرامـۆش کـردوەو لـە بیرچـووە.

ئـەم شـەش ئایەتـە موبارەکـە کـە ئـەو بەسـەرهاتەیان تێدایـە، کـە مشـت و مڕێکی خەسـتی زانایـانی لێکەوتۆتـەوە، ئەگـەر هـەر ئـاوا سـەرنجیان بدەیـن، مانایەکەیـان زۆر ڕوونـە، بـەڵام وەختێـک واز لـە قورئـان دێنیـن و دەچیـن گـوێ لـە حیکایـەتی خـاوەن کتێبـان دەگریـن، بـە تایبـەتی پەیـمانی کـۆن، لەوێدایـە حیسـابەکەمان لـێ تێـک دەچـێ!

ئێمە لەم مانای گشتییەدا، باسی ئەو حیکایەت و میکایەتە ناکەین، بەڵام دوایی لە کاتی خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکاندا، کە شیکردنەوەی وردتر بۆ ئایەتەکان دەکەین، ئەو بەسەرهاتەش ئاماژەیەکی پێ دەکەین، چونکە لە پەیمانی کۆندا هاتووەو، بە داخەوە زۆرێک لە توێژەرەوانی قورئان، هەر لە (الطبري)یەوە بگرە تاکو (محمد الطاهر بن عاشور)و زۆری دیکەش، کەم و زۆر، هەیانە زۆرو، هەیانە کەم، کەوتوونە ژێر کاریگەریی ئەو گێڕدراوانەی لە کتێبی خاوەن کتێبەکاندان، بە تایبەتی هی جوولەکەو نەصرانییەکان، مەبەستم (پەیمانی کۆنە)و، بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەریی قسەکانی پەیمانی کۆنەوە، لێرەدا چەشمەندازیان لێڵ بووە، لە کاتی سەرەنجدانی ئەم ئایەتە موبارەکانەدا، چەمک و واتای ئایەتەکان کە چەند ڕوونە، لە خۆیانیان لێڵ کردوون، بەهۆی هێنانی ئەو حیکایەت و بەسەرهاتانەوە، کە لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ناگونجێن، بەڵکو لەگەڵ مسوڵمانێکی ئاساییش دا ناگونجێن، وەک دوایی باسی دەکەین، بەڵام هەندێکیش لە (ڕوونکەرەوانی قورئان)، هەڵوێستی زۆر سەر ڕاستانەیان بووەو، بە تایبەت فەخرەددینی ڕازیی لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التفسير الكبير -مفاتيح الغيب)، وەک دوایی دەقی هەندێک لە قسەکانی دێنیین.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا﴾، ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە بە پووچ و بێ حیکمەت، بە بەلاش نەمانهێناونە دی، ﴿ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، ئاوا گومان دەبەن کە ئەم گەردوونە، ئەم کەون و کائیناتە، هیچ حیکمەتێکی لە پشتەوە نیە، ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾، ئنجا هاوار، یاخود سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوا بوون لە ئاگر، لە ئاگری دۆزەخ.

﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، یـان ئایـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، دەبـێ وەک تێکـدەران لـە زەویـدا تەماشـایان بکەیـن و، وەک وانیـان دابنێیـن؟، ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴾، یـان ئایـا دەبـێ پارێـزکاران وەک تاوانبـاران مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکەیـن؟ واتـە: ئـەوە لـە دادگەریـی خـواو لـە کاربەجێـی خـوا ناوەشـێتەوە.

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ ﴾، ئـەم قورئانـە کتێبێکـە بۆ لای تۆمـان دابەزاندوەو، بـە پێـزو بەرهەمـدارە، بۆچـی خـوا ﷻ دایبەزانـدوە؟ ﴿ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، تـاکـو لـە ئایەتەکانیـەوە ڕابمێنـن، تێیـان بفکـرن، ﴿ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، بـۆ ئـەوەش کـە خاوەن عەقڵان وەبیریـان بێتـەوە، پەنـد وەربگـرن، فێربـن، لـە ئەنجامـی تێوەڕامانـدا مـرۆڤ دەتوانـێ پەنـد وەربگـرێ و فێـر ببـێ، دەتوانـێ ئـەو ڕاسـتییانەی کـە لەگـەڵ زگماکییـدا تێـک هەڵشـێردراون، وەبیـر خۆیانیـان بێنێتـەوە.

## سەرنجدانێکی گرنگ لە بەسەرهاتەکەی داوود

بەر لەوەی بچینە سەر مەسەلە گرنگەکان، بە باشی دەزانم، لە درێژەی مانای گشتیی دا، سەرنجێکی دیکە لەو شەش ئایەتە بدەین، کە ئەو بەسەرهاتەی داوودیان تێدایە.

ئەگەر ئەو بەسەرهاتە، وەک لە قورئاندا هاتووە، تەماشای بکەین، هیچ ئیشکالی تێدانیە، وەک ئایەتەکانمان مانا کردو خستمانە ڕوو، بەڵام وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بە هۆی کەوتنە ژێر کاریگەریی قسەکانی خاوەن کتێبانەوە، بە تایبەت پەیمانی کۆن، زۆرێک لە توێژەرەوانی قورئان، تووشی هەڵە بوون، چونکە ئایەتەکانیان لەبەر ڕۆشنایی بەسەرهاتێکی ئەفسانەییدا، مانا کردوە، کە فەخرەدینی ڕازیی لە تەفسیرەکەی خۆی (مفاتیح الغیب)دا[1]، ئەو بەسەرهاتە ناوا پوخت دەکاتەوە، دەڵێ: (**أَنَّ دَاوُدَ عَشِقَ امْرَأَةَ أُورِيَا، فَاحْتَالَ بِالْوُجُوهِ الْكَثِيرَةِ حَتَّى قَتَلَ زَوْجَهَا، ثُمَّ تَزَوَّجَ بِهَا، فَأَرْسَلَ اللَّهُ إِلَيْهِ مَلَكَيْنِ فِي صُورَةِ الْمُتَخَاصِمَيْنِ فِي وَاقِعَةٍ شَبِيهَةٍ بِوَاقِعَتِهِ، وَعَرَضَا تِلْكَ الْوَاقِعَةَ عَلَيْهِ، فَحَكَمَ دَاوُدُ بِحُكْمٍ لَزِمَ مِنْهُ اعْتِرَافُهُ بِكَوْنِهِ مُذْنِبًا، ثُمَّ تَنَبَّهَ لِذَلِكَ فَاشْتَغَلَ بِالتَّوْبَةِ**).

(بەڕاستیی جوانی پوخت کردۆتەوە)، دەڵێ: کورتەی ئەو بەسەرهاتە ئەوەیە کە داوود ئاشقی ژنی ئۆریيا بووە، (ئۆریيا یەکێک بووە لە فەرماندەکانی سوپایەکەی)، ئنجا لە زۆر ڕووەوە فێڵ و پیلانی گێڕاوە، تاکو مێردەکەی کوشتوە (مێردی ئەو ئافرەتە)، دوایی هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا کردوە، خواش ﷻ دوو فریشتەی لە شێوەی دوو کەسی پێکەوە بە دەمەقاڵ هاتوو و، ناکۆک دا ناردوونە لای داوود ﷺ، بۆ ئەوەی دادوەرییان لە نێواندا بکات، لە بەسەرهاتێکی

---

(١) ج٢٦، ص٧٣.

وێنەی بەسەرهاتەکەی ئەوداو، ئەوان ئەو ڕووداوەیان بۆ باسکردوە، داوودیش بە جۆرێک دادوەریی کردوە، کە لە ئەنجامی ئەو حوکمەدا دەبووایە (داوود) بۆ خۆی دان بە گوناهی خۆیدا بنێ، دواییش بە ئاگا هاتۆتەوەو، دەستی کردوە بە گەڕانەوە بۆ لای خواو تەوبەکردن.

شایانی باسە: ئەو بەسەرهاتەی فەخرەددینی ڕازیی ئاماژەی پێکردوە، لە پەیمانی کۆندا هاتوە[1]، لە ژێر ناوونیشانی: (خَطِيئَةُ داود وَخِداعُهُ)، [گوناهەکەی داوودو فێڵەکەی] لە ژێر ئەو ناوونیشانەدا، ئەو بەسەرهاتەی بە درێژیی هێناوە، کە ئێمە چەند بڕگەیەکی جێی مەبەستی لێ وەردەگرین، پێشێ دەقی بڕگەکان بە عەرەبیی دەخوێنینەوە، چونکە ئەو سەرچاوەیەی لێمان وەرگرتوە، بە زمانی عەرەبییە، دوایی مانایان دەکەین، دەڵێ: (وَفِي إِحْدَى الأُمْسِيَاتِ نَهَضَ دَاوُدُ عَنْ سَرِيرِهِ وَأَخَذَ يَتَمَشَّى عَلَى سَطْحِ قَصْرِهِ، فَشَاهَدَ امْرَأَةً ذَاتَ جَمَالٍ أَخَّاذٍ تَسْتَحِمُّ، فَأَرْسَلَ دَاوُدُ مَنْ يَتَحَرَّى عَنْهَا، فَأَبْلَغَهُ أَحَدُهُمْ: «هَذِهِ بَثْشَبَعُ بِنْتُ أَلِيعَامَ زَوْجَةُ أُورِيَّا الْحِثِّيِّ» فَبَعَثَ دَاوُدُ يَسْتَدْعِيهَا. فَأَقْبَلَتْ إِلَيْهِ وَضَاجَعَهَا إِذْ كَانَتْ قَدْ تَطَهَّرَتْ مِنْ طَمْثِهَا، ثُمَّ رَجَعَتْ إِلَى بَيْتِهَا. وَحَمَلَتِ الْمَرْأَةُ فَأَرْسَلَتْ تُبَلِّغُ دَاوُدَ بِذَلِكَ، وَفِي الصَّبَاحِ كَتَبَ دَاوُدُ رِسَالَةً إِلَى يُوآبَ، بَعَثَ بِهَا مَعَ أُورِيَّا، جَاءَ فِيهَا: «اجْعَلُوا أُورِيَّا فِي الْخُطُوطِ الأُولَى حَيْثُ يَنْشَبُ الْقِتَالُ الشَّرِسُ، ثُمَّ تَرَاجَعُوا مِنْ وَرَائِهِ لِيَلْقَى حَتْفَهُ» ... وَعِنْدَمَا عَلِمَتْ زَوْجَةُ أُورِيَّا أَنَّ زَوْجَهَا قَدْ قُتِلَ، نَاحَتْ عَلَيْهِ. وَحِينَ انْقَضَتْ فَتْرَةُ الْحِدَادِ، أَرْسَلَ دَاوُدُ وَأَحْضَرَهَا إِلَى الْقَصْرِ وَتَزَوَّجَهَا وَوَلَدَتِ ابْناً، وَلَكِنَّ الرَّبَّ اسْتَاءَ مِنْ هَذَا الأَمْرِ الَّذِي ارْتَكَبَهُ دَاوُدُ).

واتە: لە ئێوارەیەکیاندا داوود لەسەر تەختەکەی خۆی (شوێنی پشوودانی)، هەڵساو لەسەر بانی کۆشکەکەی دەهات و دەچوو (پیاسەی دەکرد)، ئافرەتێکی زۆر جوانی بینی، کە خۆی دەشۆرد، داوود کەسانێکی ڕاسپاردن کە بۆی بپشکنن

---

(١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس/ العهد القديم، صَموئيل الثاني، إصحاح: ١١، ص: ٦٥ - ٦٦١).

{بزانـن ئـەو ئافرەتـە کێیـە؟} یەکێکیـان پێیگـوت و، پێـی گەیانـد، گـوتی: ئـەوە (بەشـەئبەع) کچـی (ئـەلی عامـە)، ژنی ئۆرییایـی حیثیـی، داوود کەسێکی نـارد، ئـەو ئافرەتـەی بانـگ کـرد، ئافرەتەکـە هاتـە لای، داوود لەگەڵـی جـووت بـوو، چونکـە لـە حەیـز پـاک بـوو بـۆوە، دوایـی ئافرەتەکـە گەڕایـەوە بـۆماڵەوەیـان و تۆڵـدار بـوو، وەڵامـی نـارد بـۆ داوود و لـەوە ئـاگاداری کـردەوە، لـە بەرەبەیانـدا داوود نامەیەکـی نـووسی بـۆ (یوئـاب) {یوئـاب کـە یەکێـک بـووە لـە فەرمانـدەکانی داوود، لـە بـەرەی جەنگـدا} نامەکـەشی هـەر بـە ئۆرییـادا نـارد، {واتـە: بـە مێـردی ئـەو ژنـەدا، کـە زینای لەگـەڵ دا کـردوە} کـە لـەو نامەیـەدا هاتبـوو: ئۆرییـا بخەنـە هێڵـەکانی پێشـەوەی جەنـگ، ئنجـا کـە شـەڕی قـورس ڕوویـدا، ئێـوە لـە پشـتیەوە بکشـێنەوە، تاکـو بـۆ خـۆی لـە بەیـن بچـێ {ئنجـا دوایـی بـاس دەکات کـە چـۆن وایـان کـردوەو ئۆرییـا کـوژراوە، ئنجـا دەڵـێ:} کاتێـک ژنی ئۆرییـا بـەوەی زانی، کـە مێردەکـەی کـوژراوەو، شـینی لەسـەر گێـڕاو، کاتێـک مـاوەی شـین گێڕانەکـەی بەسـەر چـوو، داوود بـە دوای ئـەو ئافرەتەیـدا نـاردو، هێنـای بـۆ کۆشـک، هاوسـەرگیریی لەگەڵـدا کـردو، کوڕێکیـشی لێـی بـوو، بـەڵام پـەروەردگار ئـەو کارەی کـە داوود کـردی، زۆری پـێ ناخـۆش بـوو.

ئنجـا لـە لاپـەڕە (٦٦٤)ی هەمـان سـەرچاوەداو لـە ژێـر ناوونیشـانی: (لـە دایـک بـوونی سـولەیمان)دا، دەڵـێ: داوود چـوو بـۆ لای بەشـەئبەع و دڵـی دایـەوە، بـەڵام دوایـی لەگەڵـی جـووت بـوو، دوای ئـەوە کـە کـردی بـە هاوسـەری خـۆی و، کوڕێکـی لێیبـوو، نـاوی لێنـا: (سـولەیمان)، پـەروەردگار ئـەو کـوڕەی زۆر خۆشویسـت!

ئنجـا وەک گوتمـان: بەداخـەوە زۆربـەی ڕوونکـەرەوانی قورئـان بەبـێ ڕەخنـە لێگرتـن، ئـەم بەسـەرهاتەیان هێنـاوە، بـەڵام ژمارەیەکیشـیان بـە توندیـی ڕەخنەیـان لێگرتـوە، بـۆ وێنـە: (الـرازي) دەڵـێ: (وَالَّـذِي أَدِيـنُ بِـهِ وَأَذْهَـبُ إِلَيْـهِ أَنَّ ذَلِـكَ بَاطِـلٌ، وَيَـدُلُّ عَلَيْـهِ وُجُـوهٌ: الْأَوَّلُ: أَنَّ هَـذِهِ الْحِكَايَـةَ لَـوْ نُسِـبَتْ إِلَى أَفْسَـقِ النَّـاسِ وَأَشَـدِّهِمْ فُجُـورًا لاسـتنكف منهـا، والرجـلُ الحشـوي الْخَبِيـثُ الَّـذِي يُقَـرِّرُ تِلْـكَ الْقِصَّـةَ، لَـوْ نُسِـبَ إِلَى مِثْـلِ هَـذَا الْعَمَـلِ لَبَالَـغَ فِي تَنْزِيـهِ نَفْسِـهِ، وَرُبَّمَـا لَعَـنَ مَـنْ يَنْسُـبُهُ إِلَيْهَـا، الثَّـانِي: أَنَّ حَاصِـلَ الْقِصَّـةِ

**يَرْجِعُ إِلَى أَمْرَيْنِ: إِلَى السَّعْيِ فِي قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ بِغَيْرِ حَقٍّ، وَإِلَى الطَّمَعِ فِي زَوْجَتِهِ، وَالثَّالِثُ: أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَصَفَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ قبل ذكر هذه القصة بالصفات العشر الْمَذْكُورَةِ، وَوَصَفَهُ أَيْضًا بِصِفَاتٍ كَثِيرَةٍ بَعْدَ ذِكْرِ هَذِهِ الْقِصَّةِ).**

واتە: ئەوەی کە من بڕوام پێی هەیەو بۆی دەچم و بە دینی دەزانم، ئەوەیە کە ئەو بەسەرهاتە پووچ و بێ بنەمایەو، چەند شتێک ئەوە دەسەلمێنن، (ئنجا سێ بەڵگان دێنێتەوە:)

**بەڵگەی یەکەم:** ئەگەر ئەو بەسەرهاتە پاڵ بدرێتە لای گوناهبارترین کەس و ئەوەی لە هەمووان تاوانبارترە، بێزی لێی دەبۆوەو، باباى ڕووکەش بینی پیس، (مەبەستی پێ ئەو کەسانەیە، ئەو بەسەرهاتانە وەردەگرن و دەیانکەن بە تەفسیر بۆ قورئان)، کاتێک کە ئەم بەسەرهاتە ئاوا دەگێڕێتەوە، ئەگەر وێنەی ئەو کردەوەیە پاڵ بدرێتە لای وی، زۆر خۆی بە پاک دەگرێ، بەڵکو ڕەنگە نەفرینیش لەو کەسە بکات کە بڵێ: تۆ واتکردوە! {کە تەماعی لە ژنی ڕەفیقێکی کرد بێ و، هەوڵبدات ڕەفیقەکەی بکوژێ و، بیشیکوژێ و دوایی ژنەکەشی بێنێ!}.

**بەڵگەی دووەم:** پوختەی ئەم بەسەرهاتە دەگەڕێتەوە بۆ دوو شتان:

أ- هەوڵدان بۆ کوشتنی پیاوێکی مسوڵمان، بەبێ هەق.

ب- تەماع تێکردنی ژنەکەی، {کە داوود، بە حیساب دەبێ هەم نۆرییای بە کوشت دابێ و، هەم تەماعی لە ژنەکەشی کردوە، بەڵکو مێردەکەی هەر زیندوو بووە کە زینای لەگەڵدا کردوە!}.

**بەڵگەی سێیەم:** خوای بەرز داوودی پێش ئەم بەسەرهاتە، بە دە (١٠) سیفەتان وەسف کرد، {کە پێشتر هێنامانن و فەخرەددینی ڕازیی هەڵیهێنجاون کە تێمە کردماننە یازدە} هەروەها دوای ئەوەش بە کۆمەڵێ سیفەتی دیکە، لە دوای ئەم بەسەرهاتە، وەسفی کردوە.

کەواتە: خاوەنی ئەو هەموو سیفەتە بەرزو جوانانە، هەرگیز ئەوەی لێ ناوەشێتەوە، بە هیچ پێودانگێک ئەوە ناگونجێ، سەرچاوەی ئەو بەسەرهاتەش پەیمانی کۆنە، بەڵام ئایەتەکان ئەگەر وەک خۆیان سەرنجیان بدەین، کەم و زۆر ناچنەوە سەر ئەوەو، لە ڕاستیی دا داوودیش ﷺ یەکەم پێغەمبەر نیە، کە لە پەیمانی کۆندا شتی زۆر بێ جێی پاڵدراوەتە لای، کە تەنانەت مسوڵمانێکی ئاسایی لە خۆییان ناوەشێنێتەوە، چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرز!!

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە خۆڕگربێ لە بەرانبەر قسەو قاڵی ناحەزانی بێبڕوایداو، یادی داوود عليه السلام یش بکات و، بیکاتە سەر مەشق لە مامەڵەکردنی لەگەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگادا، پاشان وەسفکردنی داوود بە یازدە سیفەت، کە هەندێکیان خەسڵەتی خودی (داوود)ن و، هەندێکیشیان ئەو نیعمەتانەن کە خوا ﷻ پێیداون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:**

١)- ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن، واتە: لەسەر ئەو قسە پووچانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانڵێن، چ دەربارەی خوا ﷻ کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، چ دەربارەی قورئان کە بە شیعرو جادووی لە قەڵەم دەدەن، چ دەربارەی خۆت کە تۆمەتی شێتیی و جادووگەریی و شاعیرییت دەدەنە پاڵ، خۆڕاگر بە: ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾، بێگومان ئینسان بەبێ خۆڕاگرتن لە بەرانبەر قسەی پووچ و تۆمەتی ناڕەوای ناحەزانیدا، بە هیچ ئامانجێک ناگات، خۆڕاگر بوون، یانی: خۆت شلوێ نەکەی و نەشڵەژێی و هاوسەنگییت تێک نەچێ، بەبێ ئەو جۆرە خۆڕاگریی و پشوو درێژییە، هەر کاتێ ئینسان قسەیەکی ناحەزێکی بیست، تۆمەتێکی ئاراستەکرا، هاوسەنگیی تێکبچێ و دنیای لێ بێتەوە

یەک، هیچی بۆ ناکرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾، خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن.

٢)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ﴾، یادی بەندەکەشمان داوود بکەوە، وەک پێشتریش لە مانای گشتییەکەیدا گوتمان، ئەمە دوو سیفەتی تێدان لە یازدە سیفەتەکانی کە خوا ﷻ داوودیان ﷺ پێ مەدح دەکات، لەو چوار ئایەتەدا، ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ﴾ یادی داوودی بەندەمان بکەوە واتە: ئەو داوودە ﷺ، بکە بە سەر مەشقی خۆت، لە بەسەرهاتیەوە ڕابمێنەو، لە هەڵسوکەوتەکانیەوە ڕابمێنە، ﴿ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ﴾، بەندەکەی ئێمە داوود، ئەوە سیفەتی دووەمیەتی، لە ڕاستیی دا داوود ﷺ بە هۆی ئەوەوە کە بەندەی چاک بووە بۆ خوا ﷻ، شایستەی ئەوە بووە خوا بیکاتە ڕەوانەکراوی خۆی و، شایستەی ئەوەش بووە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بیکاتە سەرمەشقی خۆی، لە خۆڕاگریی و لە شێوەی مامەڵەکردن لە دەوروبەرو کۆمەڵگادا.

٣)- ﴿ ذَا ٱلۡأَيۡدِ ﴾، خاوەن هێز بوو (أي: صَاحِبَ القُوَّةِ)، چونکە (أيدِ) کۆی (یَد)ە، (یَد) یانی: دەست، (أَيدِ)، واتە: دەستەکان، خاوەنی دەستەکان مەبەست پێی خاوەنی هێزو توانا، لەبەر ئەوەی وشەی دەست چ لە کوردییداو، چ لە عەرەبییداو، چ لە زمانەکانی دیکەدا، ڕەمزی هێزە، دەڵێ: دەستی فڵانکەس بەسەروانەوە هەیە، یان دەستی وی لەسەرەوەیە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ ... ﴿١٠﴾ ﴾، الفتح، ﴿ ذَا ٱلۡأَيۡدِ ﴾، واتە: خاوەنی هێزو توانا، هێزی جەستەییش دەگرێتەوەو، توانای مەعنەوییش دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر توانای مەعنەویی مەبەستە.

ئەمەش سیفەتی سێیەمی.

٣)- ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر گەڕاوە بوو، گەڕاوە بوو بۆ لای خوا ﷻ هەمیشە لە خزمەت خوادا بوو، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و، خۆ لێ پاراستنی قەدەغەکانی، ئەگەر هەڵەیەکیشی کردبایەو، هەڵەی گوتبا، ئەوا زوو دەگەڕایەوە بۆ لای خوا ﷻ.

ئەمەش سیفەتی چوارەمی.

٤)- ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ﴾، ئێمە چیاکانمان لەگەڵیدا دەستەمۆ کرد بوون، ملکەچ کرد بوون.

ئەمەش سیفەتی پێنجەمی.

شایانی باسە: دەگونجێ (معه) پەیوەست بێ بە: (إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ) ەوەو، دەشگونجێ پەیوەست بێ بە (يُسَبِّحْنَ...)ەوە، هەردووک واتاکانی هەن و تێککیراویش نین.

٥)- ﴿يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ﴾، ئێواران و دەمەو خۆرهەڵات بە پاکیان دەگرت، یانی: خوایان بە پاک دەگرت، واتە: کە داوود ڕازو نیازی دەکردو خوای بە پاک دەگرت و، ستایشی خوای دەکردو، موناجاتی دەکرد لە خزمەت خوادا، چیایەکانیش لەگەڵیاندا دەگوتەوە، پێشتریش باسمان کرد لە تەفسیری سوورەتی (الأنبياء)دا، هەروەها لە سوورەتی (سبأ)یشدا، کە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: واتە: چیایەکان دەنگیان دەدایەوە، کە داوود ﷺ دەیچریکاند بەو دەنگە پڕ سۆزو خۆشەی خۆی و، موناجاتی لە خزمەت خوادا دەکرد، دەنگیان دەدایەوە!! بەڵام بێگومان ئەو واتایە ڕاست نیە، چونکە شوانێکیش کاتێک بانگی مەڕەکانی دەکات لە چیا، چیایەکە دەنگ دەداتەوە، هەروەها لە ئەشکەوتێکیش دا هەر کەسێک هاوار بکات، ئەشکەوتەکە دەنگ دەداتەوەو، ئەوە هیچ ئیمتیازو زیادەیەک نیە، کە خوا ﷻ باسی بکات بۆ داوود ﷺ! بەڵام، چیایەکان هەر لەگەڵیان گوتۆتەوە، نەک تەنیا دەنگ بدەنەوە، بەڵکو وەک داوود دووبارەیان کردۆتەوە.

ئەمەش سیفەتی شەشەمی.

٦)- ﴿وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً﴾، هەروەها باڵندەکانیش خڕ کرابوونەوە بۆ داوود ﷺ هەر کاتێک بانگی کردبان، بە دەمیەوە دەهاتن، ئنجا خوا نەیفەرموە: کامە بوون؟! کۆتر بوون، کەو بوون، سوێسکە بوون، چۆلەکە بوون، قازو قورینگ بوون، بۆیە هەموویان دەگرێتەوە، ﴿وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً﴾، باڵندەکانیش کۆکرابوونەوەو، خڕکرابوونەوە.

ئەوەش سیفەتی حەوتەمی.

٧)- ﴿كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾، هەرکامیان زۆر گەڕاوەبوو بۆی، تەنوینی سەر: (كُلٌّ)، قەرەبووی پاڵوێدراو (مُضافٌ إِلَيه)ە، یانی: (كُلُّ الطُّيُورِ)، یان (كُلُّ الجِبالِ وَالطُّيُورِ)، هەموویان

دەگرێتەوە، دەگونجێ مەبەست پێی، هەم چیایەکانیش و هەم باڵندەکانیش بێ، (لَهُ)، واتە: بۆ داوود ﷺ، (أَوَّابٌ)، واتە: زۆر گەڕاوە، کە مەبەست لێرەدا ئەوەیە هەموویان بۆی فەرمانبەر بوون، واتە: بۆ داوود ﷺ، یان بۆ خوا، کە لێرەدا خوا ﷻ باسی چیایەکان و باڵندەکان دەکات، داوود ئیشێکی دیکەی پێیان نەبووە، دەرناکەوێ ئیشێکی دیکەی پێیان بووبێ، جگە لەوەی کاتێک ئەو موناجات دەکات لە خزمەت خواداو، لە خوا دەپاڕێتەوەو ڕازو نیاز دەکات، ئەوانیش لەگەڵی بڵێنەوە، ئنجا بۆ ئەو مەبەستە هەموویان بۆی فەرمانبەر بوون و، لەگەڵی بوون و بۆ لای دەگەڕانەوە.

ئەمیش سیفەتی هەشتەمی.

٨)- ﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ ﴾، حوکمڕانییەکەیمان بەهێز کرد، مەحکەممان کرد، کە سوپایەکی جەنگاوەری زۆرو، ژێرخانێکی ئابووری مەحکەم و، هێزێکی هەواڵگریی و ئیدارەدانێکی باش، هەموویان دەگرێتەوە.

ئەمیش سیفەتی نۆیەمی.

٩)- ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ ﴾، هەروەها حیکمەتمان پێ بەخشیی، (حیکمەت)یش یانی: زانیاریی بە سوود، یان: پێکان لە قسەو لە کردەوەدا، قسەی بە جێ و کرداری بەجێ.

ئەمیش سیفەتی دەیەمی.

١٠)- سیفەتی یازدەیەمی و نیعمەتی یازدەیەم، کە خوا ﷻ بە (داوود ﷺ)ی داوە: ﴿ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴾، پێشتریش باسمان کرد (فَصلَ) بە مانای لێک جیاکردنەوە دێ، (الخِطَاب)یش بە مانای دواندن دێ، ئنجا دواندنی لێک جیا، واتە: دواندنی ڕوون، قسەیەک کە بەرانبەرەکە بە ئاسانیی لێی تێبگات، چونکە قسەیەک کە وشەکان و تەعبیرەکانی تۆزێک لە یەک دوور بن، باشتر فام دەکرێ، وەک لەوەی تێکەڵ و پێکەڵ بێ، هەیە هەر زار پێکدا دەدات و، قسەکانی تێکەڵ دەکات و دەیکاتە ڕیس و گوریس، خەڵک باش لێی تێناگات، واتایەکی دیکەی: ﴿ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴾، واتە: توانای لێک جیاکردنەوەی کێشەو مشت و مڕەکان و، دادوەریی کردنێکی باشمان پێدابوو.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەسەر دیواردا، لە میحڕابی داوود وەژوور کەوتنی دوو کەسی پێکەوە ناکۆک و، داوا کردنیان لێی کە بە حەق دادوەرییان لە نێواندا بکات و، کێشەکەشیان ئەوە بووە: (دوو برا، یەکیان نەوەدو نۆ سەر مەڕو، ئەوی دیکەشیان یەک سەر مەڕی هەبووە، کەچی خاوەن نەوەدو نۆ سەر مەڕەکە، داوای لێکردوە ئەو تاکە مەڕەیشی تەسلیم بکات و، بە قسەش بەسەریدا زاڵبووە)، داوودیش یەکسەر دوای بیستنی قسەی داواکار، بڕیاری ستەمکار بوونی داوا لەسەر کراو (مُدَّعَى عَلَيْهِ)ی داوە، بێ ئەوەی گوێی بۆ بگرێ، بەڵام دوایی زانیویەتی کە ئەوە تاقیکردنەوەی خوا بووە بۆی و، یەکسەریش پەشێمان بۆتەوەو داوای لێبوردنی لە خوا کردوەو، کەوتۆتە ڕکووع و پەروەردگاریشی لێیبوردوەو، پلەی نیزیکیی و سەرەنجامی چاکیشی پێ داوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ ﴾، [ئەی موحەممەد ﷺ!، یان ئەی هەر کەسێک کە قورئان دەخوێنێ] ئایا هەواڵی خەڵکە ناکۆکەکەت پێگەیشتوە؟ ئەوانەی پێکەوە ناکۆکیی

و مشت و مڕیان بوو، ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ ﴾، (الإسْتِفْهَامُ لِلتَعجِيبِ أو لِلْبَحْثِ عَنِ العِلْمِ)، پرسیارکردنەکە یان بۆ سەر سوڕماندنە {یانی: ئەو کەسە ناکۆکانە پێکەوە، بەسەرهاتێکی زۆر سەرسوڕهێنەریان هەبووە، ئایا هەواڵەکەیانت پێگەیشتوە؟} یاخود پرسیارکردن بۆ لێکۆڵینەوەیەو بۆ بە دوای زانستدا گەڕانە، واتە: ئایا زانیارییت هەیە لە بارەیانەوە؟ وشەی (خَصم)، یش: (إسمٌ يُطْلَقُ عَلَى الوَاحِدِ وَالكثِيرِ)، (خَصم)، واتە: ناکۆک، بۆ یەکێکیش و بۆ دووان و بۆ کۆش بەکاردێ.

٢)- ﴿ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴾، کاتێک کە بەسەر دیواری میحڕابەکەدا سەرکەوتن، (التَّسَوُّرُ: تَفَعُّلٌ مُشْتَقٌّ مِنَ السُّورِ، وَهُوَ الجِدَارُ المُحِيطُ بِمَكَانٍ، أو بَلَدٍ، تَسَوَّرَ أي: اعتدل عَلَى السُور، مِثْلُ تَسَنَّمَ أي اعتدل عَلَى سَنَمَ البَعِيرِ)، (تَسَوُّر) (تفعّل)ە وەرگیراوە لە (سُور)ەوە، کە بریتیە لەو دیوارەی دەورەی شوێنێکی داوە، یاخود دەورەی شارێکی داوە، (تسَوَّرَ) واتە: چووە سەر (سور)و، چووە سەر دیوارەکە، وەک (تَسَنَّمَ)، واتە: چووە سەر (سَنام) یانی: دونگی حوشتر.

﴿ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴾، (المِحْـرَابُ: بَيْـتُ العِبَـادَةِ الخَـاصُ أَي: البَيْـتِ المُتَخَّـذِ لِلعِبَـادَةِ)، یـانی: ژوورێکـە تایبـەت کـراوە بـە خواپەرسـتییەوە، بـە تایبـەتی بـۆ خـوا پەرسـتیی دیارییکـراوە.

٣)- ﴿ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک لە داوود وەژوور کەوتن، ئنجا ئەو بە هۆیانەوە داچڵەکی و ترسی ڕێنیشت ، بیمی بەرانبەریان هەبوو، (الفَزَعُ: الذُعْرُ، وَهُوَ انْفِعَالٌ يَظْهَرُ مِنْهُ اضْطِرَابٌ عَلَى صَاحِبِهِ مِنْ تَوَقُّعِ شِدَّةِ مُفَاجَئَةٍ)، (فَزَع) داچڵەکینێکە کە خاوەنەکەی هاوسەنگیی تێکدەچێ، لەبەر ئەوەی مەترسیی سەختییەکی کتوپڕی بە ملدا هاتوە.

٤)- ﴿ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، گوتیان: مەترسێ، ئێمە دوو کەسی پێکەوە ناکۆکین، هەندێکمان ستەممان لە هەندێکمان کردوە، واتە: یەکێکمان ستەمی لەوی دیکەمان کردوە.

ئنجا لێرەدا زانایان پرسیارێکیان کردوە: چۆن داوود داچڵەکیوەو لە جگە لە خوا ترساوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە ترسان شتێکی سروشتییە، پاشان پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) فەرمانیان پێکراوە ژیانی خۆیان بپارێزن، چونکە ژیانیان تەنیا هی خۆیان نیە، بەڵکو هی خەڵک و کۆمەڵگایە، کە دەبێ کار لەسەر هیدایەتدان و ڕاستە ڕێ کردنیان و بەرچاو ڕۆشنکردنەوەیان و فێری خواپەرستیی کردنیان، بکەن، بۆیە لەسەریان پێویست بووە خۆیان بپارێزن و، کاتێک هەستیان بە مەترسییەک کردوە، شتێکی ئاسایی بووە کە دابچڵەکن.

کە دەڵێن: ﴿بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، دەڵێن: (البَغْيُ: الظُّلْمُ وَالتَّعَدِّي) (بغي) بریتیە لە ستەم و سنوور شکێنیی بەلایەکدا.

٥)- ﴿فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ﴾، تۆ دادوەرییمان لە نێواندا بکە بە هەق، واتە: بە شێوەیەکی چەسپاو و ڕێک و ڕاست.

٦)- ﴿وَلَا تُشْطِطْ﴾، ئەوە بۆ تەئکید کردنەوەیە، ئەگەرنا: ﴿فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ﴾، بە هەق و ڕاستیی دادوەرییمان لە نێواندا بکە چەمکی: لامەدە (وَلَا تُشْطِطْ)ش دەگرێتەوە ﴿وَلَا تُشْطِطْ﴾ یانی: ستەم مەکە، ﴿وَلَا تُشْطِطْ﴾، (مُضارِعُ أَشَطَّ، أَشَطَّ عَلَيهِ أي: جَارَ عَلَيهِ، شَطَّ وَأَشَطَّ: أي: جارَ)، واتە: ستەمی لێکرد، کە دەڵێن: ﴿وَلَا تُشْطِطْ﴾، واتە: ستەم مەکەو لامەدە، یان لە هەق دوور مەکەوەوە.

٧)- ﴿وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ﴾، بمانخە سەر ڕاستە ڕێ، (الهُدَى: هُنَا مُسْتَعَارٌ لِلبَيَانِ وَإِيضَاحُ الصَّوَابِ)، (الهُدى) لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ڕوونکردنەوەو دەرخستنی ڕاستیی، ڕاستیی چۆنە؟ ئاوا پێشانمانبدە.

ئنجا دێنە سەر خستنە ڕووی کێشەکەیان و، یەکێکیان کە داواکار (مُدَّعِي)ە، دەڵێ:

٨)- ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِى﴾، ئەمە برامە، واتە: برای دایک و باببی، واپێدەچێ زیاتر مەبەست پێی ئەوە بێ.

٩)- ﴿ لَهُۥ تِسۡعٌ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ ﴾، نەوەدو نۆ (٩٩) سەر مەڕی هەیە.

١٠)- ﴿ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴾، منیش یەک سەر مەڕم هەیە.

١١)- ﴿ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا ﴾، ئنجا گوتی: مەڕەکەی خۆشت تەسلیمی من بکە، (أَكْفِلنِيهَا، أَي: مَلِّكْنِيهَا، وَاجْعَلْنِي أَكْفُلُهَا)، بیدە بە من و من بکە بە سەرپەرشتیاری.

١٢)- ﴿ وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ﴾، لە دواندنیش دا بەسەرمدا زاڵبووە، (أَي: وَغَلَبَنِي فِي الكَلَامِ)، لە قسەکردنیش دا بەسەرمدا زاڵ بووە، دەبێ بە دەسەڵاتتر بووبێ، ئەمە وادەردەخات کە پێشێ داوای مەڕەکەی لێکردوەو، کاتێک ئەو گوتوویەتی: ناتدەمێ، ئەویش هەڕەشەی لێکردوەو قسەی توندی لەگەڵدا کردوە، بۆیە ناچار بووە سکاڵای خۆی بێنێتە لای داوود ﷺ.

١٣)- ﴿ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ ﴾ (داوود ﷺ) گوتی: بەدڵنیایی بە داواکردنی مەڕەکەت بۆ گەڵ مەڕەکانی، ستەمی لێکردووی، خستنە ڕووی بابەتەکەی داواکار (مُدَّعِي) هێندە وروووژێنەر بوو، هەست و سۆزی داوودی جووڵاندو لە بیری چوو لە داوا لەسەر کراو (مُدَّعَى عَلَيهِ)ش بپرسێ: ئەرێ وایە، وانیە؟ ئەرێ بۆچی داوات لێکردوە؟ دەگونجێ بۆ ئەوە داوا لێکرد بێ، مەڕەکەی بۆ بەخێو بکات و گوتبێتی: تۆ مەڕێکت بۆ چییە بە تەنیا، پێوەی ماندوو دەبی؟ من بۆت بەخێو دەکەم و بەرهەمەکەش بۆ خۆت، بە هەر حاڵ دەبوو لێی پرسیبایە، بەڵام یەکسەر گوتی: ﴿ قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ ﴾، گوتی: بە دڵنیایی ستەمی لێکردووی کە داوای مەڕەکەی کردوە بۆ گەڵ مەڕەکانی خۆی، لێرەدا وشەی (سُؤَال) (ضُمِّنَ سُؤَال مَعْنَى الضَّمِّ)، أي: (لَقَدْ ظَلَمَكَ بِضَمِّ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ وَسُؤَالِكَ إِيَّاهَا)، وشەی (سُؤَال) مانای خستنە گەڵی خراوەتە نێو، یانی: بە دڵنیایی ستەمی لێکردووی کە داوای لێکردووی مەڕەکەی خۆت بخەیە گەڵ مەڕەکانی وی.

١٤)- ﴿ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾، بە دڵنیایی زۆرێک لەوانەش پێکەوە تێکەڵن، هەندێکیان ستەم لە هەندێکیان دەکەن، ماف هەندێکیان پێشێل دەکەن، (الخُلَطَاءُ: جَمْعُ خَلِيط، مِثْلُ الشُّرَكَاءُ جَمْعُ شَرِيك، لكنَّ الخَلِيطَ مَعْنَاهُ أَعَمّ)، ﴿ ٱلۡخُلَطَآءِ ﴾،

هەروەک (شُرَكَاء)ە، (خُلَطاءُ)، کۆی (خَلِيطٌ)ە، هەروەک (شُرَكَاء) کۆی (شَرِيك)ە، (شريك) یانی: هاوبەش لە شتێکی دیاریکراودا، بەڵام (خَلِيط) مانایەکەی گشتییترە، بە دراوسێ و بە برادەرو بە هاوبەش دەگوترێ و، بە هەر جۆرە تێکەڵییەک دەگوترێ.

١٥)- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ {هەموو ئەوانەی کە پێکەوە تێکەڵییان دەبێ ستەم لە یەکدی دەکەن} جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن.

١٦)- ﴿ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ﴾، ئەوانیش کەمن، وشەی (ما)، لە: ﴿ وَقَلِيلٌ مَّا ﴾دا، (لِقَصْدِ الإِبْهَامِ) مەبەست پێی شاردنەوەیە، ئەمە هاندانیش بووە بۆ ئەوان، کە ئەوانیش لەو کەمە بن، لەو کەمە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن و، چاویان لە ستەمکردن نیە لە یەکدی.

١٧)- ﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ ﴾ داوود پێی وابوو تاقیمان کردەوە، (ظَنَّ) دەگونجێ بە مانای گومان بێ، بەڵام لێرەدا زیاتر واپێدەچێ بە مانای زانیاریی بێ، واتە: داوود ﷺ زانی کە ئێمە تاقییمان کردەوە، ئنجا بۆچی بە (ظَنَّ) هێناویەتی؟، وشەی (ظَنَّ) لە قورئاندا کە بەکاردێ، جاری وایە بۆ حاڵەتی سەرزەنشتکردن و، جاری واش هەیە بۆ حاڵەتی مەدحە، ئنجا ئەگەر بۆ حاڵەتی مەدح بێ، بۆیە وشەی (ظَنَّ) بەکاردێ، چونکە ئەو زانیارییانەی مرۆڤ لە ئەنجامی تێوەڕامان و سەرەنجدان و گەڕان و پشکنین دا دەستی دەکەون، سەرەتاکەیان گومانێکە دوایی وردە وردە بەهێز دەبێ، تاکو دەبێتە زانیارییەکی جێی دڵنیایی، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ ... ﴿٤٦﴾ ﴾البقرة، واتە: گومانیان وایە کە بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن، ئەو گومانە مەبەست پێی عیلمە، بەڵام ئەو زانیارییە یەکسەر زانیاریی بێ چەندو چۆن نەبووە، بەڵکو گومان بووە، دوایی وردە وردە گومانەکە بەهێز بووەو بەهێز بووە، لە ئەنجامی زۆر تێفکرین و بیرکردنەوەی مرۆڤ دا، سەرەنجام زانیارییەکەشی بە دیداری خوا بەهێز دەبێ، ﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ ﴾، داوود زانی کە ئێمە تاقیمان کردۆتەوە، (أَي: ابْتَلَيْنَاهُ وَاخْتَبَرْنَاهُ)، زانی کە ئەوە تاقیکردنەوەی ئێمە بوو، دوایی باسی دەکەین کە چۆنی زانی؟

١٨) ﴿ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعٗا وَأَنَابَ ﴾، داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کردو، بە ڕکووع دا کەوت و، گەڕایەوە، (خَرَّ) یانی: (سَقَطَ)، ڕکووعیش: (الإنْحِنَاء بِقَصْدِ التَّعْظِيم، دُونَ الوُصُولِ إِلَى الأَرْض)، بە کوردیی دەڵێین: چەمانەوە، ڕکووعیش هەر بەکاردێنین، کە بریتیە لەوە مرۆڤ بچەمێتەوە بێ ئەوەی بگاتە زەوی، کە گەیشتە زەوی پێی دەگوترێ: کڕنووش (سجدة)، بەڵام ئەو ڕکووعە دەبێ بە مەبەستی بە مەزنگرتن و گەورە گرتن بێت، هەر بۆیەش وەک چۆن کڕنووش بۆ جگە لە خوا دروست نیە، چەمینەوەش بۆ جگەلە خوا دروست نیە، کە بەداخەوە هەندێک لە حوکمڕانانی عەرەب، خەڵکەکەی خۆیان ناچار دەکەن بۆیان بچەمنەوە، کە لە ڕاستییدا ڕکووع و سەجدە تەنیا تایبەتن بە خواوە ﷻ.

١٩)- ﴿ فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ﴾ (خوا فەرموویەتی:) ئێمەش ئەوەمان چاوپۆشیی بۆ لێکرد، لێمان بورد لەو هەڵوێستەی، لەو پەلە کردنەی لە دادوەریی دا.

٢٠)- ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾، بە دڵنیایی بۆ وی لەلای ئێمە پلەیەکی نیزیک هەیە، (زُلْفَى) یانی: (قُرْبَى)، ﴿ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾ یانی: باشترین شوێنی بۆ لا گەڕانەوە، باشترین سەرەنجامیشی لەلای ئێمە هەیە.

ئنجا ئـەوە کـە ئایـا داوود ﷺ چـۆنی زانیـوە: خـوا تاقیکردۆتـەوەو ئـەوە تاقیکردنـەوەی خـوا بـووە؟ دوایی کە دە (١٠) هەڵوەسـتە لە بەرانبەر بەسـەرهاتەکەی داوود ﷺدا دەکەیـن، تیشـکێک دەخەینـە سـەر ئـەو مەسـەلەیەش.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە داوود ﷺ کە گێڕاویەتی بە جێنشین لەسەر زەوی: پێویستە بە هەق دادوەریی بکات و نەکەوێتە شوێن ئارەزوو، کە مەبەست پێی سۆزو هەڵچوونە، چونکە بەهۆی ئەوەوە لە ڕاستە ڕێی خوا لا دەدات و، سەرەنجام دووچاری ئازاری سەختی خوا دەبێ لە قیامەتدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەی داوود ﷺ! ئێمە تۆمان گێڕاوە بە جێنشین لە زەویدا، کە دەفەرموێ: ﴿ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەلیف و لامی سەر ﴿ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، بە تەنکید (ئەلیف و لامی ناساندن)ە، بەڵام بۆ جینس نیە، یانی: هەموو زەوی، چونکە حوکم و دەسەڵاتی داوود هەموو سەر زەوی نەگرتۆتەوە، بەڵکو ئەو ناساندنە بۆ عەهدە، سەر زەمینەکە، مەبەست پێی ئەو وڵاتە بووەو، ئەو شوێنی حوکمڕانییە بووە کە بەنوو ئیسرائیلی لێبوون، (داوود)یش وەک باب و باپیرانی پێشووی حوکمڕانیی کردوە بەسەر بەنوو ئیسرائیلداو، لەو شوێنەدا کە تێیدا نیشتەجێ بوون لە شام.**

**٢)- ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ ﴾ [مادام تۆمان کردوە بە جێنشین لەسەر زەوی] تۆش دادوەریی لە نێوان خەڵکدا بکە بە هەق.**

**دیسان ﴿ ٱلنَّاسِ ﴾یش، لێرەدا (ال)ەکە بۆ ناساندنەو بۆ عەهدە، واتە: لە نێوان خەڵکەکەدا، کە خەڵکەکەش مەبەست پێیان خەڵکی بەنوو ئیسرائیلە، چونکە هەر حوکمڕانی ئەوان بوودو، بە هەق حوکمڕانیی بەسەر خەڵکەکەدا بکە، (حەق)یش: (ما يَقتَضِيهُ العَدلُ الشَّرعِيُّ)، هەق دادگەرییەکە شەرع خوازیاری بێ.**

٣)- ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ﴾، شوێن ئارەزوو مەکەوە، (أل) سەر ﴿ٱلۡهَوَىٰ﴾، بۆ جینسە، کە هەموو جۆرەکانی هەواو ئارەزوو دەگرێتەوە، واتە: بە دوای سۆزو هەڵچوون مەکەوە، بە هەر هۆیەکەوە ئەو سۆزو هەڵچوونە دروست بووبێ،

بـــۆچـــی؟

٤)- ﴿فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەگەرنا ئەو شوێنکەوتنی ئارەزووە، تۆ لە ڕێی خوا لادەدات، ڕستەی: ﴿فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، وەڵامی قەدەغەکردنەکەیە (جَوَابُ النَّهي)، پێشێ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ﴾، لەبەرچی؟ ﴿فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەگەر بە دوای ئارەزوو بکەوی، لە ڕێی خوا لات دەدات، ڕێی خواش بریتیە: لە ڕێی هەق و دادگەریی و وەک یەک تەماشاکردنی هەموو لایەک، کەدێنەلات بۆ چارەسری کێشە مشت و مڕ لەسەرەکان.

٥)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە ڕێی خوا ون دەبن و لا دەدەن.

کەواتـە: دادگەریـی (عَـدل) ڕێـی خوایـەو، سـتەم پێچەوانەی ڕێـگای خوایـە، ئەوانەی کـە لـە ڕێـی خـوا لا دەدەن، واتـە: لـە دادگەریـی لا دەدەن بـۆ سـتەم و لادان، سـزایەکی سـەختیان بـۆ هەیـە.

٦)- ﴿بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لە بیرچۆتەوەو فەرامۆش کردوە، بێگومان ئینسان ئەگەر شتێکی لەبیر بچێتەوە، لەسەری سزا نادرێ، بەڵام یانی: پشتگوێیان خستوەو، نادیدەیان گرتوە وەک لە بیریان نەمابێ وایە، وشەی (ما)، لە: ﴿بِمَا نَسُواْ﴾ دا، (مَصدَرِيَّةٌ، أي بِسَبَبِ نِسْيَانِهِم) چاوگییە، یانی: بە هۆی لە بیرچوونەوەیانەوە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە، کەواتە: لەبیر بوونی ڕۆژی لێپرسینەوە، مرۆڤ دەپارێزێ لەوە کە بە دوای ئارەزوو بکەوێ و، پەلکێشی زەلکاوی گوناهو تاوان بکرێ بە هۆی شوێنکەوتنی ئارەزووەکانەوە.

مەسەلەی چوارەم:

**گەردوون بە حیکمەت دروستکراوە، نەک بە هەوەنتە، وەک بێبڕوایان گومان دەبەن و، بڕوادارانی کردار باش و تێکدەران و، پارێزکاران و تاوانبارانیش، ناگونجێ یەکسان بن:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ﴾، ئاسمان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە بێ ئامانج و بە هەوەنتەو بە پووچ نەمان هێناونە دی.

(البَاطِلُ: ضِدُّ الحَقِّ، الحَقُّ: الحِكْمَةُ أَوِ الشَّيءِ الثَّابِت)، هەق واتە: (حِكْمَة)، یان شتی چەسپاو و ئامانجدار، (باطل) یانی: شتی بێ ئامانج و هەوەنتەو بێ هۆکار.

٢)- ﴿ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، کە: ئەم گەردوونە بە هەوەنتەو بێ حیکمەت و بێ ئامانج هێنراوەتە دی، کەواتە: بوونناسیی [علم الوجود - ONTOLOGY] پووچی کافرەکان بەو سەرەنجامەی گەیاندوون، چونکە ئەوانەی بێبڕوان، بوونناسییەکی پووچیان هەیە، نە خۆیان دەناسن و، نە خوا دەناسن، بۆیەش حیکمەت و نهێنیی و ئامانجێک کە لە پشت ئەم گەردوونەوە هەیە، نایبینن، شایانی باسە: ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردووەو، ئەو مەسەلەیە لە دەوری پازدە (١٥) شوێنی قورئاندا هاتوە[1]، کە خوا

---

(١) ئێمە کتێبی یەکەم لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بە ناوونیشانی: (الإسلام معرفة صحيحة بالخالق والخلق) و، کتێبی چوارەم لە مەسووعەی: [بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا]، بە ناوونیشانی: [پایەکانی بوونناسیی و ڕوونکردنەوەی

گەردوونی بە پووچ و بێ حیکمەت و بە هەوەنتە نەخوڵقاندوە، ئێرەش شوێنێکیانە، بۆیە دەفەرموێ:

٣)- ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴾، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان لە ئاگر، وشەی (وَیل) بە مانای هاواریش دێ، هاوار بۆ ئەوان، (الوَيْلُ: يَدلُّ عَلى أَشَدِّ السُّوءِ)، (ویل) خراپترین سزاو ئازار دەگەیەنێ، هەروەها (وَيلٌ لَهُ، يُقَالُ لَهُ لِلتَعَجُّبِ)، (ویل) بۆ سەرسوڕماندنیش بەکاردەهێنرێ.

٤)- ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ﴾، ئایا ئێمە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، وەک (تێکدەران لە زەویدا) یان دادەنێین؟ یانی: ئایا دەگونجێ ئەو دوو کۆمەڵە پێکەوە پێچەوانەوە دژە، مامەڵەی یەکسانیان لەگەڵدا بکەین، کە ئەگەر سزاو پاداشت نەبێ یەکسان دەبن؟!

٥)- ﴿أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾، یان ئایا پارێزکاران وەک تاوانباران دادەنێین؟ واتە: ئەگەر زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت نەبێ، وەک بێبڕوایان گومان دەبەن، ئەو کاتە بڕوادارانی کردار باش، لەگەڵ تێکدەران لە زەویداو، پارێزکاران لەگەڵ تاوانباران دا، هەموویان یەکسان دەبنەوە، ئەوەش شتێکی نەگونجاوە، بۆیە ئەو شتە نالۆژیکییە شایستەی خوا ﷻ نیە.

ئیمان إمان، بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتە گرنگە تەرخانکردوون.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**قورئـان کتێبێکـی پیـرۆزو بەرهەمـدارە، خـوا ناردوویەتـە خـوار، تاکـو خەڵـک تێـوەی ڕامێنـن و، سـەرەنجام خـاوەن عەقڵان پەنـدی لێوەربگـرن و ڕاستییەکانیان بیـر بکەونـەوە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ ﴾، ئەمە کتێبێکە بۆ لای تۆمان دابەزاندووە ﴿ كِتَٰبٌ ﴾، (کتاب) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، گوزارە (خبر)یە یانی: (هَذَا كِتَابٌ)، ئەمە کتێبێکە، ﴿ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ ﴾، بۆ لای تۆمان دابەزاندوە، بە پیرۆز بەرهەمدارە، (وَالْمُبَارَكُ: الْمُنَبَّثَةُ فِيهِ الْبَرَكَةُ، وَهِيَ الْخَيْرُ الْكَثِيرُ)، موبارەک ئەوەیە: کە پیرۆزی زۆری تێدا بڵاوبووبێتەوە، کە مەبەست خێری زۆرە، کە دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ ﴾، بە نەناسراو (نکرة) هاتوە، ئەمە بۆ بە مەزن دانانە، یانی: وەسف ناکرێ. ئنجا بۆچی خوا ﷻ ئەو کتێبە پڕ پیت و پیرۆز بەرەکەتەی دابەزاندوە بۆ لای موحەممەد ﷺ؟

٢)- ﴿ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، تاکو ئەوان لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن، خوێندراویشەتەوە: (لِتَدَبَّرُوا آيَاتِهِ)، تاکو ئێوە لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن. هەم بە نادیار (غائب)و، هەم بە ئامادەو دواندن (حضور وخطاب) بە هەردوو شێوەکە هاتوە.

٣)- ﴿ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، بۆ ئەوەش کە خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن و بیریان بێتەوە، (التَدَبُّرُ: التَّفَكُّرُ وَالتَّأَمُّلُ الَّذِي يَبْلُغُ بِهِ صَاحِبُهُ معرفة الْمُرَادِ مِنَ الْمَعْنَى)، (تَدَبُّر): بریتیە لەو بیرکردنەوەو ڕامانەی کە خاوەنەکەی بەهۆیەوە دەگاتە تێگەیشتن لە واتایەکان. (التَّذَكُّرُ: إِسْتِحْضَارُ الذِّهنِ مَا كَانَ يَعْلَمُهُ بَعْدَ نِسْيَانِهِ، وَاسْتِحْضَارُ مَا مِنْ شَأْنِهِ أَنْ لاَ يُغْفَلَ عَنْهُ)، (تَذَكُّر):

بریتیە لە ئامادەکردنی زەین و هۆش بۆ شتێک کە لە بیری چۆتەوە، بەبیر خۆی بێنێتەوە، یاخود: زەین شتێک لە خۆیدا ئامادە بکات، کە شایستە بێ فەرامۆش نەکرێ و لەبیر نەچێ.

شایانی باسە: ئێمە بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ قورئاندا، لە کتێبی: (با لە خزمەت قورئاندا بین)دا، بە درێژیی قسەمان کردوە، لە حەوت هەنگاودا باسمان کردوە، کە دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ فەرمایشتی خوادا بکرێ؟![1]

---

(١) هەروەها لە کتێبی (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا) زۆرشتمان لەوبارەوە باسکردوە، کە ئەو بابەتەمان کردوە بە پێشەکی کۆی ئەم تەفسیرەش لە چاپی دووەمی دا.

## دە (١٠) هەڵوەستە لە بەرانبەر بەسەرهاتەکەی داوود ﷺدا:

١)- یەکێک لە حیکمەتەکانی ئەو بەسەرهاتە ئەوەیە، کە نابێ بابای حوکمڕان، بە هۆی زێدە سەر گەرمبوون بە خواپەرستیی تایبەتەوە، کەمتەرخەمیی بکات لە بواری مشوورخواردن لە کۆمەڵگاو چارەسەری کێشەو گرفتەکانی خەڵکدا.

داوود ﷺ زۆر ئەهلی خواپەرستیی بووەو، چۆتە ئیعتیکافەوەو شوێنی تایبەتی هەبووە، چونکە میحراب شوێنێکە، یان ژوورێکە تایبەت کرابێ بە خواپەرستییەوە، ئەمەش: جۆرێک لە هۆشداریی پێدان بووە بۆ داوود، هەروەها بۆ غەیری (داوود)یش کە نابێ خواپەرستیی کەسیی وا لە بابای حوکمڕان بکات، ئاگای لە مشوور لێخواردنی کۆمەڵگاو چارەسەرکردنی کێشەکانیان ببڕێ.

٢)- هەر کات خەڵک ڕێی ئاسایی و یاساییان بۆ سکاڵاو چارەسەرکردنی کێشەکانیان لێگیرا، پەنا دەبەنە بەر ڕێی نائاسایی و نایاسایی، ئەوانە بە ئەئکید ئەو دوو کەسە، ئەگەر دوو مرۆڤ بوون، یان ئەگەر دوو فریشتە بوون، ئەگەر دەرفەتیان هەبووایە لە ڕێی ئاسایی خۆیانەوە بە ئاسانیی بگەنە داوود ﷺ سەر نەدەکەوتنە سەر دیوارو بەسەر دیواردا بازیان نەدەدا، بەڵام کە لە ڕێی ئاساییەوە بواریان نەبووە، بەسەر دیواردا سەرکەوتوون، ئەوەی دەرگا لە خەڵک دابخات، خەڵک ئەگەر بۆی بکرێ لە پەنجەرەوە بۆی دێنە ژوورێ، ئنجا بۆ خێر بێ، یان بۆ شەڕ بێ! بۆیە حوکمڕانان نابێ خۆیان لە خەڵکی بشارنەوەو، خۆ لە خەڵک شاردنەوە، وا دەکات کە خەڵک بیر بکاتەوە لەوەی چۆن بگەنە ئەو حوکمڕانە؟ ئنجا چ بە مەبەستی چاکە، چ خراپە.

٣)- لەم بەسەرهاتەدا بەڵگەی شەرعیی هەیە لەسەر ئەوە کە دروستە بەسەرهاتە نواندنەکانە (القِصَصُ التَّمثِيلِيَّة) دابترێن، هەروەها بەڵگەش هەیە لەم بەسەرهاتەدا، کە دروستە ئەو بەسەرهاتانە، بە شێوەیەکی جەستەیی وێنا بکرێن، مادام پێچەوانەی

شەریعەت نەبن، ئەمە (محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)دا[1] هێناویەتی و منیش ڕایەکەیم پێ جوانە، چونکە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو دوو کەسە، دوو فریشتە بوون، خۆیان بردۆتە سەر شێوەی دوو پیاو، کەواتە: دوو فریشتەکان تەمسیلی دوو پیاوی پێکەوە ناکۆکیان کردووەو، خۆیان بردۆتە سەر شێوەی ئەوان، کەواتە: نواندن (تمثيل) دروستە، بەڵام بۆ مەبەستی چاک، بۆ گەیاندنی مەبەستێک کە دەویسترێ، بە شێوەی نواندن و بە بەرجەستەکراویی بە خەڵک بگەیەنرێ.

٤)- خاڵی بێ هێزی داوود ﷺ کە هۆکاری هەڵەکەی بووەو، پەلەکردنی بووە لە دادوەریی کردن و بڕیاردان دا، بینا لەسەر قسەی داواکار (مُدَّعي) بە بێ گوێگرتن لە لایەنی دووەم و داوا لەسەرکراو (مُدَّعى عليه).

بۆیـەش لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: {إِذَا جَلَسَ إِلَيْـكَ الْخَصْـمَانِ، فَـلا تَقْـضِ بَيْنَهُـمَا حَتَّـى تَسْـمَعَ مِـنَ الْآخَـرِ}، (أخرجـه أحمـد: ٨٨٢، والحاكـم: ٧٠٢٥، وقـال: صحيـح الإسـناد، ووافقـه الذهبـي، والبيهقـي: ٢٠٢٥٦، وأخرجـه أيضـاً النسـائي في الكـبرى: ٨٤٢٠، والديلمـي: ١٢٦٨)، واتـە: هـەر کات دوو لایـەنی ناکـۆک لـە لات دانیشـتن، بڕیـار بـۆ یەکێکیـان مـەدە، تاکـو گـوێ بـۆ ئـەوی دیکـەش نەگـری.

٥)- (القرطبي) لە (الجامع لأحكام القرآن)دا[2] گوتوویەتی: (وَلَيْسَ فِي الْقُرآنِ مَا يَدُلُّ عَلَى، الْقَضَاءِ فِي الْمَسْجِدِ إِلا هَذِهِ الْآيَةُ، وَبِهَا اسْتَدَلَّ مَنْ قَالَ بِجَوَازِ الْقَضَاءِ فِي الْمَسْجِدِ، وَلَوْ كَانَ ذَلِكَ لَا يَجُوزُ كَمَا قَالَ الشَّافِعِيُّ: لَمَا أَقَرَّهُمْ دَاوُدُ عَلَى ذَلِكَ، وَيَقُولُ: انْصَرِفَا إِلَى مَوْضِعِ الْقَضَاءِ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْخُلَفَاءُ يَقْضُونَ فِي الْمَسْجِدِ، وَقَدْ قَالَ مَالِكٌ: الْقَضَاءُ فِي الْمَسْجِدِ مِنَ الْأَمْرِ قَدِيمٍ).

واتـە: لـە قورئانـدا جگـە لـەم ئایەتـە هیـچ بەڵگەیەکـی دیکـە نیـە، بـۆ ئـەوە بشـێ لەسـەر ئـەوە، کـە دروسـتە لـە مزگەوتـدا دادوەریـی بکـرێ، ئەوانـەش کـە گوتوویانـە:

---

(١) ج٢٣، ص٢٣٨.

(٢) ج١٥، ص١١٤.

دروستە لە مزگەوتدا دادوەریی بکرێ، بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوەو، پێغەمبەر ﷺو جێنشینەکانیشی لە مزگەوتدا دادوەرییان کردووەو، مالیکیش گوتوویەتی: دادوەریی کردن لە مزگەوتدا لە ئیشە دێرینەکانە، واتە: لە مێژە کراوە بە نەریتێک لە نێو ئوممەتدا.

هەڵبەتە ئەوە بۆ کاتی خۆی کە دادگا (محكمة) نەبووە، ئەگەرنا کە ئێستا شوێنی تایبەتی دادگایی هەیە، هەروەک شوێنی تایبەتی وەرگرتنی زانست هەیە، کە زانکۆو، قوتابخانەکان و پەیمانگاکانن، هەروەها ئێستا شوێنی تایبەتیی ڕێکخستنی سوپا هەیە، کە ئەو کارانە کاتی خۆی هەموویان لە مزگەوتدا کراون، بەڵام ئێستا ئەو کارانە براونەتە دەرەوەی مزگەوت.

٦)- (قَالَ ابْنُ الْعَرَبِيِّ: لَا خِلَافَ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ أَنَّ الْمُرَادَ بِالرُّكُوعِ هَا هُنَا السُّجُودُ، فَإِنَّ السُّجُودَ، هُوَ الْمَيْلُ، وَالرُّكُوعُ هُوَ الِانْحِنَاءُ، وَأَحَدُهُمَا يَدْخُلُ عَلَى الْآخَرِ)[1].

واتە: لە نێوان زانایاندا ڕاجیایی نیە، کە مەبەست لە ڕکووع لێرەدا: کڕنووش (سجود)ە، چونکە کڕنووش بریتیە لە لاربوونەوەو، ڕکووعیش بەهەمان شێوە بریتیە لە چەمانەوە، ئنجا یەکێکیان دەچێتە نێو ئەوی دیکە.

بەڵام پێم سەیرە کە ئەو گوتوویەتی: ڕاجیایی نیە لەنێوان زانایاندا، چونکە بەدڵنیاییی وانیە، وەک دوایی دەیگەینێ، بەڵام بە هەر حاڵ هەر ڕایەکەیم هێنا، وەک ئەمانەتێکی عیلمیی، ئەگەرنا پێم وایە کە نەخێر: ڕکووع هەر بە مانای ڕکووع بەکارهاتوەو، سجوودیش بەمانای سجوود، وەک دوایی دەیگەینێ.

٧)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: السَّجْدَةُ فِي ص، لَيْسَتْ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ فِيهَا} (أخرجه أحمد: ٣٣٨٧، والبخاري: ٣٤٢١، وغيرهما).

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج١٥، ص٤٦.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبیـاس (خـوا لـە خـۆی و بـاوکی ڕازی بـێ)، گوتوویـەتی: سـەجدە بـردن لـە سـوورەتی (ص)دا لـە سـەجدە پێـوە پابەندکـراوەکان نیـە، کـە دەبێ هـەر ئەنجـام بـدرێ، بـەڵام پێغەمبەریشـم ﷺ بینیـوە کڕنـووشی تێـدا دەبـرد.

واتـە: دەگونجـێ ئینسـان کڕنـووش نەبـا، بۆیـە مـن لـە هەمـوو ئـەو شـوێنانەدا کـە سـەجدەی قورئـان خوێنـدن بـوون و پێیـان گەیشـتووم، سـەجدەم بـردوە، بـەڵام لەمەیـان دا سـەجدەم نەبـرد[1]، لەبـەر ئـەوەی لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە کـە جارێـک پێغەمبـەر ﷺ سـوورەتی (ص)ی خوێنـدو لەسـەر مینبـەر دابەزی سـەجدەی بـرد، هاوەڵانیـش سـەجدەیان بـرد، جارێکـی دیکـەش سـوورەتی (ص)ی خوێنـد بـە تەمـا نەبـوو سـەجدە بـەرێ، بـەڵام هـاوەڵان خۆیـان ئامـادە کـرد بـۆ سـەجدە بـردن، ئەویـش دابـەزی و فەرمـووی: بەتەمـا نەبـووم سـەجدە بـەرم، بـەڵام لەبـەر ئێـوە کـە خۆتـان ئامـادە کـردوە {بـۆ ئـەوەی تەریـق نەبنـەوە} دابـەزی و دووبـارە سـەجدەی بـرد[2].

کەواتە: ئەو کڕنووشبردنە پێویست نیە، بەڵام شتێکی پەسندە.

هەڵبەتـە لـە بـارەی هەمـوو سـەجدەکانی قورئـان خوێندنـەوە، ئێمـە باسـێکی دوورو درێژمـان لـە کۆتایـی سـوورەتی (الأعـراف)دا کـردوەو لـە بـارەی هەموویانـەوە ڕاجیاییـەک هەیـە، کـە ئایـا پێویسـتە، یاخـود شـتێکی پەسـندو چاکـە، کڕنـووش ببردێ.

٨)- (فخر الدين الرازي) دەڵێ: (اسْتَشْهَدَ أَبُو حَنِيفَةَ بِهَذِهِ الْآيَةِ فِي سُجُودِ التِّلَاوَةِ، عَلَى أَنَّ الرُّكُوعَ يَقُومُ مَقَامَ السُّجُودِ)[3].

واتـە: ئەبـوو حەنیفـە بەڵگـەی بـەم ئایەتـە هێناوەتـەوە، کـە جـاری وا هەیـە چوونـە ڕکـووع و چەمانـەوە، قەرەبـووی کڕنـووش بـردنی قورئـان خوێنـدن دەکات و، لـە شـوێنی کڕنـووش بـردن بـەکاردێ.

---

(١) مەبەستم کاتی دەرس گوتنەوەیە، کە سەرەتا ئایەتەکانی دەرسەکە دەخوێنم.

(٢) أخرجه أبو داود: ١٤١٠ بإسنا على شرط الشيخين.

(٣ ) التفسير الكبير: ج٢٦، ص١٨٢، هەروەها التحرير والتنوير، ج٢٣، ص٢٤١.

بۆیـە ئـەوەی (إبـن العـربي) گوتوویـەتی: (لا خِـلافَ بَـيْنَ العُلَـمَاء عـلى أنَّ المـراد بالركوع هنـا: السـجود)، ڕاسـت نییـە، ئەوەتـا ئیمامێکـی وەک ئەبـوو حەنیفـە دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە نـەک تەنیـا لێرەدا، بەڵکـو بـۆ کڕنـووش بردنـەکانی دیکـەش، دەگونجـێ مـرۆڤ تەنیـا بچێتـە ڕکـووع و، ئـەوە قەرەبـووی چوونـە سـەجدە دەکاتـەوە، کـە بـە ڕاسـتیی ئـەو ڕایـەی ئەبـوو حەنیفـە زۆرجـار مـرۆڤ لـە سـەغڵەتیی دەر دەکات، کـە شـوێنەکەی وایـە کڕنووشـت بـۆ نابـردرێ، دەگونجـێ ئینسـان بچەمێتـەوەو، بچێتـە ڕکـووع لـە جیـاتی کڕنـووش بردنەکـە.

٩)- ئایا ئەو دوو کەسە کە لە شێوەی دوو کەسی ناکۆکدا هاتن بۆ لای داوود ﷺ، مرۆڤ بوون، یان فریشتە؟! یانی: ئایا دوو مرۆڤ بوون بە ڕاستیی و بەسەر دیواردا سەرکەوتوون، لەبەر ئەوەی ڕێیان نەبووە، لە ڕێی ئاساییەوە بچن؟ یاخود دوو فریشتە بوون و هەر بەسەر دیواردا سەرکەوتوون، بەڵام لە شێوەی دوو مرۆڤدا، بەڵام فریشتە بوون؟ هەردوو ڕایەکان هەن، لە ئایەتەکاندا هیچ لایەکیان ساغ نەکراوەتەوە، دەگونجێ دوو مرۆڤ بووبن و، هەر بە ڕاستییش ڕووداوەکە ئاوا بوو بێ و، دەشگونجێ دوو فریشتە بووبن، ئەو ڕووداوەیان وەک سیناریۆو نواندنێک پێشکەش کرد بێ، هەردوو ڕایەکان هەن.

١٠)- داوود ﷺ چۆنی زانیی کە خوا تاقی کردۆتەوە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە:

یەکەم: یەکسەر خۆی بۆی دەرکەوتبێ، واتە: دوای ئەوەی بڕیارەکەی داوەو، دادوەرییەکەی کردوە، بیری لێ کردبێتەوەو بۆی دەرکەوتبێ و گوتبی: من گوێم لە بابای داوا لەسەرکراو (مدَّعی علیه) نەگرت و، تەنیا بە قسەی دلواکار (مُدَّعِي) یەکسەر بڕیارمدا، دەگونجێ خۆی بۆی دەرکەوتبێ.

دووەم: دەگونجێ لە ڕێی وەحییەوە زانیبێ، یان خوا ﷻ بۆی ئیلهام کرد بێ.

سێیەم: دەگونجێ ئەو دووانە فریشتە بووبن و، لە پێش چاوی وی بەرز بووبنەوە بۆ ئاسمان، کە ئەو ڕایەش هەیە، یان هەندێک لە زانایان دەڵێن: تەماشای یەکدییان کردو

پێکەنین، ئەو کاتە داوود بۆی دەرکەوتوە، کە ئەوانە فریشتە بوون و، بۆ تاقیکردنەوەی وی خوای پەروەردگار ئەو دوو فریشتەیەی ناردوون.

ئنجا کە داوود بۆی دەرکەوتووە تاقیکردنەوەی خوا بووە، چ دوو مرۆڤ بووبن و، چ دوو فریشتە بووبن، سەرەنجام لە ئەنجامی ئەوەدا کە بیری لێکردۆتەوە، یان خوا ئاگاداری کردۆتەوە، بۆ دەرکەوتوە کە ئەوە تاقیکردنەوەی خوا بووە بۆی و، تێشیدا دەرنەچووە، بەڵام خوا ﷻ لێی نەگرتوەو لێی بوردوە، چونکە نیازی خراپ نەبووەو، لە ئەنجامی ئەوەش دا هەڵچووە، کە زۆر ڕقی لە زوڵم بووەو، بابای داواکاری زۆر پێ مەزڵووم بووە، بۆیە یەکسەر حوکمی لەسەر داوای بابای لەسەر داوالێکراو داوە.

لێرەشدا کۆتایی بەم دەرسەمان دێنین و، لە خوای پەروەردگار داواکارین یارمەتیمان بدات هەمیشە لەگەڵ هەقدا بین و، لەگەڵ دادگەریی دا بین، کە بە ئەنکید ڕاستە شەقامی خوا، خوازیاری هەق و دادگەرییەو، دژی ستەم و لادان و دەستدرێژکارییە بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٣٠ - ٤٠)، دوو ڕووداوی ژیـانی سـولەیمانی کـوڕی داوودیـان (عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلَام) خسـتوونە ڕوو، وێـڕای ژمارەیـەک لـەو نیعمەتانـەی خـوا بـە سـولەیمانی بەخشـیبوون:

ڕووداوی یەکەمیـان: گرنگیـی و بایەخ پێـدانی زۆری سـولەیمانە بە ئەسـپە ڕەسـەن و باشـەکانی و، پشـکنینی بۆیـان و، تەماشـا کـردن و سـەرنجدانی بۆیـان و دەسـتهێنانی بـە لاق و مـل و گەردنیانـدا.

ڕووداوی دووەمیـش: فڕێـدرانی جەسـتەیەک بـووە بـۆ سـەر کورسـییەکەی سـولەیمان ﷺ، دوایـیـش بـاسی لـە خـوا پاڕانـەوەی سـولەیمان ﷺ بـۆ پێـدانی حوکمڕانییەکـی بـێ وێنـەو، گیرابـوونی داوایەکـەی لـە لایـەن خـوای بەخشـەرەوە کـراوە.

﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ
ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ
بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ
وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ
مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾
وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ
أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها سولەیمانمان بە داوود بەخشیی، باشترین بەندە بوو، چونکە زۆر (بۆ لای خوا) گەڕاوە بوو ﴿٣٠﴾ (یاد بکەوە!) کاتێک دەمەو ئێوارە ئەسپە ڕەسەنە تیژڕەوەکانی لەسەر ڕانوێنران (پێشانی دران) ﴿٣١﴾ ئنجا گوتی: من ماڵ و سامانم (بە تایبەت ئەسپەکانم) لەبەر یاد کردنی خوا خۆشویست (یان بەسەر یادی خوادا هەڵمبژاردن)، هەتا بە هۆی کەوتنە پشت پەردەوە پەنهان بوون ﴿٣٢﴾ (هەر سەر گەرمی ئەسپەکانی بوو، گوتی:) بیانگێڕنەوە سەرم، ئنجا دەستی کرد بە دەست پێداهێنانی لاقەکانیان و گەردنەکانیان ﴿٣٣﴾ بە دڵنیاییش ئێمە سولەیمانمان تاقیکردەوەو جەستەیەکمان فڕێدایە سەر کورسییەکەی، پاشان لە ناخەوە گەڕایەوە (بۆ لای خوا) ﴿٣٤﴾ گوتی: پەروەردگارم! لێم ببوورەو حوکمڕانییەکم پێ ببەخشە، دوای من بۆ کەس نەلوێ، بێگومان بەس تۆ زۆر بەخشەری ﴿٣٥﴾ ئێمەش با مان بۆ ملکەچ و ڕامکرد، بە فەرمانی وی، بە نەرمیی هەر جێیەکی ویستبایە بۆی دەچوو ﴿٣٦﴾ لە شەیتانەکانیش هەر بیناسازو دەریاوان(یَکی گەوهەر دەرهێنەرێک)مان بۆ دەستەمۆ کردبوون ﴿٣٧﴾ هەندێکی دیکەش (لە شەیتانەکان) بە جووتە کۆت و زنجیرکرابوون لە پێوەندان دا ﴿٣٨﴾ (پێمان گوت:) ئەمە بەخششی ئێمەیە، ئنجا ببەخشە، یان بگرەوە، بەبێ ژماردن ﴿٣٩﴾ هەروەها (وێڕای نیعمەتە دنیاییەکان) بۆ وی لە لای ئێمە نیزیکیی و سەرەنجامی هەرە چاک هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿٤٠﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلصَّـٰفِنَـٰتُ ): كـۆی (صَافِـنْ)ە، (الصَّفْـنُ: الجَمْـعُ بَيْنَ الشَّـيئَيْنِ ضَامًّا بَعْضَهُـمَا إلَى بَعْض)، (صَفْـن) بریتیـە لـەوە كـە دوو شـت پێكـەوە كۆبكرێنـەوەو، پێكـەوە بلكێنرێـن، (صَفْـنَ الفَـرَسُ قَوَائِمَـهُ)، ئەسـپەكە لاقـەكانی پێكـەوە نووسـاندن. كـە بـە ئەسـپ دەگوتـرێ: (فَـرَسٌ صَافـن)، ئەوەیـە كـە سـێ لاقـی لـە سـەر زەوی بـن و لاقێكـی بـەرز كردبێتـەوە سـەر سـمەكەی، بـە ئاسـتەم گەیانـد بێتـە زەوی، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (صَافِـن).

(ٱلْجِيَادُ ): (جَمْـعُ الجَـوَاد، وَهُـوَ الفَـرَسُ الجَيِّـدُ ذُو الجَـودَة، جَيِّـدُ العَـدوِ)، (جِیـاد) كـۆی (جَـوَاد)ە، ئەویـش بریتیـە لـە ئەسـپی بـاش، ئەسـپێكی ڕەسـەن، كـە بـاش بـڕوات.

(فَطَفِقَ ): (طَفِـقَ يَفْعَـلُ كَـذَا، أَي: أَخَـذَ يَفْعَـلُ كَـذَا، وَيُسْـتَعْمَلُ فِي الإِيجَـابِ دُونَ النَّفـي)، وشـەی (طَفِـقَ) بـە مانـای (شَرَعَ)، واتـە: دەسـتی پێكرد بـەو كارەو، ئـەو كارەی دەكـرد، دێ، تەنیـا بـۆ حاڵـەتی ئەرێنیـی، بـەكاردێ و بـۆ حاڵـەتی نەرێنیـی بەكارنایـەت.

(رُخَآءً): (الرُّخَـاءُ: الرِّيـحُ اللَّيِّنَـةُ شَيءٌ رَخْـو، رَخِـيَ يَرْخَـى)، (رُخَـاء): واتـە: بایەكـی نەرم، بـای نـەرم و ئـارام، دەگوتـرێ: (شَيءٌ رَخْـوٌ)، واتـە: شـتێكی نـەرم و شـل، (رَخِـيَ يَرْخَـى)، واتـە: ئـەو شتەشـل بـوو هاتـە خـوار، بـۆ وێنـە دامێنـی كـراس كـە دادەكـەوێ.

(أَصَابَ ): (أَصَـابَ كَـذَا، أَي: وَجَـدَ مَـا طَلَـبَ)، واتـە: ئـەو شـتەی داوای دەكـردو، وە دەسـتی كـەوت، (وَأَصَـابَ أَي: قَصَـدَ، مُشْـتَقٌ مِـنَ الصَّـوْبِ، وَهُـوَ الجِهَـةُ)، (أَصَـابَ): واتـە: ڕووی تێكـرد، كـە لـە وشـەی (صَـوْب)ەوە هاتـوە، (صَوب)یـش، یـانی: (جِهَـة)، ئـەو شـوێنەی یـان ئـەو لایـەی مـرۆڤ ڕووی تـێ دەكات.

(بَنَّآءٍ ): (الَّـذِي يَبْنِـي اسْـمُ فَاعِـلٍ، مَصُـوغٌ عَـلَى زِنَـةِ المُبَالَغَـةِ لِلدِّلاَلَـةِ عَـلَى مَعْنَـى الصِّنَاعَـة، مِثْـل: نَجَّـار وَقَصَّـاب وَحَـدَّاد)، (بَنَّـاء) ئـەو كەسـەیە كـە بینـا دەكات، خانـوو

دروست دەکات، کە (بَنَّاء) ناوی بکەر (إِسْم فَاعِل)ە، لەسەر کێشی موبالەغە، دروستکراوە، تاکو مانای پیشە بگەیەنێ، وەک: دارتاش و گۆشت فرۆش و ئاسنگەر.

(وَغَوَّاصٍ ): (الَّذِي يَغُوصُ فِي البَحْرِ لاسْتِخْرَاجِ اللُّؤْلُؤِ)، (غَوَّاص): ڕێژگەی زێدەڕۆیی (غَائِص)ە، (غَاصَ فِي البَحرِ، وَغَائِصٌ)، واتە: چووە نێو دەریا، ئەو چووەوە نێوە، (غَوَّاص) واتە: کەسێک کە زۆر دەچێتە نێو دەریا، یاخود زۆر قووڵ دا دەچێ، (غَوَّاص) بە کەسێک دەگوترێ کە دەچێتە نێو دەریا بۆ دەرهێنانی گەوهەر.

(مُقَرَّنِينَ ): (إِسْمُ مَفْعُولٍ مِنْ «قَرَنَهُ» أَي: جَعَلَهُ قَرِيْنَاً لِغَيرِهِ، لاَ يَنْفَكُّ أَحَدُهُمَا عَنِ الأَخَرِ)، (مُقَرَّنِيْن): ناوی بەرکار (مفعول)ە، لە (قَرَنَهُ)، واتە: جووتی کرد، کە دوو شت پێکەوە جووت بکرێن، کە یەکێکیان لەوی دیکە جیانەبێتەوە.

(ٱلْأَصْفَادِ ): (جَمْعُ صَفَد: وَهُوَ القَيْدُ، صَفَدَهُ أَي: قَيَّدَهُ)، (أَصْفَاد) کۆی (صَفَد)ە، ئەویش بە کۆت و زنجیر دەگوترێ، کۆت کە دەکرێتە پێی مرۆڤ، (صَفَدَهُ أَي: قَيَّدَهُ)، واتە: پێیەکانی زنجیری تێکردن، یاخود کۆتی تێکردن، لە کوردەواریی دا دەگوترێ: کۆت و زنجیر کراوە.

(فَٱمْنُنْ): (مُشْتَقٌّ مِنَ المَنِّ المَكْنِيِّ بِهِ عَنِ الأَنْعَامِ، أَي: أَنْعِم عَلَى مَن شِئْتَ بِالإطْلاَقِ، أَو أَمْسِكْ فِي الخِدْمَةِ)، (فَامنُن) داتاشراوە لە (مَنّ)ەوە، کە کینایەیە لە بەخشین و چاکە لەگەڵدا کردن، واتە: هەر کەسێکت دەوێ لە شەیتانەکان، چاکەی لەگەڵ بکە، بۆ ئەوەی بەری بدەی و بەرهەڵدای بکەی، یاخود بیانگرە بۆ ئەوەی کرێکاریی و خزمەتیان پێ بکەی.

(لَزُلْفَىٰ): (أَي: قُرْبَى)، واتە: نیزیکیی.

(مَـَٔابٍ ): (الأَوْبُ: ضَرْبٌ مِنَ الرُّجُوعِ، وَذَلِكَ أَنَّ الأَوْبَ لَا يُقَالُ: إلاَّ فِي الحَيَوَانِ الَّذِي لَهُ الإِرَادَة، وَالرُّجُوعُ يُقَالُ فِيهِ وَفِي غَيرِهِ: آبَ يَئُوبُ أَوْبَاً وَإِيَابَاً وَمَآبَاً، وَالمَئَابُ: المَصدَرُ وإِسمُ الزَّمَانِ وَالمَكَان)، وشەی (مَئَاب) کە لە (أَوب)ەوە هاتوە، (أَوب) بریتییە لە جۆرێک لە گەڕانەوە، ئەویش لەبەر ئەوەیە (أَوب) تەنیا بۆ زیاندارێکە کە

خاوەنی ویست و شعوور بێ، بەکاردەهێنرێ، بەڵام (رُجُوع) هەم بۆ خاوەن عەقڵ و شعوور، هەم بۆ غەیری ئەوانیش بەکاردێ، دەگوترێ: (أَبَ، يَئُوبُ، أَوْبَاً) گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە، گەڕانەوە، (إِيَابَاً وَمَآبَاً)، (أَوْب وإِياب وَمَآب) هەر سێکیان چاوگن، (مَئَابُ) وێڕای ئەوەی کە چاوگە، هەم بە ناوی شوێن و، هەم بە ناوی کاتیش دەگوترێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

هەر لە سەرەتاوە دەڵێین: بەسەرهاتی سولەیمان عليه السلاممان، لە سووڕەتی (الأنبياء)دا بە درێژیی باسکردوە، لەوێدا هەموو ئەو ئایەتانەی کە پەیوەستن بە بەسەرهاتی سولەیمانەوە لە سووڕەتەکانی دیکەوە هێناومانن، هەروەها لە پەیمانی کۆن و لە کتێبە مێژووییەکانیش، بەپێی توانا بەهرەمان وەرگرتوە، بۆیە ئەوەی لەوێ بە وردیی و بە درێژیی باسمان کردوە، لێرەدا بە پێویستی نازانین، دووبارەی بکەینەوە.

لە تەفسیری ئەم ئایەتانەشدا، مشت و مڕو ڕاجیایی زۆر لە نێوان ڕوونکەرەوانی قوڕئاندا هەیە، ئەویش دیسان وەک بەسەرهاتەکەی داوود، بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەریی قسەو قاڵی خاوەن کتێبانەوە، کە بەپێی پەیمانی کۆن، سولەیمان نەک هەر بە پێغەمبەر دانانێن، بەڵکو بە جادووگەری دادەنێن و، تۆمەتباری دەکەن بەوەی کە لە ماڵی ئەودا بت پەرستراوەو، خێزانەکانی بتپەرست بوون، سولەیمانیش بە دوای ئارەزووی ئەو ئافرەتانە کەوتوە کە بتپەرست بوون، حاشا بۆ مەقامی سولەیمان، بەڵام پەیمانی کۆن نەک هەر بەرانبەر داوودو سولەیمان، بەڵکو بەرانبەر بە پێغەمبەرانی دیکەش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام) هەڵوێستی زۆر خراپ و، بیرو بۆچوونی زۆر سەقەت و، دوور لە نەزاکەت و ڕێزی تێدا هەیە.

وەک مانـای گشـتیی ئـەم یـازدە ئایەتـە، لـە بـارەی سـولەیمانەوە ﷺ دەڵێـن: خـوا ﷻ ئاوا دەسـت پـێ دەکات: ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، سـولەیمانمان، بـە داوود بەخشـیی، باشـترین بەنـدە بـوو، ئـەو زۆر گـەڕاوە بـوو، واتـە: زۆر گـەڕاوە بـوو بـۆ لای خـوا، ئەمـە سـێ مەدحـی تێـدان بـۆ سـولەیمان ﷺ:

١- وەک چاکەو نیعمەتێکی خۆی لەگەڵ (داوود)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَ ﴾، کەواتە: عادەت نیە، کەسێک شتێکی خراپ بدات بە کەسێک، دواییش وەک چاکە لەگەڵدا کردن باسی بکات، لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: سولەیمانمان بە داوود بەخشیی، مانای وایە سولەیمان بەخششێکی گەورەو دیارییەکی گەورەی خوا بووەو، خاوەنی کەسایەتییەکی گەورەو باش بووە.

٢- دەفەرموێ: ﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ ﴾، باشترین بەندە بوو، ئەمیش بە تەئکید یانی: (**نِعْمَ العَبْدُ سُلَيْمَانُ**)، چونکە تایبەتکراو بە مەدح (**المَخصُوص بالمَدح**)ەکە، قرتێنراوە، یانی: سولەیمان باشترین بەندە بوو، ئنجا خوا ﷻ بە کەسێک بفەرموێ: باشترین بەندە، مانای وایە زۆر بەندەیەکی باشە.

٣- ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر گەڕاوە بوو، زۆر گەڕاوە بوو بۆ لای خوا ﷻ، بەردەوام لە خزمەت خوادا بوو، دەگەڕایەوە بۆ لای، مەرج نیە تەنیا لە هەڵەو کەم و کوڕیی، بەڵکو هەمیشە دەگەڕایەوە بۆ لای خوا، لە دوای تاعەتێک کە ئەنجامی دەداو، لە دوای چاکەیەکیش کە دەیکرد، دەگەڕایەوە بۆ لای خوا، بۆ ئەوەی سوپاسی بکات، خوایە تۆ یارمەتی منتدا، ئەو فەرمانبەرییە ئەنجام بدەم، یاخود: ئەو چاکەیەت پێ بەخشیم، کە ئەو کارەم ئەنجام دا، ئەوە نیعمەتی تۆیە لەسەر من، هەروەک ئەوەش دەگەیەنێ کە لە دوای کەم و کوڕیی و هەڵەیەکیش کە ڕوویدابێ، گەڕابێتەوە بۆ لای خوا، ئنجا وەک پێشتر گوتمان: ئەم یازدە ئایەتە، دوو ڕووداوی ژیانی سولەیمان دێنن:

**ڕووداوی یەکـەم:** ڕانوێـنرانی ئەسـپە ڕەسـەنەکان لە سـەری: ﴿ إِذۡ عُرِضَ عَلَيۡهِ بِٱلۡعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴾، یـاد بکـەوە کاتێـک دەمـەو ئێـوارە ئەسـپە ڕەسـەن و تیـژڕەوەکان

لەسەری ڕانوێنران، پێشتر باسی (صَافِنَات)مان کرد، (صافن) ئەو ئەسپەیە کە لەسەر سێ لاقان دەوەستێ و لاقی چوارەمیشی هەڵدێنێ، بەڵام نووکی سمەکەی دەگەیەنێتە زەوی، (جیاد)یش کۆی (جَوَاد)ە، واتە: ئەسپی تیژڕەو و چاک، ئەسپە ڕەسەن و تیژڕەوەکان لەسەری ڕانوێنران، ئەسپی زۆر بوون و بۆ جەنگ و جیهاد بە کاری هێناون، ئنجا بۆی نمایان کراون و پێشانی دراون، ﴿ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ عَن ذِكۡرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴾، گوتی: من خۆشویستنی (خَیْر)م خۆشویست، بەڵام لە یادی پەوەردگارمەوە تاکو پەردەپۆش کران، هەتا چوونە پشت پەردەوەو، بەهۆی پەردەوە ون بوون، ﴿ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ ﴾، وەک هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (خیر) لێرەدا بە مانای ماڵ و سامان دێ، کە جۆرێک لە ماڵ و سامان، ئەو ئەسپانەی بوون، واتە:

(سولەیمان) نەک هەر ئەسپەکانی خۆشویستوون و، هەر ماڵ و سامانە حەڵاڵەکەی خۆشویستوە، کە بۆ ڕەزامەندیی خوا بە کاریی هێناوە، بەڵکو خۆشویستنی ماڵ و سامانەکەشی خۆشویستوە.

ئنجا لێرەدا کە دەڵێ: ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾، سێ واتای هەن:

أ- من بۆیە ماڵ و سامانم خۆشویست، کە ئێستا لەو ئەسپانەدا بەرجەستەیە، ئەوە بۆ بەرزکردنەوەی ناوی پەروەردگارم، واتە: بۆیە من ئەو ئەسپانەم (ئەو ماڵ و سامانەم) خۆشویست، لەبەر خاتری پەروەردگارم خۆشم ویست، تاکو لە ڕەزامەندیی پەروەردگام دا بەکاری بێنم.

ب- من ماڵ و سامانم خۆشویست و بێ ئاگای کردم لە یادی پەروەردگارم، واتە: زێدەڕۆییم کرد لە خۆشویستنی ماڵ و سامانی دنیادا.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: خۆشویستنم بۆ ماڵ و سامان، وای لێکردم ئاگام لە نوێژ نەمێنێ، تاکو نوێژەکەم چوو، کە ئەوە مانایەکی بێ هێزەو، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر باسی دەکەین.

﴿ حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴾، هەتا ئەسپەکان لە چاو ون بوون، هەر تەماشای کردوون و تێیانەوە ڕاماوەو سەرنجی داون، تاکو زۆر دوورکەوتوونەوەو ونبوون، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴾، واتە: تاکو ئەسپەکان بە هۆی ئاوابوونی خۆرەوە لەبەر چاو ون بوون، یاخود تاکو خۆر ئاوا بوو، یانی: ﴿ تَوَارَتۡ ﴾، ڕاناوەکەی بۆ خۆر دەچێتەوە، تاکو خۆر ئاوا بوو، هەر خەریکی خزمەت و تەماشاکردنی ئەو ئەسپانە بوو، دوایی گوتی: ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ ﴾، بیانگێڕنەوە بۆ لام، یاخود بەردەوام هەر دەیگوت: بیانگێڕنەوە با تەماشایان بکەم، ﴿ فَطَفِقَ مَسۡحَۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلۡأَعۡنَاقِ ﴾، دەستی کرد بە دەست پێداهێنانی لاقەکانیان و گەردنەکانیان[1]، دەستی بە لاقەکانیان و گەردنەکانیاندا دەهێنا، بزانێ نەخۆشن، بزانێ چۆنن، یان بۆ جوانیی و بۆ دڵخۆشیی دەستی پێدا دەهێنان، یاخود بۆ هاندانی ئەسپەکان، دەڵێن: ئەسپ و وڵاخ بەرزە، ئەگەر دەستی پێدابێنی، دەست بە گەردن و بە لاق و جەستەیدا بێنی، دڵی پێ خۆش دەبێ و زیاتر گەشەی پێ دەکات.

ڕووداوی دووەم: ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ فَتَنَّا سُلَيۡمَٰنَ ﴾، بە دڵنیاییی ئێمە سولەیمانمان تاقیکردەوە، ﴿ وَأَلۡقَيۡنَا عَلَىٰ كُرۡسِيِّهِۦ جَسَدٗا ثُمَّ أَنَابَ ﴾، جەستەیەکمان فڕێدا سەر کورسییەکەی، دوایی (بۆ لای خوا) گەڕایەوە، ئایا ئەو جەستەیەی فڕێدراوەتە سەر کورسییەکەی چی بووە؟

١- هەندێک گوتوویانە: شەیتانێک بووە بە ناوی صەخڕ، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان وایانگوتوە، کە شەیتانێک بووە، بە فێڵێک کە بەسەرهاتێکی لەسەرە، گوایە ئەنگوستیلەی سولەیمانی کەوتۆتە دەست، ئنجا خۆی لە خەڵکەکە کردۆتە سولەیمان و لەسەر کورسیی حوکمڕانییەکەی دانیشتوە، زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان و ڕوونکەرەوانی قورئان وا دەڵێن، بەڵام من ئەو ڕایەم پێ هەڵەیە.

---

(١) (سُوق) کۆی (ساق)ە و، (أَعۡنَاق)یش کۆی (عُنُق)ە.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست لەو جەستەیە هەر سولەیمان خۆیەتی، (أبو مسلم الأصفهاني) وایگوتوە.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست لەو جەستەیە منداڵێکی نوقسان بووە کە سولەیمان گوتوویەتی: دەچمە لای ئەو هاوسەرانەم کە هەمن، سەد بوون، حەفتا بوون، ئنجا هەر کامێکیان کوڕێکی دەبێ و دەبێتە جەنگاوەر جیهاد دەکات لە پێناوی خوادا، بەڵام نەیگوتوە: (إن شاءَ الله)، بۆیە لە هەموویان کوڕێکی (منداڵێکی) نوقسانیی بووە، کە وەک پارچە گۆشتێک وابووە.

ئێمە دواتر ڕای خۆمان و، تەتەڵەو بێژینگی ئەو ڕایانە لە کاتی مەسەلە گرنگەکاندا دەخەینە ڕوو.

﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ ﴾، (سولەیمان) گوتی: پەروەردگارم! لێم ببوورەو حوکمڕانییەکم پێ ببەخشە، دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە، کە لە دوای من بۆ کەس نەلوێ و نەگونجێ، ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾، بە دڵنیایی هەر تۆی زۆر بەخشەر.

﴿ فَسَخَّرۡنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ ﴾، خوا ﷻ نافەرموێ: وەڵاممان دایەوە، یەکسەر ئەوەی داوای کردوە، خوا ﷻ باسی دەکات کە جێبەجێ بووە، دەفەرموێ: با مان بۆ ملکەچ کرد، ﴿ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ ﴾، بە فەرمانی ئەو دەڕۆیی، ﴿ رُخَآءً ﴾، بە نەرمیی و، بە هێواشیی، یان بە دەستەمۆیی، ﴿ حَيۡثُ أَصَابَ ﴾، بۆ هەر شوێنێک کە مەبەستی بووایەو ویستبای، بایەکە دەچوو، ﴿ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ﴾، هەروەها شەیتانەکانیشمان بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کردن، کە هەر بیناسازێک و هەر دەریاوانێکیان تێدابوون، بیناساز بۆ ئەوەی بینایانی بۆ دروست بکەن و، دەریاوانەکانیش بۆ ئەوەی گەوهەرو مرواریی بۆ دەربێنن، ﴿ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴾، هەندێکی دیکەشەیان هەبوون لە شەیتانەکان کە لە کۆتاندا جووتکرابوون. (أصفاد) کۆی (صَفَدْ)ە، یانی: کۆت، ئەوەی کە دەکرێتە

پێ، بە کۆتەکان پێکەوە جووت کرابوون، (مُقَرَّنِيْن)، کۆی (مُقَرَّن)ە، (مُقَرَّن) واتە: جووتکراو، ئەوەیە کە دوو شت پێکەوە جووت بکرێن و، لێک جیانەبنەوە، واتە: دوو دوو ئەو شەیتانانە، ئەو دێوانە کۆت و زنجیر کراون، دەبێ ئەوانەیان بووبن کە خراپەکار بوون و، وەک سزایەک وایان لێکراوە، ﴿ هَٰذَا عَطَآؤُنَا ﴾، {پێمان گوت:} ئەوە بەخششی ئێمەیە، ﴿ فَٱمۡنُنۡ أَوۡ أَمۡسِكۡ ﴾، چاکە بکە، یاخود بگرەوە، چاکە بکەو ببەخشە، یان دەست بگرەوەو مەبەخشە، یاخود: ﴿ فَٱمۡنُنۡ ﴾، ئەو دێوو درنجانە چاکەیان لەگەڵ بکە، منەتیان لەسەر بکەو ئازادیان بکە، ﴿ أَوۡ أَمۡسِكۡ ﴾، یاخود بیانهێڵەوەو بیانگرە، ﴿ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾، بەبێ لێپرسینەوە، واتە: دەستت کراوەیەو، دەستت ئاوەڵسیە چۆن مامەڵە دەکەی، چونکە بەبێ دەست ئاوەڵایی، لە سنووری وەحیی و شەریعەتی خوای پەروەردگاردا، حوکمڕانیی ناکرێ، ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾، بە دڵنیاییی لەلای ئێمە بۆ وی هەیە نیزیکیی و، باشترین سەرەنجام، واتە: لە ڕۆژی دواییشدا لە خوا نیزیکە و، پێگەیەکی بەرزو پەسندی هەیە، لە خوا نیزیکیی مەبەست پێی ئەوەیەو، باشترین سەرەنجامیشی هەیە، کەواتە: هەرچی لە پەیمانی کۆندا هاتوە، دەربارەی (سولەیمان)، کە گوایە لە کۆتایی تەمەنی دا بتەکانی پەرستوون، یاخود بە دوای ئەو هاوسەرانەی کەوتوە کە بتپەرست بوون و، لە ماڵی ئەودا بت پەرستراوەو، سولەیمان ڕووی کردۆتە گوناهو تاوان!! هەمووی درۆو دەلەسەیەو، هەم ئایەتی یەکەم کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، هەم ئایەتی کۆتاییی: ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾، هەردووکیان بە درۆخەرەوەی ئەو پڕوپاگەندانەو ئەو قسە بێسەرو بەرانەن، کە لە پەیمانی کۆن و غەیری پەیمانی کۆنیشدا، کە لە خاوەن کتێبان گێڕدراونەوە هاتوون، هەم دەربارەی سولەیمان ﷺو، هەم دەربارەی داوود ﷺی باپی و هەم دەربارەی ژمارەیەکی دیکە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام).

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بەخشرانی سولەیمان بە داوود کە بەندەیەکی هەرە پەسندی خوا بوو، تێوارەیەک ئەسپە ڕەسەنەکانی بۆ ڕانوێنران و، هەر سەرگەرمی تەماشاکردن و دەست بە لاق و گەردنیان داهێنانیان بوو، هەتا لێی ون بوون و ڕاشیگەیاند کە بە هۆی یادی خواوە خۆشیویستوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَـٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّـٰفِنَـٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَـٰنَ ﴾، (سولەیمان)مان، بە داوود بەخشیی، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ، ئەمە هەم مەدحە بۆ داوود، کە هێندە لەلای خوا خۆشەویست بووە، منداڵی باشی پێ ببەخشێ، هەم مەدحێکی گەورەشە بۆ سولەیمان، کە سولەیمان مادام بەخشراوی خوا بێ، دیاریی و خەڵاتی خوا بێ، خوا ﷻ شتی چاک نەبێ نابەخشێ بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام).

ئنجا هەر وەک ئاگادارکردنەوەی خوێنەرانی بەڕێز، ئەوە دەڵێم: خاوەنی (التحرير والتنوير)، (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئەم عیبارەتە دەڵێ: (وَمِنْ حُسْنِ المنَاسَبَةِ لذكر موهبة سُليمان، أَنَّهُ ولد لداود من

---

(١) ج٢٣، ص٢٢٥٣.

**المرأة الَّتِي عُوتِبَ دَاوُدَ لأَجْل استنزال زَوْجها أُورِيَا عَنْهَا كَمَا تَقَدَّم)**، واتە: لە چاکیی گونجاویی باسکرانی ئەمە ئەوەیە، کە خوا باسی بەخشرانی سولەیمانی کردوە، وەک کوڕێک لەو ژنەی کە داوود لەسەری سەرزەنشت کرا، لەبەر ئەوەی ئەو ژنەی لە مێردەکەی خۆی، کە ئۆریا بوو، ئەستاند و داوای لێکرد کە دەستبەرداری بێ!!

بە ڕاستیی من سەرم سوڕدەمێنێ لە زانای وەک (**محمد الطاهر بن عاشور**)، کە بینا لەسەر ئەفسانەیەکی پەیمانی کۆن، کە پێشتر باسمان کردو، ئەو ئەفسانەیە نە لەگەڵ عەقڵدا دەگونجێ و، نە لەگەڵ شەرع دا دەگونجێ و، مسوڵمانێکی سادەو ئاسایی لە خۆی ناوەشێنێتەوە، ئەوە کە پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەک داوود کە حوکمڕان بووە، تەماع بکاتە ژنی یەکێک لە فەرماندەکانی و، ئەو فەرماندەیە بە فێڵ و تەڵەکە بنێرێ بۆ شەڕو بە کوشتی بدات و، دوایی ژنەکەی مارە بکاتەوە، بەڵکو بەپێی قسەی پەیمانی کۆن، پێش ئەوەش کە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات، لەگەڵی جووت بێ و سولەیمانیشی بە سکی بکەوێ بە زۆڵیی!! پێم سەیرە (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی دا کە تێگەیشتنی باش باشی زۆر تێدان، بەڵام جار جار ئەو درۆو دەلەسانەی پەیمانی کۆن و ئەو شتە بێ سەرو بەرانەشی تێهاویشتوون، هەڵبەتە تەفسیری (**الطبري**)یش ئەوشتانەی تێدان و هەندێک لە تەفسیرەکانی دیکەش، کە بەڵام وەک (**فخرالدين الرازي**) گوتوویەتی: پیاوی زۆر لاڕێ ڕازی نیە، شتی وای پاڵ بدرێتە لا، بڵێن: تۆ تەماعت لە ژنی هاوەڵێکت کردوە و دوایی بە کوشتت داوەو، ژنەکەیشت هێناوە!! ئەوە زۆر نا جوامێریی و نامەردییەو، هەر کەسێک شتی وا لە پێغەمبەران بوەشێنێتەوە، یان زۆر ناحاڵییە، لە ڕووی عەقڵییەوە، یان دڵ و دەروونەکەی زۆر خراپە، خوا پەنامان بدات، چونکە تۆ شتێک لە پێغەمبەران بوەشێنیەوە، دەبێ چاکتر لە خۆشتی بوەشێنیەوە، ئایا کێ لە خۆی دەوەشێنێتەوە، هاوەڵێکی خۆی تەماع لە ژنەکەی بکات، دوایی بە کوشتی بدات بە فێڵ و ژنەکەشی مارە بکاتەوە!!

کەسێک شتی وا لە خۆی بوەشێنێتەوە، مانای وایە زۆر موخەنەت و دەروون پیسە، کە لە خۆشی نەوەشێنێتەوەو لە پێغەمبەرانی بوەشێنێتەوە، مانای وایە زۆر بەدبین و بەد گومانەو، زۆر نەفام و نەزانە، کە شتی ئاوا لە پێغەمبەران دەوەشێنێتەوە!

بە هەر حاڵ لەوە زیاتری لەسەر ناڕۆم، پێشتر قسەمان لەبارەی ئەو ئەفسانەو درۆو دەلەسەیەوە کردو، دەقی قسەکانیشمان لە پەیمانی کۆنەوە هێنان و سەرچاوەکەیان ئەوێیە، ئەگەرنا داوود ﷺ مەقامی زۆر لەوە بەرزتر بووەو، (سولەیمان)یش خوا بە چاکترین بەندەی خۆی لە قەڵەمی دەدات، ئنجا چاکترین بەندە، چۆن دەبێ لە ئافرەتێکی بێناموس پەیدابێ، کە جارێ هاوسەرەکەی هەر ماوە، بچێ لەگەڵ داووددا ڕابوێرێ و سولەیمانی وەسکی بکەوێ!! نە ئەوە شایستەیە دایکی سولەیمان بێ و، نە سولەیمان شایستەیە لە ئافرەتی وابێ و، نە شتی واش لە داوود دەوەشێتەوە، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا بێ.

٢)- ﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ ﴾، سولەیمان چاکترین بەندە بوو، (المَخْصُوصُ بالعَبْدِ مَحْذُوفٌ، يَعني: نِعْمَ العَبْدُ سُلَيمانُ)، تایبەتکراو بەمەدح فڕێنراوە، واتە: سولەیمان باشترین بەندە بوو، باشترین بەندەش ئەو هەڵەو پەڵەو کەم و کوڕییانەی دەگوترێن، لێی ناوەشێنەوە، خوا ﷻ کە لە ئایەتەکانی دەرسی پێشوودا باسمان کرد، بە یازدە (١١) سیفەتان مەدحی داوود دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ... ﴾، تا کۆتایی چوار ئایەتەکان.

لێرەش بەو شێوەیە مەدحی سولەیمان دەکات، خوا ﷻ دەزانێ کە لە پەیمانی کۆندا، چ دەربارەی ئەو دوو باب و کوڕە بەڕێزە، ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە، کە باب و کوڕ بوون، وێڕای ئەوە کە پێغەمبەر بوون، حوکمڕانیش بوون، چی گوتراوە، ئنجا خوا ﷻ دەیەوێ بە هەموو دنیا ڕابگەیەنێ، کە

ئـەوەی لـە پەیـمانی کۆنـدا هاتـوە، دەربـارەی داوودو سـولەیمان، درۆو دەلەسـەیە، داوودو سـولەیمان ئـەوەن کـە خـوا لـە دوا کتێبـی خۆیـدا پێناسـەیان دەکات، کـە بـەو شـێوەیە مەدحیـان دەکات.

٣)- ﴿إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ بێگومان ئەو زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا). ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە بۆ ئەوە، کە بۆچی سولەیمان باشترین بەندە بووە؟ لەبەر ئەوەی زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا). ﴿أَوَّابٌ﴾، موبالەغەیە لە (آیب: أي كَثِيرُ الأَوبِ)، زۆر گەڕاوە بۆ لای خوا ﷻ، زۆر گەڕانەوەش بۆ لای خوا، مەرج نیە تەنیا لە دوای گوناهان ئینسان بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەڵکو:

١- فەرمانبەرییەکی ئەنجام داوەو گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، خوایە! سوپاست دەکەم کە یارمەتییت دام.

٢- یان: چاکەو نیعمەتێکی خوای لە ژیانی خۆیدا بینیوە، گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، خوایە! من سوپاسگوزارم بۆ تۆ، ئەو چاکەو نیعمەتە لە تۆوەیە.

٣- یان: بەڵایەکی بەسەر هاتوە، گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، خوایە! ئەوە تاقیکردنەوەی تۆیەو بەڵاو گرفتارییەکە، لە پێناوی تۆدا هەموو شتێک ئاسانە.

٤- یان: هەڵەیەکی کردبێ، گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، خوایە! پەشێمانم.

کەواتـە: ﴿إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾، کـە زۆربـەی ڕوونکـەرەوانی قورئـان وایـان لێکداوەتـەوە: زۆر گەڕاوەتـەوە بـۆ لای خـوا، واتـە: زۆری تەوبـە کـردوەو، ئنجـا کـە زۆری تەوبـە کـردوە، مانـای وایـە زۆری گوناهــ کـردوون، یـان زۆری هەڵـە کـردوون!! وانیـە، چونکە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا بـۆ پێغەمبەرانیـش (عَلَيْهِـمَا الصَّـلاةُ وَالسَّلام)و بـۆ غەیـری پێغەمبەرانیـش، مـەرج نیـە هـەر دوای گوناهـان، مـرۆڤ بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا، وەک لـە کتێبـی: (گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا)دا - کـە کتێبێکمـە تاکـو ئێسـتا شـەش جـاران چـاپ کـراوە - باسـم کـردوە کـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، هـەر کەسـە بەپێـی خۆیـەتی، مـەرج نیـە ئینسـان تەنیـا لـە گوناهـەوە بگەڕێتـەوە، بـۆ چاکـە، بەڵکـو:

١- جاری وا هەیە، ئینسان لە ئیلحاد و کوفرو شیرکەوە، دەگەڕێتەوە بۆ خواناسیی و ئیمان و تەوحید.

٢- جاری واش هەیە لە گوناهو تاوانەوە دەگەڕێتەوە بۆ خواپەرستیی.

٣- جاری واش هەیە لە تاعەتێکی کەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ تاعەتێکی زۆر.

٤- جاری واش هەیە لە تاعەتێکی زۆریشەوە هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکات و، ستایشی خوا بکات، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە بارەیەوە هاتوە: هەر کاتێک سڵاوی نوێژە فەرزەکانی داوەتەوە، سێ جاران فەرموویەتی: (أَستَغفِرُ اللهَ، أَستَغفِرُ اللهَ، أَستَغفِرُ اللهَ)[1]، داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، کە بەو شێوەیە ئەو عیبادەتەم ئەنجامدا، کە ڕەنگە شایستەی مەقامی بەرزی تۆ نەبێ، هەروەها لە سوورەتی (النصر)دا، هاتوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾ النصر

واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، هەرکات یارمەتیی خوا هات و مەککە ئازاد کراو، خەڵکت بینی پۆل پۆل هاتنە نێو ئایینی خواوە، بە ستاییش کردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرەو، داوای لێبوردنی لێ بکە، بە ڕاستیی ئەو زۆر تۆبە وەرگرەو، زۆر دەگەڕێتەوە سەر بەندەی خۆی.

واتە: بگەڕێوە بۆ لای خوا ﷻ کە ئەو نیعمەتی کردنەوەو سەرکەوتنەی بە تۆ بەخشیوە.

---

(١) {عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثاً وَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ»، قَالَ الْوَلِيدُ فَقُلْتُ لِلْأَوْزَاعِيِّ كَيْفَ الِاسْتِغْفَارُ؟ قَالَ: تَقُولُ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ} أخرجه مسلم: ١٣٥.

٤)- ﴿ إِذۡ عُرِضَ عَلَيۡهِ بِٱلۡعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک دەمەو ئێوارە ئەسپە ڕەسەنە تیژڕەوەکانی بۆ ڕانوێنران، ﴿ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴾، ئەسپە ڕەسەن و تیژڕەوەکان، (**العَرْضُ: الإِمْرَارُ وَالإِحْضَارُ أَمَامَ الرَّائِي، أَي: عَرَضَ سُوَّاسُ خَيْلِهِ إِيَّاهَا عَلَيهِ**)، (**عَرض**): بریتیە: لە تێپەڕاندن و، ئامادەکردن لە بەردەم کەسێکدا کە دەبینێ و سەرنج دەدا، واتە: ئەوانەی خزمەتی ئەسپەکانیان دەکرد، ئەسپەکانیان لەسەر ڕانواند، بۆ ئەوەی تەماشایان بکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلۡعَشِيِّ ﴾، (**العَشِيُّ: مِنَ العَصرِ إِلَى الغُرُوب**)، (**عَشيٌّ**) لە نوێژی ئێوارەوەیە تاکو نوێژی شێوان.

﴿ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، (**الصَّافِنَاتُ: وَصْفٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوف، إِسْتَغْنَى عَنْ ذِكْرِهِ لِدَلالَةِ الصِّفَةِ عَلَيهِ، لأَنَّ الصَّافِنَ لا يَكُونُ إِلاَّ مِنَ الخَيلِ وَالأَفْرَاس**)، ﴿ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ﴾، وەسفە بۆ مەوسووفێکی قرتێنراو، کە سیفەتەکە دەیگەیەنێ مەبەست پێی چییە؟ چونکە سیفەتی (**صافن**) تەنیا لە وڵاخە بەرزەدا دەبێت (**الصَّافِنُ: القَائِمُ عَلَى ثَلاثِ قَوائِمَ، وَطَرَفُ حافِرِ القائِمَةِ الرَّابِعَةِ عَلَى الأَرض**)، (**صافن**): ئەو ئەسپەیە کە لەسەر سێ لاقان دەوەستێ و، لاقی چوارەمیشی بە ئاستەم سمەکەی دەگەیەنێتە زەوی.

ئەمەش عادەتی ئەسپی ڕەسەنە، کە لەسەر سێ پێیان وەستاوەو لاقێکی پێشەوەی یەکێکیان بە زۆری وایە، لاقی ڕاستی بە ئاستەم سمەکەی دەگەیەنێتە زەوی و دیمەنێکی جوانی هەیە.

(**الجِياد: جَمْعُ الجَوَاد، وَهُوَ الفَرَسُ ذُو الجَوْدَة**) (جیاد) کۆی (جواد)ە، بریتیە لە ئەسپی چاک، یاخود ئەسپی تیژڕەو.

ئەسپەکانی ئاوا بۆ ڕانوێنراون و دیمەنێکی جوان بووە، تەماشای کردوون، چەند جارێ هێناویانن و بردوویانن، دوایی:

٥)- ﴿ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾ ئنجا گوتی: من خۆشەویستیی ماڵ و سامانم خۆشویست، یاخود: ماڵ و سامانم خۆشویست، بە هۆی یادکردنی پەروەردگارمەوە، یان: بەهۆی بەرنامەی پەروەردگارمەوە، بۆ ڕستەی ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾ سێ واتایان لێکداونەوە:

١- ئەو ماڵ و سامانەم ئومێدی ئەوەم پێیەتی، پێی لە خوا نزیک ببمەوەو، خزمەتی ئایین و بەرنامەی خوای پێ بکەم، خزمەتی بەندەکانی خوای پێ بکەم.

﴿ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ ﴾، یانی: من نەک هەر ماڵ و سامانم خۆشویست، بەڵکو خۆشویستنی ماڵ و سامانەکەشم خۆشویست.

وشەی: (خَیر) بە مانای ماڵێکی بە نرخ و بە هادار دێ، کە بەپێی سیاق مەبەستی لەو ماڵ و سامانە، ئەسپەکانی بووە، (خَیر) یانی: (خَیل) لێرەدا، لەسەر ڕای زۆر لە زانایان.

٢- واتایەکی دیکەی ڕستەی: ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾، یانی: ئەو خۆشویستنەم بۆ خۆشویستنی ماڵ و سامان، یان ئەو خۆشویستنەم بۆ ماڵ و سامان کە لە وڵاخە بەرزەکاندا بەرجەستەیە، لە یادی پەروەردگارمەوە، پەیدابووە ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾، یانی: لە یاد کردنم بۆ پەروەردگارمەوە ئەو ماڵ و سامانەم خۆشویستوە، کە وەک ئامرازێک بۆ ڕازیی کردنی خوا بەکاری بێنم.

٣- واتایەکی دیکەشیان لێکداوەتەوە بۆ: ﴿ عَن ذِكۡرِ رَبِّي ﴾، (أَي: أَحْبَبْتُ حُبَّ الخَيرِ، وَهُوَ الخَيْلُ، مُتَجَاوِزَاً ذِكْرَ رَبِّي وَعُدِّيَ بِـ «عَن» بَدَلَ «عَلَى» لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى النِّيَابَةِ عَلَى العِوَضِ، فَصَارَ المَعْنَى أَحْبَبْتُ خَيراً فَجاوَزتُ ذِكرَ رَبِّي، قَالَ الطَّبَرِي: أَحبَبتُ الخيرَ حَتى سَهَوتُ عَن ذِكرِ رَبِّي).

واتە: من ئەو ماڵ و سامانەم خۆشویست کە تێپەڕیم لە یادی پەروەردگارم، یاخود بێ ئاگات بووم لە یادی پەروەردگارم، بە هۆی خۆشویستنم بۆ ئەو

مـاڵ و سـامانەوە، بۆیـەش (أَحبَبـتُ)، بـە وشـەی: (عَـن)، بـەرکاری پـێ خـوازراوە: ﴿أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى﴾، لـە جیـاتی بفەرمـوێ: (أَحبَبـتُ حُـبَّ الخَـيرِ عَلَى ذِكـرِ رَبِّي)، هەڵمبـژارد بەسـەر یـادی پەروەردگارمـدا، (أي: عِوَضـاً عَـن ذِكـرِ رَبِّي)، یـانی: کردمـە جێـداری یـادی پـەروەردگارم و کردمـە قەرەبـووی یـادی پـەروەردگارم، بـەڵام ئـەوەی مـن زیاتـر دێتـە دڵمـەوە، مانـای یەکەمیانـە، واتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى﴾، واتـە: ئـەو خۆشویسـتنەم بـۆ مـاڵ و سـامان، لـە یـادی پەروەردگارمـەوەو فەرمانبەریـی پەروەردگارمـەوە، سـەرچاوەی گرتـووە، نـەک لـە ئـارەزووی نەفسـەوە.

٦)- ﴿حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ﴾، تاکو پەنهان بوو بە هۆی پەردەوە، واتە: تاکو خۆرئاوا بووە، هەر مەشقی بە ئەسپەکان کردوەو تەماشای کردوون و سەرنجی داون.

٧)- ﴿رُدُّوهَا عَلَىَّ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ﴾ ئنجا گوتی: بیانگێڕنەوە (ئەسپەکان) بۆ لام ئیدی دەستی پێکرد، بە دەست پێداهێنان، بە لاقەکانیان و گەردنەکانیان، یانی: دەستی پێدا دەهێنان، هەم دەستی بە لاقیاندا دەهێنا بە چوار پەلیان دا، هەم بە گەردنیشیان دا.

هەندێکـی دیکـەش وایـان لێکداوەتـەوە، کـە دەفەمـوێ: ﴿حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ﴾، واتـە: خۆشەویسـتییم بـۆ مـاڵ و سـامان، لـە یـادی پـەروەردگارم بـێ ئـاگای کـردم، یاخـود لـە نوێـژ بـێ ئـاگای کـردم، تاکـو خۆرئـاوا بـوو، لـە تۆڵەی ئـەوەدا گـوتی: بیانگێڕنـەوە بـۆ لام:

﴿فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ﴾ ئنجـا دەسـتی کـرد بـەوە کە هـەم لاقەکانی پـەی کـردن و بڕینـی، هـەم گەردنیشـیانی بـڕی، وەک صەدەقەیـەک و کەفارەتێـک بـۆ ئـەوە کـە ئـەو ئەسـپانە ئەویـان بـێ ئـاگا کـردوە، لـە نوێـژی عـەصر، یاخـود بـێ ئاگایـان کـردوە لـە یـادی خـوا.

بـەڵام دەڵێـم: ئـەو واتایـە، نازانـم توێـژەرەوانی قورئـان لـە کوێیـان هێنـاوە؟ چونکـە بەپێـی ڕواڵـەتی ئایەتـەکان ئـەوە ناگەیەنـێ، جـارێ (مَسْـح) یانـی: دەسـتپێداهێنان،

نـەك سـەربڕین، خواش ﷻ وشـەی (ذَبح)ی بەکارهێنـاوە لـە قورئاندا: ﴿ فَذَبَحُوهَا ﴾ البقـرة: ٧١، وشــەی (عَقر)یــشی بەکارهێنــاوە: ﴿ فَعَقَرُوهَـا ...﴿٦٥﴾ ﴾هــود، بــەڵام (مَسح) واتـە: دەسـت پێداهێنـان.

ئنجـا: ﴿ حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴾، ﴿ تَوَارَتْ ﴾، کـە بـۆ مێینەیـە، بـۆ کـۆی ئەسـپەکان دەچێتـەوەو بـاسی خـۆر نەکـراوە، بەڵـێ جـاری وا هەیـە کـە ڕاناوێـک بـۆ شـتێک دەچێتـەوە، بـە سـیاق دەزانـرێ، با پێشـتریش بـاسی نەکرابـێ، بـەڵام شـتێک کـە بـاس کرابـێ و ڕاناوەکـە لەگەڵـی دا بگونجـێ، بۆچـی بـۆ وی نەچێتـەوەو، بـۆ شـتێک بچێتـەوە کـە بـاس نەکـراوە؟ ئنجـا لێرەدا خـوا ﷻ لـە مەقامـی مەدحدا باسی سـولەیمان ﷺ دەکات، بـەڵام ئەگـەر لەسـەر ئـەوەی تەماشـای ئەسـپانی کـردوە، نوێـژی چووبـێ، ئـەوە گوناهـەو ئەوکاتـە دەبێتـە زەم و سەرزەنشـت بـۆ سـولەیمان، بـەڵام مەقامەکـە هەمـووی مەقامـی مەدحـە: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ ﴾.

توێـژەرەوانی قورئـان دەڵێـن: ئـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴾، ئەمـە لـە باسـکردندا دواکەوتـوە، ئەگەرنا لـە ئەصڵدا لە پێشـەوەیە، یـانی: دوای ئـەوەی ڕسـتەی: ﴿ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴾ هاتـوە، ئنجا ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ ﴾، گـوتی: بیگێڕنـەوە بـۆ لام، ئنجا ﴿ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴾ هاتـوە، ئنجـا دوایـی لـە کۆتاییەکەیـدا گـوتی: مـن خۆشویسـتنم بـۆ ئـەو مـاڵ و سـامانە، بـۆ یـادی پەروەردگارمـەو، لـە یـادی پەروەردگارمـەوە هاتـوە، وەک زانایـان ئاوایـان تەعبیـر لێداوەتـەوە: ﴿ عَن ذِكْرِ رَبِّي ﴾، (أي: نَاشِئاً عَنْ ذِكْرِ رَبِّي وَطَاعَتِـهِ، وَلَيْـسَ هَـوى النَّفْـسِ)، ئـەو واتایـە گونجاوتـرە لەگـەڵ ئایەتـەکان داو لەگـەڵ پایـەو مەقامـی سـولەیمان ﷺ داو، پێـم وایـە ئـەوی دیکـە زیادەیـە کـە لـە خـۆوە مانایەکـی بـۆ هەڵتاشـین.

هەندێکیش گوتوویانە: کە سولەیمان گوتوویەتی: ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ ﴾، بیگێڕنەوە بۆ لام و، بیگێڕنەوە سەرم، مەبەستی ئەوە بووە، خۆرم بۆ بگێڕنەوەو، گوایە خۆر گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمان بۆ ئەوەی نوێژی عەسرەکەی لە کاتی خۆیدا بکات!! کە ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، سولەیمان ﷺ بەندەیەکی هێندە لە خوا نیزیک و بۆ خوا صوڵحاو بووە، لێی ناوەشێتەوە، بڵێ: ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ ﴾، فەرمان بکات، خۆری بۆ بگێڕنەوە!! بەڵکو فەرمانی کردوە بە مەیتەرەکان (سوّاس الخيل)، بەوانەی خزمەتی ئەسپەکانیان کردوە ﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ ﴾، ئەسپەکانم بۆ لا بێننەوەو، ئیدی دەستی پێدا هێناون، دەستی بە لاقەکانیان و بە گەردنیاندا هێناوە، وەک خزمەتکردنێک و هاندانێک و، دڵخۆشبوونیش بەو نیعمەتەی خوا، کە لە یادی خواو لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاریان دێنێ، لە جەنگ و جیهاددا، بۆ ڕزگارکردنی ستەمدیدان و بڵاوکردنەوەی ئایین و پەیام و بەرنامەی خوا ﷻ، نەک مەبەست ئەوە بێ کە خۆرم بۆ لا بگێڕنەوە، بۆ ئەوەی نوێژەکەم لە کاتی خۆیدا بکەم!! ئەو تەعبیرە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

ئنجا وڵاخە بەرزە، کە لە کوردییدا وڵاخە بەرزە، هەم ئەسپ دەگرێتەوەو هەم ماییـن و هەم ئێستریش بەنێرو مێ وە، کە لە ئەنجامی چاککردنی ئەسپ لە کەردا (ئەسپ لە ماکەر چاک دەکرێ) ئەو بێچوەی کە دەیانبێ، ئەگەر نێر بێ یان مێ بێ، پێی دەگوترێ: ئێستر، کە نەزۆکە، ئنجا ئەو چوار جۆرە، واتە: هەم ئەسپ و ماییـن، نێرەو مێیەی ئەسپ و وڵاخە بەرزە، هەم ئێستر نێرو مێی، هەموویان لە کوردەواریی دا پێیان دەگوترێ: وڵاخە بەرزە، کە لە چاو گوێدرێژ بەرزترن، هەروەها پێشیان دەگوترێ: یەک سم، بۆ ئەوەی جیابکرێنەوە لە کەڵ و گامێش و گاو مانگاو مەڕو بزن، کە ئەوانە سمەکەیان دوو فاقە، بەڵام هی ئەوان یەک سمە، پێغەمبەر ﷺ یش لە بارەی وڵاخە بەرزەوە دەفەرموێ: **{الخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَومِ القِيامَةِ}** **(أخرجه البخاري: ٣٦٢٤، ومسلم: ١١٧١، وغيرهما)** واتە: وڵاخە بەرزە تاکو ڕۆژی قیامەت خێرو چاکەی بە نێو چاوانەوە هەیە، (واتە: خێرو بەرژەوەندیی تێدا هەیە، بەکاردەهێنرێ و بەهرەی لێ وەردەگیرێ).

**مەسەلەی دووەم:**

**تاقیکردنەوەی خوا بۆ سولەیمان، بە فڕێدانی جەستەیەک بۆ سەر کورسییەکەی و، پاشان گەڕانەوەی سولەیمان بۆ لای خواو، داوای لێبووردن لێکردنی و، داوای دەسەڵاتێکی بێ وێنەو حوکمڕانییەکی بۆ جگە لە وی نەشیاو، لێکردنی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە سولەیمانمان تاقیکردەوە، (أي: وَلَقَدِ ابْتَلَيْنَا سُلَيْمَانَ)، وەک (الطبري) گوتوویەتی، تاقیمان کردەوەو جەڕباندمان، تاقیکردنەوەش بەڵێ جاری وا بە نیعمەت و بە خۆشیی دەبێ، بەڵام بە زۆریی وایە، بە گرفتاریی و بە ناڕەحەتییان دەبێت، کە ئەو تاقیکردنەوەیەی سولەیمان بە گرفتاریی و ناڕەحەتییەک بووە.**

**٢)- ﴿ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ﴾، جەستەیەکمان فڕێدایە سەر کورسییەکەی، مەبەست لە کورسییەکەی ئەو کورسییە بووە کە لە سەری دانیشتوە بۆ حوکمڕانیی کردن، کە دوایی باس دەکەین مەبەست لەو جەستەیە چییە؟**

**٣)- ﴿ ثُمَّ أَنَابَ ﴾، دوایی پەشێمان بووەوەو گەڕایەوە بۆ لای خوا، چونکە (إِنَابَةُ)، بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا لە ناخەوە، (التَّوْبَةُ إِلَى اللهِ مِنَ الْقَلْبِ).**

**٤)- ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى ﴾، گوتی: پەروەردگارم! لێم ببوورە. کەواتە: هەڵەو کەم و کوڕییەک بووە لەلای سولەیمانەوە.**

**٥)- ﴿ وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ﴾، موڵک و حوکمڕانییەکم پێ ببەخشە، کە لە دوای من بۆ کەس نەگونجێ و نەلوێ.**

٦)- ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾، بە دڵنیایی هەر تۆی زۆر بەخشەر، یانی: بۆیە حوکمڕانیی و دەسەڵاتێکی وام پێ ببەخشە، کە بۆ کەس نەگونجێ لە دوای من، لەبەر ئەوەی بەس تۆ شایستەی ئەوەی، چونکە زۆر بەخشندەو بەخشەری.

## چەند سەرنجێک لەبارەی ئەو تاقیکرانەوەی سولەیمانەوە:

زانایان وەک چۆن لە بارەی بەسەرهاتەکەی پێشێ، (مەسەلەی ئەسپەکان)ەوە، مەبەست پێیان چییە، کە ڕانوێنراون لەسەر سولەیمان؟ قسەو باسیان زۆر بووە، لە بارەی ئەم بەسەرهاتەشەوە زۆر قسەیان کردوەو، مشت و مڕی زۆریان بووە، بەڵام ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، بە بێ کەوتنە ژێر کاریگەریی پەیمانی کۆن و بەبێ کەوتنە ژێر کاریگەری هەندێک گێڕدراوان (روایات)و، بەبێ کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو شتانەی زانایان هێناویانن، کە هەندێکیان سەرچاوەیان نادیارەو، زۆربەشیان سەرچاوەیان دیارە، کە خاوەن کتێبەکانن، چ ئەوەی کە لە پەیمانی کۆندا هەیە، چ ئەوەی کە دەماو دەم لە هەندێک لەو زانایانەی کە جوولەکە بوون، یان نەصرانیی بوون و، یاخود مسوڵمان بوون، هەندێک شتیان لێ گێڕدراوەتەوە، ئەگەر بەبێ ئەوەی بکەوینە ژێر کاریگەریی ئەوانە، تەماشای خودی ئایەتەکان بکەین، ئاوامان دێتە بەرچاو، کە خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئێمە سولەیمانمان ﷺ تاقیکردەوەو، جەستەیەکمان فڕێدایە سەر کورسییەکەی، دوایی سولەیمان ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خواو پەشێمان بووەوەو، داوای لێبووردنی لە پەروەردگاری کرد، گوتی: پەروەردگارم! لێم ببوورەو، حوکمڕانیی و موڵکێکم پێ بدە، کە لە دوای من بۆ کەس شایستە نەبێ و نەگونجێ، بێگومان هەر تۆی زۆر بەخشەر.

ئەمە مانای ئایەتەکانە زۆر بە ڕوونیی.

**بەڵام ئایا مەبەست لەو (جَسَد)ە، چییە:**

١- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (جَسَد) نازانرێ چییە؟!، مەرج نیە ئێمە هەرچی لە قورئاندا هاتوە، هەمووی بزانین، ئەم (جَسَد)ە، نازانین، خوا دەفەموێ: جەستەیەکمان فڕێدایە سەر کورسییەکەی سولەیمان، دەگونجێ ئەوە نهێنییەک بێ لە نێوان خواو سولەیماندا، هەندێک وایانگوتوە.

٢- هەندێک گوتوویانە: مەبەست لەو (جَسَد)ە، جەستەی سولەیمان خۆی بووە، واتە: سولەیمان نەخۆش بوو و، تووشی حاڵەتێک بوو کە توانای حوکمڕانیی لە دەست دابوو، توانای کۆنترۆڵکردنی وڵاتەکەی لە دەست دابوو، وەک جەستەیەکی بێ ڕووحی لێهاتبوو، (أبو مسلم الأصفهاني) وایگوتوە.

٣- هەندێک گوتوویانە: مەبەست لە جەستەیەک، منداڵێکی نوقسانە، کە لەو بارەوە دوایی فەموودەیەک دێنین، ئەویش ئەوەیە کە سولەیمان گوتوویەتی: من بەسەر هاوسەرەکانمەوە دەگەڕێم و هەموویان کوڕیان دەبێ و، کوڕەکانیش هەموویان دەبنە جەنگاوەر لە ڕێی خوادا، بەڵام لە بیری چووە بڵێ: (إن شاء الله)، ئەگەر خوا بیەوێ، بۆیە لە هەموو هاوسەرەکانی، تەنیا یەکێکیان دوو گیان بووە، ئەویش منداڵێکی نوقصانی بوو، وەک پارچە گۆشتێک و هێناویانە لەسەر کورسییەکەیان داناوە، کە ئەوەتان بووە!!

٤- ڕایەکی دیکە ئەوەیە، کە مەبەست لەو جەستەیە شەیتانێک بووە، کە ئەویش بەسەرهاتێکی دوورو درێژی هەیە، کورتەکەی ئەوەیە: گوایە ڕۆژێک سولەیمان دەچێت خۆی بشوات، یان بۆ تارەت گرتن، ئەنگوستیلەکەی دەداتە خزمەتکارێکی، شەیتانیش خۆی دەباتە سەر شێوەی سولەیمان و دەڵێ: بێنە ئەنگوستیلەکەم، ئەویش وا دەزانێ سولەیمانەو ئەنگوستیلەکەی دەداتێ، گوایە بە هۆی ئەو ئەنگوستیلەیەوە ئەو شەیتانە حوکمڕانیی دەکات لە شوێنی سولەیمان و دەڵێ: من سولەیمانم، دوایی کە سولەیمان دێتەوە، دەڵێ: کوا ئەنگوستیلەکەم؟ دەڵێ: ئەنگوستیلەی چی؟ دامانەوە بە سولەیمان! دەڵێ: من سولەیمانم، دەڵێ: نەخێر، ڕاست ناکەی، سولەیمان هات و ئەنگوستیلەکەی

برد! بەسەرهاتێکی ئاوا هەیە، ئنجا ئایا ئەو شەیتانە ناوی چی بووە؟ هەندێکیان گوتوویانە: ناوی (صەخر) بووە، هەندێکیان گوتوویانە: ناوی (ئاصەف) بوودو، هەندێکیش گوتوویانە: ناوی (ئاصەر) بووە، هەندێکیش گوتوویانە: ناوی (حەبقیق) بووە!

ئنجا با ئەو دەقەش بێنین کە پاڵ دەدرێتە لای پێغەمبەر ﷺ بەڵام بە ڕاستیی من گومانم لێی هەیە، کە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە هەر دەیهێنم، دەڵێ: {قَالَ سُلَيْمَانُ: لَأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى سَبْعِينَ امْرَأَةٍ كُلُّ وَاحِدَةٍ تَأْتِي بِفَارِسٍ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَمْ يَقُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَطَافَ عَلَيْهِنَّ، فَلَمْ تَحْمَلْ إِلَّا امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ جَاءَتْ بِشِقِّ رَجُلٍ، فَجِيءَ بِهِ عَلَى كُرْسِيِّهِ، فَوُضِعَ فِي حِجْرِهِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَجَاهَدُوا كُلُّهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُرْسَانًا أَجْمَعُونَ} (أخرجه البخاري: ٦٦٣٩، ومسلم: ١٦٥٤).

واتە: سولەیمان عليه السلام گوتی: ئەمشەو بەسەر حەفتا ژنەوە دەگەڕێم، (واتە: لە هاوسەرەکانی، کە ئەو کاتە نەبەستراوەتەوە بە چوارەوە، یاخود بە زیاترەوە، بەڵکو بەبێ سنوور بۆیان هەبووە ژن بێنن، بەسەر حەفتا ژنەوە دەگەڕێم)، هەر کامێکیان سوار چاکێکیان دەبێ لە ڕێی خوادا، جەنگ و جیهاد بکات، بەڵام لەبیری چوو بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ، بۆیە بەسەر هەر حەفتایانەوە گەڕا، بەڵام تەنیا یەک ژنیان تۆڵدار بوو، ئەویش نیوە منداڵێکی بوو، بۆی هێنرا کە لەسەر کورسییەکەی بوو، لە کۆشی دا دانرا، {گوایە پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی:} سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر گوتبای: (إِنْ شَاءَالله)، (حەفتا کوڕی دەبوون و) هەموویان دەبوونە سوارچاک و تێکڕاش لە ڕێی خوادا جەنگیان دەکرد.

ئەمە بەڵێ لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، بەڵام وەختێک ئەم دەقە لە مەحەکی عەقڵ و واقیع دەدەین، ڕاست دەرناچێ، بۆیە دەڵێین: فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نیە، بۆچی؟ با تەماشا بکەین:

١- ئەوە کە پیاو بتوانێ لە شەوێکدا لەگەڵ حەفتا (٧٠) ئافرەتدا جووت بێ، شتێکی زۆر لە عەقڵ دوورە، لە ڕووی توانای جینسییەوە.

٢- لە ڕووی کاتەوە، ئەگەر بڵێین: خوا هەندێک شتی بۆ پێغەمبەران کردوە، وەک موعجیزەیەک و، ئەوەش شتێکی یاسا دڕ (خَارِقُ العَادَة) بووە، باشە، بەڵام ئەگەر وەک کات و واقیع تەماشای بکەین: ئایا شەوێک بایی ئەوە دەکات کە پیاو بتوانێ بچێتە لای حەفتا (٧٠) هاوسەر؟ بێگومان جووتبوونی پیاو لەگەڵ ژنیدا ئەگەر تەنیا دە (١٠) خولەکی پێ بچێ، کە ئەوەش دوورەو بە لای کەمەوە چارەگێک، بیست خولەکی پێ دەچێ، ئەگەر یەکی تەنیا (١٠) خولەکی پێ چوو بێ، لەگەڵ (٧٠) ئافرەتدا جووت بوون: (٧٠ × ١٠) دەکاتە حەوتسەد (٧٠٠) خولەک، ئەویش دەکاتە (١١) سەعات و (٤٠) خولەک، ئەوە ئەگەر هەر یەکی (١٠) خولەک بێ، بەڵام ئەگەر بیکەینە یەکی (٢٠) خولەک، مانای وایە دەکاتە (٢٣) سەعات و ئەوەندە، خولەک واتە: دەوری (٢٤) سەعات دەکات، دەقەکە دەڵێ: لە شەوێکدا، بەڵام (٢٤) سەعات دەخایەنێ!!

کەواتــە: ئــەو دەقــە ناگونجــێ فەرمایشــتی پێغەمبــەر ﷺ بــێ، بەڵــێ ئەگــەر گوتبــای: حــەوت هاوســەر بــوون، ئەگــەر گوتبــای دە (١٠) بــوون، ڕێــی تێدەچــوو، بــەڵام ئەمــە بــە هیــچ جۆرێــک ڕێــی تێناچــێ فەرمایشــتی پێغەمبــەر ﷺ بــێ، بۆیــە ئەگــەر ئایەتەکــە بــەو شــێوەیە تەفســیر بکــرێ، پێــم دوورە.

ئایــا جنــد دەتوانــن هەنــدێ شــت بکــەن؟ بــە تەئکیــد جنــد دەتوانــن هەنــدێ کار بکــەن، وەک لــەو فەرمایشــتەی پێغەمبــەردا ﷺ هاتــوە، بــەڵام ئایــا دەتوانــن خۆیــان بەرنــە ســەر شــکڵی پێغەمبەرێــک و، لــە جیــاتی ئــەو پێغەمبــەرە حوکمڕانیــی بکــەن؟ ئەوەیــان بــە مەحاڵــی دەزانــم، ئەگەرنــا هەنــدێ شــتیان لــە دەســت دێ، بــۆ وێنــە: پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: [إِنَّ عِفْرِيتَـاً مِـنَ الجِـنِّ تَفَلَّـتَ البَارِحَـةَ لِيَقْطَـعَ عَـلَيَّ صَـلاَتِي، فَأَمْكَنَنِـي اللَّـهُ مِنْـهُ، فَأَخَذْتُـهُ، فَـأَرَدْتُ أَنْ أَرْبُطَـهُ عَـلَى سَـارِيَةٍ مِـنْ سَـوَارِي المَسْـجِدِ حتَّـى تَنْظُـرُوا إِلَيْـهِ كُلُّكُـمْ، فَذَكَـرْتُ دَعْـوَةَ أَخِـي سُـلَيْمَانَ: ﴿وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ﴾، فَرَدَدْتُـهُ خَاسِـئًا] (أخرجـه البخـاري: ٤٨٠٨، ومسـلم: ٥٤١، وغيرهـما).

واتــە: (پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ:) عیفریتێکــی جیننــی دوێنــێ شــەو لێــم یاخیــی بــوو، بــۆ ئــەوەی کــە نوێژەکــەم لــێ ببــڕێ، (ســەرقاڵی بــکات و نوێــژی لــێ ببــڕێ،

بە شێوەیەک لە شێوەکان)و، خوا ﷻ منی بەسەر ئەودا زاڵ کردو گرتم (چند کاتێک خۆی دەخاتە سەر شکڵی بەشەر، یاخود ئاژەڵ، مۆڤ دەتوانێ زەفەی پێ بەرێ، ئەویش خۆی جەستاندوە لە شێوەیەکی ماددیی دا)، ویستم بە کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە، تاکو بەیانی هەمووتان تەماشای بکەن، دوایی قسەی سولەیمانی برامم کەوتەوە یاد: ﴿وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ﴾، (حوکمڕانییەکم بدەیە لە دوای من بۆ کەس نەگونجێ) لەبەر ئەوە بەرهەڵدام کردو، خوا بە زەبوونیی بەرپەرچی دایەوە.

بەڵێ بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە دەبێ تەماشای پەیمانی کۆن نەکەین، ئەو دەقەش کە پاڵدراوەتە لای پێغەمبەر ﷺ لە رووی نێوەڕۆکەوە ڕاست نیەو ناگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ شتی وا بفەرموێ: کە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ، چونکە وەک لە کتێبی: (پێناسەو گرنگیی و پێویستیی ڕێبازی پێغەمبەر) ﷺ دا گوتوومە: یەکێک لە نیشانەکانی هەڵبەستراویی دەقێک بە ناوی پێغەمبەرەوە ئەوەیەکە:

١- لەگەڵ قورئاندا دژ بوەستێ.

٢- یان لەگەڵ عەقڵدا دژ بوەستێ.

٣- یان لەگەڵ عیلم و واقیعدا دژ بوەستێ.

٤- یاخود لەگەڵ سیرەی کردەوەیی پێغەمبەردا ﷺ دژ بوەستێ.

ئەو دەقەش ناگونجێ فەرمایشتی پێغەمبەر بێ، چونکە لەگەڵ واقیعدا دژ دەوەستێ و، لەگەڵ عەقڵ دا دژ دەوەستێ، ئنجا ئایا بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە کام مانا زیاتر دەچێتە عەقڵەوە؟ بە بۆچوونی من ئەو مانایە کە خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە ئەو جەستەیە چییە؟ بەڵێ زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو جەستەیە شەیتانێک بووە، بەڵام ناگونجێ شەیتانێک بچێتە شوێنی پێغەمبەرێک، کە حوکمڕان بووە، کە هەندێک دەڵێن: چل ڕۆژ و،

هەندێک دەڵێن: هەفتەیەک و هەندێک دەڵێن: کەمترو هەندێک دەڵێن: زیاتر، حوکمڕانیی کردوە، بەڵام خوا ئافرەتەکانی سولەیمانی لێ قەدەغە کردوون! پێم وایە ئەمە شتێکی نامەنتیقییەو لەگەڵ پارێزراویی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دا ناگونجێ، کەواتە: باشتر وایە بڵێین: مەبەست لە (جَسَد) ئەوەیە کە خوا ﷻ وەک هێماو ڕەمزێکی خۆی و سولەیمان دەفەرموێ جەستەیەکمان فڕێدایە سەر کورسییەکەی و، خوا ﷻ بەس خۆی دەزانێ ئەوە چۆنەو، نهێنییەکە لە بەینی خۆی پەروەردگارو سولەیمان دا بووە، گرنگ ئەوەیە ئەوە تاقیکردنەوەیەک بووە بۆ سولەیمان و، لە دوای ئەوە سولەیمان داوای لێبوردنی لە خوا کردوەو بۆ لای خو گەڕاوەتەوەو، داوائی لە خوا کردوەو، موڵکێکی پێ بدات و حوکمڕانییەکی پێ بدات، کە لە دوای وی بە کەڵکی کەسی دیکە نەیەت.

ئنجا ئەوەش کە حوکمڕانییەک بە سولەیمان ببەخشرێ، لە دوای وی بە کەڵکی کەسی دیکە نەیەت، دوایی قسەی لێ دەکەین، چونکە هەندێک گوتوویانە: ئەوە حەسەدی لێ دەخوێندرێتەوە، کە سولەیمان ویستبێتی شتێک بەو بدرێ بە کەسی دیکە نەدرێ!

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**باسی ڕامکرانی با بۆ سولەیمان، کە بە نەرمیی بە فەرمانی وی بۆ هەر جێیەک بیەوێ بچێ، هەروەها ملپێکەچکرانی شەیتانەکانیش و ڕۆڵ گێڕانیان لە بیناسازیی و لە دەریاوانیی و غەوواسیی داو، کەلەبچەکرانی هەندێکیشیان و، دەستکراوەکردنی سولەیمان لە بەخشین و نەبەخشیندا، یاخود لە بەرهەڵداکردنی شەیتانە کەلەبچەکراوەکانی، یاخود هێشتنەوەیاندا بە دیلیی، وێڕای نیزیکیی سولەیمان ﷺ لە خوا لە ڕۆژی دوایی داو، لە پاداشتی هەرە باشی خوا بۆی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَـٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَـٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ﴾، ئنجا با مان بۆ ملکەچ کرد بە فەرمانی وی بەشێنەیی بەرەو هەر جێیەک ویستبای دەڕۆیی. خوا ﷻ دوای ئەوەی سولەیمان دوعایەکە دەکات، نافەرموێ: وەڵاممان دایەوە، لە شوێنی دیکە وا دەفەرموێ: بەڵام لێرەدا یەکسەر دەفەرموێ: ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ﴾، با مان بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کرد، خوێندراویشەتەوە: (فَسَخَّرنَا لَهُ الرِّيَاحَ)، بایەکانمان بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کردن.

(التَّسْخِيرُ: الإِلْجَاءُ إِلَى عَمَلٍ بِدُونَ اختِيَارٍ)، (تَسخِير): بریتییە لە پەنا پێبردنی کەسێک بە کارێک بەبێ ئەوەی تێیدا سەرپشک بێ، واتە: ناچارکردنی شتێک بۆ کارێک، یانی: مل پێکەچ کردن و، ڕام و دەستەمۆ کردن.

﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً﴾، بە فەرمانی وی بە نەرمیی دەڕۆیشت، (الرُّخَاءُ أَي: لَيِّنَةٌ طَيِّبَةٌ، أَو مُطِيعَةٌ لِسُلَيمَان، وَاللَّيِّنَةُ الَّتِي لا زَعْزَعَةَ فِي هُبُوبِهَا)، کە دەفەرموێ: (رخاء)

واتە: نەرم و خۆش و، ملکەچ بۆ سولەیمان، (لَيِّنَةً) ئەو بایەی کە گڤە گڤ و بەرزیی و نزمیی تێدانیەو بەشێنەیی دەڕوات، یەکێک بۆی هەیە، بڵێ: ئەدی بۆچی خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ ﴾، واتە: بۆ سولەیمان بامان بۆ دەستەمۆو ملکەچ کرد، هەڵکردوو بوو بە توندیی، (بایەکی بەهێز بوو)، بە فەرمانی ئەو بۆ سەر ئەو زەمینە دەچوو کە پیت و پێزمان تێخستوە، ئێمە بە هەموو شتێک زانا بووین. لەوێ دەفەرموێ: بایەکی توندو تیژو بەهێز بوو، لێرەش دەفەرموێ: بایەکی نەرم و نیان بوو؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە ئەگەر ویستبای زۆر خێرا دەڕۆیی و، ئەگەر ویستباشی نەرم و هێواش دەڕۆیی، یاخود لەو ڕووەوە کە بە قسەی سولەیمان ئەو بایە جووڵەی دەکرد، نەرم و ملکەچ بوو، بەڵام لەو ڕووەوە کە بە خێرایی دەڕۆیشت بەهێزو توند بوو، واتە: نەرمییەکەی بە ئیعتیبارێک و توندییەکەی بە ئیعتیبارێک، لەو ڕووەوە کە لە قسەی سولەیمان دەرنەچووە، نەرم بووەو، لەو ڕووەوەش کە بە خێرایی ماوەکەی بڕیوە، توندو خێرا بووە.

﴿ حَيْثُ أَصَابَ ﴾، بە فەرمانی وی بۆ هەر شوێنێک کە ئەو ویستبای، دەچوو ﴿ حَيْثُ أَصَابَ ﴾، أي (حَيْثُ أَرَادَ، حَيْثُ قَصَدَ: وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ الصَّوْبِ: الجِهَة، قِيْلَ: أَصَابَ الصَّوَابَ، فَأَخْطَأَ الجَوَابَ)، واتە: ﴿ حَيْثُ أَصَابَ ﴾، یانی: (حَيْثُ أَرَادَ)، واتە: بۆ هەر شوێنێک کە ویستبای، بۆ هەر شوێنێک کە مەبەستی بووایە، کە: (أَصَابَ)ش، داتاشراوە لە (صَوب)ەوە، یانی: (جِهَة) لایەک کە مرۆڤ بۆی دەچێ، لە زمانی عەرەبییدا گوتراوە: (أَصَابَ الصَّوابَ، فَأَخْطَأَ الجَوَاب)، واتە: ویستی ڕاستیی بپێکێ، بەڵام لە وەڵامەکەدا هەڵەی کرد.

٢)- ﴿ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴾، شەیتانەکانیش زۆرێکیان بیناسازو گەوهەر دەرهێنەر، یاخود دەریاوان، بوون، لێرەدا (كُلّ) بە مانای (كَثِير) دێ، زۆر لە شەیتانەکانیش بیناسازیان بۆ دەکردو، دەریاوانییشیان بۆ دەکرد.

٣)- ﴿ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴾، ئەوانی دیکەش جووتکرابوون لە کۆت و پێوەنداندا، (أَصْفَاد) کۆی (صَفَد)ە، (صَفَدةٌ: أي قَيْدَةٌ)، (صَفَد) بە مانای کۆت، کە دەکرێتە پێی ئینسانەوە بۆ ئەوەی نەجووڵێ، ﴿ مُقَرَّنِينَ ﴾، (إسمُ مَفْعُولٍ مِنْ قَرَنَهُم، مُبَالَغَةٌ فِي قَرَنَهُ، أي جَعَلَهُ قَرِيناً لِغَيْرِهُ لايَنفَكُّ أَحَدُهُمَا عَنِ الأخر)، (مُقَرَّن) ناوی بەرکارە، لە (قَرَنَهُ)، واتە: جووتی کرد، کە ئەمە (مُقَرَّن) لە جیاتی بفەرموێ: (مُقْرَن) زێدەڕۆییە لەوەدا کە جووتکراوە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا، بە شێوەیەک کە هیچ کام لەو دووانە لێک جیا نابنەوەو، دوو کەس دوو کەس پێکەوە کەلەبچە کراون، یاخود کۆت کراون و پێیەکانیان پێکەوە بوون، بۆ ئەوەی نەتوانن ڕابکەن.

(الطبري) لێرەدا لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴾، دەڵێ: (يَقُولُ تَعَالَى ذِكْرُهُ: وَسَخَّرْنَا لَهُ الشَّيَاطِينَ، أي سَلَّطْنَاهُ عَلَيْهَا مَكَانَ مَا ابْتَلَيْنَاهُ بِالَّذِي أَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ مِنْهَا، يَسْتَعْمِلهَا فِيمَا يَشَاء مِنْ أَعْمَالِهِ مِنْ بَنَّاء وَغَوَّاص، فَالْبُنَاة مِنْهَا يَصْنَعُونَ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ، وَالْغَاصَة يَسْتَخْرِجُونَ لَهُ الْحُلِيَّ مِنَ الْبِحَار، وَآخَرُونَ يَنْحِتُونَ لَهُ جِفَانًا وَقُدُورًا، وَالْمَرَدَةُ فِي الأَغْلَالِ مُقَرَّنُونَ)[1].

واتە: خوا ناوی بەرز بێ، دەفەرموێ: شەیتانەکانمان بۆ ملکەچ کردن، واتە: وامان لێکرد کە بەسەریاندا زاڵ بێ و، لە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی دابن، لەجێی ئەوەی کە تاقیمان کردەوەو بەوەی کە جەستەیەکمان لەوان فڕێدایە سەر کورسییەکەی، ئێمە شەیتانەکانمان بۆ ملکەچ کردن، کە لە هەر شتێک دا ویستبای لە کردەوەکاندا بەکاری دەهێنان، لە بیناسازەکان و دەریاوانەکان، بیناسازەکان هەرچی ویستبای لە پەرستگایان و لە پەیکەران، بۆیان دروست دەکردو، دەریاوانەکانیش خشڵیان لە دەریایەکان بۆ دەردەهێنا، {یانی: گەوهەرو مرواریی} هەندێکیشیان مەنجەڵی گەورەو، قابلەمەی گەورەیان بۆ دەتاشین، یاخییەکانیش لە شەیتانەکان، لە کۆت و پێوەندەکاندا جووت جووت پێکەوە بەسترابوون.

---

(١) جامع البيان: ج٢٣، ص٢٦٦.

٤)- ﴿ هَٰذَا عَطَآؤُنَا ﴾ [کە بایەکە دەستەمۆو ملکەچ کراوە، هەروەها شەیتانەکان بەو شێوەیە بۆ سوڵەیمان دەستەمۆ کراون:] ئا ئەمە بەخششی ئێمەیە.

٥)- ﴿ فَٱمۡنُنۡ أَوۡ أَمۡسِكۡ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾، ئنجا چاکە بکە، یاخود دەست بگرەوە، ببەخشە، یاخود دەست بگرەوە. واتایەکی دیکەی: (فَامْنُنْ)، چاکە بکە لەگەڵ شەیتانەکانداو بەریان بدەو ئازادیان بکە، ﴿ أَوۡ أَمۡسِكۡ ﴾، یاخود بیانهێڵەوە، ﴿ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾، بەبێ لێپرسینەوە، واتە: بەبێ سنوور بۆ دانان، تۆ دەستت کراوەیە لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ شەیتانەکاندا، یاخود لە چۆنیەتی مامەڵە کردن دا لەگەڵ ئەو ئیمکانییەتەی پێمان داوی، کە لە سنووری شەریعەتدا تۆ دەستت کراوەیە، دەڵێ: (فامنن: مُسْتَعْمَلٌ فِي الإِذْنِ وَالإِبَاحَةِ وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِن المَنِّ المَكْنِيِّ بِهِ الإِنْعَامَ، وَالإِمْسَاكُ عَكْسُهُ)، (فامنن) بەکارهێنراوە لە مۆڵەتدان و ڕێ پێداندا، کە لە (مَنّ)ەوە داتاشراوە، (مَنّ)یش بریتیە لە چاکەکردن، گرتنەوە (إمساك)یش پێچەوانەکەیەتی و، بریتیە لە نەبەخشین و چاکە نەکردن.

٦)- ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾، {بە نسبەت دنیاوە بەو شێوەیە، خو دەفەرموێ:} بە دڵنیایی بۆ وی لەلای ئێمە هەیە پلەی نیزیک و سەرەنجامی هەرە چاک، (حسن مآب: المَرْجِعُ الجَيِّد)، پێشتر گوتمان: ﴿ مَـَٔابٖ ﴾، دەگونجێ جاوگ بێ، واتە: گەڕانەوە، دەگونجێ ناوی شوێن بێ، واتە: شوێنی بۆ لا گەڕانەوە، دەگونجێ ناوی کات بێ، واتە: کاتی بۆ لا گەڕانەوە.

## پرسیارێک و وەڵامەکەی لەبارەی داوایەکی سولەیمانەوە

لێرەدا پرسیارێک هەڵدەستێ کە سولەیمان (عليه السلام) گوتوویەتی: ﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ ﴾، حوکمڕانییەک و دەسەڵاتێکم پێ بدە، کە لە دوای من بۆ کەس نەگونجێ و نە لوێ؟! کە ئایا ئەو قسەیەی سولەیمان (حەسەد)ی لێ نافامرێتەوە؟!

لەوبارەوە (الطبري) هەندێ قسەی هێناون، قسەکانی هەموو لێ دەگوازمەوە لەگەڵ تۆزێ کورتکردنەوەدا، (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: (إنْ قَالَ لَنَا قَائِلٌ: وَمَا وَجْه رَغْبَة سُلَيْمَان إلَى رَبّه فِي الْمُلْك، وَهُوَ نَبِيّ مِنَ الْأَنْبِيَاء، وَإِنَّمَا يَرْغَبُ فِي الْمُلْك أَهْلُ الدُّنْيَا الْمُؤْثِرُونَ لَهَا عَلَى الْآخِرَة؟ أَمْ مَا وَجْه مَسْأَلَته إِيَّاهُ، إذْ سَأَلَهُ مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْده، وَمَا كَانَ يَضُرّهُ أَنْ يَكُون كُلّ مَنْ بَعْده يُؤْتَى مِثْل الَّذِي أُوتِيَ مِنْ ذَلِكَ؟ أَكَانَ بِهِ بُخْل بِذَلِكَ، فَلَمْ يَكُنْ مِنْ مُلْكه يُعْطِي ذَلِكَ مَنْ يُعْطَاهُ، أَمْ حَسَد لِلنَّاسِ؟ كَمَا ذُكِرَ عَنْ الْحَجَّاج بْن يُوسُف، فَإِنَّهُ ذُكِرَ أَنَّهُ قَرَأَ قَوْله: ﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ ﴾ فَقَالَ: إنْ كَانَ لَحَسُودًا، فَإِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ مِنْ أَخْلَاق الْأَنْبِيَاء! قِيلَ: أَمَّا رَغْبَته إلَى رَبّه فِيمَا يَرْغَب إلَيْهِ مِنَ الْمُلْك ، فَلَمْ تَكُنْ إنْ شَاءَ اللَّه بِهِ رَغْبَة فِي الدُّنْيَا، وَلَكِنْ إرَادَة مِنْهُ أَنْ يَعْلَم مَنْزِلَته مِنَ اللَّه فِي إجَابَته فِيمَا رَغِبَ إلَيْهِ فِيهِ، «ثانياً» وَأَمَّا مَسْأَلَته رَبّه مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْده ، فَإِنَّا قَدْ ذَكَرْنَا فِيمَا مَضَى قَبْل قَوْل مَنْ قَالَ : إنَّ مَعْنَى ذَلِكَ : هَبْ لِي مُلْكًا لَا أُسْلَبْهُ كَمَا سُلِبْتُهُ قَبْل، فَيَكُون حُجَّة وَعِلْمًا لِي عَلَى نُبُوَّتِي وَأَنِّي رَسُولك إلَيْهِمْ مَبْعُوث، «ثالثاً» وَهَب لِي مُلْكًا تَخُصّنِي بِهِ، لَا تُعْطِيه أَحَدًا غَيْرِي، تَشْرِيفًا مِنْك لِي بِذَلِكَ، وَتَكْرِمَة، لِتُبَيِّنَ مَنْزِلَتِي مِنْك بِهِ، مِنْ مَنَازِل مَنْ سِوَايَ، وَلَيْسَ فِي وَجْه مِنْ هَذِهِ الْوُجُوه، مِمَّا ظَنَّهُ الْحَجَّاج فِي مَعْنَى ذَلِكَ شَيْء).

---

(١ ) جامع البيان: ج٢٣، ص١٦٩.

بـە ڕاسـتیی (الطبري) بـە خۆڕایـی نـاو نەنـراوە پێشـەوای ڕوونکـەرەوانی قورئـان، بـۆ تێگەیشـتنی زۆربـەی ئایەتـەکان بـۆ چـوونی زۆر ڕاسـت و ڕوون و ڕێکی هەیـە، هەڵبەتە پارێزراویـش نیـە لـە هەڵـە، تەنیـا پێغەمبەرانـن (عَلَيْهِـمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، لێرەدا قسـەی زۆر جـوان دەکات، دەڵـێ: ئەگـەر بێژەرێـک پێـمان بڵـێ: ڕووی ئـارەزووی سـولەیمان بـۆ لای پـەروەدگاری کـە حوکمڕانیـی پـێ ببەخشـێ، چییـە؟ لـە کاتێکـدا ئـەو پێغەمبەرێکـە لـە پێغەمبـەران و، ئەوانـەی ئـارەزووی موڵـک و حوکمڕانیــی دەکـەن بریتیــن لـە دنیادارانێــک کـە دنیـا هەڵدەبژێـرن بەسـەر دوارۆژدا، بۆچـی سـولەیمان ئـارەزووی حوکـم و حوکمڕانیـی و موڵکـی دنیایـی بـووە؟ هەروەهـا ڕووی ئـەوە چییـە کـە داوای لـە خـوا ﷻ کـردوە کـە موڵـک و حوکمڕانییەکـی پـێ بـدات، کـە دوای وی بـە کەڵکـی کـەس نەیـەت و بـۆ کـەس نـە لـوێ، ئەمـە ڕووەکـەی و پاساوەکەی چییـە؟ چ زیانێکـی پـێ دەگەیشـت کـە هـەر کەسـێک کـە لـە دوای ئـەوەوە دێ، وەک ئـەوەی کـە بـەو دراوە، بەوانیـش ببەخشرێ؟ ئایـا کـە ئـەو قسـەیەی گوتـوە، لەبـەر چرووکیـی بـووەو کە سـیفەتێک بـووە تێیـدا؟ خـۆ لـە موڵکـی ئـەو نـەدەدرا بـەوەی کـە پێـی دەدرا، (هـی وی نەبـوو)، یـان ئایـا حەسـوودیی هەبـووە بەرانبـەر بە خەڵـک؟ وەک لـە حەججاجی کوڕی یوسـفی سـەقەفییەوە باسـکراوە کە فەرمایشـتی خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾، ئـەوەی خوێندۆتـەوە، دوایـی گوتوویـەتی: بە دڵنیایـی ئـەو زۆر حەسـوود بـووە! ئـەو حەسـەدەش لـە ڕەوشـت و ئـاکاری پێغەمبـەران نیـە (ئـەو سـێ ئیشـکال و پرسـیارە دەورووژێنـێ، ئنجـا وەڵام دەداتـەوە)، لـە وەڵامـی ئـەو سـێ پرسـیارو ئیشـکالەدا دەگوترێ:

١- بە نسبەت ئەوەوە کە ئارەزوومەند بووە بۆ لای پەروەردگاری کە موڵک و حوکمڕانیی پێ بدات؟

وەڵامەکـەی ئەوەیـە: ویسـتوویەتی بزانـێ ئایـا پێگـەی لـەلای خـوا چەنـدە، لـەوەدا کـە داوای لـێ دەکات؟ ئایـا خـوا ﷻ تـا چ ڕاددەیـەک وەڵامگـۆی ئـەوە دەبـێ، کـە سـولەیمان داوای لێکـردوەو ئارەزوومەندیـی خـۆی بـۆ دەربڕیـوە؟

٢- بە نسبەت ئەوەوە کە داوای لە پەروەردگاری کردوە، حوکمڕانییەکی پێبدات کە لە دوای وی بۆ کەسی دیکە نەشێ، مەبەستی ئەوە بووە کە حکومڕانییەکم پێ بدە، لێم نەستێنرێ، وەک پێشێ لێم ستێنرا، {(الطبري) لێرەدا ئەو ڕایەی تەبەننیی کردوە کە شەیتانێک بە فێڵ حکومڕانییەکەی سولەیمانی کۆنترۆڵ کردوەو خستوویەتە ژێر ڕکێفی خۆی، کە پێشتر باسمان کرد ئەو ڕایەمان پێ ڕاست نیە} هەروەها بۆم ببێتە بەڵگەو زانیاریی کە بە خەڵکی بگەیەنم: من پێغەمبەری خوام و، نێردراوی تۆم ئەی خوایە! بۆ لای خەڵک ڕەوانکراوم.

٣- ئەوە کە داوای کردوەو گوتوویەتی: حوکمڕانییەکم پێ بدە، کە تایبەت بێ بەمنەوەو مەیدە بە کەسی دیکە، بۆ ئەوە بووە کە خوا ﷻ ڕێزێکی تایبەتیی لێ بنێ و پێگەی بەرز بکاتەوە، تاکو بەهۆی ئەو بەخشینەوە، پێگەو پلەی خۆی لەلای خوای پەروەردگار بزانێ و ئەو تایبەتمەندییەی هەبێت.

هیچ کام لەو ڕووانەش (ئەو سێ ڕووە) کە باسکران، ئەوە ناگرنەوە کە حەججاجی کوڕی یوسوف گومانی بردوە، کە گوتوویەتی: سولەیمان ﵇ حەسوود بووەو، حەسەدیش لە ڕەوشتی پێغەمبەران نیە.

کەواتە: بەو پێیەی قسەی حەججاج بێ، ئەگەر ڕاست بێ، مانای وایە نکووڵیی کردوە لە پێغەمبەرایەتیی سولەیمان ﵇، یاخود نوقسانییەکی پاڵداوەتە لای سولەیمان ﵇ کە سیفەتێکی خراپی هەبووە، کە بریتیە لە حەسەد، هەردووکیشیان هەڵەن، چونکە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە کە سولەیمان پێغەمبەر بووەو، زۆر بە ڕوونییش ڕایگەیاندوە کە باشترین بەندەی خوا بووە، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەبێ لە هەموو گوناهو هەڵەو تاوانی خراپ پارێزراو و پاک بن، بەڵام هەر مرۆڤ بوون و دەگونجێ لە بۆچوونێکدا نەیانپێکابێ، ئیجتیهادێکیان کردبێ نەیانپێکابێ، بەڵام ناگونجێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) گیرۆدەی گوناهان بووبن، شتێک بە ئەنقەست کردبیان و زانیبیشیان گوناهە، هەرگیز شتی وا نابێ.

**لە کۆتایی بەسەرهاتی سولەیماندا ﷺ دەڵێم:**

لـە بـارەی داوودەوە ﷺ باسـمان کـرد، بـە پێـی ئـەو بەسـەرهاتەی کـە لێـمان گێڕایـەوە: ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ... ﴾، واپێدەچێ داوود ﷺ زێدەڕۆیـی کردبـێ لـە خواپەرسـتیی شەخسـییدا، لەسـەر حیسـابی سەرپەرشـتییکردنی خەڵـک و ئیـدارەدانی وڵات، بۆیـە خـوا ﷻ لـەو ڕێیـەوە ئـاگاداری کردۆتـەوەو، هۆشـداریی پێـداوە، بـەڵام سـولەیمان واپێدەچـێ بـە پێچەوانـەی بابیـەوە، زێدەڕۆیـی لـە بـارەی کاروبـار هەڵسـووڕاندن و ئیـدارەدانی وڵاتـدا کـرد بـێ، لەسـەر حیسـابی خواپەرستیی شەخسـیی، لـەم بەسـەرهاتی سـولەیمانیش ئـەوە وەردەگیـرێ، ڕاسـت و دروسـتیش هـەر ئەوەیـە کـە مـرۆڤ وەک پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ هاوسـەنگیی ڕابگـرێ لـە نێـوان بـۆ خوا صوڵحـان و، لەگـەڵ خەڵکـدا گونجانـدا، یاخود لـە نێوان خواپەرسـتیی و خەڵـک دۆسـتیی دا، یاخـود لـە نێـوان جێبەجـێ کـردنی مـافی خـواو، جێبەجـێ کـردنی مـافی خەڵکـدا، ئـەوە ڕاسـت و دروسـتە کـە ئینسـان هەقـی کـەس بـە کـەس نـەدات، وەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: [إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ] (أخرجه البخاري: ٦١٣٩)، واتـە: مـافی پـەروەردگارت لـە سـەرتەو، مـافی خۆتـت لەسـەرتەو، مـافی مـاڵ و خێزانـت لەسـەرتە، بۆیـە مـافی هەرچـی خـاوەن مافـە، پێـی بـدە.

واتـە: نابـێ هەمـوو مافـەکان بـدەی بـە یەکێـک و پێـت وابـێ ئـەوە خواپەرستییە، بـۆ وێنـە: مـافی هەمـووان بـدەی بـە خـوا ﷻ خـوا بـۆ خـۆی ئـەوەی نـاوێ، خـوا بـۆ خـۆی فەرموویـەتی: ئـاگات لـە مـافی میوانـت بـێ و، ئـاگات لـە مـاڵ و خێزانـت بـێ و، ئـاگات لـە جەسـتەت بـێ و، ئـاگات لـە ڕووحـت بـێ و، ئـاگات لـە عەقڵـت بـێ، ئنجا پێـم وایـە ئـەو پەنـدەی کـە لـە کـۆی ئـەو دوو بەسـەرهاتەی داوود ﷺو سـولەیمان ﷺ وەردەگیـرێ، ئەوەیـە کـە ئێمـە دەبـێ لـە مسـوڵمانەتیی و دینداریتییمانـدا، وریـا بیـن و هاوسـەنگیی بپارێزیـن، بێگومـان هاوسـەنگیی (إتـزان)، گەورەتریـن نیشـانەو دروشـمی دینداریـی ڕاسـتەقینەو دروسـتە، کـە ئەویـش بـە تەنکیـد بـە هـۆی چـاک

تێگەیشتن لە قورئان و، چاک پێوە پابەند بوون بە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەواوە ﷺ دەستەبەر دەبێ، ئینسان تاکو لە قورئان شارەزاتر بێ و زیاتر پێیدا قووڵ بێتەوەو، هەتا زیاتریش ئاشنای ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، کە ئەویش هەر قورئانی لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆیدا بەرجەستە کردوە، بەڵێ هەتا ئینسان بە قورئان ئاشناتر بێ و، پابەندتر بێ بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ سەرکەوتووتر دەبێ بۆ ئەنجامدانی دینداریيەکی هاوسەنگ و ڕاست و دروست و، دوور لە زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمیی.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٨)، لە چوار ئایەتی یەکەم دا: (٤١ - ٤٤) بەسەرهاتی ئەییووب گێڕدراوەتەوە، ﷺ کە خوا تاقی کردۆتەوە بە نەخۆشیی و نارەحەتییەکی زۆر، بەڵام خۆڕاگر بووەو لە تاقیکردنەوەی خوادا سەربەرزانە دەرچووە.

لە سێ ئایەتی دوای وان دا: (٤٥ - ٤٧)، باسی هەر کام لە: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام) کراوەو بە چەند وەسفێکی بەرزو نایاب وەسف کراون.

لە ئایەتی هەشتەمیشدا: (٤٨) باسی هەرکام لە: ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل کراوە، ئەوانیش بە بەندە چاکەکانی خوا ﷻ ناوزەند کراون.

﴿ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ
بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ
لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ
إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ
أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ
إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها یادی ئەییووبی بەندەمان بکەوە، کاتێک بانگی پەروەردگاری کرد، کە من (بە هۆی خوتخوتەیەوە) شەیتان تووشی ڕەنج و ئازاری کردووم ﴿٤١﴾ پێیگوترا: لاقت لە زەوی بدە (کانییەک دەردەقوڵێ) یەکسەر کانییەکە دەرقوڵاو گوتمان: ئەمە خۆشۆرگەیەکە ئاوەکەی ساردەو خواردنەوەیەکی پەسندیشە ﴿٤٢﴾ ئەمە بەزەییەکە لە ئێمەوەو پەندو بیرخەرەوەیە بۆ خاوەن عەقڵان ﴿٤٣﴾ خێزانەکەی و وێڕای وان وێنەی وانیشمان پێ بەخشی، (پێشمان گوت) چەپکێک لە (چڵە گیایان) بە دەستت بگرەو پێی لێبدە (لە هاوسەرەکەت)و سوێندەکەت مەشکێنە (بە نەکردنی ئەوەی سوێندت خواردبوو بیکەی، کە بریتی بوو لە لێدانی سەد قامچی لە هاوسەرت)، ئێمە ئەومان خۆڕاگر بینی، چاکترین بەندە بوو بەڕاستیی زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا) ﴿٤٤﴾ هەرروەها (ئەی موحەممەد !) یادی بەندەکانمان: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب بکەوە، خاوەنی دەستان (توانین) و چاوان (زانین) بوون ﴿٤٥﴾ ئێمە ئەوانمان ساغ کردبووەوە بە یادکردنێکی ساغ و بێ خلتەی یادی مەنزڵگا (ی کۆتایی) ﴿٤٦﴾ هەروەها ئەوان لەلای ئێمە لە (بەندە) هەڵبژاردە چاکەکان بوون ﴿٤٧﴾ هەروەها یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل بکە، هەمووشیان لە بەندە چاکەکان بوون ﴿٤٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِنُصْبٍ): (النُّصْبُ، وَالنَّصَبُ: التَّعَب)، (نُصْبُ ونَصَب)، بە مانای ماندوو بوون و شەکەتیی دێن.

(ارْكُضْ بِرِجْلِكَ): لاقت بە زەویدا بدە، (الرَّكْضُ: الضَّرْبُ بِالرِّجْلِ وَالدَّفْعُ بِالرِّجْلِ فَمَتَى نُسِبَ إِلَى الرَّاكِبِ، فَهُوَ إِغْدَاءُ مَرْكُوبٍ، يقَال: رَكَضْتُ الفَرَسَ، وَمَتَى نُسِبَ إِلَى الماشِي، فَوَطْءُ الأَرْضِ)، (رَكْض): بریتیە لە پێ بە زەوی داکوتان، بە پێ پاڵ بە شتێکەوە بنێی، ئنجا ئەگەر (رَكْض) پاڵ درایە لای سوار، ئەوە مەبەست پێی لێخوڕینی ئەو وڵاخەیە کە مرۆڤ سواری بووە و دەنگدانیەتی، دەگوترێ: (رَكَضْتُ الفَرَسَ)، واتە: ئەسپەکەم دەنگدا [کە لاقی لە کەلەکەی دەکوتێ، یان لە ئاوزینگەکەی دەکوتێ و دەڕوا] بەڵام کاتێ پاڵ دەدرێتە لای بابایەک کە دەڕوا (ڕۆیشتوو) مەبەست پێی: پێ بە زەوی دادانە.

(مُغْتَسَلٌ): (المُغْتَسَل: المَكَانُ الَّذِي يُغْتَسَلُ فِيهِ) (مغتسل) خۆشۆرگە ئەو شوێنەیە کە خۆی لێدەشۆردرێ، هەروەها (مُغْتَسَل: المَاءُ الَّذِي يُغْتَسَلُ بِهِ) ئەو ئاوەیە کە خۆی پێ دەشۆدرێ.

(ضِغْثًا): (قَبْضَةُ رَيْحَانٍ، أَو حَشِيشٍ، أَو قُضْبَانٍ، جَمْعُهُ أَضْغَاث)، (ضِغث): بە چەپکێک لە ڕێحانە، یان گیا، یان چەند چڵە گیایەک دەگوترێ، کۆی (ضِغْث)، (أَضْغَاث)ە، چەپکەکان.

(وَلَا تَحْنَثْ): سوێندەکەت مەشکێنە، (حَنَثَ فِي يَمِينِهِ: لَم يَفِ بِها، الحِنْثُ: الذَّنْبُ المُؤثِم)، (حَنَثَ فِي يَمِينِهِ)، سوێندەکەی نەبردە سەر، پێی وەفادار نەبوو، (حِنْث): بە گوناهێک دەگوترێ، مرۆڤ سزابار بکات.

(وَجَدۡنَٰهُ): چنگمان کەوت، بینیمان (الوجدان: يُعَبَّرُ بِهِ عَنِ التَّمَكُّنِ مِنَ الشَّيءِ بِالوجُودِ: ﴿...حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ...﴿٨٩﴾﴾ النساء، ﴿...وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ...﴿٢٣﴾﴾ النمل، وجُودٌ بِالبَصَرِ وَالبَصِيرَةِ، فَقَدْ كَانَ مِنْهُمُ الشَّهَادَةُ بِالبَصَرِ وَاعتِبَارٌ لِحَالِهَا بِالبَصِيرَةِ)، وشەی (وَجْدَان): تەعبیری پێ دەکرێ لەوە کە زەفەر بە بوونی شتێک بەری، لێت هەڵکەوێ، ﴿...حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ...﴿٨٩﴾﴾ النساء، لە هەر شوێنێ بەر پەلتان کەوتن، ﴿...وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ...﴿٢٣﴾﴾ النمل، ئافرەتێکم لێهەڵکەوت، چونکە (وَجَدتُّ): ئەوەیە کە بە چاو ببینی، یاخود بە عەقڵ و دڵ هەست بە بوونی بکەی، کە دەڵێ: ﴿...وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ...﴿٢٣﴾﴾ النمل، هود هود وا بە سولەیمان دەڵێ، لەبەر ئەوەی هەم بە چاو دیتوویەتی، هەم بە عەقڵ و هۆشیشی زانیویەتی، کە ئەو ئافرەتە شاژنی (سبأ) بووە.

(بِخَالِصَةٖ): (خَالِصَة: صِفَةٌ لِمَوصُوفٍ مَحْذُوفٍ، أَي: بِسَبَبِ خَصْلَةٍ خَالِصَةٍ، وَخَالِصَةٌ مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الخُلُوصِ)، (خَالِصَة): سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، واتە: بە هۆی سیفەتێکی (خَالِصَة)دوە، خالِّیصیش چاوگە، بە مانای پاککراوەو ساغکراوە دێ.

(ذِكۡرَى: بمعنى التذكّر) (ذکری) بە مانای بیرکەوتنەوەو وەبیر هاتنەوە، دێ.

(ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ): (جَمعُ مُصْطَفَى)، (مُصطَفَى)، یانی: هەڵبژێرراو (المُصْطَفَين)، کۆیەکەیەتی.

(ٱلۡأَخۡيَارِ): کۆی (خَيِّر)ە، یان کۆی (خَير)ە، (خَيِّر وخَيْر) واتە: زۆر باش و پەسند، (أَخْيَار) کۆیەکەیەتی، ئەوانەی زۆر باش و پەسند بوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٨)، باسی حەوت (٧) لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام) دەکەن، کە بریتین: لە (ئەیووب و ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب و ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیلفل)، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، ئەیووب چوار ئایەتی بۆ تەرخانکراون، ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٤)، کە لە سوورەتی (الأنبياء)دا بەسەرهاتەکەیمان هێناوە، لەوێ ئایەتەکانی: (٨٣ و ٨٤)ی بۆ تەرخانکراون، بەڵام ئێمە بەسەرهاتی (ئەیووب)مان لە تەفسیری سوورەتی (الأنبياء)دا باسکردوە، بۆیە لێرە ناچینە نێو وردەکاریی و درێژەی بەسەرهاتی ئەیووبەوە، دووەمین لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە لەم هەشت ئایەتەدا ئاماژەیان پێکراوە، ئیبراهیمە، ﷺ ئەویش لە سوورەتی ئیبراهیم دا، بەسەرهاتەکەیمان بە درێژیی باس کردوە، پاشان ئیسحاقی کوڕیەتی ﷺ، دواییش یەعقووبی نەوەیەتی، کە یەعقووب کوڕی ئیسحاقە، (ئیسحاق)یش کوڕی ئیبراهیمە، ئێمە بەسەرهاتی ئیبراهیم و ئیسحاقمان بە یەکەوە هێناوە، هەروەها لە سوورەتی (یوسوف) دا وەک چۆن بەسەرهاتی یوسوف خراوەتە ڕوو، لە هەمان کات دا بەسەرهاتی یەعقووبی باببیشی زۆر بە تەفصیل باسکراوەو، بەسەرهاتەکەش زۆر پەیوەستە بە یوسوف و یەعقووبی باببیەوە صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (مريم)دا بەسەرهاتی ئیسحاق و یەعقووب کەم و زۆر ئاماژەیان پێدراوە، دیارە ئەم سێ پێغەمبەرە: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب، لە هەرسێ ئایەتی (٤٥ و٤٦ و٤٧)دا باسکراون، هەروەها هەر کام لە: ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام) لە ئایەتی ژمارە (٤٨)دا، ناویان هاتودو خوا ستایشی کردوون کە لە سوورەتی (الأنبياء)دا بەسەرهاتی ئەوانیشمان خستۆتە ڕوو.

خـوا ﷻ لێرەدا لـەم (٨) ئایەتـەدا سـەرەتا بـاسی ئەیـووب دەكات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ ﴾، ڕووی دوانــدن لــە پێغەمبــەری خاتەمــە موحەممــەد ﷺ: هەروەهـا یـادی بەندەكەمـان ئەیـووب بكـەوە ﴿ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾ (یادی ئـەو كاتەی بكـەوە) كـە بانگـی پـەروەردگاری كـرد، لێی پاڕایـەوە، هـاواری تێیەسـت: ﴿ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴾، (گـوتی:) بـە دڵنیایـی شـەیتان دەسـتی گەیاندۆتـە مـن بەماندوویێتـی و ئـازارەوە، یاخـود: ماندوویەتیـی و ئـازارو ناڕەحەتیـی، تووشـكردووم، ئایـا ئـەو ماندوویەتیـی و ئـازارو ناڕەحەتییـە كـە شـەیتان تـووشی كـردوە، شـتێكی بەرجەسـتە بـووە؟ بـۆ وێنـە: شـەیتان هاتـوە پاڵـی پێوەبنـێ و بیكەوێنـێ؟ یـان ئـازاری بـدات بـە جەسـتە؟ بـە تەئكیـد نەخێـر، مەبەسـت لێرەدا ئەوەیـە: شـەیتان وایكـردوە مانـدوو ببـم و، هەسـت بـە ئـازار بكـەم، كـە دەگونجـێ ئـەوە هەمـووی مەبەسـتی پـێ ئـەو خوتخوتـەو دنـەدان و دڵناڕەحەتكردنـە بـێ، كـە شـەیتان بـۆ مرۆڤـی دێنێتـە پێـش، هەندێـك شـتی دیكـەش لەوبـارەوە باسـكراوە، كـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەكانـدا زیاتـر تیشـكی دەخەینـە سـەر، بـەڵام بەپێـی ئایەتەكـە زیاتـر وادیـارە كـە لـە ڕووی مەعنەویـی و دەروونییـەوە شـەیتان بووبێتـە هـۆكاری ئـەوەی ئەیـووب ﵇ هەسـت بـە ماندوویەتیـی و شـەكەتیی و ئـازارو ناڕەحەتیـی بـكات، ئیبلیـس كـە بـابی شـەیتانەكان و بـابی جیننـە بـە گشـتیی، لـە چەنـد شـوێنێك لـە قورئانـدا بـاسی ئـەوەی كـردوە، كـە ئـەوەی ئـەو دەتوانـێ زەفـەری پـێ بـە مرۆڤـان بـەرێ، هـەر ئەوەیـە كـە دڵیـان ناڕەحـەت بـكات، خوتخوتـەو دنـەدانی خراپیـان بـۆ بـكات، وەك لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا، ئیبلیـس دەڵـێ: ﴿ ...وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِي... ﴿٢٢﴾ ﴾إبراهیـم، واتـە: هیـچ دەسـەڵاتێكم بەسـەرتاندا نەبـوو، جگـە لـەوە كـە بانگـم كـردن و ئێـوەش وەڵامتـان دامـەوە.

ئنجـا كـە ئەیـووب بەو شـێوەیە لـە پـەروەردگاری پاڕایەوە، كـە بەهـۆی شـەیتانەوە تـووشی شـەكەتیی و ئـازارو ناڕەحەتیـی بـووە، یەكسـەر خـوا بـاسی چارەسـەرەكەی دەكات:

﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴾، واتـە: (قُلنَـا لَـهُ)، پێـمان گـوت: بـە پێـت بـڕۆ، یـان پێـت بـە زەویـدا بـدە، ﴿ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾، واتـە: پێـی بـە زەوی داداو یەکسـەر سـەرچاوەیەک هەڵقوڵـی [پێـمان گـوت:] ئەمـە خـۆ شـۆرگەیەکە ساردەو بـۆ خواردنەوەشـە، واتـە: ئـەو کانیـی و سـەرچاوەیە کـە لـە ئەنجامـی پـێ بـە زەوی داکوتـانی ئەیـووب دا، دەرقوڵـی، هـەم بـۆ خۆشـۆردن و هـەم بـۆ خواردنەوەشـە، چونکـە ﴿ مُغۡتَسَلُۢ ﴾، یـانی: خۆشـۆرگە، ئـەو ئـاوەی خـۆی پێدەشـۆررێ، یـان ئـەو شـوێنەی کـە خـۆی لـێ دەشـۆردرێ، ﴿ وَشَرَابٞ ﴾، بـۆ خواردنەوەشـە، واتـە: لێشی بخـۆوەو خۆشـتی پـێ بشـۆ.

﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ ﴾، خێزانەکـەی و وێنـەی ئەوانیشـمان پـێ بەخـشی، واتـە: خێزانەکـەی کـە بەهـۆی نەخۆشـیی و گرفتارییەکـەی ئەیووبـەوە - کـە هەندێـک دەڵێـن: حـەوت سـاڵ بـووەو، هەندێـک دەڵێـن: هـەژدە سـاڵ بـووەو، هەندێـک دەڵێـن: چـل سـاڵ بـووە - کـەس و کارو مـاڵ و خێزانەکـەشی لـێ بڵاوبـووە، یاخـود وەفاتیـان کـردوە، یـان ئـەو لـەوان دابڕابـێ، بەهـۆی نەخۆشـیی و ئازارەکەیـەوە، گرنـگ ئەوەیـە خـوا دەفەرمـوێ: مـاڵ و خێزانەکەیـمان وێدایـەوەو وێنـەی خۆشـیان لەگەڵیانـدا ﴿ رَحۡمَةٗ مِّنَّا ﴾، ئـەوەش وەک بەزەییـەک بـوو لـە لایـەن ئێمـەوە ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، بیـر خسـتنەوەو پەنـدو ئامۆژگارییـش بـوو بـۆ خـاوەن عەقـڵان، خـوا دۆسـتانی خـۆی تاقـی دەکاتـەوە، بـەڵام پشـتیان بەرنـادات، خـوا ﷻ دۆسـتانی خـۆی جـاری وایـە بـە ناڕەحەتییـان تاقـی دەکاتـەوەو، وەبـەر هەورازیان هەڵدەگێـڕێ، بـەڵام بـە تەئکیـد لـە دوای هەمـوو هەورازێـک نشـێوەو، لـە دوای هەمـوو تەنگانەیـەک فەرجانییـەو، لـەدوای هـەر سـەغڵەتییەک ئاسـانییە.

﴿ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا ﴾، ڕسـتەی: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴾، واتـە: (قُلنَـا لَـهُ: ارکُـض بِرِجلِكَ)، پێـمان گـوت: پـێ بـە زەویـدا بکوتـە، لەبـەر ئـەوەی بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، هەروەهـا لێـرەش دا: ﴿ وَخُذۡ بِيَدِكَ ﴾، چەپکێـک بەدەسـتەوە بگـرە، واتـە: پێـمان گـوت: چەپکێـک بـە دەسـتەوە بگـرە ﴿ فَٱضۡرِب بِّهِۦ ﴾، پێـی لێبـدە، بـەو

چەپکە لێبدە ﴿ وَلَا تَحۡنَثۡ ﴾، سوێندەکەت مەخە (با سوێندەکەت لێ نەکەوێ) ﴿ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ ﴾، ئێمە بە خۆڕاگرمان لێ هەڵکەوت، بینیمان، خۆڕاگرە. ﴿ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ ﴾ (ئەیووب) باشترین بەندە بوو ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴾، بێگومان ئەو زۆر (بۆ لای خوا ﷻ) گەڕاوە بوو.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡ ﴾، ئەمە تەعبیرێکی زۆر کورتە، بەڵام ئەگەر تێوەی ڕامێنی، دەزانی کە ئەوە بەسەرهاتێکی دیکەی لەگەڵدایە، کە زانایان ئاوای باس دەکەن و لە هەندێ شوێنەوارانیشدا هاتوە:

ڕۆژێک ئەیووب لە خێزانی تووڕە بووە، لەسەر ئەوەی دوا کەوتوە، یان لەسەر ئەوەی سەرپێچیی لە فەرمانی کردوە، ئەویش سوێندی لێ دەخوا، کە ئەگەر چاک بۆوە سەد قەمچی لێبدا، ئنجا خوا ﷻ بۆ ئەوەی ئەو سوێندەکەی لێ نەکەوێ و، ژنەکەشی لە بەرامبەر ئەو هەموو وەفادارییە چاکەو خزمەتەیدا، سزا نەدرێ، ئەو تەگبیرەی بۆ ئەیووب کردوە کە لە جیاتی سەد قەمچی، چەپکە گیایەک بە دەستەوە بگرە، یان چەپکە شوڕکێکی نەرم، کە سەد (١٠٠) چڵ بێ، ئەگەر ئەو ڕیوایەتە ڕاست بێ کە گوتوویەتی: دەبێ سەد قەمچی لێبدەم، ئەگەر کەمتریشی گوتبێ، کەمتر. ﴿ فَٱضۡرِب بِّهِۦ ﴾، پێی لێبدە ﴿ وَلَا تَحۡنَثۡ ﴾ و سوێندەکەت لە خۆت مەخە، مادام سوێندت خواردوە، زانایان دەڵێن: دیارە ئەوکاتە کەفارەتی سوێند نەبووە، ئەگەرنا خوا دەیفەموو: کەفارەت بدەو، ئەوەی سوێندت لەسەر خواردوە جێبەجێی مەکە، ئنجا لێرە خوا فەرموویەتی: ئەوەی سوێندت لە سەر خواردوە جێ بەجێی بکە، بەڵام بە شێوەیەکی وا کە بۆ هاوسەرەکەت مایەی ئازارو ناڕەحەتیی نەبێ و شتێکی ڕەمزیی بێ، دوایی خوا بەو شێوەیە مەدحی دەکات و دەفەرموێ: ئێمە ئەومان خۆڕاگر بینی، ئەو باشترین بەندە بوو، ئەو زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە، ئەمە بە کورتی بەسەرهاتی ئەیووب و تاقیکرانەوەکەی بوو.

ئنجا باسی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب دەكات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾، هەروەها یادی بەندەكانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب بكە، كە باب و كورو نەوەن ﴿ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، كە خاوەنی دەستان و چاوان بوون، (أُوْلِي: أي: أَصْحَاب)، یانی: خاوەنان، (أَيدِي) كۆی (يَد)ە، یانی: دەستەكان، (أَبصار)یش كۆی (بَصَر)ە، واتە: چاوەكان، یان دیتنەكان، واتە: خاوەنی هێزو ئاگایی و شارەزایی بوون، ئەگەرنا هەموو كەس دوو دەستی هەن و هەموو كەس دوو چاوی هەن، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (دەست): هێزە، هێزی مەعنەویی، ئیرادە، هێزێک كە مرۆڤ بتوانێ ئەو شتانەی كە دەیانزانێ، بیانتوانێ، ئەو شتانەی دەركیان دەكات، جێبەجێیان بكات، مەبەستیش لە (دیتن) شارەزایی و ئاگاییە لەبەر ئەوەی كارەكان كە ئەنجام دەدرێن، بە دەست ئەنجام دەدرێن و، شتەكان كە دەبینرێن، بە چاو دەبینرێن، لەو ڕووەوە خوا ﷻ: ﴿ ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾ی بەكار هێناون، بۆ هێزو بۆ شارەزایی و ئاگاداریی.

﴿ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴾، ئێمە ئەوانمان ساغ كردبۆوە بە سیفەتێكی ساغكراوە كە بریتی بوو لە یادكردنەوەی مەنزڵگا (مەنزڵگای كۆتایی)، واتە: ئێمە وامان لێكردبوون كە ئەوان زۆر بە شێوەیەكی ساغ و بێ خڵتە، یادی مەنزڵگای كۆتاییان دەكرد، ئێمە ئەوانمان یەكلا كردبۆوە بۆ ئەوە، ئێمە پشک و بەشێكی باشمان بە ئەوان دابوو، لە یاد كردنەوەی مەنزڵگای كۆتایی و ڕۆژی دوایی دا.

ئنجا وەك دوایی باس دەكەین: ﴿ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴾، ئەگەر بە تەنوین بێ: ﴿ بِخَالِصَةٖ ﴾ یانی: بە خەصڵەتێكی ساغكراوە، ئەوكاتەش ﴿ ذِكۡرَى ﴾، دەبێتە بەدەلی ئەو ساغكراوەیە، ئەو خەصڵەتە ساغكراوەیە بریتی بووە لە یادكردنەوەی ڕۆژی دوایی و لە بیر بوونی مەنزڵگای ڕۆژی كۆتایی، خوێندراویشەتەوە: (بِخالِصَةِ ذِكرَ الدَّار)، ئێمە ئەوانمان ساغ كردبۆوە بە ساغكراوەی یاد كردنەوەی ڕۆژی دوایی، ئەو كاتەش دەبنە (مُضَافٌ ومُضاف إليه) پاڵدراوو پاڵ وەلادراو.

﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان لە لای ئێمە لە هەڵبژاردە چاکەکان بوون، (مُصطَفَین) کۆی (مُصطَفَی)یە، هەڵبژێدراو ﴿ ٱلْأَخْيَارِ ﴾یش، کۆی (خَیْر) یان (خَیِّر)ە، واتە: چاک، ئەوان لە لای ئێمە لەو بەندانە بوون کە هەڵبژێدراو بوون و، زۆر چاک و پەسند بوون.

لە کۆتاییدا خوا باسی سێ لە پێغەمبەرانی دیکەش دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴾، هەروەها یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل بکەوە، هەر کامێک لەو سێیانەش لە بەندە پەسندو چاکەکان بوون.

هەموو پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بەندە هەرە چاک و پەسندو هەڵبژاردەکانی خوان، وەک لە سوورەتی (النمل)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ...﴿٥٩﴾ ﴾النمل، بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەسەر ئەو بەندانەی هەڵیبژادوون، هەروەها لە سوورەتی (الحج) دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ...﴿٧٥﴾ ﴾الحج، واتە: خوا لە فریشتان و لە خەڵکی نوێنەرانێک هەڵدەبژێرێ [بۆ ئەوەی ڕەوانیان بکاو بیانکاتە نوێنەرو پەیامبەرو پەیامگەیەنەری خۆی] کەواتە: هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هەڵبژاردەو گوڵبژێری خوان لەنێو باغی مرۆڤایەتییدا.

ئەو سێ پێغەمبەرەش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)، پێشتریش باسمان کرد، کە ئێمە لە سوورەتی (الأنبياء)دا قسەمان لە بارەیانەوە کردوە، دیارە ئیسماعیل بەسەرهاتەکەی لەگەڵ بەسەرهاتی ئیبراهیم دا هاتوە لە سوورەتی (إبراهيم)دا، بەڵام ئەلیەسەع و زەلکیفل بەسەرهاتەکەیانمان لە سوورەتی (الأنبياء)دا، لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە لە پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هێناوە، لەبەر ئەوەی سوورەتەکە بە ناوی پێغەمبەرانە، ئنجا هەموو ئەو پێغەمبەرانەی پێشتر قسەمان لێنەکردبوون و بەسەرهاتەکەیانمان نەهێنابوون، لەوێدا هێناومانن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی ئەیوب کە تووشی نەخۆشیی و گرفتێکی گەورە بووەو، پاش پاڕانەوەو هاوار تێبەستنی بۆ لای خوا، خوا دەرووی خێری لێ کردۆتەوەو، بە هۆی لاق بە زەویدادانەوە، کانییەکی لەبەر پێیان دەرقوڵیوەو، هەم بۆ خۆشۆردنی و هەم بۆ لێ خواردنەوەی، ئاوەکەی شیاو بووە، دوایی وێڕای چاک بوونەوەی لەو ئازارو گرفت و نەخۆشییەی کە بۆی دروست بووە، خوا ماڵ و خێزانەکەی پێبەخشیوەتەوەو، هێندەی دیکەشی وێڕای وان پێ بەخشیوە، بۆ چارەسەری سوێند خواردنیشی لە هاوسەری، خوا بۆی داناوە کە بە چەپکێکی چەند چڵیی، کە ئازاری نەبێ، لێیبدات:

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ ﴾، یادی بەندەکەمان ئەییووب بکەوە، واتە: ئەو حاڵەتە تایبەتەی کە ئەییووب بووی، ئەو حاڵەتە تایبەتە یاد بکەوە، ئایا ئەو حاڵەتە تایبەتە چۆن بوو؟

٢)- ﴿ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾، [یادی ئەو کاتە بکەوە] کە هاواری کردە پەروەردگاری، بانگی پەروەردگاری کردو لێی پاڕایەوە و هاواری تێبەست، (النِّدَاءُ: نِدَاءُ الدُّعَاءِ)، لێرەدا

بانگکردن، بانگکردنی لێپاڕانەوەو هاوار تێبەستن و، پەنا پێبردنە، چی گوت کاتێ هاواری کردە پەروەردگاری؟

٣)- ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ﴾ [هاواری کرد، لە پەروەردگای پاڕایەوە گوتی:] کە شەیتان تووشی ماندوویەتیی و ئازاری کردووم.

وشەی (نُصب) هەم خوێنراوەتەوە: (بِنَصْبٍ) هەم خوێندراویشەتەوە: (بِنُصُبٍ)، (نُصْبٌ ونُصُب: وَهُوَ التَّعَبُ وَيُقَالُ نَصَب، أَيْضاً)، (نَصَب) و (نُصُب): ئەم دوو خوێندنەوەیە هاتوون، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەشگونجێ بڵێی: (بِنَصَبٍ)، هەمووی مانای ماندوویەتیی و شەکەتییە، شەیتان منی تووشی ماندوویەتیی کردوە، (عَذَاب)یش بە مانای ئازارو ناڕەحەتیی دێ، تووشی ئەو دووانەی کردووم.

لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٨٣﴾، واتە: یادی ئەیووب بکەوە! کاتێ لە پەروەردگاری پاڕایەوەو هاواری کرد: من زیانم تووش بووە، (ضُرّ)، یانی: نەخۆشیی، یان ناخۆشیی، یان گرفتاریی، لەوێ باسی نەکردوە سەرچاوەکەی چییە؟ بەڵام لێرە باسی کردوە کە سەرچاوەکەی بریتیە لە شەیتان.

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە ئایا شەیتان چۆن توانیویەتی ئەیووب تووشی ماندوویەتی و ئازار بکات؟

یەکەم: هەندێکیان ئاوایان تەعبیر لەو حاڵەتە کردوە، گوتوویانە: (النُّصْبُ وَالعَذَابُ مُسَبَّبَانِ لِمَسِّ الشَّيْطَانِ إِيَّاهُ، أَي: مَسَّنِي بِوَسْوَاسٍ سَبَبُهُ نُصْبٌ وَعَذَابٌ، فَجَعَلَ الشَّيْطَانُ يُوَسوِسُ إِلَى أَيُّوب بِتَعظِيمِ النصب وَالعَذَابِ عِندَهُ، وَيُلْقِي إِلَيْه أَنَّهُ لَم يَكُن مُستَحِقاً لِذَلِكَ العَذَابِ، وَالنَّتِيجَةُ سُوءُ الظَّنِّ بِالله)[1].

واتە: (نُصب)و (عَذاب)، پەیدابووی دەست گەیاندنە شەیتانی ئەون، [واتە: شەیتان کە دەستی گەیاندۆتێ و ئازاری داوە، بە دوو شتان بووە: یەکەم:

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٣، ص٢٧٠.

ماندوویەتیی، دووەم: ئازار) مەبەست ئەوەیە کە شەیتان منی تووشی خوتخوتەو دڵەڕاوکێ کردووە، ئەو خوتخوتەو دڵەڕاوکەیەش لەوە پەیدابووە کە من ماندووم و ئازارم هەیە، شەیتان خوتخوتەی بۆ تەییووب کردوە، کە ئەو ماندوویەتیی و ئازارەی هەستی پێدەکات، زۆری لەلا مەزن بێ، شەیتان دنەی داوەو خوتخوتەی بۆ کردوە، کە تۆ شایستەی ئەو سزاو ئازارە نەبووی، تاکو سەرەنجام گومانی خراپی بەرانبەر بەخوا بۆ پەیدابێ.

کەواتە: بە هۆی (نُصب)و (عَذَاب)ەوە شەیتان زەفەری پێبردوە، یانی: ئەو ماندوویەتیی و ئازارو ناڕەحەتییەی هەیبووە، کە دیار نیە هۆکارەکەی چییە، نەخۆشییەک بووە، خوا بەسەری کردۆتەوە، ئنجا لەو سۆنگەیەوە شەیتان دەستی گەیاندۆتێ، ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ﴾، نەک (نُصب)و (عَذَاب)ەکە شەیتان تووشی کردبێ، بەڵکو ئەو ماندوویەتیی و ئازارەی هەیبووە، شەیتان ئەوەی کردۆتە هۆکارو ئامرازو دەستەچیلەی ئەوە کە دەستی بگەیەنێتێ، دەست گەیاندنەکەشی ئەوە بووە کە خوتخوتەی بۆ بکات و دڵی ناڕەحەت بکات، ئەگەرنا هەموو کەس تووشی ماندوویەتیی و ئازارو ناڕەحەتیی هەر دێ، بەڵام شەیتان ئەوەی زۆر لەلا گەورە کردوە، کە سەرەنجام وای لێبکات گومانی خراپی بەرامبەر بە خوا پەیدابێ و دڵ ڕەنجاوو دڵشکاوبێ بەرانبەر بە خوا، کە دیارە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بەشەر بوون، بەڵام بە تەنکید خوا پاراستوونی، لەوە کە حاڵەتێکی وایان بۆ دروست بێ، گرنگ ئەوەیە شەیتان ئەو هەوڵەی لەگەڵ داوە، ئەمە ڕای (محمد الطاهر بن عاشور)ە.

دووەم: هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: شەیتان تووشی ماندوویەتیی و ئازاری کردوە، واتە: ماندوویەتیی و ئازارەکە شەیتان تووشی کردوە، ئنجا ئەگەر شەیتانیش تووشی کردبێ، هەر لە ئەنجامی خوتخوتەو دنەدانییەوە بۆی بووە، ئەگەرنا نەچووە پاڵی پێوەبنێ، یاخود تووشی نەخۆشییەکی تایبەتیی بکات، وەک لە هەندێ حیکایەتاندا هاتوە کە دوایی باس دەکەین، گوایە: خوا ﷻ کە ئاوا مەدح و ستایشی ئەییووبی کردوە،

ئیبلیس گوتوویەتی: خوایە! تۆ من ئیزن بدەو دەرفەتم بدە، تووشی نەخۆشیی و ئازاری بکەم، ئنجا بۆت دەردەکەویٚ داخۆ خۆڕاگر دەبیٚ، یان نا؟ گوایە خوای پەروەردگاریش ئیزنی داوەو، تووشی نەخۆشیی و ئازاری کردوە! بەڵام من ئەوە بە دوور دەزانم و هیچ بەڵگەیەکیش لەو بارەوە نیە، بەڵگەیەکی نەقڵیی، مەسەلەکە ئەوەیە کە (ئەیووب) یش وەک هەموو ئەو خەڵکەی دیکە صەڵات و سەلام لەسەر ئەییوب بیٚ، تووشی ئازارو ماندوویەتیی و ناڕەحەتیی بووە، بەڵام بە تەئکید هی وی، ئازارو ماندوویەتییەکی بێزاو خەست و خۆڵ بووە، شەیتان لەو ڕێیەوە ویستوویەتی زەفەری پیٚ بەریٚ، یاخود بەهۆی وەسوەسەی شەیتانەوە، تووشی ئەو ماندوویەتیی و دڵ ناڕەحەتیی و ئازارە بووە، ئەو ئازارەش دەگونجیٚ ئازاری جەستەیی بووبیٚ، دەشگونجیٚ هەر ماندوویەتییەکە ماندوویەتیی جەستەیی بووبیٚ، بەڵام ئازارەکە ئازاری دەروونیی بووبیٚ.

٤)- ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴾، پیٚ بە زەویدا بدە، یانی: پێمان گوت... (الرَّكْضُ: ضَرْبُ فِي الأَرْضِ بِرِجلٍ)، (رَكَض): بریتیە لەوەی پیٚ بە زەویدا بکوتی، کەواتە: کە دەفەرمویٚ: ﴿ بِرِجۡلِكَ ﴾، (زِيادَةٌ فِي بَيانِ مَعنَى الفِعْلِ، مِثْلُ: ﴿ ... طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ ... ٣٨ ﴾الأنعام)، وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا هاتوە، کەواتە: ﴿ ٱرۡكُضۡ ﴾، هەر بۆ خۆی واتە: پیٚ بە زەویدا بدە، بەڵام کە فەرموویەتی: ﴿ بِرِجۡلِكَ ﴾، ئەمە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەیە، ڕوونکردنەوەی کردەوەکەیە، هەر وەک چۆن خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ ... ٣٨ ﴾الأنعام، دیارە باڵندە هەر بە دوو باڵەکانی دەفڕیٚ، کە دەفەرمویٚ: ﴿ ... طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ ... ٣٨ ﴾الأنعام، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەیە، یاخود بۆ زیاتر بەیانکردن و تەماشا کردنە بە چاوی خەیاڵ.

٥)- ﴿ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾ ئەمە خۆشۆرگەیەکە ساردەو خواردنەوەشە. وەک زۆرجار گوتوومانە: هەموو ئەو وشەو تەعبیرانەی کە بە سیاق و بە سەلیقەو عەقڵ و هۆش دەزاندریٚن، خوا ﷻ کتێبی خۆی پیٚ قەڵەباڵغ نەکردوون، واتە: ئەییووب پێی بە زەویدادا، کانیی و سەرچاوەیەک دەرقوڵی و پێمان گوت: ﴿ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾، ئا ئەمە خۆشۆرگەیەکە ﴿ مُغۡتَسَلُۢ ﴾، (إِسْمُ مَفْعُولٍ ﴿ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ ﴾، يَعني: مُغْتَسَلٌ بِهِ)،

ئەمە خۆ پێشۆرێکە، ئاوێکە خۆی پێ دەشۆرێ، ﴿ وَشَرَابٌ ﴾، خواردنەوەشە، یاخود ﴿ مُغْتَسَلٌ ﴾، (مَكانُ الغُسلِ)، شوێنی خۆ لێ شۆردنە.

لە سووڕەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: وەڵامـمان دایـەوەو ئـەو ئـازارەی لێـی بـوو، لێـمان لابـرد، بـەڵام لـەم سـووڕەتەدا دەری دەخـات ئازارەکـە چـۆن لابـراوە! لـەوێ خـوا ﷻ بـە کورتیـی دەیهێنـێ، بـەڵام لێـرەدا بۆمـان ڕوون دەکاتـەوە ئازارەکـە چـۆن لاچـووە، خـوا فەمـانی پێکـردوە، پـێ بـە زەویـدا بکوتـێ و پێـی بـە زەویـدا کوتـاوەو، کانیـی و سـەرچاوەیەک دەرقوڵیـوە، ئـەو کانیـی و سـەرچاوەیەش ئاوەکـەی وابـووە، هـەم خـۆی لێ بشـواو، هەم بیشـیخواتەوە، بـۆ ئـەوەی بـە هـۆی خـۆ لێشـۆدنەکەیەوە، نەخۆشـیی و ئازارێـک کـە لە جەسـتەی دا بووبـێ - لـە ڕواڵـەتی جەسـتەی - لابچێ و پـاک ببێتەوەو، بـە هۆی لێخواردنەوەشـیەوە، ئـازاو ناڕەحەتییـەک کـە لـە نێـو جەسـتەیدا بووبـێ، ئـەوەش لابچـێ و، هـەم ڕواڵـەتی جەسـتەی و، هـەم نێـوەوەی جەسـتەی پـاک و خاوێـن ببێتـەوە.

٦)- ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ ﴾، خێزانەکەیمان پێ بەخشی و وێنەی خۆشیان لەگەڵیان، (مِثْلَهُم مَعَهُم، أي: ضِعْفَ عَدَدِهِم).

توێـژەرەوانی قوڕئـان هەندێکیـان گوتوویانـە: کـوڕو کچـەکانی کـە مـردوون، خـوا بـۆی زینـدوو کردوونـەوە، بـاسی خێـزانی نەکـراوە، چونکـە (أهـل) واتـە: نیزیـکانی کەسێک و ئـەو کەسـانەی کـە لـە خانوویەکدا لەگـەڵ مرۆڤـدا دەژیـن، کە بـە تەئکید مەبەسـت پێـی کـوڕو کچـەکانی بـووە، چونکـە هاوسـەرەکەی دیـارە هـەر هەبـووە کـە خـوا دەفەرمـوێ: چەپکێـک گیـا بـە دەسـتەوە بگـرەو پێـی لێبـدە، مانـای وایـە ئەویـان هـەر هەبـووەو مـاوە، بـەڵام کـە خـوا دەفەرمـوێ: ئەهلەکەیـمان وێدایـەوەو وێنـەی خۆشـیان لەگەڵیـان، واپێدەچـێ مەبەسـت پێـی کـوڕو کچـەکانی بـێ، ئنجـا ئایـا کـوڕو کچـەکانی مـردوون و، خـوا بـۆی زینـدوو کردوونـەوە؟! ئـەوە لـەلای خـوا

ئاسانە، بەڵام ئەوە باس نەکراوەو، دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە بەهۆی ئەو نەخۆشیی و ئازارەیەوە، ئەییووب ﷺ تۆزێک تەریک و لاپەڕ بووبێ، یاخود نەیپەڕژابێتە سەر کوڕو کچەکانی و وەک ئەیمابن وابووبێ، بەڵام خوا ﷻ دوایی بۆی کۆکردوونەوە، دوای ئەوە چاک بۆتەوە، هەموویان لێی کۆبوونەوە ﴿ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ ﴾، پێشێ ژمارەیان چەند بووە، خوای پەروەردگار هێندەی دیکەش کوڕو کچی پێداون.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: دوای ئەوەی کە بڵاوبوون، خوا بۆی کۆ کردوونەوە، وەک گوتم، یان ئەوەتا مردوون و بۆی زیندوو کردوونەوە، کە ئەوەش لەلای خوا ئاسانە، بەڵام ڕواڵەتی ئایەتەکان ئەوە ناگەیەنێ، چونکە نافەرموێ: (أحيَينا لَهُ أهلَهُ)، دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ ﴾، پێماندان، کەواتە: واپێدەچێ هەر حاڵەکە ئەوە بووبێ، یان لەبەر ئازارو نەخۆشیی خۆی، ئاگای لەوان نەمابێ و لە حوکمی نەبووندا بوون، یاخود بڵاو بوون و لە ئەنجامی ئازارو ناڕەحەتیی ئەودا، کە هیچیشیان بۆ لەگەڵ نەکراوەو چەند ساڵی خایاندوون، ئەوانیش هەر کەسە ڕەنگە سەرقاڵی کارو ژیانی خۆیان بووبن، بەڵام دوای ئەوەی خوا ئەو دەردو ئازارەی لێ لابردوە، ئەوانیش جارێکی دیکە کۆبوونەوە، خۆیان چەند بوون خوا ﷻ هێندەی دیکەشی پێ بەخشیوە، چونکە لە سوورەتی (الأنبياء) یشدا دەفەرموێ: ﴿ ...وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: خێزانەکەیمان پێ بەخشیەوەو، وێنەی خۆشیان وێڕای وان لەگەڵیان، چەند بوون، هێندەی دیکەشمان پێ بەخشین.

٧)- ﴿ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُولِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ ...رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەموێ: ﴿ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُولِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، لەوێ دەفەرموێ: بەزەییەک بوو لە لایەن ئێمەوە و بیرخستنەوەش بوو بۆ بەندەکان، لێرەش دەفەرموێ: بەزەییەک لە لایەن ئێمەوەو بیرخستنەوەش بۆ خاوەن عەقڵان، کەواتە: خواپەرستان، خاوەن عەقڵانن، ئەوانیشن کە پەند وەردەگرن لە

ڕووداوەکانی ڕۆژگارو لە غەیری خۆیان، وەک گوتراوە: (السَّعِيدُ مَنِ اتعظ بِغَيرِهِ) واتە: بەختەوەر کەسێکە پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ.

٨)- ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ ﴾، پێمان گوت: چەپکێک بە دەستەوە بگرەو پێی لێبدە، (الضِّغْثُ: حُزْمَةٌ مِن حَشِيشٍ أَو رَيْحَانٍ)، (ضِغْث) بریتیە: لە چەپکێک لە گیا (چڵە گیا)، یاخود لە چڵە ڕێحان، ﴿ فَٱضْرِب بِّهِۦ ﴾، پێی لێبدە، یانی: (فَاضْرِب بِهِ زَوْجَتَك)، پێی لە ژنەکەت بدە.

٩)- ﴿ وَلَا تَحْنَثْ ﴾، سوێندەکەت مەخە، دەگوترێ: (حَنَثَ فِي يَمِينِهِ: أَثِمَ بِسَبَبِ عَدَمِ الإلتِزَامِ بِهَا)، (حِنْث): ئەوەیە کە کەسێک سوێند بخوات، دوایی سوێندەکەی لێ بکەوێ، بۆ وێنە: سوێند بخوا ناچێتە ماڵی فلانکەس، دوایی بەبێ ئەوەی کەفارەت بدات، بچێت، ئەوە سوێندەکەی لێ دەکەوێ و گوناهبار دەبێ، لێرە خوا ﷻ ڕێنمایی دەکات و دەفەرموێ: سوێندەکەت لە خۆت مەخە، یانی: ئەوەی سوێندت لێ خواردوە، جێبەجێی بکە، بەڵام بە تەنویلێکەوە، کە لوتف و میهرەبانیی پەروەدگاری تێدا بەرجەستە دەبێ بەرانبەر بە ژنەکەی، ئەویش ئەوەیە لەجیاتی ئەوەی ئەو ژمارە کە گوتوویەتی، ئەوەندە دارەت لێدەدەم، ئەوەندە قەمچییەت لێدەدەم، بە ژمارەی ئەوە چڵە گیا، یاخود چڵە ڕێحان بە دەستەوە بگرێ و پێی لە هاوسەرەکەی بدات، ئەوەش لێدانێکی ڕەمزییە، کە دوایی باسی دەکەین: ئایا ئەوە بەس بۆ ئەییووب بووە، ئەو تەنویلە، کە ئەگەر ناڕێک نەبێ دەڵێین: جۆرێکە لەوەی پێی دەگوترێ: (الحِيلَةُ الشَّرْعِيَّة)، بەڵام بە بارە نیجابییەکەیدا، چونکە فێڵی شەرعیی، ئەگەر بۆ خراپەبێ بۆ حەرام کردنی حەڵاڵ بێ، یان بۆ حەڵاڵ کردنی حەرام بێ، بۆ خواردنی مافی خەڵک بێ، خراپە، بەڵام بۆ دەرباز بوون لە گرفت و کێشەیەک، زانایان قسەیان زۆر لێکردوەو کتێبی گەورەیان لەو بارەوە داناوە، زۆربەیان بەڕەوایان داناوە.

گرنگ ئەوەیە: خوا ﷻ بە ئەییووبی فەرمووو: چەپکێک بە دەستەوە بگرەو پێی لێ بدە، واتە: پێی لە ژنەکەت بدەو سوێندەکەت مەخە.

١٠ ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا﴾، [خوا مەدحی دەكات و دەفەرموێ:] بێگومان ئێمە ئەومان خۆڕاگر بینی.

١١- ﴿نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ﴾، ئەو باشترین بەندە بوو.

١٢- ﴿إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ بێگومان ئەو زۆر گەڕاوەبوو (بۆ لای خوا). ئەوە تەعلیلی ئەوەیە كە بەندەیەكی زۆر چاك بووە، لەبەر ئەوەی زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە، كە دەفەرموێ: ﴿وَجَدْنَٰهُ﴾، یانی: ئێمە لێمان هەڵكەوت، دۆزیمانەوە، بینیمان، كە بەندەیەكی خۆڕاگر بوو لە بەرانبەر تاقیكردنەوەی خوای بەرزدا.

## یازدە هەڵوەستە لە بەرانبەر بەسەرهاتی (ئەییووب)دا

بـە پێویسـتی دەزانـم یـازدە (١١) هەڵوەسـتە لەبەرامبـەر بەسـەرهاتی ئەییووبـدا ﷺ بخەینـە ڕوو، کـە تیشـکی زیاترمـان بـۆ دەخەنـە سـەر ئـەو بەسـەرهاتە، هـەر چەنـد کاتی خـۆی بەسـەرهاتی ئەییووبمـان باسـکردوە، بـەڵام لێـرەش دا ئـەو یـازدە (١١) هەڵوەسـتەیە دەکەیـن:

١- سروشتی ژیانی دونیاوایە، هیچ کەس نامێنێ تێیدا تاقی نەکرێتەوە، تەنانەت پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمَ الصَّلاةُ وَ السَّلام) کە سەرمەشقی بەشەرن، ئەوانیش تاقی دەکرێنەوەو تاقیکردنەوەی پێغەمبەران لە هی خەڵکی دیکە قورسترو سەختتر بووە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: {أَشَدُّ النَّاسِ بَلاَءً الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ} (أخرجه الطيالسي: ٢١٥، وأحمد: ١٤٨١، وعبد بن حميد: ١٤٦، والدارمي: ٢٧٨٣، والترمذي: ٢٣٩٨، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤٠٢٣، وابن حبان : ٢٩٠١، والحاكم: ١٢١)، واتە: ئەوانەی لە هەموو کەس سەختتر تاقی دەکرێنەوە، پێغەمبەرانن، ئنجا ئەوانەی وەک پێغەمبەران دەچن.

یانی: تاکو پتر بۆ خوا صوڵحاوبین، تاقیکردنەوەکەمان قورسترە.

٢- چاوەڕێ کردنی دەرووی خێر لە تەنگانەو گرفتارییداو، ناشوکریی نەکردن، یەکێکە لە سیفەتە گەورەو گرنگەکانی بەندە بۆ خوا صوڵحاوەکان، زانایان هەندێک کتێبیان هەر بەو ناوونیشانە داناوە: (إنتِظارُ الفَرَجِ بَعدَ الشِدَّة)، چاوەڕێ کردنی دەروو لێکرانەوە دوای سەختیی و ناڕەحەتیی، خواش ﷻ هەواڵی پێداوین: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ ﴾الشرح، واتە: بە دڵنیایی لەگەڵ سەغڵەتییدا، ئاسانیی هەیە، گومانی تێدا نیە لەگەڵ سەغڵەتییدا ئاسانیی دێ.

پێشـینانی خۆشـمان گوتوویانـە: {لـە دوای هـەورازان نشـێوە}، {لـە دوای شـینان شـادییە}، {لـە دوای ناخۆشـییان خۆشـییە}.

٣- بەبێ تەحەممول کردنی سەختیی و دژوارییەکانی ژیان، مرۆڤ ئیرادەی بەهێز نابێ و پەروەردە نابێ، وەک چۆن بابایەکی وەرزشکار بەبێ مەشق و ڕاهێنانی سەخت، کە خۆی ماندوو بکات و ئارەقە بکات، سەخت و قایم و پتەو نابێ، بۆیە حیکمەتی ئەوە کە خوا ﷻ ئەو بەندانەی لە خوا نزیکتر بوون، خوا سەختتر تاقیکردوونەوە، وەک چۆن کەسێک لەڕووی جەستەییەوە بیەوێ پلەی زیاتر ببڕێ و مەحکەمترو دامەزراوتر بێ، ئنجا ئەگەر کاراتەیە، ئەگەر کۆنفۆیە، ئەگەر تەواوکاریی جەستەیی (كمال الأجسام)ە، ئەگەر هەڵهێنانی شتی قورسە، زۆرانبازییە، هەتا بیەوێ پلەی زیاتر ببڕێ، دەبێ ڕاهێنان و مەشقی قورستر بکات و زیاتر خۆی ماندوو بکات، خواش ﷻ پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)و، لە دوای ئەوان جێگرانی ڕەسەنی پێغەمبەران: زانایان و دۆستانی خۆی، سەختتر تاقیکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی ویستوویەتی مەحکەمتریان بکات و چاکتریان بکات و پاکتریان بکات، تاکو باشتر بتوانن ڕۆڵی خۆیان لەسەر مەشق بوونی دینداریدا بۆ خەڵک و کۆمەڵگای خۆیان بگێڕن.

٤- لە بەسەرهاتی ئەییووبەوە فێر دەبین کە: (خۆڕاگریی تاڵە، بەڵام بەرەکەی شیرینە)، هەمیشە خۆڕاگران لەسەر ڕێی ڕاست و هەق، سەر بەرزن وسوودمەندو براوەن، بەڵام ئەگەر ئینسان لەسەر ڕێی ناهەق بێ، خۆڕاگریش بێ جگە لە پەشێمانیی هیچی دەست ناکەوێ.

٥- هەر تاقیکردنەوەیەک کە بۆ مرۆڤ دێتە پێش، بۆ دەوروبەریشی هەر تاقیکردنەوەیە، پێویستە خۆیشی لێیان وریا بێ و ئەوانیش هۆشیار بن، یانی: ماڵێک نەخۆشێکی تێدایە، ئەگەر منداڵە، ئەگەر گەورەیە، ئەگەر پیرە، بێگومان ئەو ماڵە هەموویان بە دەستیەوە گرفتار دەبن، تاقیکردنەوەکە بەس بۆ نەخۆشەکە نیە، بۆ دەورو بەرەکەشیەتی، بۆیە جاری وایە ڕەنگە ئەو لە تاقیکردنەوەکەی خۆی دەربچێت، خۆڕاگر بێ و ناشوکریی نەکات، بەڵام دەورو بەرەکەی لە تاقیکردنەوەکەدا بکەون، وەک پێویست لەگەڵیدا باش نەبن، لەگەڵیدا هاوکار نەبن، یان ناڕەزایی و ناشوکریی دەرببڕن.

(ئەیوب)یش کە سوێندی لە ژنەکەی خواردوە، قەمچی لێبدات و سزای بدات، بەڵام دوایی خوا ﷻ بەوە بۆی تەئویل کردوە کە لە جیاتی ئەوەی ئەوەندە ژمارە قەمچییەی لێبدات، بەس چەپکە گیایەک بە دەستەوە بگرێ، یان چەپکە ڕیحانێک و پێی لێبدات، وادیارە لەبەر ئەوە بووە کە ئەو ژنەی کەمتەرخەمییەکی بووە، ئەیووبی پەست و تووڕە کردوە، ئەویش سوێندی لێ خواردوە کە لێی بدات، بەڵام دوایی خوا ﷻ بۆی ئاسان کردوە، بەو تەئویلەی باسمان کرد.

٦- دۆستانی خوا لە تەنگانەشدا وەک فەڕحانیی، هەر خۆڕاگرو دامەزراون، مادام خواو پاداشتەکەی دەبینن، نالەخشێن، واتە: لە فەڕحانییشدا دۆستانی خوا دامەزراون و لەخۆبایی نابن و لە کەوڵی خۆیان دەرناچن و، لە ناڕەحەتییانیشدا هەر دامەزراون و نەلەخشاون، چونکە پاداشتی خوا دەبینن و دەستی خوا دەبینن، دەزانن ئەو تاقیکردنەوەیە، لەلایەن خواوەیە.

٧- بەسەرهاتی ئەیووب دەرخەری ئەو ڕاستییەیە، کە هات و نەهات و، هەبوون و نەبوون، خۆشیی و ناخۆشیی، نابێ بکرێنە پێوەرو تەرازووی چاکیی و خراپیی لەلای خوا، یان بە پێچەوانەوە، واتە: کەسێک تووشی نەخۆشیی دێ، تووشی نەداریی دێ، تووشی دەربەدەریی دێ، تووشی گیران دێ، تووشی ناڕەحەتیی دێ، بە دەست خەڵکەوە، نابێ ئەوە بکاتە بەڵگەی ئەوە کە ڕەنگە خوا منی خۆش نەوێ، یاخود بە پێچەوانەوە: کەسێک لەشی ساغ دەبێت، هەرچی دەستی بۆ دەبات بە ئاسانیی بە دەستیەوە دێت، دەوڵەمەند دەبێ، کەیف خۆش دەبێ و هاتی دەبێ لە دنیادا، نابێ بیکاتە بەڵگەو نیشانەی ئەوە کە خوا خۆشی بوێ، چونکە خۆشیی و ناخۆشیی، هات و نەهات، هەبوون و نەبوون، هیچیان بەڵگەی ئەوە نین کە خوا ئەو مرۆڤەی خۆش دەوێ، یان خۆشی ناوێ، بەڵکو خۆشویستن و ناخۆشویستنی خوا، بە پێی ئەوەیە ئەو مرۆڤە کردەوەکەی چۆنە؟ ئەک چەندەی هەیەو چەندەی نیە؟ ساغە یان نەخۆشە؟ گیراوە یاخود ئازادە؟ هەبوویە یان نەبوویە؟ بەڵکو لە زاتی خۆیدا چۆنە؟ هەڵوێستەکەی چۆنە؟ ئیمانی چەندەو تاعەتی چەندە؟ بۆ خوا صوڵحانی چەندە؟!

٨- هەم (ئەییووب) ﷺ هەم پێغەمبەرانی دیکەش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە قورئاندا زۆ جیاوازن، وەک لە تەورات، یان پەیمانی کۆندا، باسکراون، بۆ وێنە: کتێبی (ئەییووب) لە پەیمانی کۆندا (٤٢) بەشە، بەڵام شتی زۆر سەیرو سەمەرەی تێدایە، وەک لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يَتَجَلَّى في كِتابِ الله)، لە کتێبی پێنجەمدا باسمان کردوە، هاتوە، گوایە: ئەییووب گلەیی لە خوا کردوەو، لە خوا تووڕە بووە! شتی وا کە مسوڵمانێکی سادەو عەوام بەرانبەر بە خوا نایکات، لە پەیمانی کۆندا پاڵدراوەتە لای ئەییووب، بۆیە دەبێ وریابین! ئەو ڕێزو حورمەت و پێگە بەرزەی کە خوا ﷻ لە دوایین کتێبی خۆیدا کە قورئانە، بۆ پێغەمبەرانی خستۆتەڕوو، زۆر جیایە لەو درۆو دەلەسەیەی کە لە پەیمانی کۆندا بە ناوی فەرمایشتی خواوە، لە بارەی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هاتوە، ئەگەرنا بە تەئکید پێنج سیفرەکەی تەورات (التكوين، الخروج، اللاوين، التثنية، العدد)و هەموو کتێبەکانی دیکەی خواش، لە ئەسڵ دا هەر بە ڕێزو حورمەتەوە باسی پێغەمبەرانیان کردوە، بەڵام دوای ئەوەی گۆڕدراون و دەستکارییکراون، شتی زۆر بێ جێیان تێخزێنراوە.

٩- دیار نیە ئەییووب بۆچی فەرمانی پێکراوە: چەپکێک بە دەستەوە بگرێ و لە کەسێک بدات، تاکو سوێندەکەی لێ نەکەوێ؟ دیار نیە ئایا ئەو کەسە کێ بووە؟ ﴿فَٱضْرِب بِّهِۦ﴾، ئایا کوڕی بووە؟ کچی بووە؟ خزمەتکارێکی بووە؟ برای بووە؟ یاخود ژنی بووە؟ دیار نیە، بەڵام بە پێی قسەی زانایان، لەسەر شتێک لە هاوسەرەکەی تووڕە بووە، ئنجا ئەو شتە چی بووە؟

أ- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ژنەکەی کە ناوی (ڕەحمە) بووە، ڕۆژێک پارەیان نابێ، بۆ ئەوەی خواردن بۆ ئەییووب بێنێ، یاخود دەرمان و چارەسەری بۆ بکڕێ، ناچار بووە پرچ و کەزیی خۆی ببڕێ و بیفرۆشێ!

ب- بەڵام هەندێک دەڵێن: لەسەر شتێک دوا کەوتوە، ئەییووب کارێکی پێی بووە، بەڵام ئەو دوا کەوتوە، خۆی خافڵاندوە یان کەمتەرخەمییەکی کردوە.

ج- هەندێک دەڵێن: لەبەر ئەوە بووە کە ئیبلیس بەو هاوسەرەی ئەیووبی گوتوە: ئەگەر بێت و تۆ سەجدەم بۆ بەری و ڕێزم لێ بگری، من ئەییووبم تووشی ئەو نارەحەتییە کردوەو، نارەحەتییەکەی لێ لادەبەم، گوایە دەبێ ئەو ئافرەتەش کڕنووشی بۆ نەبردبێ، بەڵام هاتبێتەوەو بە ئەییووبی گوتبێ: کە شەیتان شتێکی وای پێگوتووم، ئنجا ئایا کڕنووشی بۆ بەرم بۆ ئەوەی ئازارەکەت لێ لابچێ؟!

بەڵام هیچ کام لەوانە پشت ڕاست نەکراونەوە بە بەڵگەیەکی نەقڵیی، کە سەنەدەکەی دیاربێ و، جێی دڵنیایی بێ، بۆیە ئێمە نازانین: ئایا کام لەو ڕیوایەتانە ڕاستەو، ئایا ئەو کەسەی (ئەییووب) لێی تووڕە بووە، ژنەکەی بووە، یاخود کەسێکی دیکەی بووە؟

بەڵام زۆبەی هەرەزۆری ڕوونکەرەوانی قورئان، ئەگەر نەڵێم هەموویان تێکڕا، هەر دەڵێن: ئەییووب سوێندی لە خێزانەکەی خواردوە، بەڵام ئەوە لە قورئاندا دیار نیە، دەگونجێ کەسێکی دیکە بووبێ، خزمەتکارێکی بووبێ، کوڕێکی بووبێ، کچێکی بووبێ، نیزیکێکی دیکەی بووبێ؟ کەسێک بێ خزمەتی کردبێ و لەسەر شتێک لێی تووڕە بووبێ.

١٠- (القرطبي)[1] دەڵێ: (وَاخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ فِي هَذَا الحُكْم هَلْ هُوَ عَامٌ أو خَاصٌ بِأَيُّوبَ؟) واتە: زانایان کەوتوونە ڕاجیاییەوە دەربارەی ئەو حوکمە کە ئایا گشتییە، یاخود تایبەتە بە ئەییووبەوە؟!

ئەو ئاوا بە کورتیی دەیڵێ، بەڵام (التفسير المنير) ی (د. وهبة الزحيلي)[2]، وردەکاریی ڕای مەزهەبەکانی لەوبارەوە هێناوە، واتە: ئەوە کە کاتێک کەسێک سوێند دەخوات لە کەسێک، بۆ وێنە: کە دە (١٠) قەمچیی لێبدات، ئایا دروستە دە (١٠) چڵە گیایان، یان دە (١٠) چڵە ڕیحان بە دەستەوە بگرێ و پێی لێبدات،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٥، ص١٧٢.

(٢) ج١٢، ص(٢٣٠، ٢٣١).

بۆ ئەوەی سوێندەکەی لێ نەکەوێ، کە ئەوە بۆ ئەییووب وابووە، ئایا تایبەتە بە ئەییووبەوە، یاخود گشتییە؟

دەڵێ: (الأَحْنَافُ وَالحَنَابِلَة يَقُولُونَ: شَرعُ مَنْ قَبْلَنَا شَرْعٌ لَنَا)، واتە: حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان دەڵێن: بەرنامەی ئەوانەی پێش ئێمە، بەرنامەیە بۆ ئێمەش، کەواتە: ئەو تەنویلە کە خوا ﷻ بۆ ئەییووبی کردوە، بۆ غەیری ویش دروستەو حوکمەکەی گشتییە.

شافیعییەکان دەڵێن: (شَرْعٌ مَنْ قَبْلَنَا لَيْسَ شَرْعَاً لَنَا)، شەرعی ئەوانەی پێش ئێمە، بۆ ئێمە شەرع نیە، دیارە دەبێ زۆربەیان وا بڵێن، ئەگەرنا هەندێکیش لە شافیعییەکان ڕایان وەک حەنەفیی و حەنبەلییەکانە، بەڵام گوتووشیانە: ئەم حوکمە لەم ئایەتەدا حوکمێکی گشتییەو، بۆ ئەوەش پشتیان بەم فەرمایشتە[1] بەستوە:

سەهلی کوڕی حونەیف خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە بارەی پیاوێکەوە کە زۆر نەخۆش و دەردەدار بووە، گوناهێکیشی کردوە، زینای کردوە، ئەویش فەرمانی کردوە کە سەد (١٠٠) شەمراخ، [لقی دار خورما، کە نەرم و باریکە] بە دەستەوە بگرن و بە یەکجار پێی لێبدەن، (لە جیاتی ئەوەی سەد قەمچیی لێبدەن) لەبەر ئەوەی گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئەو کابرایە زینای کردوە، کەنیزەکی یەکێکیان بەلایدا هاتوە، ئەویش خۆی

---

(١) [عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الأَنْصَارِ أَنَّهُ اشْتَكَى رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتَّى أُضْنِيَ فَعَادَ جِلْدَةً عَلَى عَظْمٍ، فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ جَارِيَةٌ لِبَعْضِهِمْ فَهَشَّ لَهَا فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ رِجَالُ قَوْمِهِ يَعُودُونَهُ أَخْبَرَهُمْ بِذَلِكَ وَقَالَ: اسْتَفْتُوا لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَإِنِّي قَدْ وَقَعْتُ عَلَى جَارِيَةٍ دَخَلَتْ عَلَيَّ؟ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالُوا: مَا رَأَيْنَا بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ مِنَ الضُّرِّ مِثْلَ الَّذِي هُوَ بِهِ، لَوْ حَمَلْنَاهُ إِلَيْكَ لَتَفَسَّخَتْ عِظَامُهُ، مَا هُوَ إِلاَّ جِلْدٌ عَلَى عَظْمٍ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْخُذُوا لَهُ مِائَةَ شِمْرَاخٍ فَيَضْرِبُوهُ بِهَا ضَرْبَةً وَاحِدَةً] أخرجه أبو داود: ٤٤٧٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

هەڵداوەتـە سـەرو زینـای لەگەڵـدا کـردوە، بـەڵام ئەگـەر سـەد قەمچیـی لێبدەیـن لێکهەڵدەوەشـێ، ئەویـش فەموویـەتی: مـادام وایـە، تـاوای بـۆ بکـەن.

ئـەو گێڕراوەیـە (أبـو داود) بەژمـارە: ٤٤٧٤، هێناویـەتی و (الألبـاني) بەڕاسـت (صحیـح)ی دانـاوە.

دەڵێن: کەواتە: ئەوە دروستەو ئەو حوکمە حوکمێکی گشتییە.

مالیکییـەکان دەڵێـن: (شَرْع مَـنْ قَبْلَنَـا شَرْعٌ لَنَـا)، لەگـەڵ ئەوەشـدا کە دەڵێن: شـەرعی پێغەمبـەرانی پێشـوو بەرنامەیـە بـۆ ئێمـەش، بـەڵام دەڵێـن: ئەمـە مۆڵەتێکـی تایبـەت بـووە بـە ئەییـووب، (ابـن القیم)یـش ڕای مالیکییـەکان زاڵ دەکات، لـە کتێبـی (إعـلام الموقعـین)داو دەڵـێ: ئەمـە مۆڵەتێـک بـووە تایبـەت بـووە بـە ئەییووبـەوە ﷺ. منیـش وام دێتـە بەرچـاو، چاوپۆشـیی لـەوە بکەیـن کـە ئایـا بەرنامـەی پێغەمبـەرانی پێشـوو بەرنامەشـە، بـۆ ئێمـە یـان نـا[1]؟ بـەڵام واپێدەچێ ئـەوە هـەر مۆڵەتێکی تایبـەت بووبێ بـە (ئەییـووب)ەوە ﷺ ئنجـا ئـەوەش کـە پێغەمبـەر ﷺ وەک مۆڵەتێـک - ئەگـەر فەرمایشـتە کـە سـەنەدەکەی ڕاسـت بـێ - بـۆ ئـەو هاوەڵـە بـەکاری هێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەو حاڵەکـەی وابـووە، دەگونجێ بڵێیـن: ئـەوە مۆڵەتێـک بـووە بـۆ ئەییـووب، بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا دەشـگونجێ بکرێتـە مۆڵـەت بـۆ هـەر کەسـێکی دیکـە کـە حاڵـی بـەو شـێوەیە بـێ، حاڵـی وەک هـی ئـەو پیـاوە بێ کـە لـە فەرمایشـتەکەدا هاتوە، کـە زۆر دەردەدارو نەخـۆش بـووەو گوتوویانـە: بەرگـەی سـزادان ناگـرێ.

١١- (القرطبي) دەڵێ: (اسْتَدَلَّ بَعْضُ جُهَّالِ الْمُتَزَهِّدَةِ، وَطَغَامِ الْمُتَصَوِّفَةِ، بِقَوْلِهِ تَعَالَى لِأَيُّوبَ: ﴿ ارْكُضْ بِرِجْلِكَ ﴾، عَلَى جَوَازِ الرَّقْصِ، قَالَ أَبُو الفَرَج ابن الْجَوْزِيّ: وَهَذَا احْتِجَاجٌ بَارِدٌ، لِأَنَّهُ لَوْ كَانَ أُمِرَ بِضَرْبِ الرِّجْلِ فَرَحًا، كَانَ لَهُمْ فِيهِ شبهة، وإِنَّمَا أُمِرَ بِضَرْبِ الرِّجل لِيَنْبُعَ الْمَاءُ)[2].

---

(١) پێـم وایـە ڕای بەهێزتـر ئەوەیـە کـە بەرنامـە پێشـووەکان بـۆ ئێمـەش بەرنامـەی پابەندکـەر (ملـزم)ن، جگـە لـەوەی بـە بەڵگەیەکـی یەکلاییکـەرەوە تایبـەت کرابـێ بەوانـەوە.

(٢) ج١٥، ص١٧٢.

واتـە: لەوبـارەوە هەندێـک لـە خەڵکـی نـەزانی دنیـا بـە کەمگـرو، هەندێـک لـە نەهـلی تەصـەووف نەشـارەزا، قسـەی خـوای بـەرز کـە بـە نەیبـووب دەفەرمـوێ: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴾، پـێ بـە زەویـدا بکوتـە، بـە بەڵگەیـان هێناوەتـەوە کـە هەڵپەڕیـن و شـایی دروسـتە لـە کاتی یـادی خـوا کردنـدا، بـەڵام (أَبُـو الفَـرَج ابـن الْجَـوْزِي) دەڵـێ: ئەمـە بەڵگـە هێنانەوەیەکـی سـادو سـڕە، چونکـە نەیبـووب نەگـەر بەهـۆی دڵخۆشـییەوە فەرمـانی پێکرابایـە پـێ بـە زەویـدا بکوتـێ، ئـەوە بەهـەر حـاڵ (تۆزێـک ڕێـی تـێ دەچـوو)، شـوبهەیەک بـوو، بـەڵام خـوا فەمـانی بـە نەیبـووب کـردوە پـێ بـە زەویـدا بکوتـێ، بـۆ ئـەوەی کانیـاو هەڵبقوڵـێ. (نـەک شـادیی و خۆشـیی دەرببـڕێ، تاکـو بیکەنـە بەڵگـە لەسـەر ڕەوایـی سـەماو هەڵپەڕیـن لـە کاتی یـادی خـوادا).

قسـەکەی (أَبُـو الفَـرَج ابـن الْجَوْزِيّ)یـش زۆر بەجێیـە، یـادی خـوا دەبـێ بـە شـێوەیەکی بـە ویقـارو ڕێـزو حورمەتـەوە بکـرێ، هەڵپەڕیـن و داپەڕیـن و ڕەقـص و سـەما لەگـەڵ ئـەوەدا ناگونجـێ، هەرچەنـدە کۆمەڵـێ لـە ئەهـلی تەصەووفیـش جۆرێـک لـە شـایی و هەڵپەڕیـن و هەڵسـووڕانیان هەیـە، بـەڵام مـن پێـم وایـە ئـەوە لەگـەڵ ویقـاری یـادی خـوا کـردن و، سـام و هەیبـەتی خـوا لـە دڵـدا بـوون و، ڕێـزو خۆشەویسـتی خـوا لـە دڵـدا بـووت دا ناگونجـێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**مەدحکردنی خوا ﷻ بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب کە باب و کوڕو نەوەن، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە بەندەی هەڵبژێردراوی خۆی بوون، خاوەنی تواناو زانایی بوون، زۆر یادی ڕۆژی دوایان کردوە:**

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾، هەروەها یادی بەندەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب بکەوە، دوێندراو (**مخاطب**) پێغەمبەری خاتەمە ﷺ (و)ەکەش بۆ گێڕانەوەو یادانەوەی ئەم باس و خواسەیە بۆ سەر ئەوانی پێشێ، واتە: وێڕای ئەوانەی ڕابردن، یادی بەندەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبیش بکەوە، کە وەک گوتم: باب و کوڕو نەوەن، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (**وَاذْكُرْ عَبْدَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ**)، بە تاک، کە هەر کام لە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب بەندەی خوا بوون، ئایا ئەوانە چۆن بوون؟

٢)- ﴿ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، خاوەنی دەستان و چاوان بوون، (**الأَيْدِي: جَمْعُ يَدٍ، بِمَعنَى القُوَّةِ فِي الدِّين، وَالأَبْصَارُ جَمْعُ البَصَر بِالمَعنَى المَجَازِيِّ، وَهُوَ النَّظَرُ الفِكرِيُّ المَعْرُوفُ بِالبَصِيرَة**)، (**الأَيْدِي**) کۆی (**يَد**)ە، واتە: دەستەکان، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی هێزو توانایە لە دینداریدا، (**أَبْصَار**)یش کۆی (**بَصَر**)ە، بە مانا مەجازییەکەی کە مەبەست پێی تێفکرین و سەرنج دانەو، لێرەدا مەبەست پێی بەصیرەتە، واتە: خاوەنی توانایی و زانایی بوون، یاخود خاوەنی کارایی و شارەزایی بوون، لە دینداریی و مسوڵمانەتیی و بەندایەتییدا بۆ خوا.

٣)- ﴿ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم ﴾، ئێمە ئەوانمان ساغ کردبۆوە، ئێمە ئەوانمان تایبەت کردبوو، هەڵبژاردبوو ﴿ بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴾، بە سیفەتێکی زۆر ساغ و بێ خڵتە، کە بریتیە لە یادکردنی مەنزڵگا، واتە: مەنزڵگای کۆتایی.

ئەمە خوێندراویشەتەوە: (بِخَالِصَةِ ذِكْرَ الدَّار)، واتە: (خَالِصَة) دەبێتە پاڵدراوو ﴿ ذِكۡرَى ﴾، دەبێتە پاڵوێدراو، (مُضَاف)و (مُضَاف إِلَيه)، کە دەفەرموێ: ﴿ أَخۡلَصۡنَٰهُم ﴾، (أَي: أَخْلَصْنَاهُم وجَعَلْنَاهُم خَالِصِينَ)، ساغمان کردبوونەوە، کردبوومانن بە ساغ بووەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ أَخۡلَصۡنَٰهُم ﴾، (أَي: خَصَّصْنَاهُمْ بِخَصْلَةٍ خَالِصَةٍ، هِيَ العَمَلُ لِلأَخِرَةِ وَالتِزَامُ أوامرنا وَنَواهِينا لِتَذَكُّرِهِم الدَّارَ الأَخِرَةَ وَالإِيمَانَ بِهَا)[1].

واتە: تایبەتمان کردبوون بە سیفەتێکی ساغ و بێ خڵتەوە، کە بریتی بوو لە کار کردن بۆ ڕۆژی دوایی و، پابەندیی بە فەرمانەکانی ئێمەوە و بە قەدەغە کراوەکانی ئێمەوە، بە هۆی یادکردنیان بۆ مەنزڵگای دوایی و ئیمان پێ بوونیان، کەواتە: ﴿ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم ﴾، ئێمە تایبەتمان کردبوون، ﴿ بِخَالِصَةٖ ﴾، بە سیفەتێکی ساغ، سیفەتێکی بێ خڵتە، کە بریتی بووە لە یاد کردنی مەنزڵگای ڕۆژی دوایی، یاخود تایبەتمان کردبوون بە سیفەتە ساغ بووەوەکەی یادکردنی ڕۆژی دوایی، ئەگەر (بِخَالِصَةِ ذِكْرِى الدَّار) بخوێندرێتەوە: بە سیفەتە ساغ بووەوەکەی یاد کردنی ڕۆژی دوایی، یان بە سیفەتێکی ساغ بووەوەی بێ خڵتە، کە بریتی بوو لە یاد کردنی ڕۆژی دوایی.

٤)- ﴿ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان لە لای ئێمە لە هەڵبژێردراوە چاکەکان بوون. ﴿ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ﴾، کۆی (مُصطَفَى)یە، یانی: هەڵبژێردراو، (الإِصْطِفَاءُ: أَخْذُ صَفْوَةِ الشَّيء)، واتە: خوڵاسەو پوختەی شتێک هەڵبژێری، پێی دەگوترێ: (إِصطِفَاء).

---

(١) التفسير المنير، ج١٢، ص٢٢٥.

(الأَخْيَارُ: المُخْتَارِينَ مِنْ أَبْنَاءِ جِنْسِهِم المَطْبُوعِينَ عَلَى فِعْلِ الخَيرِ)، (أخيار) كـۆی (خَيِّر)ە، یـان كـۆی (خَيْر)، بەبێ گیـرە (شـدّة) واتـە: هەڵبژێـردراوان لـە نێـو مرۆڤـنـد كـە بـار هێنرابـوون و سرووشـتێنرابوون لەسـەر ئەنجامـدانی كاری بـاش.

دیـارە ئێمـە پێشـتر باسـمان كـرد كـە هـەركام لـە ئیبراهیـم و ئیسـحاق و یەعقووب (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) كـە سـێ پێغەمبـەری پایە بـەرزی خـوان، بەسـەرهاتەكەیانمان پێشـتر بـاس كـردوە، بۆیـە لێـرەدا هـەروا بـە كورتیـی و بـە ئەنـدازەی ڕوونكردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـەكان بەسـەریدا دەڕۆیـن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردن بە یادکرانی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل، کە هەموویان بەندەی ئەوپەڕی پەسندو چاک بوون:**

وەک خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ  ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ ﴾، هەروەها (ئەی موحەممەد!) یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زەلکیفل بکەوە (ئەو سێ پێغەمبەرە) ئێمە بەسەرهاتی ئیسماعیلمان لەگەڵ بەسەرهاتی ئیبراهیم لە سوورەتی ئیبراهیم داو، لە سوورەتی مەریەمیشدا باسکردوە.

(ئەلیەسەع) خوێندراویشەتەوە: (ٱللَّيۡسَع)، لە جیاتی بفەرموێ: ﴿ وَٱلۡيَسَعَ ﴾، خوێندراوەتەوە: (وَاللَّيسَع). بەسەرهاتی هەرکام لە ئەلیەسەع و زەلکیفلیشیان لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، باسکردوە.

٢)- ﴿ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾ هەرکام لەوانەی لە بەندە پەسندو هەڵبژاردەکانی خوا بوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾، تەنوینی (كُلٌّ) (عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيهِ)، قەرەبووی پاڵوێندراوە، لە جیاتی (مُضَافٌ إِلَيهِ)، ئەم تەنوینە دەخرێتە سەر هەندێک ناو، واتە: لە جیاتی بفەرموێ: (وَكُلُّهُم)، فەرموویەتی: ﴿ وَكُلّٞ ﴾، لە جیاتی (كُلّ) پاڵبدرێتە لای (هُم)، (كُلُّهُم)، فەرموویەتی: ﴿ وَكُلّٞ ﴾، یانی: (كُلُّ وَاحِدٍ مِنهُم)، هەرکامێک لەوان.

﴿ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾، (جَمعُ الخَيِّرِ أَوِ الخَيرِ)، (خَيِّر)، واتە: زۆر باش، (خَير)یش هەر بە مانای زۆر باش، وەک (مَيِّت)و (مَيت)، هەرکام لە: (خَيِّر) و (خَير)، هەردوو

صیغەکـە دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـەن، کـە ئـەو وەصفـە زۆر تۆخـە، لـەو کەسانەدا، کەواتـە: هـەرکام لـە (ئیسـماعیل) کـە کـوڕی ئیبراهیمـە ﷺو لەهاجـەری میصرییـە، خـوا لێـی ڕازی بـێ و، (ئەلیەسـەع) کـە پێشـتریش باسـمان کـردو، ﴿وَذَا ٱلْكِفْلِ﴾یـش کـە هەردووکیـان واپێدەچـێ لـە پێغەمبـەرانی بەنـوو ئیسـرائیل بـن و لـە پەیـمانی کۆنیشـدا ناویـان هاتـوە، ﴿وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ﴾، هەرکامێـک لەوانـە لـە بەنـدە چـاک و پەسـندو هەڵبـژاردەکان بـوون، خـوا ﷻ لێـرەدا بـەس دەفەرمـوێ: یادیـان بکـە، بـەڵام بـە نسـبەت (ئیسـماعیل)ەوە، لـە سـوورەتی مەریەمـدا هاتـوە: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾﴾مریـم، یـادی ئیسـماعیل بکـەوە لـە کتێـب دا، ئـەو بەڵێنـی ڕاسـت بـوو، ڕەوانەکـراوو پێغەمبەریـش بـوو، فەرمانیـشی بـە نیزیـکانی دەکـرد بـە نوێـژو زەکات و لـەلای پەروەردگاریـشی پەسـندکراو بـوو.

بـەڵام (ئەلیەسـەع) تەنیـا نـاوی هاتـوە، لێـرە لـە سـوورەتی (ص)و لـە سـوورەتی (الأنعام)یشـدا، نـاوی هاتـوە، زەلکیفلیـش بـەس نـاوی هاتـوە لێـرەو لـە سـوورەتی (الأنبياء)یـش دا، بـەڵام بەسـەرهاتیان نەلێـرەو نـە لـەوێ نەگێردراوەتـەوە، لە سـوورەتی (الأنعـام)دا فەرموویـەتی: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾﴾الأنعـام، لـە سـوورەتی (الأنبياء)یـش دا خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾الأنبیـاء، کەواتـە: هـەرکام لـە زەلکیفـل و ئەلیەسـەع، دووجـاران ناویـان لـە قورئانـدا هاتـوە، ئەلیەسـەع لـە سـوورەتی (الأنعـام)و لـە سـوورەتی (ص)یشـدا، زەلکیفـل لـە سـوورەتی (الأنبیـاء) لـە ئایـەتی (٨٥)داو، لێـرەش لـە سـوورەتی (ص)دا، بـەڵام بـە تەئکیـد پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ یـان خـوا ﷻ بـۆی ئیلهـام کـردوە بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان، یاخـود خـوا زانیویـەتی کـە بایـی ئەوەنـدە زانیـاری لەبـارەی ئـەو دوو پێغەمبەرانـەوە هەیـە، کـە بزانـێ یـادی چییـان بکاتـەوەو، چ هەڵوێسـتێک و چ سیفەتێکیان یـاد بکاتـەوەو چـۆن لێیـان بەهرەمەنـد بـێ؟ چونکـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا، دوای ئـەوەی ناوی

هەژدە (١٨) لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دێنێ، دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ... ﴿٩٠﴾﴾الأنعام، واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا خستوونیە سەر ڕاستەڕێ، تۆش بەدوای ڕاستەڕێی وان بکەوەو بیانکە سەر مەشق، هەروەها لە سووڕەتی (الأنبياء)یشدا خوا هەر لە سیاقی ئەوەدا کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ یادی ئەو پێغەمبەرانەی خوا بکاتەوەو، لەڕێ و شوێنیان و لە هەڵوێستەکانیان بەهرەمەندبێ، هەر لەو سیاقەدا باسی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزانە کراوە، کەواتە: بایی ئەوەندە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لێیان بەهرەمەند بێ، خوا بەسەرهاتەکانیانی بۆ گێڕاونەوەو خوا شارەزایی تایبەتیی پێداوە، یاخود زانیویەتی کە پێغەمبەر ﷺ شارەزایی لەبارەیانەوە هەیە، لە سووڕەتی (الأنبياء) یشدا دوای ئەوەی خوا باسی ئیبراهیم دەکات: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾الأنبياء، ئنجا باسی هەرکام لە: لووط و نووح و داوودو سولەیمان و ئەییووب و دەکات و، ناوی ئیسماعیل و ئیدریس و زەلکیفل دێنێ و دەفەرموێ: ﴿... كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾الأنبياء، ئنجا دوایی باسی زەننون دەکات، دوایی باسی زەکەریاو یەحیای کوڕی دەکات کە پێی بەخشیوە، دوایی باسی مەریەم و عیسای کوڕیشی دەکات.

کەواتە: لە هەموو سیاقەکان دا ئەوە وەردەگیرێ، کە خوا ﷻ باسی ئەو پێغەمبەرانە بۆ پێغەمبەری کۆتایی دەکات ﷺ ناویان دەهێنێ، بۆوەی بیانکاتە سەرمەشق.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتی ئێمەش بدات، کە وەک پێغەمبەرە پێشەوایەکەی خۆمان، سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ، لەڕێ و شوێن و هەڵوێست و ئاکارو ڕەفتاری بەرزو پەسندی ئەو پێغەمبەرانە، بەهرەمەند بین و چاویان لێبکەین و، بیانکەینە سەرمەشقی خۆمان بۆ دینداریی و دنیاداریی، تاکو لە دونیادا ژیانێکی ڕێک و ڕاستی مسوڵمانانەمان هەبێ، ژیانێکی سەربەرزانەی دوور لە عەیبداریی و گوناهبارییمان هەبێ و، لەدواڕۆژیشدا سەرفراز بین، خوا

بۆمـان بـكات بچینـە ڕیـزی ئـەو بەنـدە چاكانـەی خـواوە، لـەو پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) نیزیـك بیـن و، لـە خزمەتیانـدا بیـن، لـە بەهەشـتە ڕازاوە نەبـڕاوەكانی خـوادا.

سُبحَانَكَ اللَّهُمْ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان شـازدە (١٦) ئایـەت، ئایەتـەکانی: (٤٩ - ٦٤)، دەگرێتـە خـۆی، هەموویـان لـە بـارەی پاداشـتی پارێـزکاران لـە بەهەشـتداو، سـزای یاخییـان و سـەرپێچیکارانەوەن، لـە دۆزەخـدا.

پاشـان مشـتومڕی نێـوان سـەرکردەکان و شـوێنکەوتە گومڕاکانیـان لـە دۆزەخـدا، چۆن پێکـەوە شـەڕە قسـەو دەمەقاڵێیـان دەبـێ.

هەروەهـا سەرسـوڕمان و پرسـیار کـردنی دۆزەخییـەکان، لـە بـارەی هـۆکاری نەدیتنـی کەسـانێکەوە لـە دۆزەخـدا، کـە لـە دنیـادا بـە خراپەکاریـان دادەنـان و گاڵتەیـان پـێ دەکـردن، چۆنـە لـە قیامـەت لـە دۆزەخـدا نایانبینـن؟ ئنجا ئایـا ئەمـە پرسـیار کـردنی جیددییـان بـووە، یاخـود جۆرێـک لـە سەرزەنشـتکردنی خۆیـان بـووە، کـە ئەهـا ئەوانـەی ئێمـە گاڵتەمـان پـێ دەکـردن، ئێسـتا لێـرەدا نایانبینیـن، لەبـەر ئـەوەی ئـەوان بەنـدەی خـوا بـوون و ئێمـە لـە خـوا یاخیـی بوویـن؟

﴿ هَٰذَا ذِكْرٌۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾
مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ
﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَاۚ
وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ
وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْۚ
إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَاۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾
قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾ وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا

كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ
تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئەمە باسکردنی (ئەو پێغەمبەرانە) بوو (بە چاکەو ستایش)و، بێگومان پارێزکارانیش باشترین سەرەنجامیان هەیە ﴿٤٩﴾ باخ و بێستانە هەمیشەییەکانن، دەرگایەکانیان بەڕوودا ئاوەڵایە ﴿٥٠﴾ لەوێدا پاڵیان داوەتەوە، میوەیەکی زۆر (و جۆراو جۆر)و، خواردنەوەی (نایاب)ی تێدا داوا دەکەن ﴿٥١﴾ هەروەها (ئافرەتە) نیگای خۆ کورت هەڵێنەرەکان (لەسەر مێردیان) یان لەلان، کە هاوتەمەنیانن ﴿٥٢﴾ ئەمە ئەوەیە کە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە بەڵێنتان پێ دەدرێ ﴿٥٣﴾ بە دڵنیایی ئەمە بژیوی ئێمەیەو بڕانی بۆ نیە ﴿٥٤﴾ ئەمە (پاداشتی پارێزکاران)و، یاخیی و ملهوڕانیش خراپترین سەرەنجامیان هەیە ﴿٥٥﴾ (ئاگر)ی دۆزەخ، تێیدا دەبرژێنرێن، ئنجا ئەوێ خراپترین جێی تێدا ڕاکشان و پشوودانە ﴿٥٦﴾ ئەمە (حاڵی دژواری ملهوڕانە)و، با بیچێژن ئاوی داغ و کێم و زووخاو ﴿٥٧﴾ هەروەها لە شێوەی ویش چەندان جۆری دیکە لە (سزاو جەزرەبە) هەن ﴿٥٨﴾ (دۆزەخەوانەکان بە سەرانی کافرانیان گوت:) ئەمەش کۆمەڵێکن وێڕای ئێوە خۆ تێپەستەرن (لەگەڵ ئێوەدا دێنە دۆزەخەوە)، (سەرانی کوفر گوتیان:) بەخێر نەیەن، ئەوانیش هەر (دێنە نێو دۆزەخەوەو) بە ئاگرەکەی دەبرژێنرێن ﴿٥٩﴾ (شوێنکەوتووەکان) گوتیان: ئێوە بەخێر نەیەن، ئێوە ئەم (سزاو سەرەنجام)ەتان بۆ هێناینە پێش، کە خراپترین نشینگەیە ﴿٦٠﴾ (هەروەها شوێنکەوتووەکان) گوتیان: پەروەردگارمان! هەر کەس (ئەم سەرەنجام)ەی بۆ هێناوینە پێش، ئازاری بۆ دوو بەرانبەر (و چەند بەرانبەر) زێدە بکە ﴿٦١﴾ (هەروەها سەرانی کوفر) گوتیان: ئەوە چیمانە (بۆچی) پیاوانێک نابینین (لێرە لە دۆزەخدا)؟ کاتێ خۆی (لە دنیادا) لە خراپەکارانمان

تەژمـار دەکـردن ﴿٦٢﴾ ئایا بـە گاڵتـە پێکراومـان گرتبـوون! یـان چاوەکانمـان (نایانبینـن و) لێیـان لاداون، (ئەگەرنـا هـەر لـە دۆزەخ دان)؟ ﴿٦٣﴾ بـە دڵنیایـی ئـەوە ڕاسـت و چەسـپاوە، ئـەو مشـت و مـڕەی خەڵکـی (نێـو) ئاگـری دۆزەخ ﴿٦٤﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ): (قـاصرات) کـۆی (قَاصِرَة)یـە، واتـە: ئافرەتێـک کـە چـاوی خـۆی حەپـس کـردوەو کـورت کردۆتـەوە.

(طَـرْف) بـە مانـای نیـگاو چـاو دێ، هەروەهـا بـە مانـای پێڵـووی چـاو دێ و بـە مانـای تەماشـا کـردن دێ، (قـاصِراتُ الطَّـرْف أي: لا يَمـُدُدْنَ طَرْفَهُـنَّ إلى مـا لا يَجُـوز، وَالطَّـرْفُ: الجَفْـنُ، والنَّظَـرُ)، (قـاصِرات الطَّـرْفْ)، چـاوی خۆیـان نابڕنـە شـتێک کـە بۆیـان ڕەوا نیـە، دروسـت نیـە، (طَـرف) بـە مانـای پێڵـووی چاوڕوانیـن دێ، هەڵبەتـە بـە نسـبەت دونیـاوە بۆیـان ڕەوا نیـە، ئەگەنـا لـە بەهەشـتدا هیـچ شـتێکی قەدەغـەی تێدانیـەو، حـەڵاڵ و پـاک و چاکـی هێنـدە لێیـە، کـەس چـاو نابڕێتـە حـەڕام، سروشتیشـیان هێنـدە پاکـە، کـەس مەیـلی بـە لای شـتێکی هەڵـەو پەڵـەدا ناچـێ.

(أَتْرَابٌ): (جَمْـعُ الـتِّرْب، أي: لِـداتٌ يَنْشَـأْنَ مَعـاً، تَشْـبِيهاً فِي التَّسَـاوِي، وَالتَّمَاثُـل بِالتَّرائِبِ الَّتِـي هِـيَ ضُلُـوعُ الصَّـدرِ، أو لِوُقُوعِهِـنَّ مَعَـاً عَـلَى الأَرْضِ عَـلَى الـتُّرابِ)، (أَتْـرَاب): واتـە: پێکـەوە پێدەگـەن، ئەمانـە چوێنـدراون لـەوەدا کـە وەک یەکـن و هاوتەمەنـن، بـە پەراسـووەکان کـە بـە قـەدەر یەکـن (پەراسـووەکانی سینە)، یـان لەبـەر ئـەوەی کـە لەدایـک بـوون، پێکـەوە کەوتوونـە سـەر گڵ (سـەر زەوی)، بۆیـە پێیـان دەگوتـرێ: (أَتْـرَاب) کـە کـۆی (تِـرْب)ە.

(نَّفَادٍ): (النَّفَـادُ: الفَنَـاءُ، أَنْفَـدوا أي: فَنِـيَ زَادُهُـم)، (نَفَـاد) بـە مانـای تـەواو بـوون و بڕانـە، (أَنفَـدُوا) واتـە: زادو زەخیـرەو توێشـوویان نەمـا.

(لِلطَّٰغِينَ): (جَمْعُ الطَّاغِي، وَالطُّغْيَانُ تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي العِصْيَانِ)، (طَاغِين) کۆی (طَاغِي)یە، واتە: سەرکێش، (طُغْيَان)یش بریتیە لە سنوور تێپەڕاندن لە سەرپێچیی کردنی خوادا.

(ٱلۡمِهَادُ): (المَهْدُ وَالمِهَادُ: المَكَانُ المُمَهَّدُ المُوَطَّأُ)، شوێنێک ئامادە بکرێ و خۆش بکرێ، مرۆڤ تێیدا پشوو بدات، پێی دەگوترێ: (مَهْد) یان (مِهاد).

(حَمِيمٌ): (الحَمِيمُ: المَاءُ الشَّدِيدُ الحَرَارَةِ)، ئاوێکی زۆر گەرم، واتە: کوڵاو و داغ.

(وَغَسَّاقٌ): (الغَسَّاقُ: مَا يَقْطُرُ مِنْ جُلُودِ أَهْلِ النَّارِ)، ئەوەی کە لە پێست و برینی دۆزەخییەکان دێتە خوار (لە کێم و زووخاو).

(شَكْلِهِۦٓ): (المُشَاكَلَةُ فِي الهَيْئَةِ وَالصُّورَةِ، وَالنِدُّ فِي الجِنْسِيَّةِ، وَالشَّبَهُ فِي الكَيْفِيَّةِ)، (مُشَاكَلَة)، (شَكْل) لە شێوەو دیمەن دایە، (نِدّ) لە ماهیەت و جەوهەر دایە، (شَبَه) لە چۆنیەتیی دایە، کەواتە: ﴿وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ﴾، واتە: چەند جۆری دیکە لە سزا، لە شێوەی ئەو سزایەدا کە باسکرا.

(مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ): (الإقْتِحَامُ: تَوَسُّطُ شِدَّةٍ مُخِيفَةٍ، وَقَحَمَ فُلَانٌ نَفْسَهُ فِي كَذَا مِنْ غَيْرِ رَوِيَّةٍ)، (مُقْتَحِمٌ مَعَكُم) ئاوام مانا کردوە: خۆ تێپەستێون، لەگەڵتان، چونکە: (إقْتِحَام): بریتیە لەوەی ئینسان بچێتە نێو سەغڵەتییەکی ترسناکەوە، سەختییەکی ترسناک، و دەگوترێ: (قَحَمَ فُلَانٌ نَفْسَهُ فِي كَذَا مِن غَيْرِ رَوِيَّةٍ)، واتە: فڵانکەس خۆی پەستاوتە نێو کارێکەوە بێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە.

(لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ): (الرَّحْبُ: سَعَةُ المَكَانِ، وَمَرْحَبًا وَأَهْلًا يَعْنِي: وُجِدْتَ مَكَانًا رَحْبًا)، (رَحْب): شوێنی فراوانە، کە دەگوترێ: (مَرْحَبًا وَأَهْلًا)، واتە: تۆ هاتیە شوێنێکی فراوان و هاتیە لای نیزیکانی خۆت، کە دەفەرموێ: ﴿لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ﴾، واتە: بەخێر نەیەن، یانی: پێشوازییان لێناکەین.

(ضِعْفًا): (ضَعْفْتُ شَيْئاً وَضَاعَفْتُهُ وَأَضْعَفْتُهُ)، هەرسێکیان بە مانای: (ضَمَمْتُ إِلَيْهِ مِثْلَهُ فَصَاعِدَاً)، وێنەی خۆی، یاخود زیاتر خستە پاڵی، واتە: دووبەرانبەر، یان چەند بەرانبەرم کردەوە.

(سِخْرِيًّا): (السُّخْرِيَّةُ وَالسِّخْرِيَّةُ: فِعْلُ السَّاخِرِ، الهُزْءُ والتَّسْخِيرُ)، (سُخْرِيَّة)و (سِخْرِيَّة)، کرداری کەسێکە کە گاڵتە دەکات، گاڵتە کردنیش بریتیە لە گەمە پێکردن و پێ ڕابواردن و بە سووک تەماشا کردن.

(زَاغَتْ): (الزَّيْغُ: المَيْلُ عَنِ الإِسْتِقَامَةِ)، لادان لە ڕێی ڕاست.

(تَخَاصُمُ): (الخَصْمُ: مَصْدَرُ خَصَمتهُ، أي: نَازَعْتُ خَصْمَاً)، (تَخَاصُم) لەسەر کێشی (تَفَاعُل)ە، واتە: پێکەوە ناکۆکیی و دەمەقاڵیی کردن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم شـازدە (١٦) ئایەتـەدا، پاداشـتی پارێـزکاران و، دوایـی سـزای دۆزەخییـان، ئنجـا مشـت و مـڕی دۆزەخییـان بـە تایبـەت پێشـکەوتووەکان و شـوێنکەوتووەکان، واتـە: دەمڕاسـتان و لاسـاییکەرەوەکان، دەخاتـە ڕوو، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ هَٰذَا ذِكْرٌ ﴾، ئەمـە یاسـکردن بـوو، ئەمـە یاسـکردنێک بـوو (باسی پێغەمبـەران) (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّلام) کـە تێپەڕیـن ﴿ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾، بـۆ پارێزکارانیـش باشـترین سـەرەنجام هەیـە، ﴿ مَـَٔابٍ ﴾، یـانی: (مَـكَانُ الرُّجُـوع)، (وقـت الرجـوع)، (الرُّجُـوع)، ﴿ مَـَٔابٍ ﴾، هـەم بـە نـاوی شـوێن دێ، هـەم بـە نـاوی کات دێ، هـەم بـە چاوگیـش دێ، واتـە: باشـترین شـوێنێک کـە بـۆی دەگەڕێنـەوە، باشـترین کاتی گەڕانـەوەو، باشـترین شـێوەی گەڕانـەوە بـۆ پارێـزکاران هەیـە، ئنجـا تەفسـیری دەکات، ئـەو باشـترین گەڕانـەوەو، باشـترین کات و، شـوێنی بـۆ لا گەڕانەوە، چییـە و چۆنـە؟

﴿ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، باغـە هەمیشـەییەکانن، دەرگاکانیـان بەڕوویـان دا کـراوەن ﴿ جَنَّـٰتِ ﴾، کـۆی (جَنَّة)ەیـە، واتـە: بـاغ و بێسـتان و گـوڵ و گوڵـزار، (عَـدن) بـە مانـای هەمیشـەیی، (عَـدَنَ فِي المَـكَانِ أَيِ: أَقَـامَ وَقَطَـنَ)، واتـە: مایـەوە لـەو شـوێنەو نیشـتەجێ بـوو، ﴿ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، دەرگاکانیـان بـۆ نـاوەڵا کـراون و بۆیـان خراونە سـەر پشـت، یـانی: بـە خۆشـحاڵییەوە پێشـوازیی دەکرێـن، چونکـە کەسـێک پێشـوازیی نەکـرێ، یـان نەویسـترێ بێتـە شـوێنێکەوە، دەرگاکـەی بـەڕوودا دادەخـرێ.

﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا ﴾، لەوێـدا پاڵـدەرەوەن، پاڵیـان داوەتـەوە، (إتِّـكَاء) بریتیـە لـە شـان دادان و پاڵدانـەوە، لـە کوێـدا؟ لـەو باغانـەدا، لـەو بـاغ و بێسـتان و شـوێنە خۆشـانەدا ﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِفَـٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴾، داوا دەکـەن لەوێـدا هـەم میـوەی زۆر، هـەم خواردنـەوەی جـۆراو جـۆر، میـوەی زۆر، واتـە: هەمـوو جـۆرەکانی

میـوەو، هەمـوو جـۆرەکانی شـلەمەنیی و خواردنـەوە، لەبـەر ئـەوەی نیعمەتـەکانی بەهەشـت زیاتـر بـۆ خۆشـیی و لـەززەت وەرگرتـن، نەگەرنـا بـۆ لابـردنی برسـیەتیی و تینوویەتیـی نیـن، وەک جـاری دیکـەش باسـمان کـردوە.

﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴾، ئافرەتانێکـی نیـگای خـۆ کـورت هەڵێنـەری هاوتەمەنیـان لـەلان.﴿ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ ﴾، یـانی: (نِسـاءٌ قَـاصِراتُ الطَّـرف)، یـان: (زَوجَـاتٌ قَـاصِراتُ الطَّـرف)، ئەمــە سـیفەتی وەسـفکراو (مَوصُوف)ێکــی قرتێــنراو (مَحـذُوف)ە، ئافرەتانێـک کـە نیـگای خۆیـان کـورت کردۆتـەوە لەسـەر مێردەکانیـان، واتـە: چـاو بەمـلاولادا ناگێـڕن، ئەمـە دەگونجێ مەبەسـت پێـی ئەوەبێ زۆر سەرسـامن بـە مێردەکانی خۆیـان، یاخـود مەبەسـت ئەوەبـێ کـە لـە سروشـتی پیاوانـدا وایـەو، پیـاو پێـی خۆشـە ئافرەتەکـەی چـاوی لـەدوای کـەسی دیکـە نەبـێ و، چـاو لـە کـەسی دیکـە نـەکات، خوای پـەروەردگار وەک سروشـتی ئێسـتای دنیامـان کـە تێدەگەیـن، بـاسی بەهەشـتمان بـۆ دەکات، ئەگەرنـا لـە بەهەشـت دا گوناهـو تـاوانی لـێ نیـە، هیـچ شـتێکی قەدەغـەی لـێ نیـە، لەبـەر ئـەوەی سروشـتی مرۆڤـەکان پـاک و چاکـەو، کەسـیش چـاوی لـە حـەڕام و شـتی خـراپ نیـە ﴿ أَتْرَابٌ ﴾، کـۆی (تِـرب)ە، واتـە: هاوتەمەنـن.

﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴾، ئەمـە ئەوەیـە کـە بەڵێنتـان پـێ دەدرێ، بـۆ ڕۆژی لـێ پرسـینەوە، واتـە: ئـەی مرۆڤـەکان! ئـەو گفـت و موژدەیەتـان پـێ دەدرێ بـۆ ڕۆژی لێپرسـینەوە، ئنجـا خۆتـان عاقـڵ بـن و دەرفـەت وەربگـرن لـە ژیـانی دنیاتان، وابکـەن ئـەو بەڵێنـەی خـوا، بۆتـان بێتـە دی.

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾، ئەمـە بژێـوی ئێمەیـەو بـڕانی بـۆ نیـە، وەک یەکێـک بـە یەکێـک دەڵـێ: ئەوشـتە لـە نەبڕانـە.

﴿ هَٰذَا ﴾ ئەمــە ئەوەیــە کــە باسـکرا ﴿ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴾، بـە دڵنیایـی بـۆ یاخیيانیـش خراپتریـن جێگـەو ڕێـگاو، خراپتریـن شـوێن هەیـە، ئنجـا پێناسـەی دەکات کـە ئـەو خراپتریـن شـوێنە کوێیـە؟

﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾، دۆزەخ دەیخرێنە نێو تێیدا دەپیشێترێن و دەبرژێندرێن ﴿ فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾، خراپترین شوێنی پشوودان، ئەوێیە، خراپترین شوێنی ئیسراحەت ئەوێیە.

﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ ﴾، ئەمەی کە باسکرا باسکرا، با بیچێژن ﴿ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴾، ئاوی کوڵاوو داغ، کێم و زووخاو.

﴿ وَآخَرُ مِن شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ ﴾، هەروەها سزای دیکەش لە شێوەی ئەوە، بە چەندان جۆر، سزاو جەزرەبەی دیکەش بە چەندان جۆر هەیە، بۆ لە خوا یاخییان.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەو مشت و مڕەی لە نێوان پەیڕەوان و پەیڕەویی لێکراوان، یاخود لاساییکەرەوان و سەرکردەکاندا دەبێ:

﴿ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ﴾، ئەمە یان فریشتەکان دەیڵێن، دۆزەخەوانەکان، یان: سەرانی کوفر هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا قسە دەکەن، هەردوو ئەگەرەکەی هەن، دەڵێن: ئەمە کۆمەڵێکن لەگەڵ ئێوەدا خۆ تێدەپەستێون، لەگەڵ ئێوە شانەخڕە دەکەن، کە ئەوانیش بێن، بۆ دۆزەخ، واپێدەچێ ئەمە قسەودوانی سەرانی کوفربێ، دوای ئەوەی ئەوان پێشێ دەچنە دۆزەخ، شوێنکەوتووە لاساییکەرەوە هەڵخەڵەتێندراوەکانیشیان بە دوایاندا دێن، ئنجا هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان دا دەدوێن دەڵێن: ئەوە کۆمەڵێکی زۆرن ئەوانیش هاتن خۆ تێپەستێون، ئەوانیش دەڵێن: ﴿ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ﴾، مەرحەبایان لێ نەبێ، بەخێر نەیەن ﴿ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ ﴾، بۆیەش بەخێر نەیەن، چونکە ئەوانیش هەر دەچنە نێو ئاگرەوەو بە شێوەیەکی تایبەت دەسووتێنرێن.

﴿ قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ ﴾، ئنجا شوێنکەوتووە لاساییکەرەوەکان، وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: بەڵکو ئێوە بەخێر نەیەن، ئێوە شوێنێکی فراوانتان دەست نەکەوێ و بەخێر نەیەن ﴿ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ﴾، ئێوە ئەمەتان بۆ پێشخستین،

تێـوە بوونـە هـۆكاری ئـەوەی ئێمـە تـووشی ئـەم ڕۆژە ببیـن ﴿ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴾، تێـرەش خراپتریـن شـوێنی نیشـتەجێ بوونـە.

﴿ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ﴾، ئنجا شوێنكەوتووەكان هیچیـان بـە دەسـت نامێنـێ، پەنـا دەبەنـە بـەر خـوا، دەڵێـن: پەروەردگارمـان! هەركەسـێ ئەمـەی بـۆ هێناوینـە پێـش و بـۆی فەراهـەم هێناویـن و، تـووشی ئـەم سـزایەی كردوویـن، لـە سـزای ئاگـر بـۆی دوو قـات بكـەوە، بـۆی دوو چەنـدان بكەوە، یاخـود بـۆی چەنـد بەرانبـەر بكـەوە.

﴿ وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ ﴾، دووبـارە سـەركردەو دەمڕاسـتەكان گوتیـان: ئـەوە چیمانـە! پیاوانێـك نابینیـن كـە ئێمـە لـە خراپانمـان دانابـوون، واتـە: پێمان وابـوو هیـچ خێریـان پێوەنیـە هەرچیـی و پەرچییـن، كەڵكـی هیـچ ناگـرن، كـە مەبەسـتیان بـرواداره ڕەش و ڕووتەكانـن، بۆچـی نایانبینیـن؟ چیمانـە نایانبینیـن؟

﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾، ﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (إتَّخَذْنَاهُـم)، ئێمـە گاڵتەمـان پـێ دەكـردن، یاخـود ئایـا ئێمـە گاڵتەمـان پـێ دەكـردن بـە ناهـەق و بەهەڵـەدا چووبوویـن؟ ﴿ أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾، یاخـود هـەر چاومـان لێیـان لادراوە، ئەگەرنـا ئەوانیـش هـەر لەگـەڵ ئێمـە لـە دۆزەخـدان؟ یـانی: ئایـا هـۆی نەبینینەكەمـان ئەوەیـە كـە بـە ناهـەق گاڵتەمـان پـێ دەكـردن، یـان ئێمـە كـە گاڵتەمان پـێ دەكـردن، پێچەوانـەی ئەهـلی كوفـر بـوون و دیـارە ئـەوان چوونـە بەهەشـت؟

ئەمە - وەک دوایی باسی دەكەین - دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ بەڕاستیی پرسیاربكەن.

ب- دەشگونجێ كە گاڵتە بەخۆیان بكەن و بە توانجەوە وابڵێن، دەڵێن: كوان ئەوانەی ئێمە بە خراپمان دادەنان؟ ئایا ئێمە بە ناهەق گاڵتەمان پێ دەكردن و ئێستا ئەوان

چوونە شوێنێکی دیکە؟ یاخود: هەر لێرەن و چاومان نایانبینێ؟! یانی: جۆرێک بە توانج لەخۆ گرتنەوە، ئەو قسانە بکەن، یاخود: بە جیددیی پرسیار بکەن.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە هەقەو چەسپاوە، ئەو مشت و مڕ پێکەوە کردن و دەمەقاڵێیەی خەڵکی ئاگر، و تە: ئەوانەی کە لە دۆزەخدان، کە لە نێو ئاگری دۆزەخدا سزا دەدرێن، بەو شێوەیە پێکەوە مشت و مڕو دەمەقاڵە دەکەن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**سەرەنجامی پڕ خێرو خۆشیی پارێزکاران، بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەو دەرگا کراوەکانن، کە تێیاندا ئاسوودەن و هەرچی بیخوازن هەیە، لە میوەی جۆراوجۆرو شەرابی نایاب و، ئافرەتانی دڵپەسند:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا ذِكْرٌ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ هَٰذَا ذِكْرٌ ﴾، ئەمە باسکردنێك بوو، چەند واتایەکی بۆ لێکدراونەوە،

**یەکەم:** ئەمە باسکردن بوو بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کە ڕابردن، بۆ ئەو نۆ پێغەمبەرە.

**دووەم:** ئەمە ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە.

**سێیەم:** ئەمەش باسکردنی ئەوەبوو کە باسکرا.

هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەمە وەک ئایەتەکانی سوورەتی (الحج) وایە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ... ﴿٣٠﴾ ﴾الحج، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾الحج، کە ئەمە بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێک بۆ

مەبەستێکی دیکە، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئەو مەبەستە ڕۆیی، ئنجا دەگوازێتەوە بۆ مەبەستێکی دیکە.

لێرەش چەند جارێک ﴿ هَٰذَا ﴾، دووبارە بۆتەوە، وەک گواستنەوە لە باسێکەوە بۆ باسێکی دیکە.

٢)- ﴿ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾، ئەم (و)ە، دەگونجێ بۆ بادانەوەو گێڕانەوە بێ، دەشگونجێ بۆ حاڵ بێ، یانی: لە حاڵێکدا کە بۆ پارێزکاران باشترین سەرەنجام هەیە.

ئنجا باشترین سەرەنجامەکە، خوا ﷻ باسی دەکات:

٣)- ﴿ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ﴾، باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزارە هەمیشەییەکانن، ﴿ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ﴾، (مَنْصُوبٌ عَلَى البَيانِ مِنْ «لحُسْنَ مآب»)، ﴿ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ﴾ (منصوب)ە، چونکە ڕوونکردنەوەیە بۆ ﴿ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾، واتە: چاکترین سەرەنجامەکە لە باخ و گوڵزارە هەمیشەییەکان دا بەرجەستەیە، ئنجا ئەو باخ و گوڵزارە بەردەوامانەش حاڵیان بەمجۆرەیە:

٤)- ﴿ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، دەرگایەکانیان بۆ کراوەن (مُفَتَّحَةً: حَالٌ مِنْ جَنَّاتِ عَدْنٍ)، واتە: باغەکان دەرگاکانیان کراوەن، (أل)ی سەر ﴿ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾یش، (عِوَضٌ عَنِ الضَّمِيرِ، أي: أَبْوَابُهَا)، (أل)ی سەر ﴿ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، قەرەبووی ڕاناوێکە، کە پاڵوەلادراو (مضاف إليه)ە، لە جیاتی بفەرموێ: (مُفَتَّحَةً لَهُمْ أَبْوَابُهَا)، فەرموویەتی: ﴿ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، واتە: دەرگاکانیان، کەواتە: دەبێتە (أل)ی (عهد)، واتە: دەرگاکانی ئەو باغانە، کراوەن بەڕوویاندا.

٥)- ﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا ﴾، لەوێدا پاڵدەرەوەن، یانی: شانیان داداوە، ئەمیش حاڵە لە (المُتَّقِين)، واتە: پارێزکارەکان لەوێدا پشوویانداوەو پاڵیان داوەتەوەو شانیان داداوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، (تَفْتِيحُ الأَبْوَابِ كِنَايَةٌ عَنِ التَّمَكُّنِ مِنَ الإنْتِفَاعِ بِنَعِيمِهَا، لأَنَّ تَفَتُّحَ الأَبْوَابِ يَسْتَلْزِمُ الإِذْنَ فِي الدُّخُولِ وَالتَّخْلِيَةِ)، کرانەوەی دەرگاکان، دەرگاکان زۆر چاک کراونەوە، کینایەیە لەوە کە زۆر باش دەتوانن لەو بەهەشتانە بەهرەمەندبن، چونکە دەرگا کرانەوە، خوازیاری ئەوەیە کە فەرمووشیان لێبکرێ و بچنە ژوورێ.

٦)- ﴿ يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴾، لەوێدا لە نێو ئەو بەهەشتەدا میوەیەکی زۆر و خواردنەوە (ی نایاب)یش داوا دەکەن. یانی: میوەی جۆراو جۆرو خواردنەوەی تایبەتی تێدا دلوا دەکەن.

تەنوینی سەر: (فَاكِهَةٍ) و تەنوینی سەر (شَرَاب) بۆ مەزنییە، بۆ گەورە کردنە، واتە: میوەو خواردنەوەیەکی نایاب و پەسندو هەڵبژاردە داوا دەکەن.

٧)- ﴿ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ ﴾، لەلایان هەن ئافرەتانێک کە چاوی خۆیان کورت هەڵێناوەو، هاوتەمەنیشیانن، پێشتر باسمان کرد کە وشەی: ﴿ قَٰصِرَٰتُ ﴾، سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو (صفة موصوفٍ مَحذُوف)، (أَي: نِسَاءٍ قَاصِراتِ النُّظَر)، یانی: ئافرەتانێکی چاوی خۆ کورتکەرەوە، چاو نابڕنە غەیری هاوسەرەکانی خۆیان.

٨)- ﴿ أَتۡرَابٌ ﴾، هاوتەمەنن، (أَي: أَتْرَابٌ لِبَعْضِهِنَّ البَعْض)، یاخود (أَتْرَابٌ لأَزواجِهِنَّ)، ئافرەتەکان هاوتەمەنن، یاخود ئافرەتەکان هاوتەمەنن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا، ئەمەش مەبەست پێی ئەوەیە کە ئافرەتانی بەهەشت، هەموویان چ حۆرییەکان کە بە تایبەت خوا دروستیان دەکات، چ ئافرەتانی دنیا، هەموویان بەو شێوەیە دەبن، ئەو سیفەتانەی کە خوا هەڵیان دەدا لە ئافرەتانی بەهەشت، هەموویان دەگرێتەوە.

٩)- ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾، ئەمە ئەوەیە کە بەڵێنتان پێ دەدرێ بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە، ﴿ تُوعَدُونَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (يُوعَدُونَ)، بەڵێنیان پێ دەدرێ، بەشێوەی دواندن (خطاب) و بەشێوەی نادیار (غائب).

١٠)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا ﴾، بە دڵنیایی ئەمە بژێوی ئێمەیە، ڕۆزیی تەرخانکراوو تایبەتی ئێمەیە [بۆ بەندە چاکەکان].

١١)- ﴿ مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾، بڕانی بۆ نیە (أَي: زَوَالٌ وَانْقِطَاعٌ)، بڕانی بۆ نیەو لە بەین چوونی بۆ نیە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾، واتە: پێیان دەگوترێ: کە ئەمە ئەوەیە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە بەڵێنتان پێ دەدرێ، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾، بە چوار جۆر جەختکراوەتەوە:

١- بە ﴿ إِنَّ ﴾، تەئكید كراوەتەوە.

٢- بە ﴿ هَٰذَا ﴾، كە ناوە بۆ ئاماژە، واتە: ئەم بژیوە بژیوێكی تایبەتە، بەوەش تەئكید كراوەتەوە.

٣- ﴿ لَرِزْقُنَا ﴾، بە (ل)ی جەختكردنەوە، چاكەی دیارو بەرچاوی ئێمەیە.

٤- ﴿ مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾، كە لەبەین چوونی بۆ نیە.

بە چوار سیفەتان خوای بەخشەر باسی ئەو بژیوەی كردوە.

كەواتە: سەرجەم ئەو سیفەتانەی كە خوا ﷻ نیعمەتەكانی كە بۆ پاێزكارانی لە بەهەشتدا داناون، پێیان وەصف دەكات، دە (١٠) سیفەتن:

١- ﴿ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾، باشترین سەرەنجام، باشترین سەرەنجام گشتگیرە بۆ هەموو ئەو نیعمەتانەی كە دوایی باس دەكرێن، باشترین ئاكام و سەرەنجام و، باشترین شوێن و جێگاو ڕێگا، دوایی سەرجەم موفرەدەكانی دیكە دەگرێتەوە خۆی.

٢- ﴿ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ﴾، باغە هەمیشەییەكانن.

٣- ﴿ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴾، دەرگاو دەروازەكانیان بەڕوویان دا كراونەوە بە هەمیشەیی.

٤- ﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا ﴾، لەوێدا پاڵدەرەوەو شاندادەرن.

٥- ﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴾، لە وێدا زۆر میوەی تێدا داوا دەكەن، واتە: میوەی جۆراوجۆر.

٦- ﴿ وَشَرَابٍ ﴾، هەروەها خواردنەوەیەكی نایاب، كە لێرەدا خوا ﷻ نەیخستۆتەڕوو ئەو شەڕاب و خواردنەوەیە چیە، دەگونجێ مەی بێ، دەگونجێ هەنگوین بێ، دەگونجێ شیر بێ، دەگونجێ ئاو بێ، وەك لە شوێنی دیكەدا هاتوە.

٧ ﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴾، هەروەها لەلایانن ئافرەتانێک کە چاوەکانی خۆیان لەسەر مێردەکانی خۆیان کورت هەڵێناوەو، هاوتەمەنیشیانن.

٨- ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴾، ئەمە ئەوەیە کە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە بەڵێنتان پێ دەدرێ، واتە: دڵنیابن.

٩- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا ﴾، ئەمە بژیوێکی ئێمەیە، بە تایبەت دابینمان کردوەو تەرخانمان کردوە بۆ دۆستەکانمان.

١٠- ﴿ مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾، کە لەبڕان نایەت و کۆتایی نایەت.

**مەسەلەی دووەم:**

**لـە خـوا یاخییـانی ملهـوڕ خراپتریـن سـەرەنجامیان هەیـە، کـە دۆزەخـەو، تییـدا دەبرژێنرێـن و خراپتریـن جێـی تێـدا ڕاکشـان و تێـدا پشـوودانەو، خوادنەوەیـان ئـاوی کوڵیـوو داغ و کێـم و زووخـاوەو، چەنـدان جـۆرە ئـازارو ئەشـکەنجەی دیکـەی هاوشـێوەی ئـەوەش:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هَـٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٖ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَا فَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَـٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ هَـٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٖ ﴾، ئەمەو بۆ یاخییان خراپترین سەرەنجام هەیە ﴿ هَـٰذَا ﴾، ئەمە ناوی ئاماژە (إسم إشارة)یە، بەکارهێنراوە لە گواستنەوە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە، واتە: ئەوەی ڕابرد ڕابرد، ئنجا دێینە سەر بابەتێکی دیکە: بەدڵنیایی بۆ یاخییان خراپترین سەرەنجام هەیە.

٢)- ﴿ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَا فَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾، ئنجا وەسفی ئەو خراپترین سەرەنجامە دەکات: دۆزەخ، تییدا دەبرژێنرێن، تییدا دەپیشێنرێن، خراپترین شوێنی پشوودان و تێدا سرەوتنە.

(المِهاد: الفِرَاش)، (المَخصُوصُ بِالذَّمِّ مَحْذُوفٌ، أي: فَبِئسَ المِهَادُ جَهَنَّمُ)، تایبەتکـراو بـەزەم فرتێـنراوە: خراپتریـن شـوێنی تێـدا ڕاکشـان و پشـوودان، دۆزەخـە.

٤)- ﴿ هَـٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ ﴾، ئەمە بابیچێژن ئاوی داغ و زووخاو، دیسان ﴿ هَـٰذَا ﴾، دەگونجێ بۆ گواستنەوە بێ، لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی دیکە، واتە: ئەوەی باسکرا باسکرا، یاخود: ﴿ هَـٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ ﴾، با ئەمە بچێژن، کە ئاوی کوڵاوو داغە لەگەڵ کێم و زووخاودا، (غَسَاق) خوێندراویشەتەوە: (غَسَّاق)، بەبێ گیرە (شەددە)، (وَالغَسَاقُ: أو الغَسَّاقُ: مَا يَغْسَقُ، أي: يَسِيلُ مِنْ صَدِيدِ أَهْلِ النَّار)، کێم و زووخاوی برینی

دۆزەخییانە کە دێتە خوار، ﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ ﴾، با ئەو ئاوی کوڵاوو کێم و زووخاوە بچێژن، یاخود: ﴿ هَٰذَا ﴾، یانی: ئەو سزاو ئازاردانە بەو شێوەیەو با بەو شێوەیە بیچێژن.

٥)- ﴿ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴾، هەروەها لە شێوەی ئەوە جۆری دیکەش هەن. خوێندراویشەتەوە: (وَأُخَرُ)، (آخر) بۆ یەکەو (أُخَرُ)، بۆ کۆیە، واتە: زۆر جۆرە سزای دیکەش هەن ﴿ مِن شَكْلِهِۦٓ ﴾، لە شێوەی ئەوەی ڕابرد، ﴿ أَزْوَٰجٌ ﴾، واتە: (أَصْنَاف، أَنْوَاع)، یانی: زۆر جۆری دیکەش هەن و بەس ئەوەندە نیە کە باسکرا، وشەی (شكل)، واتە: وێنەی ئەوە لە جۆریدا لە شێوەو چۆنیەتیی دا، ئەگەر (أُخَر)یش بێت واتە: زۆر جۆرە سزای دیکەش هەن، کەواتە: ئەو سزایەش کە بۆ لە خوا یاخییان دیارییکراوە، بە حەوت (٧) سیفەتان پێناسە کراوە:

١- ﴿ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴾، خراپترین سەرەنجام، خراپترین سەرەنجامنیش هەموو شتەکانی دیکە دەگرێتەوە نێو خۆی.

٢- ﴿ جَهَنَّمَ ﴾، ناوی ناسران (عَلَمْ)ی دۆزەخە.

٣- ﴿ يَصْلَوْنَهَا ﴾، تێدا دەبرژێندرێن، دەپیشێنرێن.

٤- ﴿ فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، خراپترین شوێنی پشوودان و تێدا سرەوتنە.

٥- ﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ ﴾، با بیچێژن ئاوی کوڵاوو داغ.

٦- ﴿ وَغَسَّاقٌ ﴾، کێم و زووخاو.

٧- ﴿ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴾، ئازارو سزای دیکەش هەیە، یاخود خواردنەوەی دیکەش هەیە لە شێوەی ئەوەو ئەویش هەر جۆراو جۆرە.

بێگومان کەسانێک دۆستی خوابن، خوا ﷻ شوێنێک دروست بکات تایبەت بۆ ئیسراحەت و تێدا پشوودانی ئەوان و ژیان و گوزەرانی ئەوان، واچاوەڕێ دەکرێ خۆشترین شوێن بێ و چاکترین نازو نیعمەتی تێدابێ، هەروەک کەسانێکیش

دوژمـن و ناحـەزی خوابـن، لـە تاقیکردنـەوەی دونیـای خـوادا کەوتبن، هـەروەها چاوەڕێ دەکرێ کـە ئـەو شـوێنەی بۆیـان ئامـادە دەکـرێ، خراپتریـن و پیسـترین شـوێن بێ و بـە سـەختترین سـزا، سـزا بدرێـن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـە دۆسـتانی خـۆی بگێـڕێ و، بمانپارێـزێ لـەوەی کـە توخنـی ئـەو سـیفەتانەو ئـەو کردەوانـە بکەویـن کـە لـە خوامـان دووردەخەنـەوەو، سـەرەنجام تـووشی ئـەو سـەرەنجام و ئـازارو مەینەتییەمـان دەکـەن، کـە خـوا ﷻ بـاسی کـردوە، بـۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان بسـڵەمنەوە بپرینگێنـەوە لـە گوناهـو تـاوان و لـە کوفـرو لـە یاخیـی بـوون، هـەروەک بـاسی بەهەشتیشـمان بـۆ دەکات، بـۆ ئـەوەی هاندەرمـان بـێ بـۆ بەندایەتیـی چاکـتر بـۆ خـوا، هەروەهـا بـۆ زیاتـر ڕووکردنـە خـوا، کـە سـەرەنجامیش هـەم لـە دنیـادا بـە قازانجـی خۆمـان دەشـکێتەوە، هـەم لـە دواڕۆژیشـدا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**مشتو مڕی سەران و شوێنکەوتووانی بێبڕوایان لە دۆزەخدا، هەرکامیان قسە بەوی دیکە دەڵێ و، شوێنکەوتووە فریودراوەکان (کڵاو لەسەر ناوەکان)، خەتای سەرکردەو دەمڕاستەکانیان دەگرن و، داواش لە خوا دەکەن کە سزاو ئازاری ئەو سەرکردەو دەمڕاستانە دووقات، یاخود چەند قات بکات، سەرانی کوفریش بە گاڵتە بەخۆ کردنەوە، ڕەخنە لە خۆیان دەگرن، کە مامەڵەی هەڵەیان لەگەڵ مسوڵمانانی چەوساوەدا کردوە لە دنیاداو، ئێستا ئەوان لە شوێنێکی دیکەن، کە بەهەشتە، ئەمانیش (واتە: سەرانی ئەهلی کوفریش) بۆخۆیان لە دۆزەخدا دەناڵێنن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ ٥٩ قَالُواْ بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ أَنتُمۡ قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ٦٠ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ٦١ وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ ٦٢ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ٦٣ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقّٞ تَخَاصُمُ أَهۡلِ ٱلنَّارِ ٦٤ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ ﴾، ئەمە کۆمەڵێکی زۆرە، لەگەڵ ئێوە خۆتێپەستێون، بێگومان کە ئەمە دەگوترێ: (مَقُولُ قَوْلِ قَائِلٍ)، بێگومان گوتراوی قسەی بێژەرێکە، ئنجا ئایا ئەو بێژەرە کێیە؟ هەندێک دەڵێن: دۆزەخەوانەکان (خَزَنَةُ جَهَنَّم)ن، هەندێک دەڵێن: سەرانی لە خوا یاخیی (ئەهلی کوفرن) لە بەینی خۆیاندا ئەوە بە یەکدی دەڵێن، هەردوو ڕایەکان پێدەچن، دەگونجێ لە بەینی خۆیاندا بە یەکدی بڵێن: ئەوانەش کۆمەڵێکن، لەگەڵ ئێوەدا خۆ دەپەستنە نێو دۆزەخەوە، دەشگونجێ دۆزەخەوانەکان پێیان بڵێن.

بەڵام ئایا ئەو کۆمەڵە زۆرە کێن؟

ئـەو كۆمەڵـە زۆرە، بـە تەئكیـد شـوێنكەوتووە هەڵخەڵەتێنراوەكانیانـن، ئەوانـەن كـە سـەركردە فریـودەرەكان كڵاویـان لەسـەر نـاون، ئەوانـەی لە دنیـادا لاسـایان كردوونەوەو شـوێنیان كەوتـوون و ڕیشـیان لـە مسـتی ئـەوان نـاوە، عەقڵـی خۆیـان تیجـازە داوەو بـە عەقڵـی ئـەوان بیریـان كردۆتـەوە، بـە دوای ڕێـی هەڵـەی وان كەوتـوون، ئنجـا كـە دەڵێـن: ﴿ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ ﴾، (إقتِحَام): بریتیـە لـەوەی كـە كەسـێک ڕوو بكاتـە شـتێكی مەترسییدار، یاخـود بـە تۆبزیـی خـۆی لە شـوێنێكی تەنگەبـەر بپەسـتێ، یاخود بچێتـە نێـو كۆمەڵێكـەوە كـە هاوكـووفی ئـەوان نەبـێ، كـە لێـرەدا وا پێدەچـێ ئـەوان مەبەسـتیان ئەوەبـێ: ﴿ هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ ﴾، (أي: **يَدخُلُونَ مَعَكُمُ النَّارَ، وَلَيسُوا كُفأً لَكُم، وكَأنَّهُم يُقحِمُونَ أنفُسَهُم إقحَاماً بَينَكُم**)، لـە بەینـی خۆیانـدا بـە یەكـدی دەڵێـن: ئەوانـەش كۆمەڵێكـن ئـەوە هاتـن، لەگـەڵ ئێـوەدا خـۆ تێدەپەسـتێون و هاوتـاو هاوكـوفی ئێمـە نیـن، چونكـە ئەوانـە لـە دنیـادا شـوێنكەوتووی ئێمـە بـوون، گـوێ لـە مسـتی ئێمـە بـوون، بـەڵام ئێسـتا بـە خـۆ تێپەسـتان خـۆ تێدەپەسـتێون، بـەڵام ئەگـەر قسـەی دۆزەخەوانەنـەكان بـێ واتـە: ئەوانـەش وەک چـۆن ئێـوە خۆتـان پەسـتاوتە نێـو دۆزەخ، ئەوانـەش ئـەو كۆمەڵـە زۆرەش كـە شـوێنكەوتووانی ئێـوەن، ئەوانیـش لەگـەڵ ئێـوە خۆیـان دەخەنـە نێـو دۆزەخـەوە.

٢)- ﴿ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡ ﴾، یانی: بەخێر نەیەن، چونكە (**مَرحَباً بِكَ**) یانی: (**جِئتَ مَكاناً رَحِباً**)، هاتی بۆ شوێنێكی فراوان، لە عەرەبییدا دەگوترێ: (**أَهلاً وَسَهلاً وَمَرحَباً**)، یانی: (**نَزَلتَ أَهلاً، وَوَجَدتَ مَكَاناً سَهلاً، وَنُرَحِّبُ بِكَ**)، یانی: هاتیە لای كەس و كارت و، شوێنی سێنات چنگ كەوتوەو، بەخێرت دێنین.

كـە دەڵێـن: ﴿ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡ ﴾، ئەمە واپێدەچێ قسـەی سـەركردەو دەمڕاسـتەكان بـێ، بـەو كۆمەڵـە دەڵێـن، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو كۆمەڵـە زۆرەش شـوێنكەوتووانی ئـەوان بـوون، بۆیـە دەڵێـن: بەخێـر نەیـەن: (**مَرحَبـاً: مِـنَ الرُّحـبِ أتَيـتَ رُحبَـاً، أي: مَكَانـاً ذَا رُحـبٍ**)، هـاتی بـۆ شـوێنێكی خـاوەن فراوانیـی، كـە مەبەسـت پێـی فـراوانی مەجازییـە، واتـە: ئێمـە دڵخۆشـین بـە تـۆ و ئارەزوومەنـد بوویـن، یاخـود

تامەزرۆبوویــن، بــۆ دیــدارت، بــەڵام کــە دەڵــێ: ﴿لَا مَرْحَبًا بِهِمْ﴾، واتــە: ئێمــە تامــەزرۆی دیداریــان نیــن و، خۆشــییمان لێیــان نایــەت و چارەمــان ناوێــن.

بــۆچــــی؟

٣)- ﴿إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ﴾، بە دڵنیایی ئەوان دەچنە نێو ئاگرەوە، پێشتریش گوتوومانە: (صَلي): بریتیە لە جۆرە سووتانێکی تایبەت لە ئاگردا، ئەویش ئەوەیە کە لە هەموو لاوە ئەو ئاگرە تینی بۆ بێنێ و بیبرژێنێ، یان بیپیشێنێ، دەگوترێ: (شَاةٌ مَصْلِيَّة)، مەڕێک کە بەو شێوەیە دەبرژێنرێ، کە لە هەموو لاوە ئاگر لێیدەدا، بە عەرەبیی عەوامانە پێی دەڵێن: (مەگزووف).

٤)- ﴿قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ﴾، شوێنکەوتووەکانیش وەڵامی سەرکردەو دەمڕاستەکانیان دەدەنەوەو دەڵێن: بەڵکو ئێوە بەخێر نەیەن، (بَل: لِلإضْرَابِ الإبْطَالِي لِرَدِّ الشَّتْمِ عَلَيهِم)، (بَل) لێرەدا بۆ (إضرابِ) یانی: لە قسەیەکەوە دەگوازیەوە بۆ قسەیەکی دیکە، بەڵام مەبەست پێی هەڵوەشاندنەوەی قسەی بەرانبەرە، بۆ ئەوەی ئەوانیش قسەکەیان پێ بڵێنەوە، چونکە کە ئەوان دەڵێن: بەخێر نەیەن، ئەوە جنێو پێدانێکە، ئەوانیش ئەو جنێوەیان پێ دەڵێنەوە: بەڵکو بۆ خۆتان بەخێر نەیەن.

٥)- ﴿أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا﴾، ئێوە بوون ئەمەتان بۆ پێشخستین.

ئەمــە وەک پاســاو دانــەوەی ئەوەیــە کــە بۆچــی قســەکەیان پــێ دەڵێنــەوە؟ کــە دەڵێــن: ﴿أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا﴾، کــە ﴿أَنتُمْ﴾، لەســەرکردارەکەی پێشــخراوە، ئەمــە کــورت هەڵێنــان دەگەیەنــێ، واتــە: هــەر ئێــوە تــووشی زیانتــان کردیــن و، تــووشی ئــەم چارەنووســەتان کردیــن، نــەک کەســی دیکــە، ئنجــا کــە دەڵێــن: ﴿قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا﴾، بــە ڕانــاوی نێرینــە دەیهێنــن، واتــە: ئــەم واقیعــە کــە تێیدایــن، یــان ئــەم شــوێنە کــە هاتووینــە نێــوی، ئێــوە بۆتــان پێشخســتین و واتــان کــرد کــە ئێمــە گرفتاربیــن پێیــەوە، (التَّقْدِيــمُ: جَعْــلُ الــشَّيءِ قُــدَّامَ غَــيرِهِ، أَي: جَعْلِــهِ بِحَيــثُ يَجِــدُهُ قَرِيبــاً مِنــهُ)، (تَقدِيــم): ئەوەیــە کــە شــتێک لــە پێــش کەسێک دابنــدرێ و وابــێ کــە لێینزیــک بــێ.

٦)- ﴿ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴾، واتە: ئێرە خراپترین نشینگەیە، یاخود: خراپترین مانەوەیە، (القَرَارُ: المكْثُ أو مَكَانُ القَرَارِ)، (قرار) مانەوە یان شوێنی مانەوەیە، ئێرە خراپترین نشینگەیە، یان خراپترین نیشتەجێ بوون ئەم نیشتەجێ بوونەیە، کە لێرەدا نیشتەجێ بووین، (أي: مَا قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا مِنَ العَذَابِ أسْوَءُ عَذَابٍ وَأسوَءُ مُستَقَرٍّ)، ﴿ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴾، واتە: ئێرە خراپترین نشینگەیە، هەروەک تووشی خراپترین سزاش بووین، ئنجا ئێوە بەو دەردەتان بردین، کە بێینە خراپترین شوێنەوەو، خراپترین سزاش بچێژین.

٧)- ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ﴾، شوێنکەوتووە هەڵخەڵەتێنراوەکان (کڵاو لەسەر نراوەکان)، دەست و پێوەندە لاسایی کەرەوەکان گوتیان: پەروەردگارمان! هەر کەسێک ئەمەی بۆ هێناوینە پێش و تووشی ئەم حاڵەی کردووین، سزای یان ئازاری بۆ چەند قات بکەوە لە ئاگر، (الضِّعْفُ: ضَمُّ مِثْلِ الشَّيءِ إلَيهِ فَصَاعِداً)، (ضِعْف): ئەوەیە کە شتێک بە ئەندازەی خۆی یاخود زیاتر، دوو قات، یاخود چەند قات، بخرێتە گەڵی، هەڵبەتە ئەمە قسەی شوێنکەوتووەکانە، قسەی دەست و پێوەندە هەڵخەڵەتاوەکانە، کە بە دوای طاغووت و لە خوا یاخییەکاندا ڕۆیشتوون، کە هیچیان بە دەست نامێنێ، ئەوەنەبێ کە خوا تۆڵەیەکیان بۆ بکاتەوەو قەرەبوویان بۆ بکاتەوە، ئەویش بەوە کە سزای سەرکردەکان دوو قات، یاخود چەند قاتی هی ئەو شوێنکەوتووە هەڵخەڵەتاوانە بێ.

ئەمەش لە چەند شوێنێک لە قورئاندا هاتووە، کە شوێنکەوتووەکان بە ئاوات دەخوازن، خۆزگە دەخوازن و دەپاڕێنەوە لە خوا، کە سزای ئەوانەی هەڵیانخەڵەتاندوون، ئەوانەی کڵاویان لەسەر ناون، دوو بەرانبەر، یاخود چەند بەرانبەر بکاتەوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ ... قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ ... ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی دوایی بەوانەی پێشیان گوت: {شوێنکەوتووەکان بە سەرانیان گوت، بەوانەی پێشڕەو بوون، بەسەرکردەکان} پەروەردگامان! ئەمانە ئێمەیان گومڕا کرد، بۆیە سزای دوو قات، یان چەند قاتیان بدە، با سزای ئەوان دوو بەرانبەر،

یـان چەنـد بەرانبـەری ئێمـە بـێ! بـەڵام لـەوێ خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ..لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾﴾الأعـراف، بـۆ هـەر کامێکتـان سـزای دوو قـات، یـان چەنـد قـات هەیـە، بـەڵام نازانـن.

ئێمـە لەوێ لە تەفسـیری سـوورەتی (الأعراف)دا، باسـێکی سـەربەخۆمان لـەو بارەوە کـردوەو هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی، لەوبـارەوە لـە قورئانـدا هاتـوون، لـە سـوورەتەکانی: (الأعـراف، إبراهیـم، السّـبأ، غافـر)دا، هەموویانمـان کۆکردۆتـەوەو هێناومانـن، کـە وێنەیەکـی تەواترمـان بـە دەسـتەوە دەدەن و لـە هەمـوو گۆشـەکانەوە، چونکـە خـوا ﷻ کـە بابەتێـک بـاس دەکات لـە قورئانـدا، جـاری وایـە لـە سـوورەتێکدا لـە گۆشـەیەکەوەو، لـە سـوورەتێکی دیکـەدا لـە گۆشـەیەکی دیکـەوەو، لـە سـوورەتێکی دیکـەدا بوارێکـی دیکـەی دینـێ، بەپێـی ئـەو ڕەوت (سـیاق)ە کـە سـوورەتەکەی تێـدا دابەزیـوەو، بەپێـی ئـەو کـەش و هەوایـە کـە دەیخـوازێ، ئنجـا ئەگـەر بتـەوێ دیمەنێکـی تـەواوت دەسـتبکەوێ لـەو بابەتـە، پێویسـتە هەمـوو ئایەتـەکان پێکـەوە کۆبکەیـەوە، کـە ئێمـە وێـڕای سـوورەتی (الأعـراف) لـە سـوورەتی (السبأ)یشـدا بـاسی ئـەو بابەتەمـان کـردوە.

٨)- ﴿وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ﴾، گوتیشیان: چیمانە پیاوانێک نابینین، ئێمە لە خراپەکارانمان دەژماردن؟ ئەوە قسەی سەرکردەکانە، ئەوانەی خەڵکیان گومڕا کردوە، قسەی لە خوا یاخییە گومڕاکەرەکانە، چونکە ئەوان بوون کە خەڵکیان بە کەم و خراپ تەماشا کردوە، ﴿وَقَالُوا مَا لَنَا﴾، گوتیان: چیمانە؟ ﴿لَا نَرَىٰ رِجَالًا﴾، پیاوانێک نابینین ﴿كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ﴾، کە ئێمە کاتی خۆی (واتە: لە دنیادا) لە خراپەکارانمان لە قەڵەم دەدان، بەو واتایە کە پێمان وابوو هیچ لەبارانیدا نەبوون، هیچ و پووچن، هەرچیی و پەرچیین، وەک سەرانی گەلی نووح، بە نووح ﷺ دەڵێن: ﴿ ..وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ ..﴿٢٧﴾﴾هود، نابینین شوێنت کەوتبن، جگە لەوانەمان کە هیچ و پووچن، سادەو سەرکێڵن، عەقڵیان بەدەرەوەیەو قووڵ نین.

٩)- ﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾، ئایا بەگاڵتەجارمان گرتبوون (بەناهەق) یان چاوەکانمان لێیان لاداون (نایانبینین)؟! توێژەرەوان زۆریان قسە لە بارەی ئەم دوو ڕستەیەوە کردوە، کە بە دوو شێوە خوێنراونەوە:

أ- ﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا ﴾؟ بە پرسیار کردن: ئایا ئێمە ئەوانمان بە گاڵتە پێکراو گرتبوو؟

ب- هەروەها خوێندراویشەتەوە: (إتَّخَذْنَاهُم سِخْرِيّاً)، ئێمە ئەوانمان بە گاڵتە پێکراو گرتبوو، گاڵتەمان پێ دەکردن، وەک لە مانا گشتییەکەشی دا ئاماژەمان پێدا، ئنجا ئەمە بە گشتیی دوو ئەگەری هەن:

١- ئەمە پرسیارکردنێکی ڕاستەقینە (إستِفهامٌ حَقِيقِي) بێ و، بپرسن: بۆچی ئەوان نابینن؟ ﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا أَمۡ زَاغَتۡ عَنۡهُمُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾؟! یانی: ئایا ئێمە بەناهەق گاڵتەمان پێیان دەکرد - بەڵام شایستە ئەوە نەبوون - یان: چاومان لێیان لایانداوە بۆیان بەدییان ناکەین لە دۆزەخ دا؟!

٢- ئەمە پرسیار کردنێکی سەرزەنشتکارانەبێ بۆ خۆیان، نەک پرسیار کردنی ڕاستەقینەبێ، چونکە دەزانن کە ئەوان لێرە نین، لە دۆزەخدا نین و لە شوێنێکی دیکەن کە بەهەشتە، ئنجا من مانای دووەمم زیاتر دەچێتە دڵەوە، کە مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: (مَا لَنَا لاَ نَرَى رِجَالاً مَعَنَا فِي النَّارِ كَانُوا عِندَنَا أَشْرَاراً، كُنَّا نَسْخَرُ بِهِم؟ ثُمَّ أَضرَبُوا وقَالُوا: بَل زَاغَت عَنْهُمُ الأَبْصَارُ، فَلاَ نَرَاهُم فِيهَا، وَإِن كَانُوا مَعَنَا، أَو زَاغَت أَبْصَارُنَا عَنْهُم وَكَلَّت أَفْهَامُنَا عَنْهُم، حَتَّى خَفِي عَلَيْنَا مَقَامُهُم)، واتە: بۆچی پیاوانێک لە دۆزەخ دا نابینین کە ئێمە لە خراپەکارانمان دادەنان؟ {واتە: لە دنیادا پێمان وابوو هەرچیی و پەرچیین و خەڵکی بێ کەڵکن} گاڵتەمان پێ دەکردن، دوایی دەڵێن: بەڵکو ئایا لەبەر ئەوە چاومان نایانبینێ ئەگەرنا لەگەڵمانن لە دۆزەخدا، بەڵام چاومان لێیان لایانداوە؟ یان: ئایا ئێمە لە دنیادا چاومان باشی نەدەبینی و عەقڵمان باشی کار نەدەکرد، تاکو پێگەو پلەی ئەوان چاک دەرک بکەین، کە ئەوان وەک ئێمە نەبوون و شایستەی دۆزەخ نەبوون {ئەوان ئێستا لە شوێنێکی دیکەن}؟!
بەڵام ئەگەر بە: ﴿ أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ سِخۡرِيًّا ﴾، بخوێندرێتەوە: ئایا ئێمە گاڵتەمان پێ دەکردن؟

ئەو کاتە مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: (أَتَّخَذْنَاهُم سِخْرِيّاً، وَلَمْ يَكُونُوا كَذَلِكَ فَلَم يَدْخُلُوا مَعَنَا النَّار، فَهُمْ فِي الجَنَّة؟ أَمْ دَخَلُوهَا مَعَنَا، وَلَكِن مَالَتْ أَبْصَارُنَا عَنْهُم فَلاَ نَرَاهُم)[1]، واتە: ئایا ئێمە لە دونیادا گاڵتەمان پێ دەکردن و، ئەوانیش شایستەی ئەوە نەبوون بۆیە لەگەڵمان نەهاتوونە نێو ئاگرەوەو ئەوان لە بەهەشت دان، یاخود لەگەڵماندا هاتوونە نێو ئاگر، بەڵام ئێمە چاومان لێیان لایانداوەو نایان بینین؟!

تەماشای زۆربەی تەفسیرەکانم کرد، بەڵام (إبن عجيبة) لە هەموویان باشتر مانای ئەم دوو ڕستە قورئانییە موبارەکەی هێنا بوو، هەڵبەتە زانایانی دیکەش زۆر قسەیان لێ کردوە، بەڵام هەمووی دێتەوە سەر ئەو دووەی باسمان کردن.

١٠)- لە کۆتایی دا خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهۡلِ ٱلنَّارِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە ڕاستەو چەسپاوە، ئەم مشت و مڕو ناکۆکییەی خەڵکی ئاگر، واتە: خاوەنانی ئاگر، ئەوانەی لە ئاگری دۆزەخدان، ئەو مشت و مڕو دەمەقاڵەیان پێکەوە دەبێ، یانی: سەران و شوێنکەوتووانیان، سەرکردەکان و پەیڕەوانیان.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

---

(١) البحر المديد، لابن عجيبة، ج٦، ص٢٣٩.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە دەرسـی کۆتاییـە، ئایەتـەکانی: (٦٥ - ٨٨) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: (٢٤) ئایـەتی کۆتایـی، تـەوەری سـەرەکییشی دوای فەرمانکـردنی خـوا بـە ڕاگەیانـدنی هۆشـیارکەرەوەیی پێغەمبـەر ﷺ، تاکیەتیـی خـوا لـە پەسـتراوێتیی داو، هەواڵێکـی مـەزن بـوونی، قورئـان، یەکسـەر بـاسی دروسـتکرانی ئـادەم و کڕنـووشی ڕێـز لێگرتنـی فریشـتان بـۆ بـردنی و، سـەرپێچیی کـردنی ئیبلیـس لـەو کڕنـووش بردنـەی ڕێـز لێگرتنـەو، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا نەفریـن لێکـرانی لـە لایـەن خـوای دادگـەرەوەو، دەرکـرانی لـە بەهەشـت و... هتـد.

لـە کۆتاییشـدا خـوای بـەرزو مـەزن بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: بـە خەڵـک ڕابگەیەنـە کـە هیـچ چاوەڕوانییەکـی لێیـان نیـەو، هیـچ بـار گرانییەکـی بۆیـان نیـە، قورئانیـش بـەس بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان و، بـەم زووانـەش هەواڵەکـەی دەزانـن.

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ
لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذۡ قَالَ
رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ
لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ
ٱلۡعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ
رَجِيمٞ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٧٩﴾

قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ
جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ
﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئـەی موحەممـەد)! بڵـێ: بـە دڵنیایـی مـن تەنیـا ورياكـەرەوەو ترسـێنەرم و، جگـە لـە خـوای تەنیـای ملپێکەچکـەر هیـچ پەرسـتراوێک نیـە ﴿٦٥﴾ پـەروەردگاری ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیـان، زاڵـی لێبوردەیـە ﴿٦٦﴾ بڵـێ: ئـەوە هەواڵێکـی مەزنـە ﴿٦٧﴾ کـە ئێـوە لێـی ڕوو وەرچەرخێنـەرن (پشـتگوێ خـەرن) ﴿٦٨﴾ مـن هیـچ زانیەرییەکـم لـە بـارەی کۆمەڵـی بـاڵا (فریشـتان، فریشـتە زۆر لـە خـوا نزیکـەکان) نەبـوو، کاتێـک کەوتبوونـە مشـت و مـڕەوە (لـە بـارەی دروسـتکردنی ئادەمـەوە)، بەڵام خـوا لەڕێـی سرووشـەوە ئـاگاداری کردمـەوە ﴿٦٩﴾ ئـەوەش کـە بـۆم سرووش دەکـرێ (لـە کاروبـاری پەنهـانی فریشـتان) تەنیـا لەو سـۆنگەوەیە کە مـن هۆشـیارکەرەوەیەکی ڕوونـم ﴿٧٠﴾ (یـاد بکـەوە)! کاتێـک پـەروەردگارت بـە فریشـتانی فەرمـوو: مـن بەدیهێنـەری (جەسـتەی) مرۆڤێکـم لـە قـوڕێ ﴿٧١﴾ ئنجـا هـەر کات ڕێـک و پێکـم کـرد (جەسـتەکەیم ئامـادە کـرد بـۆ گیـان بەبـەردا کـران)و، لـە گیـانی خـۆم (گیانێـک کـە دروسـتکراوی تایبەتیـی خۆمـە) فـووم پێـدا کـرد، بـۆی بـە کڕنووشـدا بکـەون (وەک ڕێـز لێنـان) ﴿٧٢﴾ یەکسـەر فریشـتەکان تێکـڕاو وێکـڕا کڕنووشـیان بـرد ﴿٧٣﴾ بێجگـە لـە ئیبلیـس، خـۆی بـە زلگـرت و لـە بێبڕوایـان بـوو ﴿٧٤﴾ خـوا فەرمـووی: ئـەی ئیبلیـس! چـی نەیهێشـت کـە کڕنـووش (ی سـڵاوکردن و ڕێـز گرتـن) بـۆ کەسـێک ببـەی کـە بـە دوو دەسـتی خـۆم (بـە شـێوەی تایبـەت) دروسـتم کـردوە، ئایـا هـەر

(لە بەرانبەر ئادەمدا) خۆت بە زلگرتە یان (پێت وایە) هەر لە باڵایانی (و لەوە بەرزتری کڕنووشی ڕێز گرتن بۆ ئادەم ببەی)؟ ﴿٧٥﴾ (ئیبلیس) گوتی: من لەو باشترم، (چونکە) منت لە ئاگر دروستکردووە، ئەوت لە قوڕێ دروستکردوە ﴿٧٦﴾ (خوا) فەرمووی: لێی (لە بەهەشتێ) بچۆ دەرێ، بێگومان تۆ دەرکراوو دوورخراوەی (لە بەزەیی خوا) ﴿٧٧﴾ هەتا ڕۆژی سزاو پاداشت نەفرینی منت لەسەر بێ ﴿٧٨﴾ (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! هەتا ڕۆژێ کە مرۆڤەکان دوی مردنیان تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، مۆڵەتم بدە (بمهێڵەوە لە ژیاندا) ﴿٧٩﴾ (خوا) فەرمووی: بێگومان تۆ لە مۆڵەت دراوان و هێڵدراوانی ﴿٨٠﴾ تاکو ڕۆژی کاتی زانراو (دیاریکرو) ﴿٨١﴾ (ئیبلیس) گوتی: سوێند بە عیززەتت (مرۆڤەکان) تێکڕایان سەرگەردان و بێمراد دەکەم ﴿٨٢﴾ بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت لە نێویاندا ﴿٨٣﴾ (خوا) فەرمووی: سوێند بە هەق و تەنیا هەقیش دەڵێم ﴿٨٤﴾ مسۆگەر دۆزەخ پڕ دەکەم لە تێکڕای وەچەی تۆش و، لەوانەی لەوان (وەچەی ئادەم) یش شوێنت بکەون ﴿٨٥﴾ (ئەی موحەممەد!) بڵێ: هیچ کرێیەکتان لە بەرانبەر (گەیاندنی پەیامی خوا)دا لێ داوا ناکەم و، من لە زۆر لەخۆ کەران و لاف لێدەران نیم ﴿٨٦﴾ ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان ﴿٨٧﴾ بە دڵنیاییش دوی ماوەیەکی کەم هەواڵ (ڕاستیی)ەکەی دەزانن ﴿٨٨﴾.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلۡقَهَّارُ): مل پێكەچكەر، (القَهْرُ: الغَلَبَةُ والتَّذْلِيلُ مَعاً)، (قَهْر): بریتیە لە زاڵبوون و زەبوون كردن پێكەوە.

(نَبَؤٌاْ): (النَّبأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ، أو غَلَبَةُ ظَنٍّ)، (نَبأ): هەواڵێكی سوود بەخشی مەزنە كە بەهۆیەوە زانیاریی، یاخود گومانێكی زاڵ پەیدادەبێ.

(سَوَّيۡتُهُۥ): واتە: ڕێكمخست، (السَّوِيُّ: المَصُونُ عَنِ الإفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ مِنْ حَيْثُ القَدْرِ وَالكَيْفِيَةِ)، (سَوِيٌّ): پارێزراو لە تێپەڕاندن و لە كورتهێنان، لە ڕووی ئەندازەو لە ڕووی چۆنیەتییەوە.

(ٱلۡعَالِينَ): (العُلْوَ: ضِدُّ السُّفْلِ، وَالعُلُوُّ: الإرْتِفَاعُ، وَقَدْ عَلَى يَعْلُو عُلُوّاً وَهُوَ عَالٍ)، (عُلْوَ): دژی (سُفْلِ)ە، (عُلْو) بەرزیی، (سُفْلْ) نزمیی، و (عُلُوّ): بە بەرزیی دەگوترێ، دەگوترێ: (عَلَى يَعلو عُلُوّاً وَهُوَ عَالٍ)، بەرز بوو، بەرز دەبێ، بەرزبوونەوە، ئەو بەرزە.

(رَجِيمٌ): (الرِّجَامُ: الحِجَارَةُ، وَالرَّجْمُ: الرَّمي بِالرِّجَامِ، يُقَالُ: رُجِمَ فَهُوَ مَرجُومٌ)، (رِجام): بە مانای بەرد دێ، (رَجْم): بریتیە لە بەرد پێدادان، دەگوترێ: (رُجِمَ فَهُوَ مَرْجُومٌ)، ئەو بەردی پێدادراو بەرد پێدادراوە، بەرد باران كراوە.

(لَعۡنَتِيٓ): (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ وَالإبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ السَّخَطِ)، (لَعْن): بریتیە لە دەركردن و دوورخستنەوە، بەڵام بە هۆی لێ تووڕە بوونەوە.

(فَأَنظِرۡنِيٓ): (النَّظَرَ: الإنْتِظَارُ، نَظَرتُهُ وانْتَظَرتُهُ، وَأنْظَرتُهُ: أخَّرتُهُ)، (نَظَر): جاری وایە بە مانای چاوەڕێ كردنە، جاری واش هەیە بە مانای تەماشا كردنە، (فَأَنظِرنِي)

واتـە: چاوەڕێـم بکـە، مۆڵەتـم بـدە، دەگوتـرێ: (نَظَرْتُهُ وانْتَظَرْتُـهُ وَأَنْظَرْتُهُ) هەرسـێکیای بـە واتـای: دوامخسـت و، مۆڵەتمـداو، هێشـتمەوە، دێـن.

(ٱلْمُتَكَلِّفِينَ): (التَّكَلُّـفُ: إسـمٌ لِـمَا يُفْعَـلُ بِمَشَـقَّةٍ، أو تَصَنُّـعٍ، أو تَشَـبُّعٍ)، (تَكَلُّـف): نـاوە بـۆ هـەر شـتێک کـە بـە زەحمـەت بکـرێ، یـان بـە (تَصَنُّع) بکـرێ، کەسـێک شـتێک بـکات کـە هـی خـۆی نەبـێ، (أو تَشَبُّع): ئەویـش دیسـان ئەویـە کـە کەسـێک زۆر لـە خـۆی بـکاو کارێـک بـکات، کـە پێچەوانـەی سروشـت و عـادەتی بـێ، بۆیـە مـن (مُتَكَلِّفِيْن) بـە زۆر لەخۆکـەران و، لاف لێـدەران، مانـام کـردوە.

(حِينٍ): (وَقْـت بلُـوغِ شَيءٍ وَحُصُولُـهُ، وَهُـوَ مُبْهَـمُ المَعْنَـى، وَيَتَخَصَّـصُ بِالمُضَـافِ إِلَيـهِ)، (حِـيْنٌ): کاتی گەیشـتنی شـتێک و پەیدابـوونی شـتێکە، لـە ئەصڵـدا (حِـيْنٌ) بـە مانـای کات دێ، بـەڵام ماناکـەی نادیـارە، بەهـۆی پـاڵ وێـدراو (مُضَافُ إِلَيهِ)ەکەیـەوە، ماناکـەی دیـار دەبـێ، ﴿حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ ۝١﴾ الإنسـان، یـانی ماوەیـەک لـە ڕۆژگار.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و فەرمـانی پـێ دەکات، کـە بفەرمـوێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ﴾، بڵـێ: مـن تەنیـا هۆشـیارکەرەوەو ترسـێنەرو ورياکـەرەوەم، چونکـە (الإنـذار: إِعْـلامٌ مَـعَ تَخْوِيـفٍ)، (إنـذار): ئـاگادار کردنەوەيـە لەگـەڵ ترسـاندن دا، بۆيـە زۆرجـار وشـەی (مُنْذِر) بـە: ورياکـەرەوەو ترسـێنەرو هۆشـیارکەرەوە، مانادەکـەم و، جـاری وا هەيـە هەرسـێکیان، جـاری وا هەيـە دووانیـان و، جـاری واهەيـە يەکێکيـان بەکاردێنـم.

(إنـذار) ئەوەيـە کـە تـۆ لايـەنی بەرانبـەر ئـاگادار بکەيـەوە، بـەڵام ئـاگادار کردنەوەيـەک ترسـاندنی لەگەڵدابـێ، هۆشـیار کردنـەوەی لەگەڵـدا بـێ، وەک نقورچکەيەکـی لێبـدەی، وريابـە! ئنجا خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: بڵـێ: مـن

تەنیا وریاکەرەوەو ترسێنەرم، ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ﴾، هیچ پەرستراوێک نیە (شایستەی پەرستران بێ) جگە لە خوای تاکی مل پێ کەچکەر.

﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ﴾، پەروەردگارو خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، زاڵی لێبوردەیە، زاڵ و باڵادەستە بۆ هەر کەسێک بیەوێ بێ فەرمانیی بکات، بەسەریەوە باڵادەستەو، زاڵە، ﴿ٱلْغَفَّٰرُ﴾، زۆر لێبوردەشە بۆ کەسانێک کە بۆ لای بگەڕێنەوەو، داوای لێبوردنی لێ بکەن، بۆ لای پەشێمان ببنەوە.

﴿قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ﴾، بڵێ: ئەوە هەواڵێکی مەزنە، وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین: زانایان گوتوویانە: ئایا ﴿هُوَ﴾ کە ڕاناوە، بۆ کێ و بۆچی دەچێتەوە، ئایا بۆ قورئان دەچێتەوە؟ بڵێ: قورئان هەواڵێکی مەزنە، یان بۆ ڕۆژی دوایی دەچێتەوە؟ ئەوە هەواڵێکی مەزنە، کە ڕۆژی دوایی دێ، ئنجا ڕۆژی دوایی، ئایا مەبەست پێی قۆناغی یەکەمە، کە ئاخیر زەمان و کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییەیە؟ یاخود مەبەست پێی قۆناغی دووەمە، قیامەت و زیندووکرانەوەو لێپرسینەوە؟ یان ئایا مەبەست لەو هەواڵە مەزنە، هەواڵی دروستکرانی ئادەمە (عَلَيْهِ السَّلام)و فەرمان کران بە فریشتان، کە ڕێزی لێ بگرن و کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن و، سەرپێچیی کردنی ئیبلیسە؟ یاخود هەموو ئەو شتانەیە کە لەم سوورەتەدا باسکراون؟ یان مەبەست پێی یەکتایی خوایە ﷻ، کە لە ئایەتی پێشوودا باسی کرد؟ یان مەبەست پێی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە ﷺو حاڵەتی وریاکەرەوەو ترساندنی بۆ مرۆڤەکان، وەک هەڵگری دوا پەیامی خوا؟ ئەو ئەگەرانە هەموویان هەن، دواییش لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕای خۆمان لەوبارەوە زیاتر دەخەینەڕوو، ﴿قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ﴾، بڵێ: ئەوە هەواڵێکی مەزنە.

﴿أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾، کە ئێوە لێی ڕوو وەرچەرخێنەرن، پشتتێکەرن، چونکە (عُرْض) بە لامل دەگوترێ، (مُعْرِض) کەسێکە لامل بکاتە شتێک، ئینسان کە

ڕووی کـردە شـتێک، مانـای وایـە پەسـندیەتی و، لێـی نزیـک دەبێتـەوە، بـەڵام کـە لامـلی تێکـرد، مانـای وایـە پشـت گوێـی دەخـات.

﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾، مـن زانیاریـم نەبـوو بـە کۆمەڵـی بـاڵا، (مَـلأ) بـە کۆمەڵێـک دەگوتـرێ: کۆمەڵـە مرۆڤێـک، کۆمەڵـە جندێـک، کۆمەڵـە فریشـتەیەک، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی کۆمەڵێـک فریشـتەیە، کۆمەڵـی بەرزتـر فریشـتەکانن کـە لـە ئاسـمانن، مـن زانیاریـم لـە بـارەی کۆمەڵـی بـاڵاوە نەبـوو ﴿ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾، کـە دەکەوتنـە مشـت و مـڕەوە، مشـت و مڕەکەیـان ئەوەبـوو کـە لـە سـوورەتی (البقرة)دا خـوا بـاسی کـردوە: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ...﴿٣١﴾ ﴾.

ئـەو مشـت و مـڕو پرسـیارکردنەی فریشـتان، دەربـارەی حیکمـەتی ئـەوە کـە بۆچی خـوا ﷻ فریشـتەکان دانانـێ بـە جێنشـین لەسـەر زەوی، بـەڵام مرۆڤێـک دادەنـێ کـە دەگونجـێ خراپەکاریـی تێـدا بـکات، لێـی دەوەشـێتەوە خراپەکاریـی تێـدا بـکات و خوێنـی تێـدا بڕێـژێ، حیکمەتەکـەی چییـە؟ ﴿ يَخْتَصِمُونَ ﴾ مشـت و مـڕ دەکـەن، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە.

دەشـگونجێ مەبەسـت لـەو دەمەقاڵێیـە، ئەوەبـێ کـە فریشـتەکان کڕنووشـیان بـرد، ئیبلیسـیش کـە هـەر لـە نێـو ئەوانـدا بـوو، بـەڵام فریشـتە نەبـوو، کڕنـووشی نەبـردو لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا کەوتـە وتووێـژەوە، دەگونجـێ مەبەسـتیش پێـی ئەوەبـێ.

﴿ إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، هیچـم بـۆلا سرووش ناکـرێ، مەگـەر ئـەوە کـە مـن وریاکـەرەوەو ترسـێنەرێکی ڕوون و ئاشـکرام، یـان ڕوونکـەرەوەو ئاشـکراکەرم، ﴿ مُّبِينٌ ﴾، دەگونجـێ لـە (أبَـانَ)ی (لازم)ەوە بـێ، واتـە: ڕوون و ئاشـکرا، دەشـگونجێ لـە (أبـانَ)ی (متعدّي)یـەوە بـێ، واتـە: ڕوونکـەرەوەو ئاشـکراکەر.

﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴾، کاتێ پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: من بەدیهێنەری مرۆڤێکم لە قوڕێ، واتە: بەدیهێنەری جەستەی مرۆڤێکم، چونکە مرۆڤ وێڕای جەستەکەی، کە لە قوڕ دروست بووە، پێکهێنەرێکی دیکەشی هەیە کە ئەو ئەصڵی مرۆڤەو بریتیە لەو ڕووحە، کە بە فووێکی خوایی چۆتە بەر جەستەی مرۆڤ، واتە: بە شێوەیەکی تایبەت ئەو ڕووحە بە بەر جەستەی مرۆڤدا کراوە، ئنجا چ مرۆڤی یەکەم، کە ئادەمە، پاشان حەووای هاوسەری، چ سەرجەم مرۆڤەکان.

﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴾، ئنجا هەرکات ڕێکمخست، واتە: جەستەکەیم ڕێک خست و ئامادەم کرد کە ڕووحی بەبەردا بکرێ، ﴿ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴾، لە ڕووحی خۆشم فووم بەبەردا کرد، واتە: لەو گیانەی کە دروستکراوی تایبەتی خۆمەو، لە جینس و ڕەگەزی ئەو قوڕو ماددەیە نیە، کە جەستەکەی لێ دروستکراوە، بەڵکو ئەو ڕووحە توخمێکی دیکەیەو جۆرە دروستکراوێکی دیکەیە، لە ڕەگەزی قوڕو گڵ و ئاوو ئەوانە نیە، کاتێک کە جەستەکەیم ڕێکخست و لە ڕووحی خۆم کە بە تایبەت دروستم کردوە، فووم بەبەردا کرد، ﴿ فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، بۆی بکەونە کڕنووش.

﴿ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴾ یەکسەر فریشتەکان تێکڕاو، وێکڕا کڕنووشیان برد، ﴿ كُلُّهُمۡ ﴾، بۆ ئەوەیە کە هیچ کامیان لێیان هەڵنەوێردرا، ﴿ أَجۡمَعُونَ ﴾یش بۆ ئەوەیە کە لە یەک کاتدا، کڕنووشیان برد، بۆیە بە تێکڕاو وێکڕا مانام کردوە، فریشتەکان واتە: هەموو ئەو فریشتانەی خوا فەرمانی پێکردن، ئنجا ئایا هەموو ئەو فریشتانەی خوا دروستی کردوون؟ یان ئەو فریشتانە، کۆمەڵە فریشتەیەکی تایبەت بوون؟ لەوەش دا هەردوو ڕایەکان هەن.

﴿ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، جگە لە ئیبلیس خۆی بە زلگرت و لە بێبڕوایان بوو، واتە: بەهۆی خۆ بە زلگرییەکەوە، بوو بە بێبڕوا، یاخود هەر پێشتر بێبڕوا بوو و، لە ئەنجامی بێبڕواییەکەیدا خۆی بە گەورە گرت؟

هـەردوو واتایەکـە هـەن، دەگونجـێ بڵێیـن: خـۆی بـە زلگـرت، بۆیـە بەهـۆی خـۆ بەزلگرییەکەیـەوە، پەلکێـش کـرا بـەرەو بێبڕوایـی، یاخـود لـە پێشـدا بێبڕوابـوو، بۆیـە خـۆی بـە زلگـرت.

﴿ قَالَ يَـٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ ﴾، (خـوا) فەرمـووی: ئـەی ئیبلیـس ! چ شـتێک ڕێگـرت بـوو کـە کڕنـووش بـەری بـۆ شـتێک کـە مـن بـە دوو دەسـتی خـۆم دروسـتم کـردوە؟ واتـە: بـە شـێوەی تایبـەت ﴿ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴾، ئایـا خـۆت بـە زلگـرت؟ یـان هـەر لـە ئەصڵـدا تـۆ بەرزتـری لـەوەی کڕنـووش بـەری؟ واتـە: ئێسـتا خـۆت بـە زلگـرت، یـان هـەر لـە ئەصڵـدا قەناعەتـت وایـە کـە ناگونجـێ تـۆ کڕنـووش بـەری؟!

﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ ﴾، گـوتی: مـن لـەو چاکـترم، ﴿ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴾، منـت لـە ئاگـر دروسـت کـردوەو ئـەوت لـە قـوڕێ دروسـت کـردوە، ئیبلیـس تەنیـا تەماشـای جەسـتەکەی کـرد، ئنجـا جەسـتەکەش، کـێ دەڵـێ: ئاگـر لـە قـوڕ باشـترە؟ ئاگـر دەسـووتێنێ و لـە بەیـن دەبـات، بـەڵام قـوڕ دەڕوێنـێ و گەشـە پـێ دەداو بەرهـەم دێنـێ.

بـە هەرحـاڵ دروسـتکراوەکان هەموویـان هـی خـوان، ماددەکان هەموویـان هـی خـوان، خـوا ﷻ جیننـی لـە ئاگـر دروسـت کـردوەو مرۆڤـی لـە قـوڕو لـە گڵ دروسـت کـردوە، ئەگـەر هـەر کامێـک لـە ئاگـر واتـە: بڵێسـەو تیشـک و، قـوڕو گڵ، چاکـتر بـێ لـەوی دیکـە، بـەڵام هیچیـان نـە مرۆڤـەکان نـە جنـد، بـەوەی کـە خـوا لـەو ماددەیـە دروسـتی کـردوون، ئازایەتیـی خۆیـانی تێدانیـە، کەواتـە: نابـێ خۆیـان بـەوە هەڵکێشـن، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـە مـرۆڤ وەک چۆن جەسـتەیەکی خاکییـە، ڕووحێکی خواییشـە.

﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾، (خـوا) فەمـووی: لێـی بچـۆ دەرێ، واتـە: لـە بەهەشـت بچـۆ دەرێ، واپێدەچـێ مەبەسـت پێـی بەهەشـت بـێ، ﴿ مِنۡهَا ﴾، ڕانـاوی مێینەیـە بـۆ بەهەشـت دەچێتـەوە، دەشـگونجێ بـۆ ئاسـمان بچێتـەوە، لـە ئاسـمان

بچۆ دەرێ، یان لە بەهەشت بچۆ دەرێ ﴿ فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی تۆ دوور خراوەی ﴿ رَجِيمٌ ﴾، (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ە، تۆ بەردباران کراوی، وەک چۆن کەسێک بەردی پێدادەدرێ و دەر دەکرێ، تۆش ئاوا دوورخراوەی.

﴿ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، بە دڵنیایی نەفرینی منیش لەسەر تۆ تاکو ڕۆژی سزاو پاداشت، واتە: تاکو ئەو ڕۆژەی سزاو پاداشتی تێدا وەردەگیرێنەوە، نەفرین هەر لەسەر تۆ بێ.

﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! مۆڵەتم بدە (بمهێڵەوە لە ژیاندا) تاکو ئەو ڕۆژەی مرۆڤەکان تێیدا هەڵدەستێندرێنەوەو زیندوو دەکرێنەوە.

﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾، (خوا) فەرمووی: بە دڵنیایی تۆ لە مۆڵەت دراوانی، لە هێڵدراوانی لە ژیاندا.

﴿ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾، تاکو ڕۆژی کاتی زانراو، واتە: نەک ڕۆژی تێیدا زیندووکرانەوە، بەڵکو تاکو ڕۆژی کاتی زاندراو (کاتی زانراو، یانی: ئەو کاتەی تەنیا لەلای خوا زانراوە) کە بریتیە: لە هاتنی ئاخیر زەمان، واتە: تۆ تا ئەو کاتە دەمێنی، نەک تاکو ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوە.

﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی: سوێند بە عیززەتی تۆ من تێکڕایان بێمراد دەکەم، تێکڕایان بێ ئاکام دەکەم، چونکە (غاوي) بە مانای (ضالّ) نیە، (ضالّ) یانی: گومڕا، بەڵام (غاوي) بە مانای بێمرادو بێ ئاکام و دەستخەڕۆ، یانی: هەموویان دەستخەڕۆ دەکەم و بە مەرەدی خۆمیان دەبەم.

﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت لەوان، (مُخلَصِین) خوێندراویشەتەوە: (مُخلِصِین)، واتە: ئەو بەندانەی کە خۆیان بۆ تۆ ساغ کردۆتەوە.

﴿ قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴾، (خـوا) فەرمـووی: سـوێند بـە هـەق و بـەس هەقیـش دەڵێـم، هـەق یـانی: چەسپاو، شـتێک کـە پێچەوانـەی واقیـع نەبـێ و لەگـەڵ واقیعـدا پڕ بـە پێست بـێ، واتـە: سـوێند بـە هـەق و هـەر هەقیـش دەڵێـم.

﴿ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی دۆزەخ لـە تـۆ، واتە: لـە تـۆو وەچـەی شـوێنکەوتووت و، لەوانـەی لـەوان شـوێن تـۆ دەکـەون، دۆزەختـان لـێ پڕ دەکـەم بـە تێکـڕا.

﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ ﴾، لـە کۆتاییـدا خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم دەفەرمـوێ ﷺ بڵـێ: مـن هیـچ ئەندازەیـەک لـە کرێتـان لەسـەری لـێ داوا ناکـەم، هیـچ ئەندازەیـەک لـە پاداشـتی لەسـەری (واتـە: لەسـەر گەیانـدنی پەیامـی خـوا) لـە ئێـوە داوا ناکـەم ﴿ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴾، هەروەهـا مـن لـە زۆر لـە خۆکـەران و لاف لێدەرانیـش نیـم، واتـە: بارگرانیـی و ئەرکتـان ناخەمـە سـەر، مـن شـتێکیش ناڵێـم کـە شایسـتەم نەبـێ، یاخـود لافێـک لێنـادەم کـە وانەبێـت.

﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئەمـە تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان، ڕاناوەکـەی بـۆ قورئـان دەچێتـەوە، ئـەم قورئانـە تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان، یاخـود ئامۆژگارییـەو پەنـدو دەرسـە، یاخـود شـەرەف و ڕێـزو حورمەتـە بۆیـان، بـۆ هەمـوو جیهانییـان.

﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴾، بـە دڵنیاییـش دوای ماوەیـەک هەواڵەکـەی دەزانـن، واتـە: هەواڵەکـەی دەزانـن کـە ئـەم قورئانـە حەقـەو، هەواڵەکـەی دەزانـن کـە ئـەو ڕاستییانەی ئـەم قورئانـە پێـی ڕاگەیانـدوون، هـەق و ڕاسـتن، ئـەو هەواڵـە زانیارییتـان لەبارەیـەوە پەیدادەبـێ، بـە دڵنیایـی، ئنجـا دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانیشـدا باسـیدەکەین کـە ئەمـە ئیعجازێکـی هەواڵیـی مێژوویـی تێدایـە، چونکـە خـوا ﷻ شـتێکی فەرمـووەو، زۆریـش بـە داکۆکیـی لەسـەر کردنـەوە کـە بـە دڵنیایـی هەواڵەکـەی دوای ماوەیەکـی کـەم دەزانـن، ئنجـا کاتێـک کـە خـوا وایفەرمـوە ﷻ:

ئەم ئیسلام و قورئانە، پێغەمبەر ﷺو، شوێنکەوتووانی لە نێو شاخ و داخی شاری مەککەدا گرفتار بووبوون، ئابلووقە درابوون، کافرە ملهوڕەکان پێیان وابوو کە ئیسلام هەر شتێکی ناوچەییەو دەتوانن ئەم ڕۆشناییە خەفە بکەن، پێیان وابوو کە لەو چوارچێوەیە ناچێتە دەرێ، لەو بازنە تەسکە، دەرباز نابێ، نەیاندەزانی کە ئەم ئایینە، ئەم قورئانە، ئەم کۆتا پەیامەی خوا ﷻ بۆ بەشەرییەت کە بە پێغەمبەری کۆتاییدا ناردوویەتی ﷺ، بۆ تێکڕای جیهانییانە، نەک تەنیا بۆ خەڵکی مەککەو دەوروبەری، نەک تەنیا بۆ هۆزی قوڕەیش و هۆزەکانی دیکەی عەرەب، نەک تەنیا بۆ کۆی گەلی عەرەب، بەڵکو بۆ تێکڕای مرۆڤەکانە، بە هەموو نەتەوەکانیانەوە، بە هەموو ڕەنگ و زمانەکانیانەوە، خوا هەواڵی داوەو فەرمووشیەتی بۆتان دەردەکەوێ کە ئەم قورئانە وەک ئێوە گومانی پێ دەبەن، بەو شێوەیە نیە، بەڵکو پەیامێکە خوا بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیی و جند ناردوویەتی و، ئەوەش دەچەسپێ، دواییش ئەوەی خواش فەرموویەتی، هاتۆتە دی.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمان کردنی خوا بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کە ڕایبگەیەنێ: خۆی تەنیا هۆشیارکەرەوەو ترسێنەرە بۆ جیهانییان و، جگە لە خوای تاکی باڵا دەستیش، هیچ پەرستراوێکی شایستەی پەرستران نیەو، خوا پەروەردگارو خاوەنی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیانەو، باڵادەست و لێبوردەیە:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٦٥ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ٦٦ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

**١)- ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ ﴾، بڵێ: من تەنیا وریاکەرەوەو ترسێنەرم، (أي: لَسْتُ إلاَّ مُنْذِراً)، من تەنیا ترسێنەرو وریاکەرەوەم، پێشتریش گوتوومانە: (الإِنْذَارُ: إعْلاَمٌ مَعَ تَخْوِيفٍ)، (إنذار) ئاگادارکردنەوەیە لەگەڵ ترساندن و بیم دانەبەردا.**

ئەوەش کە خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەو حەقیقەتە ڕابگەیەنێ کە تەنیا وریاکەرەوەو ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیە، بۆ بەرپەرچ دانەوەی قسەکانی ئەوانەیە کە دەیانگوت: موحەممەد ﷺ جادووگەرە، شێتە، شاعیرە، کاهینە، هەروەها بۆ ترساندنیشیانە کە من هاتووم وریاتان بکەمەوە، بتانترسێنم و هۆشدارییتان پێ بدەم، کە دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، ژیانی مرۆڤ هەروا شتێکی هەوەنتە نیە!

**٢)- ﴿ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴾، هیچ پەرستراوێک نیە شایستەی پەرستران بێ، جگە لە خوای تاکی مل پێکەچکەر، یانی: (وَمَا مِنْ إِلَهٍ حَقٍّ)، هیچ پەرستراوێکی هەق**

و ڕاست و شایستەی پەرستران نیە، جگە لە خوای تاکی مل پێکەچکەر، واتە: هەم تاکەو هاوەڵی نیەو، هەم باڵادەستەو، ملی بە هەموو دروستکراوەکانی کەچکردوەو، هیچیان بێ فەرمانیی ناکەن، لەو نێوەدا تەنیا مرۆڤ دەتوانێ بێ فەرمانیی خوا بکات، دەتوانێ لە فەرمانی خوا دەربچێ، ئەویش خوا ﷻ خۆی ئەو ئازادییەی پێداوە، تاکو پێی تاقی بکاتەوە.

٣)- ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیانە، وشەی ﴿رَبُّ﴾، بە مانای پەروەردگار دێ، بە مانای مشوورخۆر دێ، بە مانای خاوەن دێ، بە مانای سەروەرو گەورە دێ، ئنجا خوا پەروەردگارو خاوەن و سەروەری ئاسمانەکان و زەوییە، یانی: دروستکراوەکان هەتا بۆ سەرێ دەڕۆی، هەروەها دروستکراوی هەرە خوارێ کە زەوییە، بە نسبەت ئاسمانەوە، ئەگەرنا بەپێی گەردوونناسیی ئێستا، زەوی خڕۆکەیەکە لە نۆ خڕۆکەکەی خۆرو، خۆریش یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان، کە زانایان بە مەزەننە دەڵێن: (یەک تریلیۆن) واتە: هەزار ملیار (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەی تێدا هەیە، وەک خۆری خۆمان و گەورەترو گچکەتر، جگە لەو کەهکەشانەی خۆشمان کە پێی دەگوترێ: ڕێی کاکێشان، یان ڕێی شیری، بە مەزەننە هەندێک دەڵێن: دوو سەد ملیار کەهکەشانی دیکەو هەندێک دەڵێن: یەک تریلیۆن، واتە: هەزار ملیار کەهکەشانی دیکەی وەک ئەوەی ئێمە یان گەورەترو گچکەتر هەیە لە گەردووندا، دیارە ئەوە هەمووی وەک نزیک خستنەوەیی و بە مەزننەیە، ئەوەی کە بە دووربینەکان دەبینرێ، ئەوەش کە دەکەوێتە نێوانیانەوە، یانی: هەرچی دەکەوێتە نێوان ئەو ئاسمانە بەرزانە، تاکو دەگاتەوە زەوی، کە تیرەی گەردوون، وەک پێشتریش باسمان کردوە: بە پازدە ملیار ساڵی تیشکیی، یاخود: بە سێزدە ملیارو حەوتسەد ملیۆن ساڵی تیشکیی، مەزەندە دەکرێ.

٤)- ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ﴾، زاڵی لێبوردەیە، ئەو خوایەی کە خاوەنی عیززەت، واتە: باڵادەستیی و زاڵ بوون و خاوەنی ئەو پەڕی تواناو ویستی ڕەهایە، ﴿ٱلْغَفَّٰرُ﴾، زۆر لێبوردەو چاو پۆش، بەرانبەر بە هەڵەو کەم و کوڕیی بەندەکانی.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکـردنی خـوا بــە پێغەمبــەر ﷺ کــە ڕاییگەیەنــێ قورئــان، یــان: قیامــەت، یاخـود: دروسـتکردنی خـوا بـۆ ئـادەم و فەرمـان کـردنی بـە فریشـتەکان کـە کڕنـووشی ڕێزگرتنـی بـۆ بـەرن، ئـا ئـەوە هەواڵێکـی مەزنـە، کـە ئـەوان لێـی بـێ ئـاگان و، ئـەو (واتــە: موحەممــەد ﷺ) هیــچ زانیاریــی بــە کۆمەڵــی بــاڵای فریشــتان نیــەو، تەنیــا لــە ڕێــی سرووش بـۆ کرانـەوە ئـاگاداری دروسـتکرانی ئـادەم و، کڕنـووش بـۆ بـردنی فریشـتان و، یاخیـی بـوونی ئیبلیـس، کراوەتـەوە:**

﴿ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلۡ هُوَ نَبَؤٌاْ عَظِيمٌ ﴾، بڵێ: ئەوە هەواڵێکی مەزنە، ئەوە: دەگونجێ مەبەست پێی دابەزێنرانی قورئان و هاتنی قورئان، بێ و، دەگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ و، دەگونجێ مەبەست پێی دروست کرانی ئادەم و فەرمان پێکرانی فریشتان بێ کە کڕنووشی بۆ بەرن و، دەگونجێ مەبەست کۆی ئەو شتانە بێ کە باسکران، ئەوە هەواڵێکی مەزنە.

بــەڵام زیاتــر واپێدەچــێ مەبەســت قورئــان بــێ، کــە هەواڵێکــی مەزنــە لــە خــواوە ﷻ هــەواڵ دەدات بــە مرۆڤــەکان: بۆچــی دروســتکراون و، چــی چاوەڕێیــان دەکات و، حیکمــەت لــە دروســتکرانیان چیــەو، چــی بکــەن و چــۆن بکــەن؟ ئــەوە هەمــووی هەواڵــی خوایــەو هەواڵێکــی مەزنیشــە، چونکــە (**النَّبَأُ: خَبَرٌ ذو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ، أو غَلَبَةُ ظَنٍّ**)، (نَبَأ): بریتیــە لــە هەواڵێکــی ســوود بەخــشی مــەزن کــە بەهۆیــەوە زانیاریــی، یاخــود بــەلای کەمــەوە گومانێکــی زاڵ پەیدادەبــێ.

٢)- ﴿ أَنتُمۡ عَنۡهُ مُعۡرِضُونَ ﴾، کە ئێوە ڕوو وەرچەرخێنەرن لەو هەواڵە، کە بریتیە لە قورئان، یان بریتیە لە ڕۆژی دوایی، یان بریتیە لە دروستکرانی ئادەم، یان بریتیە لە ئیسلام، یان ئەو ڕاستییانەی کە باسکران، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست قورئان بێ، چونکە هەرچەندە ئەوان پشتیان لە قیامەتیش کردووەو، پشتیان لە ئیسلامیش کردوە، بەڵام زیاتر وا پێ دەچێ مەبەست قورئان بێ، پشتیان لە قورئان کردوە.

٣)- ﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴾، هیچ زانیارییەکم نیە بە کۆمەڵی باڵا، کاتێک کە دەکەوتنە دەمەقاڵێ و مشت و مڕەوە، (المَلأ الأَعْلَى: المَجْلِسُ الأَعْلَى لِلمَلاَئِكَة)، (المَلأ الأَعلَى) واتە: کۆڕی باڵای فریشتەکان، مەبەستیش لە (يَخْتَصِمُون) دەکەوتنە مشت و مڕەوە، هەندێک دەڵێن: مەبەست ئەوەیە کە فریشتەکان کەوتنە مشت و مڕەو پرسیار کردنەوە لە خوای بەرز، کە پرسیاریان کرد حیکمەتی خوا چییە کە ئادەم کراوە بە جێنشینی خوا لەسەر زەوی؟ یاخود: مەبەست لە مشت و مڕەکە ئەوە بوو کە خوا فەرمان دەکات بە فریشتەکان کڕنووش بەرن بۆ ئادەم و ئیبلیسیش لە نێویاندا دەبێ و، ئەو یاخیی دەبێ، بەڵام فریشتەکان تێکڕاو وێکڕا کڕنووش دەبەن، دوایی لەوبارەوە فەرمایشتێکی پێغەمبەریش دێنین ﷺ.

٤)- ﴿ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾، تەنیا ئەوەم بۆلا سرووش دەکرێ، کە من ترسێنەرێکی ڕوونم، یان ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەم، ﴿ إِلَّآ أَنَّمَآ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إِلاَّ إِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِين)، واتە: هەم بە ژێری هەمزەکەو، هەم بە سەری هەمزەکە (إِنَّمَا) و (أَنَّمَا) خوێنراوەتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، (أي: مَا يُوحَى إِلَيَّ مِنَ الأُمُورِ الغَيبِيَّةِ الَّتِي مِنْ جُملَتِها حَالُ المَلأ الأَعلَى، إِلاَّ لأَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ مِن جِهَتِهِ تَعَالَى)، واتە: سرووش بۆ لای من ناکرێ لەوەی کە بۆم سرووش دەکرێ لە کاروبارە پەنهانەکان، کە لە نێویاندا حاڵی فریشتە باڵاکانە، مەگەر بە هۆی ئەوەوە کە من وشیارکەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوە، یاخود ڕوونم لە لایەن خوای بەرزەوە، واتە: تەنها بەهۆی ئەوەوە کە من ترسێنەرو وریاکەرەوەم، سرووشم بۆ دەکرێ.

واتایەکی دیکەی: (ما يُوحَى إِلَيَّ إِلاَّ هَـذَا، وَهُوَ أَن أُنـذِرَ وَأُبَلِّـغَ، وَلا أُفَرِّطَ فِي ذَٰلِكَ، أَي: ما أُؤْمَرُ إِلاَّ بِهَـذَا الأَمرِ وَحْـدَهُ، وَلَيْسَ إِلَيَّ غَـيرُ ذَٰلِك)، یانی تەنیا ئـەوەم بـۆ سرووش دەکرێ، کـە مـن ئێـوە بترسێنم و، ئاگادارتـان بکەمـەوەو، لـەو بـارەوە کەمتەرخەمیی نەکـەم، تەنیا بـەوە فەرمانـم پـێ دەکرێ و، هیـچ شـتێکی دیکـە عایـدی مـن نیـە.

واتــە: ئەگــەر ئێــوە بــە قســەی ئــاگادار کردنــەوەو هۆشــیار کردنەوەکــەی مــن نەکـەن و لێـی بەهرەمەنـد نەبـن، هیـچ ئەرکێکـی دیکـەم پـێ نەسـپێردراوە، ئـەوە نەبێـت، نــەک ئەرکــی مــن بــێ هیدایــەتی ئێــوە بــدەم و بتانخەمــە ســەر ڕێــی ڕاســت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴿٥٦﴾ ﴾القصـص، کـە مەبەسـت لـەو هیدایەتـە، خسـتنە سـەر ڕێیـە، ئەگەرنـا ڕێنمایـی کـردن، دیـارە پێغەمبـەر ﷺ ڕێنمایـی خەڵکـی کـردوە، بۆیـە دەبـێ وردبیـن لـە مانـای هیدایـەت داو، هەمیشـە دیقـەت بدەیـن، داخـۆ کام لـە مانایانی هیدایـەت لەگەڵ ئەو وشـەیەدا دەگونجـێ، لـەو سیاقەدا کـە تێیـدا هاتـوە، کەواتـە: بـە هـۆی سرووشـکردنی خـواوە بۆ لای مـن، ئـەوەی کـە زانیومـە، زانیومـە، ئەگەرنا ئەگـەر خـوا بـۆی سرووش نەکردبـام نەمـدەزانی، یاخـود: ئـەوەی بـۆم سرووشـکراوە، هـەر ئەوەیـە کـە مـن ئێـوە ئـاگادار بکەمــەوەو بتانترســێنم و کەمتەرخــەم نەبــم.

لەبـارەی ئــەوەوە کــە باســم کــرد، فەرمایشــتێکی پێغەمبــەر هەیــە ﷺ لــە بــارەی مشــت و مــڕی فریشــتە باڵاکانــەوە، پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: (أَتَـانِي اللَّيْلَـةَ رَبِّي فِي أَحْسَـنِ صُـورَةٍ، «أَحْسَـبُهُ قَـالَ فِي الْمَنَـامِ»، قَـالَ: يَـا مُحَمَّـدُ! هَـلْ تَـدْرِي فِيـمَ يَخْتَصِـمُ الْمَـلأُ الأَعْـلَى؟ قُلْـتُ لَا، فَوَضَـعَ يَـدَهُ بَـيْنَ كَتِفَـيَّ حَتَّـى وَجَـدْتُ بَرْدَهَـا بَـيْنَ ثَدْيَـيَّ أَوْ فِي نَحْرِي، فَعَلِمْـتُ مـا فِي السماوات وَالأَرْضِ، ثُـمَّ قَـالَ لِي: يَـا مُحَمَّـدُ هَـلْ تَـدْرِي فِيـمَ يَخْتَصِـمُ الْمَـلأُ الأَعْـلَى؟ قُلْـتُ نَعَـمْ فِي الْكَفَّـارَاتِ، وَالْكَفَّـارَاتُ: الْمُكْـثُ فِي الْمَسَـاجِدِ بَعْـدَ الصَّلَـوَاتِ، وَالْمَـشْيُ عَـلَى الأَقْـدَامِ إِلَى الْجَمَاعَـاتِ، وَإِبْـلَاغُ الْوُضُـوءِ فِي الْمَـكَارِهِ) (أخرجـه أحمـد: ٢٢١٦٢، والترمـذي: ٣٢٣٥، وقـال: حسـن صحيـح، والحاكـم: ١٩١٣)، هــەر بــە بۆنــەی

ئـەو رسـتەیەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿مَا كَانَ لِيَ مِنۡ عِلۡمِۭ بِٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰٓ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ﴾، بـەو بۆنەیــەوە ئـەم فەرمایشــتەمان هێنـا.

(پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:) ئەمشــەو پــەروەردگارم لـە جوانتریـن وێنـەدا هاتـە لام، (ڕاوییەکـە دەڵـێ:) «پێموایـە فەرمـووی: لـە خەونـدا») گـوتی: ئـەی موحەممـەد! دەزانی کۆمەڵـی بـاڵا لـە چیـدا مشـت و مڕیانـە؟ گوتـم: نەخێـر، ئیدی خوا ﷻ دەسـتی خسـتە سـەر دوو شـانم، تاکـو فێنکاییەکـەی لـە نێـوان دوو مەمکمـدا هەسـتم پێکـرد، یاخـود لـە سـینگمداو، هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە زانیـم، دوایـی خـوا فەرمـووی: ئـەی موحەممـەد! دەزانی کۆمەڵـی بـاڵا لەبـارەی چییـەوە مشـت و مڕیانە؟ گوتـم: بەڵـێ لەبـارەی کەففارەتانـەوە، (ئـەو شـتانەی کـە گوناهـەکان دەسـڕنەوە)، سـڕەرەوەکانی گوناهیـش بریتیـن لـە مانـەوە لـە مزگـەوت لـەدوای نوێـژەکان [دوای ئـەوەی کـە نوێـژت کـرد بمێنیـەوە]و ڕۆیشـتن بـە پێیـان بـۆ نوێـژی بـە کۆمـەڵ (نوێـژە بـە کۆمەڵـەکان)و، لـە کاتی دەسـتنوێژ گرتنـدا لـە ناڕەحەتییانـدا [نەگـەر گەرمایـە ئەگـەر سـەرمایە ئەگـەر لەبـەر هەرچـی هەیـە] دەسـتنوێژەکە بـە تەواویـی بگـری.

بێگومـان ئەمـە تەفسـیر نیـە بـۆ ئـەم ئایەتـە موبارەکـە، بـەڵام تیشـکمان بـۆ دەخاتـە سـەر وشـەی ﴿إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ﴾، کـە مەبەسـت پێـی مشـت و مـڕو قسـە کـردن و سـەرقاڵ بـوونی فریشـتەکانە، کـە لـە بـاڵان، واتـە: لـە ئاسـمانن.

مەسەلەی سێیەم:

**ئاگادارکردنەوەی خوا ﷻ بۆ فریشتان، کە مرۆڤێک لە قوڕێ دروست دەکات، ئنجا هەر کات جەستەکەی تەواو کردو ئامادەی کرد و ڕووحی بەبەردا کرد، کڕنووشی بۆ ببەن، کڕنووش بردنی فریشتانیش و، لاملیی کردنی ئیبلیس و خۆ بە زلگرتنی و، پاساو هێنانەوەی لە وەڵامی پرسیاری خوادا، کە ئەو لە ئادەم چاکترە، چونکە لە ئاگر دروستکراوەو، ئادەم لە قوڕێ، سەرەنجام دەرکرانی لە بەهەشت و نەفرین لێکرانی و، داوای مۆڵەت کردنی ئیبلیس و مۆڵەت درانی و، هەڕەشە کردنی بە گومڕا کردنی مرۆڤەکان، جگە لە بەندە ساغکراوەکانی خواو، سوێند خواردنی خواش ﷻ کە دۆزەخ لە خۆی و شوێنکەوتوانی لە جندو مرۆڤ پڕ دەکات:**

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن
رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ
ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّۖ
أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾
قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ
إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ
فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ
أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و یەك بڕگەدا:

١)- ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴾، یاد بکەوە کاتێک پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من دروستکەری بەشەرێکم لە قوڕێ! واتە: (أذكُر إذ قالَ رَبُّك للملائكة)، یاد بکەوە! کاتێک پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو، ئەمە دەگونجێ

تەفسیرو ڕوونکردنەوەی مانای: ﴿إِذۡ یَخۡتَصِمُونَ﴾، بێت، یەکێک لە مانایەکانی ئەوە کە فریشتەکان مشت و مڕ دەکەن، واتە: ئەو مشت و مڕەی لە نێو واندا ڕوویداوە، هەڵبەتە ئەوان کڕنووشیان بردوە، بەڵام ئیبلیسیش کە لەنێو واندا بووەو، ئامادە نەبووە کڕنووش ببات، لێرەدا لە نێو ئەواندا حیساب کراوە، بۆیە ئەو کەوتۆتە دەمەقاڵێی و مشت و مڕو ناکۆکیی لەگەڵ خوای بەرزدا، ئەگەرنا فریشتەکان هەرچەندە پرسیاریان کردوە لە بارەی حیکمەتی دروستکرانی ئادەم و گێڕانی بە جێنشین لەسەر زەوی، لە حاڵێکدا کە خوا فریشتەکانیشی هەن، بەڵام دوایی کە خوا ﷻ بۆی ڕوونکردنەوە، ئەوان کۆتاییان پێ هێناو، چی خوا پێی فەرموون، جێبەجێیان کرد، بەڵام ئیبلیس ئەو حەقیقەتەی کە خوا بۆ فریشتەکانی ڕوونکردبۆوە، بە تەئکید ئەویش زانیویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نەبوو فەرمانی خوا جێبەجێ بکات و ڕێز لە ئادەم بگرێ.

٢)- ﴿فَإِذَا سَوَّیۡتُهُۥ﴾، هەرکاتێک ڕێکمخست، خوا ﷻ هەم بۆ جەستەی ئادەم وشەی ڕێکخستن (تَسوِیَة)ی بەکارهێناوە، هەم بۆ جەستەی وەچەکەیشی ڕێکخستن و ئامادەکردنی بەکارهێناوە، دوایی باسی ڕووح بەبەردا کردنی کردوە ﴿فَإِذَا سَوَّیۡتُهُۥ﴾، (أَي: جَعَلْتُ لَهُ الْمُسْتَلْزَمَات الَّتِي يَحْتَاجُهَا جَسَدِيًّا)، واتە: هەموو ئەو پێداویستییانەی کە لە ڕووی جەستەییەوە پێویستیی پێینی، بۆم ئامادە کردن.

٣)- ﴿وَنَفَخۡتُ فِیهِ مِن رُّوحِی﴾، لە ڕووحی خۆشم فووم پێداکرد، یانی: لەو ڕووحەی کە دروستکراوی تایبەتی خۆمە، لە شێوەی مادده نیە، لە ڕەگەزی مادده نیە، (الرُّوحُ: المَخلُوق الخاص الَّذِي يَشتَرِكُ فِيهِ المَلَائِكَةِ وَالإِنسِ وَالجِنّ) [ئەمە ڕای هەندێک لە زانایانە] ڕووح ئەو دروستکراوە تایبەتییەی کە فریشتەکان و مرۆڤ و جند، تێیدا بەشدارن، فریشتەش کە جەستەکەیان لە ڕووناکیی (نور) دروستکراوە، دیارە ڕووحیشیان هەیە، جیننیش کە جەستەکەیان لە بڵێسەی ئاگر دروستکراوە، بەتەئکید ئەوانیش دەبێت ڕووحیان هەبێ، وا پێدەچێ.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕووح دروستکراوێکی بەرزی تایبەتە، لە ڕەگەزو لە جۆری مادده نیە، ئایا ئادەم و وەچەکەی ئەو ڕووحەیان چۆن بەبەردا کراوە؟

ئێمە نازانین، (فخر الدین الرازي) قسەیەک دێنێ پێم چاکە لێی بخوازمەوە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

(وَأَمَّا كَيْفِيَّةُ نَفْخِ الرُّوحِ، فَاعْلَمْ أَنَّ الأَقْرَبَ أَنَّ جَوْهَرَ النَّفْسِ، عِبَارَةٌ عَنْ أَجْسَامٍ شَفَّافَةٍ نُورَانِيَّةٍ، عُلْوِيَّةِ الْعُنْصُرِ، قُدْسِيَّةِ الْجَوْهَرِ، وَهِيَ تَسْرِي فِي الْبَدَنِ سَرَيَانَ الضَّوْءِ فِي الْهَوَاءِ، وَسَرَيَانَ النَّارِ فِي الْفَحْمِ، فَهَذَا الْقَدْرُ مَعْلُومٌ، أَمَّا كَيْفِيَّةُ ذَلِكَ النَّفْخِ فَمِمَّا لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ تَعَالَى).

واتە: بەڵام چۆنیەتیی ڕووح بەبەردا کردن، بزانە کە ئەوەی لە هەموویەوە نیزیکترە ئەوەیە: کە چییەتی ڕووح (نفس)، بریتیە: لە چەند ماددەیەکی ڕوونی نوورانیی بەرز، کە توخمەکەیان زۆر پاکە {کەواتە: کە وشەی (جسم) بەکار دێنێ، مەبەستی پێ ماددە نیە} کە بە جەستەدا دەڕوات وەک چۆن ڕووناکیی بەهەوادا دەڕواو، وەک چۆن ئاگر لە نێو خەڵووزدا هەیە، ئاواش ڕووح لە نێو جەستەدا هەیە، ئەو ئەندازەیە زانراوە، بەڵام چۆنیەتیی ئەو فوو پێداکردنە، جگە لە خوای بەرز کەس نایزانێ.

هەڵبەتە بەوەندەش کە فەخرەددینی ڕازیی گوتوویەتی: وە نەبێ تیشکێکی وای خستبێتە سەر ڕووح، چونکە ڕووح خوا لە بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، پرسیارت لێدەکەن لە بارەی ڕووحەوە، بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمەو، ئەندازەیەکی کەم نەبێ زانیاریتان پێ نەدراوە.

ئنجا نەک هەر ڕووح زانراو نیە، بەڵکو ژیان (حیاة)یش هەر نازانرێ، کە ژیان لە چڵە گیایەکیشدا هەیە و لە ئەمیبایەکیشدا هەیە، هەروەک لە فیل و کەرگەدەنێکیشدا هەیە، بەڵام ڕووح تەنیا لە مرۆڤدا هەیە، کە بەداخەوە زۆر کەس ئەوە نازانێ، بۆیە بە هەموو دروستکراوەکان هەر دەڵێن: گیان لەبەران،

---

(١) ج٢٦، ص٢٠٨.

یـان گیانـداران، کـە مـن ئـەوەم پـێ هەڵەیـەو دەبـێ بگوتـرێ: ژیانـداران، چونکـە مرۆڤیـش (نوتفـەی مـرۆڤ) ژیـانی تێدایـە، بـەڵام دوای چـوار مانـگ و دە شـەو، دوای ئـەوەی جەسـتەکەی لـە نێـو منداڵدانـدا تـەواو دەبـێ، وەک دەفەرمـوێ، ئنجـا خـوا رووحـی بەبـەردا دەکات: ﴿...ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾﴾المؤمنـون، وەک لـە سـەرەتای سـووڕەتی (المؤمنـون)دا باسـێکی درێژمـان لـەو بـارەوە کـردوە.

کەواتـە: ئـەوەی بـۆ ئێمـە دیـارە، تەنیـا مـرۆڤ رووحـی هەیـە، ئـەوەی دیکـە ئـاژەڵ و درِنـدەو پـەڕەورو رووەک و شـیناوردو ئەوانـە، هەموویـان ژیانیـان هەیـە، ئنجـا ژیانیـش پلـە پلەیـە، کـە سـادەترین شـێوەی ژیانیـش، تاکـو ئێسـتا زانیاریـی لـە بەرانبەریـدا دەسـتەپاچەیەو، هیچـی لەبـارەوە بـۆ دەرنەکەوتـوە، وەک ئێمـە لـە دەرسـەکانی رابـردوودا لـەو بارەوە شـتمان باسـکردوە، لە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیـمان و پووچەڵیـی ئیلحـاد لەبـەر رۆشـنایی زگـماک و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی دا) لـەو بـارەوە، زیاتـر قسـەو باسـمان کـردوە

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴾، ئنجـا کاتێـک جەسـتەکەیم رێکخسـت و لـە رووحـی خـۆم [لـەو رووحـەی دروسـتکراوی تایبـەتی خۆمـەو هـەر خـۆم دەزانـم چۆنـە] فـووم بەبـەردا کـرد.

٥)- ﴿ فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، یەکسـەر بۆی بە کڕنووشدا بکەون، (قَعُوا) کرداری فەرمان (فعل الأمر)ە، (قَع) یانی: بکەوە، (قَعُوا) یانی: بکەون، ﴿ فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، واتە: بۆی بە کڕنووشدا بکەون.

٦)- ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾ ئنجا فریشتەکان تێکڕاو وێکڕا کڕنووشیان برد، (كُلٌّ: للإحاطَةِ، وَأَجمَعُ لِلإجتِماعِ، أَي: سَجَدُوا كُلُّهُم عَن أَخرِهِم فِي وَقتٍ واحِدٍ)، وشەی (كُلّ): ﴿ كُلُّهُمْ ﴾، بۆ دەورەدانە، ﴿ أَجْمَعُونَ ﴾یش، بۆ کۆبوونەوەیە، واتە: تێکڕا بێ ئەوەی هیچیان لێ هەڵباوێررێن و، وێکڕا بەبێ ئەوەی هیچیان دوا بکەون، لە یەک

کاتدا کڕنووشیان برد، کە بێگومان کڕنووشی ڕێز گرتنە، ئەگەرنا کڕنووشی پەرستن، تەنیا بۆ خوا دەبردرێ.

٧)- ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾، فریشتەکان تێکڕاو وێکڕا کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس، ئەو خۆی بە زلگرت و، لە بێبڕوایان بوو، ئەمە دوو واتای هەن - وەک پێشتر گوتمان - :

أ- لە ئەنجامی خۆ بە زلگرتنیدا چووە ڕیزی بێبڕوایانەوە،

ب- پێشتر لە بێبڕوایان بوو، بۆیە خۆی بە زلگرت، واتە: لە بێبڕوایان بوو لە زانیاریی خوادا ﷻ.

٨)- ﴿ قَالَ يَـٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی ئیبلیس! چ شتێک ڕێگرت بوو کە کڕنووش بەری بۆ شتێک کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە؟ (أي: خَلْقاً خَاصاً دُفْعَةً مُبَاشِرةً لأَمْرِ التَّكْوِين)، واتە: بە شێوەیەکی تایبەت دروستم کردبوو، ڕاستەوخۆ بە فەرمانی (ببە) دروستم کردبوو، بەڵام هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (اليَدَان): دوو سیفەتی خوای بەرزن، هەندێکیش گوتوویانە: (اليَدَان): کینایەیە لە دەستەڵاتی خواو، مەبەست پێی گرنگیی پێدانی خوایە بە شێوەی دروستکردنی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلام) ئەگەرنا خوا ﷻ وشەی (يَد)ی بەتاک (مفرد) بەکارهێناوە: ﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾ ﴾الفتح، هەروەها بە دووان (مثنى) بەکاری هێناوە: ﴿ بِيَدَىَّ ﴾، کە لە قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتووەو، بە کۆش بەکاریهێناوە: (مِمَّا خَلَقَت أَيْدِينَا) يس - ٧١ -، دەستەکانمان، هەروەک (عَيْن)یشی بە تاک بەکارهێناوە، بە کۆش بەکارهێناوە: ﴿ وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ ﴾طه، ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾ ﴾الطور.

ئنجا لەمەوە دەزانین کە مەبەست لێرەدا ئەوە نیە خوا ﷻ باسی سیفەتێکی خۆی بکات، بەناوی (عَين) و (يَد)، چونکە ئەو وشانە وەک چۆن مانای ڕاستەقینەیان هەیە کە بریتیە: لە (چاو) بۆ ئێمە کە پێی دەبینین، (دەست) کە شتی پێ دەگرین، مانای مەجازییشیان هەیەو، لێرەدا مانا مەجازییەکە مەبەستە،

ئەگـەر کەسێک شـتێک بـکات بەکرنکیـی و بایـەخ پێدانـەوە دەڵـێ: بـە دەسـتی خـۆم ئـەوەم کـردوە، بـە دەسـتی خـۆم تێمهاویشـتوە، ئەمـە وەک گرنگیـی پێـدان و جەختکردنـەوە کـە لێـرەدا ئـەوە مەبەسـتە.

٩)- ﴿ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ ﴾، ئایا خۆت بە زلگرت، یاخود هەر پێشتر لە بەرز و لە باڵایان بووی؟ واتە: ئێستا خۆت بە زلگرت، یان هەر وابووی؟

١٠)- ﴿ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴾، گوتی: من لەو چاکترم، منت لە ئاگر دروستکردوەو ئەوت لە قوڕێ دروستکردوە.

## دوو هەڵوەستەی گرنگ

ئێمە کاتێ خۆی لە سەرەتای سوورەتی (الأعراف)دا، بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (عَلَيْهِمَا السَّلام)، پاشان ئیبلیس و، هەموو ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەوانەوە هەیە، بە تەفصیلی باسمان کردوون، بەڵام لێرەدا دوو هەڵوەستە دەکەین لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئیبلیس دەڵێ: ﴿ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ﴾، من لەو باشترم، بەڵگە بە چی دێنێتەوە؟ ﴿ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾:

**هەڵوەستەی یەکەم:** بەڵگە بەوە دێنێتەوە کە ئەو کەرەستەیەی ئەوی لێ دروستبووە، ئاگرە، بەڵام کەرەستەی لێ دروستکرانی ئادەم، بریتییە لە قوڕ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خۆ هەڵکێشان بە ڕەچەڵەک و ڕەگەزو دەنگ و زمان و ... هتدەوە، عادەتی شەیتانە! کەسی وا هەیە دەڵێ: من کوڕی فڵانکەسم، بۆیە من لە فڵانکەس چاکترم، نەخێر، کردەوەت چۆنە؟ ئیمانت چۆنە؟ ئاخت چۆنە؟ سیفەتەکانت چۆنن؟ بەوە چاک دەبی، یان خراپ دەبی، نەک بابم فڵانکەسە، وەک پێشینان دەڵێن: (کە خۆت کۆسەی، ڕیشی بابت بە تۆ چی)!، یان دەڵێن: (کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە)!

**هەڵوەستەی دووەم:** ئیبلیس دوای دروستکرانی ئادەم، ئەو خۆ بەزلگریی و بێبڕواییەی تێدادەرکەوتوە، ئەمەش یاسای خوایە لە دنیای بەشەردا، کە لە ڕووداوو لە تەنگانەکاندا، ڕەوشت و ئاکارو مەعدەنی مرۆڤەکان دەردەکەون، بۆیە هەتا خەڵک نەزموون نەکرێ، دروست و ڕاست نیە حوکمیان دیاریی بکرێ، بە چاک یان بە خراپ، هەر بۆیەش گێڕدراوەتەوە: پیاوێک مەدحی یەکێکی دیکەی کردوە لە لەلای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەویش گوتوویەتی: ئایا دراوسێی بووی؟ ئەدی مامەڵەت لەگەڵ کردوە؟ ئەدی سەفەرت لەگەڵ کردوە؟ کابرا

گوتوویەتی: نەخێر، گوتوویەتی: نەتناسیوە! بە دراوسێیەتیی ئینسان لە ئینسان حاڵی دەبێ، بە مامەڵەو بازرگانیی دەناسرێ و دەزانرێ: تەماعی، قەناعەتی، حەلاڵ خۆریی، حەرام خۆریی، هەروەها بەسەفەرێ مرۆڤ دەناسرێ، (سُمّيَ السَّفَرُ سَفَرَاً، لأنَّهُ يُسْفِرُ عَنْ أَخْلاَقِ الرِّجَال)، سەفەر بۆیە پێی گوتراوە سەفەر، چونکە ڕەوشت و ناکاری پیاوان دەردەخات، هەروەها لەو بارەوە شیعرێک هەیە زۆر جوانە، دەڵێ:

لا تَمْدَحَنَّ امرءاً حَتّى تُجَرِّبَهُ وَلا تَذُمَّنَّهُ مِن قَبلِ تَجرِيبِ
إنَّ الرِّجَالَ صَنَادِيقٌ مُقَفَّلَةٌ وَما مَفَاتِحُهَا غَيرُ التَّجارِيبِ

واتە: ستایشی کەسێک مەکە، تاکو تاقی نەکەیەوە، هەوەها سەرزەنشتیشی مەکە پێش تاقیکردنەوە،

پیاوان وەک صندووقانی داخراون و، کلیلەکانیان تەنیا ئەزموون کردنەکانن، (ئەزموونی بکە دەیناسی).

ئنجا خوا ﷻ لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئیبلیس بێ فەرمانیی خوا دەکات سزای دەدات:

١١)- ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴾، فەرمووی: لێی بچۆ دەرێ، [لە بەهەشت،] بێگومان تۆ نەفرین لێکراوی، دەرکراوی، (الرَّجِيمُ: أَي المَرْجُوم المَطْرُودُ)، بەردبارانکراوو دەرکراو.

١٢)- ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾، بە دڵنیایی نەفرینی منت لەسەر بێ، تاکو ڕۆژی دوایی، واتە: دوورخراوەی لە بەزەیی من.

١٣)- ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾، گوتی: پەروەردگارم! تاکو ڕۆژی تێدا زیندوو دەکرێنەوە، مۆڵەتم بدەو دوامخە.

١٤)- ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾، (خوا) فەرمووی: بە دڵنیایی تۆ لە مۆڵەت دراوانی (أي: مِنَ المُمْهَلِين، المؤَخَّرِين)، لە ژیاندا دەهێڵدرێیەوەو چاوەڕێت دەکرێ.

١٥)- ﴿ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾، (بەڵام) تاکو ڕۆژی کاتی زانراو، واتە: تاکو ئەو ڕۆژەی کە خوا دیاریکردوە بۆ لەبەین بردنی دروستکراوەکان، لە دوای فووی یەکەم، نەک تاکو ڕۆژی زیندووکرانەوە، تاکو ئەو ڕۆژەی دیارییکراوە، کە ئاخیر زەمانی تێدا دێ و ئەم ژیانەی تێدا دەپێچرێتەوە، تاکو مرۆڤێک لەسەر زەوی هەبێ، تۆش هەی، بەڵام کە ئەوان نەمان، تۆش نامێنی.

١٦)- ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی: سوێند بە عیززەتی تۆ تێکڕایان بێمراد دەکەم، (الإغْوَاءُ: جَعْلُ الإنْسَانِ غَاوِيَاً، أي: شَقِيّاً تَعِيْساً وَالغَوايَةُ: نَتِيجَةُ الضَّلَالِ، كَمَا أَنَّ الرُّشْدَ نَتِيجَةُ الهِدَايَةِ) زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: زۆر لە توێژەرەوانی قورئان (غَوَايَة)یان هەر بە (ضَلَال) لێکداوەتەوە، بەڵام وانیەو (إغْوَاء) ئەوەیە کە مرۆڤ (غاوي) بکرێ، واتە: بێ بەخت و بێمراد و بێ ئاکام بکرێ، (غوايَة) بەرئەنجامی گومڕاییە، هەر وەک چۆن سەر ڕاستیی (رشد) بەرئەنجامی ڕێنماییە، ئیبلیس سوێند بە عیززەتی خوا دەخوات، کە هەموویان بێمراد دەکات، واتە: بە مەرەدی خۆیان دەبات.

١٧)- ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت، خوێنراویشەتەوە: (المُخْلِصِين)، واتە: بەندە خۆ ساغکەرەوەکانت.

١٨)- ﴿ قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴾، (خوا) فەرمووی: سوێند بە هەق و هەر هەقیش دەڵێم، کە خوێنراویشەتەوە: (فَالحَقَّ، وَالحَقَّ أقُول)، ئنجا ئەگەر (فَالحَقَّ) بێ، واتە: (إلزَمُوا الحَقَّ، وَالحَقَّ أقُول) هەق بگرن و هەر هەقیش دەڵێم، بەڵام ئەگەر ﴿ فَٱلْحَقُّ ﴾، بە بۆر (ضمة) بێ، واتە: سوێند بە هەق، ﴿ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴾، تەنیا هەقیش دەڵێم.

١٩)- ﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، بە دڵنیایی دۆزەخ لە تۆو {واتە: لە وەچەی تۆ، لە وەچەی ئیبلیس ئەوانەی شوێن ئیبلیس دەکەون} لەوانەی کە شوێن تۆ دەکەون لەوان (لە مرۆڤان) لە تێکڕاتان پڕ دەکەم، کەواتە: کە دەفەرموێ:

(مِنْكَ ومِمَّن تبعك منهم أجمعين)، (أي: مِنْ جِنْسِكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِن بَنِي آدَم)، لەوانەی کە لە تۆن، لە وەچەی تۆن و شوێن تۆ دەکەون، هەروەها لەوانەی وەچەی ئادەمن و شوێن تۆ دەکەون، دۆزەختان بە تەواویی لێ پڕ دەکەم.

کەواتـە: ئـەوەی کـە وەچـەی ئیبلیـس بـێ، بـەڵام شـوێن ئیبلیـس نەکـەوێ، یـان وەچـەی ئـادەم بـێ و شـوێن شـوێن ئیبلیـس نەکـەوێ، ئەوانـە سـەر فـرازن، دیـارە پێشـتریش باسـم کـرد کـە ئێمـە لـە سـەرەتای سـوورەتی (الأعـراف) ئایەتـەکانی: (١٠ - ٢٥)دا بـە درێژیـی بـاسی بەسـەرهاتی ئـادەم (عَلَيْـهِ السَّـلَامُ) و ئیبلیسـمان کـردوە، هەروەهـا لـە کتێبـی یەکەمـی: موسـوعة: (الإِسْـلَامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَـابِ اللَّـه)دا، بـە درێژیـی لـەو بـارەوە دواویـن.

**مەسەلەی چوارەم و كۆتایی:**

**فەرمـان كـردنی خـوا بـە پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ كـە ڕایبگەیەنـێ: هیـچ كرێـیەكیـان لـێ داوا نـاكات و، هیـچ بارگرانییەكـی بۆیـان نیـەو، هیچیـش نـاكات و نالّێ كـە بـۆی لاف لێـدانی لێبـێ، قورئانیـش تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان و بـەم زووانـەش هەواڵـی ڕاسـتەقینەی لەبـارەوە دەزانـن:**

﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، بڵێ: من هیچ كرێیەكتان لەسەری، (واتە: لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانەو گەیاندنی پەیامی خوا) لێ داوا ناكەم، هیچ كرێ و پاداشتێكم لێتان ناوێ، هیچ چاوەڕوانییەكم لێتان نیە، ئنجا چۆن دەزانین كە مەبەست پێی قورئانە؟ بە مەقام و ڕەوت (سیاق) دەزانرێ، چونكە باس باسی قورئانە ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانە كە پێتان دەگەیەنم، هیچ كرێ و پاداشتێكم لێتان ناوێ، چونكە ئەم سوورەتە موبارەكە بە باسی قورئان دەستی پێكردو بە قورئانیش كۆتایی پێ هێنا، شارەزایان گوتوویانە: (هَذَا رَدُّ العَجُزِ عَلَى الصَّدرِ)، پێشێ فەرمووی: ﴿ صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ ﴾، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، یانی: ئەو قورئانە خاوەن یادخستنەوەیە، یان ئەو قورئانە، خاوەن پلەو پایە بەرزەو، كە پێتان دەگەیەنم هیچ كرێ و پاداشتێكم لێتان ناوێ.

٢)- ﴿ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾، هەروەها من لە لاف لێدەرانیش نیم و، لە زۆر لەخۆكەران نیم، كە شتێك بڵێم وا نەبێ، یان بمەوێ كارێك بكەم كە لە توانامدا نەبێ، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾، (أَفَادَ انْتِفَاءَ جَمِيعَ التَكَلُّفِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ)، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچی تەكەللوفە تێیدا نەبووە، (وَالتَّكَلُّفُ: مُزَاوَلَةُ

الكُلْفَةِ، وَهُوَ مَا يَشُقُّ عَلَى المَرْءِ عَمَلُهُ وَالتِزَامُهُ، لِكَونِهِ يُحْرِجُهُ، أو يَشُقُّ عَلَيهِ، وَمادّةُ التَّفَعُّلِ لِلمَشَقَّةِ)، (تَكَلُّف): بریتیە لە ئەنجام دانی كولفە، كولفەش هەر شتێكە كە كردنی لەسەر مرۆڤ و پێوە پابەندبوونی بوێ و قورس بكەوێ، واتە: سەغڵەتی دەكات و بۆی ناكرێ، صیغەی (تفعّل)یش دەلالەت لەسەر مەشەققەت و نارەحەتیی دەكات، كەواتە: ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾، وەک چۆن ئەوە دەگرێتەوە كە: من كارێک ناكەم، زۆر لە خۆم بكەم و پێم نەكرێ، بەهەمان شێوە ئەوەش دەگرێتەوە كە: من لافێک لێنادەم بە ناهەق و شتێک ناڵێم كە وانەبێ، كەواتە: ئەم قورئانە كە دەڵێم فەرمایشتی خوایە، فەرمایشتی خوایەو لەخۆوە واناڵێم و لاف لێدانێكی بۆش نیە، بەڵكو ڕاگەیاندنی هەقێكە.

٣)- ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ﴾، ئەوەی كە دەیڵێم تەنیا بیرخستنەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، یاخود شەرەف و ناوبانگە بۆ هەموو جیهانییان، نە جادوویە، نە شیعرە، نە كەهانەیە، ئەواشە كە لە خۆمەوە گوتبێتم و لافم لێدابێ، هیچ كرێتان لە بەرانبەریدا لێ داوا ناكەم، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان.

٤)- ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ﴾، بە دڵنیایی هەواڵەكەشی دوای ماوەیەكی كەم دەزانن، چونكە (حین) (أي: زَمَنٍ قَصِيرٍ)، كاتێكی كورت، ئەمە بە پێی سیاق، ئەگەرنا (حین) یانی: ماوەیەک لە كات، نازانین كەمە، زۆرە، چەندە؟ بەڵام بەپێی سیاق، لێرە كە دەفەرموێ: بە دڵنیایی هەواڵەكەی دەزانن دوای ماوەیەک، واتە: دوای ماوەیەكی كەم، هەواڵ زانینەكەی قورئانیش یانی: دەزانن كە ئەم قورئانە چ بەرنامەیەكە، چ پەیامێكە، چ بیرخەرەوەیەكە بۆ هەموو جیهانییان، تەنیا بۆ ئێوە نەهاتوە ئەی كافرەكانی قورەیش! كافرەكانی مەككە، كافرەكانی عەرەب، بەڵكو بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هاتوە، بگرە بۆ هەموو جیهانییان هاتوە، لەمەودوا بۆتان دەردەكەوێ كە بۆ هەموو جیهانییان هاتوە، چونكە ئەو كاتەی ئەو ئایەتە دابەزیوە، كافرەكانی مەككە پێیان وا بووە كە ئەم قورئانەو، موحەممەد ﷺ شتێكی ناوچەییەو، پەیوەستە بە شاری مەككەو دەورو بەریەوە، بەڵام نا، خوا هەر لەو كاتەوە كە ئەم قورئانەو پێغەمبەر ﷺ لە نێو چوار چێوەی شاخەكانی مەككەدا گرفتار بوو بوون بەدەست كافرەكانەوە، هەر لەو كاتەوە خوا فەرموویەتی بۆ هەموو جیهانییانە، دواییش بۆ هەموو جیهانییان بوو، وەک خوا فەرموو بووی.

ئنجا ئەمە ئیعجازێکی مێژوویی هەواڵییە، خوا ﷻ کە لە سەرەتاوە وایفەرمووە، زانیویەتی چی دەکات و، ئەو ئیسلامە چۆن بڵاو دەکاتەوە! ئەگەرنا کێ گرەنتیی و زەمانەتیی ئەوەی دەکرد کە هەر لەوێ بە ساوایی سەر نەنێتەوە، هەر بە ئەمامی نەشکێنرێ و کۆتایی پێ نەهێنرێ، لە نێو شاخ و داخی مەککەدا، لە لایەن ئەبوو جەهل و هاووێنەکانیەوە، بەڵام هەر لەوکاتەوە خوا فەموویەتی: ئەخێر لەمەودوا هەواڵەکەی دەزانن، کە ئەمە بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، تەنیا بۆ ئێوە نەهاتووە، کە دەفەرموێ: ﴿ نَبَأَهُۥ ﴾، واتە: ئەوەی کە قورئان هەواڵی پێداوە لە ئاگادار کردنەوەو ترساندنی ئێوە، یاخود ﴿ نَبَأَهُۥ ﴾، یانی: ڕاستیی قورئان و تەواویی قورئان، کە مانای دووەمیان زیاتر پێدەچێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (فصلت)دا، دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾.

کەواتە: هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێت و، نیشانەکانی خوا لە ئاسۆیەکان و لە نەفسی مرۆڤیشدا زیاتر دەرکەون، ڕاستیی و تەواویی قورئان زیاتر دەردەکەوێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات زیاتر لە فەرمایشتەکەی تێبگەین و، باشتر بە هۆی فەرمایشتەکەیەوە پێبگەین، یارمەتییمان بدات کە ئەم قورئانە لە ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی خۆماندا زیاتر ڕەنگ پێ بدەینەوە، هەم خۆمانی پێ پاک و چاک بکەین، هەم دەوروبەرمانی پێ پاکسازیی و، چاکسازیی بکەین، تاکو هەم لە دنیادا بەختەوەربین، هەم لە دوارۆژدا سەر فرازبین و، لەسەر بوونەکەمان قەرزدار نەبینەوەو، بەمەرەدی ئەوانە نەچین کە لە ڕۆژی دوایی دا، خۆزگە دەخوازن کە گڵ بوونایە، وەک دەفەرموێ: ﴿ ...وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾ ﴾النبأ.

خـوا بـە هـۆی قورئانـەوە دڵ و عەقڵـمان زیاتـر ڕۆشـنبکاتەوەو ڕەوشـتمان بەرزتـر بـکات و، یارمەتیمانبـدات چـی قورئـان دەیفەرمـوێ، ئێمـەش بـەو شـێوەیە ڕەفتار بکەیـن، هـەروەک دایکمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) کاتێـک لـە بارەی ڕەوشـت و ئـاکاری پێغەمبـەرەوە ﷺ پرسـیاری لێکـراوە، گوتوویـەتی: {كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللهِ الْقُرْآنُ} (أخرجه مسلم: ١٧٧٣، وابن حبان: ٢٥٥١)، ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـو ﷺ هەڵسـوکەوتی ئـاکارەکانی بریتـی بـوون لـە قورئـان، قورئـان چـی دەفەرمـوو، پێغەمبەریـش ﷺ وایدەکـرد، خـوا یارمەتیـمان بـدات، ئێمـەش لـە قـەدەر خۆمـان بـەو شـێوەیە بیـن.

لێرەشـدا کۆتایـی بـە تەفسـیری سـوورەتی (ص)، دێنیـن، خـواش پشـتیوان بـێ لەسـەر تەفسـیر کـردنی سـوورەتەکانی قورئـان (إن شـاءالله) بـەردەوام دەبیـن تاکـو تـەواوی دەکەیـن، خـوا بۆمـان ئاسـان بـکات.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (١٢/ی صفـر/ی ١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/١٠/١١) زایینـی، خـوا پشـتیوان بێـت دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الزمـر).

وەک عـادەتی خۆمـان سـەرەتا پێناسـەو نێـوەڕۆک و بابەتـەکانی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە دەخەینـەڕوو، ئەویـش لـە حـەوت برگـەدا.

## پێناسەی سووڕەتی (الزمر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی:

ئـەم سـووڕەتە نـاوی سـووڕەتی (الزمـر)ە، لـە ڕۆژگاری پێغەمبەریشـدا ﷺ هـەر بـەو نـاوە نـاسراوە، وەک لـە چەنـد دەقێکـی سـوننەتدا هاتـوە، بـۆ نموونـە:

أ)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يُفْطِرَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالزُّمَرِ} (أخرجه النسائي في التفسير: ٤٦٤، وأحمد: ٢٤٤٣٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح دون قوله: «وكان يقرأ» فحسن، والحاكم: ٣٦٢٥ وقال: إسناده صحيح، وابن خزيمة: ١١٦٣).

واتـە: دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ جـاری وا بـوو هێنـدە بـە ڕۆژوو دەبـوو، (واتـە: ڕۆژووی سـوننەت) هەتـا دەمانگـوت: نایـەوێ هیـچ ڕۆژان بـە ڕۆژوو نەبـێ، (واتـە: لەسـەریەک زۆر بـە ڕۆژوو دەبـوو)،

جاری واش هەبوو بە ڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانگوت: لەوانەیە نەیەوێ هیچ ڕۆژووی سوننەت بگرێ (لەو ماوەیەدا) و، لە هەموو شەوێکدا سوورەتی: (بني إسرائيل و الزمر)ی دەخوێند.

ب)- [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الزُّمَرَ وَبَنِي إِسرائِيلَ] (أخرجه: الترمذي: ٢٩٢٠، ٣٤٠٥، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شەوێک نەدەخەوت، تاکو سوورەتی (الزمر)و سوورەتی (بني إسرائيل)، [واتە: سوورەتی (الإسراء)ی] نەخوێندبان.

بەڵام هەندێکیش ناوی (سورة الغرف)یان وێڕای سوورەتی (الزمر) بۆ بەکارهێناوە، لەبەر ئەوەی لەم سوورەتەدا وشەی (غرف)یشی تێدایە، وەک چۆن وشەی (زمر)ی تێدایە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە مەککەییە، هەرچەندە هەندێک ئایەتیان لێ هەڵاواردوون، وەک:

أ)- ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾.

ب)- ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾.

بەڵام هیچ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر لەو بارەوە نیە، کە ئەو ئایەتانەش مەککەیی نەبن.

ئنجا بە پێی ئایەتی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، دەبێ ئەم سوورەتە موبارەکە لە ساڵی پێنجی پێغەمبەرایەتییدا دابەزیبێ، چونکە لەو ساڵەدا ژمارەیەک لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) لە پیاوان و ئافرەتان، کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، بە ڕێنماییکردنی پێغەمبەر ﷺ، لەو ئایەتە موبارەکەشدا باسی کۆچکردنی مسوڵمانان کراوە، یەکەم کۆچی مسوڵمانانیش لە مەککەوە بووە بۆ حەبەشەو، کۆچەکەش دوو جاران بووە، جارێکیان لە ساڵی پێنجەمداو، ئەوی دیکەشیان لە ساڵێکی دواتردا، کاتێک لە حەبەشە هەواڵیان پێ دەگات کە قورەیش مسوڵمان بوون، دەگەڕێنەوە، بەڵام کە دێنەوە، دەزانن هەواڵەکە ڕاست نیە، ئیدی دووبارە دەچنەوە بۆ حەبەشە، ئەوەش پێیگوتراوە: کۆچی دووەم.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لە ڕیزبەندیی دابەزین (ترتيب النزول)دا، ئەم سوورەتە موبارەکە ژمارەکەی (٩٥)ە، دوای سوورەتی (سبأ)و پێش سوورەتی (غافر) دابەزیوە، لە ڕیزبەندیی موصحەفیشدا ژمارە (٣٩)یە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

لە لای زانایانی کووفەیی: (٧٥) ئایەتەو، لە لای زانایانی مەدینەو مەککەو بەصرە: (٧٢) ئایەتەو، لە لای زانایانی شامیش بە (٧٣) ئایەت دانراوە، کە ژمارەی (٧٥) تەبەننیی کراوە، لەو موصحەفانەی کە ئێستا لەبەر دەستماندان.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

لـە ڕووی نێوەڕۆکـەوە، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، هەمـان نێوەڕۆکـی قورئـانی مەککەییـە، کـە ئێمـە لـە سـەرەتای تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الأنعـام)دا، لـە بـارەی قورئـانی مەککەیـی بـە تایبـەت و، مەدینەییـەوە بـە گشـتیی، قسـەمان کـردوە، قورئـانی مەککەییـش تـەوەرە سـەرەکییەکانی کـە جەختیـان لەسـەر دەکاتـەوە، ئەمانـەن:

١- بوونناسیی، کە بوون (وجود) بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراوەو، بە ئەرزو ئاسمانەوەو، بە مرۆڤ و دەوروبەریەوە، چییەو چۆنەو، بۆچی دروستکراوەو ئامانج و حیکمەت لێی چییە؟.

٢- ئیمان بە خواو، بە ڕۆژی دوایی و، ئیمان بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی خواو، بە پێغەمبەرانی.

٣- سەرەنجامی خێری ئەهلی ئیمان و، ئاکامی شوومی ئەهلی کوفر لە دنیاو دواڕۆژدا.

٤- باسی سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا، کە لە دۆزەخدا بەرجەستە دەبێ و، پاداشتی خوا لە ڕۆژی دوایی دا، کە لە بەهەشتدا بەرجەستە دەبێ، بەڵام لە ڕووی بایەخ پێدانی زیاترەوە، ئەم سوورەتە موبارەکە باسی سێ بابەتی سەرەکیی تێدا کراوە:

أ)- باسی تەنیا خواپەرستیی (تَوْحِيدُ الله)، کە پانتاییەکی زۆری داگرتوە.

ب)- باسی قورئان لە شەش شوێندا کراوە، دووبارە بۆتەوە، هەرجارە بە شێوازێک.

ج)- باسی ڕۆژی دوایی، ئەویش دیسان پشک و بەشێکی باشی پێبڕاوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

١- بە ڕای زۆربەی زانایان، نومێد بەخشترین ئایەت، لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە بۆ مرۆڤەکان بە گشتیی و، گوناهباران بە تایبەتی، کە هەموو مرۆڤەکانیش کەم و زۆر

گوناهیان هەیە، ئەویش ئایەتی ژمارە (٥٣)یە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾.

٢- بەکارهێنانی وشەی (سِيْقَ)، بۆ هەر کام لە بێبڕوایان و پارێزکاران، لە ئایەتەکانی: (٧١و ٧٣)دا، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

٣- بەکارهێنانی تەعبیری: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ﴾، واتە: شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دەپێچێ و، ڕۆژگار بەسەر شەوگاردا دەپێچێ، کە ئەمیش تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە، بەڵێ وشەی (تكوير) بەکارهاتوە: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾﴾التكوير، بەڵام ئەو تەعبیرە (يكوّر) تەنیا لێرەدا هاتوە.

٤- بەکارهێنانی تەعبیری: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بەوە پاساوی هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوادانەرانەی خۆیان دەدایەوە، دەیانگوت: ئێمە تەنیا بۆیە دەیانپەرستین، تاکو لە خوامان نیزیک بخەنەوە.

٥- بەکارهێنانی تەعبیری: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾، ئەم تەعبیرەش تەنیا لێرەداو، لە ئایەتی ژمارە (٦)دا هاتوە، واتە: خوا ﷻ لە ئاژەڵان هەشت جووتی بۆ ناردوونە خوار، واتە: لە ڕەشە وڵاخ دووان: (نێرو مێ) گاو مانگاو، لە مەڕ دووان: بەران و مەڕو، لە بزن دووان: بزن و نێری و، لە حوشتریش دووان: (ناقة) و (جمل).

٦- بەکارهێنانی تەعبیری: ﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ﴾، ئەوانەی گوێ بۆ هەموو قسەیەک هەڵدەخەن، بەڵام شوێن باشترینی دەکەون، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە: (١٨)دا.

٧- پێناسەکردنی قورئان بە دە (١٠) وەسفی گەورەو گرنگ، لە یەک ئایەتدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ

يَهْدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، ئەمەش ئایەتی ژمارە (٢٣) یە، کە لە هەموو قورئاندا تەنیا ئایەتێک کە دە (١٠) وەسفی قورئانی گرتبنە خۆی، تەنیا ئەو ئایەتەیە.

٨)- ڕاگەیاندنی ئەوە کە موحەممەد ﷺ دەمرێ، وەک چۆن نەیارەکانیشی دەمرن، ئەویش تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٣٠)دا: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

٩)- باسی مرێندرانی مرۆڤان لە کاتی خەوتنیاندا، لە ئایەتی ژمارە (٤٢)دا: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ﴾.

١٠)- باسی لە چەنگ گرتنی خوا بۆ زەویی و، بە دەستی ڕاست پێچانەوەی ئاسمانەکان، ئەمیش لە ئایەتی (٦٧)دا هاتوە: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾.

## حەوتەم: دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:

ئەم سوورەتەمان دابەشکردوە بۆ شەش کۆمەڵە ئایەت، کە هەر کۆمەڵە ئایەتێک لە دەرسێکدا شیی دەکەینەوەو، واتاو چەمکەکانیان ڕوون دەکەینەوە:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٩) دەگرێتەوە، واتە: نۆ (٩) ئایەت و هەر سێک تەوەرەکەی: یەکتایی خوا لە پەرستراندناو، لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەنداریێتیی دا، پاشان پێغەمبەرایەتیی و وەحیی و، ڕۆژی دوایی، لەم نۆ (٩) ئایەتەی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکەدا توێژراونەوە.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (١٠ - ٢١)، واتە: دوازدە (١٢) ئایەت، باسی خوا بەیەکگرتن و شیرک و، سەرەنجامی هەردووکیان لە دنیاو لە دوارۆژدا.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٢٢ - ٤٠)، واتە: نۆزدە (١٩) ئایەت، باسی قورئان و کاریگەریی و، باسی تەوحیدو پشت ئەستوور بوونی تەوحیدو تەنیا خواپەرستیی بە بەڵگەو، بێ بنەمایی و پووچەڵیی شیرک.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٤١ - ٥٢)، واتە: دوازدە (١٢) ئایەت، باسی قورئان و، خوا بەیەکگرتن و، سەرەنجامی شیرک و ... هتد.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٥٣ - ٦٧)، واتە: پازدە (١٥) ئایەت، باسی گەڕانەوە بۆ لای خواو، ڕۆژی دوایی و، تەوحیدو، تەنیا خواپەرستیی، ئنجا باسی ئەوە کە هەر کەسێک هاوبەش بۆ خوا دابنێ، کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوەو، تەنانەت ئەگەر گریمان پێغەمبەری خواش بێ ﷺ کە ئەوە مەحاڵەو، دواییش باسی مەزنیی خواو، حوکمڕانێتیی ڕەهاو دەسترۆیشتوویەتیی بێ سنووری کراوە.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەکانی: (٦٨ - ٧٥)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، باسی ئاخیر زەمان و کۆکردنەوەو لێپرسینەوەو، بەڕێکرانی بێبڕوایان بەرەو دۆزەخ پۆل پۆل و، پارێزکارنیش دیسان بەڕێکرانیان بە حورمەت و ڕێزەوە بەرەو بەهەشت، پۆل پۆل.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە پێکهاتووە، ئایەتەکانی: (١ - ٩)، کە خوا ﷻ پێناسەیەکی کورتی قورئان دەکات، دوایی فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، بە پەرستنی ساغ و بێ خلتەی خوا.

پاشان رەخنە لە هاوبەش بۆ خوادانەران گیراوە، کە بە هیوای نیزیکخستنەوەیان لە خواوە، پەرستراوەکانیان دەپەرستن.

دوایی باسی نەگونجانی رۆڵە بۆ خوا کراوە، پاشان باسی ئەوە کراوە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروست کردوون و، شەوگارو رۆژگاریش بە دەوری یەکدا دەپێچێ.

ئنجا باسی دروستکرانی مرۆڤان لە یەک باب و دایک و، دابەزێنرانی هەشت جووت لە ئاژەڵان کراوەو، دوایی باسی ناڕازیبوونی خوا لە کوفرو، پەسند کردنی بۆ ئیمان و سوپاسگوزاریی بۆ مرۆڤەکان کراوە، دواییش بەراوردێک لە نێوان بابای بێبڕوای سپڵەو نەزان و، بڕواداری خواپەرست و زاناو دانادا، کراوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ
فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ
أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ
يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ
وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٤﴾ خَلَقَ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ
وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ
﴿٥﴾ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ
أَزْوَٰجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ
رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ
وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ
رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ وَإِذَا
مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟
إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ
ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ
قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

### بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

{دابەزاندنی ئەم کتێبە لە خوای زاڵی کارزانەوەیە ﴿١﴾ ئێمە کتێبمان بە هەق بۆ لات دابەزاندوە، دەجا خوا بپەرستە لە حاڵێکدا کە ساغکەرەوەی گەردنکەچیی دەبێ بۆی ﴿٢﴾ ئەها (ئاگاداربن!) ملکەچیی و فەرمانبەریی ساغ و بێ خلتە، تەنیا هی خوایە، (شایستەی کەسی دیکە نیە)، ئەوانەش کە جگە لەوی دۆست و سەرپەرشتیاریان گرتوون (دەڵێن:) تەنیا بۆیە دەیانپەرستین کە پێگەمان لە خوا نیزیک بخەنەوە، بە دڵنیایی لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە

ڕاجیاییـەوە، خـوا دادوەرییـان لـە نێـوان دا دەکات، بێگومـان خـوا کـە سێک کـە درۆزن و سـپڵەیە ڕاسـتە ڕێـی نـاکات ﴿٣﴾ ئەگـەر خـوا ویسـتبای ڕۆڵەیـەک بگـرێ (بـۆ خـۆی دایبنـێ)، لەوانـە کـە دروسـتیان دەکات، هەرچییەکـی ویسـتبایە (بـۆ ئـەو مەبەسـتە) هەڵیدەبژارد! پاکیـی بـۆ وی (کـە ڕۆڵـەی هەبـێ) ئـەو خـوای تاکـی ملپێکەچکـەرە ﴿٤﴾ ئاسـمانەکان و زەوی بـە هـەق هێناونـە دی، شـەوگار بەسـەر ڕۆژگاردا دەپێچـێ و، ڕۆژگار بەسـەر شـەوگاردا دەپێچـێ و، خـۆرو مانگـی دەسـتەمۆو ملکـەچ کـردوون، هـەر کامیـان تاکـو کاتێکـی ناوبـراو (دیاریکـراو) دەڕوات، ئەهـا (وریابـن!) ئـەو (خـوا) زاڵـی لێبوردەیـە ﴿٥﴾ (ئـەی مرۆڤـەکان! خـوا) لـە یـەک نەفـس دروسـتیکردوون، دوایـی هاوسـەرەکەشی لـە خـۆی دروسـتکردوە، هەروەهـا لـە ئـاژەڵان هەشـت جـووت (نێـرو مـێ)ی بـۆ دابەزانـدوون، (ئێـوەش) لـە سـێ تاریکاییانـدا لـە نێـو سـکەکانی دایکانتانـدا دروسـتکران دوای دروسـتکران (قۆنـاغ قۆنـاغ) دروسـتتان دەکات، ئـا ئـەو خوایەتـان پەروەردگارتانـە، حوکمڕانیـی تەنیـا هـی ویـە، جگـە لـەوی هیـچ پەرستراوێک نیـە، ئـەدی بۆچـی و چـۆن (لـە پەرستنی وی) لادەدرێـن؟ ﴿٦﴾ ئەگـەر بێبڕوابـن (ئـەی خەڵکینـە!) بێگومـان خـوا لێتـان بـێ نیـازەو، بێبڕواییـش بـۆ بەندەکانی پەسـند نـاکات، بـەڵام ئەگـەر سوپاسـگوزاریی بکـەن، بۆتـانی پەسـند دەکات (و پێـی خۆشـە)و، هیـچ کەسـێکی گوناهباریـش گوناهـی کەسـێکی دیکـە هەڵناگـرێ، دواییـش گەڕانەوەتـان تەنیـا بـۆ لای پەروەردگارتانـەو، هەواڵتـان پێـدەدات بـەوەی دەتانکـرد، بێگومـان ئـەو بـە نهێنیـی (خـاوەنی) سـینەکان زانایـە ﴿٧﴾ کاتێکیـش مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) زیانێکـی تووشـبوو، بـە لـە ناخـەوە گەڕانـەوەوە بـۆ لای پـەروەردگاری لێـی دەپاڕێتـەوە، (کەچـی) دوایـی هـەر کات چاکەیەکـی لـە لایـەن خۆیـەوە پێـدا، ئـەوەی پێشـتر بـۆی دەپاڕایـەوە (لـە خـوا) لەبیـری چـوو و هاوتـای بـۆ خـوا دانـان، تاکـو (بـەو هۆیـەوە) (خەڵـک) لـە ڕێـی وی لابـدات و گومـڕا بـکات، بڵـێ: ماوەیەکـی کـەم لـە کوفرەکـەت بەهرەمەندبـە (ئـەی بابـای بێبـڕوا)، بـە دڵنیایـی تـۆ لـە هـاوەڵانی ئاگـری ﴿٨﴾ (ئنجا ئایا بابایەکـی وا باشـترە)، یـان کەسـێک کـە لـە کاتـەکانی شـەوگاردا بـە کڕنـووش بردوویـی و ڕاوەسـتاویی (بـۆ خـوا) ملکەچـە،

ترس و لەرزی لە ڕۆژی دوایی هەیەو، بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی ؟ بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەکسانن؟ بە دڵنیایی تەنیا خاوەن عەقڵان بیردەکەنەوەو پەند وەردەگرن ﴿٩﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلدِّينُ ): (الدِّيْـنُ: يُقَـالُ لِلطَّاعَـةِ وَالجَـزَاء)، وشـەی (دِيْـن): بـە مانـای فەرمانبەریـی و پاداشـت، بـە پلـەی یەکـەم بەکارهێـنراوە لـە قورئانـدا، لێرەدا دەگونجـێ بگوتـرێ: وشـەی (دِيْـن) بـە مانـای هەڵـس و کـەوت (المُعَامَلَـة)، دێ، وەک گوتـراوە: (كَمَا تَدِيْـنُ تُـدَان)، واتـە: چـۆن مامەڵـە بکـەی، ئـاوا حوکمـت بەسـەردا دەدرێ.

هەروەهـا وشـەی (دِيْـن): بـە مانـای ملکەچیـی و فەرمانبەریـی و پاداشـت و پەرسـتن، دێ.

(ٱلْخَالِصُ ): واتـە: سـاغ، بـێ خلّتـە، (الإِخْـلَاصُ الإِمْحَـاضُ وَعَـدَمُ الشَـوْبِ بِمَغايـرٍ)، (إِخْـلَاص): واتـە: (إِمْحَاض) واتـە: سـاغکردنەوەو پاککردنـەوە، بـە شـێوەیەک کـە ئـەو شـتە شـتی بێگانـەو نامـۆی تێـدا نەبـێ.

(زُلْفَىٰٓ ): (الزُّلفَـى: مَنْزِلَـةُ القُـرْبِ، لِيُقَرِّبُونَـا إِلى اللهِ، زُلْفَـى أي: لِيُقَرِّبُوا إِلى اللهِ مَنْزِلَتَنَا)، بـۆ ئـەوەی پێگـەو پلەمـان لـە خـوا نیزیـک بخەنـەوە، (الزُّلْفَـى: المَنْزِلَـةُ وَالحَظْـوَة)، واتـە: پێگـەو نیزیکیـی.

(يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ): واتـە: شـەوگار بەسـەر ڕۆژگاردا دەپێچـێ، (التَّكْوِيْـرُ: اللَّفُّ وَاللَّيُّ، كَوَّرَ العَمَامَـةَ عَلَى رَأْسِـهِ، إِذَا لَوَّاهَـا وَلَفَّهَـا)، (تَكْوِيْـر): بـە مانـای پێچـرانی شـتێک دێ بـە دەوری شـتێکدا، یـان بەسـەر شـتێکدا، دەگوتـرێ: (كَـوَّرَ العَمَامَـةَ عَـلَى رَأْسِـهِ) واتـە: مێزەرەکـەی لەسـەری هاڵانـد، هـەر کاتێـک کـە لەسـەری هاڵانـدو بەسـتی.

(وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ): واتـە: ڕازی نیـە بـە بێبڕوایـی بـۆ بەنـدەکانی، (لَا يَـرْضَى:

**لَا يَخْتَار)** هەڵینابژێرێ و، پێی پەسند نیە، **(لَا يُفَضِّلُ)** واتە: هەڵینابژێرێ، **(لَا يُحِبُّ)** واتە: خۆشی ناوێ، **(لَا يُحَبِّذُ)** واتە: بە چاکی نازانێ، ئەوانە هەموویان دەچنە نێو مانای وشەی: **(لَا يَرْضَى)**ەوە.

**(ضُرٌّ)**: **(الضُّرّ: سُوءُ الحَالْ)**، **(ضُرّ)**: بریتیە لە حاڵ خراپیی، یان **(مَا فِيْهِ ضَرَر)** هەرچییەک کە زیانی تێدابێ، **(ضَرَّهُ، ضَرّاً: جَلَبَ إِلَيْهِ ضَرّاً)** زیانێکی بۆ هێنا.

**(خَوَّلَهُ)**: **(التَّخْوِيْلُ: الإِعْطَاءُ وَالتَّمْلِيْكُ دُونَ قَصْدِ عِوَضٍ)**، **(تَخْوِيْل)**: بریتیە لە پێ بەخشین و خاوەندارکردن، بەبێ مەبەست هەبوونی وەرگرتنەوەی قەرەبوو.

**(أَندَادًا)**: **(جَمْعُ نِدّ: وَهُوَ الكُفْءُ)**، **(نِدّ)**: بە مانای کوفنە، واتە: هاوتا، کەواتە: **(وَجَعَلَ لِلَّهِ أَنْدَاداً)** واتە: هاوتایان بۆ خوا دادەنێ.

**(قَٰنِتٌ)**: **(أَي: عَابِد وَمُطِيْع)**، **(قَانِت)**: هەم بە مانای پەرستار دێ، هەم بە مانای ملکەچ دێ، هەروەها بە مانای ڕاوەستاو دێ، لە کاتی تاعەتدا.

**(ءَانَآءَ)**: **(جَمْعُ أَنِي مِثْل أَمْعَاء جَمْعُ مَعِي، وَأَقْفَاء جَمْعُ قَفِي، وَالأَنَى: السَّاعَة)**، **(أَنَاء)** کۆی **(أَنِي)**ە، وەک **(أَمْعَاء)** واتە: ڕیخۆڵەکان، کۆی **(مَعِي)**ە واتە: ڕیخۆڵەیەک، **(أَقْفَاء)** واتە: پشتەمل کۆی **(قَفِي)**ە، **(أَنِي)** یان **(أَنَى)** بە مانای ماوەیەک لە کات دێ.

**(يَحْذَرُ)**: **(الحَذَرُ: احْتِرَازٌ مِنْ مُخِيْفٍ)**، یان **(خَوْفٌ مَعَ احْتِرَازٍ)**، خۆپاراستنە لە شتێکی مەترسیلێکراو، یاخود ترسانە وێڕای خۆ وریابوون، دەگوترێ: **(حَذَرَ حَذَراً وَحَذَّرْتُهُ: تَحْذِيْراً)** واتە: وریابوو بە وریابوون، وریامکردەوەو ئاگادارو هۆشدارییم پێیدا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە سەرەتای سووڕەتی (الزمر)دا، چەند بابەتی زۆر گەورەو گرنگ باس دەکات، بەڵام هەموویان لە هەر سێ تەوەری: خوا بەیەکگرتن و، وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و، ڕۆژی دوایی دا، دەسووڕێنەوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، واتە: ئەو کارە دەست پێدەکەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کاتێک مرۆڤ ئەو ڕستە موبارەکە دەڵێ، دەبێ چوار واتای بنەڕەتیی بە عەقڵ و هۆشی خۆیدا بێنێ:

١- بە ناوی خوا دەست پێ دەکەم، نەک بە ناوی خۆم یان هەر کەس و شتێکی دیکە.

٢- ئەو کارە بۆ ڕازییکردنی خوا، ئەنجام دەدەم.

٣- ئەو کارە بە پێی بەرنامەی خوا، ئەنجام دەدەم.

٤- ئەو کارە بە یارمەتیی و هاوکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەک بە شان و شەوکەتی خۆم.

دوایی دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە لە لایەن خوای زاڵی کارزانەوەیە، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾، واتە: (هَـٰذَا تَنْزِيلُ الكِتَاب)، ئەو کاتە: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾، دەبێتە گوزارە (خَبَر) و، (هَـٰذَا) دەبێتە نیهاد (مُبْتَدأ)، یاخود: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ﴾، دەبێتە نیهاد (مُبْتَدأ)، تنجا: ﴿مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾، دەبێتە گوزارە (خَبَر).

بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿الْكِتَابِ﴾، وەک دوایی باسی دەکەین (أل)ی سەر (الكِتَاب) بۆ ناساندنەو، لێرەشدا بۆ ناساندنی (عهد)ە، واتە: دابەزاندنی کتێبەکە، ئەو کتێبەی کە دەزانن کامەیە، کە قورئانە لەلایەن خواوەیە، خواش ﷻ دوو سیفەتی بۆ باسکراون: (العِزَّةُ وَالحِكْمَة)، کەواتە: ئەم کتێبە کە لە لایەن خوای

خاوەن ئەوپەڕی عیززەت و خاوەن ئەوپەڕی حیکمەتەوە، هاتوە، بەرجەستەکەری عیززەت و حیکمەتەو، هەر کەسێ شوێنی بکەوێ، هەم عیززەتی بۆ دەڕەخسێنێ و، هەم حیکمەتی پێ دەبەخشێ.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کتێبەکەمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە بە هەق، واتە: ئێمە هەق بووین کە ئەو کتێبەمان بۆ تۆ دابەزاندوە، یاخود ئەو کتێبەی کە بۆ تۆمان دابەزاندوە، هەقی لە خۆی گرتوە، یاخود ئەو کتێبەمان دابەزاندوە، بۆ ئەوەی هەق بچەسپێنێ، ﴿ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾، دەجا خوا بپەرستە، بەندایەتیی بۆ خوا بکەو، ملکەچیی خۆتی بۆ ساغ و یەکلایی بکەوەو خڵتەی پێوە مەهێڵە، واتە: بەندایەتیی ساغ و بێ خڵتە بۆ خوا بکە، بە هۆی شوێنکەوتنی ئەو کتێبە هەقەوە، کە لەلایەن خوای خاوەن ئەوپەڕی عیززەت و ئەوپەڕی حیکمەتەوە بۆ لات دابەزێنراوە.

﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ ﴾، ئاگاداربن! ملکەچیی ساغ و بێ خڵتە تەنیا هی خوایە، تەنیا شایستەی خوایە، ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە جگە لە خوا دۆستانێکیان گرتوون و، سەرپەرشتیارانێکیان گرتوون، بەندایەتییان بۆ دەکەن، ﴿ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ﴾، واتە: (يَقُولُون) - کە فڕتێنراوە لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ - (دەڵێن:) نایانپەرستین مەگەر بۆ ئەوەی لە ڕووی پلەو پێگەوە لە خوامان نزیک بخەنەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ ﴾، بە دڵنیایی خوا دادوەرییان لە بەیندا دەکات، لەوەدا کە تێیدا دەکەونە ڕاجیاییەوە، یانی: هاوبەش بۆ خوادانەرەکان لەگەڵ ئەهلی تەوحیدو ئیماندا، کە کەوتوونە ڕاجیاییەوە، خوا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ﴾، بە دڵنیایی کەسێک کە درۆکەرەو، زۆر سپڵەیە، یاخود زۆر بێبڕوایە، خوا ڕاستە ڕێی ناکات، لێرەدا وشەی: ﴿ لَا يَهۡدِي ﴾، بە مانای: ڕێنمایی ناکات، نیە، چونکە خوا ڕێنمایی هەموو کەسێکی کردوە، بەڵام واتە: ڕاستە ڕێی ناکات، واتە: نایخاتە

سەر ڕێی ڕاست، ڕێنمایی کران قۆناغێکەو، خرانە سەر ڕێی ڕاست، قۆناغێکی دیکەیە، ڕێنمایی کران، ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێ ئەوە ڕێیەکی ڕاستە، بەڵام خرانە سەر ڕێی ڕاست، ئەوەیە کە دڵی بۆی وەرچەرخێ و پابەندبێ بەو ڕێیە ڕاستەوە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: کەسانێک کە درۆزن بن و، زۆر بێبڕوابن، خوا نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست، ڕێنمایی کردوون، بەڵام گرتنی ڕێی ڕاستیان بۆ ئاسان ناکات، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی درۆ کەرن و بێبڕوان.

﴿ لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ ﴾، ئەگەر خوا ویستبای ڕۆڵە بۆ خۆی بگێڕێ و، پەیدا بکات، لە نێو ئەوانەدا کە دروستیان دەکات، ئەوەی ویستبای بۆ خۆی هەڵیدەبژارد، پاکیی بۆ وی، ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴾، ئەو خوای تاکی ملپێکەچکەرە، واتە: ناگونجێ خوا ﷻ ڕۆڵەی هەبێت، چونکە ئەگەر گریمان یەکێک بە ناوونیشانی ڕۆڵەش بۆ خۆی بگرێ، دەبێ هەر لە نێو دروستکراوانی خۆیدا هەڵیبژێرێ، چونکە خوا ﷻناگونجێ ڕۆڵەی هەبێ، وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: خوا چۆن ڕۆڵەی دەبێ، کە هاوسەری نیەو هەموو شتێکیشی وەدیهێناوەو، خوا بە هەموو شتێک زانایە.

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا ﷻ ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، واتە: بە حیکمەت، وشەی (حَقّ) بە پێی ئەو سیاقە کە تێیدا دێ، مانایەکەی دەزانرێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، واتە: بە حیکمەت و ئامانجێک، بەڵام جاری وایە دەگوترێ: (حَكَمَ فُلَانٌ بِالحَقّ) واتە: بە دادگەریی دادوەریی کرد، هەروەها دەگوترێ: (قُلْتَ أَنْتَ الحَقّ) واتە: تۆ قسەیەکی ڕاستت گوت، کەواتە: وشەی (حَق) بە مانای دادگەریی دێ و، بە مانای ڕاستیی دێ و، بە مانای حیکمەت دێ، بە پێی ئەو سیاقانە کە تێیاندایە، ئەسڵی وشەی (حَق)یش واتە: شتی چەسپاوو،

دامەزراوو نەلەخشاو، ﴿ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِ ﴾، شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دەپێچێ و، ڕۆژگاریش بەسەر شەوگاردا دەپێچێ، ئەمە ئاماژەیەکی زۆر ڕوونە بەوەی کە زەوی هەم مەیلەو هێلکەیی و خڕەو، هەمیش دەخولێتەوە بەدەوری خۆیدا، چونکە پێچرانی شەوگار بە دەوری ڕۆژگارداو، پێچرانی ڕۆژگار بە دەوری شەوگاردا، تەنیا کاتێک دەگونجێ وێنا (تصوُّر) بکرێ کە زەوی خڕ بێ، ئنجا شەوگارو ڕۆژگار بە دوای یەکدابێن، هەر کامێکیان ئەوی دیکە داپۆشێ و، جێی ئەوی دیکە بگرێتەوە، ﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ ﴾، خۆرو مانگیشی دەستەمۆ و ملکەچ کردوون، هەر کامێکیان بۆ کاتێکی ناوبراو دەڕوا، یانی: کاتێک کە بۆی دیاریکراوە، ئەو کاتەش کە بۆی دیاریکراوە، دەگونجێ: لەسەر ئاستی شەو و ڕۆژ، یان لەسەر ئاستی مانگ، یان لەسەر ئاستی ساڵ، یاخود لەسەر ئاستی تەمەنی خۆرو مانگ بێ، ﴿ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴾، ئاگادار بن! هەر خوا زاڵی باڵا دەستی زۆر لێبوردەیە.

﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ﴾، ئێوەی لە یەک نەفس هێناونە دی، کە ئادەمە، ﴿ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ﴾، دواییش هەر لە خۆی هاوسەرەکەشی هێنایە دی.

وشەی: ﴿ نَّفۡسٖ ﴾، مەبەست پێی ڕووحە، نەک جەستە، واتە: هەر لە هەمان جۆرە نەفس و ڕووح، لە ڕووی مەعنەوییەوە، کە ئادەم دروستکراوە، حەوواش لە هەمان جۆرە نەفس و ڕووح دروستکراوە، بەڵام باسی جەستەکەی نەکراوە، کە جەستەکەی چۆن هێنراوەتە دی؟.

﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ ﴾، لە ئاژەڵانیش هەشت جووتی بۆ دابەزاندوون، ئنجا هەشت جووت بە تێگەیشتنی باوی ئێستا، دەکاتە شازدە دانە، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئانداو، لە بەکارهێنانی زمانی عەرەبییشدا وشەی (زَوْج) بە هەر کام لە نێرو مێ دەگوترێ، دەگوترێ: (هَـذَا زَوْج هَـذا، وَهَـذا زَوْج هَـذا)، یانی: بە هەر کام لە نێرو مێ، دەگوترێ: (زَوْج) نەک بە هەردووکیان،

ئنجا پێیان بگوترێ: (زَوْج)، وەک ئێستا وەک لە زمانی عەرەبییدا باوە، کە گوتت جووت (زَوْج) واتە: نێرو مێ، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا، بە هەر کام لە نێرو مێ گوتراوە: (زَوْج)، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾، واتە: هەشت دانە لە ئاژەڵان، چواریان نێرن و چواریان مێن، ﴿يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾، لە سکەکانی دایکانتاندا دەتانهێنێتە دی، چۆن؟ ﴿خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ﴾، دروستکران، لە دوای دروستکران، واتە: قۆناغ قۆناغ، پێشێ تۆویلکە (نطفة)ن، ئنجا دەبن بە خوێنپارە (علقة)، ئنجا دەبن بە زارجوو (مُضغة)و... هتد، ﴿فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ﴾، لە نێو سێ تاریکاییاندا، کە تاریکایی سک و، تاریکایی منداڵدان و، تاریکایی ناوەڵ منداڵ (مشیمة)، بە نسبەت ئاژەڵانیش: تاریکایی سکیان و، تاریکایی بەچکە دانیان و، تاریکایی پزدان، ئەوەی کە لەگەڵ بەچکەکە دێتە دەرێ، ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾، ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، حوکمڕانیی و موڵک و دەسەڵات هەمووی هی ئەوە، ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾، کەواتە ئێوە بۆ کوێ لا دەدرێن؟ یاخود: چۆن لادەدرێن، کە جگە لەوی بپەرستن، لە حاڵێکدا کە ئەو پەروەردگارو بەدیهێنەرو کارسازی هەموو شتێکە؟.

﴿إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ﴾، ئەگەر بێبڕوا بن، یاخود: ئەگەر سپڵە بن، وشەی (تَكْفُرُوا) هەم دەگونجێ بە مانای بێبڕوایی بێ، هەم دەگونجێ بە مانای سپڵەیی و ناسوپاسیی بێ، ئەگەر بێبڕوابن، یان سپڵە بن، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ﴾، بە دڵنیایی خوا دەوڵەمەندە لە ئێوە، بێ نیازە لە ئێوە، ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ﴾، بەڵام بێبڕوایی بۆ بەندەکانی پەسند ناکات، یاخود سپڵەیی بۆ بەندەکانی پێ پەسند و چاک نیە، ﴿وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن (بە هۆی ئیمانەوە)، ﴿يَرْضَهُ لَكُمْ﴾، ئەوەتان بۆ پەسند دەکات، ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾، هیچ قورسایی هەڵگرێکیش، قورسایی یەکێکی دیکە هەڵناگرێ، ﴿وَلَا تَزِرُ﴾، (وَلَا تَحْمِلُ) هەڵناگرێ، ﴿وَازِرَةٌ﴾،

واتـە: (آثِمَـة) نەفسـێكی گوناهبـار كـە نەفـسی گوناهبـار چوێـنراوە بـە كەسـێک، كۆڵێكـی قـورسی لـە كۆڵـە، ئنجـا دەفەرمـوێ: هیـچ كـۆڵ هەڵگرێكـی قـورس، كۆڵـی نەفسـێكی دیكـە، هەڵناگـرێ، واتـە: كـەس گوناهـی كـەس هەڵناگـرێ، ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ ﴾، دوایـی شـوێنی گەڕانەوەتـان پەروەردگارتانـە، ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، ئنجا هەواڵتـان پێـدەدات بـەوەی دەتانكـرد، هەواڵتـان پێـدەدات، یـانی: ئەگـەر خراپەتـان كـرد، سـزاتان دەدات و، ئەگـەر چاكەشـتان كـرد، پاداشـتان دەداتـەوە، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو زانایـە بـە خـاوەنی سـینەكان، (ذات) مێینـە (مُؤنـث)ی (ذو)یـە، واتـە: (صَاحِـب)، (ذَات) واتـە: (صَاحِبَـة)، ﴿ ٱلصُّدُورِ ﴾یـش، كـۆی (صـدر)ە، واتـە: سـینە، ئنجـا خـوا ﷻ نهێنییـەكانی كـە لـە سـینەكاندا پەنهانـن، بـە خـاوەنی سـینەكانی دانـاون، كـە ئەوەنـدە لـە نێـو ئـەو دڵ و سـینانەدا چەسـپاون، وەک بووبـن بـە خـاوەنی ئـەو دڵ و سـینانە.

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ ﴾، مـرۆڤ كاتێـک زیانێكـی تـووش دێ، لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوە، مـرۆڤ كاتـێ زیانێكـی تـووش دێ، زیانێـک لـە جەسـتەیدا، لـە ماڵـی دا، لـە دەوروبەریـدا، كـە ناڕەحەتییـەک بەسـەری دێ، ﴿ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ﴾، لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوە، بـە لـە ناخـەوە بـۆ لا گەڕانـەوەوە، (أنَـابَ، يُنِيـبُ) واتـە: گەڕایـەوە لـە ناخـەوە، بـە دڵ گەڕایـەوەو، دەگەڕێتـەوە، ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ ﴾، ئنجـا هـەر كات خـوا لەلایـەن خۆیـەوە چاكەیەكـی پـێ بەخشـی، (تَخْوِيـل): بریتیـە لـە بەخشـینێک كـە مـرۆڤ چاوەڕێـی قەرەبـوو و پاداشـتی لـە بەرانبەریـدا نەبێـت، كاتێـک كـە خـوا لـە لایـەن خۆیـەوە چاكەیەكـی پـێ دەدات، بـێ ئـەوەی قەرەبوویەكـی لـێ چـاوەڕێ بـكات، ﴿ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ ﴾، ئـەو مرۆڤـە (كـە مەبەسـت پێـی مرۆڤـی بێبڕوایـە)، ئـەوەی پێشـتر بـۆی لـە خـوا دەپاڕایـەوە، لەبیـری دەچـێ، یاخـود كـە پێشـتر داوای لـە خـوا ﷻ دەكـرد، ئـەو زیانـەی لـێ لابـدات، لـە بیـری دەچـێ، ﴿ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا ﴾، هاوبەشـان بـۆ خـوا دادەنـێ، ئـەو چاكـەو نیعمەتانـە دەگێڕێتـەوە بـۆ غەیـری خـوا، ﴿ لِّيُضِلَّ عَن

سَبِيلِهِۦ ﴾، تاكو سەرەنجام خەڵك لە ڕێی خوا لابدات، ئەم (ل)ە، (لام التعليل)ە، بەڵام لە ئەصڵدا بە مانای سەرەنجامە، ئەگەرنا ئەو كەسە بە حیسابی خۆی بۆیە هاوتایان بۆ خوا دانانێ، بڵێ: بۆ ئەوەمە كە خەڵك لە ڕێی خوا لابدەم! بەڵام مادام سەرەنجامەكەی وادەبێ، كە بەهۆی ئەو هاوتاو هاوبەشانەوە كە بۆ خوایان دادەنێن، خەڵك لە ڕێی ئیمان بە خواو خواپەرستیی لابدرێ، مادام سەرەنجامەكەی وایە، وەك لە ئەصڵدا بۆ ئەوە كردبێتی.

﴿ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ﴾، (ئەی پێغەمبەر! ﷺ تۆ) بفەرموو: (ئەی بابای بێبڕوا!) ماوەیەكی كەم بەهرەمەندبە بە كوفرەكەت، چونكە كوفریش جۆرێك لە بەهرە وەرگرتنی تێدایە، ڕێی گوناهو تاوان و، ڕێی ڕابواردن و لەززەتەكان، بە حەڕامیی بۆ مرۆڤ تەخت و ناچووغ دەكات، واتە: كەمێك بەهرە وەربگرە لە كوفرەكەت مادام پێت خۆشەو پێت پەسندە، ﴿ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە هاوەڵانی ئاگری (دۆزەخی).

لە كۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا ﴾، ئەمە لێرەدا خوا ﷻ بەراوردی پێ دەكات، واتە: (أَهَـٰذَا خَيْرٌ) ئایا ئەمە باشترە، ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ ﴾، ئایا ئەوەی پێشتر باسكرا، باشترە كە هەر كات زیانێكی تووش بوو، لە خوا دەپاڕێتەوەو بۆ لای دەگەڕێتەوەو، ئەگەر خۆشیشی تووش بوو، خوای لە بیردەچێتەوەو، زیانەكەشی لەبیردەچێتەوەو، هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، كە سەرەنجام خەڵك لە ڕێی خوا لابدات، (ئایا ئەوە باشترە)، ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ ﴾، یاخود كەسێك كە لە كاتەكانی شەوگاردا بۆ خوا ملكەچە، بەندایەتیی بۆ خوا دەكات، ﴿ سَاجِدًا وَقَآئِمًا ﴾، بە كڕنووش بردوویی و بە ڕاوەستاویی، ﴿ يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، وریایە لە ڕۆژی دوایی، ترس و بیمی هەیە.

(الحَذَرُ: إِحْتِرَازٌ مِنْ مُخِيفٍ): (حذر) بریتییە لە لەخۆ وریا بوون لە شتێكی ترسناك، یاخود (الحَذَرُ: هُوَ الخَوْفُ مَعَ الإِحْتِرَازِ): (حذر) ترسە لەگەڵ خۆپاراستندا،

واتە: وریایەو بیمی هەیە لە ڕۆژی دوایی، ﴿وَيَرْجُوا رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾، بە تەمای بەزەیی پەروەردگاریشیەتی. لە لایەکەوە ترس و بیمی هەیە لە ڕۆژی دوایی، (واتە: لە سزای ڕۆژی دوایی)، لە لایەکی دیکەشەوە ئومێدو هیوای هەیە بە بەزەیی پەروەردگاری.

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بڵێ: ئایا یەکسانن ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن؟ ئەوانەی دەزانن، ئەو خواپەرستانەن و، ئەوانەش کە نازانن، ئەو بێبڕوایانەن کە هەر ڕۆژە لەسەر حاڵێکن، لە کاتی ناخۆشییدا پەنا بۆ خوا دەبەن و، لە کاتی خۆشییدا بوغرا دەبن، بەڵام ئەوانەی زانان، لە شێنەیی و لە تەنگانەدا، لە فەرحانیی و لە ناڕەحەتیی دا، هەر بەندەی خوان، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەکسانن؟ ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ﴾، بە دڵنیایی تەنیا خاوەن عەقڵان بیر دەکەنەوەو پەند وەردەگرن، ئەو ڕاستییانەیان دێتەوە بیر، کە خوای میهرەبان لە ناخ و زگماکیاندا دایناون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەی قورئان و، حیکمەتی دابەزێنرانی و، فەرمانکردن بە خواپەرستیی ساغ و بێخەوش، کە خوا تەنیا ئەوەی شایستەیەو، ئەوانەش کە بەبیانووی لە خوا نیزیکخستنەوەیانەوە، جگە لە خوا دەپەرستن، خوا دادوەرییان لە لێواندا دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە کێشەوەو، ناشگونجێ خوا ڕۆڵەی هەبێ، چونکە هەرچی هەیە دروستکراوی خۆیەتی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ
ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ
ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ
بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾
لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ
ٱلْقَهَّارُ ﴿٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە لە خوای زاڵی کارزانەوەیە، وشەی (تَنْزِيل): (نَزَّلَ، يُنَزِّلُ، تَنْزِيْلًا) چاوگ (مصدر)ە، ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە، کە قورئانە، ﴿مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾، لە خوای زاڵی کارزانەوەیە، دەگونجێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، نیهاد (مُبْتَدأ) بێ و، ﴿مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾، گوزارە (خَبَر) بێ، یاخود: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ﴾، گوزارە (خَبَر)بێ بۆ نیهادێکی قرتێنراو

(مُبْتَدأ مَحْذُوف) واتە: (هَذَا تَنْزِيل الكِتَاب)، ئەمە دابەزێنرانی کتێبەکەیە، وشەی (الكِتَاب) کە ناسێنراوە، ناساندنەکەی بۆ (عهد)ە، (عهد)یش لە زمانی کوردییدا، لە بەرانبەر (کە) دایە، ئەگەر گوتمان: کتێب (کتاب) نازانی، کام کتێبەیە؟ بەڵام کە گوترا: کتێبەکە (الكتاب) دەزانرێ، کام کتێبەیە، جاری واش هەیە (ألْ) بۆ تێکڕا (جینس)ە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەو کتێبەیە کە زاندراوە کامەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، ئەمە بۆ خۆی ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەو قورئانە بە بەش بەش (مُنَجَّم)یی دابەزێنراوە، نەک هەمووی بە یەکجار.

هەڵبەتە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەم کتێبە لەلایەن خوای زاڵی کارزانەوە دابەزێنراوە، ﴿ ٱلْعَزِيزِ ﴾، (العزيز: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالفِعْل) (العزيز) سیفەتێکی بەکردار چوێنراوە، بە مانای زاڵ (غالب) دێ، بە مانای کەسێک دێ کە لە ڕووی بەڵگەوە زاڵە، یاخود لە ڕووی بەخشینەوە، لەو ڕووەوە کە خاوەن چاکەو بەخششە بەسەر مرۆڤایەتییەوە، یان لە ڕووی دەستەڵاتەوە.

﴿ ٱلْحَكِيمِ ﴾، دەگونجێ بە مانای (حاکم) بێ، واتە: دەستڕۆیشتوو، یاخود بە مانای (مُتْقِنْ) بێ، واتە: زۆر بە وردەکاریی بێژراو، یاخود بە مانای: خاوەن حیکمەت بێ.

٢)- ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئێمە کتێبەکەمان (کە قورئانە) بۆ لای تۆ دابەزاندوە بە هەق، کە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئەمە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

أ/ بۆ ئەوەی هەق بچەسپێنێ.

ب/ ئێمە کە قورئانمان دابەزاندوە، لەسەر هەق بووین.

ج/ قورئانمان کە دابەزاندوە هەقی لە نێوخۆیەوە گرتوە، وشەی: (الحق)یش بە مانای شتی چەسپاو دێ و، بە مانای شتی ئامانجدار دێ، بەڵام بە پێی ئەو سیاقە جۆراو جۆرانە کە تێیان دێ، مانایەکەی دیاریی دەکەین.

٣)- ﴿ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾، کەواتە: بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ بکەو، ملکەچیی خۆتی بۆ ساغ بکەوە، واتە: دابەزێنرانی ئەم کتێبە (قورئان) نیعمەتە، کە پێویستە بە سوپاسگوزاریی پێشوازیی لێ بکرێ، سوپاسگوزارییش بۆ خوا، ئەوەیە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکرێ، بەهۆی پەیڕەویی کردن لەو قورئانەوە.

٤)- ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ﴾، ئاگادار بن! ﴿ أَلَا ﴾، لە زمانی کوردیی دا دەبێتە بەرانبەری (ئەها) واتە: ئاگادار بن! ملکەچیی ساغ و بێ خڵتە تەنیا هی خوایە، (الخَالِصُ: السَّالِمُ مِنْ أَنْ يَشُوبَهُ تَشْرِيكُ غَيْرِهِ فِي عِبَادَتِهِ)، (خَالِص): واتە: سەلامەت لەوەی کە جگە لە خوا بەشدارکرابێ لە پەرستنی دا.

(أبو حامد الغزالي) ئاوا پێناسەی ئیخلاص دەکات، دەڵێ: (الإِخْلَاصُ: تَجْرِيدُ قَصْدِ التَّقَرُّب إِلى اللهِ عَنْ جَمِيعِ الشَّوَائِب)، (إِخْلَاص): بریتیە لە داڕنینی مەبەستی لە خوا نیزیکبوونەوە، لە هەموو خڵتەکان، واتە: ئەو نیازو مەبەستە کە لە پشت ئەو کارەتەوەیە، یاخود هاندەری ئەو کارەتە، کە ئەنجامی دەدەی، هیچ خڵتەی جگەلە خوا پێ مەبەست بوونی پێوە نەبێ.

شایانی باسە: (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، هەم لە کتێبی: (إحياء علوم الدين)دا، هەم لە زۆر بەرهەمی دیکەشدا، شتی باش باشی گوتوون، لە بواری ئیخلاص و شیرک و ئەوانەشدا، بەڕاستیی قسەی زۆر وردو قووڵی کردوون[1].

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ﴾، ئاگاداربن! دینداریی و ملکەچیی ساغ و بێ خڵتە، تەنیا هی خوایە.

٥)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾، ئەوانەش کە جگە لەو دۆستان و سەرپەرشتیارێکیان گرتوون و، پەیداکردوون.

---

(١) کەواتە: نابێ بەهۆی هەندێک قسەو بیروڕای هەڵەیەوە، خۆمان لە بیروڕا چاکەکانیشی بێبەش بکەین.

٦)- ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾، (يَقُولُونَ: مَا نَعْبُدُهُم) بۆچی (يَقُولُونَ) دیار نیە؟ چونکە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ (دەڵێن) ئێمە نایانپەرستین ئەو سەرپەرشتیارانە، مەگەر بۆ ئەوەی لە ڕووی پێگەوە لە خوامان نیزیک بخەنەوە، ﴿لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾، (أَي: لِيُقَرِّبُونَا إِلى اللهِ تَقْرِيبًا)، (الزُّلْفَى: إِسْمٌ أُقِيمَ مُقَامَ المَصْدَرِ)، (الزلفى) ناوێکە لە شوێنی چاوگ دانیشتوە، تاکو بە نیزیکخستنەوە لە خوامان نیزیک بخەنەوە، دەشگونجێ (زُلْفَى) هەر بە مانای پێگە (منزلة) بێ، واتە: (لِيُقَرِّبُوا مَنْزِلَتَنَا إِلى الله)، بۆ ئەوەی پێگەمان لە خوا نیزیک بخەنەوە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ:

٧)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾، بە دڵنیایی خوا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە.

واتە: خاوەن دینەکان، ئەو ڕاجیاییە کە لە نێوانیاندا هەیە، کە هەندێکیان ئەهلی تەنیا خواپەرستنن و، ئەوانی دیکەش ئەهلی شیرکن و، هاوبەشانی جۆراو جۆر بۆ خوا ﷻ لە پەرستنیدا دادەنێن.

٨)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ کەسێک کە درۆکەر بێ و، زۆر بێبڕوا، یان زۆر سپڵە بێ، ڕاستە ڕێی ناکات، واتە: نایخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لێرەدا: ﴿لَا يَهۡدِي﴾، بە مانای (ڕێنمایی ناکات) نیە، چونکە خوا ﷻ ڕێنمایی هەموو کەسی کردوەو، هی ڕاست و درۆیانی کردوەو، هی چاک و خراپانی کردوە، هەموویانی ڕێنمایی کردوون، بەڵام هەمووان ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، کەسێک دەبێ هیدایەتی خوا قبووڵ بکات، ڕێنمایی خوا قبووڵ بکات، ئنجا شایستەی ئەوەیە کە خوا بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، هەروەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧﴾محمد، واتە: ئەوانەی هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، خوا ﷻ هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، بەڵام کەسێک درۆکەر بێ و، زۆر بێبڕواو سپڵە بێ، شایستەی ئەوە نیە، خوا ڕاستە ڕێی بکات، کەواتە: ﴿لَا يَهۡدِي﴾، (أَي: لَا يُرْشِدُ وَلَا يُوَفِّقُ) واتە: کاری بۆ ئاسان ناکات و ڕاستە ڕێی ناکات.

وشەی: ﴿كَـٰذِبٌ﴾یش ناوی بکەر (إسْم فاعِل)ە، واتە: درۆکەر، (كَذّاب) واتە: درۆزن، زۆر درۆکەر، بەڵام (كَفّار) کە (صِيْغَة المُبَالَغَة)ی (كَافِر)ە، واتە: کەسێک کە زۆر بێبڕوابێ، دەشگونجێ (صِيْغَة المُبَالَغَة)ەی (كَافِر)بێ، بە مانای کەسێک کە زۆر سپڵەو ناسوپاس بێ، چونکە (كَافر) وەک چۆن بە مانای بێبڕوایی هاتوە، بە مانای سپڵەو ناسوپاسیش هاتوە.

٩)- ﴿لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾، ئەگەر خوا ویستبای ڕۆڵەیەك بۆ خۆی بگرێ، یەکێک لە هاندەرەکانی بێبڕوایەکان بۆ هاوبەش بۆ خوادانان، ئەوە بوو کە ڕۆڵەیان بۆ دادەنا، ئەگەر کچ بوون و، ئەگەر کوڕ بوون، بە خەیاڵی خۆیان دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕانی خوان و، فریشتەکان کچانی خوان، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای ڕۆڵەیەک بۆ خۆی بگرێ.

١٠)- ﴿لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾، لەوانەدا کە دروستیکردوون، هەڵیدەبژارد، (أَي: لَاصْطَفَى مِنْ ضِمْنِ مَخْلُوقَاتِهِ مَا يَشَاء، إِذْ لَيْس غَيْرُهُ مَوجُودٍ سِوَى خَلْقِه)، چونکە خوا جگە لە خۆی، ئەوەی هەیە هەمووی دروستکراوەکانی خۆینی، کەواتە: ئەگەر ڕۆڵەیەکیشی پەیداکردبایە، دەبوو لە نێو دروستکراوەکانی دا پەیدای بکات.

١١)- ﴿سُبْحَـٰنَهُۥ﴾، پاکیی بۆ وی، دووریی بۆ وی، (کە ڕۆڵەی هەبێ).

١٢)- ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ﴾، ئەو خوای تاکی ملپێکەچکەرە، ئەمە ڕوونکردنەوەی پاکێتیی خوایە، یانی: کە خوا (ألله)یە، واتە: خاوەنی هەموو سیفەت و ناوە بەرزە چاکەکانە، (الوَاحِد) مادام تاک بێ و دووەمی نەبێ و هاوبەشی نەبێ، (القَهّار) هەروەها ملپێکەچکەرو باڵا دەست بێ بەسەر هەموو بووندا، خوایەکی ئاوا ناگونجێ ڕۆڵەی هەبێت، خوا ﷻ خاوەنی هەموو سیفەتە چاکەکانەو، کۆکەرەوەی هەموو سیفەتە باشەکانە، لە زاتی خۆیدا یەکتایەو، وێنەی نیەو، بۆ هەموو دروستکراوەکانیشی ملپێکەچکەر و باڵا دەستە.

پێشتریش گوتمان: وشەی (حَقّ) لە ئەصڵدا بە مانای (الثَّابِتْ والرَّاسِخ) چەسپاو و ڕۆچوو دێ، بەڵام بەپێی ئەو سیاقانەی تێیان دێ، وشەی (حَقّ) مانایەکەی دیاریی دەکرێ بۆ وێنە:

١)- ئەگەر بگوترێ: (حَكَمْتَ بِالحَق: أي: حَكَمْتَ بِالعَدْل)، حوکمت بە هەق کرد، واتە: بە دادگەرانە، کەواتە: لێرەدا هەق بە مانای دادگەریی دێ.

٢)- ئەگەر بگوترێ: (قُلتَ قَوْلاً حَقّاً، أَي: قُلتَ صِدْقاً)، واتە: تۆ قسەیەکی ڕاستت کرد، کەوتە: لێرەدا وشەی (حَقّ) بە مانای ڕاستیی دێ.

٣)- ئەگەر بگوترێ: (وَفَّقْتَ بَيْنَهُمْ بِالحَق) واتە: تۆ ئەو تەرەفە ناکۆکانەت بە هەق پێک هێنا، واتە: بە حیکمەت، هەق لێرەدا حیکمەتە.

٤) ئەگەر گوتت: (فَعَلْتَ الحَقّ)، (أي: فَعَلْتَ مَا يُرْضِي الحَقّ)، شتێکت گوتوە هەق کە خوایە ﷻ، ڕازیی دەکات.

٥)- ئەگەر بگوترێ: (خَلَقَ اللهُ الكَوْنَ بِالحَقّ، أي: لِهَدَفٍ كَبِيرٍ، وَلِحِكْمَة جَلِيْلَة)، واتە: بۆ ئامانجێکی گەورەو، بۆ حیکمەتێک خوا گەردوونی هێناوەتە دی، کەواتە: وشەی (حَقّ) بەپێی ئەو سیاقانە کە تێیاندا دێ، مانایەکەی دیاریی دەکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی بە هەق و، پێچانی شەوگار بەسەر ڕۆژگارداو، ڕۆژگار بەسەر شەوگارداو، ڕامکرانی خۆرو مانگ، تاکو کاتێکی دیاریکراوو، دروستکرانی بابی مرۆڤان لە یەک نەفس و، دروستکرانی هاوسەرەکەشی هەر لە خۆی و، دابەزێنرانی هەشت جووت لە چوار جۆرە ئاژەڵ و دروستکرانی مرۆڤ لە سکی دایکیدا، لە نێو سێ جۆرە تاریکاییاندا، قۆناغ قۆناغ، دروستکران لە دوای دروستکران:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٥﴾ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، واتە: بۆ حیکمەتێک و بۆ هێنانە دی ئامانجێک، ئێمە لە سوورەتی (یونس) دا، باسێکی تایبەتمان لەو بارەوە کردووە، لە هەموو ئەو ئایەتانەی کە دەوری پازدە ئایەتێ لە قورئاندا، باسی ئەم بابەتە دەکەن، هێناومانن.**

**٢)- ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ﴾، شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دەپێچێ و، ڕۆژگار بەسەر شەوگاردا دەپێچێ، (يُكَوِّرُ: يَلُفُّ) واتە: دەپێچێ، هەڵبەتە ئەم تەعبیرە ڕاستییەکی زانستیی گرتۆتە خۆی، کە لە کاتی دابەزێنرانی قورئاندا ئەو ڕاستییە زانستییە نەزانراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین،**

هەم مەیلەو خڕ هەڵکەوتوە (هێلکەیی)، نەک خڕی تەواو، هەم بە دەوری خۆشیدا دەخولێتەوە، چونکە (تَكْوِير) واتە: شەوگار پێچران بە دەوری ڕۆژگارداو، ڕۆژگار پێچران بەسەر شەوگاردا، کاتێک دەگونجێ وێنا (تصوّر) بکرێ، کە زەوی مەیلەو هێلکەیی و خڕ بێ، بە دەوری خۆشیدا بخولێتەوە.

لەو بارەوە (الطنطاوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، عیبارەتێکی جوانی هێناوە پێم چاک بوو لێی بخوازمەوە، دەڵێ:

**(كَارَ العَمَامَةَ عَلَى رَأْسِهِ وَكَوَّرَهَا، وَلَا جَرَمَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ فِي تَتَابُعِهِمَا أَشْبَهُ بِتَتَابُعِ أَكْوَارِ العَمَامَةِ بَعْضِهَا عَلَى بَعْضٍ، فَالأَرْضُ كَالرَّأْسِ وَالظَّلَامُ وَالضِّيَاءُ يَتَتَابَعَانِ بِتَتَابُعِ أَكْوَارِ العَمَامَةِ، وَيَلْتَفَّانِ مُتَتَابِعَيْنِ حَوْلَهَا، وَهَذَا التَّعْبِيرُ مِنْ أَعْجَبِ مَا يُعْلِمُ أَنَّ القُرْآنَ يُرْشِدُنَا إِلَى كُرَوِيَّةِ الأَرْضِ أَوَّلًا، وَيُرْمِزُ إِلَى دَوَرَانِهَا حَوْلَ نَفْسِهَا ثَانِيَاً).**

واتە: لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: **(كَارَ العَمَامَةَ عَلَى رَأْسِهِ وَكَوَّرَهَا)**، مێزەرەکەی لەسەری خۆی پێچا، چونکە هەر قەفێکیان بە دەوری ئەوی دیکەدا دەپێچرێ، گومانی تێدانیە، کە هەر کام لە شەوگارو ڕۆژگار کە بە دوای یەکدا دێن، وەک بە دوای یەکدا هاتنی پێچەکانی مێزەر وایە، کە هەندێکی بەسەر هەندێکی دا دەپێچرێ، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ زەوی وەک سەر(ی مرۆڤ) تەماشا کردوەو، داناوە، تاریکایی و ڕووناکیی و شەوگارو ڕۆژگاریش بە دوای یەکدا دێن، وەک چۆن پێچەکانی مێزەر بە دوای یەکدا دەپێچرێن و، شەوگارو ڕۆژگاریش بەسەریەکدا دەپێچرێن بە دەوری زەویدا، (ئەگەر ئەم بلاجکتۆرە خۆر بێ و[2]، ئەمە زەوی بێ و، زەوی ئاوا دەخولێتەوە بە دەوری خۆیدا، ئەو شوێنەی ڕووی لە خۆرە دەبێتە ڕۆژو پشتەکەی دەبێتە شەو، کەواتە: بەردەوام شەو ڕۆژ ڕاودەنێ، ڕۆژیش شەو ڕاودەنێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ

---

(١) الجواهر في تفسير القرآن الكريم: ج١٨، ص١٨٣.

(٢) لەکاتی دەرس گوتنەوەکەدا ئاماژەم بەگڵۆپێکی بلاجکتۆر کردوە، ئاماژەم بەشتێکی دیکە کردوە، چواندمن بە خۆر و زەوییەوە.

يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾﴾، واتە: بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە دوای دەکەوێ بە خێرایی، سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، نزیکەی سی (٣٠) کیلۆمەترە لە خولەکێکدا، ئنجا بۆ ئەوەی سەعاتێکت بۆ دەرکەوێ: (٣٠) جارانی (٦٠) دەکەی (٣٠ × ٦٠ = ١٨٠٠کلم)، دەکاتە ئەو ماوەیەی کە زەوی لە ماوەی سەعاتێکدا دەیبڕێ بە دەوری خۆیدا، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾، بەڵام لەبەر ئەوەی زەوی زۆر گەورەیە، ئێمە زۆر هەست بەو سووڕانەوە خێرایە ناکەین، هەڵبەتە ئەگەر خێراتر سووڕابایەوە، ئەو کاتە وەک پێشتریش باسمان کردوە، حاڵ و گوزەرانی مرۆڤ لەسەر زەوی جۆرێکی دیکە بوو، یان هەر نەدەبوو)[1].

ئەم دەربڕینەش سەرسووڕهێنەرترین دەربڕینە، لەوەدا کە بزانرێ قورئان ڕێنماییمان دەکات یەکەم: زەوی مەیلەو خڕە، دووەم: ئاماژەشە بەوە کە بە دەوری خۆشیدا دەخولێتەوە.

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێک بکرێ:

بۆچی خوا ﷻ بە تەعبیرێکی دیکە نەیهێناوە، ڕوونتر بووایە؟ واتە: هەر ڕێک فەرمووبای: زەوی خڕەو بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو شەو و ڕۆژ لەوەدا پەیدادەبن؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ بە شێوەیەکی فەرمووە: بە کەڵکی هەموو ڕۆژگارەکان بێ، بۆیە بە ئاماژە هاتووە، ئنجا هەر ئەمەش نیەو، زۆر ڕاستیی دیکەی گەردوونیی لە قورئاندا هاتوون، کە ئەگەر خوا ﷻ وەک لە واقیعی خۆیاندا هەن، ئاوای فەرمووبانایە، بۆ خەڵک دەبوونە مەتەڵێک کە لێی تێ نەدەگەیشتن و، لە عەقڵیانەوە نەدەچوو، بەڵام بە ئاماژە فەرموونی، کە ئەوان بە جۆرێک لێیان تێ دەگەن و، دواییش کە زانست زیاتر بەرەو پێشەوە دەچێ، وەک حەقیقەتی خۆیان دەیانزانن.

---

(١) هی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

ئنجا لە چەند شوێنی دیکەش دا، ئاماژەی پێدراوە، کە زەوی خڕو هێلکەیی هەڵکەوتوە، بۆ وێنە:

أ- ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا ﴿١٩﴾ ﴾الحجر، واتە: زەوییمان درێژ کردۆتەوە، کە کاتێک درێژ کردنەوەی زەویی و پان ڕاخستنەوەی زەوی تەسەووڕ دەکرێ، کە خڕو هێلکەیی بێ، چونکە ئەگەر چوارگۆشە یان، لاکێشە، سێگۆشە بووایە، دەبوو گۆشەی هەبوونایە، بەڵام هەر دەڕۆی و گۆشەی نین!

ب- ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ ﴾النازعات، واتە: دوای ئەوە خوا ﷻ زەویی پان ڕاخستوە، یاخود مەیلەو هێلکەیی لێکردوە.

ج- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ ﴿٣﴾ ﴾الرعد، واتە: خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە زەویی درێژکردۆتەوەو، پان ڕاخستوە، کە ئەوانە هەموویان ئاماژەن بە خڕێتیی زەوی.

د- ﴿ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا ... ﴾الأعراف: ٥٤، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە بە سووڕانەوەی زەوی و، بە دوای یەکداهاتنی شەوگارو ڕۆژگار لەسەر پانتایی و ڕووبەری زەوی.

٣)- ﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ ﴾، هەروەها خوا ﷻ خۆرو مانگی ڕامکردوون، ملکەچ کردوون، هەر کامێکیان دەڕوات بۆ کاتێکی دیارییکراو.

ئەو کاتە دیارییکراوە دەگونجێ مەبەست پێی کاتی دیارییکراوی شەوگارو ڕۆژگار بێ، یان هی مانگ بێ، یان هی ساڵ بێ، یاخود هی تەمەنی مانگ و خۆر بێ، تاکو تەمەنیان دەبێت.

ئێمە لە سوورەتی (یونس)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لە قەدەر ئەم تەفسیرە کردوە، لە بارەی هەر کام لە خۆرو، مانگ و، زەوی، هەروەها پێشێ لە بارەی

گەردوونەوە بە گشتیی[1]، هەرچەندە جار جار ئەوەندەی پێویست بکات ئاماژە بە هەندێک شت دەکەینەوە بۆ وێنە: قەبارەی خۆر ملیۆنێک و سێ سەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی قەبارەی زەوی گەورەیەو، نێو جەرگەی خۆر شەش ملیۆن (٦,٠٠٠,٠٠٠) پلەی سەنتیگراد گەرمە، کە ئەگەر زەوی ئێمە بخرێتە نێو خۆرەوە، لە چرکەیەکدا دەبێتە هەڵم، بەڵام توێژی دەرەوەی خۆر بیست هەزار (٢٠,٠٠٠) پلەی سەنتیگراد گەرمەو، بڵێسەی زمانی خۆر ملیۆنێک (١,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر درێژەو، ئەگەر هەر کاتێک خۆر بکوژێتەوە، زەوی ئێمە یەکسەر (٢٧٠) پلە دەچێتە ژێر سفرەوە، واتە: دەبێتە سفری موتڵەق، بە پێی پلەی کاڵفن، ئەو کاتەش نەک هیچ جووڵەیەک لەسەر زەوی نامێنێ، بگرە گەردیلەکانیش ڕەنگە جووڵەیان تێدا نەمێنێ.

٤)- ﴿أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ﴾، ئاگاداربن! ئەو (خوا) زاڵی زۆر لێبوردەیە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی دروستکردنی مرۆڤ و دەفەرموێ:

٥)- ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾، (خوا) ئێوەی لە یەک نەفس دروستکردوە.

کە بە تەئکید مەبەست پێی ئادەمە.

٦)- ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾، دوایی هەر لە خۆی (لەو یەک نەفسە کە نەفسی ئادەمە ﷺ) هاوسەرەکەشی دروستکرد.

بێگومان لێرەدا مەبەست لە: ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾، ئەوەیە کە لە هەمان جۆرە نەفس کە ئادەمی لێ دروست بووە، حەوواش لە هەمان جۆرە نەفس دروست بووە، هیچ گومان لەوەدانیە کە مەبەست پێی ئەوەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾، هەروەها لە سوورەتی (النساء) دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا

---

(١) هەروەها لە تەفسیری هەرکام لە سوورەتی (فصلت) و (الرحمن) یش، لەبارەی گەردوونەوە دواوین.

وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾، ڕاناوی (منها) لە هەردوو شوێنەکاندا بۆ نەفس دەچێتەوە، کە مێینە (مؤنث)یە، واتە: لەو جۆرە نەفسە حەوواشی دروستکردوە، نەک لەو جەستەیە، چونکە ئەگەر بۆ جەستە چووبایەوە، دەیفەرموو: (خَلَق منه)، ئنجا کە گوایە: حەووا لە پەراسووی ئادەم دروست بووە، ئەوە قسەی پەیمانی کۆنەو پێشتریش هێناومانە لە تەفسیری سوورەتی (النساء)داو، لە تەفسیری سوورەتی (الروم)یش دا، کە لەوێ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾الروم، ئنجا ئەگەر بە پێی (النساء: ١) حەووا لە ئادەم جیا بووبێتەوە، دەبێ بەپێی (الروم: ٢١) جەستەی هەر ژنێکیش لە جەستەی پیاوەکەی جیابووبێتەوە! کە بە تەئکید ئەوە وانیە، بەڵکو واتە: هەموویان لە یەک جۆرە نەفسن، بەڵام ئایا جەستەی ئادەم کە لە قوڕ دروست بووەو ئەوە خوا ﷻ فەرموویەتی، جەستەی حەوواش هەر لەو قوڕە دروستبووە؟ لە هەندێ شوێنەواراندا هاتوە کە لەو قوڕەی ماوەتەوە لە جەستەی ئادەم، حەوواشی لێ دروستبووە، بەڵام لە قورئاندا خوای پەروەردگار باسی نەکردوە و، لە سوننەتی پێغەمبەریشدا نەهاتوە، بەڵام بە تەئکید ئەگەر نەفسەکە هەمان جۆرە نەفس بێ، دیارە جەستەکەش هەمان جۆرە جەستەیەو، ئەویش هەر لە قوڕو لە خاک دروست بووە.

٧)- ﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ﴾، لە ئاژەڵان هەشت جووتی بۆتان دابەزاندوون.

کە دەفەرموێ: بۆی دابەزاندوون، واتە: وایلێکردوون ئێوە بیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆتانەوە، یاخود مەبەست ئەوەیە کە فەرمانی دروستکردنی ئاژەڵەکان، لە لایەن خواوەیە لە ئاسمانەوە دابەزیوەو، یان مەبەست پێی دابەزێنرانیانە لە کەشتیی نووح، کە کاتی خۆی لە هەر جۆرە ئاژەڵێک جووتێکی بە فەرمانی خوا لە

کەشتییەکەیدا سوار کردوە، ئەوانەش هەموویان ئەوانە بوون کە لە ئاودا خنکابن و لە کەشتییەکەدا پارێزراون و، دوایی لە کەشتییەکە هاتوونە خوار، خوا ﷻ بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم﴾، ئنجا (أنزل) بە هەر کام لەو واتایانە بێ، دەگونجێ.

مەبەست لە هەشت جووتەکانیش، هەشت نێرو مێیەکانی چوار جۆرە ئاژەڵەکانن، کە لە سوورەتی (الأنعام)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ... ﴿١٤٤﴾﴾الأنعام، هەشت جووتن، [هەشت نێرو مێن، چواری نێر، چواری مێ، لە مەڕ دووان و لە بزن دووان]، دوایی دەفەرموێ: لە حوشتر دووان و، لە ڕەشە وڵاخ دووان، هی مەڕ نێرەکە پێی دەگوترێ: بەران و مێیەکە پێی دەگوترێ: مەڕ، هی بزن، نێرەکەی پێی دەگوترێ: نێریی و، مێیەکە پێی دەگوترێ: بزن، هی حوشتریش بە عەرەبیی هاتوە، چونکە لە کوردەواریی ئێمەدا نیە، تاکو وشەیەک بۆ نێرەی حوشتر دابنێین بەرانبەر مێیەی حوشتر، بەڵام بە عەرەبیی بە نێرەکەی (بعیر) دەگوترێ، یاخود (جمل)، بە مێیەکەی دەگوترێ: (ناقة)، هی ڕەشە وڵاخیش نێرەکەی گایەو، مێیەکەی مانگایە، کە دیارە کەڵ و گامێشیش لە جۆری ڕەشە وڵاخن و، نێرەکە کەڵەو مێیەکە گامێشە، ئنجا باسی مرۆڤ دەکات، دەفەرموێ:

٨)- ﴿يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾، لە سکی دایکتاندا دروستتان دەکات.

٩)- ﴿خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ﴾، دروستکران دوای دروستکران، واتە: قۆناغ قۆناغ.

١٠)- ﴿فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ﴾، لە سێ تاریکاییدا، سێ تاریکاییەکەش: تاریکایی سک و، تاریکایی منداڵدان (رحم) و، تاریکایی ئاوەڵ منداڵ (مشیمة)ن، کە بۆ ئاژەڵ پزدانی پێدەڵێن، بەڵام بۆ مرۆڤ هی ئافرەت، ئاوەڵ منداڵی پێ دەڵێن، کە لەگەڵ ئەو منداڵەدا دێتە دەرێ، بەڵام منداڵدان هەر لەوێدایە.

١١)- ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، حوکمڕانیی و دەسەڵات بەس هی ئەوە.

١٢)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾، هیچ پەرستراوێک نیە، کەواتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟! یاخود چۆن لادەدرێن؟ مەبەست ئەوەیە کە مادام خوا ﷻ خاوەنی هەموو گەردوونەو، خاوەنی شەوگارو ڕۆژگارە، خاوەنی خۆرو مانگ و زەوییەو، ئێوەی هێناوەتە دی و، ئاژەڵی بۆ هێناونە دی، خاوەنی هەموو چاکەکانە، کەواتە: بۆچی جگە لەو دەپەرستن؟ بەندایەتیی بۆ جگە لەو دەکەن؟ وەک پێشتریش گوتوومانە: ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا، باسێکی باشمان لە بارەی دروستکردنی مرۆڤان کردوە، چ ئادەم و حەوواو، چ مرۆڤ و قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ، کە بە حەوت قۆناغاندا مرۆڤ تێدەپەڕێ:

١)- قۆزغی پوختەیەک لە قوڕ.

٢)- نوتفە.

٣)- عەلەقە.

٤)- موضغە.

٥)- ئێسقان.

٦)- داپۆشرانی ئێسقان بە گۆشت.

٧)- دروستکرانێکی دیکە، کە بریتیە لە ڕووح بە بەرداکران.

## کورتە باسێک لە بارەی جەستەی مرۆڤەوە

لەبەر رۆشنایی تەفسیری: (**الجواهر في تفسير القرآن الكريم**)، ی (**طنطاوي الجوهري**)دا[1]، کە ئەو لە پەنجا (٥٠) خاڵدا باسی جەستەی مرۆڤ دەکات، بەڵام من لە پازدە (١٥) تەوەردا، ئەو پەنجا (٥٠) خاڵەی ئەو کورت دەکەمەوە، بەپێی ئەندامەکانی جەستە:

١)- جەستەی مرۆڤ: کاتێک سەرنجی جەستەی مرۆڤ دەدەین، دەبینین خوا ﷻ جەستەی مرۆڤی بەش بەش کردوە، نەک هەمووی یەک پارچە بێ، تاکو مرۆڤ بتوانێ کارەکانی خۆی بکات، سەر بە جیا، دەست بەجیا، لاق بە جیا، لە نێو سەریشدا پێنج هەستەکان، هەستی بیستن و دیتن و بۆنکردن و تامکردن و، ئنجا هەستکردن (لمس) کە ئەویش هەم پەیوەندیی بە سەرەوە هەیە، هەم پەیوەندیی بە ئەندامەکانی دیکەوەش هەیە.

٢)- جومگەو ئێسقان: جومگەکانی مرۆڤ و، ئێسقانەکانی، هەر کامێکیان بە شێوەیەک دانراوە کە لەگەڵ ئەو جووڵەیەدا کە بۆی پێویستە، بگونجێ، دوایی ئەم جومگانە بە چەند ژێیەک پێکەوە بەستراون و، هەر کام لە سەری ئەو ئێسقانانەش، بە شێوەیەکە بچێتە نێو ئێسقانی دیکە کە پێیەوە پەیوەست دەبێ، جگە لەوەی کە دەشچێتە نێوی لە رێی جومگەیەکەوە، بە ژێیەکانیش مەحکەم کراوەو بە ماسوولکەکانیش مەحکەم کراوە، ئەگەر وانەبووایە، بە تەئکید مرۆڤ ئەو جموجۆڵەی کە ئێستا دەتوانێ بە هەموو لادا سەر بسوورێنێت، دەست بسوورێنێ، لاق بسوورێنێ، ئەو کاتە ئەو جموجۆڵەی نەدەبوو.

٣)- سەر: سەر لە کۆمەڵێک ئێسقان پێک هاتوە، زۆر کەس وا دەزانێ کەللەی سەر یەک ئێسقانە، بەڵام لە چەندان پارچە پێک هاتوە، ئەویش بۆ ئەوەی ئەگەر پارچەیەکیان زیانی پێگەیی، هەمووی درزنەبات و هەمووی نەشکێت و، هەر ئەو پارچەیە بێت کە

---

(١) ج٩، ص١٩٦ - ١٩٨.

زیانی پێگەیشتووە، ئنجا ئێسقانەکانی دیکەی کە سەریان لێ پێک دێ شەویلاگەکانن، ددانەکانن، ئێسقانەکانی لووتن، گوێیەکانن، کە هەر کامێکیان قەبارەو شێوەو چۆنیەتییەکەیان، بەو شێوەیە کە لەگەڵ ئەرکەکەیاندا بگونجێ.

٤)- گەردەن: گەردنی مرۆڤ، لە حەوت بڕگە، پێک دێ، کە هەر کامێکیان دەچێتەوە نێو ئەوی دیکەو، کرۆو کروژەیەکیان لە بەیندا هەیە لەگەڵ بڕگەکانی دیکەی پشت دا تاکو خوارێ، تاکو دەگاتە کلێنجە (عُصعُص) هەموویان پێکەوە گونجاون، کۆی ئێسقانەکان بە پێی هەندێ سەرژمێر (٢٤٨) دوو سەدو چل و هەشت ئێسقانن، جگە لە ئێسقانە وردەکان، هەندێکیش دەڵێن: زیاترن، بەڵام جومگەکان وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا هاتوە سێ سەدو شەست (٣٦٠) جومگەن، هەر کامێک لەو جومگانەو لەو ئێسقانانە بە وردو درشتیانەوە، لەگەڵ ئەو ئەرکەیدا کە بۆیان دیاریکراوە، گونجاون.

٥)- چاو: پێش هەموو شتێک، پێڵووی بۆ دروستکراون، ئەو پێڵووانەش وەک دەروازەو دەرگا وان، کە لە کاتی خۆیدا چاو ئەو پێڵووانە دەکاتەوەو، کاتێ نیشی پێیان بێ، نەگەرنا دایان دەخات، بۆ وێنە: ئەگەر هەست بە ترسێک بە ناخۆشییەک بکات، یان لە کاتی خەوداو، ئنجا ئەو پێڵووانە جوانن بۆ چاو، تۆ بێنە بەرچاوی خۆت چاو پێڵووی نەبوونایە، ئنجا برژانگەکانی چاو، کە نە کەم دەکەن و نە زیاد دەکەن، ئەگەر زیادیان کردبایەو پێویستییان بەوە بووایە ئینسان برژانگی خۆی بە مقەس بقرتێنێ، وەک چۆن مووەکانی شوێنەکانی دیکە، زۆر زەحمەت دەبوو!

ئنجا چاو ئاوێکی سوێری تێدایە، کە بەردەوام ئەو چاوە دەشوات و پاکی دەکاتەوە، هەردوو برۆیەکانیش دیسان ئارەقەیەک کە لەسەرەوە ڕا دێ، چاو دەپارێزن لەو ئارەقەیەو بەولاو بەولای برۆیەکاندا ئارەقەکە دێتە خوار، جگە لەوەی کە جوانییەکیش دەدەن بە چاو، جگە لەوەی جۆرێک لە داپۆشینیشن بۆ چاوو، مووی برۆیەکانیش وەک هی برژانگەکان کەم وا هەیە زیاد بکەن، شێوەیەکی تایبەتن لە موو، وەک مووی سەرو ڕیش و سمێڵ و ئەوانە نین.

٦)- مووەکان: مووی ڕیش و سەر بە نسبەت پیاوانەوەو، بە نسبەت ئافرەتانەوە مووی سەر، زیاد دەکەن و حەواڵەی مرۆڤ کراوە کە ڕیشی چەند بێ، بیهێڵێتەوەو نەیهێڵێتەوە، قژی سەری چەند بێ، زۆری بکات کەم بکات، بەپێی ئەو ژینگەو عادەت و نەرێتەی تێیدا دەژی، بەڵام ئەگەر وابووایە کە وەک مووی برژانگ و برۆ، کەم و زیادیان نەکردبایە، جۆرێکی دیکە دەبوو، بەڵام خوا ﷻ مووی سەرو ڕیش و سمێڵی والێکردوە، زیادو کەم بکەن، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی زەوق و سەلیقەو ژینگەو عورف و عادەتی کۆمەڵگایەکەی خۆی، دەستکاریان بکات.

٧)- لێوەکان: لێوەکان جگە لەوەی مایەی داپۆشینن بۆ زارو وەک دەرگایەک وان و، لە کاتی پێویستدا مرۆڤ لێوەکانی لێک دەکاتەوە، جگە لەوەش پەردەیەکیشن بەسەر پووک و دداندا، با ئینسان بێنێتە بەرچاوی خۆی لێوی نەبوونایەو، هەموو دەمی پووک و ددانی دیاربوونایە، زۆر دیمەنێکی دزێوی دەبوو!

کەواتە: لێوەکان دەرگان بۆ زارو، پەردەو پۆشاکن بۆ پووک و ددان و، جوانییەکیش دەدەن بە دەم و چاوی مرۆڤ، بە هۆی لێوەکانیشەوە مرۆڤ دەتوانێ زۆر لە پیتەکان گۆ بکات.

٨)- زمان: ئنجا با تەماشای زمان بکەین: زمان جگە لەوەی بۆ قسەکردن بەکاردێ و، بۆ دەربڕینی ئەوەی مرۆڤ لە دەروونیدایە، بۆ چێژتنی خواردنیش بەکاردێ، بۆ ساردیی و گەرمیی ئەو خواردنەوەیە، یان ئەو خواردنەی دەیخوات ئایا ساردە، گەرمە؟ سەری زمانی دەگەیەنێتێ دەزانێ داخۆ بە کەڵک دێ بخورێ، یان بخورێتەوە، یانا نا؟ هەروەها زمان بۆ هەڵگێڕو وەرگێڕکردنی خواردنیش، بەکاردێ، کە ئەو خواردنە ئەو پارووە بگوازێتەوە لەو ددانە بۆ ئەو ددانە، بۆ وێنە لە کەڵبەکانەوە بۆ بڕەڕەکان، لە بڕدڕەکانەوە بۆ خرێکان، بۆ ئەوەی بیهاڕن.

٩)- ددانەکان: ئنجا با تەماشای ددانەکان بکەین: ددانەکان یەک ئێسقان نین، بەڵکو هەر کامێک لە ئێمە (٣٢) ددانمان هەیەو، ئەو (٣٢) ددانە دابەش دەبن بۆ سێ جۆر، بە عەرەبی (ثنایا، أنیاب، أضراس) واتە: (کەڵبەکان، بڕەڕەکان، خرێنەکان)، کەڵبە ئەوانەی

پێشەوەن و مرۆڤ شتیان پێ دەبڕێ، دوایی بڕەڕەکان ئەوانەی شتیان پێ قڵت قڵت دەکات، ئنجا خڕێنەکان ئەوانەی پشتەوە کە شتیان پێ دەهاڕێ، پێشێ دەیبڕێ دوایی قڵت قڵتی دەکات و، دوایی قۆناغی سێیەم دەیهاڕێ، ئنجا بە کەڵک دێ قووت بدرێ، ئنجا ددانەکان وێڕای ئەوە کە بۆ خواردن و بڕین و قڵت قڵتکردن و هاڕین پێویستن، لە هەمان کاتدا بۆ جوانیی دەم و چاویش پێویستن، سپێتیی ددانەکان لەگەڵ سووریی پووکەکان و لێوەکاندا، جوانییەکی دیکە دەدا بە دەم و چاوی مرۆڤ.

سەری ددانەکانیش هەموویان ڕێکە، ئەگەر ئینسان شتێکی بچووک بچێتە بەر ددانەکانی، هەستی پێدەکات، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ هەموویانی بە یەک ئەندازەو تاست دروستکردوە.

١٠)- زار: ئنجا با تەماشای زار (فم) بکەین: هەمیشە لە نێو زاردا تەڕاییەکی هەست پێکراو هەیە، بەڵام ئەو تەڕاییە کە مەبەست پێی لیکە، لە کاتی پێویستدا وەدەردەکەوێ، ئەگەر هەمیشە ئەو لیکە لە دەمدا هاتبایە، زار پڕ دەبوو لە لیک و دەبووایە مرۆڤ هەمیشە تف فڕێ بدات، بەڵام نا، لە کاتێکدا کە مرۆڤ پێویستیی پێ بێ، ئەو لیکە دێ، دەگوترێ: ئاوی لە دەم دێ، بە تایبەت لە کاتی خواردندا، یان بیرکردنەوە لە هەندێک خواردن، ئەوەش وادەکات یەکەمین پرۆسەی هەرسکردنی خواردن لە زاردا ئەنجام بدرێ، بە هۆی ئەو لیکەوەو، پارووەکەش نەرم و خۆش دەکات، بە کەڵکی قوتدان دێ، ئەوەی لەگەڵ پارووەدا قوتدەدرێ، ئەوەی دیکەش کە دەمێنێتەوە، بۆ تەڕو باشکردنی نێو دەمەو، هەروەها بۆ ئەوەی مەڵاشوو و قوڕگ نەرم بێت، تاکو ئینسان بتوانێ قسە بکات، لە کاتێک دا مرۆڤ قوڕگی وشک دەبێ و لیکی لە دەمدا نامێنێ، قسەی بۆ ناکرێ، یەک بە یەک دەڵێ: ئاوی لە دەمدا وشک بووە، واتە: قسەی بۆ ناکرێ.

١١)- گوێ و بیستن: ئنجا با تەماشای گوێ و هێزی بیستن، بکەین: ئەو ئاوەی کە لەنێو گوێدایە، تەڕاییەکە نێو گوێ دەری دەکات و زۆر کەس پێی قەڵسە، پێی دەگوترێ: چڵکی گوێ، بەڵام ئەوە زۆر زۆر پێویستە، تاکو لە هەر زیندەوەرێکی زیانبەخش بیپارێزێ، چونکە تاڵەو دەیکوژێ.

ئنجا سەیوانی گوێ، کە لە ماددەیەکی کرۆژ کرۆژەیە، نە گۆشتەو نە ئێسقە، بۆ ئەوەی دەنگ کۆ بکاتەوەو، دوایی بیخاتە نێو گوێ، هەروەها لە نێو گوێدا مووەکان هەن، کە ئەوانیش تۆزو غوبارو شتێک کە زیانبەخش بێ دەیگێڕنەوە، هەڵبەتە پێویستیی بە باسێکی سەربەخۆ دەکات کە باسی دەزگای بیستن (جهاز السمع) بکەین، کە چۆن لە چەکوش و سندان و تەپڵ و نیوە کەوانەو کەوانە تەواوەکان و ... هتد پێک دێ، کە ئێمە لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)، لە باسی جەستەی مرۆڤدا، باسێکی درێژمان لەو بارەوە کردوە.

١٢)- قورقوڕاگە: ئنجا با تەماشای قورقوڕاگە بکەین: قوڕ قوڕاگە جگە لەوەی خوا ﷻ ئامادەی کردوە، دەنگی لێوە بێتەدەر، زمانیش مەیلەو بازنەییە، تاکو بتوانێ ئەو هەواو دەنگە بکات کە لە قورقوڕاگەوە دێ، هاوکاریی بکات و پیتەکان و وشەکان لە زاردا دروست بکات، ئنجا لە نێو قورقوڕاگەدا چەند شێوەیەکی تەسک و فراوان و زبرو لووس و ... هتد، هەن، بۆ ئەوەی بە پێی ئەوە مرۆڤ هەر کات بیەوێ دەنگ هەڵێنێ، یان دەنگ نزم بکاتەوە، یان بە چپە قسە بکات، یاخود بەپێی مرۆڤەکان، دەنگی ئافرەت جۆرێکە، هی منداڵ جۆرێکە، هی پیاوی بە تەمەن جۆرێکە، شێوەی دروستکرانی قورقوڕاگە، ئەوانەی هەموویان تێدا ڕەچاو کراون و، جیاوازیی دەنگەکان لە جیاوازیی قورقوڕاگەو سندوقی دەنگەکانەوەیە، ئێمە وەک چۆن دەتوانین دوو وێنەی دوو مرۆڤان لە یەک جیا بکەینەوە، دەتوانین دوو دەنگی دوو مرۆڤانیش لە یەک جیا بکەینەوە.

١٣)- دەستەکان: ئنجا با تەماشای دەستەکان بکەین: دەست لە چەند بەشێک پێک هاتوە: لە لەپی دەست و باسک و، قۆڵ و، شان پێکهاتوە، لەپی دەستیش لە پێنج پەنجە پێک هاتوە، هەر کام لە پەنجەکان لە چەند بەشێک پێک هاتوە، پەنجەی گەورە بە دەورەی هەر چواریاندا دەسووڕێ، دەستی مرۆڤ بۆ خۆی یەکێکە لە شتە زۆر سەرسووڕهێنەرەکان، مرۆڤ دەتوانێ بە دەستی خۆی چەندان قورەکار ئەنجام بدات،

بۆ وێنە: ئەگەر پانی بکات، دەگونجێ شتی لەسەر دابنێ، ئەگەر کۆی بکاتەوە، دەگونجێ شتی تێ بکات، لە جیاتی کەوچک، ئەگەر خڕی بکاتەوە، دەتوانێ وەک ئامرازێک بۆ لێدان بەکاری بێنێ و، دەتوانێ پەنجەکانی لێک جیابکاتەوەو وەک شەنە بەکاری بێنێ.

١٤)- نینۆکەکان: ئنجا با تەماشای نینۆکەکان بکەین کە لە کۆتایی پەنجەکان دان: هەم جوانیین بۆ دەست و پەنجەکان، هەم ئەگەر ئینسان بیهێنێتە بەرچاوی خۆی، ئەو پەنجانە کۆتاییەکانیان نینۆک نەبووانایە، دەزانن چەند ناخۆش دەبوو! جاری وا هەیە ئینسان نینۆکێکی دەکەوێ، بەو پەنجەیەی شتی پێ ناگیرێ، شتی پێ ناخورێ و، ئینسان ئەگەر بیەوێ شتێک هەڵگرێتەوە، بە هۆی نینۆکەکانیەوە کە بە پەنجەکانەوەن دەتوانێ شت هەڵگرێتەوەو، هەروەها ئینسان ئەگەر بیەوێ ئەندامێکی شوێنێکی خۆی بخورێنێ، بەهۆی نینۆکەوە دەتوانێ و، لە ڕاستییدا بە هۆی نینۆکەوەیە ئینسان دەتوانێ بزانێ داخۆ کوێی خۆی بخورێنێ؟ وەک عەرەب دەڵێن: (ما حَكَّ ظَهْرَكَ مِثْلُ ظفرِكَ)، هیچ شتێک وەک نینۆکی خۆت پشتی نەخوراندووی، ئنجا نینۆکەکان وان کە درێژو کورت بێن و، مرۆڤ بتوانێ دەستکارییان بکات، کورتیان بکات، درێژیان بکات.

١٥)- دروستکرانی لە سێ تاریکییان دا: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَـٰتٍ ثَلَـٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾، ئینسان ئەگەر بهێنێتە بەرچاوی خۆی لە سێ تاریکاییدا، خوا ﷻ ئەم هەموو وردەکارییەی کە ئێمە هەروا شتێکی سادەمان لێ باسکرد، شتێکی سەرکێڵ و ڕووکەشمان لێ باسکرد، لە نێو سێ تاریکاییاندا، خوا ﷻ بۆ هەر کام لە مرۆڤەکان ئەو هەموو وردەکارییانە دەخوڵقێنێ، ئنجا هەر کامێک لە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی تایبەت دەخوڵقێنێ، کە لە هەموو شتێکی دا جیا بێ لە ئەوانی دیکە، بۆ ئەوەی هیچ مرۆڤێک نوسخەیەکی دیکەی دووەمی نەبێ لە گەردووندا، لە ئادەمەوە تا دوا مرۆڤ، کە لەسەر زەوی دەژی، هەر مرۆڤێک بۆ خۆی نوسخەیەکی سەربەخۆیە.

مەسەلەی سێیەم:

**خـوا ﷻ بێنیـازە لـە بێبڕوایـی و سپڵەیی مرۆڤـەکان، بـەڵام بێبڕوایـی و سـپڵەییانی پـێ ناپەسـندە، لـە حاڵێکـدا کـە سوپاسـگوزارییان و، بەندایەتییـانی بـۆ خـۆی پـێ شـتێکی پەسـندو چاکـەو، هیـچ گوناهبارێکیـش گوناهـی کـەسی دیکـە هەڵناگـرێ و، گەڕانـەوەش تەنهـا بـۆ لای خـوای پـەروەردگارە، خـوا هەواڵیـان پـێ دەدات بـە کردەوەکانیـان، چونکـە بـە نهێنیـی نێـو سـینەکانیان زانایـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ﴾، ئەگەر ئێوە بێبڕوابن، بە دڵنیایی خوا لێتان بێنیازە، ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و لە بێبڕوایەکانە، یاخود لێرەدا: ﴿ تَكْفُرُوا ﴾، بە مانای سپڵەیی و ناسوپاسییە، کوفرانی نیعمەت، واتە: ئەگەر ئێوە سپڵەیی و ناسوپاسیی بکەن، بە دڵنیایی خوا دەوڵەمەندەو، بێنیازە لە ئێوە، واتە: پێویستیی بە ئێوە نیەو، حەوجێتان نیەو، نە حەوجێی بڕواهێنانتانەو نە حەوجێی سوپاسگوزارییتانە، چونکە ئەوە ئێوەن کە پێویستییتان بەوە هەیە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، ئێوەن پێویستییتان بەوە هەیە بڕوا بە خوا بێنن و، خوا بە تەنیا بپەرستن، ئێوەن کە بەهرەمەند دەبن لە بەندایەتییتان بۆ خواو، بە پێچەوانەوە زیانبار دەبن لە بەندایەتیی نەکردنتان بۆ خواو، سپڵەیی و ناسوپاسییتان بەرانبەر بە خوا.

**٢)-** ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ﴾، بەڵام خوا ﷻ بۆ بەندەکانی کوفریان بۆ پەسند ناکات، کوفری بۆ ئەوان پێ باش نیە، (کفر)یش یان بە مانای بێبڕوایی دێ، یان بە مانای

سپڵەیی (کفران)، واتە: ناسوپاسیی و سپڵەیی بۆ بەندەکانی بە پەسند نازانێ، وشەی (لِعِبَادِهِ) لێرەدا بە دوو واتا دێ:

أ- دەگونجێ بڵێین: خوا کوفری بۆ بەندە بڕوادارەکانی، یان کوفرانی بۆ بەندە بڕوادارەکانی پێ پەسند نیە، حەزی لێ ناکات.

ب- (لِعِبَادِهِ) واتە: تێکڕای مرۆڤەکان بە بڕوادارو بێبڕواوە، ئەوەش پەیوەندیی بەوەوە هەیە: ئایا مەبەست لە (رِضَى) ویست و خواستی خوای پەروەردگارە، یان مەبەست پێی حەز لێکردن و خۆشویستنی و پەسندکردنی خوایە بۆ شتێک، بەڵام زیاتر وابێدەچێ مەبەست لە (رضى) پەسندکردن و خۆشویستن بێ، کە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، گرنگ ئەوەیە ئەم ڕستە قورئانییە، هەردوو واتایەکان هەڵدەگرێ، دەگونجێ (عِبَاد) مەبەست پێی تێکڕای مرۆڤەکان بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی بەندە بڕوادارەکان بێ، وشەی: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ ﴾، کە دواییش دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾، ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن بۆتانی پەسند دەکات و، پێی خۆشە بۆتان، (**الرِّضَى: حَالَةٌ نَفْسَانِيَّةٌ تَعْقُبُ حُصُولَ مُلَائِمٍ مَعَ ابْتِهَاجٍ بِهِ، وَهُوَ غير مَعْنَى الْإِرَادَةِ، وَعَكْسُ الرِّضَى السُّخْطُ، وَعَكْسُ الْإِرَادَةِ الْإِكْرَاه، وَالرِّضَى أَمِيَلُ إِلَى الْمَحَبَّةِ**)، ئەوە ڕای یەکێک لە ڕوونکراوەکانی قورئانەو، منیش پێم پەسندە.

دەڵێ: (رِضَى) حاڵەتێکی دەروونییە کە لە ئەنجامی گونجانی شتێک لەگەڵ مرۆڤدا پەیدا دەبێ، لەگەڵ پێ شادمان بوونیداو، (رِضَى) جیایە لە ویست، چونکە پێچەوانەی (رِضَى) بریتیە لە تووڕەیی، لێی ڕازییە، پێچەوانەکەی لێی تووڕەیە، لێی پەستە، بەڵام پێچەوانەی ویست، ئەوەی ویست، یاخود ئەوەی نەویست، بەو واتایە کە بە ویستی خۆی کردی، یان بەناچاریی (إِكْرَاه) پێی کرا، ئنجا (رِضَى) لەگەڵ خۆشویستن و حەزلێکردندا، زۆر تێکەڵکێش و لێک نزیکە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ﴾، مانای ڕاستری بە بۆچوونی من ئەوەیە، کە خوا ﷻ کوفری بۆ بەندەکانی پێ پەسند نیە، واتە: بۆ تێکڕای

بەندەکان، حەز ناکات ڕوو لە کوفرو بێبڕوایی، یان لە سپڵەیی و ناسوپاسیی بکەن.

٣)- ﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾، (ئەی مرۆڤەکان!) ئەگەر ئێوە سوپاسگوزاریی بکەن (بۆ خوا ﷻ)، ئەوەی بۆ ئێوە حەز لێیەو پێی پەسندەو، پێی خۆشە، کەواتە: دەبێ (رِضَى) لە ویست جیا بێت، چونکە هەر شتێک خوا نەیەوێ، نایەتە دی، ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ﴾، ئەگەر مەبەست: (لَا يُرِيْدُ لِعِبَادِهِ الْكُفْر) بووایە، واتە: کوفری بۆ بەندەکانی ناوێ، بێگومان بەبێ ویستی خوا کوفر پەیدا نابێ، کەواتە: دەبووایە هەرگیز کوفر لە بەندەکاندا پەیدا نەبێ!! بۆیە هەندێکیان گوتوویانە: (عباد) لێرەدا مەبەست پێی بەندە بڕوادارەکانن، واتە: خوا نەیویستوە بەندە بڕوادارەکانی کوفریان تێدا پەیدابێ، یان کوفرانیان تێدا پەیدابێ، بەڵام وەک باسمانکرد (رِضَى) غەیری ویستن (إرادة)ەو، ویستنیش دوو جۆرە:

أ- ویستی هێنانە دی. ب- ویستی بەرنامەیی.

بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ١٨٥﴾البقرة، ئەم ئیرادەیە ئیرادەی تەشریعییە، چونکە دوای باسی مۆڵەت هەبوون بۆ بابای ڕۆژووگر لە ڕەمەزاندا، کە ئەگەر بە سەفەرچوو، یان نەخۆش بوو، بۆی هەیە بەڕۆژوو نەبێ، لەو سیاقەدا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ١٨٥﴾البقرة، خوا ﷻ ئاسانیی بۆتان دەوێ و، زەحمەت و قورسیی بۆتان ناوێ.

ئنجا لێرەدا ئەگەر مەبەست پێی ئیرادەی کەونیی و قەدەریی بووایە، دەبووایە مرۆڤەکان هەمیشە لە خۆشیی و ئاسانیی دابوونایەو، هەرگیز تووشی زەحمەتیی نەبوونایە، بەڵام نا، مەبەست لە ویستن (إرادة) لێرەدا ئیرادەی شەرعییە، واتە: خوا لە شەرعی خۆیداو لە بەرنامەی خۆیدا، قورسیی و زەحمەتیی لەسەر ئێوە دانەناوە، بەڵکو ئاسانیی بۆ داناون، شتێک کە لە تواناتاندا هەیە، بۆیە

مانای ڕاستتر ئەوەیە کە لێرەدا (رِضَی) غەیری ئیرادەیە، واتە: پێ خۆش بوون و حەزلێکردن و پەسندکردن، کە دەفەرموێ: (لِعبادە) واتە: بۆ تێکڕای مرۆڤەکان، بەڵکو تێکڕای مرۆڤ و جند، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ ﴾الذاریات، واتە: خوا بۆ هەموو بەندەکانی بە مرۆڤ و جندەوە ڕازیی نیەو، حەز ناکات ملی کوفر بگرن، چ بە مانای بێبڕوایی بێ، چ بە مانای سپڵەیی، ﴿ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، خوا بۆتان پەسند دەکات و ئەوەی بۆ ئێوە حەز لێیەو، بۆ ئێوەی هەڵدەبژێرێ.

٤)- ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیچ گوناهـ هەڵگرێک، گوناهو قورسایی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، واتە: هیچ نەفسێکی گوناهکار، گوناهی نەفسێکی دیکە هەڵناگرێ، (أي: لَا تَحْمِلُ نَفْسٌ إِثْمَ نَفْسٍ أُخْرى).

٥)- ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ ﴾، دوایی بۆ لای پەروەردگارتانە گێڕانەوەتان و گەڕانەوەتان، دەڵێ: (ثُمَّ: للتَّرْتِيْب الرُّتْبِي، والتَّراخِي) وشەی (ثُمَّ) لێرەدا هەم بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، هەم بۆ ڕیزبەندیی بە دواداهاتنە، ئاوای لێدێتەوە: (أي: وَأَعْظَم مِنْ كَوْنِ الله غَنِيَّاً عَنْكُمْ، أَنَّهُ أَعَدَّ لَكُمْ الجَزَاءَ عَلَى كُفْرِكُمْ وَسَتُرْجَعُون إِلَيْهِ)، واتە: مەزنتر لەوەی خوا لە ئێوە بێ نیازە، سزاشی داناوە بۆتان لە بەرانبەر کوفرەکەتانداو، لەمەودواش دەگەڕێنەوە بۆ لای.

٦)- ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێدەدات بەوەی دەتانکردو ئەنجامتان دەدا، کە دەفەرموێ: هەواڵتان پێدەدا، کە ئەمە لە قورئاندا زۆر هاتوە، ئنجا ئەگەر خوا بفەرموێ: ئەوە گوناهەکەتە، مانای وایە ئەوەش سزایەکەیەتی، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێدەدا بەوەی دەتانکرد، هەر خودی هەواڵ پێدرانەکە بۆ خۆی، سزایەکی دەروونییە کە لە ڕۆژی دواییدا، خوا مرۆڤ ڕابگرێ لە بەردەم دادگای خۆیداو، بفەرموێ: ئەوە کوفرو بێبڕوایی و سپڵەیی و گوناهو تاوانەکانی تۆن!! هەر ئەوە بۆ خۆی سزایەکی دەروونییە، ئنجا دواییش بە تەئکید مادام کردەوەکان خراپ بن، سزاشیان لە بەرانبەردا هەیە.

ئەگەرنا: ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، مانایەکەی ئەگەر تەماشای سیاقەکە نەکەین، واتە: هەواڵتان پێدەدا (ئەی مرۆڤەکان!) بە هەمووتان بەوەی دەتانکرد، ئنجا ئەوەی چاکەی کرد بێ، هەواڵی چاکەو، ئەوەی خراپەی کردوە، هەواڵی خراپە، بەڵام بە سەرنجدانی سیاقەکە دەزانین کە مەبەست پێی بێبڕوایان و خراپەکاران و لادرانەو سزادرانیشیانە.

٧)- ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا) زانایە بە خاوەنی سینەکان، لێرەدا مەبەست لە (خاوەنی سینەکان) جاری دیکەش باسمانکردوە، بەڵام زیاتر ڕوونی دەکەینەوە: وشەی (ذَات): (مُؤنث)ی (ذُو)یە، (ذُو): (صاحب) هاوەڵ، (ذَاتِ): (صاحبة) ە، ئنجا کە دەفەرمویّ: ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، ئەم (ذَاتِ)ە، صیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، کە بەم شێوەیە: (إِنَّهُ عَلِيمٌ، بذات الصدور أَيْ: بِالْأَعْمَالِ صَاحِبَةِ الصُّدُورِ، أَيْ الْمُسْتَقِرَّةِ فِي النَّوَايَا، فَعَبَّرَ بِالصُّدُورِ عَمَّا يَحِلُّ بِهَا، وَالصُّدُورُ مُرَادٌ بِهَا الْقُلُوبُ الْمُعَبَّرُ بِهَا عَن بِالْعَزْمِ وَالإِرَادَةِ)، (ذَاتِ الصُّدُورِ): (ذَاتِ) واتە: هاوەڵ، (صُدُور) واتە: سینەکان، ئنجا (ذَاتِ) لێرەدا سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، واتە: (الْأَعْمَالِ ذَاتِ الصُّدُورِ) ئەو کردەوانەی کە هاوەڵی سینەکانن، واتە: ئەو نیازو مەبەستانەی کە لە سینەکاندا سەقامگیربوون و نیشتەجێ بوون، بە شێوەیەک وەک بووبنە هاوەڵی ئەو دڵ و سینانە، (صدُور)یش کە کۆی (صدر)ە، واتە: سینەو سینگ، مەبەست پێی ئەو دڵانەن کە لە نێو سینەکاندان، کە شوێنی بڕیاردان و جووڵانی مرۆڤن بەرەو خێر، یان بەرەو شەڕ.

وشەی (رِضَى) چاوگەو کردارەکەی بە (رَضِيَ، يَرْضَى) دێ، دەگوترێ: (رَضِيَ عنه) واتە: لێی ڕازیبوو، (رَضِيَ به) واتە: پەسندی کرد، (رَضِيَ لَهُ) واتە: بۆی پەسند کرد، (رَضِيتُ بِحُكْمِ فُلَان، أَي: أَحْبَبْتُهُ) واتە: ئەو حوکمی فلانکەسم پێ چاک بوو، دەتوانین بڵێین: ویستن و پەسند کردن (الإِرَادَة وَالرِّضَى) گشتیی و تایبەتیی (عام و خاص)ن، ویستن (إرادة) گشتییە، بەڵام پەسند کردن (رِضَى) تایبەتییە، خوا ﷻ بە گشتیی شتەکانی ویستوون، هەموو ئەوانەی کە ویستوویەتی پەیدابن، بەڵام لە نێو ئەو شتانەدا کە ویستوونی پەیدابن، لە هەندێکیان ڕازییە، ئەویش

ئەوانەن کە بە پێی شەریعەتی خوای پەروەردگارن، هەر بۆیە ناگونجێ بڵێی: (رِضَى) لەگەڵ (إرادة) یەکن، زانایان لەو بارەوە مشتومڕێکی زۆریان بووە، کە بە بۆچوونی من هەندێ لە مشت و مڕی زانایان خوا پاداشتیان بداتەوە، لەوەوە بووە کە باش چەمک و واتای وشەکانیان دیاریی نەکردوە، ئەگەرنا خوا ﷻ وشەی ئیرادەشی بەکارهێناوە، هەم ئیرادەی کەونیی و هەم ئیرادەی شەرعیی، هەروەها وشەی (رِضَى)شی بەکارهێناوە، بۆ وێنە: بە هاوەڵان دەفەرموێ: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ١٠٠﴾التوبة، ئنجا (رِضَى): چەمک و واتایەکی جیای هەیە لە (إرادة)، هەمیشە خوا ﷻ (رِضَى)ی خۆی بەستۆتەوە بەو شتانەوە کە موافیقی هەق و بەرژەوەندیی و چاکەن و بە پێی شەریعەتەکەینی، بۆ وێنە: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ٣﴾المائدة، واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون، یان لە بارەی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری ﷺ خاتەمەوە خوا لێیان ڕازی بێ، دەفەرموێ: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ١٠٠﴾التوبة، خواش لەوان ڕازییەو ئەوانیش لەو ڕازیین.

ئنجا لێرە کە دەفەرموێ: ﴿إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ﴾، ئنجا ئەگەر (رِضَى) بە مانای ئیرادەبێ، واتە: (وَلَا يُرِيدُ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ)، ئنجا ئەگەر خوا نەیویستبایە بەندەکان بێبڕوابن، کەس بێبڕوا نەدەبوو، بەڵێ ئەگەر بگوترێ: (رِضَى) مەبەست پێی ئیرادەی شەرعییە، واتە: خوا لە شەرعەکەیدا ویستی وانەبووە کە بەندەکانی کافربن، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر وابووایە ئەو کاتە خوا ﷻ لە جیاتی (رِضَى) وشەی (إرادة)ی بەکاردەهێنا، وەک لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ١٨٥﴾.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەراوردێک لە نێوان مرۆڤێکی بێ بار، کە لە کاتی زیان و نارەحەتییدا، پەنا بە خوا دەبات و لێی دەپاڕێتەوەو، هەر کاتێک خوا چاکەو نیعمەتێکی پێدا، هی پێشێی لە بیردەچێ و، هاوتایان بۆ خوا دادەنێ و، سەرەنجام خەڵکی لە ڕێی خوا لادەدات، لە بەرانبەریشدا مرۆڤێکی هەمیشە بۆ خوا ملکەچی نوێژکەری دڵ پڕ ترس و ئومێد، ئایا بابای زاناو نەزان وەک یەکن؟ زانایەک کە خوا پەرستەو، بۆ خوا ملکەچە، نەزانێک کە تەنیا لە تەنگانانەدا خوای بەبیردێتەوە؟ نەخێر، بەڵام جگە لە خاوەن عەقڵان پەند وەرناگرن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ﴾، هەر کاتێک مرۆڤ زیان و نارەحەتییەکی تووش بوو، بە گەڕانەوەوە بۆ لای پەروەردگاری لە ناخیەوە، لێی دەپاڕێتەوە.

(**الضُّرُّ: سُوءُ الحَالِ**)، (ضرّ) یانی: حاڵ خراپیی، ئنجا ئەو حاڵ خراپییە جاری وا هەیە نەخۆشییەو، جاری وا هەیە زیانی ماڵییەو، جاری وا هەیە گرفتێک لە دەوروبەریدایەو، جاری وا هەیە شتێکی مەعنەوییە، خەم و خەفەتە، جاری وا هەیە شتێکی ماددیی و بەرهەستە، هەمووی دەگرێتەوە.

وشەی (الإِنْسَان) لە: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ ﴾، (ال)ی سەر (الإِنْسَان) بۆ ناساندنی تێکڕا (جنس)ە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە تێکڕاییەکە، تێکڕاییەکی باوو عورفییەو، مەبەست پێی کۆمەڵێک لە خەڵکە، ئەوانیش هاوبەش بۆ خوادانەرانن، بۆچی؟ چونکە هەموو مرۆڤەکان لە کاتێکدا کە زیانیان تووش دەبێ، پەنا بۆ پەروەردگاریان نابەن و دواییش پشتی تێبکەن، بەڵکو تەنیا بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرەکان وان.

٢)- ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةً مِّنۡهُ ﴾، دوایی هەر کاتێک (خوا) لە لایەن خۆیەوە چاکەیەکی پێ بەخشیی، بۆچی نەیفەرمووە: (أَعْطَاهُ)، بەڵکو (خَوَّلَه)ی فەرمووە؟ (خَوَّلَهُ: أَعْطَاهُ مِنْ غَيْرِ عِوَضٍ، وَمَلَّكَهُ إِيَّاهُ مِنْ غَيْرِ مُقَابِلٍ)، (خَوَّلَهُ): واتە: پێی بەخشیی بەبێ قەرەبوو، بە بێ ئەوەی شتێکی لە بەرانبەردا هەبێ، چونکە نیعمەتانی خوا ﷻ کە بە مرۆڤەکانی بەخشیون، لە بەرانبەردا خوا ﷻ هیچیان لێ وەرناگرێ، چونکە خوا بێ نیازە لە مرۆڤەکان، کە دەشفەرموێ: نیعمەتەکانی من لە چاکەدا بەکاربێنن، یان: سوپاسگوزارییم بۆ بکەن، ئەویش هەر بۆ بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خواداو، لە چاکەدا، سوپاسگوزاریی کردن بۆ خواش لە بەرانبەر نیعمەتەکانیدا، هەر مرۆڤەکان خۆیان لێی بەهرەمەندن.

٣)- ﴿ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ ﴾، (ئەو مرۆڤە کاتێ خوا ﷻ چاکەیەکی لە لایەن خۆی پێدەبەخشێ)، ئەوەی کە پێشتر بۆی پاڕاوەتەوە لە بیری دەچێ، (عُدِّيَ يَدْعُو بـ «إلى» لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى الإِبْتِهَالِ وَالتَّضَرُّعِ)، ﴿ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ ﴾، دەیتوانی بفەرموێ: (يَدْعُوهُ مِنْ قَبْلُ)، یان (يَدْعُو لَه)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، (يَدْعُو) کە بە (إلى) بەرکاری خواستوە، مانای لێپاڕانەوەو کڕووزانەوەی خراوەتە نێو، مانای پاڕانەوەکە هەر هەیەو، کڕووزانەوەو لاڵانەوەشی خراوەتە نێو.

وشەی (مَا) لە ڕستەی: ﴿ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ ﴾دا، زانایان سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:

١)- ئەو زیان و ناڕەحەتییەی کە پێشتر بۆی لە خوا دەپاڕایەوە، کە لە کۆڵی بکاتەوە، ئەوەی لە بیرچۆوە.

٢)- ئەو پاڕانەوەیەی کە پێشتر پێی دەپاڕایەوە لە خوا، ئەوەی لە بیرچوو.

٣)- خوای لە بیر چوو.

کەواتـە: یـان زیانەکـەی لـە بیـر چـوو، یـان پاڕانەوەکـەی خـۆی لـە بیـر چـوو، یاخـود ئـەو خوایـەی کـە لێـی دەپاڕایـەوە لـە بیـری چـوو، هـەر سـێ واتـاکان گونجـاون.

بـەڵام زیاتـر وایێدەچـێ مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ، ئـەو زیـان و ناڕەحەتییـەی کـە پێشـتر بـۆی دەپاڕایـەوە لـە بیـری چـوو، دوای ئـەوەی کەوتـە فەرحانیـی، کاتی تەنگانـەو ناڕەحەتییەکـەی فەرامـۆش کـرد.

٤)- ﴿وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا﴾، ئنجا هەر بە ئەوەندەش وازی نەهێنا کە ئەوەی پێشێی لە بیر بچێ، بەڵکو: هاوتای بۆ خوا دانان.

(أَنْـدَاد) کـۆی (نِـدّ)ە، بـە مانـای (کُـفء)ە واتـە: هاوتـا، شـتانێک کـە بهێنرێنـە ئاسـتی خـواو ڕێـزی خـواو، وەک خـوا ﷻ مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـرێ، ئنجـا بۆچـی وایکـرد؟

٥)- ﴿لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾، تاکو لە ڕێی خوا لابدات، خوێنراویشەتەوە: (لِيَضِلَّ)، بۆ ئەوەی خۆی لە ڕێی خوا لابدات، ئەم (ل)ە، چ (لِيُضِلَّ)بێ، یان (لِيَضِلَّ) بێ، واتە: خەڵک لابدات، یان خۆی لابدات، پێی دەگوترێ: (لَام التَعْلِيْل الَمجَازِي)، لامی هۆکار دۆزییە، بەڵام بە مەجاز، چونکە لە ڕاستییدا مەبەست پێی سەرەنجامە، (لِإنَّ الإِضْلَالَ لَمّا كَانَ نَتِيْجَة الجَعْل، جَازَ تَعْلِيْلُ الجَعْلِ بِهِ، كَأَنَّهُ هُوَ العِلَّةُ الجَاعِل)، لەبەر ئەوەی گومڕاکردنە دەرەنجامی ئەو هاوتا بۆ خوادانانە بووەو، لە ئەنجامی ئەوەدا هاوتای بۆ خوا داناون، کە گومڕا بووە، یانی: هەر لە بناغەدا ویستوویەتی گومڕابێ، یان خەڵک گومڕا بکات، بۆیە هاوتای بۆ خوا

داناون، بەڵام لە ڕاستییدا ئەو مەبەستی ئەوە نەبووە، بەڵکو سەرەنجامەکەی وابووە بۆیە پێی دەگوترێ: (لَام العَاقِبة)، واتە: بە ڕواڵەت (لَامُ العِلّة)یە، بەڵام لە ڕاستییدا دەبێتە لامی سەرەنجام، هەروەک لە سووڕەتی (القصص)دا، خوا ﷻ لە بارەی (آل فرعون)، دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ ﴿٨﴾﴾القصص، واتە: بنەماڵەی فیرعەون مووسای مەلۆتکەیان (لە صندووقەکەدا) هەڵگرتەوە، تاکو سەرەنجام بۆیان ببێتە دوژمن و مایەی خەفەت و ناڕەحەتیی.

بە تەئکید ئەوان بۆ ئەوەیان هەڵنەگرتبۆوە، بەڵام یانی: سەرەنجام وای لێ بێ.

٦)- ﴿قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: یان بە هەر کەسێک کە بابایەکی وا ببینێ، دەفەرموێ: تۆ بڵێ: ماوەیەکی کەم بەهرەمەندبە بە کوفرەکەت، (التَّمَتُّعُ: الإِنْتِفَاعُ المُؤَقَّتُ)، (تمتع) بەهرەمەند بوونێکی کاتییە، ئنجا ئایا ئەو بەهرەمەندبوونە لە کوفر، چۆنە؟ لە ئەنجامی کوفرو بێبڕوایی دا، مرۆڤ ڕێی گوناهی بۆ تەخت و ئاچووخ دەبێ و، هەندێ بەهرەی دنیایی وەردەگرێ.

یاخود: (تَمَتَّعْ بِالسَّلَامَةِ زَمَنَ كُفْرِكَ)، واتە: خوا ﷻ مۆڵەتت دەدات، ئەو ماوە ژیانەی کە دەیگوزەرێنی بە کوفرەوە، خوا مۆڵەتت دەدا، مۆڵەت دانەکەی خوا کە دەتهێڵێ، ئەوە بەهرە وەرگرتنێکە، یاخود: بەهۆی کوفرەکەتەوە بەهرە وەربگرە لەوەی کە تام و چێژێکی جەستەیی، یاخود مەعنەویی حەڕام، وەردەگری لە کوفرەکەتدا، بەڵام بزانە کە ئەوە شتێکی کەمە.

٧)- ﴿إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾، بە دڵنیایی (دوایی) تۆ لە هاوەڵانی ئاگری، پیتی (مِنْ) لە ڕستەی: ﴿إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾دا، تۆ لە هاوەڵانی ئاگری، بۆ بەشێکە، چونکە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، بەشێکن لە خاوەنان و هاوەڵانی ئاگر، نەک هەموو هاوەڵانی ئاگر هەر ئەوان بن.

ئنجا خوا ﷻ بەراوردێک دەکات و دەفەرموێ:

٨)- ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا ﴾، یان ئایا کەسێک کە هەمیشە ملکەچە لە کاتەکانی شەوگاردا، بە کڕنووش بردووی و بە پێوە وەستاویی.

٩)- ﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، مەترسیی هەیە لە ڕۆژی دوایی.

١٠)- ﴿ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦ ﴾، بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریشیەتی.

لێرەدا زانایان دەڵێن: دەبێ لێرەدا شتێک قرتێنرابێ، واتە: ئایا کەسێک کە پێشتر باسکرا، کە تەنیا لە تەنگانانـدا خوای بە بیر دێتەوەو، لە خۆشییاندا خوای لە بیر دەچێتەوە، دوایی سەرەنجامەکەی خۆی یان خەڵک لە ڕێی خوا لادەدات، ئایا ئەوە باشترە، یاخود کەسێک لە کاتەکانی شەوگاردا بە کڕنووش بردوویی و وەستاویی بە ملکەچیی لە خزمەتی خوادا دەمێنێتەوەو، مەترسیی ڕۆژی دوایی هەیەو، بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریشیەتی، کامیان باشترە؟

وەڵامەکەی دیارەو، وشەی (أَمَّنْ) خوێنراویشەتەوە: (أَمَن) واتە: هەمزەی ئیستیفهام لەسەر (مَن)، ئەوی دیکەیان (أَمْ مَنْ)، بەڵام تێیدا دەغم کراوەو بۆتە (أَمَّن)، لە هەردوو خوێندنەوەکاندا پرسیارکردنەکە پرسیارکردنێکی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: بە تەئکید ئەوەی پێشێ لەگەڵ دوای ئەو، وەک یەک نین.

وشەی (آنَاء) کۆی (أَنِي)ە، وەک (أمْعَاء) کۆی (مَعِي)ە، (أقْفَاء) کۆی (قَفِي)ە، (أَنِي) بە مانای کات دێ و (آنَاء) کۆیەکەیەتی واتە: کاتەکان، وشەی (قَانِت) هەم بە مانای خواپەرست دێ و، هەم بە مانای ملکەچ دێ و، هەم بە مانای فەرمانبەر دێ بۆ خوا.

کە دەفەرموێ: ﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، (الحَذَرُ: الإحْتِرَازُ مِنْ مُخِيفٍ)، (حَذر): بریتییە لە وریابوون لە شتێکی مەترسییلێکراو، یاخود (خَوْفٌ مَعَ احْتِرَازٍ) ترسە لەگەڵ لە خۆ وریابوون و خۆپاراستندا.

ئنجا لە كۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ:

١١)- ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن، وەک یەکن؟ ئەمەش دیسان مەبەست پێی پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەیە.

١٢)- ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، بە دڵنیاییی تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن، بیردەکەنەوەو، هەق دەدۆزنەوە.

لێرەدا دەپرسین: بۆچی خوا ﷻ ئەو شێوازەی بەکارنەهێناوە کە بفەرموێ: (هَلْ يَسْتَوِي هَـٰذَا وَذَاكَ)؟

دەگوترێ: بۆ ئەوەی هاو کات لەگەڵ ئەوەی کە خوا عزوجل پرسیار دەکات، ستاییشی کۆمەڵی دوای ئەوە بکات و، زەم و سەرزەنشتی ئەوانی پێشێش بکات.

## قوڵە باسێک لە بارەی ترس و ئومێدەوە

لەو بارەوە کە خوا ﷻ باسی ئەو مرۆڤە دەکات، کە هەم ترسی هەیە، هەم ئومێدی هەیەو، هەم وریایی هەیە بەرانبەر بە ڕۆژی دوایی و مەترسیی هەیە، هەم ئومێدو هیواشی بە بەزەیی خوا هەیە، سەرەتا لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَقَالَ: «كَيْفَ تَجِدُكَ»؟ قَالَ: أَرْجُو اللَّهَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنِّي أَخَافُ ذُنُوبِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَوْطِنِ إِلَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ مَا يَرْجُو وَآمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ»} (أخرجه عبد بن حميد: ١٣٧٠، والترمذي: ٩٨٣، قَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، والنسائي في الكُبْرَى: ١٠٩٠١، وابن ماجه: ٤٢٦١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە پیاوێک وەژوورکەوت کە لە حاڵەتی مەرگدا بوو، (حاڵەتی گیانەڵا)، پێی فەرموو: چۆنی؟ ئەویش گوتی: ئومێدەوارم بە خواو لە گوناهەکانیشم دەترسێم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو دووە، (واتە: ئەو ئومێدو ترسە) لە حاڵێکی وەک ئەوەدا، لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆنابنەوە، مەگەر خوا ﷻ ئەوەی کە ئومێدی دەکات، پێی دەبەخشێ و، ئەوەش کە لێی دەترسێ دڵنیای دەکاتەوە.

لە بارەی ترس و ئومێدەوە کە پێویستە ئینسانی ئیماندار هەردووکیانی هەبن و وەک زانایانی تەزکیەی نەفس و، پسپۆڕانی بواری ڕەوشت و ئاکارەکان گوتوویانە: ترس و ئومێد ددبێ بۆ مرۆڤی بەرەو خوا چوو، وەک دوو باڵ وابن، وەک چۆن مەل بە دوو باڵان دەفڕێ، دەبێ ئینسانی خوا پەرستیش، هەم ترس و وریایی هەبێ، هەم ئومێدو چاوەڕوانییشی هەبێ و، لەو بارەوە حەوت خاڵان دەخەینەڕوو:

١)- ترس و ئومێد بە زاراوەی پسپۆڕانی بواری تەزکیە، لە مەقامەکانی بەرەو خواچووان، (مِنْ مَقَامَات السَّالِكِين)ن، لە زاراوەی ئەهلی تەزکیەو تەصەووفدا، (حال) هەیەو (مقام) هەیە، حاڵ ئەوەیە کە دێ و دەڕوات، بەڵام مەقام ئەوەیە کە دەمێنێتەوە، بۆ وێنە: (قَبْض وَبَسْط) واتە: دڵ وێکهاتنەوەو دڵکرانەوە حاڵە، بەڵام ترس و نومێد هەردووکیان مەقامن، چونکە بەردەوامن.

٢)- ئومێد، هیوا (رَجَاء): بریتیە لە چاوەڕوانیی کردنی شتێک کە نیعمەتێکی تێدایەو، گونجاوە لەگەڵ نەفسدا، بەڵام ترس (خَوْف) بریتیە لە چاوەڕوانیی شتێک کە نەفس پێی ناخۆشەو پێچەوانەی (رَجَاء)ە، (ئومێد) حاڵەتی ئەرێنیی هەیەو (ترس) حاڵەتی نەرێنیی.

٣)- ئومێد (رَجَاء) بۆ ئەوە پێویستە، کە مرۆڤ هانبدات بەرەو تاعەت و فەرمانبەرییەک کە مایەی ڕەزامەندیی خوایەو، ترس (خوف) باشییەکەی لەوەدایە کە مرۆڤ دەگێڕێتەوەو دەسڵەمێنێتەوەو دەپرینگێنێتەوە لە شتێک کە زیان و خراپیی تێدایەو، جێگای تووڕەیی خوای کارزانە، کەواتە: هەردووکیان پێویستن، مرۆڤ پێویستیی بە هاندەرێک هەیە بەرەو تاعەتێک کە جێگای ڕەزامەندیی خوایە، هەروەها پێویستیشی بە گێڕەرەوەیەک هەیە، لەو گوناهـ و تاوانانەی کە مایەی تووڕە بوونی خوای دادگەرن.

٤)- ترس و نومێد بۆ بابای (سالك)، واتە: کەسێک کە ڕێی خوای گرتووەو بەرەو خوا دەچێ، وەک دوو باڵی باڵندەیەک وان، کە پێیان بەرەو خوا دەڕوات، هەردووکیان پێویستن، ئنجا هی وایە حاڵەتی نومێدی بەسەردا زاڵ دەبێ و، هی وایە حاڵەتی ترس، بەڵام هەردووکیان هەر پێویستن کەم و زۆر.

٥)- دەبێ بزانرێ کە ئومێد واتە: ئومێد بە بەزەیی خواو، پاداشتی خوا، بەڵام ترس واتە: ترس لە سزای خوا، ئەگەرنا ترسەکەمان لە زاتی خوا نیە ﷻ، بەڵکو ترسمان هەیە لە سزای خوا، سزای خواش لە ئەنجامی کردەوە خراپەکانی خۆماندا، ئەوە زۆر گرنگە کە ئێمە بزانین، خوا ﷻ لە زاتی خۆیدا مەترسیلێکراو نیەو، ترسناک نیە، بەڵکو ئەوەی جێی مەترسییە بۆ ئێمە، سزای خوایە کە بە هۆی کردەوە خراپەکانی ئێمەوە پەیدا

دەبێ، بەڵام ئومێدو خۆشویستنی بەندە بۆ خواو بۆ زاتی خوایەو، بۆ سیفەتەکانیەتی، ئەگەر پاداشتیشی نەدابایەوە خوای پەروەردگارمان دەبووایە هەر خۆشویستبایەو، هەر ڕێزمان لێگرتبایەو، هەر بە گەورەمان گرتبایە، بەڵام ئەگەر لەبەر گوناهو خراپەکانی خۆمان نەباو، لەبەر سزاو تۆڵەی خوا نەبایە، زاتی خوا هیچ جێگای مەترسیی نیە.

٦)- کەسێک کە دەڵێ: من ئومێدەوارم و هیوام هەیە بە بەزەیی خوا، بەڵام لەسەر گوناهیش بەردەوامە، ئەوە لە ڕاستیدا پێی ناگوترێ: ئومێدەوار (راجي)، بەڵکو پێی دەگوترێ: خۆزگەخواز (مُتَمَنّي)، لەو بارەوەش ئەوەی لە حەسەنی بەصرایی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێردراوەتەوە، قسەیەکی جوانە، دەڵێ: (لَيْسَ الإِيْمَانُ بالتَّمَنّي وَلاَ بالتَّحَلّي، وَلَكِنْ هُوَ مَا وَقَرَ فِي القَلْبِ، وَصَدَّقَهُ العَمَلُ) واتە: ئیمان بە خۆزگە خواستن و قسەی شیرین کردن نیە، بەڵکو ئیمان ئەوەیە کە لە دڵدا دەچەسپێ و، کردەوەکان بەڕاستی دەزانن و، بەڕاستی دەگێڕن.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە کەسێک لەسەر گوناهان بڕوا، بۆی نیە بڵێ: من ئومێدەوارم، بەڵکو دەتوانێ بڵێ: من خۆزگە خوازم، ئەوەیە خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨ ﴾، واتە: بە دڵنیاییی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، ئەوانەی کۆچیان کردوەو تێکۆشاون لە ڕێی خوادا، ئا ئەوانە بە هیوای بەزەیی خوان و، خوا لێبووردەی بە بەزەییە.

٧)- هەبوونی ترس و سام بەرانبەر بە خوا ﷻ، واتە: سزای خواو، هەبوونی ئومێدو هیوا بە چاکەو نیعمەتی خوا، کە لە بەهەشتدا بەرجەستەیە، هەروەک چۆن سزایەکەشی لە دۆزەخدا بەرجەستەیە، ئەمە عادەتی عەوامان نیە، وەک هەندێک لە (أهل التصوف) گوتوویانە: کە ئەوە خەڵکی عەوامە بە تەمای بەهەشتی خوایەو، بەهەشت لە خوا ﷻ داوا دەکات و، لە دۆزەخەکەی دەترسێ! بەڵام ئەمە ڕاست نیە، چونکە بەهەشتی خوا بەرجەستەکەری ڕەزامەندیی خوایەو، دۆزەخیش بەرجەستەکەری تووڕەیی و

بەستیی خوای پەروەردگارە، کەواتە: ئەو قسەیە ڕاست نیەو، پێغەمبەریش ﷺ لە زۆر لە پاڕانەوەکانیدا، داوای بەهەشتی لە خوا کردوەو، پەنای بە خوا گرتوە لە دۆزەخ.

وەک لەم دەقەوە دیارە: جارێک یەکێک لە هاوەڵەکان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من ئەو گرمە گرمەی تۆو موعاز نازانم، (ئەو پاڕانەوە زۆرانەتان)، من بەس دەڵێم: خوایە! داوای بەهەشتت لێ دەکەم و، لە دۆزەخ بمپارێزە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: {حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ}[1]، واتە: ئەو گرمە گرمەی من و موعازیش هەر لەو بارەوەیە، هەر داوای بەهەشت دەکەین و، داوای پارێزران لە دۆزەخ لە خوای پەروەردگار دەکەین.

---

(١) {عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجُلٍ كَيْفَ تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: أَتَشَهَّدُ ثُمَّ أَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ النَّارِ، أَمَا إِنِّي لَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ وَلَا دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ حَوْلَهَما نُدَنْدِنُ} أخرجه أحمد: ١٥٩٣٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

## کورتە باسێک لە بارەی

## زانیاریی و زانایان و پلەو پێگەیانەوە

ئەم کورتە باسە لە سێ بڕگە پێک دێ:

**ا)- پێناسە:**

**أ)- زانیاریی: (العِلْمُ: هُوَ إِدْرَاكُ الشَّيءِ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْه، وَعَكْسُهُ أو وَضِدُّهُ الجَهْل)، واتە: (علم): بریتیە لە زانینی شتێک وەک ئەو شتە لە واقیعدا خۆی چۆنە ئاوا، پێچەوانەکەی یان دژی زانیاریی، بریتیە لە نەزانیی، (واتە: بێ ئاگایی و نائاشنایی بە شتێک وەک لە خودی خۆیدا هەیە).**

**ب)- زانایان: (العُلَمَاءُ: هُمُ الَّذِينَ لَهُمْ عِلمٌ فَهُمْ يُدرِكُونَ حَقَائِقَ الأَشْيَاءِ عَلَى مَا هِيَ عَلَيْهِ، وَتَجْرِي أَعْمَالُهُمْ عَلَى حَسْبِ عِلْمِهِمْ، وَعَكْسُهُمْ لاَ يُدْرِكُونَ الأَشْيَاءَ عَلَى مَا هِيَ عَلَيْه، بَلْ تَخْتَلِطُ عَلَيْهِمُ الحَقَائِقُ وَتَجْرِي أَعْمَالُهُمْ عَلَى غَيْرِ انْتِظَامٍ، كَحَالِ الَّذِينَ تَوَهَّمُوا الحِجَارَةَ وَغَيْرَهَا آلِهَةً)، (زانایان): ئەوانەن کە تێگەیشتنێکیان هەیە، ڕاستیی شتەکان و چییەتی شتەکان، وەک خۆیان کە لە واقیعدا لەسەرنی دەیزانن و، کردەوەکانیشیان بە پێی زانیارییەکەیان ئەنجام دەدەن، پێچەوانەی زانایان نەزانن، ئەوانەن کە چییەتی شتەکان نازانن، بەڵکو ڕاستییەکانیان لێ تێکەڵ دەبن و، کردەوەکانیشیان بەپێی زانیاریی نین، وەک ئەوانەی کە بە وەهم و گومان پێیان وابووە بەردو پەیکەرو، شتەکانی دیکە پەرستراون (و هێناویاننە ئاستی خوا).**

**لە ڕاستییدا چەمکی زانیاریی (علم) زۆر فراوانە، بەڵام دەتوانین بڵێین: زانیارییەکان بە گشتیی دەبنەوە بە دوو بەش:**

أ)- (العُلُومُ الدينية):

ب)- (والعُلُومُ الدنيوية):

کە دەتوانین بەو شێوەیەش تەعبیریان بکەین: (العُلُومُ النَّقْلِيَّة والعُلُومُ العَقْلِيَّة)، دەشتوانین بڵێین: (عِلْمُ الوَحِي الشَّرْعِي، وَعِلْمُ العَقْلِي التَّجْرِيبِي).

واتە:

أ- زانیارییە ئاینییەکان و، زانیارییە دنیاییەکان.

ب- زانیارییە گوازراوەکان و، زانیارییە ژیرییەکان.

ج- زانیارییەک کە لە وەحیی خواوە سەرچاوە دەگرێ و، زانیارییەک کە لە عەقڵ و ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێ.

ئنجا زانیاریی بە گشتیی بەو دوو چەمکە بەرانبەرەی کە بە سێ تەعبیر هێناومانن و، بە هەموو چەمکەکانی دیکەی، زانیاریی، هەمووی شتێکی پەسندو خوازراوەو داواکراوە، ئنجا کە خوا ﷻ لە سوورەتی (طه)دا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: بڵێ: پەروەرگارم! زانیاریم بۆ زیاد بکە، دیارە هەموو جۆرەکانی زانیاریی گرتۆتەوە، هەموو ئەو زانیارییانەی مرۆڤ پێویستی پێن، بۆ دینداریەکی ڕێک و ڕاست.

(طنطاوي جوهري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] قسەیەکی جوان دێنێ، بە پێویستم زانی کە لە بارەی زانیاریی و زانایانەوە، بیهێنم، دەڵێ:

(وَعَلَى هَذَا التَّفْسِيْر يَكُوْنُ المُسْلِمُونَ اليَوْم قَدْ تَرَكُوْا مَوَاهِبَهُمْ وَعَطَّلُوْهَا وَأَنَامُوهَا، وَهَذَا نُزُولٌ مِنَ المُقَصِّرِيْنَ عَنْهُمْ عَنْ بَعْضِ خَصَائِصِ الإِنْسَانِيَةِ، لإِنَّ الحَيْوَانَ لَا قُدْرَةَ لَهُ عَلَى الصِّنَاعَاتِ، وَلَا العُلُومِ، وَقَدْ سَهَّلَ اللهُ لَهُ الرِّزْقَ وَلَمْ يُجَشِّمْهُ المَشَاقَ، فَوْقَ

---

(١) تفسير الجواهر، ج: ١٨ ص١٨٤.

طَاقَتَه، أَمَّا الإِنْسَانُ فَإِنَّهُ جَعَلَ رِزْقَهُ غَيْرَ مَيْسُوْر كَرِزْقِ الحَيْوَان، وَبَسَطَ لَهُ المَوَاهِبَ لِيَسْتَعْمِلَهَا، فَإِذَا قَصَّرَ فِيْهَا فَقَدْ تَنَزَّلَ إِلى الحَيْوَانِيَّةِ).

شایانی باسیشە: (طنطاوي) تەفسیرەکەی لە سێیەکی یەکەمی سەدەی بیستدا نووسیوەو، ئەو قسانەی لە ساڵانی بیستەکاندا نووسیون و گوتوون، دەڵێ: مسوڵمانان ئەمڕۆ ئەو وزەو توانایانەی خوا پێی بەخشیون و وازیان لێ هێناون و پەکیان خستوون و، خەواندوویانن، ئەوەش بە نسبەت ئەوانەوە کە کەمتەرخەمن، دابەزینیانە لە هەندێک لە تایبەتمەندییە مرۆڤایەتییەکانیان بۆ ئاستی ئاژەڵ، چونکە ئاژەڵ ناتوانێ پیشەو پیشەسازیی و کارو کردەوەو زانیارییەکان، وە دەست بێنێ، بۆیە خوا بژیوی بۆ ئاژەڵ ئاسان کردوەو، زەحمەتی نەخستووەتە سەر زیاد لە توانای خۆی، هەروەها بە زاری خۆی دەلەوەڕێ و هەر شتێک بێ دەیخوات، بەڵام مرۆڤ خوا بژیوەکەی بۆ ئاسان نەکردوە وەک بژیوی ئاژەڵ (گیا بێ، هەرچی بێ دایبێتێ و بیخوات)، بەڵکو کۆمەڵێک توانای پێداون کە ئەو توانایانەی خۆی بەکاربێنێ (بۆ پەیداکردنی بژیوی خۆی)، ئنجا کاتێک کەمتەرخەمیی دەکات لە بەکارهێنانی تواناکانی خۆیدا، مانای وایە خۆی بردۆتەوە ئاستی ئاژەڵ.

منیش دەڵێم: بەڕاستیی قسەکەی جوانە، هەر بۆیە کاتێک کە مسوڵمانانیش لە ئەنجامی بەکارنەهێنانی تواناکانی خۆیانەوەو، لە بەهرە وەرگرتن لە نیعمەتەکانی خواوە، لەسەر زەوی دوادەکەون، دێنەوە ئاستی ئاژەڵ، ئەوەتا زلهێزانیش وەک ئاژەڵ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، ئاژەڵ چۆنی مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرێ؟ لێیان دەخۆن، سەریان دەبڕن، بەکاریان دێنن، باریان لێ دەنێن، ئێستا مسوڵمانان بەداخەوە لە ئاستی بەرپرسانیاندا بە تایبەت، گوێیان بە دەستی ئەمریکاو جوولەکەو ڕووسیاو چین و شەرق و غەربەوەیە، خێرو بێریان لە خزمەتی ئەواندایە، خۆشیان لە خزمەتی ئەواندان و بۆیان بوونە بارەبەر.

هەروەها ئەوەشی دەخەمە سەرو دەڵێم: ئەگەر تەماشای واقیعی ئێستای مسوڵمانان بکەین، زۆر جوان ئەوە بەرجەستە دەبێ کە لە ئەنجامی ئەوەدا، مسوڵمانان ئەو تواناو وزانەی خوا پێیداون، پەکیان خستوون و بەکاریان نەهێناون، لە بەهرە وەرگرتن لە نیعمەت و چاکەکانی خوا، دەیانبینین بۆ غەیری خۆیان، وەک ناژەڵ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ و تەماشایان دەکرێ و بەکاریش دەهێنرێن بۆ بەرژەوەندیی ئەو کەسانەی خۆیان لێ کردوونە خاوەن.

## ٢)- پلەو ئیمتیازەکانی زانا بەسەر نەزاندا:

بۆ بابای زانا دە (١٠) پلەو ئیمتیاز هەن بەسەر بابای نەزاندا:

مەبەستمان زانایە بە گشتیی، چ لە دیندا زانابێ، چ لە ژین دا، چ بە وەحیی و پەیامی خوا زانا بێ، چ بە گەردوون و سروشت و دەوروبەرو بوونەوەر زانا بێ، واتە: چ زانیارییەکی هەبێ کە لە ڕێی وەحییەوە دەستگیری بووبێ، چ لە ڕێی عەقڵ و ئەزموونەوە دەستگیری بووبێ:

١)- زانا بە ئاسانیی پەی بە وەدەستهێنانی شتان دەبات، بەڵام نەزان، یان پەییان پێ نابات، یاخود دوای زەحمەتێکی زۆرو، بەرهەمێکی کەمیشی دەبێ، جاری واش هەیە لە جیاتی ئەوەی ئەو شتە وەدەست بێنێ، پێچەوانەی ئەو شتەی دەستگیر دەبێ، بە هۆی نەزانییەکەیەوە.

٢)- زانا لە خلیسکان و هەڵە پارێزراوە، بەڵام نەزان دەیەوێ سەلامەت بێ، کەچی دەکەوێ، پێشینانی خۆمان دەڵێن: «بەردێک نەزان بیهاوێتە گۆمێ، بە سەد زانا نایەتەوە دەرێ».

٣)- زانا بەهۆی ئاشکرابوونی خێرو شەڕانەوە، هۆگری ڕاستییان دەبێ و دڵی پێیان خۆش دەبێ، بەڵام نەزان بەهۆی نەزانییەکەیەوە، دژی ڕاستییەکان دەبێ، جاری وایە لەگەڵیشیاندا بەشەڕ دێ، دژیشییان دەوەستێ.

٤)- زانا بە هۆی زانیارییەکەیەوە، زۆر جاران لە خەڵک بێنیاز دەبێ، لە ڕووی دین و دنیاوە، بە ئەندازەی ئەوە کە زانیاریی و شارەزایی هەیە، بەڵام بابای نەزان چەندە نەزانییەکەی خەستتر بێ، هێندە زیاتر ئاتاج و نەداری ئەوانی دیکەیە.

٥)- زانا چێژ لە زانستەکەی وەردەگرێ، لە هەموو شتێکی دیکەی زیاتر، ئەو چێژەی کە ئینسانی زانا لە زانیارییەکەی خۆی وەری دەگرێ، کاتێک کە ڕاستییەکی بۆ دەردەکەوێ، کاتێ پەی بە حەقیقەتێک دەبات، ئەو چێژە مەعنەوییە، هیچ چێژێکی جەستەیی نایگاتێ.

٦)- زانا هەمیشە زیکری خێری دەکرێ لەدنیاو دوارۆژدا، بەهۆی شوێنەوارە باشەکانیەوەو، بابای نەزانیش یان ئەوەتا هەر ناوی دەسڕێتەوە، یان ئەوەتا ئەگەر باسیشی بکرێ، بە شەڕو خراپە باسی دەکرێ.

٧)- زانا لە کتێبی دابەزێنراوی خوا بەهرەمەند دەبێ، بۆ خۆی و بۆ کۆمەڵگاکەی، بەڵام بابای نەزان لە کتێبی دابەزێنراوی خوا، لە ڕووناکیی و بەرەکەت و هیدایەتی خوا بێ بەشە، چونکە بەهۆی زانیارییەوە، ئینسان دەتوانێ لە قورئان بەهرەمەند بێ، ئنجا چ زانیاریی زمان کە پێی تێبگەی، چ زانیاریی دیکە تاکو تۆ قەدری ئەو فەرمایشتەی خوا بزانی، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، دەزانن کە ئەوەی بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەقەو، خەڵک ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستاییشکراو.

٨)- زانا لە کتێبی گەردوون بەهرە وەردەگرێ و، یاساکانی دەدۆزێتەوە، بەڵام نەزان زۆرجار بەهۆی گەردوون و دیاردە سروشتییەکانەوە زەرەرمەند دەبێت، چونکە ئاشنا نیە بە یاساکانی خوا، تاکو بە شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ گەردووندا بکات، کە لە نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند بێ، زۆرجار باجی نەزانییەکەی خۆی دەدات، وەک چۆن کەسێک ژەهر بخوات، بە تەئکید دوایی باجەکەی دەدات، زۆرجار نەزان بە هۆی نەزانییەکەی خۆی مامەڵەیەکی هەڵە لەگەڵ گەردوون و سروشت و نیعمەتەکانی خوادا دەکات.

٩)- زانا هێزو توانایەکانی چەند بەرانبەر دەبنەوە بەهۆی زانستەکەیەوە، بە هۆی زانستەوە هێزو توانای مرۆڤ چەند بەرانبەر دەبێتەودو، نەزانیش بە پێچەوانەوە، ئەو هێزو توانایەش کە هەیەتی زەربی سفر دەبێتەوەو لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

١٠)- زانایەک چەندان نەزان دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئەگەر تەماشای واقیعی ئێستای مسوڵمانان بکەی، بەهۆی نەزانیی و دواکەوتوویانەوە، نەک هەر لە ئاستی خەڵک و جەماوەر، بەڵکو لە ئاستی بەرپرسانیان، زلهێزان بەکاریان دێنن و خێرو بێریان بە تاڵان دەبەن و، تەراتێن لە وڵاتیاندا دەکەن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەوان هەندێک زانیارییان هەیەو، زانیاریی گەردوونیی و، زانیاریی بە یاساکانی خواو، کە مسوڵمانان ئەو زانیارییەیان نیە، لە حاڵێکدا کە کتێبەکەیان لە مێژە لەسەری فەرز کردوون، کە دەبێ هەوڵبدەن تەماشای گەردوون بکەن و، تەماشای دەوروبەریان بکەن و، تەماشای خۆیان، تەماشای خواردنیان بکەن، تەماشای هەموو دیاردە سروشتییەکان بکەن و، بەهرەیان لێوەربگرن.

## ٣)- کەسێك زانا نەبێ لە عەقڵەکەی بەهرەمەند نەبووە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۝٩ ﴾الزمر، واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن، وەک یەکن، یان یەکسانن؟ تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

کەواتە: تەنیا خاوەن عەقڵان دەتوانن زانیاریی وەدەست بێنن، بە واتایەکی دیکە: کەسێک زانیاریی وەدەست نەهێنابێ، لە عەقڵەکەی خۆی، لە بیرو هۆشەکەی خۆی، لە توانا زاتییەکانی کە خوا پێیداون، بەهرەمەند نەبووە.

وشەی (تَذَكُّر)یش لە قورئاندا، دەگونجێ بە پەند وەرگرتن لێک بدرێتەوە، دەگونجێ بە دەرککردنی ڕاستییەکان، (تَذَكُّرُ الحَقَائِق) لێک بدرێتەوە، دەگونجێ بە بیرکرنەوە لێک بدرێتەوە، خاوەن عەقڵان بیردەکەنەوە، دەگونجێ بە پابەندیی بە فەرمانەکانەوەو دووریی گرتن لە قەدەغەکراوەکان، لێک بدرێتەوە.

خـو بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی، ئێمـە لـەو کەسانە بکێـڕێ کـە بـەو شێوەیە مەدحـی کـردوون، کـە خـاوەنی زانیارییـن و، عەقڵـی خۆیـان بەهـرە لـێ وەرگرتـوەو، خـوا ئـەو سـیفەتانەمان تێـدا بێنێتـە دی، کـە لـە زانایانێکـدا هـەن، لـە لای خـو پەسـندن، ئـەو زانایانـەی پێـش هەمـوو شـتێک ئـەو ڕاسـتییەیان بـۆ دەرکەوتـوە، کـە ئـەم گەردوونـە خاوەنێکـی هەیـەو، مرۆڤیـش جێنشـینی خـاوەنی گەردوونـەو، ئەمانـەی پێسـپێردراوەو، خراوەتـە نێـو تاقیکردنـەوەو، کـە بـە دڵنیایـی هـەر کەسێک ئـەو ڕاسـتییە دەرک نـەکات، لـە ڕاسـتییەکانی دیکـە بەهرەمەنـد نابێـت، خـو ئـەو ڕاسـتییەمان زیاتـر لـە عەقـڵ و دڵـدا قـووڵ بکاتـەوە، پـەروەردگاری خۆمـان چاکـتر بناسـین و زیاتـر پێـی ئاشنابین و، بەندایەتییەکـی ساغترو چاکتری بـۆ ئەنجام بدەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دوازدە (١٢) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٠ - ٢١)، لـە پێنـج ئایـەتی: (١٠و ١١و ١٣و ١٤و ١٥)دا، پێنـج جـاران وشـەی (قُـل) دووبـارە بۆتـەوە، واتـە: خـوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبـەر دەکات ﷺ بفەرمـوو، تـەوەری سـەرەکیی ئـەو دوازدە (١٢) ئایەتـەش بـاسی خـوا بـە یەکگرتنـەو، بـاسی شـیرکە، هەروەهـا بـاسی سـەرەنجامی خوا بـە یەکگرتـن و هاوبـەش بـۆ خـوا دانانـەو، هەندێـک لـە خەسـڵەتە بنەڕەتییـەکانی تەنیـا خواپەرسـتانی پارێزکاریـش خراونـە ڕوو.

لـە کۆتاییشـدا باسـی دیمەنێکـی سـەرنجڕاکێشی گـەردوون کـراوە، کـە هـاوکات بەڵگـەی تەنیایـی خـواو، ڕاسـتیی زینـدوو کرانـەوەی مردووانیشـە، ئەویـش دابەزێنرانی ئـاوو، ئەنبارکـرانی لـە کانیـی و سـەرچاوەکانی زەویـداو، پاشـان پـێ ڕوێـنرانی ڕووەک و دوایـی پێگەیشـتن و، سـەرەنجام وشـک بـوون و، کۆتایـی پـێ هاتنـی ڕووەک و شـینا وردەکان.

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ
وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ
مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى
عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِى ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ
ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾
لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ
﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ
يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟

ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ
ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ
بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کە بڕواتان هێناوە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن بۆ ئەوانەتان کە لەم (ژیانی) دنیادا چاکەیان کردوە، چاکەیەک (ی مەزن و ناوازە) هەیە (لە دنیاو دواڕۆژدا) سەرزەمینی خوا فراوانە (ئەگەر ڕێی چاکەکارییتان لێگیرا، کۆچ بکەن) بە دڵنیایی خۆڕاگران بەبێ ژماردن (بەبێ سنوور) پاداشتیان دەدرێتەوە، (بۆیە لەسەر ناڕەحەتییەکانی کۆچکردن خۆڕاگربن) ﴿١٠﴾ بڵێ: بێگومان من فەرمانم پێکراوە: کە بە ساغکەرەوەیی و گەردنکەچییەوە خوا بپەرستم ﴿١١﴾ هەروەها فەرمانم پێکراوە کە یەکەمینی ملکەچان بم (بۆ خوا) ﴿١٢﴾ بڵێ: مسۆگەر من ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەترسم ﴿١٣﴾ بڵێ: تەنیا خوا دەپەرستم و دینداریی خۆمم بۆ ساغکردۆتەوە (و خڵتەی شیرک و لادانم پێوە نەهێشتوە) ﴿١٤﴾ دەجا ئێوەش جگە لەو هەرچییەکتان دەوێ، بیپەرستن، بڵێ: بە دڵنیایی زیانباران (ی ڕاستەقینە) ئەوانەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا خۆیان و کەس و کاریان دەدۆڕێنن، ئەها (ئاگادار بن!) ئا ئەوە زیانباریی ئاشکرایە ﴿١٥﴾ لە سەروویان ئاگرە لەسەر یەک کەڵەکە بووەکان(ی سێبەرو هەور ئاسا) هەن و، لە ژێریشیانەوە (بە هەمان شێوە) ئاگرە کەڵەکە بووەکان هەن، ئەوەش خوا بەندەکانی پێ دەترسێنێ، دەجا

بەندەکانم! پارێزم لێ بکەن ﴿١٦﴾ ئەوانەش کە لە پەرستنی تاغووت دوورە پەرێزبوون و، لە ناخەوە بەرەو لای خوا گەڕاونەوە: مژدەو دڵخۆشیی (ەکی شایستە)یان بۆ هەیە، بۆیە مژدە بدە بە بەندەکانم ﴿١٧﴾ ئەوانەی گوێ بۆ هەموو قسەیەک هەڵدەخەن، (سەرەنجام) شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕاستە ڕێی کردوون و، ئا ئەوانەن عاقڵمەندان ﴿١٨﴾ ئایا کەسێک کە وشە (بڕیار)ی سزا (دران)ی بەسەردا چەسپاوە (و شایستەی چوونە نێو ئاگرە) ئایە تۆ دەربازکەری کەسێکی لە ئاگردابێ؟! ﴿١٩﴾ بەڵام ئەوانەی پارێزیان لە (سزاو جەزرەبەی دادگەرانەی) پەروەردگاریان کردوە، ئەوانە (لە بەهەشتدا) کۆشک و باڵەخانەکانیان هەن، لەسەروویانەوە باڵەخانە بیناکراوەکان هەن، ڕووبارەکانیان بە ژێردا دەڕۆن، ئەوە بەڵێنی خوایە، (بێگومان) خواش بەڵێنی خۆی دشکێنێ ﴿٢٠﴾ ئایا سەرنجت نەداوە کە خوا لەسەرێوە ئاوی دابەزاندوە، یەکسەر خستوویەتە نێو کانیی و سەرچاوەکانی زەمینەوە، دوایی کشتوکاڵ و هێناوردێکی ڕەنگ جۆراوجۆری پێ (لە زەوی) دەردێنێ، پاشان ئەو کشتوکاڵە هەراش دەبێ (پێدەگات)و دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، دوایی‌ش دەیکاتە پووش و پەڵاش تێکشکاو، بێگومان لەوەدا بیرخەرەوەو بەندێک(ی گەورە) هەیە بۆ خاوەن عەقڵان ﴿٢١﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُوَفَّ): (الـوافِي: الَّـذِي بَلَـغَ التَّـمَام)، وەردەگرێتـەوە بـە تەواویـی، (وَافِي) شـتێکە کـە تێـرو تـەواو بووبێ و، گەیبێتـە ئەنـدازەی تـەواو بـوون، (وَفَى بِعَهْـدِه، وَأَوْفَى: تَمَّـم بِعَهْـدِهِ وَلَـمْ يَنْقُـضْ حِفْظَـهُ)، (وَفَى بِعَهْـدِه، وَأَوْفَى بِعَهْـدِه) واتـە: پەیمانەکـەی خـۆی تـەواو کـردوەو پاراسـتنەکەی هەڵنەوەشـاندوە.

(ظُلَلٌ): (جَمْـعُ الظُّلَّـة: سَـحَابَة تُظِـلُّ كَقِطَـعِ السَّـحَابِ)، (ظُلَـل) کـۆی (ظُلَّة)یـە، بـە هەورێـک دەگوتـرێ کـە سێبەر بـکات، واتـە: ئـەو دووکەڵـە کەڵەکـە بـووەی سـەر دۆزەخ، یـان ئـەو ئاگـرە کەڵەکـە بووانـەی نێـو دۆزەخ، وەک پارچـە هـەور وان.

(ٱلطَّـٰغُوتَ): (عِبَـارَةٌ عَـنْ كُلِّ مُتَعَبَّـدٍ، وَكُلِّ مَعْبُـودٍ سِـوَى اللـهِ، وَيُسْـتَعْملُ فِي الوَاحِـدِ وَالجَمْـعِ)، وشـەی (طَاغُـوت): هـەر شـتێکە بـە پەرسـتراو گیرابـێ و، هـەر پەرسـتراوێکە جگـە لـە خـوا، وشـەی (طَاغُـوت) بـۆ تـاک و بـۆ کـۆش بـەکاردێ.

(غُرَفٌ): (جَمْـعُ غُرْفَـة: العُلِّيَّـةُ مِـنَ البِنَـاءِ، وَسُـمِّيَ مَنَـازِلُ الجَنَّـةِ: غُرَفَاً)، (غُـرَف) کـۆی (غُرْفَة)یـە، واتـە: باڵەخانـەو کۆشـک، کـە قـات لەسـەر قاتـە، مەنزڵـگاکانی بەهەشـت بـە (غُـرَف) ناوبـراون، لەبـەر ئـەوەی باڵەخانـەن، چەنـد قاتـن.

(فَسَلَكَهُۥ): (السُّـلُوكُ: النَّفَـاذُ فِي الطَّرِيـق)، (سُـلُوك): بریتیـە لـەوەی ئینسـان بچێتـە نێـو ڕێـگاوە، خـوا ﷻ ئـەو ئـاوەی کـە دایبەزانـدوە لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەرزەدا، خسـتوویەتە نێـو کانیـی و سـەرچاوەکانەوە.

(يَنَـٰبِيعَ): (النَّبْـعُ: خُـرُوجُ المَـاءِ مِـنَ العَـيْنِ، وَاليَنْبُـوعُ: العَـيْنُ الَّـذِي يَخْـرُجُ مِنْـهُ المَـاءُ)، (نَبْع): واتـە: دەرچـوونی ئـاو لـە سـەرچاوەو کانیـی، (يَنْبُوع)یـش، واتـە: ئـەو کانیـی و سـەرچاوەیەی ئـاوی لـێ دێتـە دەرێ.

(يَهِيجُ ): واتـە: پێدەگات، هـەراش دەبـێ، (هَاجَ البَقْلُ يَهِيجُ: اصْفَرَّ وَطَاب)، واتـە: زەردبـوو، پێگەیشـت، (بَقْلُ): هـەر شـتێك كـە لـە شـێوەی قاصۆڵیـاو، كەلـوو، ماشـە سـپیی و، ماشـە ڕەش و ئەوانـە دابـێ.

(مُصْفَرًّا): (ذُو اللَّوْنِ الأَصْفَرِ)، (مُصْفَرّ): زەرد هەڵگەڕاو، واتە: خاوەن ڕەنگی زەرد.

(حُطَٰمًا ): (الحَطْمُ: كَسْرُ الشَّيءِ، مِثْلُ الهَشْمِ وَنَحْوِهِ)، (هَشْم): واتـە: شـكاندن، (حَطْم): واتـە: تێكشـكاندن، مانایـان لێـك نیزیكـە، بـەڵام (هَشْم) زیاتـر بـۆ ئێسـقان بـەكاردێ، (وَالحُطَامُ: مَا يُتَكَسَّرُ مِنَ اليَبِسِ)، (حُطَام): ئەوەیـە كـە شـتێك تێـك شـكێنرابێ و وشـك هەڵگەڕابـێ، ئنجـا تێكشـكاوەكە پێـی دەگوتـرێ: (حُطَام)، وەك (فُتَات) واتـە: ئـەو پارچانـەی لـە شـتێك بەجـێ دەمێنـن و جیادەبنـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك پێشـتریش باسـمان كـرد لـە پێنـج ئایـەتێ: (١٠و ١١و ١٣و ١٤و ١٥)دا، جگـە لـە ئایـەتێ ژمـارە (١٢)، خـوا ﷻ پێنـج جـاران بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: بڵـێ: سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانـەم كـە بڕواتـان هێنـاوە! پارێـز لـە پەروەردگارتـان بكـەن.

دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەكانی پێشـێ دا، خـوا ﷻ بـەراوردی نێـوان مرۆڤـی بێبـڕواو مرۆڤـی بـڕواداری كـرد، كـە مرۆڤـی بێبـڕوا نەزانـەو، دوور لـە خوایـەو، بـە هەڵپەیـەو، خۆڕانەگـرە، بـەڵام مرۆڤـی بـڕوادار سـەقامگیرەو، دامـەزراوەو، ڕاوەسـتاوەو، زانایـەو، بەرچـاو ڕوونـە، دوای ئـەوە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانـەم كـە بڕواتـان هێنـاوە! پارێـز لـە پەروەردگارتـان بكـەن، واتـە: خۆتـان بپارێـزن لـە هـەر شـتێك كـە پەروەردگارتـان پێـی ناخـۆش بـێ،

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾، بۆ ئەوانەی چاکەیان لەم ژیانی دنیایەدا کردوە، چاکەیان بۆ هەیە، واتە: پاداشتێکی چاکیان بۆ هەیە، هەم لە دنیاداو، هەم لە دوارۆژدا.

دەشگونجێ: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾، ئەوانەی کە چاکەیان کردوە لەم ژیانە دنیایەدا، لەم ژیانە دنیایەدا چاکەیان بۆ هەیە، بەڵام مانای یەکەم بەهێزترە، ئەوانەی کە لەم ژیانی دنیایەدا چاکە دەکەن و چاکەیان کردوە، ئنجا چاکە بریتیە لە ئیمان و، کردەوەی باش و، هاوکاریی خەڵک و، مشوور لێخواردنی کۆمەڵگا، کە پابەندیی بە شەریعەتی خواوە هەموویان دەگرێتەوە، ئەوانەی چاکەیان کردوە لەم ژیانە دنیایەدا، چاکەیان بۆ هەیە، ئەو چاکەیەی کە بۆیان هەیە، یانی: هەم لە دنیادا چاکەیان دێتە رێ و، هەم لە رۆژی دواییدا، ﴿وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ﴾، سەر زەمینی خواش فراوانە، واتە: ئەگەر رێی چاکە کردنتان لە شوێنێک لێگیرا، ئەوێ بەجێبهێڵن زەوی خوا فراوانەو، بە زەوی خوادا بڕۆن.

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، ئنجا لەبەر ئەوەی ئینسان ئەگەر کۆچ بکات لە رێی خوادا، تووشی نارەحەتیی دێت، ئینسان کە لە ماڵ و حاڵی خۆی و لەسەر جێگەو رێگەی خۆی، لە خزم و کەسی خۆی، هەڵدەقەنێ، بە تەئکید بارودۆخی دەگۆڕێ و بە جۆرێکی دیکە دەبێ، دەچێتە نێو خەڵکێک کە نایانناسێ، یان بێگانەن، یان لە رووی جێگاو رزق و رۆزییەوە رەنگە لە شوێنی خۆی باشتر دەستی بۆ جووڵابێ، لەوێ تاکو بەرچاوی روون دەبێتەوەو، دەستی دەکرێتەوە، پێی دەچێ، بۆیە مرۆڤ پێویستیی بە خۆڕاگریی هەیە.

هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ بە ئاشکرا نەیفەرمووە، کۆچ بکەن، بەڵام کە دەفەرموێ: زەوی خوا فراوانە، واتە: بە زەوی خوادا بڕۆن، وەک لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ

﴿ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ ﴾، واتــە: ئەوانــەی کــە فریشــتەکان گیانیــان دەکێشـن لـە کاتێکـدا کـە ستەمیان لـە خۆیـان کـردوە، دەڵێـن: ئێـوە لـە چ حاڵێکـدا بـوون؟ دەڵێـن: ئێمــە چەوســێنراوە بوویــن لــە زەوی داو، بــێ دەســەڵات بوویــن، (بۆیـە ملکەچـی ئەهـلی کوفـر بوویـن، بـەڵام فریشـتەکان ئـەو پاسـاوەیان لـێ قبـووڵ ناکـەن، پێیـان دەڵێـن:) ئایـا سـەر زەمینـی خـوا فـراوان نەبـوو، کۆچـی تێـدا بکـەن؟! ئنجـا دوای ئــەوەی ئامــاژە دەکات بــە کۆچکــردن، یەکســەر دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، بـە دڵنیایـی خۆڕاگـران پاداشـتیان دەدرێتـەوە بەبـێ ژمـاردن، واتـە: بۆیـان ناژمێـردرێ، پاداشـتەکە هێنـدە زۆرە، پاداشـتێکی بـێ ئەژمـارو بـێ سـنووریان دەدرێتـەوە.

کەواتـە: دەربەسـت مەبـن، کـە تـووشی نارەحەتییـان بـوون و خۆڕاگربـن، چونکـە پاداشـتی بـێ ئەژمارتـان لـە بەرانبـەر خۆڕاگرییتانـدا هەیـە.

ئنجـا بـۆ جـاری دووەم دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾، خـوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکات، کـە بفەرمـوێ: مـن فەرمانـم پێکـراوە کـە خـوا بپەرسـتم و، ملکەچیـی خۆمـی بـۆ سـاغ بکەمـەوە، ﴿ مُخْلِصًا ﴾، واتـە: سـاغکەرەوەبم بـۆ وی، ﴿ ٱلدِّينَ ﴾، ملکەچیـی، (دِیـن) لێرەدا بـە مانـای ملکەچییـە، واتـە: فەرمانبەریـی خـۆم بـۆ خـوا سـاغ بکەمـەوەو، خڵتـەی شـیرک و بـە قسـە کـردنی غەیـری خـوا، بـە ملکەچییەکەمـەوە نەهێڵـم.

﴿ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، فەرمانیشـم پێکـراوە کـە مـن یەکەمینـی مسـوڵمانان بـم، واتـە: یەکەمینـی مسـوڵمانان لـە ڕووی کاتـەوە نـا، لـە ڕووی کاتـەوە دیـارە، پێغەمبـەر ﷺ یەکەمینـی مسـوڵمانانی ئوممـەتی خـۆی بـوو، لە ئەسـڵ دا ئیسـلام بـۆ وی هاتـوە، ئـەوە شـتێکی ئاشـکرایە، بـەڵام نـا، یەکەمینـی مسـوڵمانان واتـە: لـە هەمـوو کـەس زیاتـر بـۆ خـوا ملکـەچ بـم و، پابەندبـم بـە شـەریعەت و بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارەوە.

﴿ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، ئنجا بۆ جاری سێیەم خوا ﷻ فەرمانی پێ دەکات کە بڵێ: مـن دەترسێم ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن، وەک گوتم: ترسی مرۆڤەکان بەرانبەر بە خوا ﷻ، ترسانیانە لە سزاو ئازاری خوا، کە ئەویش بەهۆی کردەوە خراپەکانی مرۆڤەکانەوە دێتە دی.

ئنجا بۆ جاری چوارەم خوا دەفەرمێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴾، بڵێ: بەس خوا ﷻ دەپەرستم و، ملکەچیی خۆمی بۆ ساغ و یەکلایی دەکەمەوە، ساف و ساغی دەکەم و ساغیی دەکەم، خلتەی پێوە ناهێڵم.

﴿ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ﴾، ئێوەش جگە لەو، چی دەپەرستن، بیپەرستن، واتە: لێتان بێ منەتم، وەنەبێ خوا ﷻ پەکی لەسەر پەرستنی ئێوە کەوتبێ، ئێوە خۆتان پێویستییتان بەوە هەیە کە خوا بپەرستن، بۆیە ئەگەر خوا ﷻ ناپەرستن، ئەوە چی دەپەرستن بپەرستن، بێمنەت بن، هەم خوای پەروەردگار پێویستی بە پەرستنی ئێوە نیە، هەم منیش لە خۆتان و پەرستراوەکانتان بێباک و بێ منەتم.

ئنجا بۆ جاری پێنجەم خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، بڵێ: زیانباران ئەوانەن کە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، خۆیان و کەس و کاریان لە دەستداوەو، دۆڕاندوە، ﴿ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئاگاداربن! ئەها ئا ئەوەیە زیانباریی ڕوون و ئاشکراو، بێ پێچ و پەنا.

کە مرۆڤ هەم خۆی لە دەست بدات و، هەم کەس و کارو نزیکانیشی، ئەگەر هاوسەریەتی، ئەگەر باب و دایکیەتی، ئەگەر کورو کچیەتی، ئەگەر خزمی نیزیکیەتی، ئەگەر دۆست و ڕەفیقیەتی، کاتێک کە ئەو مرۆڤە دەچێتە دۆزەخ، ئەوانی دیکە چ لە دۆزەخ دابن، چ ئەوان بچنە بەهەشت، مانای وایە لێک دادەبڕێن.

﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ﴾، ئنجا باسی ئەو زیانبارییە ڕوون و ئاشکرایە دەکات کە چییە؟ دەفەرموێ: بۆ ئەوان هەیە لەسەروویانەوە

چەنـد سـێبەرێک لـە ئاگـر، ﴿ظُلَلٌ﴾ کـۆی (ظُلَّة)یـە، (ظُلَّـة)ش هـەر شـتێکە سـێبەرت لـێ بـکات، واتـە: ئاگرەکـە لەسـەریەک کەڵەکـە بـووەو، سـێبەری کـردوە، ﴿وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾، لـە ژێریشـیانەوە دیسـان چەنـد پارچـە ئاگرێکـی کەڵەکـە بـوو هـەن، سـێبەریان کـردوە، ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ﴾، ئـەوەش ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ بەنـدەکانی پـێ دەترسـێنێ.

واتـە: هۆشـدارییان پێـدەدات، کـە ئەوەتـان لـە ڕێ دا هەیـە، ئـا ئـەوە چاوەڕوانییتـان دەکات، ئەگـەر بێـت و بـێ وەفـاو سـپڵەبن بەرانبـەر بـە خـوا، ئەگـەر بێـت و بدۆڕێـن، ئەگـەر بێـت و لـە ژیـانی دنیاتانـدا ئـەو حیکمەتەی کـە خوا بـۆی خوڵقانـدوون، نەیهێننە دی، کـە بەندایەتییـە بـۆ خـوا، ﴿يَا عِبَادِ فَاتَّقُونِ﴾، ئـەی بەندەکانـم! پارێـزم لـێ بکـەن، واتـە: پارێـز لـە سـزاو ئازارەکـەم بکـەن، کـە بـە هـۆی خراپـەکانی خۆتانـەوەو، بـە هـۆی کوفـرو لادان و تـاوانی خۆتانـەوە، ئـەو سـزاو ئازارەتـان بـۆ دێتـە پێـش.

ئنجـا لـە دوای ئـەوان، بـاسی ئیماندارانێـک دەکات کە خاوەن عەقڵ و تێگەیشـتوون، هۆشـیارو بێدارن، دەفەرمـوێ: ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا﴾، ئەوانەی خۆیان لـە تاغـووت بـە دوورگرتـوە کـە بیپەرسـتن، کـە لێـرەدا (طاغـوت) بـە مانـای کۆیەکـەی بەکارهاتـوە، چونکـە دەفەرمـوێ: ﴿أَن يَعْبُدُوهَا﴾[1]، تاغووتیـش هـەر کەسێکە کـە لـە یاخییبـوون و سـەرپێچیی کـردن لـە خـوادا سـنووری بەزاندبـێ، ئەوانـەی خۆیـان دوور دەگـرن لـە تاغـووت کـە بیپەرسـتن، ﴿وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ﴾، گەڕاویشـنەوە بـۆ لای خـوا، لـە ناخـەوە، ﴿لَهُمُ الْبُشْرَىٰ﴾، ئـا ئەوانـە شـادمانیی و دڵخۆشـیی و موژدەیـان بـۆ هەیـە، چ جـۆرە موژدەیـەک؟! ﴿لَهُمُ الْبُشْرَىٰ﴾، (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە، واتـە: تێکـڕا (جنـس)ی مـوژدەو، هەرچـی مانـای تـەواوی مـوژدەی تێدابێـت و، دڵخۆشـیی تێدابێـت بـۆ ئەوانـە، ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ﴾، تـۆش مـوژدە بـدە بـە بەندەکانـم.

---

(١) چونکـە وشـەی (طاغـوت) لـە زمانـدا نێرینـە (مذکـر)ی مەجازییـە، بۆیـە کـە ڕانـاوی مێینـە (مؤنـث)ی بـۆ بەکارهاتـوە (أن یعبدوهـا)، کەواتـە: (طاغـوت) لێـرەدا کـۆ (جمـع) یـە نـەك تـاك.

﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ ﴾، ئەوانـەی گـوێ بـۆ هەمـوو قسـەیەک هەڵدەخـەن، بـەڵام شـوێن باشـترینی دەکـەون، واتـە: چـاو ورد دەکەنـەوەو، گـوێ هەڵدەخـەن و، سـەرنج دەدەن، ئـەوە نیـە کـە عەقڵـی خۆیـان بکەنـە سـەبەتەیەک، هـەر شـتێک تێـی بکرێ، وەریبگرن، بەڵکـو عەقڵییـان کردۆتـە بێژینگێـک و شـت لـە بێژینـگ دەدەن، هەڵیدەسـەنگێنن لـە مەحەکـی دەدەن و کامـەی چاکـتر بـێ، ئـەوە تەبەنییـی دەکـەن و شـوێنی دەکـەون، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئـا ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە خـوا ﷻ خسـتوونیە سـەر ڕاسـتە ڕێ (نـەک ڕێنمایـی کـردوون)، چونکـە خـوا ﷻ هەمـووی هـەر ڕێنمایـی کـردوون، بـەڵام ئـەو مرۆڤانـەی خـوا ڕێنماییـان دەکات، بەشـێکیان ڕێنماییەکـەی خـوا وەردەگـرن و تەبەنییـی دەکـەن، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ڕاسـتە ڕێ دەبـن، بـە ئامانـج دەگـەن و، بـە مـراد دەگـەن، وەک خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾فصلـت، واتـە: ئێمـە گـەلی سـەموودمان ڕێنمایـی کـرد بـوو، بـەڵام کوێرییـان هەڵبـژارد بەسـەر بـەر پێـی خـۆ دیـتن و، بـە ئامانـج گەیشـتن دا، بـە نسـبەت ئیماندارانیشـەوە لـە سـوورەتی (محمـد)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی ڕێنمایـی خوایـان وەرگرتبـوو، خـوا ﷻ بەرچـاوی ڕوونیـی بـۆ زیـاد کـردن، پارێزکاریـی کـە بـۆ ئـەوان شایسـتەیە، پێـی بەخشـین.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی کـە ئـاوان، گـوێ بـۆ هەمـوو قسـەیەک دەگـرن، بـەڵام شـوێن باشـترینی دەکەون، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، ئـا ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە خـوا ﷻ خسـتووینە سـەر ڕاسـتە ڕێ و، ئـا ئەوانـەن خـاوەن عەقـڵان.

﴿ أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴾، ئایـا کەسـێک کـە وشـەی سـزاو ئـازاری لەسـەر چەسـپیی بـێ، ئایـا تـۆ کەسـێک کـە لـە نێـو ئاگردایـە، دەتـوانی دەربـازی بکـەی؟! واتـە: ئەوانـەی کـە هیدایـەتی خـواو، ڕێنمایـی خـوا ڕەفـز

دەکەن، لە ئەنجامی ڕەفزکردنیان بۆ هیدایەت و ڕێنمایی خواوە، بڕیاری خوایان لەسەر دەچەسپێ، بڕیاری خواش بریتیە لەوەی کەسێک ڕێنمایی خوا قبووڵ نەکات و پشت لە خوا بکات، دەبێ سزا بدرێ، مەبەست ئەوەیە، وشەی سزایان لەسەر چەسپیوە، واتە: بڕیاری خوا بە سزادرانیان لەسەر ئەوان چەسپیوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خۆیان ڕێی ڕاستیان نەگرتوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴾، واتە: ئایا تۆ کەسێک کە لە نێو ئاگردایە، دەتوانی دەربازی بکەی؟ ئەوانە بەپێی خۆیان و، بە ویستی خۆیان ئەو ڕێیەیان گرتوە، کە دەیانگەیەنێ بە دۆزەخ، چۆنیان دەردێنی و چۆنیان دەرباز دەکەی؟!

﴿ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ ﴾، بەڵام ئەوانەیان کە پارێزیان لە پەروەردگاریان کردوە، ﴿ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ ﴾، ئەوانە چەند کۆشک و باڵەخانەیان هەن، لەسەرووویانەوە کۆشک و باڵەخانەی دیکە هەن، بینا کراون، دروستکراون، ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، ﴿ مَّبۡنِيَّةٞ ﴾، واتە: دروستکراون، بەڵام بۆچی خوا ﷻ ئەو وشەیەی لێرەدا بەکارهێناوە؟ زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، کە دوایی قسەکانیان دێنین، ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، واتە: ئەو کۆشک و باڵەخانانە، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، ﴿ وَعۡدَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە بەڵێنی خوایە، ﴿ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ﴾، خوا بەڵێنی خۆی دوا ناخات، بەڵێنی خۆی ناشکێنێ، ﴿ ٱلۡمِيعَادَ ﴾، (مِيْعَادو مَوعِدو، وَعد) هەر سێکیان بە مانای بەڵێن و پەیمان دێن.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ ﴾، ئایا نابینی! واتە: بە چاوی سەر، دەشگونجێ مەبەست پێی چاوی عەقڵ و دڵ بێ، چونکە ئەگەر باران و بەفرو تەرزەکە دەبینین کە دێتە خوار، بەڵام دوایی خرانە نێو کانیی و سەرچاوەی ئەو ئاوە کە دادەبەزێ، پاشان پێ ڕوێنرانی شیناوردو کشتوکاڵ، نابینن، بۆیە لێرەدا: ﴿ أَلَمۡ تَرَ ﴾، دەگونجێ بە مانای: ئایا نابینی بێ، بۆ هەندێک لەو دیمەنانە دەبینرێن، دەشگونجێ مەبەست پێی زانین بێ، واتە:

ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینی و نازانیی، چی نابینیّ و نازانیّ؟ ﴿أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، کە خوا لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە؟ زۆرجاران گوتوومانە: لە قورئاندا بە زۆریی خوا ﷻ باسی ئاو دەکات، بۆچی؟ چونکە لە هەندێ لە وڵاتان تەنیا باران هەیەو، لە هەندێکیان تەنیا بەفر هەیەو، وەک بەستەڵەکی باکوورو باشوور، لەوێ هەر بەفر هەیەو، لە هەندێ شوێنان ڕەنگە بەس تەرزە هەبێ، بەڵام خوا ﷻ ئەو ئاوەی لە ئاسمانێ دەینێرێتە خوارێ، بە هەر سێ حاڵەتی باران و بەفرو تەرزە هەیە، کە هەر سێکیان ئاون، بۆیە دەفەرموێ: ئاوی دابەزاندوە، ﴿فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، (فَسَلَكَهُ) واتە: (فَأَدْخَلَهُ) خستوویەتە نێو کانیی و سەرچاوەکانی زەوییەوەو، عەمباری کردوە، دوایی بەشێوەی کانیی و سەرچاوە، ئەو ئاوە عەمبار کراوو پەزمەندە کراوە، دێتەوە دەرێ، ﴿ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ﴾، دوایی بەو ئاوە عەمبار کراوو پەزمەندە کراوەی نێو زەوی، کە لە ڕێی کانیی و سەرچاوەکان و کارێزو بیرەکانەوە دێتە دەرێ، کشتوکاڵێکی پێ دەڕوێنێ، پێ دەردێنێ ڕەنگی جۆراو جۆرە، ﴿ثُمَّ يَهِيجُ﴾، دوایی پێدەگات، دەورووژێ و گەشە دەکات و هەراش دەبێ، ﴿فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا﴾، ئنجا دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، کاتێک کە ئینسان سەرنجی پەڵە گەنمێک دەدات، پەڵە جۆیەک، پەڵە نیسکێک، نۆکێک، ماشێک، هەرزنێک، بەڵکو پەڵە مەرەزەیەک تەماشا دەکات لە کاتی گەیشتنیدا، زەرد هەڵدەگەڕێ، پێشێ سەوزە کە جارێ نەگەیشتوە، دوایی وردە وردە فەریکەو، دوایی وردە وردە زەرد هەڵدەگەڕێ و پێدەگات، ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا﴾، ئنجا پاش ئەوەی پێگەیشت و زەرد هەڵگەڕا، وشک دەبێ، خوا ﷻ دەیکاتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکاو، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا بیرخەرەوە هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، بۆچی خوا ﷻ لێرەدا ئەمەی فەرمووە؟ ئایەتەکانی دیکە هەموویان پێکەوە پەیوەست بوونیان دیارە، ئەمەیان لێرەدا زانایان دوو ئەگەریان بۆ داناون:

١)- خوا ﷻ هەر لەسەر باسی خستنەڕووی بەڵگەکانی تەنیا بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خۆی بەردەوامە، کە: تەماشا بکەن، ئەوەش یەکێکە لە بەڵگەکان.

٢)- خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ڕۆژی دوایی و سەرەنجامی ئەهلی ئیمان و ئەهلی کوفری کرد، ئنجا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوە کە ئەو زیندووکرانەوەیەی ئێوە، لە لایەن خوای باڵا دەستەوە، وەک ئەوە وایە کە خوا ﷻ ئاوێک لە ئاسمان دادەبەزێنێ، دوایی دەیخاتە کانیی و سەرچاوەکانەوە، دوایی کشتوکاڵ و شیناوردێکی ڕەنگ جۆراوجۆری پێ دەڕوێ، دوایی پێدەگات و زەرد هەڵدەگەڕێ، دوایی دەبێتە پووش و پەڵاش، ژیانی ئێوەش بە هەمان شێوەیەو، ساڵانە سەر زەوی سەوز دەبێ، دوایی دەبێتە پووش و پەڵاش، دوایی جارێکی دیکە دووبارە ئەو شیناوردو کشتوکاڵە دەڕوێتەوە، ئێوەش بە هەمان شێوە دوای ئەوەی پاییزی ئاخیر زەمانتان بەسەردا دێ، جارێکی دیکە خوا ﷻ وەک چۆن سەر زەوی زیندوو دەکاتەوە بە کشتوکاڵ، ئێوەش جارێکی دیکە دەژیێنێتەوەو زیندووتان دەکاتەوە.

لە خوای پەروەردگار داواکارین بە لوتف و کەرەمی خۆی، یارمەتیمان بدات، باشتر لە فەرمایشتەکەی تێبگەین و، دەرس و پەندی لێوەربگرین و، لەو خاوەن عاقڵانە بین کە باشترین بەهرەو سوود لە فەرمایشتە بە پێزو بێ وێنەو ناوازەکەی خوا ﷻ وەردەگرن، بە شێوەیەک کە هەم ژیانی خۆمانی پێ پاک و چاک بکەین، هەم لە دنیادا بە هۆی بەهرەمەند بوون لە قورئان، ژیانێکی ڕاست و دروست دوور لە گوناهباریی و عەیبداریی، بەسەر ببەین، ژیانی تاکییمان، خێزانییمان، کۆمەڵایەتییمان، هەم لە دواڕۆژیشدا پێی سەرفرازبین و سەر بەرزبین و شایستەی ئەوەبین کە خوا ﷻ لە خزمەت پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆی و، هاوەڵانی بەڕێزیدا خوا لێیان ڕازیبێ و، پیاوچاکانی دوای ئەواندا، بمانخاتە بەهەشتەکانی خۆیەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە بانگی بەندەکانی بکات بۆ پارێز لە خوا کردن و، موژدەی پاداشتی هەرە چاک پێدانیان لە دنیاو لە دوارۆژدا لە بەرانبەر چاکەکاریی داو، ئامازەکردنیش بە کۆچکردن بە زەوی فراوانی خواداو، لە کاتی ناچارکراندا، موژدەی پاداشتی بێ ئەژماردان بە خۆڕاگران لە پێناوی خوادا، بە تایبەت ئەوانەی لە کاتی ئاوارەیی و کۆچ و کۆچباردا خۆڕاگردەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کە بڕواتان هێناوە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن.

ئەم دواندنە تایبەتە بە بڕوادارانەوە، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەدە ﷺ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی موحەممەد ﷺ! بڵێ: ئەی بەندانەم (واتە: ئەو بەندانەی خوا) کە بڕوایان هێناوە، واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

﴿ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، واتە: بەردەوام بن لەسەر پارێز لە خوا کردن، یاخود هەوڵبدەن بە پلەکانی پارێزکردندا بەرزتر ببنەوەو

زیاتر هەڵکشێن، چونکە وەک چۆن ئیمان پلە پلەیە، تەقواش بە هەمان شێوە پلە پلەیە.

٢)- ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾، بۆ ئەوانەی کە لەم ژیانی دنیایەدا چاکەیان کردوە، چاکە هەیە، ئەمە بە دوو شێوە لێکدراوەتەوە:

یەکەم: ئەوەیە کە ئەوانەی لەو ژیانی دنیایەدا چاکەیان کردوە، چاکەیان هەیە، واتە: خوا بە چاکە پاداشتیان دەداتەوە، لە دنیاو دوارۆژدا.

دووەم: ئەوانەی چاکەیان کردوە لەم ژیانی دنیایەدا، خوا چاکەیان دەداتەوە، لە دنیادا.

بە پێی واتای یەکەمیان ئەوانەی لەم ژیانی دنیایەدا چاکەیان کردوە، خوا پاداشتی چاکیان دەداتەوە، واتە: هەم لە دنیاداو هەم لە دوارۆژدا، بەڵام بەپێی واتای دووەمیان بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە، لەم ژیانی دنیایەدا، چاکە هەیە، واتە: لەم ژیانی دنیایەدا خوا لە بەرانبەر چاکەی چاکەکاراندا، شتی باشیان بۆ دەرەخسێنێ، وەک لەشساغیی، ناو بانگی چاک، دووریی لە عەیبداریی، بژیوی حەلاڵ، بەختەوەریی و، هەموو ئەو شتانەی دەکەونە چوارچێوەی چاکەو باشەوە، ڕستەی: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ تەنوینی سەر (حَسَنَة)، بۆ مەزنکردنە واتە: چاکەیەکی زۆر مەزن و ناوازەو پەسند هەیە.

٣)- ﴿وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ﴾، سەر زەمینی خواش فراوانە، ئەمە ئاماژەیە بە کۆچکردن، واتە: ئەگەر ڕێی چاکەکاریی ، یان ڕێی دینداریی چاکتان لێ بەسترا، ئەوە چاو چڕ دامەگرن لەسەر ئەو شوێنەی کە تێیدان، لەسەر خانووبەرەیەک و، لەسەر هەندێک بەرژەوەندیی و، لەسەر هەندێک خەڵک و خزم و کەس، کە لەگەڵتاندا هاو ناوازو هاودەنگ نین بۆ بەندایەتیی و بۆ خواپەرستیی، بەڵکو ڕێگرو پەرچ و لەمپەرن، چاو لەسەر ئەو شوێنە چڕ دامەگرن، زەوی خوا فراوانەو تێیدا کۆچ بکەن و ئەو شوێنە بە جێبهێڵن، کە بە ناسوودەیی و ئارامیی ناتوانن بەندایەتیی بۆ خوا تێدا، ئەنجام بدەن.

٤)- ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، بە دڵنیاییەوە خۆڕاگران بە بێ ژماردن، بەبێ بۆ ژمێردران، پاداشتیان دەداتەوە.

وشەی (صَبْرٌ) واتە: خۆڕاگریی و ئاوا پێناسە کراوە: (**الصَّبْرُ: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا تَكْرَه**)، (صَبْر): بریتییە لە ڕاگرتنی نەفس لەسەر شتێک کە پێی ناخۆشەو، هەست بە تاڵیی و نارەحەتیی دەکات، بەڵام تۆ دەبێ نەفسی خۆتی لەسەر حەپس بکەی، وەک نەکردنی گوناهو، کردنی چاکەو، دەستبەردار بوونی هەندێ بەرژەوەندیی ناشەرعیی، لە کاتێکدا کە لەگەڵ بەرنامەی خوادا تێک دەگیرێن و ... هتد، هەندێ لە زانایانیش ئاوایان پێناسە کردوە: (**الصَّبْرُ: سُكُونُ النَّفْسِ عِنْدَ حُلُولِ الآلَامِ والمَصَائِبِ، بِأنْ لا تَضْجَرَ ولاَ تَضْطَرِبَ لِذَلِكَ**)، بەڵام ئەمە تەنیا بەشێک لە پێناسەی (صَبْر)ە، واتە: (صبر) بریتییە لە ئارامیی نەفس و، داسەکنانی نەفس لە کاتی پەیدابوونی ئازارو بەڵایەکاندا، بە شێوەیەک کە بێزاریی دەرنەبڕێ و، جووڵە جووڵ نەکات.

ئنجا (صبر) دەبێ بە سێ بەش» صەبر لەسەر فەرمانبەریی (**طاعة**)و، صەبر لەسەر گوناهو تاوان و، صەبر لەسەر موصیبەت و بەڵا.

ئنجا لێرەدا تەنیا بەشی سێیەمیان پێناسەی کردوە، صەبر لەسەر بەڵاو گرفتارییەکان کە مرۆڤ بێزاریی و سکاڵا دەرنەبڕێ.

دیارە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم﴾، بێگومان خۆڕاگران پاداشتیان بە تەواویی دەدرێتەوە، (**التَّوْفِيَةُ: إعْطَاءُ الشَّيءِ وَافِياً أي: تَامَّاً**)، (**تَوْفِيَة**) واتە: بەخشینی شتێک بە تەواویی، کەواتە: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم﴾، خۆڕاگران پاداشتیان دەدرێتەوە بە تەواویی، پڕ بە پێستی کردەوەکەی خۆیان.

٥)- ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، بەبێ ژماردن، واتە: پاداشتێک کە لە ژمێرە نایەت، هەڵبەتە ئەمە کینایە بۆ زۆریی، چونکە شتی زۆر، عادەت وایە ناژمێردرێ، کەسێک بە کەسێک دەڵێ: کتێبم بۆ هێناوی، دەڵێ: چەند؟ دەڵێ: زۆر، واتە: ناژمێردرێن تاکو بڵێ: (١٠) یان (١٥)

یان (٢٠) یان (٣٠) شتی زۆر عادەت وایە ناژمێردرێ، ﴿بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴾، (كِنَايَةٌ عَنِ الوَفْرَةِ، وَالتَّعْظِيْمِ لأَنَّ الشَّيءَ الكَثِيْرَ لَا يُتَصَدَّى لِعَدِّهِ)، (بِغَيْرِ حِسَاب): كینایەیە بۆ زۆریی و مەزنیی، چونکە شتی زۆر ڕوو لە ژماردنی ناکرێ.

وەک گومـان: ئـەم ئایەتـە موبارەکـە: ﴿وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ﴾، ئاماژەیـە بـە کۆچکـردن، کـە لـەو سەروحەدەشـدا کـە سـاڵی پێنجەمـی پێغەمبەرایەتییـەو، وەک گومـان ئـەم سـوورەتە لـەو سـاڵەدا دابەزیـوە، مسـوڵمانان بـۆ جـاری یەکـەم کۆچیـان کـرد بـۆ حەبەشـە، وەک لـە (السِّيْرَة النَّبَوِيـة لابـن هيشـام)دا هاتـوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێـک بـە هـاوەڵانی بەڕێـزی فەرمـوو: [لَـوْ خَرَجْتُـمْ إِلَى أَرْضِ الحَبَشَـةِ، فَإِنَّ بِهَـا مَلِـكًا لَا يُظْلَـمُ عِنْـدَهُ أَحَـدٌ، وَهِـيَ أَرْضُ صِـدْقٍ، حَتَّـى يَجْعَـلَ اللّـهُ لَكُـمْ فَرَجَـاً مِـمَّا أَنْتُـمْ فِيـهِ، فَخَـرَجَ ثَلَاثَـةُ وَثَمَانُـوْن رَجُـلاً وَتِسْـعَ عَـشَرة امْـرَأَة سِـوى أَبْنَائِهِـم الَّذِيْـن خَرَجُـوا بِهِـمْ صِغَـارًا][1].

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێ بـە هـاوەڵانی بەڕێـزی فەرمـوو: [کاتێـک تەماشـای کـرد زۆر بێـزار دەکرێـن و ئـازار دەدرێـن و، ناڕەحـەت دەکرێـن و، هەندێکیـان لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا شـەهید کـران، وەک (یـاسرو سـومەییەی هاوسـەری خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دایـک و بـاب عەمـار]، ئەگـەر دەربچـن بـۆ سـەر زەمینـی حەبەشـە حوکمڕانێکـی لێیـە، کـە هیـچ کـەس لـە لای وی سـتەمی لـێ ناکـرێ، (بیسـتوویەتی کـە دادگـەرە)، تاکـو خـوا لـەوەی کـە تێیـدان دەرووی خێرتـان لێدەکاتـەوە، (واتـە: بتوانـن لـە وڵاتی خۆتانـدا بژیـن)، ئیـدی ئەوەبـوو هەشـتاو سـێ پیـاو لەگـەڵ نـۆزدە ئافـرەت دا، جگـە لـە منداڵەکانیـان کۆچیـان کـرد.

دیـارە ئـەو هەشـتاو سـێ پیـاوە، کـە نـۆزدە ئافرەتیـان لەگەڵدا بـوون ئـەو ئافرەتانە هاوسـەری هەندێـک لـەو هەشـتا و سـێ پیـاوە بـوون، مـاوەی هەشـتاو سـێ پیاوەکـە کـە دەمێننـەوە، زگورتیـی بـوون، ئنجـا بـەو پێیـە بـێ، نۆزدەیـان هاوسـەرداربوون لـە پیـاوەکان، یاخـود هەندێکیـان لـە ئافرەتـەکان کچـی گـەورە بـوون؟! دیـار نەکـراوە.

---

(١) السيرة النبوية لآبن هشام، ج١ ص ١٦٢-١٦٨.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانكـردنی خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ كـە بەندایەتیـی سـاغی خـۆی بـۆ خـوا ڕابگەیەنـێ، وێڕای تـرس و بیمـی لە سزای مـەزنی دوارۆژو، بـێ منەتكـردنی كافرەكان لـە پەرستنی هـەر شـتێک جگـە لـە خـواو، خسـتنە ڕووی سـزای سـەختی خـوا بـۆ زیانبارانێـک، كـە خۆیـان و نیزیكانیـان دەدۆڕێنـن لـە ڕۆژی دوایـدا:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ ﴾، بڵێ: من فەرمانم پێكردوە كە خوا بپەرستم، خوا ﷻ - وەک پێشتریش گوتوومانە: لە مانای گشتیی دا - لە ئایەتەكانی: (١٠و ١١و ١٣و ١٤و ١٥) لەو پێنج ئایەتەدا، پێنج جاران ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم دەكات ﷺ پێی دەفەرموێ: بڵێ (قُلْ)، كە لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا یەكێكیان تێپەڕی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم! كە بڕواتان هێناوە، پارێز لە پەروەردگارتان بكەن، ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ﴾، بۆ ئەوانەی لەم ژیانی دنیایەدا چاكەیان كردوە، چاكەیان بۆ هەیە، چاكەی دنیا و چاكەی دوارۆژ، یاخود بۆ ئەوانەی چاكەیان كردوە، كە بریتیە لە ئیمان هێنان و، بۆ خوا صوڵحان، لەم ژیانە دنیایەدا، چاكەیان بۆ هەیە، بەڵام مانای یەكەمیان گشتگیرترو لە ڕاستییەوە نزیكترە، واتە: ئەوانەی كە لەم ژیانی دنیایەدا، چاكەیان كردوە، پاداشتی چاكیان هەیە، هەم لە دنیاشداو، هەم لە دوارۆژیشدا، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: كە ئەمە

جاری دووەمە خوا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات ﷺ بفەرموێ: (قل): ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ ﴾، بڵێ: من فەرمانم پێکراوە بەوە کە خوا بپەرستم.

٢)- ﴿ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾، لە حاڵێکدا ملکەچیی بۆ ساغ بکەمەوە، بە جۆرێک بۆی ملکەچبم و، جۆرێک بیپەرستم و، بە جۆرێک فەرمانبەرییبم، خڵتەی بێ فەرمانیی بە خۆمەوە نەهێڵم، ملکەچییەکەم ساغ و بێ خڵتە بێت.

٣)- ﴿ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، هەروەها فەرمانم پێکراوە کە یەکەمینی مسوڵمانان بم، (الطَّبَرِي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، ئایەتەکەی پێشێ و ئەم ئایەتەش بەمجۆرە تەفسیر دەکات: (قُلْ يَا مُحَمَّد ﷺ لِمُشْرِكِي قَوْمِكَ إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَعْبُدَه مُفْرِداً لَهُ الطَّاعَةَ، وَأَمَرَنِي رَبِّي جَلَّ ثَنَاؤُهُ بِذَلِكَ ، لِأَنْ أَكُون بِفِعْلِ ذَلِكَ أَوَّل مَنْ أَسْلَمَ مِنْكُمْ، فَخَضَعَ لَهُ بِالتَّوْحِيدِ، وَأَخْلَصَ لَهُ الْعِبَادَة ، وَبَرِيء مِنْ كُلّ مَا دُونَهُ مِنْ آلِهَة).

واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ بە هاوبەش بۆ خوادانەرانی گەلەکەت بفەرموو: بێگومان خوا فەرمانی پێکردووم کە بیپەرستم و ملکەچیی خۆمی بۆ تاک بکەمەوەو، پەروەردگاریشم (جَلَّ ثَنَاؤُهُ) بۆیە بەوە فەرمانی پێکردووم، تاکو ببمە یەکەمین کەس لە ئێوە کە ملکەچ دەبم بۆ خواو، بۆی فەرمانبەر دەبم بە خوا بە یەکگرتنەوەو، ساغکردنەوەی بەندایەتییەوەو، یەکەمین کەس دەبم کە دوور دەبێ لە هەموو ئەو پەرستراوانەی جگە لەو دەپەرسترێن.

ئنجا خوا ﷻ بۆ جاری سێیەم فەرمانی پێدەکات:

٤)- ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، بفەرموو (ئەی موحەممەد! ﷺ) بە دڵنیایی ئەگەر سەرپێچیی پەروەردگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەترسێم، مەترسییم لێی هەیە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٣، ص٢٠٧.

﴿ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾، (أي: يَـوۡمٌ يَعۡظُـم هَوۡلـه)، ڕۆژێـك كـە نارەحەتییەكـەی زۆر بێرەزایـە، هەڵبەتـە كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأُمِرۡتُ لِأَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، بەپێـی لێكدانـەوەی (الطـبري) واتـە: مـن یەكەمیـن كەسـێك دەبـم لـە ئێـوە، لـە ڕووی كاتییـەوە، كـە بـۆ خـوا ملكـەچ دەبـم، بەندایەتیـی خۆمـی بـۆ سـاغ دەكەمـەوە.

بـەڵام مانایەكـی دیكـەشی هەیـە كـە هەندێك لـە توێـژەرەوان ئەویان هەڵبـژاردوە، ئەویـش ئەوەیـە كـە: ﴿ أَوَّلَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، (أي: أَقْـوَى المُسْـلِمِيْنَ إِيْمَانَـاً)، واتـە: مـن یەكەمینـی ملكەچـان دەبـم بـۆ خـوا، واتـە: لـەو ڕووەوە كـە لـە هەمـوو كـەس زیاتـر بـۆ خـوا ملكـەچ دەبـم.

منیـش ئـەو مانایـەم زیاتـر بـە دڵـە، چونكـە هـی یەكەمیـان شـتێكی ئاشـكرایە، كـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و هـەر پێغەمبەرێـك بـە نسـبەت گـەل و كۆمەڵگایەكـەی خـۆی، یەكەمیـن مسـوڵمان و یەكەمیـن ملكـەچ بـووە بۆ خـوا، چونكە ئـەو ئیسـلامی هێنـاوە، كەواتـە: ئـەوە شـتێكی ئاشـكرایە، بـەڵام مەبەسـت ئەوەیـە كـە فەرمانـم پێكـراوە كـە بەهێزتریـن و چاكتریـن ملكـەچ بـم بـۆ خـوا، پێموایـە ئـەو مانایـە بەهێزتـرە، هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ بـۆ ئـەوەی ئۆممەتەكـەی حاڵیـی بـكات، فەرموویـەتی: {أَمَـا وَاللَّـهِ إِنِّي لأَتْقَاكُـمْ لِلَّـهِ، وَأَخْشَـاكُمْ لَـهُ} (أخرجـه مسـلم: ٢٦٤٤ وغـيره).

ئنجـا لـەم دەرسـەماندا بـۆ جـاری سـێیەم، ئەگەرنـا لـە ڕیزبەندیـی ئـەو پێنـج جـارەدا بـۆ جـاری چـوارەم، خـوا فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەكات:

٥)- ﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴾، بڵێ: بەس خوا دەپەرستم، ملكەچیی خۆمی بۆ ساغ دەكەمەوە.

٦)- ﴿ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦ ﴾، ئێوەش هەرچی جگە لەو دەپەرستن، بیپەرستن، كە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴾، بڵێ: من خوا دەپەرستم، دیارە بەركار (مفعول به) پێشخراوە، بۆ ئەوەی كورت هەڵهێنان (حَصر) بگەیەنێ، ﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ ﴾، ئەمەش وەك: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ۝ ﴾الفاتحة، وایە، بە تەنیا خوا دەپەرستم، ﴿ مُخۡلِصٗا

﴿ لَّهُۥ دِينِي ﴾، ملکەچیی خۆشمی بۆ ساغ دەکەمەوەو، دەربازی دەکەم و خڵتەی پێوە ناهێڵم، ﴿ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦ ﴾، ئێوەش جگە لەو چی دەپەرستن و کێ دەپەرستن، بیپەرستن.

ئەمەش واتای ئەوەیە لە مەودوا سەرەنجامی ئەو پەرستنە هەڵەیەی خۆتان، کە بۆ غەیری خوا ئەنجامی دەدەن، سەرەنجامەکەی دەزانن، کەواتە: (الأَمْرُ هُنَا بِمَعْنَى التَّخْلِيَةِ وَالتَّسْوِيَةِ، وَهِيَ كِنَايَةٌ عَنْ قِلَّةِ الإِكْتِرَاثِ)، فەرمانکردن لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦ ﴾، مەبەست لێگەڕان و بێ منەتکردنە، واتە: ئەمە کینایەی گرنگیی و بایەخ پێ نەدانە، کەچی دەپەرستن بیپەرستن.

ئنجا بۆ جاری چوارەم لەم دەرسەمانداو، بۆ جاری پێنجەم لە کۆی ئەو پێنج جارەی لەم پێنج ئایەتەدا کە باسمانکردن هاتوە، دەفەرموێ:

٧- ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی زیانباران ئەوانەن کە خۆیان و کەس و کاریان لە دەستداوە لە ڕۆژی قیامەتدا، خۆیان و کەس و کاریان دەدۆڕێنن، ئەمە: (تَمْثِيلٌ لِحَالِهِمْ بِحَالِ التَّاجِرِ الَّذِي عَرَّضَ مَالَهُ لِلنَماءِ وَالرِّبْحِ، فَأُصِيبَ بِالتَّلَفِ)، لێرەدا حاڵەتی ئەو بێبڕوایانە چوێنراوە بە حاڵی بازرگانێکەوە کە ماڵ و سامانەکەی خستۆتە دۆخێکەوە گەشەی پێ بدات و زۆری بکات، کەچی نەک هەر قازانجی نەکردوە، بەڵکو دەستمایەکەشی لە دەستداوە.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بڵێ: زیانبارانی ڕاستەقینە، کە پێناسەی زیانباران بە تەواویی دەیانگرێتەوە - چونکە (أل)ی سەر (الخَاسِرِيْن) بۆ ناساندنە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی تێکڕا زیانبارانە - کەسانێک کە بە تەواویی مانای زیانباریان تێدا هاتۆتە دی، ئەوانەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا، خۆیان و کەس و کاریان و ماڵ و خێزانیان لە دەست دەدەن و دەدۆڕێنن.

٨)- ﴿أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾، ئاگاداربن! ئا ئەوە زیانبارییەکی ڕوون و ئاشکرایە، چونکە هیچیان بۆ نەماوەتەوە نە خۆیان و، نە ئەوەی کە هەیانبووە، لە کەس و کارو هەرچی کە بە دەوریانەوە بووە، ئنجا خوا ﷻ دیمەنێک لەو شێوە سزاو ئازارو ئەشکەنجەیەی کە بۆیان ئامادە کراوە لە دوارۆژدا، دەیخاتە ڕوو، کە دیمەنێکی زۆر سامناکە، دەفەرموێ:

٩)- ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾، بۆ ئەوان لە ئاگری دۆزەخدا چەند سێبەر هەن، لە سەروویانەوە.

١٠)- ﴿وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾، هەروەها لە ژێریشیانەوە چەند سێبەر هەن.

١١)- ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ﴾، ئەوەش ئەوەیە کە خوا ﷻ بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ.

١٢)- ﴿يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾، ئنجا ئەی بەندەکانم! پارێزم لێ بکەن.

وشەی (ظُلَّة)، کە بە (ظُلَل) کۆ دەکرێتەوە، پێشتریش گوتوومانە: (ظُلَّة)، هەر شتێکە بەرزبێتەوە لە بینا، کەپر، هەور، هەر شتێک کە سێبەرت لێ بکات، کاتێک کەسێک دادەنیشێ شتێک لەسەر سەری بێ، پێی دەگوترێ: (ظُلَّة)، سەقفی خانوو بێ، سابات و کەپر بێ، هەور بێ، هەرچی بێ، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: لە سەروویانەوە چەند سێبەرێکی ئاوا هەن، لە ژێریشیانەوە هەر سێبەرەکان هەن، دۆزەخیش چین چینە، هەم لەسەروویانەوە پەڵەی ئاگرو دوو کەڵ هەیە، هەم لە ژێریانەوە هەیە.

ئەمە وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)ە، کە دەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ﴿٤١﴾﴾، واتە: لە دۆزەخدا بۆ ئەوان ڕایەخ هەیەو لە سەرووشیانەوە پۆشەرەکان، واتە: هەم ئاگر دایان دەپۆشێ و هەم لەسەر ئاگریش ڕادەکشێن.

هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت)دا، خوا ﷻ هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: ئەو رۆژە كە ئازار دایان دەپۆشێ لەسەرروویانەوەو لە ژێر پێیەكانیشیانەوە، واتە: ئاگر دەوریان دەدات.

هەروەها لە سوورەتی (الواقعة)ش دا، خوا ﷻ ئەم شێوە سزادرانەیان زیاتر روون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: هاوەڵانی دەستە چەپ، دەزانی هاوەڵانی دەستە چەپ كێن و چۆنن؟ گڕەبای گەرم و سووتێنەرو ئاوی كوڵاوو داغ و لە سێبەرێک دان سێبەرێكی رەش! (واتە: ئاگرەكە دووكەڵێكی رەشی بەرزبووەوەی هەیە)، نە فێنكایەتیی و، نە رێز و حورمەتی تێدایە.

دیارە قورئانیش هەندێكی، هەندێكی روون دەكاتەوە، بۆیە واباشە وەك زۆرجاران گوتوومانە: لە هەر شوێنێک باسی مەبەستێک كرا، ئینسان بگەڕێ ئەو ئایەتانەی دیكە كە باسی ئەو مەبەستە دەكەن، بیانهێنێ، ئەو كاتە لە هەموو رووەكانەوە ئەو مەبەستە تیشكی دەخرێتە سەر.

كە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ﴾، (ذَلِكَ)، (إشَارَةٌ إلى مَا ذُكِرَ بِتَأْوِيْلِ المَذْكُور)، واتە: (ذَلِكَ المَذْكُور) ئەو باسكراوە ئەوەیە كە خوا بەندەكانی خۆی پێ دەترسێنێ، بیمیان دەداتە بەرێ، تاكو بسڵەمنەوە لە كوفرو شیرک و، لە گوناهو تاوان و لادان، كە هەم لە دنیادا مایەی نەگبەتیی و عەیبداریی و، دەردەداریی و نارەحەتییانە، هەم بۆ دوارۆژیان، مایەی شەرمەزاریی و سزاو جەزرەبەی دادگەرانەی خوایە، ﴿ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴾، ئنجا ئەی بەندەكانم! پارێزم لێ بكەن، سەرنج بدەن! خوا چەند بە میهرەبانیی و لوتفەوە بانگمان دەكات!.

هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ بانگی هەموو بەندەكان دەكات، ئەی بەندەكانم! واتە: هەموو ئەوانەی ملكەچن بۆ من، لەو بەشەی ژیانتاندا كە بەدەست خۆتان

نیە، مرۆڤ بەشێکی ژیانی بەدەست خۆیەتی و دەتوانێ بۆ خوا ملکەچ بێ و، دەتوانێ ملکەچ نەبێ، لە بەشە ئیختیارییەکەیدا. بەڵام لە بەشە ئیجبارییەکەدا، ئێمە هەمووومان خوا ﷻ دروستی کردووین، بێ ئەوەی ویستی ئازادمان لە ئارادا هەبێ، خوا هەر کەسێک بە جۆرێکی خوڵقاندوە، نیوەیان ڕەگەزیان نێرەو، نیوەیان مێن بە گشتیی، هەروەها هەر کەسە لە نەتەوەیەکە، هەر کەسە لە پارچەیەکی سەر زەوی و نیشتمانێک دایەو، هەر کەسە بە بیچم و شێوەیەکە، ئنجا لە هەموو نەوانەداو، بەو پێکهاتە جەستەیی و دەروونیی و عەقڵییەوە کە هەین، هەر کەسە خوا ﷻ بە شێوەیەک خوڵقاندوویەتی، کە تێیدا سەرپشک و ئازاد نیە، کەواتە: هەموو مرۆڤەکان لەو ڕووەوە ملکەچی خوان و بەندەی خوان، بەڵام لە ڕووە ئیختیارییەکەیانەوە، خوا فەرمانیان پێدەکات کە ئەهلی تەقوا بن و، پارێزی لێ بکەن و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بۆیە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (تَنْبِيهٌ مُشْفِقٌ مِنَ اللهِ لِلنَّاسِ الَّذِيْنَ هُم عِبَادُهُ اخْتِيَاراً أَو إِجْبَاراً)، ئەمە ئاگادار کەرەوەیەکی زۆر بە پەرۆشانەیە لە خواوە بۆ خەڵک، ئەو خەڵکەی کە هەر بەندەی ئەون، چ بە ویستی خۆیان بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، چ بە ویستی خۆیان بەندایەتیی بۆ خوا نەکەن، بە ناچاریی هەموویان هەر بەندەی خوان.

جێی سەرنجە کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾، بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾، واتە: ئەی خاوەن عەقڵان! پارێزم لێ بکەن، هۆی ئەو جیاوازییە چییە؟ دەڵێن: لە سوورەتی (البقرة)دا، شوێنەکە باسی تەواو کردنی کردەوەکانی حەج و عومرەیەو، توێشوو هەڵگرتنە بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵام لێرەدا شوێنەکە شوێنی ترساندن و بیم پێدانە، بۆیە بە (ي)ی بانگکردن ڕستەکە هاتوە، لە سوورەتی (البقرة)دا، لە نێواخنی باسی حەج و عومرەدا خوا ﷻ باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ وَمَا

تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩٧﴾﴾ واتە: حەج چەند مانگێکی دیارییکراوە، هەر کەسێ حەجی تێدا لەسەرخۆی پێویست کرد (بڕیاریدا حەج بکات) با قسەی نارێک و، لادان نەکات و مشتومڕ نەکات لە کاتی حەجداو، هەر شتێک لە چاکە پێش بخەن، خو دەیزانێ و، توێشوو هەڵبگرن، بێگومان باشترین توێشوو پارێزکارییەو، ئەی خاوەن عەقڵان! پارێزم لێ بکەن.

ئنجا لەوێ بۆیە بەو شێوەیە هاتوە، چونکە پەیوەست بووە بە تەواو کردنی خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەوە، بۆیە خوا ﷻ بە خاوەن عەقڵان دواندوونی، واتە: عەقڵتان هەبێ و لە کاتێکدا کە خەریکی جێبەجێکردنی خوا پەرستییەکانی حەجن، شتێک مەکەن کە دژی خوا پەرستییەکانی حەج بێ، دژی پارێزکاریی بێ، وەک قسەی بێ جێ و، لادان و مشتومڕو شەڕە قسە، بەڵام لێرەدا باسەکە باسی ترساندنی خەڵکەو مەترسیی خستنە بەریانە بە گشتیی، بۆیە خوا ﷻ بە: ﴿يَٰعِبَادِ﴾، دواندوونیی، ئەی بەندەکانم: ﴿فَٱتَّقُونِ﴾، پارێزم لێ بکەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**کەسانێک کە دوورە پەرێزییان لە پەرستنی تاغووت کردووەو، بۆ لای خوا، لە ناخەوە گەڕاونەوە، مژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیە، کەسانێکیش کە گوێ بۆ هەر قسەیەک هەڵدەخەن و، دوایی شوێن باشترینی دەکەون، ئەوانە کەسانێکی ڕێی ڕاستگرتوون و، خاوەن عەقڵن و بەندەی مژدە پێدراوی خوان ﷻ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ﴾، ئەوانەی کە خۆیان دوور گرتوە لە تاغووت کە بیپەرستن و لە ناخەوە بۆ لای خوا گەڕاونەوە، دڵخۆشییان بۆ هەیە.

وشەی (طَاغُوت) چاوگە، یاخود ناوی چاوگەو، لە (طَغَى)ەوە هاتوە، (طَغَى) واتە: لە سنوور دەرچوو، یاخیی بوو، ئنجا تاغووت لەسەر کێشی (فَعَلُوت)ە، وەک (رَحَمُوت، مَلَكُوت، رَهَبُوت)، کە ئەمە زێدەڕۆیی لە ماناکەیدا دەگەیەنێ، کەواتە: (الطَّاغُوتُ: هُوَ القَوِيُّ فِي الكُفْرِ، أَوِ الظُّلْمِ)، (طَاغُوت): بریتیە لە کەسێک کە لە کوفرو ستەم دا زۆر ڕۆچوو بێ، زۆر بەهێز بێ، کوفرو ستەمێکی خەست و خۆڵی هەبێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا﴾، ئەوانەی خۆیان دوور گرتوە لە (طَاغُوت) کە بیپەرستن، لێرەدا (طَاغُوت) بە مانای کۆ هاتوەو، کۆی مێ (جمع مؤنث)ە، بۆ غەیری عاقڵان، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا﴾، بۆیەش دەڵێین: کۆیە چونکە بە

ڕاناوی مێینە هاتووەو، ڕاناوی مێینەش بۆ کۆی غەیری عاقڵان بەکاردەهێنرێ، کە ئەگەر بە عاقڵ لە قەڵەم درابان، دەیفەرموو: (الَّذِيْنَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهُمْ)، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ تاغووتی بە مانای کۆ بەکارهێناوە، ئنجا وشەی (طَّاغُوت) بە مانای تاکیش دێ و بە مانای کۆش دێ، هەروەک لە سوورەتی (البقرة)دا، دیسان لەوێش بە مانای کۆ بەکارهاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ ﴿٢٥٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە بێبڕوان دۆست و پشتیوانەکانیان تاغووتن، کە لە ڕووناکیی دەریان دێنن، بەرەو تاریکاییان دەیانبەن.

لەوێش تاغووت بە کۆ هاتوە، بەڵام ڕاناوی عاقڵان بەکارهاتوە، چونکە لە ئەسڵدا طاغووتەکان خاوەن هەست و ویستن.

(تاغووت)یش پێشتریش گوتوومانە هەر پەرستراوێکە جگە لە خوا، زانایان گوتوویانە: پەیکەر بێ، شەیتان بێ، هەواو ئارەزوو بێ، ژیاندار بێ، بێ ژیان بێ.

بەڵام من زیاتر وای تێدەگەم: مەبەست (طَّاغُوت) ئەو پەرستراوانە بێ کە جگە لە خوا دەپەرسترێن و خاوەنی ئیرادەو شعوورن، بەڵام لێرەدا کە خوا ﷻ وەک کۆی مێینەی غەیری عاقڵان بەکاری هێناوە، لەبەر ئەوەیە کە ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرسترێن، هەم خۆیان لە تەرازووی حەقیقەتدا، بەبێ عەقڵ و بێ شعوور دادەنرێن، هەم ئەوانەش کە دەیانپەرستن.

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا، بە کۆی عاقڵان تەعبیر کراون، چونکە دەفەرموێ: ﴿ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ ﴿٢٥٧﴾ ﴾، ئەمەش بە ئیعتیباری ئەوە کە طاغووتەکان لە ئەسڵدا خاوەن هەست و ویست (شعور وإرادة)ن، یاخود: چونکە ئەوانەی دەیانپەرستن، پێیان عاقڵ و خاوەن شعوورن و، خوای زانا بە پێی عەقڵی ئەوان، لەوێدا بە ڕاناوی کۆی عاقڵان کۆی کردوونەوە.

خوا دەفەرموێ: ئەوانەی خۆیان لە (طَاغُوت) دوور دەگرن کە بیانپەرستن و لە ناخەوە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، چونکە (إنابة): بریتیە لە گەڕانەوە دوای گەڕانەوە، یاخود گەڕانەوە لە ناخەوە، ئەوانە موژدەی تەواویان بۆ هەیە، (البُشْرَى: البَشَارَةُ وهِيَ الإِخْبَارُ بِحُصُولِ نَفْعٍ، وَفِي تَقْدِيمِ المُسْنَدِ إِفَادَةُ الحَصْرِ)، واتە: (بشرى وبشارة) هەواڵدانە بە پەیدابوونی سوودێک و کە پاڵوەلادراو ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ﴾، (مُسْنَدُ إِلَيْهِ)ەکە پێش خراوە، ئەمە کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ، واتە: هەر ئەوانە موژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیە، چونکە (بَشَارَة، بُشْرى): بریتیە لە هەواڵدان بە پەیدابوونی سوودو قازانجێک، کە ببێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ پێستی دەم و چاوی پێی بگەشێتەوە.

٢)- ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ ﴾، تۆ موژدە بدە، بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هەموو قسەیەک هەڵدەخەن و، گوێگرن و کراوەن، دەڵێ: (التَّعْرِيفُ فِي القَوْلِ لِلْجِنْسِ يَسْتَمِعُونَ القَوْلَ)، (القول): (أل)ی ناساندنی لەسەرە، واتە: گوێ بۆ هەموو قسەیەک دەگرن و هەر لە ڕێوە قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوەیان نیە، هەر لە ڕێوە بڕیاریان نەداوە کە فڵانکەس هەر گوێی بۆ ناگرم، بەڵکو گوێ بۆ هەموو قسەیەک دەگرن، نەک هەر گوێش دەگرن، بەڵکو گوێ هەڵدەخەن، چونکە (سَمِعَ) واتە: گوێی گرت، بەڵام (اسْتَمَعَ) واتە: بە گرنگیی پێدانەوە گوێی گرت، بە کوردیی دەڵێین: گوێی بۆ هەڵخست.

٣)- ﴿ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ﴾، دوای ئەوەی گوێیان بۆ هەموو قسەیەک هەڵدەخەن، هەڵیدەسەنگێنن و دوایی شوێن باشترینی دەکەون، (أَحْسَنَهُ: إِسْمُ التَّفْضِيلِ لَيْسَ مُسْتَعْمَلاً فِي تَفَاوتِ المَوْصُوفِ بِهِ فِي الفَضْلِ عَلَى غَيْرِهِ، بَلْ لِلدَّلَالَةِ عَلَى قُوَّةِ الوَصْفِ)، زۆرجار ڕێژەکەی ناوی هەڵبژاردن (إِسْمُ التَّفْضِيلِ) بەکاردێ لە قورئاندا، بەڵام مەبەست ئەوە نیە، بەسەر شتێکی دیکەدا هەڵیبژێرێ، بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾ المؤمنون ١٤، بەرزو بە پێزە باشترین بەدیهێنەر، مانای وا نیە کە بەدیهێنەری دیکەش هەن، بەڵکو یانی: بەدیهێنەرێک کە لە خودی خۆیدا باشترینە، یاخود ئەوپەڕی سیفەتی بەدیهێنانی هەیە.

لێرەشدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ ﴾، دوای باشترین قسە دەکەون، واتە: دوای قسەی هەرە باش دەکەون، ئەوپەڕی باش، چ قسەیەک زۆر پەسندو باش و بە کەڵکە، ئەوەیان تەبەننیی دەکەن و دوای دەکەون، بەڵام لە سەرەتاوە گوێی بۆ هەمووی دەگرن.

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوا ﷻ ڕاستە ڕێی کردوون، لێرەدا وشەی: (هَدَاهُمْ) بە مانا تایبەتییەکەی هیدایەتە، نەک بە مانای گشتییەکەی، مانای گشتیی (هَدَاهُمْ) واتە: ڕێنمایی کردوون، ئنجا خوا ﷻ هەموو کەسی ڕێنمایی کردوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ ﴾، ئا ئەوانە کەسێکن، خوا ﷻ خستوونیە سەر ڕاستە ڕێ، ڕاستە ڕێی کردوون.

٥)- ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، ئا ئەوانەشن کە خاوەن عەقڵن، ئەمەش دیسان مانای کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ، چونکە هەموو کەسێک کە عەقڵی هەبێ، خاوەن عەقڵە، بەڵام لێرەدا واتە: ئەوانە خاوەن عەقڵی تێر و تەواون، ئەگەرنا هەر کەسێک کە مرۆڤەو خوا عەقڵی پێداوە، هەر بە خاوەن عەقڵ لە قەڵەم دەدرێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ ﴾، بە ڕاناوی فەصڵ: ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، واتە: بەس ئەوانەن خاوەن عەقڵی تێرو تەواو، عەقڵی ڕاستەقینەن.

لەو بارەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ ﴾، دڵخۆشیی بۆ وان هەیە، مژدە بۆ وان هەیە، ئەم فەرمایشتە دێنین کە فەرموودەیەکی قودسییە، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە خواوە گێڕاویەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:

{قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ: مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (أخرجه البخاري: ٣٢٤٤، ومسلم: ٢٨٢٤، عَن أبي هريرة ﷺ).

واتە: خوای بەرز دەفەرموێ: بۆ بەندە چاکەکانم ئامادەم کردوە شتێک: کە هیچ چاوێک نەیدیوەو، هیچ گوێیەک نەیبیستوەو، بەسەر دڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتوە!

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: ئەوەی خوا ﷻ بۆمان باس دەکات لە بارەی بەهەشتەوە، کەمترە لەوەی لە بەهەشت دا هەیە، چونکە خوا ﷻ بە زمانی ئێمە، ئێمەی دواندوە، ئێمەش هەر ئەو وشانەمان هەن، بەڵام ئەوەی خوا ﷻ داینـاوە لە بەهەشتدا، لە قاڵبی ئەو وشەو تەعبیرانەدا جێی نابێتەوەو، ئێمەش بەس لەوەندە حاڵیی دەبین، کە وشەو تەعبیرەکانمان هاوکارمان دەبن.

ئەمەش زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، ئەوەی خوا ﷻ باسی کردوە لە بارەی بەهەشتەوە، بە ئەندازەی عەقڵ و تێگەیشتنی ئێمە باسی کردوە، ئەگەرنا ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە، گەورەترەو زیاترە لەوەی خوا ﷻ باسی کردوەو، پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە، بەڵام ئێمە بەس ئیستیعابی ئەوەندە دەکەین، زمانەکەی ئێمە تەنیا ئەوەندەی جێ تێدابێتەوە.

## نۆ (٩) ڕاستیی گەورەو گرنگ لە ئایەتەکانی:
## (١٧، ١٨)ەی سووڕەتی (الزمر)دا

**١)- بناغەی سەرفرازیی مرۆڤ، پەرستنی خواو دووریی لە تاغووتە:**

تاغـووت، یـان بـە مانـای هـەر پەرسـتراوێکە جگـە لـە خوا، یـان بە مانـای هەمـوو ئەوانەیە کـە لـە کەوڵـی خۆیـان دەرچـوون و، خۆیـان لـە خەڵـک کردۆتـە پەرسـتراوو، پـەروەردگار، چ جنـد بـن، چ مـرۆڤ بـن، چ تـاک بـن، چ کـۆ بـن، ئەمـەش سـێ بەڵگـە لـەو بـارەوە:

أ)- لە سووڕەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێک بێبڕوابێ بە تاغووت و، بڕوا بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفێکی هەرە مەحکەمەوە گرتوە، کە پچڕانی بۆ نیەو، خواش بیسەری زانایە.

ب)- لە سووڕەتی (النحل)یشدا بە هەمان شێوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: لە نێو هەر کۆمەڵگایەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوان کردوە، کە بە خەڵک ڕابگەیەنێ بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، خۆتان لە تاغووت دوور بگرن.

ج)- هەروەها لە سووڕەتی (الزمر)یشدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی خۆیان لە تاغووت دوورگرتوە کە بیانپەرستن و، گەڕاونەوە بۆ لای خوا، ئەوانە موژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیە.

**٢)- دڵخۆشییەک کە بۆ خۆ دوورگران لە تاغووتە، پێش قیامەت لە دنیادایە:**

هەرچەنـدە ڕوونکـەرەوان تەنیـا بـاسی هـی قیامەتیـان کـردوەو، مـن لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوە ئامـاژە بـەوە بکـەن و لـە تەفسـیری: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ﴾ دا، هـەر گوتوویانـە: بـە

نسبەت ڕۆژی دواییەوە، بە تەئکید دڵخۆشیی و موژدەی گەورە لە بەهەشتدا لە ڕۆژی دوایی دا دێتە دی و، دنیا لەوە بچووکترە، جێگای پاداشتی خوای ﷻ بۆ بڕواداران تیدا ببێتەوە، پاداشتی خوا لە کەوڵی دنیادا جێگای نابێتەوە، بەڵام ئەو دڵخۆشییە کە بۆ خۆ دوورگران لە تاغووت هەیە، بۆ خوا پەرستان هەیە، پێش قیامەت هەر لە دنیادا هەیە، بابای خوا پەرست بەرچاو ڕوونە، دڵنیایە، سەربەرزە، پاکە، ڕێک و ڕاستە، ساغە لەگەڵ خواو خەڵکدا، عەیبەی نایەتەوە سەر، لە گوناهباریی دوورە، لە عەیبداریی دوورە، لە دڵی خۆیدا هەست بە ئۆخژن و ئارامیی دەکات.

**٣)- ئەو بەندانەی خوا، کە کراوەن بە ڕووی هەر جۆرە قسەو بیروڕایەک داو، داخراو نین، لە لای خوا پەسندن و موژدە پێدراون:**

چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ ١٨﴾ الزمر، واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هەموو قسەیەک هەڵدەخەن، (بە گرنگیی پێدانەوە)، دوایی شوێن باشترینی دەکەون.

واتە بێژینگ ئاسا ئەو قسانەی وەریان دەگرن لە بێژینگیان دەدەن، وەک پێشینانی خۆمان دەڵێن: «قسە دابێژەو بیچێژە، ئنجا بیبێژە»، ئەوانەش کاتێک گوێ هەڵدەخەن بۆ قسان هەر لە ڕێوە نیەتیان نەهێناوە، گوێ بۆ کەسانێکی دیاریکراو نەگرن، بەڵکو وەک خوا ﷻ لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: گوێ بۆ هەموو قسەیەک دەگرن، چونکە (أل)ی سەر (القول) وەک پێشتر گوتمان: (أل)ی ناساندنە بۆ جینس، یانی: گوێ بۆ هەموو قسەیەک دەگرن، بەڵام دوایی کام قسەی هەرە باش و پەسندو چاکە، ئەوە دەگرن و تەبەنیی دەکەن، واتە: وەک سەبەتە نین، هەر شتێکی تێیان بکرێ، وەری بگرن، بەڵکو وەک بێژینگن، ئەو قسانەی کە بە کەڵکن و سوود بەخش و باشن، لە هەر کەسێکەوە بن وەریان دەگرن، وەک عەرەب دەڵێن: (أُنظُر إلى مَا قِيل، وَلَا تَنظُر إلى مَنْ قَال)، تەماشا بکە! چ گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی.

**٤)- مرۆڤ بەبێ بە کارهێنانی عەقڵی بۆ هەڵسەنگاندنی قسەو بیروڕا جۆراو جۆرەکان، هەق و ڕاستیی بۆ دەرناکەوێ و، بەپێی بنەمای (للوَسَائِلِ حُكْمُ المَقَاصِدِ)یش، ئەوە فەرزە:**

واتە: ئامرازەکان هەمان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە، ئینسان تاکو گوێ هەڵنەخات بۆ قسان و ورد نەبێتەوەو سەرنج نەدات، هەق و ڕاستیی بۆ دەرناکەوێ، ئنجا فەرزیشە لەسەر مرۆڤ کە هەق و ڕاستیی بناسێ و بۆی دەربکەوێ، هەروەها چەوتیی و لاریی بناسێ، بۆیە گوێگرتن و کرانەوە بە ڕووی خەڵکدا، بە ڕووی قسەو بیروڕایەکانی خەڵکی جۆراو جۆردا، فەرزە، چونکە بەبێ ئەوە هەقی بۆ دەرناکەوێ و، بۆی لە ناهەق جیانابێتەوە.

**٥)- ڕامان و وردبوونەوە لە قسەو بیروڕایەکان فەرزە:**

ئنجا یان فەرزی عەینە، ئەگەر پەیوەندیی بە ئیمان و عەقیدەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بەو شتانەوە بێ، کە لەسەر مرۆڤ فەرزی عەینن، وەک پێنج فەرزەی نوێژ، ڕۆژوو، زەکات لە کاتی خۆیدا، حەج و عومرە لە کاتی خۆیاندا، هەروەها ئەرکەکانی دیکەی فەرز، وەک پەیوەندیی خزمایەتیی، هەقی باب و دایک، هەقی ماڵ و منداڵ، هتد...، یاخود فەرزی کیفایەن، ئەگەر پەیوەست بێ بە بواری هەڵسوکەوتە گشتییەکانەوەو، کەسانی دیکەش هەبن لەو بوارەدا، کەواتە: گوێگرتن بۆ قسەو بۆ بیروڕایەکان هەر چۆن بێ، فەرزە، یان فەرزی عەینە، فەرزێکی خودییە، فەرزێکی تایبەتییە، یاخود فەرزێکی گشتییە، ئەگەر پەیوەست بێ بەو شتانەوە کە لەسەر مرۆڤ بە تایبەت فەرز نین و، لەسەر کۆمەڵگا بە گشتیی فەرزن.

**٦)- ڕستەی: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ﷻ ڕاستە ڕێی کردوون، یانی: ئەوەی ڕابرد، گەیەنەری ئەو ڕاستییەیە، کە ڕاستە ڕێ کراون:**

واتە: ئەوانەی خوا هیدایەتی داون و خستوونیە سەر ڕاستە ڕێ، کەسانێکن عەقڵێکی کراوەو ئازادو لێکۆڵەرەوەیان هەیەو، عەوداڵی هەق و ڕاستیی و حیکمەتن، بەبێ

سەرنجدانی سەرچاوەکەی، یانی: ئەو کەسەی قسەکەی کردوە، یان ئەو لایەنەی قسەکەی لێوە هاتوە، وەک گوتراوە: (انْظُر إلى مَا قِيْل، وَلَا تَنْظُر إلى مَنْ قَال).

**٧)- ڕستەی: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾، هەر ئەوانەش خاوەن عەقڵانن، گەیەنەری ئەو ڕاستییەیە، کە ئەوەی وانەبێ، عەقڵەکەی لەلای خوا پەسند نیە:**

ئەو کەسەی داخراو بێ و گوێ بۆ قسەی خەڵک نەگرێ و، هەستیاریی هەبێ بەرانبەر بە هەندێک کەس، جاری وا هەیە هەر لەنێو بازنەی ئیسلامیشدا، خاوەن مەشرەبێکی دیارییکراوە، ناوی لە خۆی ناوە سەلەفیی، یان ناوی لە خۆی ناوە صۆفیی، یان ناوی لە خۆی ناوە فڵان لایەنی ئیسلامیی، یان فڵان ڕێکخراو و دەزگا، ئنجا ئەوەی لە مەشرەبەکەی خۆیدایەو، لە ڕێچکەو مەزهەبەکەی خۆیدا هەیە، بەس گوێ بۆ ئەوە دەگرێ و بەرانبەر بەوانی دیکە، داخراوە، هەر لە نێو بازنەی ئیسلامیشدا، بەڵام ئایەتەکە دەفەرموێ: دەبێ لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامیش، گوێ بۆ خەڵکی دیکەش بگری، وەک پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) گوێیان گرتوە بۆ قەومەکانی خۆیان، دیالۆگیان لەگەڵدا کردوون و، وتووێژیان لەگەڵدا کردوون، بە شێوەیەکی کراوەو زۆر بە ئینسافانە.

**٨)- لە کۆی ڕستەو بەڵگەکانی ئەم دوو ئایەتە وەردەگیرێ، کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی عەقڵدا، مرۆڤ دەبێتە خواپەرستێکی دوور لە تاغووت:**

چونکە ئەو خوایەی عەقڵی دروستکردوە، یاسای واشی لە عەقڵی مرۆڤدا داناون، کە خاوەنەکەیان بگەیەننە ناسینی خواو پەرستنی خوا، هەروەک ئێمە لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی دا) ئەودمان سەلماندوەو زۆر بە تەفصیل لەو بارەوە قسەمان کردوە.

**٩)- ئەو مژدەو دڵخۆشییەش، چەمکەکەی زۆر فراوانە، کە بۆ خوا پەرستانی خۆ دوورگر لە تاغووت هەیە:**

دەتوانین بڵێین لە زۆر شتدا خۆی دەبینێتەوە، بۆ نموونە ئەم دە (١٠)یە:

١)- لەوەدا کە هەستی پێ دەکەن لە ئاسوودەیی دڵ و دەروون.

٢)- لەوەدا کە لە ڕووی جەستەییەوە، دوور دەبن لەو نەخۆشیی و دەردانەی، کە بە هۆی خواردنی حەرام و کردەوە حەرامەکانەوە پەیدادەبن.

٣)- لەوەدا کە وەدەستی دێنن لە ڕەوشتە بەرزەکان و ئەدەبە جوانەکان و بەها بەرزەکان، کە خۆیانیان پێ دەڕازێننەوەو، سەر بەرز دەبن لە نێو کۆمەڵگادا.

٤)- بەوە کە ناوو ناوبانگی باشیان دەبێت، لەسەر ئەو کردەوە چاکانەی دەیانکەن: ڕاستگۆن، ئەمینن، پاکن، چاکن، دادگەرن، بە ڕەحمن، خەڵکیش خاوەنی ئەو سیفەتانەیان خۆش دەوێن.

٥)- کە دەچنە قۆناغی بەرزەخەوەش، ئنجا ئەگەر گۆڕیان بە نسیب بێ، کە دادەهێڵرێنە گۆڕەوە، یاخود ئەگەر گۆڕیان بە نسیب نەبێ، دەچنە قۆناغی بەرزەخەوە، لەوێش ئەوە بۆیان دەبێتە مایەی دڵخۆشیی.

٦)- هەروەها لە کاتێک دا لە گۆڕ دەهێنرێنە دەرێ، لە کاتی زیندوو کرانەوەدا، لە قیامەتدا، دیسان ئەوانە موژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیە.

٧)- لە کاتێکدا کە ڕادەگیرێن بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، (**عند الوقوف للحساب**) لەوێشدا دیسانەوە دڵخۆشیی و موژدەیان بۆ هەیە.

٨)- لە کاتێکدا بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخدا ڕەت دەبن، (**عند جواز الصراط**)، لەوێشدا ئەو دڵخۆشیی و شادمانییەیان بۆ هەیە.

٩)- لە کاتێکدا کە دەچنە نێو بەهەشت، لەو کاتەشدا ئەو دڵخۆشییەیان بۆ هەیە.

١٠)- لە کاتێکدا کە لە بەهەشتدا سەقامگیرو نیشتەجێ دەبن، دیسان دڵخۆشیی و موژدەیان بۆ هەیە.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴾، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، نەک بەس شتێک و دوو شتان بگرێتەوە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەراوردێک لە نێوان کەسانێکدا کە سزای خوایان بەسەردا چەسپیوە، کەسانێک کە بە هۆی پارێزکارییەوە، لە کۆشک و باڵەخانەکانی بەهەشتدا نیشتەجێن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي النَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي النَّارِ﴾، ئایا کەسێک کە وشەی ئازاری بەسەردا چەسپیوە، ئایا تۆ کەسێک کە لە ئاگردایە دەربازی دەکەی؟! دیارە هەر لە سوورەتی (الزمر)دا، لە ئایەتی ژمارە: (٧١)دا، هاتوە: ﴿حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾، لەوێ بە (مُؤَنَّث) هاتوە، بەڵام لێرەدا: ﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ﴾، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، کاتێک شتێک کەوتە نێوان کردارەکەو، ئەو شتەی وەسفکراوە، ئەو کاتە دەگونجێ چ بە (مُذَكَّر) بهێنرێ، چ بە (مُؤَنَّث) بهێنرێ، (حَقَّتْ) واتە: (وَجَبَت)، کە وشەکە بە تەئکید مەبەست پێی بڕیاری خوایە، لەبەر ئەوەی ئێمە عادەتمان وایە، بڕیارەکانمان دەخەینە دوو توێی وشەو تەعبیرەکانەوە، خوای پەروەردگاریش بە پێی عەقڵی ئێمە، دەماندوێنێ، واتە: بڕیاری ئازاردران لە لایەن خوایان لەسەر چەسپیوە.

یەکێک بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا ﷻ ئەو بڕیارەی بۆ داون؟

دەڵێین: لێرەدا خوا ﷻ باسی یاساکانی خۆی دەکات، واتە: بەپێی یاساکانی خوا، کەسێک ڕوو لە کوفر بکات، کەسێک لادان و تاوان و خراپەکاریی بکات، خوا ﷻ سزای دەدات، ئەوانەش وایان کردوە، بۆیە بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە.

بەڵام خوا ﷻ ئەو هەموو وردەکارییە هەموو جارێ باس ناکاتەوەو، هەر دیارە خوا کێ سزا دەدات؟ خوا ﷻ ئەوانە سزا دەدات کە ڕوو لە کوفر و زوڵم دەکەن، ڕوو لە خراپە دەکەن، لادان و تاوان دەکەن، خوا ئەوانە سزا دەدات، بەپێی یاساکانی خۆی کە دایناون.

﴿أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ﴾، ئایا تۆ کەسێک دەرباز دەکەی کە لە ئاگردایە! دوای ئەوەی ئەوانە سزای خوایان لەسەر چەسپیوە، بە پێی یاسای خوا، ئەوانە تازە ئەهلی دۆزەخن، ئنجا کەسێک چووبێتە نێو دۆزەخ، چۆن ڕزگار دەکەی؟

٢)- ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ﴾، بەڵام ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کردوە، ژووری بەرزیان هەن، لە سەروویانەوە ژووری بەرز هەن، دروستکراون.

وشەی: (لَٰكِن) بە عەرەبیی بۆ (إِسْتِدْرَاكِ)و لە کوردییدا دەبێتە بەڵام، لێرەدا تەنیا بۆ هەست پێکردنی ئەوەیە کە ئەو دوو حاڵەتە، دژی یەکن، کە ئەوانەی بڕیاری سزادرانیان لەسەر چەسپاوە، دژو پێچەوانەی ئەوانەن کە پارێزیان لە پەروەردگاریان کردوە، ئەوانە چۆنن؟.

﴿لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ﴾، ئەوانە ژووری بەرزیان هەن، لە سەروویانەوە ژووری بەرز هەن، دروستکراون، کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: باڵەخانەو کۆشک، (غُرَف) کۆی (غُرْفَةٍ)یە، (الْغُرْفَةُ: هِيَ الْبَيْتُ الْمُرْتَكِزُ عَلَى بَيْتٍ آخَرَ، وَتُسَمَّى عُلِّيَّة)، (غُرَف) کە بە (غُرْفَة) کۆدەکرێتەوە خانوویەکە لەسەر پشتی خانوویەکی دیکە چەسپا بێت، لەسەر خانوویەکی دیکە بنیاتنرابێ، بە عەرەبیی (عُلِّيَة)ی پێ دەگوترێ، بە کوردیی پێی دەڵێن: باڵەخانەو کۆشک.

﴿مَّبْنِيَّةٌ﴾، (الْمَبْنِيَّةُ: الْمَسْمُوكَةُ الْجُدْرَانِ بِحَجَرٍ أَو جَصٍّ أَو غَيْرِهِمَا)، (مَبْنِيَّة) واتە: دیوارەکانی دروستکراون لە بەرد، یان لە گەچ، یان لەو کەرەستەو ماددانە کە خانوویان لێ دروست دەکرێ، بە نسبەت تێگەیشتنی ئێمەوە (مَبْنِيَّةٌ) بەوە

دەگوترێ، ئەگەرنا بێگومان كۆشك و خانووەكانی بەهەشت كەرستەكەیان جیایە لە هی دنیا، كە لەوێشدا پێغەمبەر ﷺ بە پێی عەقڵی ئێمە دەفەرموێ: خشتێك لە زێڕەو، خشتێك لە زیوە، یان دەفەرموێ: یاقووت و گەوهەرەو لەو ماددە گرانبەهایانەن.

٣)- ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، كۆشكەكان ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، یانی: ڕووبار بە ژێر كۆشك و درەختەكانی كە لە دەوری كۆشك و باڵەخانەكاندان، دەڕۆن.

٤)- ﴿ وَعۡدَ ٱللَّهِ ﴾، بەڵێنی خوایە، (**مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ مُؤَكِّدٌ لِنَفْسِهِ، وَهُوَ مَصْدَرٌ مَنْصُوبٌ أَصْلاً: وَعَدَ اللهُ وَعْداً**)، ئەمە بەركارێكی ڕەهایە كە جەختكەرەوەی خۆیەتی، لە ئەصڵدا وەعد چاوگەو، مەنصووبە لەسەر چاوگیی.

٥)- ﴿ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ﴾، خوا بەڵێنی خۆی زایە ناكات، یاخود: لە بەڵێنی خۆی پاشگەز نابێتەوە، یان: بەڵێنی خۆی ناشكێنێ.

وشەی (**مَبْنِيَّة**) زانایان بە چەند جۆرێك مانایان كردوە، (**مَبْنِيَّة**) واتە: بیناكراو، دروستكراو، بەڵام بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: دروستكراو، دیارە كۆشك و باڵەخانە هەر دەبێ دروست بكرێ؟!

١)- هەندێك گوتوویانە: (**لِيُعْلَمَ أَنَّهَا غُرَفٌ حَقِيقِيَّةٌ، لَا أَشْيَاءُ مُشَابِهَةٌ لِلغُرَفِ**)، بۆ ئەوەی بزانرێ كە ئەوانە كۆشك و باڵەخانەی ڕاستەقینەن، نەك شتانێك بن لە شێوەی كۆشك و باڵەخانەدا.

٢)- هەندێك گوتوویانە: (**مِثْلُ الْمَنَازِلِ اللَّاصِقَةِ لِلْأَرْضِ لِجَرَيَانِ الأَنْهار من تَحْتِهَا**)، ئەو باڵەخانە بەرزانە هەروەك ئەو خانووانەن كە بە زەوییەوە چەسپاون، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

٣)- (أَيْ: مَبْنِيَّةٌ بِنَاءً بَالِغًا الْغَايَةَ فِي نَوْعِهِ، كَقَوْلِهِمْ: لَيْلٌ أَلْيَل، وَظِلٌّ ظَلِيلٌ)، بۆیە دەفەرموێ: (مَبْنِيَّة) واتە: بینایەک کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی لە چاکییداو، لە بیناکراوییدا، وەک دەگوترێ: (لَيْلٌ أَلْيَل) شەوێکی شەو، (ظِلٌّ ظَلِيلٌ) سێبەرێکی زۆر خەست.

٤)- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (مَبْنِيَّة) واتە: ئێستا ئامادەیە (مُهَيَّأ الآن)، بە هەر کام لەو واتایانەش لێک بدرێتەوە، هەر گونجاوە.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**سەرنجڕاکێشانی خوا بۆ مرۆڤان، کە لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوەو، خستوویەتە نێو زەوییەوەو، لە شێوەی کانیی و سەرچاواندا، هەڵیقوڵاندوەو، کشت و کاڵی ڕەنگ جۆراوجۆری پێ ڕواندوە، کە پاش پێگەیشتن و زەرد هەڵگەڕانی، کردوویەتە پووش و پەڵاشێکی وردو خاش، لەوەشدا بیرخەرەوەیەکی گرنگ و گەورە بۆ عاقڵمەندان هەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ئایا نابینی کە خوا ﷻ لەسەرێوە، لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوە! ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، (الإِسْتِفْهَامُ للتقْرِيْر) پرسیارکردن بۆ چەسپاندنە، واتە: وا دەبینی، نەک بۆ پرسیارکردنێکی نکوولّیلێکەرانە بێ، بەڵکو بۆ چەسپاندنە، واتە: ئەوە دەیبینی، ئنجا (تَرَ) دەیبینی، ئایا مەبەست پێی چاوی سەرە؟ کە بە تەئکید بە چاوی سەریش دەیبینین، یاخود مەبەست پێی چاوی عەقڵ و دڵە؟ ئێمە بە چاوی عەقڵ و دڵ دەزانین، خوا ئەو ئاوەی لەسەرێوە دایدەبەزێنێ، هەر ئەو ئاوەیە دەچێتە نێو ناخی زەوییەوەو، دوایی بە شێوەی کانیی و سەرچاوە دێتەدەرو، کشتوکاڵ و شیناوردی پێ دەڕوێنرێ، کە دەفەرموێ: ﴿ مَآءً ﴾ ئاوێک، نەزانراو کردن (تنكير)ەکەی بۆ مەزنکردن (تَعْظِيْم)ە، یانی: ئاوێکی زۆر بەرەکەتدارو بە پێز، ئەو ئاوەش دەبێتەوە بە سێ جۆر: باران و، بەفرو، تەرزە.

٢)- ﴿ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئنجا خستوویەتە نێو سەرچاوەکانی زەوییەوە، (يَنابِيعَ جَمْعُ يَنْبُوعٍ وَهُوَ الْعَيْنُ مِنَ الْمَاءِ)، (يَنابِيعَ) کۆی (يَنْبُوع)ە، کە بە سەرچاوەو کانیی دەگوترێ، (سَلَكَهُ: أَدْخَلَهُ، أَيْ جَعَلَهُ سَالِكًا، أَيْ دَاخِلًا)، واتە: ئاوەکەی خستۆتە نێو زەوی،

بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ ﴾، واتە: خستوویەتە نێو زەوی و لە نێو زەویدا عەمباری کردوە، دوایی لە ڕێی کانیی و سەرچاوەکان و بیرەکانەوە، چ بیری ئاسایی، چ بیری ئیرتیوازیی، جارێکی دیکە هەڵدەقوڵێت و دێتەوەدەر.

٣)- ﴿ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا ﴾، دوایی کشتوکاڵێکی پێ دەردێنێ، (زَرْع) چاوگە، مەبەست پێی بەرکار (مَفْعُول به)ە، واتە: (مَزْرُوع)، (الزَّرْع: مَصْدَرٌ وَيقْصد بِهِ المَزْرُوع)، واتە: ئەوەی دەچێنرێ و دەڕوێنرێ.

٤)- ﴿ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ﴾، ڕەنگەکانی جۆراو جۆرن، (أَلْوَان) کۆی (لَوْن)ە، واتە: ڕەنگ حاڵەتێکە کە لەسەر ڕواڵەتی جەستەکان و تەنە ماددییەکان، لەبەر ڕۆشناییدا دەردەکەوێ.

٥)- ﴿ ثُمَّ يَهِيجُ ﴾، دوایی گەشە دەکات و هەراش دەبێ، (أي: يَغْلُظُ وَيَرْتَفِعُ) واتە: قەبە دەبێ و بەرز دەبێتەوە، (وَحَقِيقَةُ الهِيَاجِ: ثَوْرَةُ الإِنْسَانِ أَوِ الحَيَوَانِ، وَيُسْتَعَارُ الهِيَاجُ لِشِدَّةِ الشَّيْءِ مِنْ غَيْرِ الحَيَوَانِ يُقَالُ: هَاجَتْ رِيحٌ، وَمِنْهُ هِيَاجُ الزَّرْعِ فِي الآيَةِ، لِأَنَّ الزَّرْعَ تَطُولُ سُوقُهُ وَسَنَابِلُهُ)، واتە: (هِيَاج) بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ بەکاردێ، لە کاتێکدا کە مرۆڤ ڕادەپەڕێ و تووڕە دەبێ، یان ئاژەڵ بەلەسەو پەست دەبێ، بەڵام دوایی (هِيَاج) خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێکی دیکە، کە لە غەیری حەیوانیشدا بێتە دی، دەگوترێ: (هَاجَتْ رِيحٌ) بایەک هەڵیکردو، هەروەها دەگوترێ: (هاج الزَّرْعَ)، یانی: کشت و کاڵەکە گەشەی کرد، ئەویش ئەوەیە کە قەددەکەی بەرزدەبێتەوەو، گوڵەکانی گەشە دەکەن و هەراش دەبێ.

٦)- ﴿ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ﴾، تۆ دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوە، (المُصْفَرُّ: ذُو اللَّوْنِ الأَصْفَر) واتە: خاوەن ڕەنگی زەرد، کە واپێدەچێ زیاتر مەبەست پێی حاڵەتی گەیشتن بێ، واتە: گەنم و، جۆ و، نیسک و، نۆک و، ماش و، مەرەزەو، هەرزن و، گەنمەشامیی، هەموو ئەوانە کاتێک پێ دەگەن، زەرد دەبن و، ئەوە نیشانەی پێگەیشتنیانەو، ئەوەش حیکمەتی گەورە خوای تێدایە، چونکە ئەوانە تێکڕا کە دەگەن، زەرد دەبن، بۆ ئەوەی بزانرێ ئەو شتە گەیشتوە.

٧)- ﴿ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ﴾، دوایی (خوا ﷻ) دەیکاتە پووش و پەڵاشێکی تێکشکاو، (الحُطَامُ: المَحْطُومُ، أَيِ المَكْسُورُ المَفْتُوتُ)، (حُطَامُ): بریتیە لە تێکشکێنراو، وردو خاش

کراو، دوای ئەوەی دەبێتە پووش و پەڵاش و دەبێتە پەرێز، دیارە وشک دەبێت و وردو خاش دەبێت.

٨)- ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا بیرخەرەوە هەیە، پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

چۆنیەتی پەیوەست بوونەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە بە ئایەتەکانی پێشەوە، بەدڵنیایی ئایەتەکانی قورئان هەموویان وەک ئاڵقەکانی زنجیرێک بە ئاشکرا دیارە کە هەموویان پێکەوە پەیوەستن، بەڵام هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان، دەبێ وردتر سەرنج بدرێ، ئنجا چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست بوونیان ڕوون دەبێتەوە، بۆ چۆنییەتی پەیوەست بوونەوەی ئەم ئایەتەش بەئایەتەکانی پێشووەوە:

یەکەم: هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەمە سەرنج ڕاکێشانە بۆ پێگەی بەرزی قورئان و، ئەو هیدایەت و ڕێنماییەی کە گرتوویەتە نێو خۆی و، هیدایەتێک کە لە قورئاندا هەیە، تەشبیهکراوە بە حاڵی دابەزێنرانی ئاو لەسەرێوەو، ڕووەک پێ ڕووانی، ئەو هیدایەتەش کە لە قورئاندا هەیە، هیدایەتی خوایە دابەزێنراوەو، دەگونجێ ئەمامی کەسانی بڕواداری پارێزکاری پێ بڕوێنێ لەسەر زەوی.

دووەم: ئەمە گەڕانەوەیە بۆ دووبارە بەڵگە هێنانەوە لەسەر یەکتایی خواو، تەنیا پەرستراوێتیی خوا، کە بەس ئەو بپەرسترێ، بە بەڵگەی ئەوەی دروستکراوەکانی خوا، خەڵک بەردەوام دەیانبینن، بۆ وێنە: ئەم دیمەنی ئاو دابەزێنران لەسەرێوەو پێ ڕوێنرانی کشتوکاڵ و شیناوردو ڕووەک بە گشتیی، کە تەنیا خوا ئەوەی پێدەکرێ، بۆیە دەبێ بەس خواش بپەرسترێ ﷻ.

سێیەم: وشك هەڵگەڕانی ڕووەك و کشتوکاڵ و ڕاماڵینی بەهۆی بایەکانەوە، وەك دیمەنی ئاخیر زەمان و کۆتایی پێهاتنی ژیانی دینایە، کەواتە: خەڵکینە! خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ساز بکەن و تێشوو بۆ ئەو سەفەرەتان ئامادە بکەن و بپێچنەوە!

## حەوت (٧) ڕاستیی کە لەم ئایەتەدا بەرجەستە کراون:

١)- دابەزێنرانی ئاو لەسەرێوە، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە.

٢)- ئەو ئاوە خراوەتە نێو زەوی، چونکە دەگونجا ئاو بێتە خوار، بەڵام زەوی وا نەبێ وەخۆی بگرێ، ئێستا لەبەر ئەوەی باران و بەفرو تەرزە دەبارێ و دەچێتە نێو ناخی زەوی و، لەوێدا عەمبار دەکرێ، پێمان شتێکی سادەو ئاساییە، بەڵام بیهێنە بەرچاوی خۆت: توێخی زەوی بەو شێوەیە نەبووایە کە ئێستا هەیەو، هەمووی بەردبووایە، یان ماددەی کلسیی بووایە، کە ئاو لە خۆیدا کۆ ناکاتەوە، چی لێدەهات؟ ئەو ئاوە هەمووی هەر دەڕۆیی، یان هەمووی لەسەری کۆدەبووە، بەڵام ئێستا خوا ﷻ ئەو زەوییەی وا دروستکردوە، ئەو ئاوە لە نێو خۆیدا کۆ بکاتەوەو عەمباری بکات.

٣)- دەگونجا ئەو ئاوە لە نێو زەویدا کۆبێتەوە، بەڵام نەیەتەدەر، بەڵام خوا ﷻ وای لێکردوەو ئاوەکە لە نێو زەوی دا، دوایی فشارێکی لێ بکرێ و دەربقوڵێ، وەک سەرچاوەی زەڵم، سەرچاوەکان ئاوەکەیان ئەوەندە بەهێز دێتە دەر، ئاوەکە سپییە، چونکە زۆر بە زەخت و فشار هاتۆتە دەرێ، چونکە عەمبارکرانی ئاوەکە لە نێو هەندێک شوێنی زەویدا، دەبێتە گۆمێکی زۆر گەورە، ئنجا هەندێکی ئاستی زۆر بەرزەو فشارێکی زۆر دەکات تاکو ئەو ئاوە دەربقوڵێ، کە دەگونجا بەو شێوەیە نەبێت، بەڵام خوای پەروەردگار شێوەیەکی وای بۆ زەوی هەڵخستوە کە ئەو ئاوە لە خۆیدا کۆ بکاتەوەو، دواییش دەربقوڵێ، ئەگەرنا کێ دەیتوانی بیهێنێتەوەدەر؟ دەبووایە هەموو جارێک بیر لێ بدرێ، تاکو بێتە دەرێ.

٤)- هەروەها دەرهێنران و ڕوێنرانی کشتوکاڵ، کە وشەی (زَرْع) دەگونجێ هەر مەبەست پێی ئەو کشتوکاڵە بێ کە مرۆڤ دەیکات، دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی ئەو ڕووەکە بێ کە لەسەر زەوی دەڕوێ، ئنجا بە شێوەی دارو درەختە، بە شێوەی دانەوێڵەیە،

بە شێوەی سەوزەیە، بە شێوەی تەڕەکارە (زرع)، هەموو ئەو شتانەن کە دەڕوێن، چ دەستی مرۆڤیان تێدابێ، چ دەستی مرۆڤیان تێدانەبێ.

٥)- ئەو کشتوکاڵ و شیناوردو ڕووەکەش، ڕەنگی جیاجیایە، بەهۆی ڕەنگ جیاییەوە دەزانی کە ئەوە گەنمە، ئەوە جۆیە، ئەوە نیسکە، ئەوە نۆکە، هەروەها لە دارو درەختان دا، ئەوە فڵان میوەیەو ئەوە فڵان میوەیە.

٦)- زەرد هەڵگەڕانی ئەو کشتوکاڵەش، چ مرۆڤ کردبێ، وەک جۆرەکانی دانەوێڵە، جۆرەکانی دارو درەخت و تەڕەکارو میوە، یاخود خوا کرد بێ، کە هەمووشی هەر هی خوایە، بەڵام هەندێکی مرۆڤ دەستی تێدەخات، هەندێکی خوا ﷻ ڕاستەوخۆ دروستی دەکات، هەمووی حاڵەتی پێگەیشتنەکەی دیارە، بە هۆی ڕەنگەکەیەوە کە زەرد دەبێ.

٧)- ڕاستیی حەوتەم کە لێرەدا خوا ﷻ باسیکردوە، بریتیە لە وشک هەڵگەڕان و دوایی تێکشکانی ئەوەی کە تاکو دوێنێ سەوز بووەو، دیمەنێکی دیکەی بووە، دوایی وشک دەبێ و، زەرد هەڵدەگەڕێ و دەبێتە پووش و پەڵاش و با ڕایدەماڵێ.

ئنجا ئەمەش جۆرێکی دیکەی پەیوەستکردنی ئەم ئایەتە موبارەکەیە، بە ئەوانەی پێشەوە، کە ئێوە بزانن ئەی مرۆڤەکان! سەرەنجامی ژیانی دنیای ئێوەش هەر ئاوایە، کەواتە: بزانن ڕۆژێک هەیە، تێیدا بە دیداری خوا دەگەنەوەو، ئەو ژیانی دنیایە هەمووی دەپێچرێتەوەو کۆتایی پێ دێ و دەچنەوە بەردەستی خوا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆزدە (١٩) ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (٢٢ - ٤٠)، تەوەری سەرەکییان باسی قورئانەو، باسی خوا بەیەکگرتن و، هاوبەش بۆ خوادانانەو، پشت ئەستوور بوونی ئیمان و خوا بە یەکگرتنە، بە بەڵگەی زگماک و عەقڵ و وەحیی و، پووچەڵیی و بێ بنەمایی کوفرو شیرکە، ئەمانە تەوەرە سەرەکییەکانی ئەو نۆزدە ئایەتەن.

بەڵام وێڕای ئەو تەوەرە سەرەکییانە، چەندان مەسەلەی دیکەی گەورەو گرنگیش تێواخن کراون، لەگەڵ ئەو تەوەرە سەرەکییانەدا، کە ئەم دە (١٠)یە گرنگترینیانن:

١)- سینە گوشادیی و دڵڕەقیی لە بەرانبەر یادی خوادا.

٢)- پێناسەی قورئان بە چاکترین فەرمایشت.

٣)- حاڵ خراپیی بێبڕوایانی ستەمکار لە قیامەتێ دا.

٤)- وەسفی قورئان بەوە کە لە هەموو وێنەیەکی تێدا باسکراوە، بۆ تێگەیاندنی مرۆڤەکان لە ڕاستییە مەعنەوییەکان.

٥)- وێنە هێنانەوە بۆ بابای هاوبەش دانەرو، بابای خوا بە یەککرو تەنیا خواپەرست.

٦)- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە موحەممەد ﷺو، نەیارانی هەموویان هەر دەمرن و، لە قیامەتیش مشت و مڕیان دەبێ لە خزمەت خوای پەروەردگاریاندا.

٧)- بەراوردی نێوان بێبڕوایان و بڕواداران.

٨)- بەس (کافِی) بوونی خوا بۆ پاراستنی بەندەی خۆی.

٩)- تەسلیم بوونی هاوبەشدانەران بەو ڕاستییە، کە جگە لە خوا هیچ بەدیهێنەرێک نیە.

١٠)- بێباکیی دەربڕینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەیارانی.

﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَـٰسِيَةِ قُلُوبُهُم
مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا
مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ
ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ
﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّـٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ
تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾
فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ
ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ
ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَـٰكِسُونَ وَرَجُلًا
سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ
وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ۞ فَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى
لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ
أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ
ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ
مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾
وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ
هَلْ هُنَّ مُمْسِكَـٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ

﴿يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ
عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا کەسێک کە خوا سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام، ئنجا کەوتۆتە سەر ڕووناکییەک لە پەروەردگاریەوە (وەک کەسێکە کە دڵی داخراوەو کەوتۆتە تاریکاییان؟)، سزای سەخت بۆ دڵڕەقان لە ئاست یادی خوادا، ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان ﴿٢٢﴾ خوا باشترین فەرمایشتی دابەزاندوە، کتێبێک (کە لە ڕووی بەش و بابەتەکانیەوە) وێکچوویەو دووپاتکراوەیە، ئەوانەی بە مەزنگرتن و سامیان بۆ پەروەردگاریان هەیە، بە هۆیەوە (مچوڕکەیان پێدادێ و) پێستەکانیان گرژ دەبن، دوایی پێستەکانیان و دڵەکانیان بەرەو لای یادی خوا نەرم دەبن، ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر کەسێکی بوێ بە هۆیەوە ڕاستە ڕێی دەکات و، هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات، هیچ ڕاستە ڕێکەرێکی نیە ﴿٢٣﴾ ئایا کەسێک کە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە ڕووی، خۆی لە ئازاری سەخت و خراپ دەپارێزێ (وەک کەسێکە کە سەلامەت و بێ مزەڕەتە؟) بە ستەمکارانیش گوترا: بیچێژن (سزای) ئەوەی وەدەستتان دەهێنا (لە کاری بەدو ڕەفتاری قێزەون) ﴿٢٤﴾ ئەوانەی لە پێش وانیشەوە بوون (لە گەلانی بێبڕوا)، (پەیامی خوایان ڕەتکردەوەو) بە درۆیان دانا، ئنجا ئازارو سزا (ی خوا)یان لە لایەکەوە (و بە شێوەیەک) بۆ هات کە بە بیریان دا نەدەهات ﴿٢٥﴾ سەرەنجام خوا سزای ڕیسوایی لە ژیانی دنیادا پێ چێژتن و، ئەگەر بشزانن ئازارو سزای (قۆناغی) کۆتایی گەورەتریشە ﴿٢٦﴾ بە دڵنیایی لەم قورئانەشدا لە هەموو وێنەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بەڵکو بیر بکەنەوەو پەند وەربگرن ﴿٢٧﴾ (ئەم کتێبە) قورئانێکی عەرەبییە، خاوەنی

هیـچ جـۆرە لاریـی و ناڕێکییـەک نیـە (دامانبەزانـدوە)، بەڵکـو (مرۆڤـەکان) پارێـز بکـەن ﴿٢٨﴾ خـوا پیاوێکـی بـە وێنـە هێناوەتـەوە: چەنـد خاوەنێکـی پێکـەوە ناکـۆک و ناتەبـا تێیـدا هاوبەشـن و، پیاوێکیـش کـە سـاغ و یەکلابۆتـەوە بـۆ پیاوێـک، ئایـا حاڵیـان یەکسـانە؟ سـتاییش بـۆ خـوا (لەسـەر دەرخسـتنی هـەق و ڕاسـتیی)، بەڵکـو زۆربەیـان نازانـن، (بۆیـە جیاوازیـی ئـەو دوو کەسـە ناکـەن) ﴿٢٩﴾ بـە دڵنیایـی (ئـەی موحەممـەد! کاتێـک دێ:) تـۆش مـردووی و ئەوانیـش مـردوون ﴿٣٠﴾ دوایـی مسـۆگەر ئێـوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا لـەلای پەروەردگارتـان مشـت و مـڕو دەمەقاڵـێ دەکـەن ﴿٣١﴾ ئنجا ئایـا کـێ لـەو کەسـە سـتەمکارترە، کـە درۆی بـە خـواوە کـردوە (هاوبـەشی بـۆ هەڵبەسـتوە)و، ئـەو ڕاسـتییەی بـۆی هاتـوە بـە درۆی دانـاوە! ئایا لـە دۆزەخـدا جـێ بـۆ بێبڕوایـان نیـە؟ ﴿٣٢﴾ ئـەو کەسـەش کـە ڕاسـتیی هێنـاوەو بەڕاسـتیشی دانـاوە، ئـا ئەوانـەن پارێـزکاران ﴿٣٣﴾ هەرچـی بیانـەوێ (لـە نـازو نیعمـەت) لـە لای پەروەردگاریـان (لـە ڕۆژی دواییـدا) هەیانـە، ئـەوەش پاداشـتی چاکەکارانـە ﴿٣٤﴾ (خـوا بەڵێنـی هـەرە چاکـی پێـداون)، تاکـو خراپتریـن کـردەوە کـە کردوویانـە، لێیان بسـڕێتەوەو، بەپێـی باشـترین کردەوەشـیان پاداشـتیان بداتـەوە ﴿٣٥﴾ ئایـا خـوا بـۆ (پاراسـتن و سەرخسـتنی) بەندەکـەی بـەس نیـە! کەچـی ئـەوان بـەو (پەرسـتراو)انەی جگـە لـەوی (دەیانپەرسـتن) دەتترسـێنن! هـەر کەسـێکیش خـوا سـەرگەردانی بـکات، هیـچ ڕاسـتە ڕێ کەرێکـی چنـگ ناکـەوێ ﴿٣٦﴾ هەروەهـا هـەر کەسـێکیش خـوا ڕاسـتە ڕێـی بـکات، هیـچ گومڕاکەرێکـی نابـێ، ئایـا خـوا زاڵـی خـاوەن تۆڵەسـتاندن نیـە؟! ﴿٣٧﴾ ئەگـەر لێشـیان بپرسـی: کـێ ئاسـمانەکان و زەوی دروسـتکردوون؟ بـە جەختکردنـەوەوە دەڵێـن: خـوا، بڵـێ: ئایـا ئەوانەتـان دیـون کـە لـە جیاتی خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوە، ئایـا ئەگـەر خـوا زیانێکـی بـۆم بـوێ: ئـەوان لابـەری زیانەکەینـی؟ یـان ئەگـەر بەزەییەکـی بـۆم بـوێ، ئایـا ئـەوان گێـڕەوەو ڕێگـری بەزەییەکەینـی؟ بڵـێ: خـوام بەسـە، پشـت بەسـتووان تەنیـا پشـت بـەو دەبەسـتن (و منیـش پشـتم بـەو قایمـە) ﴿٣٨﴾ بڵـێ: ئـەی گەلەکـەم! هەرچـی پێتـان دەکـرێ (لـە دژم) بیکـەن، منیـش

بکەرم (بۆ ئەرکی خۆم)، بێگومان لەمەودوا دەزانن ﴿٣٩﴾ کێ ئازارێکی بۆ دێ، ڕیسواو زەبوونی دەکات و، ئازارو سزایەکی بەردەوام و نەبڕاوەی بەسەردا دەچەسپێ ﴿٤٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(شَرَحَ): (أَصْلُ الشَّرْحِ: بَسْطُ اللَّحْمِ وَنَحْوِهِ، وَشَرْحُ الصَّدْرِ: بَسْطُهُ بِنُوْرٍ إِلهِيٍ وَسَكِيْنَةٍ)، وشەی (شَرْح): بریتیە لە پان ڕاخستنی گۆشت، یاخود پەکلاکردنەوەی، هەروەها شێوەی گۆشت، (وَشَرْحُ الصَّدْرِ)یش مەبەست پێی فراوانکردنی سینەی مرۆڤە، بە هۆی ڕووناکییەکی خوایی و، بە هۆی ئارامیی و هێمنییەک کە لە خواوە دێتە دی.

(لِّلْقَسِيَةِ): (القَسْوَةُ: غِلَظُ القَلْبِ، وَأَصْلُهُ مِنْ الحَجَرِ القَاسِي)، وشەی (قَسْوَة): بە پتەویی و ڕەقیی دڵ دەگوترێ، لە ڕیشەشدا وشەی (قَسْوَة): لە (الحَجَرِ القَاسِي)ەوە هاتووە، واتە: بەردی ڕەق، (قَاسِيَة)ش کۆی (قَاسِي)یە، (حَجَرٌ قَاسٍ، وأحْجَارٌ قَاسِيَة)، بەردی ڕەق و بەردە ڕەقەکان.

(مَّثَانِيَ): (لأَنَّهَا تُثَنَّى أَي: تُكَرَّرُ عَلَى مُرُورِ الأَوْقَاتِ، وَالمَثْنَى مَا يُعَادُ مَرَّتَيْنِ، وَيَصِحُّ أَنْ يَكُونَ مِنَ الثَّنَاءِ)، (مَثَانِي) کۆی (مُثَنَّى)یە، چونکە ئایەتەکان دووبارە دەبنەوە بەپێی دووبارە بوونەوەی کاتەکان، (المُثَنَّى) هەر شتێکە کە دووبارە ببێتەوە، دەشگونجێ (مَثَانِي) لە (ثَنَاء)ەوە هاتبێ، لەبەر ئەوەی ستاییشی خوایان پێدەکرێ.

(تَقْشَعِرُّ): (تَعْلُوهَا قُشَعْرِيْرَة)، (قُشَعْرِيْرَة): بە مانای تەزوو، مچووڕکە دێ، کە پێست ڕێک دێ لە کاتی سەرمادا، یان لە کاتێک دا ئینسان ترسێکی بۆ دێ، یاخود حاڵەتێکی عاتیفیی بەهێز ڕووی تێدەکات، مچووڕکەی پێ دادێ، تەزووی پێ دادێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (قُشَعْرِيْرَة).

(ٱلْخِزْىَ): (خَزِيَ الرَّجُلُ: لَحِقَهُ انْكِسَارٌ إمَّا مِنْ نَفْسِهِ، أو إمَّا مِنْ غَيْرِهِ)، (خَزِيَ الرَّجُلُ) واتە: بە خۆدا شکانەوەی تووشبوو، یان لە زاتی خۆیدا، یان بە هۆی کەسێکی دیکەوە تەریق کرابێتەوە.

(ذِى عِوَجٍ): خاوەن لاریی، (العَوْجُ: العَطْفُ عَلَى حَالِ الإنْتِصَابِ)، (عَوْج): بریتیە لە شتێک کە پێشێ ڕاست بێت، دوایی بنووشتێتەوە، (عَوَج: يُدْرَكُ بِالبَصَرِ، وَعِوَج: يُدْرَكُ بِالبَصِيْرَة)، وشەی (عَوَج) لارییەکە بە چاو ببینرێ، دەگونجێ بڵێی: (هَذَا العُودُ بِهِ عَوَج)، ئەم دارە لاریی تێدایە، بەڵام (عِوَج) ئەوەیە کە بە عەقڵ و دڵ دەرک بکرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿غَيْرَ ذِى عِوَجٍ﴾، لە ڕووی مەعنەوییەوەو لە ڕووی واتایەوە قورئان لاریی و ناڕوونیی تێدانیە.

(مُتَشَٰكِسُونَ): (الشَّكِسُ: السَّيِّءُ الخُلُقِ، وَمُتَشَاكِسُونَ أي: مُتَشَاجِرُونَ لِشَكَاسَةِ خُلُقِهِمْ)، (شَكِسْ) واتە: ڕەوشت دزێو، ڕەوشت خراپ، شڕو دڕ، (مُتَشَاكِسُون: مُتَشَاجِرُونَ)، بە دەمەقاڵە هاتوو، لەبەر ئەوەی ڕەوشتیان پێکەوە ناڕێکە، هەمیشە پێکەوە خەریکی دەمەقاڵێ و مشت و مڕو دەمبەدمەن.

(سَلَمًا): (السَّلْمُ وَالسَّلَامَة: التَعَرِّي مِنَ الآفَاتِ الظَّاهِرَةِ وَالبَاطِنَة)، وشەی (سَلْمُ وَسَلَامَة): بریتیە لە داڕنران لە دەردە ڕواڵەتیی و پەنهانەکان، واتە: بێ بەڵایی و سەلامەتیی.

(بِكَافٍ): (الكِفَايَةُ: مَا فِيهِ سَدُّ الخَلَّةِ وَبُلُوغُ المُرَادِ فِي الأَمْرِ)، (كِفَايَة): بریتیە لە شتێک کە ببێتە هۆی کەلێن پڕکردنەوەو، گەیشتن بە ئامانج لە کارێکدا.

کەواتە: (أليس الله بِكَافٍ عبده)، ئایا خوا ﷻ بۆ بەندەکەی بەس نیە، تەواو نیە؟ یانی: خوا بۆ تۆ بەسە، بۆ پاراستنت، بۆ سەرخستنت، بۆ ڕێنمایی کردنت، بۆ خستنە سەر ڕێگای ڕاستت.

(ذِى ٱنتِقَامٍ): خاوەن تۆڵەستاندن، (نَقَمْتُ الشَّيءَ، وَنَقِمْتُهُ، إذَا أَنْكَرْتَهُ إمَّا بِاللِّسَانِ، وَإمَّا بِالعُقُوبَةِ)، (نَقَمَ و نَقِمَ): بە مانای (عَابَ)ە، (نَقَمْتُ الشَّيءَ وَنَقَمْتُهُ) ئەو شتە ڕەخنەم لێگرت، نکووڵییم لێکرد، چ بە زمان، چ بە سزادان.

(مَكَّنَّاكُمْ): (مَكَّنْتُه فَتَمَكَّنَ) واته: توانام پێداو، بوو به خاوه‌ن توانا، یاخود جێگیرم کرد، نیشته‌جێم کرد، (مَكَّنْتُكُم) واته: چی له تواناتاند هه‌یه بیکه‌ن.

(وَيَحِلُّ عَلَيْهِ): سزایه‌کی به‌رده‌وام دێته سه‌ری، (حَلَلْتُ: نَزَلْتُ، أَصْلُهُ مِنْ حَلِّ الْأَحْمَالِ عِنْدَ النُّزُولِ)، (حَلَّ عَلَيْهِ ضَيْفاً) واته: دابه‌زیه لای، (حَلَّ: نَزَلَ)، (حَلَلْتُ) دابه‌زیم، له چییه‌وه هاتوه؟ له‌وه هاتوه کاتێ خۆی بارو سواریان هه‌بووه، وڵاخیان پێ بووه، ئنجا که دابه‌زیون، وڵاخه‌کانیان ڕاگرتوون و باره‌کانیان کردوونه‌وه، ئه‌وه پێی گوتراوه: (حَلُّ الْأَحْمَالِ) واته: باره‌کانیان کردوونه‌وه، باره‌کانیان داگرتوون، دوایی بوون به میوان و له لای خانه خوێیه‌که دابه‌زیون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەو ئایەتانەدا کە ئێمە کردوومانن بە دەرسی سێیەم، لەو نۆزدە ئایەتەدا، سەرەتا باس و بەراوردی دوو جۆرە کەس دەکات: کەسێک کە دڵ و سینەی ئاوەڵاو گوشاد بووە بۆ ڕووناکیی هیدایەتی خواو، جۆرە کەسێکی دیکەش کە دڵیان ڕەقە لە ئاست یادی خوادا، دوایی خوا ﷻ باسی قورئان دەکات کە بەباشترین فەرمووده ﴿أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾، پێناسەی دەکات و چەند سیفەت و چەند شوێنەوارێکی قورئان باس دەکات.

دوایی خوا ﷻ باسی ناکام و سەرەنجامی شووم و خراپی بێبڕوایانی ستەمکار دەکات، دواتر دێتە سەر باسی وێنە هێنانەوە لە قورئاندا، پاشان جارێکی دیکە وەسفی قورئان دەکات، بەوە کە هیچ لاریی و ناڕێکییەکی تێدا نیە، دوایی خوا ﷻ وێنە دێنێتەوە بۆ کەسێک کە وێڕای خوا ﷻ، یاخود جگە لە خوا، پەرستراوانێکی دیکە دەپەرستێ، کەسێکیش کە خۆی ساغ و یەکلاکردۆتەوە بۆ خوا، بەو شێوەیە خوا ﷻ کۆمەڵێک بابەت لەم نۆزدە ئایەتەدا دەخاتەڕوو، کە کاتی خۆی لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، ئێمە لە دە (١٠) بابەتدا خستماننەڕوو.

ئنجا ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، وەک پێشتریش گوتوومانە: هەندێکی بە ڕوونیی چۆنیەتی پێکەوە پەیوەست بوونی ئایەتەکانی دیارە، هەر کامێکیان وەک ئاڵقەکانی زنجیرێک ئەوی دیکە دەگرێ، بەڵام هەندێک جار پێویستیی بە لێوردبوونەوەی زیاتر دەکات، هەڵبەتە تاکو مرۆڤ زیاتر لە قورئان وردبێتەوە، نهێنیی زیاتری بۆ دەردەکەون و، ڕاستیی زیاتری دەستگیر دەبن، لێرەدا خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەکات:

﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾، ئایا کەسێک کە خوا سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام، بۆ ملکەچیی، چونکە ئیسلام لە ئەسڵدا

بە مانای ملکەچیی و گەردنکەچیی بۆ خوا ﷻ دێ، دوایش وەک شتێکی باو و عورفیی بۆتە ناو، بۆ دواییـن پەیامی خوا، ئایا کەسێک کە خوا سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام و بۆ پەیامی خۆی، ﴿ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا کەوتۆتە سەر ڕووناکییەک لە پەروەردگاریەوە، چاوەڕێ دەکرێ کە بگوترێ: ئایا وەک کەسێک وایە کە دڵ و سینەی داخراوە بەرانبەر بە هیدایەت و پەیامی خوا؟ بەڵام خوا ﷻ بە تەعبیرێکی دیکە دەیهێنێ، دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، سزای سەخت، یاخود هاوار بۆ ئەوانەی دڵیان ڕەقە لە بەرانبەر یادی خوادا، واتە: کەسانێک کە دڵی خۆیان ئاوەڵا کردۆتەوە، دەروازەی دڵ و سینەی خۆیان کردۆتەوە بۆ هیدایەت و پەیامی خواو، پێشوازییان لێ کردوە، زۆر جیان لە کەسێک کە دڵی ڕەق و سەختە، لە بەرانبەر یادی خوادا، شتی سەخت و ڕەقیش، شتی دیکەی ناچێتە نێو، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادان.

ئنجا خوا ﷻ ئەو هیدایەت و ڕۆشناییەی کە کەسانی بڕوادار، دڵ و سینەی خۆیانی بۆ دەکەنەوەو، بە دڵ پەسندی دەکەن، دەروازەکانی دڵی خۆیانی بۆ دەکەنەوە، پێناسە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ ﴾، خوا باشترین فەرمایشتی دابەزاندوەو، پلە پلەش دایبەزاندوە، چونکە وشەی (نَزَّلَ)، کە چاوگەکەی (تَنْزِيل)ە، (نَزَّلَ، يُنَزِّلُ، تَنْزِيلاً)، بریتیە لە دابەزاندنی شتێک کە پلەو پلەو بەش بەشە، بە پێچەوانەی (إنزال)ە، (أنزل، يُنزِل، إنزالاً)، (إنزال) بریتیە لە دابەزاندنی یەکسەر، قورئان لە ماوەی (٢٣) ساڵدا بۆ سەر دڵ و سینەی موبارەکی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزیوەو، ئەویش هەوڵیداوە لە عەقڵ و دڵی بڕوادارانـدا نیشتەجێی بکات.

ئنجا دوای ئەوەی خوا قورئان بە باشترین فەرمایشت پێناسە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ ﴾، کتێبێکە، واتە: نووسراودیەکە، ﴿ مُّتَشَٰبِهًا ﴾، وێکچوویە، بەشەکانی و ئایەتەکانی وێک دەچن، ﴿ مَّثَانِيَ ﴾، کۆی (مُثَنَّى)یە، واتە: دووبارە

کراوەیە، بابەتەکان لە قورئاندا دووبارە دەبنەوە، بەڵام نەک دووبارە بوونەوەی ڕووت، بەڵکو بۆ جەختکردنەوەو، هەرجارێک هەر بابەتێک لە قورئاندا لە جارێک زیاتر، دوو سێ تاکو چەند جار دووبارە بێتەوە، جگە لە چەند شوێنێکی هەڵاوێردراو، کە بە دەق دووبارە دەبنەوە، وەک خۆیان، ئەگەرنا ئەوی دیکە هەمووی جیایە، هەر جارێک کە دێ، بەشێوەیەکی دیکە دێ، بە تام و چێژێکی دیکەوە، بۆ کەسانێک کە ورد سەرنجی قورئان بدەن و لێی وردبنەوە، بۆیان دەردەکەوێ بابەتێک هەر جارێک کە دێ، نهێنییەکی دیکەی هەڵگرتوە، یاخود گۆشەیەکی دیکە لەو بابەتە کە دەویسترێ باس بکرێ، لەو جاری دووەم و سێیەم و چوارەمدا، کە هاتوە، گۆشەیەکی دیکە خراوەتە ڕوو، ﴿ مَّثَانِيَ ﴾، هەم دەگونجێ کۆی (مُثَنَّى) بێ، واتە: دووان، دووبارە، هەم دەشگونجێ کۆی (مَثْنى) بێ، لە (ثَناءُ)ەوە شتێک کە سەنا و ستاییشی خوای پێ بکرێ، ﴿ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾، پێستی ئەوانە ڕێک دێ و مچوڕکەی پێدا دێ، کە ترس و بیمیان لە بەرانبەر پەروەردگاریاندا هەیە، سام و هەیبەتیان هەیە، چونکە وشەی (خَشْية) لەگەڵ (خَوْف) جیاوازییەکەیان ئەوەیە (خَوْف) واتە: ترسان، بەڵام (خَشْية) بریتیە لە لێترسان و سام لێ کردن بە مەزنگرتنەوە، ئەوانەی سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، پێستیان تەزووی پێ دادێ، مچوڕکەی پێ دادێ، چونکە ﴿ تَقْشَعِرُّ ﴾، واتە: (تَأْخُذُهَا القُشَعْرِيرَةُ)، واتە: مچوڕکەی دەیگرێ.

﴿ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، لە سەرەتاوە مچوڕکە بە پێستیاندا دێ، تەزووی پێ دادێ، پێستیان ڕێک دێ، بەڵام دوایی پێستەکانیان و دڵەکانیان بەرەو یادی خوا نەرم دەبن، لە سەرەتاوە گرژ دەبن، دوایی وردە وردە دڵ و پێستیشیان نەرم دەبێ بۆ ئەو هیدایەتەی خوا، ﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، ئا ئەو حاڵە کە باسکرا، ڕێنمایی خوایەو هەر کەسێک خوا بیەوێ پێی ڕاستە ڕێ دەکات، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾،

هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات، هیچ ڕاستە ڕێکەرێکی نابێ، ﴿يَهۡدِي بِهِۦ﴾، واتە: پێی ڕاستە ڕێ دەکات، وشەی (هداية) لە: ﴿يَهۡدِي﴾دا، جیایە لە واتایەکەی لە: ﴿هُدَى﴾دا، کە لە ڕستەی پێشێ دا هاتوە: ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ﴾، ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، بەڵام: ﴿يَهۡدِي بِهِۦ﴾، بە مانای ڕێنمایی دەکات، نیە، بەڵکو یانی: ڕاستە ڕێ دەکات، ئەگەرنا خوا هیدایەتی خۆی بۆ هەمووان ناردوەو هەمووی ڕێنمایی کردوون، بەڵام ئەوانەیان ڕاستە ڕێ دەکات، کە هیدایەتەکەی خوا ﷻ قبووڵ دەکەن و وەری دەگرن، بەڵام هەر کەسێک خوا گومڕای بکات، لەبەر ئەوەی هیدایەتی خوای قبووڵ نەکردوە، هیچ ڕاستە ڕێ کەرێک بۆ وی چنگ ناکەوێ.

ئنجا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی شووم و خراپی ئەوانە دەکات، کە پشت لە هیدایەتی خوا دەکەن، دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجۡهِهِۦ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، ئایا کەسێک کە بەهۆی ڕوویەوە، خۆی لە سزاو ئازاری خراپی ڕۆژی قیامەت دەپارێزێ، واتە: ڕوو (وجه)ی دەکاتە پارێزەری خۆی، واتە: ئایا کەسێک کە ئاوایە، - بەرانبەرەکەی دیسان باس نەکراوە - وەک کەسێک وایە کە دڵنیاو سەلامەت و، بێ مزەڕەتە؟ ﴿وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ﴾، بە ستەمکارانیش گوترا: بیچێژن ئەوەی وەدەستتان دەهێنا، واتە: سزای ئەوەی وەدەستتان دەهێنا، کە دەفەرموێ: بەرووی خۆی خۆی دەپارێزێ، مرۆڤ سروشتی وایە دەم و چاوو ڕووی، لە هەموو شوێنێکی دیکەی لەلا گرنگترە، ئەگەر زەبرێکی بۆ بێ، دەست بە دەم و چاویەوە دەگرێ، بەڵام ئەوانە مەگەر بە ڕوویان و بە دەم و چاویان خۆیان لە ئاگر بپارێزن، ئەگەرنا هیچ هۆکارو ئامرازێکی دیکەیان نیە، خۆیانی پێ لە سزای خراپ و سەختی ڕۆژی دوایی و ڕۆژی قیامەت بپارێزن.

هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: بۆیە وا دەفەرموێ: چونکە ئەوانە دەستیان کەلەپچە کراوە لە پشتەوەو، یان لە پێشەوە، مەجالیان نیە کە دەست هەڵێنن و بە دەم و چاوی خۆیانەوە بیگرن.

﴿ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئەوانـەی پێـش وانیـش بـە درۆیـان دانـا، چییـان بـە درۆیـان دانـا؟ پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـان و پەیامـەکانی خوایـان بـە درۆ دانـان، ﴿ فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، ئنجـا ئـازارو سـزایان بـۆ هـات لەلایەکـەوە، بـە شـێوەیەک کـە هەسـتیان پـێ نەدەکـرد.

﴿ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ئیـدی خـوا (سـزای) سەرشـۆڕیی و زەبوونیـی پـێ چێژتـن لـە ژیـانی دنیـادا، یـانی: هەر لـە ژیـانی دنیـادا بەهـۆی پشـتکردنە هیدایـەتی خـواو، بـە درۆ دانـانی پەیامـی خـواو پێغەمبـەرانی خـواوە (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، خـوا زەبوونیـی و سەرشـۆڕیی بـۆ کـردن بـە سـزایەک و، پێـی چێژتـن لـە ژیـانی دنیـادا، ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئـازارو سـزای ڕۆژی دوایـی و مەنزڵـگای کۆتایـی، گەورەتریشـە ئەگـەر بزانـن، واتـە: ئەگـەر بزانـن بۆیـان دەردەکـەوێ کـە سـزای ڕۆژی دوایـی، زۆر گەورەتـرە لـەوەی دنیـا، کـە لـە ئەنجامـی بێبڕوایـی دا دووچـاری دەبـن.

﴿ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی بـۆ خەڵـک لـەم قورئانـەدا لـە هەمـوو وێنەیەکـمان هێناوەتـەوە، بەڵکـو پەنـد وەربگـرن، بیریـان بکەوێتـەوە، تێبگـەن، چونکـە وشـەی (تَذَكُّر): بـە هەمـوو ئـەو واتایانـە دێ، بـە مانـای: بیرکەوتنـەوە دێ، بـە مانـای پەنـد وەرگرتـن دێ، بـە مانـای تێگەیشـتن دێ، بـە مانـای خـۆ ڕاسـت کردنـەوە دێ، کـە دەفەرموێ: لـە هەموو وێنەیەکـمان هێناوەتـەوە، واتـە: لـە هەمـوو وێنەیـەک کـە بـۆ ئـەوان پێویسـت بـێ، تاکـو ڕاسـتییەکانیان بـۆ دەربکـەون، لـە قاڵـب و بۆتەیەکـی وادا، کـە بتوانـن بـە چاوی خەیـاڵ تەماشـایان بکـەن، چونکـە بابەتـە مەعنەوییـەکان وەختێـک کـە دەخرێنـە نێـو دوو توێـی وێنـە هێنانـەوەوە، ئـەو کاتـە مـرۆڤ باشـتر لێیـان تـێ دەگات، چونکـە ئـەو کاتـە بـە چـاوی خەیاڵیـش دەگونجـێ سـەرنجیان بـدات، وەک دوایـی خـوا ﷻ وێنەیـەک دێنێتـەوە.

﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، ئەم قورئانە قورئانێكی عەرەبییە، واتە: ڕۆشنە، ﴿ غَيْرَ ذِى عِوَجٍ ﴾، لە ڕووی بێژەكەیەوەو لە ڕووی پاراوییەوە ڕۆشنە، لە ڕووی ماناكەشیەوە هیچ نارێكیی و لارییەكی تێدانیە، ﴿ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، خوا ﷻ دایبەزاندوە بەڵكو پارێز بكەن.

ئنجا كە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە هەموو وێنەیەكمان بۆ خەڵك هێناوەتەوە، بەڵكو پەند وەربگرن، یەكێك لە وێنەكان دەفەرموێ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ ﴾، خوا ﷻ وێنەی هێناوەتەوە بە پیاوێك كە چەند هاوبەشێكی پێكەوە ناكۆك و ناتەبا خاوەنینی و، وێنەیەكیشی هێناوەتەوە بە پیاوێك كە تایبەتە بە پیاوێكەوە، واتە: عایدی یەك كەسە، یەك كەس فەرمانی پێدەكات، ئنجا چ مەبەست پێی ئەوەبێ: ئەوەی دیكە چەند خاوەنێكی هەن، واتە: كۆیلەیە، یاخود مەبەست ئەوە بێ: كارمەندێكەو لە چەند بەڕێوەبەرێكەوە فەرمانی بۆ دەچێ، بەڵام ئەوی دیكە، بەس یەك كەس فەرمانی پێ دەكات، یەك مرۆڤ ناڕاستەی دەكات، ﴿ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ﴾، ئایا حاڵیان یاخود، سیفەتیان وەك یەكە؟! ئەوە پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانەیە، یانی: وەك یەك نین، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ستاییش بۆ خوا، ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، (وەك یەك نین)، بەڵام زۆربەیان نازانن، واتە: لەبەر ئەوەی زانیاریان نیە، بۆیە جیاوازیی لە نێوان تەنیا خواپەرستیی و هاوبەش پەرستییدا ناكەن، كە بابای هاوبەش پەرست، وەك كەسێكە كۆمەڵێك خاوەنی هەبن، نەزانێ بە قسەی كامەیان بكات، كۆمەڵە خاوەنەكەش پێكەوە ناكۆك و ناتەبابن، یەكیان بڵێ: بەو لاوە برۆ، یەكیان بڵێ: بەملاوە برۆ، یەكیان بڵێ: وابكە، یەكیان بڵێ: نەخێر وابكە، كابرا سەری لێ دەشێوێ، بەڵام بابای خواپەرست وەك كەسێكە كە یەك كەس، یەك پیاو، یەك خاوەنیەتی، یان یەك بەڕێوەبەر فەرمانی پێدەكات و دەڵێ: فڵان كارە ئەنجام بدە! ئەویش دەزانێ چی بكات و چۆن بكات!

دوایی خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾، بە دڵنیایی تۆ مردووی و، ئەوانیش مردوون، هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (مَيِّت) ئەگەر بە گیرە (شدَّة) بێ، واتە: کەسێک کە لە داهاتوودا دەمرێ، بەڵام ئەگەر (مَيْت) بێ، واتە: مردووەو لێ بۆتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (مَيِّت) و (مَيْت) هەر یەک واتایان هەیە، بەڵام بە دڵنیایی ئەو کاتەی خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزاندوون، زیندوو بووە، کەواتە: یانی: تۆ لە داهاتوودا دەمری، بەڵام چونکە لە داهاتوودا بە مسۆگەریی دەمری، وەک ئێستا مرد بێ وایە، ﴿وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾، ئەوانیش بە دڵنیایی هەر دەمرن.

ئنجا وەک توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەمە وەڵامی بێبڕوایەکانە کە خوا لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ۝٣٠﴾ الطور، واتە: یان دەڵێن: شاعیرێکە چاوەڕێ دەکەین، داخۆ کەی مردنی دەگاتێ، مەرگی بەسەر دادێ (و قوتار دەبین لە دەستی)، خوا ﷻ دەفەرمووێ: تۆش دەمری و ئەوانیش دەمرن.

﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾، دوایی بە دڵنیایی ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای پەروەردگارتان، دەکەونە دەمەقاڵێی و مشت و مڕو ناکۆکییەوە، واتە: خوا دادوەریتان لە نێواندا دەکات، کە تۆ بانگت کردوون بۆ پەیامی خوا، بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، کە مایەی سەربەرزیی دنیاو دواڕۆژەو، مایەی کۆک بوون و تەبابوونی مرۆڤە لەگەڵ خۆیداو، لەگەڵ دەوروبەریدا، وێڕای ئەوەی لەگەڵ خوای پەروەردگاریشی دا، بانگت دەکردن کە خۆیان لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بپارێزن، کە هاوبەش بۆ خوا دانان دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ خۆیشی دا بەشەڕ بێ، لەگەڵ دەوروبەریشی دا تێک بگیرێ و، خوای پەروەردگاریشی لێ نارازیی بێ و، لە دنیاو دواڕۆژدا مایەی شەرمەزاریی بێ.

دوایی خوا ﷻ هەر لەو سیاقەدا دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ؟ درۆ لەسەر خوا دەکات؟ واتە: کە دەڵێ: خوا هاوبەشی هەیەو ڕۆڵەی هەیە، ئەوە درۆکردنە لەسەر خوا، کێ لەو کەسە ستەمکارترە؟ ﴿وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ﴾، هەروەها کێ ستەمکارترە لەو کەسەی بێبڕوا دەبێ بە ڕاستیی، دوای ئەوەی بۆی هاتوە، خوا ﷻ قورئان و پەیامی خۆی ناو ناوە: (صدق)، چونکە ڕاستیی گرتۆتە نێو خۆی، بە مانای تەواوی وشەی ڕاستیی، ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ﴾، پرسیارکردنەکە پرسیاری نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: هیچ کەسێک ستەمکارتر نیە لەو کەسەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ و ڕاستییەکیش کە بۆی دێ، لە خواوە بە درۆی دادەنێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ﴾، ئایا لە دۆزەخدا شوێنی حەوانەوە نیە بۆ بێبڕوایان؟ بە تەئکید با.

﴿وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾، ئەو کەسەش کە کە ڕاستیی هێناوەو بەڕاستیشی داناوە، واتە: ئەو ڕاستییەی بە ڕاست داناوەو، پەسندی کردوە، ئا ئەوانەن پارێزکاران.

﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، هەرچی بیانەوێ لە خزمەت پەروەردگاریاندا هەیانە، هەموو شتێکیان هەیە، ﴿ذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ﴾، ئەوەش پاداشتی چاکەکارانە، کە هەرچی دڵیان بیخوازێ و داوای بکەن لە خزمەت پەروەردگاریانداو، لە ڕۆژی دواییدا، هەیانە، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (ق)دا دەفەرموێ: ﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: هەرچی بیانەوێ لەوێدا بۆیان هەیەو، زیادەشمان لەلایە.

﴿لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، تاکو سەرەنجام خوا ﷻ خراپترینی ئەوەی کردوویانە، لێیان

بسڕێتەوەو، پاداشتیشیان بداتەوە بە پێی باشترینی ئەوەی ئەنجامیان داوە، واتە: کردەوە خراپەکانیان لێ دەسڕێتەوەو، چاکەکانیشیان بەپێی باشترین کردەوەی باشیان، پاداشتیان دەداتەوە، ئەو چاکەکارانە سەرەنجامەکەیان ئاوایە، (ل)ی سەر: ﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾، بە ڕواڵەت بۆ تەعلیلە، بەڵام لە ڕاستییدا (ل) ی سەرەنجامە، واتە: سەرەنجامیان ئاوا دەبێ.

﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥ﴾، ئنجا لە وەڵامی ئەوەدا کە بێبڕوایەکان پێغەمبەری خوایان ﷺ دەترساندو دەیانگوت: پەرستراوەکانمان زیانت پێ دەگەیەنن، دەفەرموێ: ئایا خوا ﷻ بەس نیە بۆ بەندەی خۆی! بەس نیە کە بیپارێزێ، هیدایەتی بدات، ئاگای لێ بێ، مشووری بخوات؟ بە تەئکید بەسە، ﴿وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ﴾، بەوانەش کە لە خوار خواوەن، یاخود جگە لە خوان ﷻ، دەتترسێنن، ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾، هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات، هیچ ڕێنماییکارو، یاخود هیچ کەسێکی نیە کە بیخاتە سەر ڕێ، هیچ ڕاستەڕێکەرێکی نیە.

﴿وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾، هەروەها هەر کەسێکیش خوا ﷻ بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، هیچ گومڕاکەرێکی نابێ، هیچ کەس ناتوانێ گومڕایی بکات و سەری لێ تێک بدات، ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٖ ذِي ٱنتِقَامٖ﴾، ئایا خوا زاڵی خاوەن تۆڵە نیە؟ بە تەئکید خوا باڵا دەستەو، خاوەن تۆڵەشە.

﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾، ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون؟ زۆر بە جەختکردنەوە دەڵێن: خوا ﷻ، ﴿قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، بڵێ: ئایا بینیوتانن (بە چاوی عەقڵ و دڵ، یاخود بە چاوی سەر)، ئەوانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە، ﴿إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ﴾، ئەگەر خوا ﷻ زیانێکی بۆم بوێ، ﴿هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ﴾، ئایا ئەو پەرستراوانەی ئێوە لابەری ئەو زیانە

دەبن، کە خوا بۆ منی دەوێ؟ ﴿ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ ﴾، یان ئەگەر (خوا ﷻ) بەزەییەکی بۆ من بوێ، چاکەو خێرێکی بۆ من بوێ، ﴿ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ﴾، ئایا ئەو پەرستراوانە، گێڕەرەوەی بەزەیی خوا دەبن، بەرپەرچدەرەوەی دەبن، دەتوانن بەزەیی خوا بگرن و نەهێڵن بۆم بێ؟ ﴿ قُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ ﴾، بڵێ: خوام بەسە، ﴿ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾، پشت بەستووان هەر پشت بەو دەبەستن، واتە: پشت بەستووانێک کە عاقڵمەندن، تێگەیشتوون، تەنیا پشت بە خوا دەبەستن، بە تەمای لوتف و مەرحەمەتی جگە لەو نین، تەنیا چاویان لە بەزەیی و لوتف و کەرەمی ئەوە.

﴿ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ ﴾، بڵێ: ئەی خەڵکەکەم! ئەی گەلەکەم! ئەوەی لە تواناتاندا هەیە بیکەن، یان لە شوێنی خۆتانەوە چیتان پێدەکرێ بیکەن، ﴿ إِنِّي عَٰمِلٌ ﴾، منیش ئەنجامدەرم، واتە: ئەنجامدەرم بۆ ئەوەی فەرمانم پێکراوە، ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم، ئێوە ئەوەی پێتان چاکە بیکەن، منیش ئەوەی فەرمانم پێکراوە، ئەنجامی دەدەم، ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن (ئێوە سەرەنجامتان چۆن دەبێ، منیش سەرەنجامم چۆن دەبێ، لە مەودوا دەزانن کە کارەکەی ئێوە چی لێ هەڵدەوەرێ، چ بەرهەمێکی دەبێ، کارو ئەرکەکەی بە منیش سپێردراوە، چ بەرهەمێکی دەبێ؟)، ئێستا ئێمە زۆر چاک دەزانین چۆن بوو، ئەوانەی دژو نەیاری پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، فڕێدرانە نێو زبڵدانی مێژووەوە، نە ناویان ماوە، نە ڕێبازیان ماوە، نە شوێنەواریان ماوە، هیچ شتێکیان نەماوە، مەگەر وەک پەندو عیبرەت باس بکرێن، (**أبو جهل، نضر بن الحارث، أمية بن خلف و ... هتد**)، پێغەمبەریش ﷺ ئەوە دیارە ناوو ناوبانگی و، خێرو بەرەکەتی پەیامەکەی بە دنیادا بڵاوبۆتەوە.

ئنجا بۆیە دەفەرموێ: لە مەودوا دەزانن، ﴿ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ ﴾، کێ ئازارو سزایەکی بۆ دێ، زەبوون و سەرشۆڕی دەکات، ﴿ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾، ئازارێکی نیشتەجێ، یەخەی دەگرێ، ئازارێکی نەبڕاوەو نەپساوە دێتە

سەری. ﴿وَيَحِلُّ عَلَيْهِ﴾، (يَقَعُ عَلَيْـهِ و يَثْبُـتُ عَلَيْـهِ)، وەک پێشتریش باسمانکرد، (حَلّ، يَحِلُّ) لەوەوە هاتووە، کە کاتێ خۆی کەسێک چۆتە ماڵی خانە خوێیەک بە میوانیی، ئەگەر وڵاخی پێ بووبێ و بارگەیەکی پێ بوو بێ، بارەکەی کردۆتەوەو، بارەکەی خستوە. لەوەوە هاتوە، کەوانە: (حَلَّ عَلَيْهِ، يَحِلُّ) واتە: (وَقَعَ عَلَيْهِ) یان (نَزَلَ عَلَيْهِ) دابەزیە لای و کەوتە سەری.

ئەمەش هەڕەشەیەکی گەورەو گرنگە. بەڵام باسی ئەوەی نەکردوە، کە ئەو (محمد) سەرەنجامی چۆن دەبێ؟ چونکە پێشتر باسکراوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**کەسێک خوا ﷻ سینەی ئاوەڵا کردبێ بۆ ئیسلام، بۆ ملکەچیی بۆ خواو، وەرگرتنی پەیامی خوا، جیاوازەو، پێچەوانەی کەسێکە کە دڵی لە ئاست یادی خوادا، سەخت و ڕەق و داخراوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ﴾، ئایا کەسێک کە خوا ﷻ سینەی ئاوەڵا کردۆتەوە بۆ ئیسلام، (الشَّرْحُ: شَقُّ اللَّحْمِ): (شرح) بریتیە لە لەتکردن و ئاوەڵا کردنی گۆشت، کە دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ﴾، (صَدْر): یانی: سینە، بەڵام بە تەئکید مەبەست پێی دڵێکە لەنێو سینەدا هەیەو، ئەویش دیسان مەبەست پێی دڵی مەعنەویی و نابەرهەستە، نەک دڵی گۆشتین، ئاوەڵا کردنیش مەبەست پێی ئەوەیە کە دڵی وا لێکردوە ملکەچیی بۆ خواو، بۆ پەیامی خوا، ئیسلامی بچێتە نێو، کە دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ﴾، ئەم (ل)ی (للإسلام)، یانی: (لأَجْلِ الإِسْلَامِ)، لەبەر خاتری ئیسلام و ملکەچیی بۆ خوا، دڵی یەکالاو یەکلاکردۆتەوە.

٢)- ﴿فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، سەرەنجام ئەو کەسە کەوتۆتە سەر ڕووناکییەک لە پەروەردگاریەوە، وشەی (عَلَى) کە دەفەرموێ: ﴿فَهُوَ عَلَىٰ﴾، (عَلَى: لِلتَّمَكُّنِ مِنَ النُّورِ)، بۆ ئەوەیە کە ئەو کەسە، چاک دەستی لە ڕووناکیی پەروەردگاری گیر بووە، (النُّورُ: مُسْتَعَارٌ

لِلهُدَى وَوُضُوحِ الحَقِّ، لِأَنَّ النُّورَ تَنْجَلِي بِهِ الأَشْيَاءُ). (نُور): خوازراوەتەوە بۆ ڕێنمایی خواو، بۆ ڕوونیی ئەو هەقە، کە لە خواوە هاتوە، چونکە بە هۆی ڕووناکییەوە شتەکان دەردەکەون.

٣)- ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، وەک لە مانای گشتییەکەی دا، گوتمان: لێرەدا خوا ﷻ کە بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە دەپرسێ (أَفَمَن)؟ چونکە هەمزەکە بۆ پرسیاری نکووڵیلێکردنە، ئایا کەسێک کە خوا ﷻ سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام، سەرەنجام کەوتۆتە سەر ڕووناکییەک لە پەروەردگاریەوە، وا چاوەڕێ دەکرا بفەرموێ: وەک کەسێک وایە کە دڵ و سینەی داخراوە، بەرانبەر بە هیدایەتی خواو، کەوتۆتە نێو تاریکایی؟! بەڵام لە جیاتی ئەوە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: کەسێک کە خوا سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام و کەوتۆتە سەر ڕووناکیی لە پەروەردگاریەوە، وەک کەسێک نیە کە دڵی ڕەق و سەختە لە بەرانبەر هیدایەتی خوادا، ئنجا سزای سەخت بۆ دڵڕەقان لە بەرانبەر یادی خواو بەرنامەی خوادا، یانی: خوا ﷻ بە بەراوردکردنی ئاسایی بەراوردی نەکردوەو وێڕای باسکردنی بەرانبەرەکە، کە بابایەکی دڵ داخراو و سینە تەنگە بەرانبەر بە هیدایەتی خوا، باسی سزایەکەشی بکات، ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، سزای سەخت بۆ دڵڕەقان لە بەرانبەر یادی خوادا، وشەی: (القَاسِي: المُتَّصِفُ بِالقَسَاوَةِ فِي الحَالِ، وَحَقِيقَةُ القَسَاوَةِ: الغِلَظُ وَالصَّلَابَةُ فِي الأَجْسَامِ)، وشەی (قَاسِي): کەسێکە کە ئێستا دڵی سەخت و ڕەق بێ، چییەتی (قَسَاوَة)یش بریتیە لە زبریی و، سەختیی و، ڕەقیی لە جیسمەکاندا (لەو شتانەدا کە ماددیین)، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ دڵڕەقیی و، دڵداخراویی لە بەرانبەر هیدایەت و یادی خوادا.

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، (المُبِينُ: الشَّدِيدُ البَيَانِ، الَّذِي لَا يَخْفَى لِشِدَّتِهِ)، لە گومڕاییەک دان کە هێندە ڕوونە، هیچ پەنهان نیە، واتە: هەر کەسێک تەماشای بکات، دەزانێ کە ئەوە زۆر گومڕاییە.

(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (وَجَوَابُ الإِسْتِفْهَامِ اجْتِزَاءً بِمَعْرِفَةِ السَّامِعِينَ الْمُرَادَ مِنَ الْكَلَامِ، إِذْ ذُكِرَ أَحَدُ الصِّنْفَيْنِ، وَجَعَلَ مَكَانَ ذِكْرِ الصِّنْفِ الآخَرِ الْخَبَرَ عَنْهُ بِقَوْلِهِ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾).

واتە: وەڵامی پرسیارکردنەکە کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ﴾، - کە وەک گوتمان: پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە - بەوە نیکتیفا کراوە کە بیسەرەکان دەزانن مەبەست لەو قسەیە چییە؟ چونکە یەکێک لە دوو شتان باسکراوە، لە شوێنی شتی دووەمدا هەواڵی لە بارەوە داوە بەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، سزای سەخت بۆ دڵڕەقان لە ئاست یادی خوادا.

کە دەفەرموێ: ﴿ مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە دوو واتای هەیە:

١)- یان (مِنْ) بە مانای (عَنْ)ە، واتە: (عَنْ ذِكْرِ الله)، ئەویش بەوە کە وشەی (قَاسِيَة) مانای (الْمُعْرِضَة وَالنَّافِرَة) واتە: پشت هەڵکردوو و سڵەمیوەوەی خراوەتە نێو، واتە: سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە لە ئاست یادی خوادا دڵیان ڕەقەو، پشتیان لە یادی خوا کردووەو، لێی سڵەمیونەوەو لێی دوور کەوتوونەوە.

٢)- یاخود: ﴿ مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، (مِنْ) بە مانای: (مِنْ أَجْلِ ذِكْرِ اللهِ، أَي: حَصَلَتْ قَسَاوَةُ قُلُوبِهِمْ مِنْ أَجْلِ أَنْ يُذْكَرَ اللهُ)، ڕەقیی و زبریی لە دڵەکانیاندا پەیدابووە بەهۆی یادی خواوە، کە بە تەئکید مەبەست لە: ﴿ مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾، قورئانە، کە زیکری تایبەتە، یاخود بە گشتیی بە مانای یادی خواو، خوا لە بیر بوون و، پەیامی خواو، ئایین و بەرنامەی خوایە.

لە سوورەتی (التوبة)دا خوا ﷻ بەو شێوەیە تەعبیر لەوە دەکات کە لێرەدا هاتووە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى

---

(١) جامع البيان: ج٢٣، ص٢١٢.

قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾، واتـە: کاتێـک سـوورەتێک دادەبـەزێ، هەیانـە دەڵـێ: (واتـە لـە دڵ نەخـۆش و دەغەڵـەکان) کامەتـان ئـەم سـوورەتە بـڕوای بـۆ زیادکـردن؟ (خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:) بــەڵام ئەوانــەی بڕوایــان هێنــاوە، ئــەو ســوورەتە ئیمانــی بــۆ زیادکــردن و ئــەوان دڵخۆشـن (بـەوەی کـە سـوورەتێکی دیکـەش بەشـێوەی دیکـە، لـە فەرمایشـتی خـوادا دابەزیـوە). بـەڵام ئەوانـەی کـە دڵیـان نەخۆشـیی تێدایـە، (نەخۆشـیی گومـان و دوو دڵیـی و نیفـاق)، ئـەو سـوورەتە پیسـیی بـۆ گـەڵ پیسـیەك کـە لـە دڵیانـدا هەیـە زیـادی دەکات و بـە بێبڕواییـش دەمـرن.

ئەمـەش ڕێـک وەک ئـەوە وایـە کـە بارانێـک یـان بەفـرو تەرزەیـەک دابارێتـە سـەر دوو شـوێن، شـوێنێکیان پارچـە زەوییەکـی بـە پیتـی بەرەکەتـدارە، کـە لـە ئەنجامـی ئـەو ئـاوەدا کـە دەبـارێ، بـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەرزە، دانەوێڵـە دەڕوێ، جـۆو، گەنـم و، نیسـک و، هـەرزن و، یـان درەختـی میـوە، یـان سـەوزەو، تـەرەکار دەڕوێ، واتـە: شـتێکی لـێ دەڕوێ کـە خەڵـک لێـی بەهرەمەنـدن، زەوییەکـی دیکـەش، هـەر هەمـان ئـاو دابەزیوەتـە سـەری، بـەڵام هەمـووی زیـخ و بـەردە، یـان هیـچ سـەوز نـاکات، یاخـود دڕک و داڵ سـەوز دەکات، هـەر یـەک جـۆرە ئـاوە، بـەڵام بەپێـی سروشـت و جیاوازیـی زەوییـەکان، بەرهەمیـان و ئـەوەی کـە لێیـان پەیـدا دەبـێ، زۆر جیـاوازە، دژو پێچەوانـەی یەکدییـە، قورئانیـش هـەر یـەک قورئانـەو، بـۆ ئیمانـداران دەبێتـە هـۆی زیادبـوونی ئیمانیـان و دڵخـۆش بوونیـان، بـەڵام بـۆ دڵ نەخۆشـان دەبێتـە هـۆی زیاتـر دڵنەخـۆش بوونیـان، چونکـە پێشـتر بێبڕوابـوون بـە بەشـێک لـە فەرمایشـتی خـوا، ئنجـا کـە بەشـێکی دیکـە لـە فەرمایشـتی خـوا دادەبـەزێ، بـەوەش هـەر بێبـڕوا دەبـن، کەواتـە: بێبڕواییەکەیـان تۆخـتر دەبێتـەوەو نەخۆشـییەکەیان زیاتر دەبـێ، یـان کۆمەڵێـک ڕاسـتیی دیکـە دادەبـەزن، ئەوانیـش نکوولییـان لە ڕاسـتییەکانی پێشـتر کـردوە، ئنجـا لەوانـەش هـەر نکوولیـی دەکـەن، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە کوفـرو نەخۆشـیی دڵ و دەروونیـان سـەختترو خەسـتتر بێتـەوە.

لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئەم دەقەی سوننەت دێنین، هەرچەندە هەندێک لە زانایان لە بارەی سەنەدەکەیەوە، مشت و مڕیان هەیە، چەند دەقێکیش لەو بارەوە هەن و، من ئەوەیانم هێنا کە لەڕووی سەنەدەوە، ئەگەر ڕاستیش نەبێ، لە چاکییەوە نزیکتربێ و، بێگومان مانایەکەشی ڕاستە:

[مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلًا قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْيَسُ؟ قَالَ:« أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا، وَأَحْسَنُهُمْ لَهُ اسْتِعْدَادًا، وَإِذَا دَخَلَ النُّورُ فِي الْقَلْبِ انْفَسَحَ وَاسْتَوْسَعَ، قَالُوا: فَمَا آيَةُ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: الْإِنَابَةُ إِلَى دَارِ الْخُلُودِ، وَالتَّجَافِي عَنْ دَارِ الْغُرُورِ، وَالِاسْتِعْدَادُ لِلْمَوْتِ قَبْلَ نُزُولِ الْمَوْتِ]»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ کام لە بڕواداران عاقڵترو بەهۆشترە؟ فەرمووی: ئەوەیان کە زیاتر یادی مردن دەکات و، ئەوەیان کە باشتر خۆی بۆ ئامادە دەکات، کاتێک ڕووناکیی (هیدایەتی خوا) چووە نێو دڵی، ئەو دڵە فراوان دەبێ و لێک دەکشێتەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ نیشانەی ئەوە چییە؟ (سێ شتی هەڵدان وەک نیشانە بۆ نیشتەجێ بوون و سەقامگیربوونی ئەو ڕووناکییەی هیدایەتی خوا لە دڵدا) فەرمووی: گەڕانەوە بۆ مەنزڵگای نەبڕاوە، (واتە: یادکردنی ڕۆژی دوایی و، هەمیشە لەبەرچاو بوونی ڕۆژی دوایی)، دوورە پەرێزیی لە مەنزڵگای فریودەر (دوورە پەرێزیی بەو واتایە نا کە هیچی تێدا نەکات، بەڵکو بەو واتایە کە باوەشی پێدانەکات)، خۆ ئامادەکردن بۆ مردن، پێش دابەزینی مردن.

ئەو سێ نیشانەیە، نیشانەی ئەوەن کە ئەو دڵە هیدایەتی خوایی و ڕووناکیی ئیمانی تێدا نیشتەجێ بووە.

---

(١) أخرجه الحكيم الترمذي في نوادر الأصول ص١٢٥، وغيره، وضعفه الألباني في «الضعيفة»: ٩٦٥.

**مەسەلەی دووەم:**

**پێناسەی قورئان بە دە (١٠) لە سیفەت و شوێنەوارەکانی و، هۆکاری پێ ڕاستە ڕێی بوونی و، سەرگەردان و بێ مراد بوونی لێ لادەرانی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ﴾، خوا ﷻ باشترین فەرمایشتی دابەزاندوە، وشەی (نَزَّلَ) ئەوە دەگەیەنێ کە قورئان پلە پلە دابەزیوە، وەک زانایانی شارەزاو پسپۆڕانی قورئان دەڵێن: (نَزَّلَ مُنَجَّماً)، واتە: بەش بەش و پلە پلە دابەزیوە، کە ئەوە ڕاستەو قورئان لە ماوەی (٢٣) ساڵدا دابەزیوەتە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ.

﴿أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ﴾، دیارە (أل)ی سەر (الحَدِيث) بۆ ناساندنەو، مەبەست لە ناساندنەکە لێرەدا بۆ تێکڕا (جنس)یە، واتە: باشترین فەرمایشتە بە ڕەهایی، چونکە ئەم قورئانە باشترین هەواڵەکانی پێغەمبەرانەو، باشترین ماناو مەبەستە سوود بەخشەکان و، کۆکەرەوەترین ماناو مەبەستەکانی گرتوونە خۆی.

٢)- ﴿كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا﴾، کتێبێکە وێکچوویە، (الطَّبَرِي) دەڵێ: (يُشْبِهُ بَعْضُهُ بَعْضًا، لَا اخْتِلَافَ فِيهِ، وَلَا تَضَادٌّ)، هەندێکی بە هەندێکی دەچێ و، هیچ ناکۆکیی و دژایەتیی تێدانیە.

٣)- ﴿مَّثَانِيَ﴾، دووپاتکراوەکانە، یان کۆی (مُثَنَّى)یە، یانی: دووان، یاخود کۆی (مَثْنَى)یە، کە (مَثْنَى)اش دیسان ناوە بۆ ئەوە کە شتێکی ژمێردراو بکرێتە جووت، وەک: (مثنى وثلاث وَرُباع)، کەواتە: ئەگەر کۆی (مُثَنَّى) بێ، یان کۆی (مَثْنَى) بێ، واتە: مەبەستەکان تێیدا دووبارە دەکرێنەوە.

یاخود (مثاني) کۆی (مثنی)یە بە مانای (ثناء) یانی: پێهەڵاگوتن، مەبەست ئەوەیە کە ئەم قورئانە مەدح و ستایش و سەنای خوای پێ دەکرێ.

٤)- ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ﴾، ئەوانەی سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، پێستیان بە هۆیەوە ڕێک دێ، پێستیان مچووڕکەو، تەزووی پێ دادێ، (اقْشَعَرَّ الجِلْدُ، إذَا تَقَبَّضَ تَقَبُّضاً شَدِيداً كَالَّذِي يَحْصُلُ عِنْدَ شِدَّةِ بَرْدِ الجَسَدِ ورِعْدَتِهِ)، (اقْشَعَرَّ الجِلْدُ) واتە: پێست هاتەوە یەک، ڕێک هات، گرژ بوو، وەک ئەوەی کە لە حاڵەتی سەرمایەکی زۆردا، مرۆڤ پێستی ڕێک دێ، پێست کونەکانی خۆی دادەخات، تاکو ئەو گەرمایەی لە نێو جەستەدا هەیە نەچێتە دەر، بە پێچەوانەی کاتی گەرما بوونەوەیە، کە پێست کونەکانی خۆی دەکاتەوە بە فەرمانی مێشک، خوای کاربەجێ وایداناوە کە گەرمای نێو جەستە بچێتە دەرێ، لە ڕێی ئارەقە کردنەوە.

٥)- ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾، دوایی پێستەکانیشیان و، دڵەکانیشیان، بەرەو یادی خوا نەرم دەبن، (واللِّيْنُ: مُسْتَعَارٌ لِلْقَبُولِ، والسُّرُورِ، وَهُوَ ضِدٌّ لِلْقَسَاوَةِ)، وشەی: (لِيْن) خوازراوەتەوە بۆ پەسند کردن و دڵخۆشیی و (لِيْن) پێچەوانەی سەختیی و ڕەقییە.

٦)- ﴿ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ﴾، ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، ڕاستە ڕێ دەکات بەهۆی (ئەو ڕێنمایی)ەوە، هەر کەسێک کە بیەوێ.

٧)- ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾، هەر کەسێک خوا گومڕای بکات هیچ ڕێنمایی کارێک، یاخود هیچ ڕاستە ڕێکەرێکی دەست ناکەوێ، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾البقرة، بڵێ: ڕێنمایی تەنیا ڕێنمایی خوایە، تەنیا خوا ﷻ دەزانێ ڕێنمایی ڕاست چۆنەو، بە کوێ دایەو، خەڵکی بۆ ڕێنمایی دەکات؟

## کورتە باسێک لە بارەی

## دە (١٠) لە سیفەتەکانی قورئان و خوێنەرەکانیەوە

**لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی (٢٣) سوورەتی (الزمر)دا:**

**کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ﴾، لەم ئایەتە بەرزو بەپێزەدا، خوای بەرزی مەزن بە دە (١٠) سیفەتان پێناسەی قورئان و کاریگەرییەکانی قورئانی کردوە، لەسەر کەسانێک کە دەیخوێننەوە، ئەمەش هەڵهێنجانی خۆمە، بەڵێ تەفسیرەکان زۆر شتیان باسکردوە، بەڵام نەمبینیوە بەم شێوەیە، لەم ئایەتە موبارەکەدا، ئەو خەسڵەتە بۆ قورئان و، خوێنەرانی قورئان و، کاریگەرییەکانی قورئان خرابنە ڕوو:**

**١)- (اَللّٰه) خوا ﷻ سەرچاوەی قورئانە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾، کەواتە: (اَللّٰه) خوا ﷻ سەرچاوەی قورئانەو، خواش ﷻ خاوەنی سەرجەم ناوو سیفەتە بەرزەکانە، چونکە خوا (اَللّٰه)، خاوەنی سەرجەم ناوو سیفەتەکانەو، ناوی (الله) کۆکەرەوەی هەموو سیفەتەکانە لە نێویشیاندا پەروەردگارێتیی و، بەدیهێنەرایەتیی و، خاوەندارێتیی و، حکومڕانێتیی، ... هتد، ئنجا کە خوا ﷻ سەرچاوەی قورئانە، مانای وایە ئەو قورئانە خوا ﷻ سیفەتەکانی خۆی تێدا دەرەوشاندوونەوە، بۆیە یەکێک لە خواناسان دەڵێ: (لَقَدْ تَجَلَّى اللّٰهُ فِي كِتَابِهِ لِلناس)، بە دڵنیایی خوا لە کتێبی خۆیدا درەوشاوەتەوە بۆ خەڵک، هەڵبەتە بۆ کەسانێک، کە باش سەرنجی بدەن و، لەگەڵی ئاوێتە بن و، قەدری بزانن.**

٢)- (نَزَّلَ): کەواتە: قورئان بە پلە پلەو لە ماوەی (٢٣) ساڵاندا دابەزیوە، کە هەر ئەوە بۆ خۆی - کە قورئان لە ماوەی (٢٣) ساڵاندا دابەزیوە - موعجیزەیەکی سەربەخۆیە، چونکە ئێمە دەبینین مرۆڤەکان ئەمڕۆ قسەیەک دەکەن سبەینێ هەڵیدەوەشێننەوە، بەڵام ئەم قورئانە مەزنە فەرمایشتی خوایە، لە ماوەی (٢٣) ساڵان دا، ئنجا قسەیەک کە لە سەرەتای (٢٣) ساڵەکەدا کردوویەتی، لەگەڵ ئەوەدا کە لە کۆتایی (٢٣) ساڵەکەدا کردوویەتی، هەمووی وەک ئاڵقەکانی زنجیر یەکدی دەبەستنەوە، بێجگە لە خواش ﷻ هیچ کەسێکی دیکە توانای ئەوەی نیە، بەو شێوەیە فەرمایشت بفەرموێ.

٣)- ﴿أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾: خوا قورئانی بە: ﴿أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾، باشترین فەرموودە وەسفکردوە، (حديث) بە مانای هەواڵەو بە مانای قسەیە، (الحَدِيْث: الخَبَرُ، الكَلَام)، ئنجا ئایا قورئان لە چ ڕوویەکەوە باشترین فەرمایشتە؟ دەڵێین: هەم لە ڕووی واتاو نێوەڕۆکیەوە، هەم لە ڕووی بێژەکانیەوە، هەم لە ڕووی پێکهاتەی پیت و وشەو بڕگەکانیەوە، واتە: قورئان باشترین فەرمایشتە: أ- لە ڕووی پاراویی و ڕوونییەوەو، ب- لە ڕووی ڕەوانبێژییەوەو، ج- لە ڕووی ماناو نێوەڕۆکیشیەوە.

٤)- ﴿كِتَٰبٗا﴾: قورئان وێڕای ئەوەی کە فەرمایشتەو دەبیسترێ و دەخوێنرێتەوەو، دەگوترێ، کتێبیشە (کتاب) واتە: نووسراوە، هەم بەشێوەی خوێنراوە (مقروء) قورئان لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، کە لە ڕێی قورئان خوێنەکانەوە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوەو، هەم بە نووسراوییش لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، واتە: ئەو باشترین فەرمایشتەی خوا، هەم قورئانەو، هەم کتێبە، هەم خوێنراوەیەو هەم نووسراوە، هەم خوێنراوەیەو دەبیسترێ، هەم نووسراوەو دەخوێنرێتەوە.

٥)- ﴿مُّتَشَٰبِهٗا﴾: قورئان، وێکچووە، هەندێکی بە هەندێکی دەچێ، (أَي: مَعَانِيه مُتَشَابِهَةٌ فِي صِحَّتِهَا وَأَحْكَامِهَا وَابْتِنَائِهَا عَلَى الْحَقِّ وَالصِّدْقِ، وَأَلْفَاظُهُ مُتَمَاثِلَةٌ فِي الشَّرَفِ وَالْفَصَاحَةِ وَالْإِصَابَةِ لِلْأَغْرَاضِ مِنَ الْمَعَانِي)، هەندێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان ئاوایان وشەی (مُتَشَابِه) شیکردۆتەوە.

واتـە: واتـاکانی وێکدەچـن لـە ڕووی ڕاسـتییەوەو، یاسـاکانی لـەو ڕووەوە کـە لەسـەر هـەق بنیاتـنراون، بێـژەکانی وێکدەچـن لـە ڕووی شـەرەف و ڕوونیـی و پاراوییـەوەو، لـەو ڕووەوە کـە مانایـەکان دەپێکـن، بۆیـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النسـاء)دا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾، واتـە: ئایـا لـە قورئانـەوە ڕانامێنـن، ئەگـەر لـەلای جگـە لـە خـواوە بووایـە، ناڕێکیـی و ناکۆکیـی زۆریـان تێـدا دەبینـی.

بـەڵام لێـرەدا دەبـێ وریابیـن، (مُتَشَابِهاً) کـە لێـرەدا هاتـوە، مانایەکـەی جیایـە لـە وشـەی (مُتَشَابِهَات) کـە لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا هاتـوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ﴿٧﴾ ﴾، واتـە: لـە قورئـان ئایەتانێکـی موحکـەم هـەن و هەندێکیشـیان (مُتَشَابِهَات)ن، زۆربـەی زانایـان مانـای (مُحْكَمَات) یـان ئـاوا لێکداوەتـەوە: (وَاضِحَـاتِ المَعْنَـى) مانایەکەیان ڕۆشـنە، بـەڵام (مُتَشَـابِهَات)یان بـەوە لێکداوەتـەوە، کـە زیاتـر لـە واتایـەک هەڵدەگـرن، یاخـود واتـای وێکچوویـان هـەن.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مُّتَشَٰبِهًا ﴾، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە قورئـان، هـەم واتایەکانـی، هـەم بێـژەکانی پێکدەچـن، هەندێکـی بـە هەندێکـی دەچـێ لـە ڕووی ڕاسـتیی و تەواویـی و، لـە ڕووی لـە ئامانجـدان و، لـە ڕووی ڕەوانبێژییـەوە.

بـەڵام لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا، خـوا عزوجـل بەشـێوەیەکی دیکـە بـاسی قورئـان دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ ﴿٧﴾ ﴾آل عمـران، (مُحْكَمَات) کـۆی (محکـم)ە، واتـە: قاییـم و پتـەو، بـێ درزو کەلێـن، یـانی: ئایەتانێکـی مانـا ڕۆشـنن، بـەڵام هەندێکیان لـە ئایەتـەکان (مُتَشَابِهَات)ن، واتـە: مانـای وێکچوویـان هـەن، یاخـود زیاتـر لـە واتایەک هەڵدەگرن.

٦)- ﴿ مَّثَانِيَ ﴾: وەک پێشتر باسمانکرد، یان کۆی (مُثَنَّى)یە، یاخود کۆی (مَثْنَى)یە، (مُثَنَّى) واتە: دووان، (مَثنى) واتە: (إِثْنَيْنِ إِثْنَيْن) دووان دووان، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴿٣﴾ ﴾النساء، واتە: دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار، کەواتە: (مَثَانِي) چ کۆی (مُثَنَّى) بێت، واتە: دووان، چ کۆی (مَثْنَى) بێت، واتە: دوو دوو، هەردووکیان مەبەست پێیان پێ دووبارە بوونەوەیە، واتە: ئایەتەکانی قورئان دووبارە دەبنەوە، واتاو مەبەستەکانیان تێدا دووبارە دەبنەوە، بەڵام هەرجارە بە تام و چێژێک، وەک لە سوورەتی (الحجر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی بە تۆمان داوە حەوت لە (مَثَانِي)، (حەوت لەو ئایەتانەی کە دووبارە دەبنەوە)و، قورئانی مەزنیشمان بە تۆ داوە.

(مَثَانِي) وێڕای ئەوە کە دەگونجێ کۆی (مُثَنَّى) بێت، یان کۆی (مَثْنَى) بێت، بە مانای: دوو دوو، دەشگونجێ مەبەست پێی دوو دوو نەبێ، بەڵکو مەبەست پێی (ثناء) بێ، یانی: سەناو مەدح و ستاییشی خوا ﷻ لە میانی قورئاندا هەیە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ قورئانی وا دابەزاندوە، کە مەبەستەکانی تێدا دووبارە ببنەوە؟

چونکە دووبارە بوونەوە زۆرجاران مانایەکە زیاتر ڕۆدەچوێنێ و زیاتری دادەمەزرێنێ لە دڵ و عەقڵی مرۆڤدا، هەروەک دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە وەسفی قسەکردنی پێغەمبەردا ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کە قسەیەکی دەکرد، سێ جاران دووبارەی دەکردەوە.

هەڵبەتە هەموو قسەیەکی سێ جاران دووبارە نەکردۆتەوە، بەڵام هەندێک جار کە مەبەستی بوو بێ، سێ جاران قسەیەکی دووبارە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی چاک لێی تێبگەن، لە چەند فەرموودەیەکیشدا هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سێ جاران وایفەرموو.

٧)- ﴿ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ﴾، ئەوانەی سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، یاخود لە پەروەردگاریان دەترسێن بە مەزن گرتنەوە، پێستیان مچووڕکەی پێدادێ بە هۆی قورئانەوەو، تەزووی پێدادێ، (تَقْشَعِرُ: أَي تَأْخُذُهَا القَشْعَرِيرَة)،

(قَشْعَرِيْرَة) بە کوردیی بە مانای مچووڕکەو تەزوویە، یانی: ڕێک هاتن و گرژ بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ هەتا زیاتر خوا ﷻ بناسێ، زیاتر لە فەرمایشتەکەی تێدەگات و زیاتر قەدری فەرمایشتەکەی دەزانێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ﴾، ئەوانەی ترس و سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، بە هۆی قورئانەوە، پێستیان ڕێک دێ و مچووڕکەی پێدادێ.

٨)- ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، دوایی پێستەکانیشیان و دڵەکانیشیان بەرەو یادی خوا نەرم دەبن.

٩)- ﴿إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، ئەمەش سیفەتێکی دیکەیە، کە خوا ناوی لە قورئان ناوە: ﴿ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، یادی خواو، باسی خوا، لێرەدا دەگونجێ بڵێین: لە کاتێکدا ئەوانەی قورئان دەخوێنن، باسی سزای خوا دەکرێ، باسی دادگەریی خوا دەکرێ، باسی مەزنیی و بەرزیی خوا دەکرێ، ئەوانە مچووڕکەیان پێدادێ و، پێستیان ڕێک دێ و گرژ دەبێ، بەڵام کاتێ باسی بەزەیی خواو، پاداشتی خواو، میهرەبانیی خوا، دەکرێ، دڵیان نەرم دەبێ و پێستیشیان نەرم دەبێ.

(فخر الدین الرازي) قسەیەکی جوانی لەو بارەوە هەیە لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: (قَالَ الْمُحَقِّقُونَ مِنَ الْعَارِفِينَ قَالُوا: السَّائِرُونَ فِي مَبْدَأ إِجْلَالِ اللَّهِ، إِنْ نَظَرُوا إِلَى عَالَمِ الْجَلَالِ طَاشُوا، وَإِنْ لَاحَ لَهُمْ أَثَرٌ مِنْ عَالَمِ الْجَمَالِ عَاشُوا).

واتە: لێکۆڵەرەوان لە خواناسان گوتوویانە: ئەوانەی کە بەرەو خوا دەچن، لە سەرەتای بە مەزنگرتنی خواوە، کاتێک کە تەماشای جەلال و هەیبەتی خوا دەکەن، هۆشیان سەرسام دەبێ، بەڵام کاتێک کە شوێنەوارێک لە جوانیی و میهرەبانیی خوایان بۆ دەردەکەوێ، بەوە زیندوو دەبنەوەو دەژێنەوە.

١٠)- ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، ئەمە ڕێنمایی خوایە، (قورئان ڕێنمایی خوایە)، خوا بە هۆی ئەو ڕێنماییەوە، هەر کەسێ بیەوێ، ڕاستە ڕێی دەکات

---

(١) ج٣٦، ص٢٤٩.

واتە: بە ئامانجی دەگەیەنێ و بە مرادی دەگەیەنێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، هەر کەسێ خوا گومڕای بکات بە پێی ئەو یاسایانەی کە لە ژیانی مرۆڤدا دایناون، ئەوانەی کە بەرەو هیدایەتی خوا دێن، هیدایەتی خوا قبووڵ دەکەن، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات و ڕاستە ڕێیان دەکات: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾محمد، واتە: ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتوە، ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، یاخود ڕاستە ڕێیان دەکات، هێدایەتیان بۆ زیاد دەکات، ئەو هیدایەتەش کە زیاد دەکرێ، بریتیە لەبەر چاو ڕوونکردنەوەیان و دڵ دامەزرانیان لەسەر هیدایەتی خواو، ڕاستە ڕێی بوونیان، هەروەها پارێزکارییشیان پێدەبەخشێ، بەڵام هەر بەپێی یاسای خوا: ئەوانەی پشت لە یادی خوا دەکەن، گومڕا دەبن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾فصلت، واتە: گەلی سەموودمان ڕێنمایی کردن، بەڵام ئەوان کوێرییان بەسەر ڕێنمایی (خوا)دا هەڵبژارد.

ئێستاش حەوت دەقان دێنین کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخەنە سەر هەندێک لە برگەو وشەکانی ئەم ئایەتە موبارەکە، کە وەک گوتمان: دە (١٠) خەسڵەت و سیفەتی قورئان و هەڵگرانی قورئان و، خوێنەرانی قورئان دەخاتە ڕوو، شوێنەوارەکانی قورئان لە کەسانێکدا کە دەیخوێنن و لەگەڵیدا کارلێک دەکەن:

١)- خوا ﷻ لە سوورەتی (الحشر)دا، ئاوا قورئانمان بۆ وێنا دەکات دەفەرموێ: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئەو قورئانەمان دابەزاندبایە سەر چیایەک، کێوێک، ئەو کێوەت دەبینی: بە ترس و لەرز دەبوو و پارچە پارچە دەبوو، لێک دەبۆوە، لە سام و هەیبەتی خواو، ئەو وێنانە بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە.

بیر بکەنەوە کە ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایەو، ئەو فەرمایشتی خوایە، ئەگەر خوا دایبەزاندبایە سەر چیایەکی سەخت دەترساو، پارچە پارچە دەبوو!

٢)- هەر لە بارەی کاریگەریی قورئانەوە ئەم دەقەش دێنین: {عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ، فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴾، (أَمْ خَلَقُوا السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ بَلْ لَا يُوقِنُونَ، أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُسَيْطِرُونَ)، قَالَ: كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيرَ، وَذَلِكَ أَوَّلُ مَا وَقَرَ الْإِسْلَامُ فِي قَلْبِي}، (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٤٥٧٣، وإبن ماجه: ٨٣٢ وغيرهما).

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم لە بابی دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی شێواندا سوورەتی (الطور)ی دەخوێند: ﴿ وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ۝٢ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ۝٣ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ۝٥ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ... ﴾، تاکو دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ۝٣٥ ﴾، واتە: ئایا ئەوانە بە بێ شت دروستکراون، بەبێ بەدیهێنەر پەیدا کراون، یاخود خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن؟ (کە هەردووکیان مەحاڵن، مەحاڵە شتێک پەیدا بکرێ و پەیداکەری نەبێ، مەحاڵیشە شتێک خۆی خۆی پەیدا کرد بێ، کەواتە: ئەگەرێکی دیکە هەیە کە ئەویش خوا بەدیهێنەرە)، هەتا دەگاتە (مُسَيْطِرُون)، دەڵێ: خەریک بوو دڵم بفڕێ (ئەوەندە کاریگەر بوو ئەو قورئانخوێندنەی پێغەمبەر ﷺ)، ئەوە یەکەمجار بوو کە ئیسلام چووە نێو دڵمەوەو خوا هیدایەتی دام.

٣)- یەکێک لە زانایان قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (لَقَدْ تَجَلَّى اللَّهُ فِي كِتَابِهِ للناس)، بە دڵنیایی خوا لە کتێبی خۆیدا بۆ خەڵک دەرەوشاوەتەوە، چونکە قسەی هەر کەسێک دەرخەری چییەتی ئەو کەسەیە، فەرمایشتی خواش سیفەتەکانی خوای تێدان، زانیاریی خوا، حیکمەتی خوا، بەزەیی خوا، میهرەبانیی خوا، مەزنیی خوا، بەرزیی خوا، سیفەتەکانی خوا، لە فەرمایشتی خوادا دەرەوشاونەوە.

٤)- هەر لەو بارەوە دەقێکی دیکە دێنین کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِذَا اقْشَعَرَّ جِلْدُ الْعَبْدِ مِنْ مَخَافَةِ اللَّهِ، تَحَاتَّتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا يَتَحَاتُّ عَنِ الشَّجَرَةِ الْبَالِيَةِ وَرَقُهَا}

(ذكره الحكيم: (٣٩٥/١)، والبزّار: ١٣٢٢)، قال الهيثمي (٣١٠/١٠): فيه أم كلثوم بنت العباس، ولم أعرفها، وبقية رجاله ثقات، وأورده الألباني في السلسلة الضعيفة (٢٣٤٢/٥)).

واتە: کاتێک مرۆڤی بڕوادار لە ترس و سام و هەیبەتی خوا، پێستی ڕێک دێ، تەزووی پێدادێ، گوناهەکانی لێی هەڵدەوەرن، وەک چۆن درەختێکی شڕبوو، (واتە: درەختێک کە کەوتۆتە گەڵاڕێزان) گەڵایەکانی لێ دەکەونە خوار.

٥)- ئەمەش دەقێکی دیکەیە: (عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ قَالَ: قَالَ فُلَانٌ: إِنِّي لَأَعْلَمُ مَتَى يُسْتَجَابُ لِي! قَالُوا: وَمِنْ أَيْنَ تَعْلَمُ ذَلِكَ؟ قَالَ: إِذَا اقْشَعَرَّ جِلْدِي، وَوَجِلَ قَلْبِي، وَفَاضَتْ عَيْنَايَ، فَذَلِكَ حِينَ يُسْتَجَابُ لِي)[1].

واتە: سابیتی بونانیی گوتوویەتی: فڵانکەس گوتوویەتی: (واتە: لە زانایەکەوە لە خوا ناسێکەوە هێناویەتی)، من دەزانم کەی وەڵامم دەدرێتەوە؟ (کاتێ دوعا دەکەم، کەی دوعاکەم گیرا دەبێ!) گوتیان: چۆن دەزانی؟ گوتی: هەر کاتێک پێستم مچووڕکەو تەزووی پێداهات و، دڵم جووڵا لەرزی و، چاوەکانم فرمێسکیان پێداهات، ئەوە ئەو کاتەیە کە دەزانم وەڵام دەدرێمەوە.

ئەوەی ئەو گوتوویەتی: بەلای منیشەوە شتێکی ئەزمونکراوو جەڕبێنراوەو، بەندەش ئەو حاڵەتەم بۆ دەرکەوتوە، ئەو کاتانەی دەزانی پارانەوەکەت قبووڵ دەبێت، هەست بە نارامیی و نۆخژنێک و دڵ فەڕاحییەک و شادمانییەک دەکەی کە وەسف ناکرێ.

٦)- (فخرالدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2] ئەم دەقەی هێناوە: (قَالَ: قَتَادَةَ: الْقُرْآنُ دَلَّ عَلَى أَنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ مَوْصُوفُونَ بِأَنَّهُمْ عِنْدَ الْمُكَاشَفَاتِ وَالْمُشَاهَدَاتِ، تَارَةً تَقْشَعِرُّ جُلُودُهُمْ، وَأُخْرَى تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ، وَلَيْسَ فِيهِ أَنَّ عُقُولَهُمْ تَزُولُ، وَأَنَّ أَعْضَاءَهُمْ تَضْطَرِبُ، فَدَلَّ هَذَا عَلَى أَنَّ تِلْكَ الْأَحْوَالَ لَوْ حَصَلَتْ لَكَانَتْ مِنَ الشَّيْطَانِ).

---

(١) جامع البيان: ج٢٣، ص١٩٩.

(٢) مفاتيح الغيب ج٢٦، ص٢٥٠.

واتـە: قەتـادە دەڵـێ: قورئـان ئـەوە دەگەیەنـێ کـە دۆسـتانی خـوا لـە کاتێـک دا هەندێـک شـتیان بـۆ دەردەکـەوێ و هەندێـک شـت دەبینـن، جـاری وا هەیە پێسـتیان ڕێـک دێ و مچوڕکەیـان پێـدادێ، جـاری واش هەیـە پێسـت و دڵیـان نـەرم دەبـێ بـەرەو یـادی خـواو، بـەڵام لـە قورئانـدا بـاس نەکـراوە کـە دۆسـتانی خـوا عەقڵیـان لـە لای خۆیـان نامێنـێ و بێهـۆش دەبـن و، ئەندامەکانیشـیان جموجۆڵێکـی خـراپ دەکـەن، کەواتـە: ئـەو حاڵانـە کـە پەیدابـوون، مانـای وایـە لـە شـەیتانەوەن.

ئـەو بەڕەهایـی گوتوویـەتی: بـەڵام مـن پێموایـە کـە بـەو ڕەهایـی قسـە کردنـەش بـاش نیـە، چونکـە هەیـە دڵەکـەی تەحەممـولی ئـەوە نـاکات کـە لـە خـواوە بـۆی دادەبـەزێ، واتـە: مـەرج نیـە لـە شـەیتانەوە بـێ، مـەرج نیـە بـۆ خـۆ نوانـدن (تمثیـل) وابـکات، چونکـە هەیـە دەنگێکـی لێـدێ و، چریکەیـەک دەکات، یاخود بێهـۆش دەبێ، یـان حاڵەتێکـی بەسـەر دادێ، ناگونجـێ بـە ڕەهایـی بڵێیـن: ئەوانـە هەموویـان لـە شـەیتانەوەن، بەڵکـو جـاری واش هەیـە لەوەوەیـە دڵەکـەی تەحەممـولی ئـەوە نـاکات کـە دادەبەزێتـە سـەری، کـە خـوا ﷻ لـە زانیاریـی و ئیلهامـی خێـر دایدەبەزێنێتـە سـەر دڵـی.

٧)- (فخر الدين الرازي) هەر لە سەرچاوەی پێشوودا، دەڵێ: (الشيخ أبو حامد الغزالي) لە کتێبی (إحياء علوم الدين)ەکەی خۆی لە باسی (سَمَاع)دا، باسی ئەوە دەکات کە هەندێک لەوانەی ئەهلی تەزکیەو تەصەووفن، کاتێک هەندێک شیعریان بۆ دەخوێنرێنەوە، جاری وا هەیە حاڵەتێکی ناناساییان بۆ دروست دەبێ، بێهۆش دەبن، یان دەکەونە حاڵەتێکی ناناسایی، بەڵام لە کاتی گوێگرتن لە قورئاندا، ئەو حاڵەتەیان بۆ دروست نابێ.

(فخـر الديـن الـرازي) وەک قسـە کـردن لەسـەر ئـەو قسـەیەی (الغزالي)دا دەڵـێ: (إِنِّي خُلِقْـتُ مَحْرُومًـا عَـنْ هَـذَا الْمَعْنَـى، فَـإِنِّي كُلَّـمَا تَأَمَّلْـتُ فِي أَسْرَارِ الْقُـرْآنِ، اقْشَـعَرَّ جِلْـدِي، وَقَـفَ شَـعْرِي، وَحَصَلَـتْ فِي قَلْبِـي دَهْشَـةٌ وَرَوْعَـةٌ، وَكُلَّـمَا سَـمِعْتُ تِلْـكَ الْأَشْـعَارِ، غَلَـبَ الْهَـزْلُ عَـلَيَّ، وَمَـا وَجَـدْتُ اَلْبَتَّـةَ فِي نَفْسِـي مِنْهَـا أَثَـرًا)، واتـە: مـن بێبەشـم لـەو

حاڵەتە، لەو واتایە، بەڵام هەر کاتێک کە لە نهێنییەکانی قورئان ورد دەبمەوە، پێستم ڕێک دێ، (واتە: تەزووی پێدادێ)، مووەکانم دەوەستن و، سەرسامیی و خۆشحاڵییەک لە دڵمدا پەیدادەبێ، بەڵام هەر کاتێک ئەو شیعرانە دەبیستم، حاڵەتێکی گاڵتەپێکردن لە مندا پەیدادەبێ، بە هیچ شێوەیەک ئەو شوێنەوارەی کە بە هۆی قورئان خوێندنەوە لە دڵمدا پەیدادەبێ، بە هۆی بیستنی ئەو شیعرانەوە لێم پەیدانابێ.

منیش بە گشتیی قسەکەی (فخر الدين الرازي) پشتگیر دەکەم و پشت ڕاستی دەکەمەوە، قسەکەی ڕاستە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانرێ کە هەموو کەسیش وەک (فخر الدين الرازي) لە قورئان تێناگات، تاکو ئاوا پێی کارتێکراو بێ، بۆیە لەوانەیە هەبێ لە شیعرەکە باشتر تێبگات و حاڵەتێکی ڕووحیی بۆ پەیدابێ کە بە هۆی بیستنی قورئانەوە، بۆی پەیدا نەبێ، لەبەر ئەوەی لە قورئانەکە تێناگات.

بەڵام بە گشتیی ڕاستە، ئەوەی دەبێ مرۆڤ پێی کارتێکراو بێ، دەبێ فەرمایشتی خوا بێ، بەو ئەندازەیەی بە فەرمایشتی خوا کارتێکراو دەبێ و، بەهرەمەند دەبێ، نابێ بە هیچ شتێکی دیکە ئاوا بەهرەمەند بێ، ئەگەر حاڵەتێکی تەندروستی هەبێ، بۆیە جار جار بە تەئکید شەیتان لەو ڕێیانەوە زەفەری بە هەندێک لە ئەهلی تەصەووف بردوە، ناڵێم ئەوانەیان کە دامەزراوو نەلەخشاو بەرچاو ڕوون بوون، ئەوانە بۆ خۆیان ئەهلی قورئان و سوننەت بوون، بەڵکو هەندێک لەوانەی کە جاری وا هەیە چوونەتە نێو ئەو ڕێبازانەوە، بەڵام ئەو شایستەییەیان نەبووە، هەشبووە وەک بۆ خۆشیان دەڵێن: صۆفیی نەبووەو موتەصەوویف بووەو، ئەهلی حەقیقەت نەبووە، بەڵکو ئەهلی ئیددیعاو لاف لێدان بووە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی ستەمکاری بە درۆ دانەری پەیامی خوا، کە بەدەم و چاویان ئازاری ئاگر لە خۆیان وەدوور دەخەن و، سەرباری زەبوونیی ژیانی دنیا، ئازاری گەورەو بێزەزاتری ڕۆژی دواییش چاوەڕێیانە:**

خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّـٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، پرسیارکرنەکە پرسیارکردنی نکووڵیلیکەرانەیە، ئایا کەسێک کە بە ڕووی، خۆی دەپارێزێ لە ئازاری خراپی ڕۆژی قیامەت، واتە: ئایا کەسێک کە ئاوایە، وەک کەسێکە کە لە خۆشیی و شادمانیی و سەلامەتیی و دڵنیایی دایە؟ بەڵام خوا ﷻ بەرانبەرەکەی نەخستۆتە ڕوو، چونکە بەرانبەرەکەی دیارە، بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ئەگەر من گوتم: ئایا کەسێک کە درۆزنەو، دوایی عەیبدارو شەرمەزار دەبێ، دوایی بێ دەنگ بووم، بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، واتە: ئایا وەک کەسێکە کە ڕاستگۆیەو، هەمیشە سەر بەرزو بێ باک و بێ منەتە، لە نێو خەڵکدا؟ واتە: جارێ وایە باسی شتێک دەکرێ، بەرانبەرەکەشی لێی دەفامرێتەوە، وەک زۆرجار گوتوومانە: یەکێک لە ڕووە هەرە گرنگەکانی ڕەوانبێژیی لە قورئاندا بریتیە لە کورتیی (إيجاز)، کورت و پوخت، قسەکردنیش ئەوەیە شتێک کە بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، باس نەکرێ، بۆیەش خوا لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴿٨١﴾ ﴾، واتە: (خوا) پۆشاکێکی بۆ ڕەخساندوون کە لە گەرما دەتانپارێزێ، پۆشاکێکیش کە لە کاتی جەنگدا دەتانپارێزێ.

یانی: لە گەرما دەتانپارێزێ، هەروەها لە سەرماش، بەڵام سەرمایەکەی باس نەکردوە، دیسان لە جەنگدا دەتانپارێزێ، هەروەها لە حاڵەتی ئاشتییشدا عەیب و عەورەتتان دەپۆشێ، واتە: ئەوەی کە بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، خوای کاربەجێ زۆرجار باسی ناکات.

٢)- ﴿ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾، بە ستەمکارانیش گوترا: بیچێژن ئەوەی وەدەستتان دەهێنا، واتە: بیچێژن سزای ئەوەی کە دەتانکردو وەدەستتان دەهێنا، ئەمە لە شوێنی ئەو بەرانبەرەیە کە خوا ﷻ باسی نەکردوە، کە ئایا کەسێک بە دەم و چاوی، خۆی دەپارێزێ لە سزای خراپی ڕۆژی قیامەت و، بەوانە کە ستەمکارن گوترا: بیچێژن سزای ئەوەی کە وەدەستتان دەهێنا، کە دیارە ئەمە هەر باسی ئەوانە، بەڵام بەرانبەرەکەیان باس نەکراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ.

بەرانبەرەکەی ئەوەیە، دەگونجێ بگوترێ: (كَمَنْ أَمِنَ العَذَابَ؟)، یان (كَمَنْ هُوَ فِي النَّعِيم؟)، ئایا کەسێک کە هیچ ئامرازێکی دیکەی نیە خۆی پێ لە سزای خراپی ڕۆژی قیامەت بپارێزێ، جگە لە دەم و چاوی، کە مرۆڤ بە هەموو ئەندامەکانی بەرگریی لە ڕووی دەکات و، پێشگیریی دەکات لەوە کە دەم و چاوی سەلامەت بێ، کەچی ئەو بە ڕووی، خۆی لە سزای خوا ﷻ دەپارێزێ، ئایا وەک کەسێک وایە کە دڵنیایە لە سزاو ئازار، یاخود: کەسێک کە لە نازو نیعمەت دایە؟ هەروەک پێشتر گوتمان: ﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ ﴾، واتە: (كَمَنْ قَسَى قَلْبُهُ عَنْ ذِكْرِ اللهِ)، وەک کەسێکە دڵی لە ئاست یادی خوادا ڕەقە؟ هەروەها هەر لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿ أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ ﴾، واتە: ئایا کەسێک کە وشەو بڕیاری سزای بەسەردا چەسپیوە، بەرانبەرەکەی باس نەکراوە، یانی: وەک کەسێکە کە بڕیاری خۆشبەختیی بۆ دراوە؟ بە تەئکید نەخێر.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾، دەگونجا خوا ﷻ فەرمووبای: (وَقِيلَ لَهُم)، چونکە ئەوەی کە بە دەم و چاوی، خۆی لە سزای خراپی ڕۆژی دوایی دەپارێزێ، بێبڕوایەکانن و قسە هەر لە بارەی ئەوانەوەیە،

بۆیە دەگونجا فەرمووبای: (وَقِيْلَ لَهُم)، ئنجا ئەوە پێی دەگوترێ: (إِظْهَارٌ بَدَلَ الإِضْمَار)، دەرخستنە لە جیاتی پەنهانکردن، تاکو بەم سیفەتی ستەمکارییەش مۆریان بە نێو چاوانەوە بنێ، کە ئەوانە بەس ئەوە نەبووە بێبڕوابن، بەڵکو ستەمکاریش بوون.

لێرەدا کە دەفەرمویٚ: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: ئایا کەسێک کە بە دەم و چاوی، خۆی دەپارێزێ لە سزای خراپی ڕۆژی قیامەت! ئەمە کینایەیە لە خۆ نەپاراستن، بەڵام بە شێوەیەکی گاڵتەپێکردن، یاخود بە شێوەیەکی ئاماژە، وەک گوترا بێ: کەسێک کە دەیەوێ ڕووی خۆی بپارێزێ لە ئاگر، بەڵام هیچ شتێکی دەست ناکەوێ ڕووی خۆی پێ بپارێزێ، جگە لە ڕووی خۆی.

٣)- ﴿ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانەی پێش وانیش بە درۆیان دانا، ئایا چییان بە درۆ دانا؟ (مَفْعُوْلُ كَذَّبَ مَحْذُوفٌ، أَي: كَذَّبُوا الرُّسلَ، كَذَّبوا الكُتُب وكَذَّبوا الشَّرَائِعَ)، ئەوانەی پێش وانیش پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە درۆ دانان، کتێبەکانی خواو بەرنامەکانی خوایان بە درۆ دانان.

٤)- ﴿ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام ئازارو سزایان بۆ هات بە شێوەیەک کە هەستیان پێ نەدەکرد، وشەی (حَيْثُ) جاری وایە بۆ شوێنە (ظَرْفُ مَكَان) و جاری وایە بۆ کاتەو، جاری وایە بۆ حاڵەتە: (أَي: جَاءَ العَذَابُ الَّذِيْن مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ مَكانٍ أو زمان أو حال لا يَشْعِرُون به)، واتە: ئەوانەی پێشووان سزاو ئازاریان بۆ هات لە شوێنێکەوە کە هەستیان پێ نەدەکرد، یان لە کاتێک دا یان بە شێوەیەک کە هەستیان پێ نەدەکرد، چونکە وشەی (حَيْثُ) جاری وا هەیە ناوی شوێنەو، جاری وا هەیە بۆ کاتەو، جاری وا هەیە بۆ حاڵەتە، وەک: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوو زەڕ ﷺ دەفەرموێ: {اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ} (أخرجه أحمد: ٢١٣٩٢، والترمذي: ١٩٨٧، وقال: حسن صحيح، والدارمي: ٢٧٩١، والحاكم: ١٧٨، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي)، واتە: لە هەر حاڵێک و

کاتێک و شوێنێک دای، پارێز لە خوا بکە، وشەی (حَيْثُ) زەرفێکە مانایەکەی نادیارە، دواییەکەی دەریدەخات.

٥)- ﴿ فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾، خوا ﷻ سزای زەبوونیی پێ چێژتن لە ژیانی دنیادا، واتە: خوا ﷻ خودی زەبوونیی وەک سزایەک پێی چێژتن لە ژیانی دنیادا.

٦)- ﴿ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾، سزاو ئازاری مەنزڵگای کۆتایی گەورەتریشە، ئەگەر بزانن، ئەوانەی پێش وان واتە: کۆمەڵگاکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأحقاف)دا خوا ﷻ لە بارەی گەلی (عاد)ەوە فەرموویەتی: ﴿ وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ ﴾، دوایی لە درێژەی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾الأحقاف، دەفەرموێ: گەلی عاد کاتێک بینییان هەورێک ڕووی لە دۆڵ و شیوەکانیان کرد بوو، (ئەو دۆڵ و شیوانەی کە چادرو خێوەتەکانیان، یاخود خانووبەرەکانیانی تێدابوون، کە ماوەیەک بوو بارانیان بۆ نەباریبوو)، ﴿ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴾، گوتیان: ئەمە هەورێکە بارانمان بۆ دەبارێنێ، خواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ﴾، بەڵکو ئەوە ئەو سزایەیە کە پەلەتان لێدەکرد، ﴿ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بایەکە ئازارێکی بە ئێشی تێدایە: ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾، بە فەرمانی پەروەردگاری هەرشتێکی بیگاتێ وێرانی دەکات و تەختی دەکات، ﴿ فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ ﴾، ئنجا وایان لێهات تەنیا خانووبەرەکانیان دەبینران، جێ و ڕێیەکانیان دەبینران، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴾، ئاوا کۆمەڵی تاوانباران سزا دەدەین.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ ﴾، سزای مەنزڵگای کۆتایی گەورەترە، گەورەتر مەبەست پێی سەخترو خراپترو بێ ڕەزاترە، بەڵام وشەی گەورەتر

خوازراوەتەوە بۆ توندترو سەختترو بێزراتر، وەک لە شوێنی دیکەش دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾السجدة، لە سزای کەمتریان پێدەچێژن، پێش سزای گەورەتر، بەڵکو بگەڕێنەوە، سزای گەورەتر لە ڕۆژی دوایی دایە، ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَكْبَرُ ﴾، سزای مەنزڵگای کۆتایی گەورەترە، واتە: بێ ڕەزاترو سەختترو توندترە.

﴿ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، ئەگەر بزانن، چی بزانن؟ دەڵێ: (**مَفْعُولُ «يَعْلَمُونَ» دَلَّ عَلَيْهِ الْكَلَام الْمُتَقَدِّم: أَنَّ اللّهَ أَذَاقَ الأَخَرِيْنَ الخِزِيَ بِسَبَبِ تَكْذِيْبِهِمْ للرُّسُول وَجَوابُ «لَوْ» مَحْذُوفٌ تَقْدِيْرُه: لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ أَنَّ مَا حَلَّ بِهِمْ سَبَبُهُ تَكْذِيْبُهُمْ رُسُلَهُم، لَمَّا كَذَّبَ هَؤُلَاء مُحَمَّدَاً ﷺ**)، کە دەفەرموێ: ﴿ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، دیارە بەرکار (**مَفْعُول** بە)ەکەی باس نەکراوە، چونکە ئەو قسەیەی لە پێشێ دا هاتوە، دەیگەیەنێ، ئەویش ئەوەیە کە خوا ﷻ بە ئەوانی پێشتر سزای زەبوونیی پێ چێژتوون، بەهۆی بەدرۆ دانانی پێغەمبەرانەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، هەروەها بە هۆی درۆ دانانی پەیامەکانی خواو کتێبەکانی خواوە.

(**لَوْ**) وەڵامەکەی قرتێنراوە، واتە: ئەگەر زانیبایان کە ئەوانی پێش وان بە هۆی بەدرۆ دانانی پێغەمبەرانیانەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)و، بە هۆی بە درۆ دانانی کتێبەکانی خواوە، وایان بەسەرهاتوە، ئەم خەڵک و کۆمەڵگایە موحەممەدیان ﷺ بە درۆ دانەدەنا.

**مەسەلەی چوارەم:**

**خـوای میهرەبـان بـە مەبەسـتی بیرهاتنـەوەو پارێزکـردنی خەڵکـی، لـە هـەر جۆرە وێنەیەکـی لـە قورئانـدا هێناوەتـەوەو، قورئانیـش زۆر ڕۆشـنەو، هیـچ جـۆرە نارێکییەکـی تێدانیـە، لـە ڕووی بێژەکانیـەوە ڕۆشـنەو، لـە ڕووی زمانپاراویـی و لـە ڕووی ڕەوانبێژیـیـەوەو لـە ڕووی واتاکانیشـیەوە هیـچ نارێکییەکـی تێدانیـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، بە دڵنیایی بۆ خەڵک لەم قورئانەدا لە هەموو وێنەیەکمان هێناوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ لِلنَّاسِ ﴾، وشەی (النّاس) (ألْ)ی ناساندنی لەسەرە، واتە: بۆ تێکڕای خەڵک، مانای (جنس) دەگەیەنێ، واتە: بۆ هەموویان، بەبێ هەڵاواردن.

﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، تەنوینـی سـەر (مَثَـلٍ) بـۆ مەزنیـی و گەورەییـە، یـانی: لـە هەمـوو وێنەیەکـی زۆر مـەزن و گـەورەو ناوازەمـان هێناوەتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، واتـە: لـە هـەر وێنەیـەک کـە خەڵـک پێویسـتیانە بـۆ تێگەیشـتنی ڕاسـتییەکان، کـە تەنیـا لەمیـانی وێنـە هێنانەوەکانـدا لێیـان حاڵیـی دەبـن، یاخـود چاکـتر لێیـان تێدەگـەن، ئەمـە وەک ئـەو ئایەتـەی ژمـارە (٨٩)یـە، لـە سـوورەتی (النحـل)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ﴿٨٩﴾ ﴾، واتـە: ڕوونکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو شـتێک، واتـە: بـۆ هەمـوو شـتێک کـە مرۆڤـەکان پێویسـتییان پێیـەتی، بـۆ هەمـوو شـتێک کـە مرۆڤـەکان پەکیـان لەسـەری کەوتـوە، کـە لـە ڕێـی وەحیـەوە بۆیـان ڕوون بێتـەوە، چونکـە لـە ڕووی عەقـڵ و ئەزمـوونی خۆیانـەوە پێـی ناگـەن، نـەک هەمـوو شـتێک بـە ڕەهایـی.

٢)- ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾، بەڵکو بیریان بێتەوەو، ڕامێنن و، تێبگەن، (تَذَكُّر) بریتیە لە ڕامان و بیرکردنەوە، تاکو ئەوەی ئەوان لێی بێئاگان، بۆیان دەرکەوێ، ئنجا چ زانیبیان و لە بیریان چووبێتەوە، چ جارێ هەر فێری نەبووبن و بۆ ئەوەی فێری بن، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا﴾، کە خوا ﷻ بە (لَ)ی سوێند خواردن و بە (قد)ی ساغکردنەوە (تحقیق) ئەوە جەخت دەکاتەوە، ئەوە حاڵی دوێنراوەکان لەبەر چاو گیراوە، حاڵی ئەوانەی بێبڕوابوون.

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی قورئان دەکات و دەفەرموێ:

٣)- ﴿قُرْءَانًا عَرَبِيًّا﴾، قورئانێکی عەرەبییە، لە حاڵێکدا کە قورئانێکی عەرەبییە، عەرەبیی بە مانای ڕۆشن دێ، واتە: بێژەکانی ڕۆشنن، چونکە زۆر کەس وادەزانێ عەرەبیی، واتە: زمانی گەلێکی دیارییکراو، کە بە تەئکید ئەو واتایەی هەیە، بەڵام بۆچی بەو زمانە گوتراوە عەرەبیی؟

لەبەر ئەوەی نەتەوەو گەلی عەرەب، ئەو زمانەی خۆیان زۆر پێ ڕۆشن بووەو، بێژەکانی ڕۆشن بوون، لێیان تێگەیشتوون، لە عەرەبییدا دەڵێ: (أَعْرَبَ عَنْ رَأْيِهِ) واتە: ڕای خۆی ڕوون کردەوە، هەروەها (إِعْرَاب) واتە: ڕۆشن کردنەوەی ئەو ڕستەیە، کامی بکەرەو کامی بەرکارەو، کامی پیتەو، کامی کردارەو، کامی ناوە؟ کەواتە: ئەم قورئانە ڕۆشنە، لە ڕووی بێژەکانیەوە.

٤)- ﴿غَيْرَ ذِي عِوَجٍ﴾، خاوەنی لاریی نیە، لە ڕووی واتاکانیەوە، (العَوَجُ: والعِوَجُ: الإِختِلَال)، هەندێک لە زانایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (عَوَجٌ وعِوَج) هەردووکیان بە مانای نارێکیی دێن، بەڵام هەندێک گوتوویانە: (عَوَج) بۆ شتێکی بەرهەستە، دەگوترێ: (هَذَا العُودُ عَوَجٌ، أَو بِهِ عِوَج)، ئەم دارە لاریی تێدایە، چونکە دار بەرهەستە، بەڵام (عِوَج) بۆ شتی مەعنەوییە، ﴿غَيْرَ ذِي عِوَجٍ﴾، واتە: نارێکیی تێدانیە لە ڕووی واتاکانیەوە، کەواتە: ئەم قورئانە لە ڕووی بێژەکانیەوەو ڕۆشنەو، لە ڕووی ماناکانیشیەوە ڕێکە، هیچ نارێکییەکی تێدانیە.

٥)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، (بۆیە خوا ﷻ دایبەزاندوە) بەڵکو پارێز بکەن، پارێزکردنیش ئەنجامی بیرکەوتنەوەو ڕامان و تێفکرینە.

ئنجا بۆچی خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ ﴾، نەیفەرمووە: (قُرْآنـاً عَرَبِيّـاً مُسْـتَقِيماً؟)، (محمـد الطاهـر) گوتوویـەتی: (ووَجْـهُ العُـدُولِ عَـنْ وَصْفِـهِ بِالإِسْـتِقامَةِ إلى وَصْفِـهِ بِانْتِفَـاءِ العِـوَجِ عَنْـهُ، التَّوَسُّـلُ إلى إِيْقَـاعِ «عِـوَجٍ» وَهُـوَ نَكِـرَةٌ فِي سِـيَاقِ مَـا هُـوَ بِمَعْنـى النَّفْـيِ، وَهُـوَ كَلِمَـةُ «غَـيْرَ» فَيُفِيـدُ انْتِفـاءَ جِنْـسِ العِـوَجِ عَـلى وجْـهِ عُمُـومِ النَّفْـيِ، أيْ: لَيْـسَ فِيـهِ عِـوَجٌ قَـطُّ، ولِأَنَّ لَفْـظَ «عِـوَجٍ» مُخْتَـصٌّ بِاخْتِـلالِ المَعـانِي، فَيَكُـونُ الـكَلامُ نَصًّـا فِي اسْـتِقامَةِ مَعـانِي القُـرْآنِ، لِأَنَّ الدَّلالَـةَ عَـلى اسْـتِقامَةِ أَلْفاظِـهِ ونَظْمِـهِ، قَـدِ اسْـتُفِيدَتْ مِـنْ وَصْفِـهِ بِكَوْنِـهِ عَرَبِيّاً)[1]، قسـەکەی زۆر جوانـە، هەرچەنـدە زیاتـر ئەوانـەی شـارەزای زمـانی عەرەبیـی و ڕێزمـانی عەرەبییـن تێـی دەگـەن.

دەڵـێ: لـە جیاتی ئـەوەی خـوا بفەرمـوێ: ئـەم قورئانـە ڕێـک و ڕاسـت (مستقیم)ە، بـەوە وەسـفی کـردوە کـە لاریـی ﴿ عِوَجٍ ﴾ی تێـدا نیـە، ئـەوەش بـۆ ئەوەیـە وشـەی (عِـوَج) کـە وشـەیەکی نەنـاسراو (نکـرة)ە، بچێتـە ڕەوتێکـەوە کـە بـە مانـای لابـردن (نفــي)ە، بەهــۆی وشــەی: ﴿ غَيْرَ ﴾ ەوە، ﴿ غَيْرَ ذِي عِوَجٍ ﴾، ئــەو کاتــەش ئــەوە دەگەیەنـێ کـە هەرچـی لارییـە لـە قورئانـدا نیـە، وشـەی: ﴿ عِوَجٍ ﴾یـش تایبەتـە بـە نارێکیـی لـە واتاکانـدا، بۆیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ غَيْرَ ذِي عِوَجٍ ﴾، واتە: مانـاکانی قورئان هیـچ نارێکییەکیـان تێدانیـە، ڕاسـتیی و ڕێکیـی قورئانیـش لـە ڕووی بێژەکانیـەوەو، لـە ڕووی ڕستەسـازییەوە، پێشـتر زانـراوە لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە قورئـان بـە عەرەبیـی وەسـفکراوە.

واتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾، یـانی: لـە ڕووی بێـژەو دارشـتنیەوە، ڕێـک و ڕاسـتە، کـە دەشـفەرموێ: ﴿ غَيْرَ ذِي عِوَجٍ ﴾، واتـە: هیـچ جـۆرە نارێکییـەک لـە ڕووی واتاکانیـەوە لـە قورئانـدا نیـە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٣، ص٣٩٨.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لە قورئان تێبگەین و لێی وردبینەوەو لێی بەهرەمەند بین، بە تەئکیدیش ئەوانە زیاتر لە قورئان بەهرەمەند دەبن، کە زیاتر تێیڕا دەمێنن و لێی ورد دەبنەوە، مرۆڤیش تاکو دوای شارەزایی لە زمانی عەرەبیی، زیاتر خاوەنی قورئان و بێژەری قورئان بناسێ، کە خوایە ﷻ، بە دڵنیایی زیاتر لە فەرمایشتەکەشی تێدەگات، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە زیاتر بە خوا ئاشنا دەبن و، زیاتر لە فەرمایشتەکەی تێدەگەن و، زیدتر لێی بەهرەمەند دەبن.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**وێنەهێنانەوە بە بابایەکی بەردەستی خاوەنانی پێکەوە ناتەباو ناکۆک و، بابایەکی یەکلابووەوە بۆ یەک خاوەن، کە بێگومان یەکسان نین:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ﴾، خوا ﷻ وێنەیەکی هێناوەتەوە: پیاوێک، (یاخود: پیاوێکی بە وێنە هێناوەتەوە)، هی هاوبەشانی ناتەباو ناکۆکە.

لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە (مَثَلًا) دەگونجێ بەرکار (مَفْعُول بِهِ)ی یەکەم بێ و ﴿رَّجُلًا﴾، دەبێتە بەرکاری دووەم (مَفْعُول بِهِ الثاني)، یاخود بە پێچەوانەوە، ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا﴾، (رَجُلًا) بەرکاری یەکەمەو دواکەوتووەو، (مَثَلًا) بەرکاری دووەمەو پێشکەوتوە، واتایەکەشیان ئاوایە: خوا ﷻ وێنەیەکی هێناوەتەوە بە پیاوێک، یاخود: خوا پیاوێکی بە وێنە هێناوەتەوە، ئەو وێنەیە چۆنە؟ ﴿فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ﴾، چەند هاوبەشێکی هەن، پێکەوە ناکۆکن، (التَّشَاكُسُ: التَّخَالُفُ، وَالتَّعَاسُرُ، وَالشَّكِسُ: السَّيِّءُ الخُلُق)، (تَشَاكُسُ) بە مانای پێکەوە ناکۆک، یان پێکەوە دژ، کە هەڵسوکەوتیان پێکەوە نەگونجاو بێ، چونکە وشەی (شَكِس) واتە: مرۆڤێک هەڵسوکەوت و ڕەوشتی نارێک بێ، واتە: پیاوێک کە چەند خاوەنێکی هەن، لەبەر دەستی چەند کەسێک دایە فەرمانی پێدەکەن، ئەو چەند کەسە لەگەڵ یەکدا ناکۆک و ناتەبان، دیارە هەر کامێکیان دەیەوێ بە دڵی وی بجووڵێتەوە، هەر کامێکیان دەیەوێ فەرمانی ئەو جێبەجێ بکات، ئەویش لەو نێوانەدا سەراسیمەو سەرگەردان دەبێ.

٢)- ﴿ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ ﴾، واتە: هەروەها خوا ﷻ وێنەیەکی هێناوەتەوە بە پیاوێک، یان: پیاوێکی بە وێنە هێناوەتەوە، یەکلابۆتەوەو ساغ بۆتەوە بۆ پیاوێک، واتە: پیاوێک کە لەبەر دەستی یەک پیاودایە، یەک خاوەنی هەیە، یاخود یەک فەرمانکەری هەیە.

یەکێک بۆی هەیە بپرسێ: بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا ﴾، بۆ وێنەی یەکەم، وێنەی دووەمیشی دەفەرموێ: ﴿ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ ﴾، هەر باسی پیاو دەکات؟

گوتراوە: (ذُكِرَ الرَّجُلَ لِأَنَّ الرَّجُلَ هُوَ الَّذِي يَسْبِقُ إِلَى أَذْهَانِ النَّاسِ فِي الْمُخَاطَبَاتِ وَالْحِكَايَاتِ، وَلِأَنَّ مَا يُرَادُ مِنَ الْأَعْمَالِ أَكْثَرُ مِمَّا يُرَادُ مِنَ الْمَرْأَةِ وَالطِّفْلِ)، واتە: بۆیە باسی پیاو کراوە، چونکە لە کاتی قساندا‌و، لەبەرو مەجلیساندا، ئەوەی کە زۆرتر دێتە زەینەوە، پیاوە، هەروەها پیاو لە ژن و منداڵ پتر بە ئامانج دەگیرێ، بۆ نیش و کار پێ سپاردن.

٣)- ﴿ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ﴾، ئایا سیفەت و حاڵیان وەک یەکە؟! (مَثَل) لێرەدا بە مانای سیفەت دێ، یان بە مانای حاڵ دێ، ئایا حاڵ و بارودۆخیان وەک یەکە، ئەو دوو کەسە؟! یەکێکیان چەند خاوەنێکی پێکەوە ناکۆک و ناتەبای هەن، ئەوەی دیکەش یەک خاوەنی هەیە بۆی یەکلابۆتەوە، ئایا حاڵ و سیفەتیان وەک یەکە؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە واتە: بە تەئکید وەک یەک نین و یەکسان نین.

٤)- ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ستاییش بۆ خوا، خوا ستاییشی خۆی دەکات لەسەر ئەوە کە ئەو ڕاستییانە بەو شێوەیە ڕوون دەکاتەوە، یاخود: (إِيذَانٌ لِلْمُوَحِّدِينَ بِأَنَّهُمْ بِتَوْحِيدِهِمْ فِي نِعْمَةٍ عَظِيمَةٍ تَسْتَحِقُّ الْحَمْدَلِلَّهِ تَعَالَى، أَوْ هُوَ جَوَابٌ لِلْإِسْتِفْهَامِ التَّقْرِيرِي)، یان ئاگادار کردنەوەیە بۆ یەکتا پەرستان کە بە هۆی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خواپەرستنیانەوە، لە چاکەو خێرو خۆشییەکی مەزندان، کە شایستەی ئەوەیە ستاییشی خوای بەرزی لەسەر بکرێ، یاخود: کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ئەمە وەڵامە بۆ پرسیارکردنەکەی

پێشی، کە ئەو پرسیارکردنەی پێشی دەگونجێ پرسیارکردنی چەسپاندن (تقریر) بێ، نەک پرسیارکردنی نکوولّیلێکردن، ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾، واتە: ئەی دوێنراو! ئایا وەک یەکن؟ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾، ستاییش بۆ خوا، کە وەک یەک نین.

٥)- ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵکو زۆربەیان نازانن، واتە: (لَا يَعْلَمُونَ عَدَمَ اسْتِوَاءِ الحَالَتَيْنِ، ولَوْ عَلِمُوا لاخْتارُوا لِأَنْفُسِهِمُ الحُسْنى)، نازانن کە حاڵی ئەو دوو کەسانە یەکسان نیە، ئەگەر زانیبایان ئەوەی باشترە ئەوەیان هەڵدەبژارد.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ﴾، نافەرمـوێ: (كُلُّهُـمْ)، لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا، خـوا ﷻ وشـەی زۆربـە (كَثِـيْر، أَكْـثَر) بەکاردەهێنـێ، بۆچـی؟ (أَكْثَرُهُـم: وَهُـمُ الأَتْبَاعُ المَخْدُعُـون لَكِـن الرُّؤَسَـاء الأَقَلِيَّـة كَانُـوْا يَعْلَمُـون)، واتە: شـوێنکەوتووە، کڵاو لەسـەرنراوو، هەڵخەڵەتێـنراوەکان، نەیانزانیـوە کـە تەوحیـدو، شـیرک، وەک یـەک نیـن، بـەڵام سـەرکردە زۆر زانـاکان کـە کەمینـە بوونـە، ئـەوان زانیویانـە، بۆیە خـوا ﷻ دەفەرموێ: زۆربەیـان نازانـن، واتـە: زۆربـەی ئەهـلی شـیرک و ئەهـلی کوفـر ئـەو ڕاسـتییە نازانـن و کەمێکیـان دەیزانـن، بـەڵام بەرژەوەندییـان لـە کوفـرو شـیرکدایە، بـۆ ئـەوەی بـازاڕی خۆیـان بـەو خەڵکـە نـەزان و نەفامـە قەڵەباڵـغ بکـەن و، بەکاریـان بێنـن بـۆ مـەدار سـازکردنی ناشـەرعییانەی خۆیـان، کـە خەڵکەکـە ئەگـەر بێـت و هۆشـیار بـن و، چاویـان بکرێتـەوە، چیدیکـە ئامـادە نابـن بـاری ئـەو خۆسـەپێن و ستەمکارانەیان لەسـەر پشـتێ بـێ.

لێـرەدا ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دێنیـن، کـە دەفەرمـوێ: {مَنْ كَانَـتِ الدُّنْيَـا هَمَّـهُ، فَـرَّقَ اللَّـهُ عَلَيْـهِ أَمْـرَهُ، وَجَعَـلَ فَقْـرَهُ بَـيْنَ عَيْنَيْـهِ، وَلَـمْ يَأْتِـهِ مِـنَ الدُّنْيَـا إِلَّا مَـا كُتِـبَ لَـهُ، وَمَـنْ كَانَـتِ الآخِـرَةُ نِيَّتَـهُ، جَمَـعَ اللَّـهُ لَـهُ أَمْـرَهُ، وَجَعَـلَ غِنَـاهُ فِي قَلْبِـهِ، وَأَتَتْـهُ الدُّنْيَـا وَهِـيَ رَاغِمَـةٌ} (أخرجـه الترمـذي: ٢٤٦٥، وابـن ماجـه: ٤١٠٥، قـال الألبـاني: صحيـح).

واتـە: هـەر کەسـێک مەبەسـتی دنیـا بـێ (ئـەوەی کـە زۆر لێـی دەخەفتـێ ژیـانی دنیـا بـێ)، خـوا کاروبارەکـەی لـێ بـڵاو دەکات و هەژاریـی دەخاتـە نێـو چـاوانی و

(و تـە: هەمیشـە خـۆی بـە هـەژار دەبینـێ و دەزانـێ)، تەنیا ئەوەنـدەشی لـە دنیا بـۆ دێ، کـە بـۆی نـووسراوە. بـەڵام هـەر کەسێک ڕۆژی دوایـی و مەنزڵـگای کۆتایـی مەبەسـت و ئامانجی بێ، خوا ﷻ کاروبارەکـەی بـۆ کـۆ دەکاتـەوە سـەریەک (پـەرش و بـڵاو نابـێ)و دەوڵەمەندیـی و بـێ نیازیـی دەخاتـە نێـو دڵـی و، دنیـاش دێتـە بەردەستی بـە ملکەچیی.

**مەسەلەی شەشەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەر کام لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺو، بێبڕوایەکانیش سەرەنجام دەمرن و، لە قیامەتیش لە خزمەت خوادا، مشت و مڕو دەمەقاڵێیان دەبێ، لە کاتی دادگایی کرانیان و دادوەریی کردنی خوای دادگەر لە نێوانیاندا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە: لە سێ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ ﴾، بە دڵنیایی تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ)مردووی، ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (إِنَّكَ مَائِتٌ)، (مَيِّتٌ) لەگەڵ (مَائِتٌ) هەردووکیان بە مانای مردوون، هەڵبەتە ئەو کاتە کە خوا ﷻ ئەو ئایەتەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ناردوە، زیندوو بووە، بەڵام واتە: تۆ بە مسۆگەریی دوایی دەمری، نەک ئێستا مردووی.**

**٢)- ﴿ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانیش هەر مردوون، هەروەها ئاواش خوێنراوەتەوە: (وَإِنَّهُم مَائِتُونَ)، هەندێک لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە: (مَيِّت: مَنْ لَمْ يَمُتْ، وَمَيْت: مَنْ مَاتَ، وَالصَّحِيحُ، أَنَّهُ لَا فَرْقَ بَيْنَهُمَا)، هەندێک گوتوویانە: (مَيِّت) واتە: کەسێک کە جارێ نەمردوە، بەڵام (مَيْت) بەبێ گیرە (شَدَّة)، واتە: کەسێک کە مردوە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە کە جیاواز نین و، لە قورئانیشدا بە هەردوو خوێندنەوەکان هاتوون، بۆیە یەک واتایان هەیە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ ﴾، واتە: لە داهاتوودا تۆ دەمری، ﴿ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾، یان (مَائِتُونَ) و بە دڵنیایی ئەوانیش لە داهاتوودا دەمرن.**

**ئەمە بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، کە دەیانگوت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ ﴾الطور، یان دەڵێن: شاعیرە بەڵای مردنی**

بـۆ چـاوەڕێ دەکەیـن، بەڵایـەکانی ژیـان و گـوزەرانی بـۆ بێـن، بمـرێ و لـە کۆڵـمان بێتـەوە، ئنجـا لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: تـۆش دەمـری بـە دڵنیایـی و ئەوانیـش دەمـرن.

٣)- ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾، دوایی بە دڵنیایی ئێوە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا (و لەو ڕۆژەدا کە خەڵک زیندوو دەکرێنەوەو، هەڵدەسێنرێنەوە بۆ سزاو پاداشت)، لە لای پەروەردگارتان و لە خزمەت پەروەردگارتاندا دەکەونە دەمەقاڵییەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾، لـە خزمـەت پەروەردگارتانـدا، دەکەونـە دەمەقاڵێـوە، لەبـەر ئەوەیـە کـە پـەروەردگار دادوەریـیان لـە نێوانـدا دەکات و دادگاییـان دەکات، بـەو شـێوەیە کـە بـەس خـوا ﷻ بـۆ خـۆی دەزانـێ چۆنـە؟

ئەمـە بەرپەرچدانـەوەی هاوبـەش بـۆ خوادانەرەکانیشـە، لـەوەدا کـە نکووڵییـان دەکـرد لـە زینـدوو کرانـەوەو لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئـەی موحەممـەد ﷺ! تـۆش دەمـری و، ئەوانیـش بـە دڵنیایـی دەمـرن، دوایـی ئێـوە لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا لـە خزمـەت پەروەردگارتانـدا، دەکەونـە دەمەقاڵـێ و ناکۆکیـی و مشـتومڕەوە، واتـە: زینـدووش دەکرێنـەوەو لێشـتان دەپرسـێتەوەو دادگاییـش دەکرێـن.

لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُكَرَّرُ عَلَيْنَا مَا يَكُونُ بَيْنَنَا فِي الدُّنْيَا مَعَ خَوَاصِّ الذُّنُوبِ؟ قَالَ: نَعَمْ، لَيُكَرَّرَنَّ عَلَيْكُمْ، ذَلِكَ حَتَّى يُؤَدَّى إِلَى كُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ. قَالَ الزُّبَيْرُ: فَوَ اللَّهِ إِنَّ الْأَمْرَ لَشَدِيدٌ} (أَخْرَجَهُ الحاكم: ٢٩٨١، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ. تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح).

واتـە: زوبەیـری کـوڕی عـەووام ﷺ دەڵـێ: کاتێـک ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـە هاتنـە خـوارێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾، گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئایـا گوناهـە تایبەتییـەکان کـە لـە نێو ئێمانـدا دەبـن، پێـمان دەگوترێنـەوەو بۆمـان دووبـارە دەکرێنـەوە؟ فەرمـووی: بەڵـێ، ئـەو گوناهانەتـان دەخرێنـەوە بەرچـاو، هەتـا هـەر خـاوەن مافێـک مـافی خـۆی پـێ دەدرێ، زوبەیـر گـوتی: بـە خـوا کارەکـە زۆر سـەختە.

واتـە: ئەگـەر ئـەوەی لـە نێـوان مسـوڵمانان خۆشـیاندا دەبـێ، ئـەوەش بخرێتـەوە بەرچاویـان، کارەکـە سـەختە، یـانی: بـاسی یەکـدی کردنـە، تۆمـەت بـۆ یەکـدی هەڵبەسـتنە، دڵـی یەکـدی ئێشـاندنە، گومـانی خـراپ بـە یەکـدی بردنـە ... هتـد، ئەوانـەش دێنـەوە ڕێ، دیارە لـە حاڵێکـدا کـە لـە دنیـادا مـرۆڤ تەوبەیەکـی سـخ و ڕاسـتی لـێ نەکردبـن و، مـافی خـاوەن مافـانی نەگێڕابێتـەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**بەراوردی نێوان بە درۆ دانەرانی پەیامی ڕاست و دروستی خوا، کە سەرەنجامیان دۆزەخ و، بە ڕاستدانەرانی پەیامی ڕاستی خواو، سەرەنجامی دڵپەسندانەیان و پاککرانەوەیان لە خراپەکانیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ! پیتی (ف) لە (فَمَنْ)دا، **(فَاء التَّفْرِيع عَلَى مَا قَبْلَهَا وَهُوَ الإخْتِصَام)**، ئەم (ف)یە پەیوەست دەبێتەوە بە مەسەلەی پێشێوە، کە دەفەرموێ: لە خزمەت پەروەردگارتاندا دەکەونە مشت و مڕەوە، ئنجا دەفەرموێ: کێ ستەمکاترە لە کەسێک کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ، مەبەست لە درۆ بۆ خوا هەڵبەستن، ئەوەیە کە گوتوویانە: خوا ﷻ هاوبەشی هەیە، خوا ڕۆڵەی هەیە...هتد، ئەو بیرۆکە ئەفسانەیی و پووچ و بۆشانە، وشەی (مَنْ)یش بۆ پرسیارکردنە، ئەویش یان پرسیارکردنی چەسپاندن و دان پێداهێنانە، یاخود بۆ نکووڵییکردنە، بۆ هەردووکیان دەشێ، واتە: **(لَا أَحَدٌ أَظْلَمُ مِنْ هَذَا المُفْتَرِي المكَذِّبِ)**، هیچ کەسێک لەو درۆ هەڵبەستەرە بە ناوی خواوەو، بە درۆ دانەرە بۆ ڕاستیی پەیامی خوا ستەمکارتر نیە، ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ﴾، کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بە ناوی خواوە دەکات و درۆی بۆ هەڵدەبەستێ!

٢)- ﴿وَكَذَّبَ بِٱلصِّدۡقِ إِذۡ جَآءَهُۥٓ﴾، هەروەها ئەو ڕاستییەی کە بۆی هاتوە، بە درۆی دادەنێ، هیچ کەسێک لە کەسێک کە درۆ بۆ خوا ﷻ هەڵدەبەستێ و، ڕاستییەک کە لە خواوە هاتبێ بە درۆی دادەنێ ستەمکارتر نیە، مەبەست لە (صِدْق) لێرەدا: (القُرْآن الَّذِي هُوَ مُجَسَّمٌ الصِّدْق مِنْ كُلِّ الجَوَانِب)، مەبەست لە: (صِدْق) ڕاستیی، ئەو قورئانەیە کە لە ڕاستییدا لە هەموو ڕوویەکەوە ڕاستیی و هەقی تێدا بەرجەستە بووە.

٣)- ﴿أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئایا لە دۆزەخدا جێگەو ڕێگەی حەوانەوە بۆ بێبڕوایان نیە! ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: بە دڵنیایی لە دۆزەخدا جێی حەوانەوەو، تێدا نیشتەجێ بوون بۆ بێبڕوایان هەیە، چونکە (المَثْوَى: إِسْمُ مَكَانِ الثُّوَاءِ، وَهُوَ القَرَارُ، فَالمَثْوَى: المَقَرّ)، (مَثْوَى): ناوی شوێنە لە وشەی (ثُوَاء) ەوە هاتوە، (ثُوَاء) بریتیە لە نیشتەجێ بوون، کەواتە: (مَثْوَى) یانی: شوێنی نیشتەجێ بوون، لە ڕستەی پێشێ کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ بِٱلصِّدۡقِ إِذۡ جَآءَهُۥٓ﴾، ئەو پەیامە ڕاستەی بۆی هاتوە یەکسەر بە درۆی داناوە، بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوەو، تێوەی ڕامێنێ، ئەوانە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئایا بۆ بێبڕوایان جێگەو ڕێگە لە دۆزەخدا نیە! واتە: بە تەئکید ئەوانە بێبڕوان و، جێگەو ڕێگەشیان لە دۆزەخدایە.

٤)- ﴿وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ﴾، بەڵام کەسێک کە ڕاستیی هێناوەو، بەڕاستیشی داناوە، ئا ئەوانەن پارێزکاران.

﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾: هەر خۆشی دڵنیا بووەو بە ڕاستدانەری خۆی و پەیامەکەی بووە، یاخود ئەوانەش کە بە ڕاستیان داناوە کە هاوەڵانی، خوا لێیان ڕازی بێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾، (هـ)ی سەر (بِهِۦٓ ) یان دەگەڕێتەوە بۆ (الصدق)، (صَدَّق بِالصِّدقِ)، واتە: ئەو پەیامە ڕاستەی کە بۆی هاتوە، بە ڕاستی دادەنێ، یاخود دەگەڕێتەوە بۆ (الَّذِي) واتە: ئەو کەسەی پەیامە ڕاستەکەی هێناوە، بە ڕاستی دەزانێ کە موحەممەدە ﷺ، واتە: قورئان بە ڕاست دەزانێ، یان موحەممەد ﷺ کە هێنەری قورئانە لە خواوە، بە ڕاستی دادەنێ.

کە دەفەرمـوێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، ئـا ئەوانــەن پارێــزکاران، ئەمـە شـێوازێکی کورتهەڵێنانـە، واتـە: پارێـزکاران ئەگـەر هەبـن تەنیـا ئەوانـەن، بێگومـان لێـرەدا مەبەسـت لەوانــەش هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەرە ﷺ بـە پلـەی یەکـەم، چونکـە کاتێـک موحەممـەد ﷺ ئـەو پەیامـە ڕاسـتەی خـوای هێنـا، یەکەمیـن کەسـانێک کـە بڕوایـان پـێ هێنـان، هـاوەڵانی بەڕێـزی بـوون، خـوا لێیـان ڕازی بـێ، لـە پێـش هەمووشـیانەوە، ئەوانـەی کـە لـە پێشـەوە بـوون بـە تایبـەتی (أبـو بکـر الصدیـق)، ئنجـا دوایـی ئـەوانی دیکـەش خـوا لـە هەموویـان ڕازی بـێ.

بێگومـان ئـەوەش بەرزیـی پێگـەو پایـەی هـاوەڵانی بەڕێــزی پێغەمبـەر ﷺ دەگەیەنـێ، چونکـە خـوا ﷻ بـە کۆمەڵێـک سـیفەتی گـەورە ستاییشـیان دەکات و دواییـش پاداشـتێکیان بـۆ ڕادەگەیەنـێ کـە هـەر شایسـتەی ئەوانـە، خـوا هـاوکار بـێ دوایـی لـە تەفسـیری سـوورەتی (الفتـح)دا، کـە لـە چەنـد شـوێنێکدا مـەدح و سـتاییشی زۆری هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەری ﷺ تێـدا کـراوە، خـوا پشـتیوان بـێ بـاسی پێگـەو پایـەی بـەرزی هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ دەکەیـن، هـەروەک لـە کتێبـی حەوتەمـی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كمـا يتجلـى في كتـاب اللـه**) کـە لـە ژێـر ناوونیشـانی: (**خاتـم النَّبيـين محمَّـد ﷺ: موجـز سـيرته، وبراهـين نبوتـه، ومقامـه الرَّفيـع، وواجبنـا اتجاهــه**)، لەوێــدا بـاسی پێگـەو پلـەی بـەرزو نـاوازەی هـاوەڵانی بەڕێــزی پێغەمبـەر ﷺو، پۆلێـن کردنیـان بـۆ چەنـد بەشـێکمان، کـردوە.

هـۆکاری چییـە؟ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، بـە کـۆ (جمـع) دەیهێنـێ، هـەر ئەوانـەن پارێـزکاران، لـە حاڵێکـدا کـە (الَّـذِي) بـۆ تاکـە: ﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ ﴾، هەروەهـا: ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴾، ئەویـش هـەر بـۆ تاکـە؟

دەڵێیـن: ئـەوە لەبـەر ڕەچـاو کـردنی وشـەی (الَّـذِي) بـووە، کـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴾، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا مەبەسـت پێـی کۆیـە، چونکـە دوایـی

هەموو ڕاناوەکان بە کۆ دێنێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ٣٣ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٣٤ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٣٥﴾، کە زیاتر لە دە (١٠) ئاماژەی کۆ هاتوون، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ﴾، بە دڵنیایی مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ، ئەو کەسەی ڕاستیی هێناوە، پەیامی ڕاستیی هێناوە، بەڵام ئەوی دیکە: ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾، هەروەها ئەو کەسەی کە ئەو پەیامە ڕاستەی، یاخود ئەو هێنەری پەیامە ڕاستەی بەڕاست داناوە، واتە: قورئانی بەڕاست داناوە، کە پەیامە ڕاستەکەیە، یان هێنەرەکەی ئەو پەیامە کە موحەممەدە ﷺ بەڕاست داناوە، ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾، هەرچەندە بە تاک هاتوە، بەڵام مەبەست پێی کۆیە، چونکە دوایی دەفەرموێ: هەر ئەوانەن پارێزکاران.

٦)- ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، هەرچی بیانەوێ لە لای پەروەردگاریان هەیانە، (أي: لَهُمْ كُلُّ مَا يَتَمَنَّوْنَهُ وَيُعْطَوْنَهُ)، هەرچی کە بە خۆزگەی دەخوازن بۆیان هەیەو پێیان دەبەخشرێ.

٧)- ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، ئا ئەوەش پاداشتی چاکەکارانە، کەواتە: خوا ﷻ هەم بە پارێزکاران پێناسەی کردوون، هەم بە چاکەکاران، دەشیتوانی بفەرموێ: (ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، ئەمە: (إِظْهَارٌ فِي مَقَامِ الإِضْمَارِ، لإِفَادَةِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِم بِأَنَّهُمْ مُحْسِنُون)، ئەمە دەرخستنە لە شوێنی شاردنەوە، بۆ ئەوەی ستاییشان بکات، بەوەی کە وێڕای ئەوەی پارێزکارن، چاکەکاریشن.

٨)- ﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ﴾، تاکو خوا ﷻ لێیان بسڕێتەوە، خراپترین شتێک کە کردوویانە، خراپترین کردەوەکانیان بسڕێتەوە.

(ل)ی سەر (لِيُكَفِّر)، (ل)ی هۆکارە: (اللاَّمُ لِلتَّعْلِيلِ وَهِيَ تَتَعَلَّقُ بِفِعْلٍ مَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ قَوْلُهُ: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، وَالتَّقْدِيرُ: وَعَدَهُمُ اللهُ بِذَلِكَ، وَالْتَزَمَ لَهُمْ ذَلِكَ، لِيُكَفِّرَ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا)، واتە: (ل) بۆ هۆکار دۆزییەو پەیوەستە

بـە کرداریّکـی قرتێـنراوەوە، کـە (لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ) دەیگەیەنێ و تـاوا مەزەننـە دەکـرێ: بۆیـە خـوا ﷻ ئـەو بەڵێنـەی پێـداون، کـە هەرچـی بیانـەوێ هەیانـە، تاکـو خراپترینـی کردەوەکانیـان کـە ئەنجامیانـداون، لێیـان بسـڕێتەوەو پاکیـان بکاتـەوە.

٩)- ﴿ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، پاداشتەکەشیان بداتەوە، بە پێی باشترینی کردەوەکانیان کە ئەنجامیانداون.

پرسـیار لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـراوە: چ گوناهێـک گەورەتـرە؟ فەرموویـەتی: (أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ) (أخرجه أحمد: ٤١٣١، والبخاري: ٤٢٠٧، ومسلم: ٨٦، وأبو داود: ٢٣١٠، والترمذي: ٣١٨٢، والنسائي: ٤٠١٣) واتـە: (گەورەتریـن گونـاح ئەوەیـە) کـە تـۆ هاوتایـەک بـۆ خـوا بانـگ بکـەی، لـە حاڵێکـدا ئـەو (خـوا) بەدیهێنـەری تۆیـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ ﴾، وشـەی (أَسْوَأَ) یـانی: خراپتریـن، بـەڵام (الأَسْوَأُ مَسْلُوبَ المُفَاضَلَةِ، أي: العَمَلِ الشَّدِيْدِ السُّوءِ)، لێـرەدا مەبەسـت پێـی خراپتریـن کردەوەیـان لـە فـڵان کردەوەیان، نیـە، چونکـە بەرانبەرەکەی قرتێـنراوەو، لەبـەر چـاو ناگیـرێ، بەڵکـو مەبەسـت پێـی هـەر کردەوەیەکـی زۆر خراپـە لـە خـودی خۆیـدا، هەروەهـا ئـەوی دیکەشـیان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، بـە هەمـان شـێوە، واتـە: ئـەو کـردەوە زۆر باشـەی کـە کردوویانـە، ئـەوە دەکرێتـە پێوانـە بـۆ پاداشـتدانەوەیان، سـەرەنجام مانایەکـەی دەبێتـە ئـەم دووە:

١)- (يَجْزِيهِمْ بِمَحَاسِنِ أَعْمَالِهِمْ دُوْنَ مَسَاوِئِهَا)، خوا پاداشتی کردەوە باشەکانیان دەداتەوە، بەڵام خراپەکانیان لێ دەسڕێتەوەو لەسەریان سزایان نادات.

٢)- (يَجْعَلُ مَحَاسِنَ أَعْمَالِهِمْ مِثْلَ أَحْسَنِهَا فِي الأَجْرِ)، سەرجەم کردەوە باشەکانیان، وەک کردەوە هەرە باشەکانیان دادەنێ لە پاداشت درانەوەدا، واتە: کردەوە هەرە باشەکانیان

دەکرێنە پێوەرو تەرازوو بۆ پاداشت دانەوەیان و، بە پێی باشترین کردەوەیان پاداشتیان دەدرێتەوە.

بۆ وێنە: کەسێک کە نوێژکەرە، هەندێک لە نوێژەکانی زۆر بە ڕێک و پێکیی دەکات، چ لە ڕووی نێوەڕۆکیانەوەو، چ لە ڕووی ڕووالەتیانەوە، ئنجا خوا ﷻ ئەو نوێژە هەرە باشانە، دەکاتە پێوەر بۆ پاداشت دانەوەی لەسەر سەرجەم نوێژەکانی، هەروەها ڕۆژوو گرتنەکەو، هەروەها خێرو چاکەکان، هەروەها هەموو کردەوەکانی دیکەش هەر بەو شێوەیەو، دیارە بەخشش و کەرەمی خواش ﷻ سنووری نیە.

**مەسەلەی هەشتەم و کۆتایی:**

**بێبڕوایەکان پێغەمبەریان ﷺ بە پەرستراوەکانیان دەترساند، بەڵام خوا ﷻ بەسە بۆ بەندەی خۆی کە بیپارێزێ و پشتی بگرێ و سەری بخات، نەگومڕاکراوی خواش ڕاستە ڕێکەری هەیەو، نە ڕاستە ڕێکراویشی گومڕاکەری هەیەو، لە حاڵێکیشدا کە بێبڕوایەکان دان بە بەدیهێنەرایەتیی خوا ﷻ و، هیچ لە دەست نەهاتوویی پەرستراوەکانیان لە بەرانبەر خوادا دێنن، هیچ لۆژیک نیە بیانپەرستن، بۆیە خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بێ منەتیان بکات و، دڵنیاشیان بکات کە زەبوون و تێشکاو دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾، ئایا خوا ﷻ بەس نیە، بۆ بەندەی خۆی! بەوانەی جگە لەو (خوا)یش دەتترسێنن! (عَبْدَه) خوێنراویشەتەوە: (عِبَادَه)، (أَلَيْسَ اللهُ بِكَافٍ عِبَادَه) واتە: ئایا خوا ﷻ بۆ بەندەکانی خۆی بەس نیە! ئەمە لە ئەسڵدا بەو شێوەیە بووە: (وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِيْنَ مِنْ دُونِ اللهِ، وَاللهُ كَافِيْكَ)، ئەوان بە جگە لە خوا دەتترسێنن، بەو پەرستراوانەی کە لە جیاتی خوا یان لە وێڕای خوا دەیانپەرستن، تۆ دەترسێنن و دەڵێن: زیانت پێ دەگەیەنن، بەڵام خوا ﷻ بۆ

تۆ بەسە، بەڵام بۆیە خوا ﷻ تەعبیرەکەی ئاوا دارشتوە: ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ[١] وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ ﴾، تاکو ئەوەی کافرەکان پێیان ناخۆشەو ئەوەش کە مایەی دڵخۆشیی پێغەمبەرە ﷺ پێش بخرێ، کە بریتیە لە: ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾، ئەمە جێی دڵخۆشییە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە ئایا خوا ﷻ بەس نیە بۆ بەندەی خۆی؟ هەروەها ئەمە جێی دڵناڕەحەتیی و ناخۆشییە بۆ بێبڕوایەکان، مادام خوا بەس بێ بۆ بەندەی خۆی.

کەواتـە: ترسـێنرانی ئـەو بەندەیـەی خـوا، یـان بەنـدەکانی خـوا، ئەگـەر بـە (عِبَادَه) بخوێنرێتـەوە، بـت و صەنەمـەکان و پەرسـتراوە سـاختەو پووچـەکان، شـتێکی بـێ جێیـە.

﴿ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ ﴾، ئەمـە ئاوڕدانەوەیـە لـە شـێوەی نادیـارەوە بـۆ شـێوەی ئامـادە (إلْتِفَاتٌ مِنْ الغَائِبِ إلى الحَاضِرِ)، تاکـو نێوەڕۆکـی ئـەم ڕستەیە تایبـەت بکـرێ بـە پێغەمبـەرەوە ﷺو بـۆ ئـەو سـاغ و یەکلابکرێتـەوە، ئـەوان تـۆ دەترسـێنن بـەو شـتانەی کـە لـە خـوار خـواوەن و لـە جیـاتی خـواوە دەیانپەرسـتن، بـە بـت و صەنەمەکانیـان، دەیانگـوت: ئـەی موحەممـەد! ﷺ قسـە بـە بتەکانمـان، مەڵـێ، - بێگومـان پێغەمبەریـش ﷺ تەعبیـرو وشـەی ناشایسـتەی بەکارنەهێنـاون، بـەس دەیفەرمـوو: ئەوانـە هیـچ نیـن، ئـەو پەیکـەرو بـت و صەنەمانـەی کـە دەیانپەرسـتن، هیـچ لـە دەسـت نەهاتـوون، هیچیـان پـێ ناکـرێ، ئایەتـەکانی خـوا هـەر ئـەو جـۆرە تەعبیرانەیـان تێدایـە، ئـەوان ئەوەیـان بـە قسـە پـێ گوتـن و جنێـو دادەنـا - دەیانگـوت: قسـە بـە پەرسـتراوەکانمان مەڵێ، زیانـت پـێ دەگەیەنـن، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئایـا خـوا بـۆ بەنـدەی خـۆی بـەس نیـە؟، یـان بـۆ بەنـدەکانی

---

(١) هەرجارێـك ئـەم ئایەتـە بەپێـزە دەخوێنمـەوە، ئـەو ڕۆژەم دێتـەوە یـاد، کـە دوای ماوەیـەك ئـازار و ئەشـکەنجە لـە زیندانـی ئەمریکا دا لـە (کرووپـەر) چەنـد ڕۆژێـك بـێ هـەواڵ بـوون و، ڕۆژێـك لـە خوێندنـی قورئانـدا لـە نوێژەکانمـدا، ڕێـك گەیشـتبوومە ئـەو ئایەتـە: ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ... ﴾، لـە دەرگایانـدا بـۆ لێکۆڵینـەوەو دادگایـی (تحقیـق و محاکمـة) و، خوێندنـی ئایەتەکـە لەوکاتـەدا، هـۆکاری هێمنـی و ئارامیـم بـوو! ئـەو ڕۆژەش دەوری: ٢٠٠٣/٧/٣٠ ز بـوو، چونکـە (٢٠) ڕۆژ دوای دەسـتگیرکرانم بـوو.

خۆی، بەس نیە، بیانپارێزێ و سەریان بخات؟ ئەوانیش تۆ دەترسێنن بەو شتانە کە لە خوار خواوەن و لە جیاتی خوا دەیانپەرستن!

٢)- ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾، کەسێکیش خوا ڕێی لێ تێک بدات، یان لە ڕێ ونی بکات، هیچ ڕاستە ڕێکەرێکی بۆ نیە، نەک ڕێنماییکار، چونکە خوا ڕێنمایی هەموو کەسێکی کردوە، بەڵام ئەوانەی کە خوا ڕێنماییان دەکات، هەیە ڕێنمایی خوا قبووڵ دەکات و، خواش ڕاستە ڕێی دەکات، هەشە ڕێنمایی خوا ڕەفز دەکات و، خواش سەری لێ دەشێوێنێ و سەرگەردان دەبێ، بەهۆی ئەوەوە کە ڕێنمایی خوای ڕەتکردۆتەوە.

٣)- ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾، هەروەها هەر کەسێکیش خوا ڕاستە ڕێی بکات، هیچ گومڕاکەرێک و هیچ سەرلێشێوێنەرێکی بۆ پەیدا نابێ.

ئەمە لە لایەکەوە دڵخۆشییە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ بڕواداران، کە مادام خوا ﷻ ڕاستە ڕێی کردوون، هیچ کەس ناتوانێ ڕێیان لێ تێک بدات و ڕێیان لێ بشێوێنێ، لە لایەکی دیکەشەوە نائومێدکردنە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرە گومڕایەکان، کە مادام بەپێی بڕیاری خواو، بە پێی یاسای خوا، ئێوە گومڕا بوون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ڕێنمایی خواتان قبووڵ نەکردوە، تازە ڕێ نابیننەوەو، هەرگیزیش ڕاستە ڕێ نابن.

٤)- ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ﴾، ئایا خوا زاڵ و باڵا دەستی خاوەن تۆڵە نیە؟ (الإسْتِفْهَامُ تَقْرِيرِيٌّ، لأَنَّ العِلْمَ بِعِزَّةِ اللهِ مُتَقَرِّرٌ فِي النُّفُوس)، لێرەدا ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی چەسپاندنە، چونکە زانیاریی هەبوون بە عیززەت و باڵا دەستیی خوا، چەسپاوە لە هەموو عەقڵ و دڵەکان دا.

کە دەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ﴾، (العَزِيزُ: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ مُشْتَقَّةٌ مِنَ العِزِّ، أَي: المَنَعَة)، واتە: (عَزِيز): ناوەڵناوی چوێنراوە (بە کردار) - لە ڕووی ڕێزمانییەوە - لە وشەی (عِزّ)ەوە هاتوە، (عِزّ)یش ئەوەیە کەسێک حاڵەتێکی هەبێ کە بەرانبەرەکانی پێی نەوێرن و زەفەرەی پێ نەبەن.

کە دەفەرمـوێ: ﴿ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴾، خـاوەن تۆڵەسـتاندن، (الإِنْتِقَامُ: الْمُكَافَأَةُ عَلَى الشَّرِّ بِشَرٍّ، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ النَّقْمِ وَهُوَ الْغَضَبُ)، (إِنْتِقَام) لـە (نَقْم)ەوە هاتـوە، واتـە: تووڕەیـی، ئنجـا: ﴿ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴾، واتـە: خـاوەن تۆڵـە، چونکـە (إِنْتِقَام) بریتیـە لـە سـزادانەوەی خراپـە بـە خراپـە، واتـە: خـوا هـەم بـاڵا دەسـتەو هـەم خـاوەنی تۆڵەستاندنیشـە بـۆ کەسـانێک کـە شایسـتەی ئـەوەن، خـوا سـزایان بـدات و تۆڵەیـان لـێ بسـتێنێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ﴾، لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾الأعـراف، واتـە: هـەر کەسـێک خـوا گومـڕای بـکات، ڕاسـتە ڕێ کـەری بـۆ نابـێ و، لێیـان دەگـەڕێ لەسـەر کێشـیی خۆیـان دا سەراسـیمەو سـەرگەردان بـن، بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ﴾، یـان: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، (مِـن)ی بـۆ زیـاد کـراوە: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، ئنجـا (مِـن)، بۆیـە لێـرەدا زیـاد کـراوە، تاکـو دەق بـێ لەسـەر ئـەوەی کـە جینـسی ڕێنماییـکارو ڕاسـتەڕێکەریان نابێـت، بـەڵام لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ﴾ لەبـەر ئـەوەی (لا) کـە لـە پێشـەوەیەتی پێـی دەگوتـرێ: (لَا النَّافِيَة للجِنْس)، واتـە: جینـسی ڕاسـتە ڕێکـەری نابـێ، کەواتـە: ئەمـە هونـەر نواندنـە لـە دەربڕینـدا، ئەگەرنا ماناکەیـان هەریەکـە، چونکـە هـی سـوورەتی (الزمـر)، (مِـن) خراوەتـە سـەر: ﴿ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، واتـە: کەسێک خـوا گومـڕای بـکات، هەرچـی ڕاسـتە ڕێکـەرە نایبـێ، لـە سـەرەتاوە تاکـو کۆتایـی، لـە سـوورەتی (الأعراف)یشـدا: ﴿ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ﴾، بـە (لا)ی لابـەری تێکـڕا (جنـس) یـانی: جینـسی ڕاسـتە ڕێکـەری نابـێ.

٥)- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر لێشیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی؟ زۆر بە جەختکردنەوەوە دەڵێن: خوا ﷻ.

ئەمە زەمینە خۆشکردنە بۆ ئەوەی لە دوایی دا دێ:

٦)- ﴿قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، بڵێ: ئایا ئەوانەتان دیونە کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە!

یانی: مادام بەس خوا بەدیهێنەرە، دەبێ هەر ئەویش داوالێکراوو پەرستراو بێ، واتە: شتێک کە جێگای مشت و مڕ نیە، کە بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی و پەروەردگارێتیی خوایە بۆ گەردوون و، بۆ بوون بەسەرو خواریەوە، ئاسمانەکان و زەوی، ئەوە کە هیچ مشت و مڕێکی تێدانیە، ئەوەی کردوە بە زەمینە خۆشکردن و بناغە) تاکو دوایی پابەندیان بکات بەوە کە دەبێ تەنیا خواش بپەرستن و تەنیا داوا لەو بکەن، کە دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتُم﴾، دەگونجێ دیتن، بینینی چاویی بێ، چونکە ئەوانەی پەرستوویانن، بە چاوی سەریان بینیویانن، دەشگونجێ مەبەست بینینی عەقڵیی بێ، واتە: ئایا عەقڵ و هۆشتان نیە ئەو شتانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ نین و شایستەی ئەوە نین؟ هەمزەکەش بۆ پرسیارکردنەو پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، ﴿قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، بڵێ: ئایا ئەوانە دەبینن (بە چاوی عەقڵ و دڵ، یان بە چاوی سەر) کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە!

٧)- ﴿إِنْ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ﴾، ئەگەر خوا ﷻ زیانێکی بۆ من بوێ، ئایا ئەوان لابەری زیانەکەینی؟ (الضُّرُّ: مَا يَسُوءُ الإِنْسَانَ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ وَمَا حَوْلَهُ)، (ضرّ) هەر شتێکە کە مرۆڤ پێی ناخۆش بێ لە جەستەیداو لە ماڵ و سامانیداو لە دەوروبەریدا، ﴿هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ﴾، ئەوانەی ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن، ئایا زیانەکەی لادەدەن؟ ئایا لابەری ئەو زیانەن؟ وشەی (كَاشِفَاتُ) بە پاڵدراو (مُضَاف) بۆ لای (ضُر) خوێنراوەتەوە: ﴿هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ﴾، ئایا ئەوان لابەری زیانەکەینی؟! ئەو زیانەی کە خوا ﷻ بۆ منی بوێ، هەروەها بە تەنوینی (کاشفاتٌ)یش خوێنراویشەتەوە: (كَاشِفَاتٌ ضُرَّهُ)، ئایا ئەوان لابەرن بۆ ئەو

زیانەی کە خوا ﷻ بۆ منی دەوێ؟ (وَالْكَاشِفَاتُ: الْمُزِيلَاتُ) لابەرەکان، (فَالْكَشْفُ مُسْتَعَارٌ لِلْإِزَالَةِ بِتَشْبِيهِ الْمَعْقُولِ وَهُوَ الضُّرُّ بِشَيْءٍ مُسْتَتِرٍ، وَتَشْبِيهُ إِزَالَتِهِ بِكَشْفِ الشَّيْءِ الْمَسْتُورِ، أَيْ: إِخْرَاجِهِ)، لێرەدا کە دەفەرموێ: (كَاشِفَاتٌ ضُرَّهُ) یان (كاشِفاتُ ضُرِّهِ) هەردوو شێوەی خوێندنەوەکە هاتوون، واتە: ئایا ئەو پەرستراوانەی ئێوە، لابەری ئەو زیانەن، کە خوا ﷻ بۆ منی دەوێ؟! وشەی (كَشْف) خوازراوەتەوە بۆ لابردن، چونکە زیانەکە چوێنراوە بە شتێکی پەنهانەوەو، لابردنەکەشی چوێنراوە بە دەرخستنی ئەو شتە پەنهانەو پەردە لەسەر لادانیەوە.

٨)- ﴿أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ﴾، یان ئەگەر خوا ﷻ بەزەییەکی بۆ من بوێ، خێرو خۆشییەکی بۆ من بوێ، ئایا ئەوان گیرەرەوەی ئەو بەزەییەی وین؟ (مُمْسِكاتُ رحمتِهِ)، خوێنراویشەتەوە: (مُمْسِكاتٌ رَحْمَتَهُ)، ئایا ئەوان گیرەرەوەی ئەو بەزەییەی خوان کە خوا بۆ منی بوێ.

٩)- ﴿قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ﴾، بڵێ: خوام بەسە، هەموو پرسیارکردنەکان پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەن، واتە: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ زیانێکم لێ بدات، ناتوانن زیانەکەم لێ دووربخەنەوەو، ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ خێرو خۆشییەکم تووش بکات و بەزەییەکم لەگەڵ بنوێنێ، ناتوانن ئەو بەزەییە بگێڕنەوە، کەواتە: ئەو پەرستراوانەی ئێوە هیچ کارە نین، ﴿قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ﴾، بڵێ: خوام بەسە، واتە: خوام بەسە، بۆ هەموو شتێک و لە هەموو حاڵاندا، خوا بۆ من بەسە، کە پشتی پێ ببەستم و مشوورم لێ بخوات و سەرم بخات.

١٠)- ﴿عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾، پشت بەستووان تەنیا پشت بەو دەبەستن، واتە: پشت بەستووانێک کە عەقڵ و هۆشیان هەبێ، تەنیا پشت بە خوا دەبەستن، تەنیا ئەو دەکەنە کارپێ سپێردراوی خۆیان.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ﴾، یان: ﴿أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ﴾، (عُدِلَ عَنْ عِبَارَةِ: إِنْ أَرَادَ ضُرِّي، أَوْ أَرَادَ رَحْمَتِي، إِلى مَا نَرَاهُ، لِقَصْدِ الإِهْتِمَامِ بِالْمُرَادِ

بِهِ لإِيصَالِ الْمُرَادِ إِلَيْهِ، حَتَّى كَأَنَّ ذَاتَهُ هِيَ الْمُرَادُ لِمَنْ يُرِيدُ إِيصَالَ شَيْءٍ إِلَيْهِ، وَهَذَا مِنْ تَعْلِيقِ الْأَحْكَامِ بِالذَّوَاتِ، وَالْمُرَادُ أَحْوَالُ الذَّوَاتِ مِثْلَ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ ﴿٣﴾﴾[الْمَائِدَة: ٣]، أَيْ أَكْلُهَا).

جار جار له ڕووی ڕەوانبێژیی و ڕێزمانییەوە ئاماژە دەکەین بە هەندێ شتی ورد.

کە دەفەرمووێ: ﴿إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ﴾، یان: ﴿أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ﴾، بۆچی خوا ﷻ نەیفەرمووە: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ زیانم لێ بدات، یان بیەوێ بەزەییم لەگەڵ بنوێنێ؟ بۆیە ئەو تەعبیرە بەو شێوەیە گۆڕاوە، تاکو بایەخ پێدان دەربخرێ بۆ ئەوەی دەویسترێ، ویستراوەکەی پێ بگەیەنرێ، (کە بریتیە لە زیانەکە، یان لە ڕەحمەتەکە)، وەک خودی ئەو کەسە (کە پێغەمبەرە ﷺ) ویستراوەکەبێ، کە بابای ویستەر دەیەوێ شتەکەی پێ بگەیەنێ (ئەو زیانەی بۆی دەویسترێ و، ئەو بەزەییەی بۆی دەویسترێ)، ئنجا ئەمە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە پێی دەگوترێ: (تَعْلِيقِ الْأَحْكَامِ بِالذَّوَاتِ) واتە: پەیوەستکردنی حوکمەکان بە خودەکانەوە، کە مەبەست پێی حاڵی ئەو خودانەیە، وەک خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ ﴿٣﴾﴾المائدة، واتە: مردارتان لێ قەدەغە کراوە، واتە: خواردنی مردار، ئەگەرنا مردار لە چ ڕوویەکەوە قەدەغەیە؟ کە لێی بخۆین.

١١)- ﴿قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ﴾، بڵێ: ئەی گەلەکەم! ئێوە لە شوێنی خۆتانەوە کاری خۆتان بکەن، منیش کاری خۆم دەکەم، واتە: منیش ئەنجامدەری ئەو ئەرکەم کە پێم سپێردراوە.

١٢)- ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، لە مەودوا دەزانن، چی دەزانن؟!

١٣)- ﴿مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾، کێ ئازارێکی بۆ دێ، زەبوون و ڕیسوای دەکات.

١٤)- ﴿وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾، ئازارێکی بەردەوامیشی دێتە سەرێ، واتە: دەزانن کێ لە دنیادا خوا سزایەکی بۆ دەنێرێ، زەبوون و شەرمەزاری بکات و، لە دواڕۆژیشدا سزایەکی بەردەوام دادەبەزێتە سەری و ملی دەگرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴾، واتە: بڵێ: خوام بەسە، پشت بەستووان بەس پشت بەو دەبەستن، ئەمە مەبەست پێی ئەوەیە کە من قەناعەت و بڕوام وایە، هەروەها مەبەست پێی ئەوەیە کە من ئەوەم لە یادە کە دەبێ پشت تەنیا بە خوا ببەسترێ، دیسان ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە بۆ ئەوەیە کە مسوڵمانان و خەڵک بەگشتیی فێر بن کە دەبێ تەنیا پشت بە خوا ﷻ ببەسترێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ ﴾، بڵێ: ئەی گەلەکەم! ئەمە جۆرێکە لە دڵ نەرمکردنی دوێنراوەکان بۆ ئەوەی باش گوێی بۆ بگرن، واتە: منیش یەکێکم لە خۆتان، ﴿ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ ﴾، دەڵێ: (الْمَكَانَةُ: الْمَكَانُ، وَتَأْنِيثُهُ رُوعِيَ فِيهِ مَعْنَى الْبُقْعَةِ، واسْتُعِيرَ لِلْحَالَةِ الْمُحِيطَةِ بِصَاحِبِهَا إِحَاطَةَ الْمَكَانِ بِالْكَائِنِ فِيهِ)، (مَكَانَةُ) بە مانای شوێنە، بەڵام بۆچی کراوە بە مێینە، مێینەی مەجازیی؟ لەبەر ئەوەی مانای پارچە زەوی (بُقْعَةِ)ی تێدا ڕەچاو کراوە، (بُقْعَة)ەش مێینەی مەجازییە، وشەی (مَكَانَة)یش خوازراوەتەوە بۆ ئەو حاڵەتەی کە دەوری مرۆڤ دەدات، وەک چۆن ئەو شوێنەی کە کەسێک لێیەتی، یان شتێک لێیەتی، دەوری ئەو کەس و ئەو شتە دەدات، وشەی (مَكَانَتِكُم) بە کۆ (جمع) خوێنراوەتەوەش: (مَكَانَاتِكُم).

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنِّي عَٰمِلٞ ﴾، منیش ئەنجامدەری ئەوەم کە فەرمانم پێکراوە، یانی: من ئەرکی خۆم ئەنجام دەدەم و، ئێوەش چیتان پێ چاکەو لە تواناتاندا هەیە، بیکەن، کە بێگومان ئەمە بێ منەتکردن و، بێ باکیی دەربڕینە لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، چونکە ئەوان خۆیان بە پەرستراوەکانی خۆیان هەڵدەدایەوەو، گەفیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، ئنجا بۆ ئەوەی بۆیان دەربخات: ئەو خوا بە یەکگرتنەی لە دڵی موحەممەد دایە ﷺ هێندە ڕۆچوویەو، ئەو هێندە پشتی بە پەروەردگار و پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی قایمەو، بێ منەتە لەو شڕو شاڵاتەی ئەوان دەیپەرستن و هەڕەشەی پێ لەو دەکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئەمە بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوە کە بە تەئکید لەمەودوا دەزانن، بە دڵنیاییەوەش: تەنیا خوا ﷻ دەتوانێ شتێکی وا بفەرموێ، بفەرموێ: مسۆگەر لە مەودوا دەزانن و بۆتان دەردەکەوێ، هەروەها بەس خوا دەتوانێ بفەرموێ: ﴿ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ ﴾، واتە: دەزانن کێ ئازارێکی بۆ دێ، زەبوون و سەرشۆڕی بکات لە دنیاداو، ﴿ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ ﴾، سزایەکی بەردەوامیشی بێتە سەرێ، کە مەبەست پێی سزای ڕۆژی دواییە، یاخود ئەمانە هەردووک مەبەست پێیان ڕۆژی دواییە، واتە: سزایەکی بۆ دێ، زەبوون و سەرشۆڕی دەکات لە ڕۆژی دوایی داو، سزایەکی بۆ دێ کە بەردەوام بێ و لە کۆڵی نەبێتەوە.

وشەی (يحلُّ)، پێشتریش باسمانکرد کە کاتێ خۆی کەسێک چووە بۆ سەردانی کەسێک، بۆ لای خانە خوێیەک، وڵاخی پێ بووەو باری پێ بووە، ئیدی بارەکەی خستوەو لەوەڕا هاتوە.

هەڵبەتە ئەو تەعبیرەش ئیعجازێکی مێژوویی تێدایە، هەرچەندە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا ئاماژەی بۆ کرابێ، چونکە کەسێک دەتوانێ بڵێ: بە دڵنیایی لەمەودوا دەزانن کێ زەبوون دەبێ و، کێ لە دنیادا زەبوون و سەرشۆڕ دەبێ و، لە دواڕۆژیشدا ئازارو سزایەکی بەردەوامی بە مل دادێ، کەسێک دەتوانێ بە ڕەهایی ئەوە بڵێ، کە خاوەنی گەردوون و خاوەنی دنیاو قیامەت بێ!.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوازدە (١٢) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤١ - ٥٢)، لەو دوازدە (١٢) ئایەتەدا، خوا ﷻ چەند بابەتێکی جۆراو جۆر دەخاتە ڕوو، کە سەرجەم هەشت بابەتی سەرەکیین:

١- دابەزێنرانی کتێب بۆ لای (محمد ﷺ) بە هەق، بۆ ڕێنمایی کردن و ڕاستە ڕێ کردنی خەڵکی.

٢- گیان کێشانی خوا بۆ مرۆڤان، لە حاڵەتی مردن و خەوتندا.

٣- بە هەڵەداچوونی هاوبەش بۆ خوادانەران لە بواری شەفاعەتدا، کە پێیان وابووە پەرستراوەکانیان، تکاو ڕەجایان لە لای خوا ﷻ بۆ دەکەن.

٤- دڵ تێکچوونی کافران و، دڵ بێزار بوونیان بە یادی خواو، دڵ خۆشبوونیان بە باسی پەرستراوەکانیان.

٥- فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بە لێ پاڕانەوەیەکی کورتی ناوازە.

٦- حاڵ خراپیی بێبڕوایان لە قیامەتدا، بە شێوەیەک کە چاوەڕوانییان نەدەکرد.

٧- لە خۆبایی بوونی مرۆڤی خوانەناس، لە کاتی هات و لە کاتی خێرو خۆشیی داو، خستنە ڕووی خوای کارزان بۆ ئەو ڕاستییەی کە پێشووانیشیان هەروا بوون، کاتێک خۆشییەکیان بۆ دەهات لە کەوڵی خۆیان دەردەچوون و زۆر شادمان دەبوون، هەتاکو سزای خوایان بۆ هاتوەو، سزایان چێژتوە.

٨- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە بژیو بە دەست خوایەو، فراوان و تەسکی دەکات، واتە: زۆرو کەمی دەکات، بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ، هەڵبەتە نەک لە گۆترە بەڵکو بەپێی حیکمەتی بێ سنووری خۆی و، بە پێی ئەو یاسایانەی لە ژیانی مرۆڤدا دایناون.

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن
ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ ٤١ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ
حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ
وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٤٢
أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ
٤٣ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ
٤٤ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا
ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ٤٥ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ٤٦
وَلَوۡ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلۡعَذَابِ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ٤٧ وَبَدَا لَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا
كَسَبُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٤٨ فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا
ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ بَلۡ هِيَ فِتۡنَةٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ
لَا يَعۡلَمُونَ ٤٩ قَدۡ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٥٠
فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ
وَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ٥١ أَوَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥٢﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئێمە (ئەی موحەممەد!) بە هەق کتێبمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، بۆ خەڵک، ئنجا هەر کەس ڕێی ڕاستی گرت، بە سوودی خۆیەتی و، هەر کەسیش گومڕا بوو، تەنیا بە زیانی خۆی گومڕا دەبێ و، تۆ چاودێرو پارێزەرنی بەسەریانەوە (کە نەهێڵی گومڕابن) ﴿٤١﴾ خوا لە کاتی مردندا گیانەکان وەردەگرێ (دەکێشێ)و، ئەوانەی نەشمردبن لە (کاتی) خەوتنیاندا، گیانەکانیان وەردەگرێ، ئنجا ئەوەی مردنی بۆ بڕیاردابێ (لە لای خۆی) دەیانهێڵێتەوەو، ئەوانەی دیکەش تاکو کاتێکی ناوبراو دەنێرێتەوە (نێو جەستەکانیان)، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک بیربکەنەوەو ڕامێنن ﴿٤٢﴾ (ئایا ئەوانە لە سزای خوا بێباکن!) یان جگە لە خوا تکاکارانێکیان گرتوون (کە لە قیامەتدا تکایان لەلای خوا بۆ بکەن)؟ بڵێ: ئایا ئەگەر ئەوانە هیچ شتێکیان بەدەست نەبێ و نەشفامن (چۆن تکاتان بۆ دەکەن)؟! ﴿٤٣﴾ بڵێ: تکاکردن تێکڕای تەنیا هی خوایە (و بەدەست ویە)، حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی ویەو، دواییش هەر بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە ﴿٤٤﴾ کاتێکیش خوا بە تەنیا باس بکرێ، ئەوانەی بڕوایان بە (مەنزڵگای) کۆتایی نیە، دڵەکانیان دەسڵەمنەوە (و دەگووشرێن)، کەچی کە باسی ئەوانەی جگە لەوی (پەرستراوەکان) بکرێ، یەکسەر ئەوان دڵخۆش و شادمان دەبن ﴿٤٥﴾ بڵێ: ئەی خوایە! داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، تەنیا تۆ دادوەریی لە نێوان بەندەکانتدا دەکەی، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە (لە ژیانی دنیادا) ﴿٤٦﴾ ئەگەر هاتباو (لە ڕۆژی دوایی دا) ئەوانەی ستەمیان کردوە (تووشی کوفرو شیرک بوون) هەرچی لە زەویدایەو، وێنەی خۆیشی لەگەڵیدا هەیانبووایە، دەیانکردە بەلا گێڕەوە (و قەرەبوویان بۆ قوتاربوون) لە ئازاری سەخت و بێڕەزای ڕۆژی قیامەت و، ئەوەی

کـە چاوەڕێـیان نەدەکـرد لـە لایـەن خـواوە بۆیـان دەرکـەوت ﴿٤٧﴾ هەروەهـا ئـەو (کـردەوە) خراپانـەش کـە (لـە دنیـادا) وە دەسـتیان هێنابـوون، بۆیـان دەرکەوتـن و (سـزای) ئـەوەی گاڵتەیـان پێدەکـرد گەمـارۆی دان ﴿٤٨﴾ (جێـی سەرسـوڕمانە) کاتێـک مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) زیانێکـی تـووش دەبـێ، بانگمان دەکات (لێـمان دەپاڕێتـەوە کـە لێـی لابەریـن)، دوایـی کاتێـک لەلایـەن خۆمانـەوە چاکەیەکـی پێدەبەخشـین، دەڵـێ: ئەمیـا بەهـۆی زانیارییـەوە پێمـدراوە (و وەدەسـتم هێنـاوە) ڕاسـت نیـە، بەڵکـو ئـەوە تاقیکردنەوەیـە، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن ﴿٤٩﴾ ئەوانـەی پێـش وانیـش ئـەو قسـەیان گـوت: کەچـی ئـەوەی وەدەسـتیان هێنابـوو (لـە سـامان و مـاڵ) هیـچ دادی نـەدان (و سـوودی پـێ نەگەیانـدن) ﴿٥٠﴾ سـەرەنجام (بـە هـۆی ئەو هەڵوێستەیـنەوە) سـزی (کـردەوە) خراپەکانیـان کـە وەدەسـتیان هێنابوون، تووشـیان بـوو، هەروەهـا ئەوانەش کـە سـتەمیان کـردوە لەمانـە سـزای ئـەو (کـردەوە) خراپانـەی وەدەسـتیان هێنـاون، لەمـەودوا تووشـیان دێ و، دەستەوسـانکەریش نیـن (لـە سـزای خـوا قوتاربـن) ﴿٥١﴾ ئایـا نازانـن کـە خـوا ﷻ هـەر کـەس بیـەوێ، بژیـوی بـۆ فـراوان دەکات، هەروەهـا تەنگـی دێنـێ (و کەمـی دەکات)! بـە دڵنیایـی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کۆمەڵێـک بڕوابێنـن ﴿٥٢﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِوَكِيلٍ): (الوَكِيلُ: فَعِيلٌ بِمَعْنَى المَفْعُول (وَكَفَى بِاللهِ وَكِيلًا) أي: اكْتَفِ بِهِ أَنْ يَتَوَلَّى اللهُ أَمْرَكَ: ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾، أي بِمُوكَّلٍ عَلَيْهِمْ وَحَافِظٍ لَهُمْ)، (وَكِيل): لەسەر کێشی (فعيل)ە، بەڵام بە مانای (مفعول)ە، واتە: (مَوْكُولٌ إِلَيْهِ) کار پێ سپێردراو، کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ ﴾النساء، واتە: تۆ ئیکتیفا بکە بەوە خوا سەرپەرشتیاریی کاروبارت بکات و کاری خۆت بەو بسپێری، ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾، تۆ کار پێ سپێردراو نی بۆ ئەوان، پارێزەر نی بەسەر وانەوە.

(يَتَوَفَّى): وەردەگرێ، دەمرێنێ، (عُبِّرَ عَنِ المَوْتِ وَالنَّوْمِ بِالتَّوَفِّي) واتە: هەر کام لە مردن و خەوتن بە وشەی (تَوَفِّي) تەعبیریان لێکراوە، لەبەر ئەوەی لە کاتی مردندا، ڕووحی مرۆڤ لە جەستەی وەردەگیرێ بە تەواویی، بەڵام لە کاتی خەوتندا، بەشێوەیەکی ناتەواو ڕووحەکە وەردەگیرێ نەک بە تەواویی، ئەگەر بە تەواویی وەربگیرێ و لێی جیابێتەوە، مردن ڕوودەدات.

(ٱلْأَنفُسَ): کۆی (نَفْس)ە، (نفس)یش بە مانای ڕووحە، هەتا لە جەستە دایە (نەفس)و، لە دەرەوەی جەستەش (ڕووح)ی پێدەگوترێ.

(ٱشْمَأَزَّتْ): (أي: نَفَرَتْ وَانْقَبَضَتْ)، سڵەمیەوەو گووشرا، دڵیان گووشراو، تەنگ بوو، (إِشْمِئْزَاز) واتە: (انْقِبَاض) وەتەنگ هاتن و نارەحەت بوون و بێزاربوون.

(يَحْتَسِبُونَ): (يَتَوَقَّعُون) بە شێوەیەک کە چاوەڕوانییان نەدەکرد: ﴿ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴿٣﴾ ﴾الطلاق، واتە: لەلایەکەوە بە شێوەیەک کە چاوەڕوانییان نەدەکردو حیسابیان بۆ نەکرد بوو.

(وَحَاقَ بِهِم): (نَزَلَ بِهِمْ أَصَابَهُم)، واتە: دابەزییە سەریان و، تووشیان بوو.

(فِتْنَةٌ): بە مانای تاقیکردنەوەو جەڕباندن دێ، لەم سیاقەدا: ﴿بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ﴾، ئەمە تاقیکردنەوەیە، ئەو ماڵ و سامانە کە پێتان دراوە، ئەگەرنا (فتنة) بە پێی سیاقە جۆراو جۆرەکان، مانایەکەی دەگۆڕێ.

(يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ): (يَبْسُطُ) پانی دەکات و، درێژی دەکات، (رِزْق) بژیو: ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ﴾، (يُوَسِّعُ) فراوانی دەکات، مەبەستی پێ (يُكَثِّرُ) زۆری دەکات.

(وَيَقْدِرُ): (أي: يُضَيِّق) وەتەنگی دێنێ، (يُضَيِّقُ) بە مانای (يُقَلِّلُ) بژیو کەم و تەنگ دەکاتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم ڕەوتەدا ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، کە وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: هەشت بابەتی گەورەو گرنگ لەم دوازدە (١٢) ئایەتەدا خراونە ڕوو، بەڵکو دەگونجێ بگوترێ: زیاتریشن، یاخود ئەو هەشت بابەتەش هەندێکیان بچنە نێو هەندێکیان، بەڵام من بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی چەمک و واتای ئایەتەکان لە پێناسەی دەرسەکەدا، کردوومن بە هەشت بابەت.

ئنجا یەکێک لەو بابەتانە باسی قورئانە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کتێبمان بە هەق دابەزاندۆتە سەر تۆ بۆ خەڵکی، دوێنراو (مُخَاطَب) موحەممەدە ﷺ، کە خوا ﷻ قورئانی دابەزاندۆتە سەر دڵی پاک و موبارەکی، وشەی (إِنَّا)ش بۆ جەختکردنەوەیە: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ﴾، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی قسەو پڕوپاگەندەی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە کە دەیانگوت:

أ- موحەممەد ﷺ شەیتانێک فێری دەکات.

ب- بۆ خۆی هەڵیبەستوە.

ج- لە کەسێکی دیکە فێری بووە، ئەو تۆمەتانە هەموویان گوتراون، خوا ﷻ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو قسانە هەموویان دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئێمە قورئانمان بە هەق دابەزاندۆتە سەر تۆ بۆ خەڵک، کە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلۡحَقِّ ﴾، واتە:

١- ئێمە هەق بووین کە قورئانمان بۆ تۆ ناردوە.

٢- یاخود بە شێوازێکی هەق بۆ تۆمان دابەزاندوە.

٣- یاخود قورئانمان دابەزاندوەو هەقی لە نێو خۆیەوە گرتوە.

﴿ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦ ﴾، ئنجا هەر کەسێک ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە سوودەکەی بۆ خۆیەتی، ﴿ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَا ﴾، هەر کەسێکیش گومڕا بوو لە ڕێی لاداو، لە ڕێ ون بوو، گومڕا بوونەکەی بە زیانی خۆیەتی، خۆی لە گومڕا بوونەکەی زەرەرمەندە، هەروەک تەنیا خۆی لە ڕێی ڕاستگرتنەکەی بەهرەمەندە، ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ ﴾، تۆ بەسەر ئەوانەوە کار پێ سپێردراوو سەرپەرشتیارنی، چاودێرو پارێزەر نی، نەهێڵی لابدەن، ئەمە بابەتی یەکەم.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکە، کە یەکێک لەو هەقانەی ئەم قورئانە گرتوونیە خۆی، بریتیە لەوەی ڕووحەکان هەموویان بەدەست خوان و بێگومان لە کاتی مردندا، ئەو ڕووحانە وەردەگرێ و بەو شێوەیە خوا ﷻ مردنیان بەسەردا دێنێ، ئەوەی نەشمردبێ، لە کاتی خەوتندا، واتە: هەم لە کاتی خەوتندا، هەم لە کاتی مردندا، ڕووحەکان لەبەر دەستی خوان و خوا دەیانباتەوە لای خۆی، ئەوەی کە بە مراندنیش ڕووحی وەرنەگرێتەوە، لە کاتی خەوتندا ڕووحەکەی وەردەگرێتەوە.

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾، خـوا ﷻ نەفسـەکان وەردەگـرێ بـە تەواویـی لـە کاتی مردنیانـدا، ﴿ وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ﴾، ئەوانـەش کـە نـە مـرد بـن، لـە کاتی خەوتنیانـدا نەفسـەکان وەردەگرێ، دوایـی بـاس دەکەیـن بۆچـی خـوا ﷻ وشـەی نەفسـەکان ﴿ ٱلْأَنفُسَ ﴾ی بەکارهێنـاوە، کـە کـۆی نەفسـەو، وشـەی ڕووحـەکان (أَرْوَاح)ی بەکارنەهێنـاوە، دواتـر لـەو بـارەوە باسـێکی تایبـەت دەکەیـن، ﴿ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ ﴾، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەوەی کـە مـردنی بـۆ بڕیـار دابـێ، لـەو نەفسـانەی وەریگرتـوون لـە کاتی خەوتنیانـدا، لـە لای خـۆی دەیهێڵێتـەوە لـەو شـوێنەی کـە بـەس خـۆی دەزانـێ، ئایـا لـە مەنزڵـگای بەهەشـتدایە، یـان لـە مەنزڵگای دۆزەخـدا، ئەوانـە دەهێڵێتـەوە؟! یـان لە شـوێنێکی دیکەی وەک بەهەشـت و دۆزەخ، ﴿ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، ئـەوانی دیکـەش دەنێرێتـەوە، تاکـو کاتی ناوبـراو، واتـە: هـەر کامیـان لـەو ڕووحانـە دەینێرێتـەوە بـۆ نێـو جەسـتە، تاکـو ئەوەنـدە مـاوە ژیانـەی ماویـەتی لـە دنیـادا، تـەواوی دەکات، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بـە ڕاسـتیی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کۆمەڵێـک بیـر بکەنـەوە، ڕابمێنـن و تێبفکـرن.

کـە دوایـی ئێمـە تۆزێـک تێدەفکریـن و ڕادەمێنیـن لـە دیـاردەی خەوتـن و چۆنیـەتی جیابووەنـەوەو دوور کەوتنەوەیەکـەی نەفـس لـە جەسـتە، کـە لـە حاڵـەتی خەوتنـدا ڕوودەدات.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتە سـەر بابەتێکـی دیکە، هەر لـەو چوارچێوەیـەی هەمەکارەبوونی خـوا ﷻ لـە دنیـاو دواڕۆژدا، کـە ئەوەتـا کتێبـی بـە هـەق بـۆ تـۆ دابەزانـدوەو، بـۆ ئـەوەی خەڵـک ڕێ ڕاسـت بگـرێ، ئەگـەر ڕێـی ڕاسـت بگـرن، قازانجـی خۆیانـەو، ئەگـەر ڕێـی چـەوت بگـرن و لابـدەن، بـە زیـانی خۆیـان تـەواو دەبـێ، تۆشـمان نەنـاردوە کـە نەهێڵـی لابـدەن، تـۆ تەنیـا پەیامـی خۆیـانی پێدەگەیەنـی.

ئەوەتـا خـوا ﷻ چ لە کاتی مردنـداو، چ لە کاتی خەوتندا، ڕووحـەکان وەردەگرێتەوە، ئنجـا ئەوانەیـان کـە لـە کاتی خەوتنـدا ڕووحەکانیـان وەردەگـرێ، ئەگـەر مـردنی بـۆ

بڕیار دابن یەکجاریی ئەو ڕووحەی وەریگرتوە، نایگێڕێتەوە نێو جەستە، ئەو کەسە خەوتووەو بە خەبەر نایەت و لە قیامەتێ لە عالەمی بەرزەخدا بە خەبەر دێ، ئەوی دیکەش دەنێرێتەوە تاکو کاتی دیارییکراو.

بابەتی سێیەمیش ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە تەمابوون بت و سەنەمە پەرستراوەکانیان شەفاعەت و تکایان لە لای خوا بۆ بکەن، هەروەک بەداخەوە هەندێک لە ئۆممەتی موحەممەدیش ﷺ کە تووشی شیرک بوون بە هۆی هەندێک لەوانەوە، کە بە پیاو چاکیان داناون، ئنجا لە زیندووان، یان لە مردووان، ئەوانیش تووشی جۆرێک لە شیرک بوون، پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕوونیی و، بە تۆخیی هۆشداریی داوە بە ئۆممەتی کە تووشی شیرک نەبن، بۆ وێنە: لە یەکێک لە فەرمایشتەکانی دا دەفەرمووێ: **(لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ) (أخرجه أحمد: ١٥٤، والدارمي: ٢٧٨٤، والبخاري: ٣٢٦١)**، واتە: بە من هەڵمەڵێن و تێمەپەڕێنن لە مەدح کردنمدا، وەک چۆن نەصرانییەکان لە عیسای کوڕی مەریەمدا تێیان پەڕاند (و کردیان بە کوڕی خواو کردیان بە بەشێک لە خوا)، من بەس بەندەی ویم، ئنجا بڵێن: بەندەی خواو ڕەوانەکراوەکەی.

هەروەها زۆر شتی دیکەی لەو بارەوە فەرمووە کە ئێمە لە باسێکی سەربەخۆ لە کۆتایی سوورەتی (یوسف)دا، لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾یوسف، باسێکی خەست و خۆڵمان لەو بارەوە کردوە.

بەڵێ یەکێک لە عەقیدەو عادەتەکانی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، بریتی بوو لەوەی بەتەما بوون پەرستراوەکانیان تکاو ڕجایان بۆ بکەن، کە لە نێو شیعەدا بەگشتیی و هەندێک لە ئەهلی تەصەووف و خەڵکی عەوامدا، ئەو حاڵەتی چاوەڕێکردنی کار بۆ کرانە بە شێوەی ناشەرعییانە، لەلایەن هەندێک لەوانەوە کە پێیان بڕوادارن لە شێخ و پیاو چاک و مەزارگەکانیان ئەو حاڵەتە هەیە، لە شیعرێکدا هاتوە دەڵێ:

بۆیە لە دنیا دەستم گرت وەتۆ ... تاکو لە قیامەت نەبم ڕەنجەڕۆ

یانی: لە دنیادا بۆیە دەستم پێگرتی، تاکو لە قیامەتدا ڕەنجەڕۆ نەبم و تۆ شەفاعەتم بۆ بکەی! هەڵبەتە ئێمە باسێکی سەربەخۆمان لە بارەی شەفاعەت و تکاوە کردوە، لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، جارێکی دیکە باسی ناکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەم مەسەلەی تکا بۆ کران و تکا بۆ کردنە، یەکێکە لەو هۆکارانەی کە خەڵکێک بە هۆیەوە تووشی شیرک بووە.

لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ﴾، بێگومان ئەمە دەبێ پەیوەست بێتەوە بە ڕستەیەکەوە کە لە پێش ویدا بووە، بەڵام بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، واتە: ئایا ئەوان لە سزای خوا بێ باکن! یاخود جگە لە خوا تکا کارانێکیان بۆ خۆیان گرتوە، تکایان بۆ بکەن؟ ﴿ قُلْ أَوَلَوْ كَانُواْ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴾، بڵێ: ئایا ئەگەر ئەوانە هیچیان بەدەست نەبێ و نەشفامن (ئەو پەرستراوانە)، ئایا دەتوانن تکا بکەن؟!

﴿ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ﴾، بڵێ: تکاکردن هەمووی تێکڕا هی خوایەو، کەسی دیکە خاوەنی تکاکردن نیە، دەبێ ئەو مۆڵەت بداو، بۆ کەسێکیش کە لێی ڕازییە، وەک دەفەرموێ: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴿٢٥٥﴾ ﴾البقرة، واتە: کێ لە لای وی تکا دەکات، مەگەر بە مۆڵەتی ئەو، هەروەها دەبێ تکا بۆ کراویش خوا ڕازیی بێ تکای بۆ بکرێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾الأنبياء، واتە: فریشتەکان تکا ناکەن، مەگەر بۆ کەسێک خوا لێی ڕازی بێ، تکای بۆ بکرێ، ئەوانیش لە سام و هەیبەتی بۆ خۆیان بە پەرۆشن.

﴿ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، موڵکی ئاسمانەکان و زەوی، حوکمڕانیی لە ئاسمانەکان و زەویدا هی ویە، ﴿ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، دواییش بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە.

ئنجا باسی بابەتێکی دیکەی چوارەم دەکات:

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، ئەمە باسی بابەتێکی دیکەیە کە بریتیە لە هەڵوێستی نەفامانەو نەزانانەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان لە بەرانبەر خوادا، کە کاتێک باسی خوا ﷻ دەکرا، دڵیان ڕێک دەهات و دەگووشرا، بەڵام کە باسی بت و صەنەمەکانیان کرابایە، دڵیان خۆش دەبوو، کەیفیان دەهات، لە حاڵێکدا زانیویشیانەو گوتووشیانەو دانیشیان پێداهێنانەوە، کە بەدیهێنان هەمووی هی خوایە، پەروەردگارێتیی هەر هی خوایە، خاوەندارێتیی تەنیا هی خوایە، کەچی دڵیان بەبت و سەنەمەکانیان خۆشتر بووە!.

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، لە کاتێکدا تەنیا باسی خوا ﷻ بکرێ، ئەوانەی بڕوایان بە مەنزڵگای کۆتایی نیە، دڵیان ڕێک دێ و دەگووشرێ، ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ ﴾، بەڵام کاتێک ئەوانی دیکەی جگە لەو، واتە: ئەو پەرستراوە ساختانەی کە وێڕای خوا، یان لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، باس بکرێن: ﴿ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، کت و پڕ دڵیان خۆش دەبێ، کەیف و شادمانییان بۆ دێ، کە ئەمەش دیسان ئەو دڵخۆشبوونە بە جگە لە خوا، زیاتر لە خوا، دڵخۆش بوون بە بەرنامەی جگە لە خوا، زیاتر لە هی خواو، بە پاداشتی جگە لە خوا، زیاتر لە پاداشتی خواو، ترسان لە سزای جگە لە خوا، زیاتر لە سزای خوا، ئەمەش کەم و زۆر لە نێو مسوڵمانانێکی لادەرو ڕێ لێ تێکچوودا هەیە، کە ئەوەش بێگومان چەند جۆرێکن لە شیرک، چونکە مرۆڤی تەنیا خوا پەرست و خوا بە یەکگر، ئەو کەسەیە کە ئەوپەڕی دڵخۆشیی و شادمانیی، تەنیا بە خواو پاداشتی خواو بە بەزەیی خوا بێ و، ئەوپەڕی سام و ترسیشی، تەنیا لە بەرانبەر سزای خواو هەڕەشەی خوا بێ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾یونس، واتە: بڵێ: بە بەخششی خواو بە بەزەیی، با بەس

بەوە زۆر دڵ خۆش بن، چونکە وشەی (فرح) واتە: ئەوپەڕی دڵخۆشیی، (أَشَدُّ السُّرُور)، هەروەها بە نسبەت ترسیشەوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەوە شەیتانە لە دۆستانی خۆی دەتانترسێنێ، لەوان مەترسێن و لە من بترسێن، ئەگەر بڕوادارن، واتە: ئەو ترسەی بەرانبەر بە سزای من هەتانە، بەرانبەر بە هیچ شتێکی دیکە نەتانبێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکەی پێنجەم: خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بڵێ: ئەی خوایە! داهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوی، ﴿ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، زانای پەنهان و ئاشکرا، ﴿ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، بەس تۆ دادوەریی دەکەی لە نێوان بەندەکانتدا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە، یانی: بەس تۆ دادوەریی دەکەی لە ڕۆژی دواییدا.

شایانی باسە: ئەو بابەتانەش هەموویان وەک ئاڵقەکانی زنجیرێک یەکدی دەبەستنەوە، ئەوەی پێشێ فەرمووی: ئەوانەی بڕوایان بە مەنزڵگای کۆتایی نیە، ئەگەر بە تەنیا باسی خوا بکرێ، دڵیان ڕادەگووشرێ، دڵیان تێکدەچێ، بەڵام ئەگەر باسی پەرستراوەکانی دیکەی جگە لەو بکرێ، دڵیان خۆش دەبێ، خواش ﷻ فەرمووی: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، (ئەی موحەممەد! ﷺ) بڵێ: ئەی خوایە! پەیداکەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، هەر تۆ دادوەریی دەکەی لە نێوان بەندەکانتدا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، کە خوا بەیەکگران تەنیا دڵیان بە خوا خۆشەو، پەرستراوەکانی دیکە، نەک هەر دڵیان پێیان خۆش نیە، بگرە دڵیان پێیان ناڕەحەتە، کەچی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، دڵیان بە پەرستراوەکانیان خۆشەو، دڵیان بە یادی خوا دەگووشرێ، لە حاڵێک تەنیا باسی خوا بکرێ، هەروەها ئەوانەی خوا پەرستن و بە ڕێی بەرنامەی خوادا دەڕۆن، دڵیان بە بەرنامەی خوا خۆشە، بەڵام دڵزەدەو

دڵ نارەحەتن، بە ڕێچکەو کوێرەڕێیەکان، کەچی ئەوانەی کوێرە ڕێ و ڕێچکەکان دەگرن، دڵیان بە کوێرە ڕێیەکانی خۆیان خۆشە، بەڵام دڵ نارەحەتن و بێزارن لە ڕاستە شەقامی خوا، ئنجا ئەمە هەمووی ڕاجیایی و ناکۆکییەو، تەنیا خوا لە نێوان بەندەکانیدا لە ڕۆژی دواییدا، دادوەریی لە بارەوە دەکات و، ئەو هەق و ناهەقیان بۆ لێک جیادەکاتەوە.

ئنجا دێتە سەر بابەتی شەشەم و باسی سەرەنجامی بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوادانەران دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ ﴾، ئەگەر ئەوانەی ستەمیان کردوە -مەبەستی پێ هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و بێبڕوایەکانن، بەڵام بۆیە بە وشەی (ظَلَمُوا) دەیهێنێ، واتە: وێڕای ئەوەی کە ئەهلی کوفرو شیرکن، ئەهلی زوڵمیشن، یاخود کوفرو شیرکەکەیان لە خۆیدا ستەم و لادانە- ﴿ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ ﴾، لە ڕۆژی دواییدا هەرچی لە زەویدایەو، وێنەی خۆشی لەگەڵیدا هەیانبێ: ﴿ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، دەیکەنە بەلاگێڕی خۆیان و قەرەبوویان، لە سزای خراپی ڕۆژی هەڵسانەوە، ﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴾، لە لایەن خواوەش شتێکیان بۆ دەرکەوت کە چاوەڕوانییان نەدەکرد، یانی: پێیان وانەبوو خوا ﷻ بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین، من پێم وایە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خەیاڵ پڵاوانەی هەموو ئەوانەی بەشێوەیەکی هەڵە، خوا دەپەرستن، ئنجا چ خواناسن و، هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن، چ بە حیساب هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەن، بەڵام بە دوای هەندێ ئەفسانەو قسەی پڕوپووچ کەوتبن، کە فڵانکەس شەفاعەتیان بۆ دەکات و، فڵانکەس لەوانەیە دەربازیان بکات، یان ڕەنگە بەهۆی فڵانکەسەوە دەرباز بن، یان لەبەر ئەوەی کە کوڕی فڵانکەسە، یان بە شەجەرەو ڕەچەڵەک دەچنەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، یاخود لەبەر ئەوەی کە مەلازادەن، یان شێخ زادەن و، سەید زادەن، یان بەگزادەن، یان چی زادەن، دەربازیان بێ، ئەوانە

بە جۆرێک بیردەکەنەوە کە لە قیامەتی بۆیان دەردەکەوێ، بیرکردنەوەکەیان هەڵە بووە، وەک گوتراوە: (ئیمانی بە ئیسکی دەسپێرێ)، هەیە بە تەمای ئەوە لێگەڕاوە کە بە ڕەچەڵەک دەچێتەوە سەر فڵان پیاو چاکە، یان فڵانکەسە، بەڵام تەماشا دەکات لە قیامەتی ئەو حیساب و کیتابە لە گۆڕێدا نیە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ۝١٠١ ﴾المؤمنون، واتە: ئەگەر فوو بە کەڕەنادا کرا، لەو ڕۆژە دا، نە ڕەچەڵەکیان لە بەیندا هەن و نە لە یەکدی دەپرسن، بۆچی لە یەکدی ناپرسن و داوا ناکەن؟ چونکە دەزانن بێ سوودە، دەزانن کەس بە فریای کەس ناکەوێ، ئنجا لەوێ شتێکیان بۆ دەردەکەوێ لە لایەن خواوە، کە حیسابیان بۆ نەکرد بوو و چاوەڕوانییان نەدەکردو لەبەرچاویان نەگرتبوو، ﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴾.

﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ﴾، هەروەها بۆیان دەرکەوت خراپەی ئەوەی کردبوویان واتە: سزای ئەو کردەوە خراپانەی ئەنجامیان دابوون، بۆیان دەرکەوت، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، سزای ئەوەش کە گاڵتەیان پێ دەکرد دەوری دان، نابلووقەو گەمارۆی دان.

ئنجا دێتە سەر بابەتی حەوتەم: کە ئەویش دیسان هەر باسی بابای هاوبەش بۆ خوادانەرو، بابای چاک خوانەناسە کە لەگەڵ خوادایە، بەڵام بە مەرجی خێرو خۆشیی و قازانج و سوود، بەڵام کاتێک زیان و ئازار ڕووی تێدەکات، پشت لە خوا دەکات و پەنا بۆ غەیری خوا دەبات، خوا دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ﴾، مرۆڤ، مرۆڤی بێبڕوا، یان مرۆڤێک کە گیرۆدەی هاوبەش بۆ خوادانان بووە، کاتێک زیانێکی تووش دێ، ﴿ دَعَانَا ﴾، لێمان دەپاڕێتەوە، لە کاتی نەهاتدا ڕوومان تێدەکات و لێمان دەپاڕێتەوە، پەنامان پێدێنێ، ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا ﴾، بەڵام هەر کاتێک ئێمە لە لایەن خۆمانەوە، چاکەیەکمان پێداو، پێ بەخشیی بەبێ بەرانبەر، بەبێ چاوەڕوانیی

و قەرەبـوو، ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍۭ ﴾، دەڵـێ: مـن ئـەو خێـرو خۆشـیی و چاکەیـەم بـە هـۆی زانیارییـەوە پێـدراوە، واتـە: خـوا ﷻ زانیویـەتی شایسـتەم، یاخـود: بەهـۆی ئـەوەوە کـە مـن شـارەزایی و زانیارییـم هەیـە، پێمـدراوە، یاخـود: مـن دەزانم کـە شایسـتەی ئـەوەم و لـە قیامەتیشـدا هەمـان پشـک و بـەشی چاکـەم هەیـە، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ بَلۡ هِيَ فِتۡنَةٞ ﴾، بەڵکـو ئـەوە تاقیکردنەوەیـە، ئـەو نیعمەتـە، ئـەو خێـرو خۆشـیی و چاکەیـە کـە پێتـدراوە، تاقیکردنەوەیـە، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن، بـە هـۆی نەزانینیانـەوە، ئـەو خێـرو خۆشـیی و چاکەیـە کـە دێتـە دەسـتیان، دەیگێڕنـەوە بـۆ شـان و شـەوکەتی خۆیـان، بـۆ هـەوڵ و ڕەنـج و زانیاریـی خۆیـان، لـە تەنگانانـدا پەنـا بـۆ خـوا دەبـەن و، لـە خۆشیانیشـدا خوایـان لـە بیـر دەچـێ.

﴿ قَدۡ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئـەو قسـەیە، ئـەوانی پێـش وانیـش هـەر گوتیـان، یـانی: کـە خێـرو خۆشـییمان تـووش دەکـردن، دەیانگـوت: بـۆ خۆمـان ئەوەمـان وەدەسـت هێنـاوەو دەسـتەبەر کـردوە.

﴿ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، بـەڵام ئـەوەی وەدەسـتیان دەهێنـا لـە مـاڵ و سـامان، هیـچ سـوودی پـێ نەگەیانـدن، (مَـا) دەگونجـێ (مـا)ی لابـەرە (مَـا النَّافِيَـة) بـێ، واتـە: هیـچ سـوودی پـێ نەگەیاندن، دەشـگونجێ (مـا)ی پرسـیارکردن (ما الإِسـتِفْهَامِيّة) بـێ، (فَـمَا أَغْنَـى عَنْهُـم مَـا كَانُـوا يَكْسِـبُون؟)، چ سـوودێکی پـێ گەیانـدن ئـەوەی وەدەسـتیان دەهێنا؟ لـە کاتێـک دا کـە بـەڵای خـوا ﷻ مـلی گرتـن و، مـاڵ و سـامان و سـەروەتیان کـە وەدەسـتیان هێنابـوو، چ سـوودێکی پـێ گەیانـدن؟! هیـچ.

﴿ فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ﴾، خراپـەی ئـەوەی وەدەسـتیان هێنابـوو، تووشـیان بـوو، واتـە: سـزای ئـەو کـردەوە خراپانـەی کـە بەدەسـتیان دەهێنـان، ئـەو گەلانـە تووشـیان بـوو، مـلی گرتـن، ﴿ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، ئەوانـەش کـە سـتەمیان کـردوە لەوانـە، لەوانـەی ڕۆژگاری تـۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) یاخـود:

لەوانــەی ئوممــەتی تــۆ، چ لــە ڕۆژگاری خۆتــداو، چ لــە ڕۆژگارەکانی دیکــەدا، تاکــو دنیـا بـە کۆتـا دێ، چونکـە هەموویـان لەسـەر میلاکـی موحەممـەدن ﷺ، ئەوانـەی ستەمیشـیان کـردوە، لەوانـەی تـۆ بـۆ لایـان ڕەوانـە کـراوی. ﴿سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا﴾، بـە دڵنیایـی خراپـەی ئـەوەی وەدەسـتیان هێنـاوە، تووشـیان دێ، واتـە: سـزای خراپـی کـردەوە خراپەکانیـان، تووشـیان دێ و یەخەیـان دەگـرێ. ﴿وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾، ئەوانیـش دەستەوسـتانکەر نیـن، واتـە: ناتوانـن خـوا ﷻ بـێ توانـا بکـەن و ڕابکـەن لـە دەسـەڵاتی خـواو، دەربـاز بـن لـە سـزای خـوا.

لـە کۆتاییـدا خـوا بابەتی هەشـتەم و کۆتایـی لـەم دوازدە ئایەتە موبارەکـەدا دەخاتە ڕوو، کـە لـە چەنـد شـوێنی دیکـەی قورئانیشـدا ئـەو ڕاسـتییە هاتـوە، دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾، ئایـا نەیانزانیـوە کـە خـوا ﷻ بژیـو بـۆ هـەر کەسـێک بیـەوێ فـراوان دەکات، ﴿وَيَقْدِرُ﴾، هەروەهـا وەتەنگیـش دێنـێ. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، بەڕاسـتیی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کۆمەڵێـک بڕوابێنـن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوا﴾، ئایـا نەیانزانیـوە کـە خـوا ﷻ بژیـو فـراوان دەکات بـۆ هـەر کەسـێک بیـەوێ و وەتەنـگ دێنـێ، واتـە: بـۆ هەندێکیـان فـراوان دەکات و بـۆ هەندێکیـان وەتەنـگ دێنـێ، یاخـود بـۆ هـەر کامێکیـان هەندێـک جـاران بژیـوی بـۆ فـراوان و زۆر دەکات و، هەندێـک جاریـش لێـی وەتەنـگ دێنـێ و لێـی کـەم دەکات، بۆچـی؟ تاکـو تاقییـان بکاتـەوە: ئایـا کـە خـوا ﷻ بژیـوو سـەروەت و سـامانی بـۆ زۆر دەکات، شـوکرانە بژێرەو بـە نیعمـەتی خـوای دەزانـێ؟ هەروەهـا کاتێـک خـوا بـە نەداریـی و هەژاریـی تاقـی دەکاتـەوە، خۆڕاگـرەو دەزانـێ تاقیکردنـەوەی خوایـە؟ یـان دەسـت دەکات بـە ناشـوکریی و ناڕەزایـی دەربڕیـن؟ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، بەڕاسـتیی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کەسـانێک بـڕوا بێنـن، ئینسـان کـە ئیـمانی هەبـوو، دەسـتی خـوا دەبینـێ لـە کارەکانـداو، کاتێـک کـە بژیـوی بـۆ فـراوان دەکـرێ، دەسـتی خـوای تێـدا دەبینـێ و، کاتێـک بژێـوی لێـی وەتەنـگ دێ، خـوا بـە نەداریـی و هەژاریـی و

تەنک دەستیی تاقیی دەکاتەوە، دیسان دەستی خوای بەرزو کاربەجێ دەبینێ، لە کاتێکدا هەتیی دەبێ، سوپاسگوزار دەبێ، بەڵام کە نەهاتیی دەبێ، خۆڕاگر دەبێ.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ بە لوتف و کەرەمی خۆی، کە چاکەو نیعمەتەکانی خوا بە سوپاسگوزاریی و شوکرانە بژێریی پێشوازیی بکەین و، ناڕەحەتیی و گرفتارییەکانیش لەو ڕووەوە کە لە لای خوای پەروەردگارەوەن، بە خۆڕاگریی و بە پشوو درێژیی، پێشوازیی لێ بکەین، لە هەردوو حاڵاندا تەنیا بەندەی خوابین و، بەو شێوەیە بین کە ڕەزامەندیی خوا وەدەست بێنین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا کتێبی خۆی بە هەق بۆ خەڵک دابەزاندۆتە سەر موحەممەد ﷺو، هەر کەسێک ڕاستە ڕێ بێ بە هۆی قورئانەوەو لێی بەهرەمەند بێ، ئەوە بە سوودی خۆی ڕاستە ڕێ بووەو، هەر کەسێکیش لابداو گومڕابێ، بێگومان بە زیانی خۆی تەواو دەبێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾، ئێمە کتێبمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، لێرەدا خوا ﷻ بە ڕاناوی: خۆ بەمەزنگر (مُعَظِّمٌ لِنَفْسِهِ) کەسێک کە خۆی بە مەزن دەگرێ، کە بێگومان مەزنیی و گەورەیی ڕەها، تەنیا هی خوایە ﷻ، دەفەرموێ: ئێمە دامان بەزاندۆتە سەر تۆ کتێبەکە، چونکە (الكِتَاب) (أل)ی ناساندنی لەسەرەو لێرەدا ناساندنەکە بۆ (عهد)ە، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، (عَهْد)یش واتە: ئەو شتەی زانراو (معهود) ە، وەک جاری دیکەش باسمان کردوە (أل)ی (عهد) لە زمانی کوردییدا دەبێتەوە بە (کە)، ئەگەر گوتم: کتێبم بۆ بێنە، نازانی کام کتێبە؟ بەڵام کە گوتم: کتێبەکە، دیارە چ کتێبێکە! لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾، واتە: کتێبەکەمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، ئەو کتێبەی کە دەزانی، کە قورئانی بەرزو بەپێزە، ئنجا ئەو کتێبە بۆ کێ دابەزێنراوە؟

٢)- ﴿لِلنَّاسِ﴾، ئەو کتێبە بۆ خەڵک دابەزێنراوە، (ل) سەر (لِلنَّاس)، لامی هۆکار (لَام العِلَّة)ی پێ دەڵێن، واتە: (لأَجْلِ النَّاس)، لە پێناوی خەڵکدا، بۆ خاتری خەڵک دامانبەزاندوە، ئنجا خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە، بۆچی لە پێناوی خەڵک دایەو، بۆچی بۆ خەڵکە؟ واتە: بۆ ڕاستە ڕێکردنی خەڵک، بۆ بەهرەمەندکردنی خەڵک، بۆ ئەوەی عەقڵ و دڵیان ڕوون بێتەوە، بۆ ئەوەی ژیانی تاکییان بەو شێوەیە بگوزەرێنن کە شایستەی مرۆڤە، هەروەها شایستەی ژیانی خێزانییان و، ژیانی کۆمەڵایەتییان و، ژیانی سیاسییان، هەمووی دەگرێتەوە.

٣)- ﴿بِٱلْحَقِّ﴾، بە هەقیش دامان بەزاندوە، واتە:

أ- (مُتَلَبِّساً بَالحَقِّ)، قورئانمان دابەزاندوە، هەقی تێدایەو هەقی گرتۆتەوە نێو خۆی، قورئان خۆی لەگەڵ هەقدا ئاوێتەیەو، هەقی گرتۆتە نێو خۆی.

ب- (مُتَلَبِّسِيْنَ بَالحَقِّ) ئێمە لە کاتێکدا قورئانمان دابەزاندوە، هەق بووین، واتە: شتێکی هەق و ڕاست و چاکمان کردوە، کە قورئانمان دابەزاندوە.

ج- بە شێوازێکی هەق و لە کات و شوێنی خۆیشی دا، هەر ئایەتەو هەر سوورەتەمان دابەزاندوە، کەواتە: ١- هەم قورئان هەقە، ٢- هەقی گرتۆتە نێو خۆی، ٣- هەم بە شێوازێکی هەق دابەزیوە، ٤- هەم ئێمەش هەق بووین، شتێکی هەق و ڕاست و چاکمان کردوە کە قورئانمان دابەزاندوە.

٤)- ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ﴾، هەر کەسێک ڕێی ڕاست بگرێ، سوودەکەی بۆ خۆیەتی.

(فمن) لێرەدا، («مَنْ» شَرْطِيَّةٌ، أَيْ: مَنْ حَصَلَ مِنْهُ الإهْتِدَاءُ فِي الْمُسْتَقْبَلِ: فَإِنَّ اهْتِدَاءَهُ لِفَائِدَةِ نَفْسِهِ فَحَسْبُ)، (مَن) بۆ مەرجە، هەر کەسێک لە داهاتوودا، ڕێی ڕاست گرتنی بۆ پەیدابێ، سوودەکەی تەنیا بۆ خۆیەتی.

٥)- ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾، هەر کەسێکیش ون بوو، گومڕا بوو، بێگومان بە زیانی خۆی گومڕا دەبێ، (كَذَلِكَ الضَّلَالُ وَبَالُهُ عَلَى صَاحِبِهِ الضَّال فَقَط)، واتە: گومڕاییش خراپییەکەی تەنیا بۆ خاوەنە گومڕایەکەیەتی.

٦)- ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ﴾، تۆش بەسەریانەوە کار پێ سپێردراو نی، (أي: لَسْتَ مَأْمُوراً بِإِرْغَامِهِمْ عَلَى الإِهْتِدَاء)، (ئەوە یەکێکە لە واتاکانی): تۆ فەرمانت پێنەکراوە ناچاریان بکەی ڕێی ڕاست بگرن، یاخود تۆ پارێزەر نی بەسەریانەوە، نەهێڵی گومڕابن، یاخود: ڕاستە ڕێکردنی ئەوان بە تۆ نەسپێردراوە، چونکە وەک لە چەند شوێنی دیکەدا خوا ﷻ فەرموویەتی: تۆ بەس گەیاندنی پەیامی خوای پەروەردگارت لەسەرە، ﴿إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾الشورى - ٤٨ -.

شایانی باسە: شێوەی ئەم تەعبیرە لە سوورەتی (یونس)یشدا هاتووەو، لە سوورەتی (النمل)یشدا هاتووە:

١- لە سوورەتی (یونس)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ١٠٨﴾، واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! هەقتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتوە، ئنجا هەر کەسێک ڕێی ڕاست بگرێ، بە سوودی خۆی ڕێی ڕاست دەگرێ و، هەر کەسێک گومڕا بێ، بە زیانی خۆی گومڕا دەبێ و، من بەسەرتانەوە پارێزەرو کارپێ سپێردراو نیم.

٢- لە سوورەتی (النمل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ٩٢﴾، واتە: هەروەها فەرمانم پێکراوە کە قورئان بخوێنمەوە، ئنجا هەر کەسێک ڕێی ڕاستی گرت، بە سوودی خۆی ڕێی ڕاستی گرتوەو، هەر کەسێکیش گومڕابێ، ئەوە بڵێ: من تەنیا لە ترسێنەران و وریاکەرەوانم.

بۆ حیکمەتی ئەو جیاوازییەی نێوان ئایەتی (٤١)ی سوورەتی (الزمر)و، لەگەڵ ئایەتی (١٠٨) سوورەتی (یونس)و، ئایەتی (٩٢)ی سوورەتی (النمل)دا: (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

(جِيءَ قَصْرُ الإِهْتِدَاءِ عَلَى نَفْسِ الْمُهْتَدِي فِي تَيْنَكَ الآيَتَيْنِ، وَتُرِكَ ذَلِكَ فِي هَذِهِ السُّورَةِ، ووجهُ ذلك أَنَّ تَيْنَكَ الآيَتَيْنِ وَارِدَتَانِ بِالأَمْرِ بِمُخَاطَبَةِ الْمُشْرِكِينَ، فَكَانَ الْمَقَامُ

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٤، ص٣٢.

فِيهِمَا مُنَاسِبًا لِإِفَادَةِ أَنَّ فَائِدَةَ اهْتِدَائِهِمْ لَا تَعُودُ إِلَّا لِأَنْفُسِهِمْ، خِلَافًا لِهَذِهِ الْآيَةِ فَإِنَّهَا خِطَابٌ مُوَجَّهٌ مِنَ اللَّهِ إِلَى رَسُولِهِ ﷺ، لَكِنَ اتَّحَدَتِ الْآيَاتُ الثَّلَاثُ فِي قَصْرِ ضَلَالِهِمْ عَلَيْهِمْ).

واتە: حیکمەتی ئەو جیاوازییە کە لەو دوو ئایەتەی سوورەتی (یونس)و سوورەتی (النمل)دا، ڕێی ڕاستگرتن کورت هەڵهێنراوە لەسەر بابای ڕێی ڕاستگرتوو، بەڵام لەم سوورەتەدا، ئەوە نەهێنراوە، حیکمەتەکەی ئەوەیە کە لە سوورەتی (یونس)و لە سوورەتی (النمل)دا، ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوادانەرانە، بۆیە مەقامەکە وایخواستوە کە سوودی ئەو ڕێی ڕاستگرتنە، بخرێتە ڕوو کە تەنیا بۆ خۆیانەو بۆ غەیری خۆیان ناچێ، بەڵام ئەم ئایەتەی سوورەتی (الزمر): ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ﴾، لێرەدا دواندن لە خوای پەروەردگارەوە ڕووی کردۆتە پێغەمبەرەکەی ﷺ، بۆیە پێویستیی بە کورت هەڵهێنانی سوودی ڕێی ڕاستگرتن، لەسەر دوێنراو (مخاطَب) نەبووە، چونکە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ خوا حاڵیی کردوە و لەوسەری هاتۆتەوە، بەڵام لە هەر سێکیاندا (واتە: هەم لە سوورەتی (الزمر)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۝٤١﴾، هەروەها لە سوورەتی (یونس)دا: ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۝١٠٨﴾، هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا: ﴿وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ۝٩٢﴾، کە هەمان واتای دوو ئایەتەکەی پێشێی هەیە، لە هەر سێ ئایەتەکەدا)، زیانی گومڕایی بە کورت هەڵهێنانەوە ڕووی پێکراوەتە بابای دوێنراو.

نهێنییەکانی قورئان بێ سنوورن و، زانایان چ لە ڕووی ڕەوانبێژییەوەو، چ لە ڕووی ڕێزمانییەوە، چ لە ڕووی زانستە گەردوونییەکانەوە، چ لە ڕووی زانستی کۆمەڵناسییەوە، چ لە ڕووی دەروونناسییەوە، لە هەر ڕوویەکەوە کە لە قورئان ورد دەبنەوە، هەر کەسێ لە بواری پسپۆڕیی و شارەزایی خۆیدا، کۆمەڵێک نهێنیی دەست دەکەون، کە ڕەنگە زانایانی دیکە ئەو نهێنییانەیان نەکەوتبنە بەرچاو، لەبەر ئەوەی لەو بوارەدا، ئەو شارەزاییەیان نەبووە.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی وەرگرتنی خوا بۆ ڕووحەکان، لە کاتی مردن و خەوتن داو، گێڕانەوەی ئەوانەی مردنی بۆ بڕیار نەداون بۆ نێو جەستەکانیان، تاکو کاتی دیاریکراو:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾، خوا ﷻ نەفسەکان وەردەگرێ لە کاتی مردنیاندا، (يَتَوَفَّى)، (التَّوَفِّي: الإِمَاتَةُ وَالَّذِي يُمِيْتُه اللهُ، فَقَدْ توفاه أجله فَاللهُ الْمُتَوَفِّي، وَالْمَيِّتُ: الْمُتَوَفَّى)، کە دەفەرمووێ: خوا ﷻ نەفسەکان لە کاتی مردنیاندا وەردەگرێ، وشەی (تَوَفِّي) بە مانای مراندن دێ، کەسێک کە خوا ﷻ دەیمرێنێ، یانی خوا ﷻ وەفاتی پێ کردوە، کاتەکەی تەواو کردوە (کاتی ژیانەکەی تەواو کردوە)، بۆیە خوا تەواوکار (مُتَوَفِّي)و، بابای مردووش تەواوکراو (مُتَوَفَّى)یە، یاخود: خوا ﷻ وەرگرە بۆ ڕووحەکان و، بابای مردووش وەرگیراوە، ڕووحەکەی لێ وەرگیراوە.

دوایی لە کورتە باسێکدا زیاتر تیشک دەخەینە سەری، کە ڕووح و نەفس هەردووکیان دوو بێژەن، بۆ یەک حەقیقەت بە ئیعتیباری جیا.

دوایی دەفەرمووێ:

٢)- ﴿ وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ﴾، ئەوانەش کە نەمردوون لە کاتی خەوتنیان دا (وەریاندەگرێ).

واتە: (وَيَتَوَفَّى الْأَنْفُسَ الَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا)، ئەو ڕووحانەش کە نەمردوون لە کاتی خەوتنیان دا، خوا ﷻ وەریان دەگرێ، هەڵبەتە لە کاتی خەوتندا بە شێوەیەکی دیکەی جگە لە مراندن، ئەو ڕووحانە وەردەگرێ.

٣)- ﴿فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ﴾، ئنجا ئەوانەی مردنی بۆ بڕیار دابن، ڕووحەکان دەگرێ لە لای خۆی، یانی: خوای بەرز دوای ئەوەی وەریگرتوون، لە لای خۆی گلیان دەداتەوە، ئنجا کە نەشچوونەوە نێو جەستەکانیان، مانای وایە تەواو بوون.

(وَالْإِمْسَاكُ: الشَّدُّ بِالْيَدِ)، (إمساك) توند گرتنە بە دەست.

٤)- ﴿وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، ئەوانی دیکەش (ئەو ڕووح و نەفسانەی دیکەش)، دەنێرێتەوە، (دەیان نێرێتەوەو بەرهەڵدایان دەکات، بۆ نێو جەستەکانیان بچنەوە)، هەتاکو کاتی دیاریکراو.

(وَالْإِرْسَالُ: الْإِطْلَاقُ وَالتَّمْكِينُ مِنْ مُبَارَحَةِ الْمَكَانِ لِلرُّجُوعِ إِلَى مَا كَانَ)، (إِرْسَالُ) بریتیە لە بەرهەڵداکردن و توانا پێدان، بەوەی ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە شوێنی پێشووی.

ڕستەی: ﴿قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ﴾، بە جۆرێکی دیکەش خوێنراوەتەوە: (قُضِيَ عَلَيْهَا الْمَوْتُ)، مردنی لەسەر بڕیادراوە.

٥)- ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێک بیر بکەنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، بۆ کاتێکی ناوبراو، واتە: کاتێکی دیاریکراو.

کە دەفەرموێ: ﴿لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، (تَفَكُّر) لەسەر کێشی (تَفَعُّلُ)ە، (التَّفَكُّرُ: تَكَلُّفُ الْفِكْرَةِ)، (تفكر) ئەوەیە مرۆڤ بیر بخاتە مێشکی خۆیەوەو، عەقڵی خۆی بجووڵێنێ بە ئاڕاستەی بیر لێکردنەوەی شتێک و، تێوەڕامانی.

ئـەو ڕاسـتییە کـە خـوا ﷻ لـە کاتی خەوتنـدا نەفسـەکان وەردەگـرێ، لـە سـوورەتی (الأنعام)یشـدا لـە ئایـەتی ژمـارە (٦٠)دا هاتـوەو، تەنیـا لەوێشـدا هاتـوە، پێـم شـک نایـەت لـە هەمـوو قورئانـدا، جگـە لـەم ئایـەتی (٤٢) سـوورەتی (الزمـر)و ئایـەتی ژمـارە (٦٠)ی (الأنعـام)دا، لـە هیـچ شـوێنێکی دیکـەدا هەبـێ، لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٦٠ ﴾، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە بـە شـەوگار وەفاتتـان پێـدەکات، (ڕووحەکانتـان وەردەگـرێ)، دەشـزانێ بـە ڕۆژێ چـی دەکـەن، دوایـی لـە ڕۆژگاردا بێدارتـان دەکاتـەوە، (زیندووتـان دەکاتـەوە) تاکـو کاتی ناوبـراو، (تەمەنتـان کـە دیاریکـراوە) تـەواو بـێ، دوایـی گەڕانەوەتـان بـۆ لای ویە، دوایـی هەواڵتـان پێدەدات بـەوەی کـە ئەنجامتـان دەداو دەتانکـرد.

شـایانی باسـە: زانایـان و ڕوونکـەرەوانی قورئـان زۆر قسـەیان کـردوە لـە بـارەی چۆنیـەتی پەیوەسـت بـوونی ئـەم ئایەتـە موبارەکـە، بـە ئایەتـەکانی پێـش خۆیـەوەو دەگونجـێ بـە زۆر شـێوە قسـەی لـێ بکـرێ، بـەڵام پێموایـە چۆنیـەتی پێکـەوە پەیوەسـت بوونیـان ئەوەیـە کـە: ئەمـە هـەر گەڕانەوەیـە بـۆ دووبـارە خسـتنە ڕووی بەڵگـەکان لەسـەر ئـەوەی تەنیـا خـوا ﷻ هەمـەکارەی گـەردوون و زەوی و ژیـان و مرۆڤـە، کەواتـە: مـادام هـەر خـوا ﷻ هەمەکارەبـێ، تەنانـەت لـە کاتی خەوتنیشـدا خـوا ﷻ ڕووحـەکان وەردەگـرێ و، ئەگـەر کەسـێک خـوا ﷻ بیـەوێ ژیـانی بـەردەوام بـکات، ڕووحەکـەی دەنێرێتـەوە نێـو جەسـتەی و، ئەگـەر بیـەوێ تـەواوی بـکات، ڕووحەکـەی نانێرێتـەوەو لـە لای خـۆی لـەو شـوێنەی کـە بـۆ خـۆی دەیزانـێ، گـلی دەداتـەوەو، مانـای وایـە مـردنی بەسـەر دادێ، کەواتـە: خوایـەک ﷻ بـە شـەوو ڕۆژ، لـە کاتی خەوتـن و، لـە کاتی بێدارییـدا، بـەس ئـەو تەصـەڕروف بـکات لـە ژیانتانـداو، هەمـوو شـتێکتان بـە دەسـت ئـەو بـێ، عەقـڵ و لۆژیـک وادەخـوازن کـە تەنیـا ئەویـش بپەرسـترێ و بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ.

## کورتە باسێک لە بارەی

## (نووستن) و وەرگرتنی ڕووحەکانەوە لە کاتی خەوتندا

ئەم کورتە باسە لە چوار تەوەردا دەخەینە ڕوو:

### ا)- پێناسەی خەوتن:

ئایا خەوتن چییە؟ بەپێی ئایەتەکە، نووستن مردنێکی بێهێزەو، مردن خەولێکەوتنێکی بەهێزە، هەر بۆیش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: (النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ) (أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٤٥، والديلمي: ٦٩٠٧، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع: ٦٨٠٨)، واتە: نووستن برای مردنە، چونکە پرسیاری لێکراوە: ئایا لە بەهەشتدا خەوتن هەیە؟ فەرموویەتی: نەخێر، چونکە نووستن برای مردنە، یانی: زۆری لێوە نیزیکە، بەپێی ئایەتەکەش خەوتن و مردن لێک نیزیکن، یەک جیاوازییان هەیە، ئەویش ئەوەیە لە کاتی مردندا ڕووح بە تەواویی لە جەستەدا دوور دەکەوێتەوەو، وەردەگیرێ، بەڵام لە کاتی خەوتندا بە تەواویی وەرناگیرێ، دواییش دەخرێتەوە نێو جەستە، هەڵبەتە زانایانی دەروونزان، هەروەها زانایانی توێکاریی کە لە جەستەی مرۆڤ دەکۆڵنەوەو، فەیلەسووفەکان، زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە کە هۆکاری خەوتن چییە؟

أ)- بۆ وێنە هەندێکیان دەڵێن: هۆکاری خەوتن هۆکارێکی فیزیکییە، ئەویش ئەوەیە کە خوێن بە ئەندازەی پێویست ناچێ بۆ مێشک و، کە مێشک کاری نەکرد تەعلیمات نانێرێ بۆ هەندێک لە کۆئەندامەکان، ئەو ئەندامانەی کە بە شێوەی ویستیی (إرادي) کار دەکەن، نەک نەویستیی (لاإرادي)، بۆیە حاڵەتی خەوتن ڕوودەدات.

ب)- هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر هۆکاری خەوتن، هۆکارێکی کیمیاییە کە لە ئەنجامی ماندوو بووندا، چەند ماددەیەکی ژەهریی پەیدادەبن و، فشار لەسەر کۆئەندامی دەمار دەکەن، وای لێدەکەن شل ببێ و ماندوو ببێ و بە ناچاریی مرۆڤ خەوی بەسەر دادێ.

ج)- هەندێکی دیکە گوتوویانە: بەڵکو هۆکاری خەولێکەوتن، دەماریی (عصبي)یە، کە لە ئەنجامی ماندوو بوونی کۆئەندامی مێشک و دەماردا، حاڵەتی پشوودان و ئیسراحەت کردن بە خۆی دەدات.

بەڵام وەک گوتمان: بەپێی ئایەتەکە، هۆکاری سەرەکیی خەو پەیوەندیی نێوان جەستەو ڕووحەو، لە کاتی خەوتندا پەیوەندییەکە سست و بێهێز دەبێ.

با زانیاریی پتر لێی بکۆڵێتەوە، هەمیشە سەرەتای وەحیی کۆتایی زانستە، زانست با بڕوا لێی بکۆڵێتەوە، دوایی هەر دێتەوە سەر ئەوەی وەحیی خوا ﷻ فەرموویەتی، هیچ گومانی تێدانیە، چونکە لە ئەنجامی ئەوەدا کە ڕووح بە شێوەیەکی بەشیی (جزئي) لە جەستە دوور دەکەوێتەوە، خەوتن ڕوودەدات و، ئەوانەی دیکە هەموویان دەرهاویشتەن، حاڵەتی فیزیکی کە خوێن کەم دەچێ، یان حاڵەتی کیمیایی، یان حاڵەتی دەماریی، ئەوانە هەموویان دەرهاویشتەن و دەگونجێ شتی دیکەش باس بکرێن، بەڵام ئەسڵەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ڕووح ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی کە لە حاڵەتی بێدارییدا لەگەڵ جەستەدا هەیەتی، ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی نامێنێ، پەیوەندییەکە سست و بێهێز دەبێ و، حاڵەتی خەو بەسەر مرۆڤدا دێ.

شایانی باسە: کە ئەمە دەبێ پسپۆڕان و شارەزایانی بواری توێکاریی و دەروونزانیی زیاتر قسەی لێ بکەن، بەڵام بە هەرحاڵ بۆ ئێمەی مسوڵمان ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیفەرموێ و لە هەر ڕوویەکەوە، خوا ﷻ شتێک بفەرموێ: ئێمە سەدا سەد لێی دڵنیاین، زانیاریی با ئێستا جارێ لێشی تێنەگەیبێ، یان بۆشی دەرنەکەوتبێ، بەڵام دوای ئەوەی زۆر بەرەو پێشەوە دەچێ - چونکە هەمیشە

سەرەتای وەحیی کۆتایی زانستە - زانست لە کۆتایی دا دەگاتە ئەوەی وەحیی لەسەرەتاوە فەرموویەتی، چونکە وەحیی زانیاریی خوایە، خواش ﷻ بۆ خۆی رووح و جەستە و گەردوون و، پەنهان و، ئاشکراو، هەموو شتێکی دروستکردوە، خۆی دەزانێ هۆکاری خەوتن چییە؟ تەنیا خوا ﷻ وەک پێویست دەزانێ، دیارە توانای دەرککردنیشی بە مرۆڤەکان داوە بۆ هەندێک لە ڕاستییەکان، نەک بۆ هەموویان، چونکە مرۆڤەکان پێویستییان بەوە نیە هەموو ڕاستییەکان بزانن، خوا ﷻ بەس ئەوەندە توانایەی داوە بە مرۆڤان، ئەوەندە ڕاستییانەی پێ بزانن، کە ژیانی دنیایان پێویستیی پێیەتی، خۆشیان لە توانایان دا هەیە.

### ٢)- ڕووح و نەفس یەك شتن:

لەو بارەوە زانایان زۆریان قسە کردوە، کە ئایا ڕووح چییەو، نەفس چییە؟ هەڵبەتە خوا ﷻ لە قورئاندا بە زۆریی باسی نەفسی کردوە، بەڵام باسی ڕووحیشی کردوە، تەنیا لە یەک ئایەتی قورئان، لە سوورەتی (الإسراء)دا، خوا ﷻ باسی ڕووح دەکات، ڕووح وەک ڕووحی مرۆڤ، ئەگەرنا وەک جیبریل کە ناوی لێناوە (روح)، هەروەها وەک وەحیی خۆی کە بە (روح)ی ناو بردوە، لە چەند شوێنێک دا هاتوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾الشعراء.

٢- ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾القدر.

٣- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴿٥٢﴾ ﴾الشورى.

٤- ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ ﴾النحل.

بەڵام ڕووح کە بگونجێ مەبەست پێی ڕووحی بەشەر بێ، تەنیا ئەو ئایەتەی سوورەتی (الإسراء)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: لە بارەی ڕووحەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمەو، ئەندازەیەکی کەمیش نەبێ زانیاریتان پێ نەدراوە.

بەو ئەندازە کەمە زانیارییەش ناتوانن چییەتی ڕووح دەرک بکەن، وەک لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی)دا، لەو بارەوە وردەکاریی زۆرمان باسکردوە.

ئنجا ئەوەی کە ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەیگەیەنن، ئەوەیە کە ڕووح و نەفس یەک شتن، هەرچەندە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: نەخێر دوو شتن، بەڵام ڕایەکەیان ڕاست نیەو، هیچ بەڵگەیەکیان لەو بارەوە نیەو ڕووح و نەفس یەک شتن و، بە دوو ئیعتیباری جیاواز ئەو دوو ناوەی بۆ بەکارهێنراون کە دوایی باسیان دەکەین.

سەرەتا با سەرنجی ئەم دەقە بدەین:

سەعیدی کوڕی جوبەیر ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (إِنَّ اللَّـهَ يَقْبِضُ أَرْوَاحَ الْأَمْوَاتِ إِذَا مَاتُوا، وَأَرْوَاحَ الْأَحْيَاءِ إِذَا نَامُوا، فَتَتَعَارَفُ مَا شَاءَاللَّهُ أَنْ تَتَعَارَفَ): ﴿ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، (أَيْ: يُعِيدُهَا إِلى أَجْسَادِهَا)[1].

سەعیدی کوڕی جوبەیر دیارە هەر لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکەدا دەڵێ: خوا ﷻ ڕووحی مردووەکان وەردەگرێ، کاتێک دەمرن و، ڕووحی زیندووەکان وەردەگرێ و کاتێک دەخەون، ئنجا ئەو ڕووحانە هی مردووان و هی زیندووان، (هی مردووان کە وەرگیراون و، هی زیندووان کە لە کاتی خەوتن دا، وەرگیراون)،

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٥، ص٢٠٧.

یەکدی دەناسن و پێک ئاشنا دەبن، ئەوەندەی خوا ﷻ بیەوێ، دوایی خوا ﷻ ئەوەی کە مردنی بۆ بڕیار دابێ، دەیهێڵێتەوە، ئەوی دیکەش بەرهەڵدادەکات، واتە: دەیگێڕێتەوە بۆ نێو جەستەی، (بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤە بێدار بێتەوەو جارێکی دیکە دەست بە ژیان بکاتەوە).

بەڵێ ڕووح و نەفس یەک شتن و، لەو بارەوە دەتوانین زۆر بەڵگان بێنینەوە، چونکە لە هەندێ دەقاندا هاتوە کە پاڵدراونە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و هەندێکی دیکە لە هاوەڵان و زانایانی تابیعین، کە گوتوویانە: مرۆڤ لە کاتی خەوتن دا نەفسەکەی دەمێنێ، بەس ڕووحەکەی دەنێرێ، یان ڕووحەکەی دەمێنێ، بەڵام نەفسەکەی دەچێتە دەرەوەی جەستە، بەڵام ئەو ڕایەم پێ ڕاست نیەو، پێشم وانیە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، وای گوتبێ، بەڵکو لە ڕاستییدا ڕووح و نەفس هەر یەک شتن و، تەعبیر دەکەن لە یەک حەقیقەت.

(إمام فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (مفاتیح الغیب) کە بە (التفسیر الکبیر)یش ناودارە،[1] چۆنیەتی پەیوەندیی نەفس و ڕووح لەگەڵ جەستەدا، ڕوون دەکاتەوەو ڕوونکردنەوەکەیم پێ جوانە، دەڵێ:

(تَعَلُّقَ جَوْهَرِ النَّفْسِ بِالْبَدَنِ عَلَى ثَلَاثَةِ أَوْجُهٍ:

أَحَدُهَا: أَنْ يَقَعَ ضَوْءُ النَّفْسِ عَلَى جَمِيعِ أَجْزَاءِ الْبَدَنِ ظَاهِرِهِ وَبَاطِنِهِ، وَذَلِكَ الْيَقَظَةُ.

وَثَانِيهَا: أَنْ يَرْتَفِعَ ضَوْءُ النَّفْسِ عَنْ ظَاهِرِ الْبَدَنِ مِنْ بَعْضِ الْوُجُوهِ دُونَ بَاطِنِهِ، وَذَلِكَ هُوَ النَّوْمُ.

وَثَالِثُهَا: أَنْ يَرْتَفِعَ ضَوْءُ النَّفْسِ عَنِ الْبَدَنِ بِالْكُلِّيَّةِ وَهُوَ الْمَوْتُ، فَثَبَتَ أَنَّ الْمَوْتَ وَالنَّوْمَ يَشْتَرِكَانِ فِي كَوْنِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا تَوَفِّيًا لِلنَّفْسِ).

---

(١) ج٢٦، ص٢٦٠.

بە ڕاستیی (**فخرالدین الرَّازي**) وەک جار جار لێی دەخوازینەوە، هەندێک تێگەیشتنی وردی هەن بۆ هەندێک ئایەتان، لێرەشدا دەڵێ:

پەیوەست بوونی جەوهەری نەفس (واتە: ڕووح) بە جەستەوە بە سێ شێوەیە:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە ڕۆشنایی نەفس (واتە: ڕۆشنایی ڕووح) بکەوێتە سەر هەموو بەشەکانی جەستە، ئاشکرای جەستەو، پەنهانی جەستە، ئەوەش حاڵەتی بێدارییە.

**دووەمیان:** ئەوەیە کە ڕۆشنایی نەفس، (یان کاریگەریی نەفس)، لەسەر ڕواڵەتی جەستە لابچێ لە هەندێک ڕووەوە، بەڵام لەسەر دیوی نێوەوەو پەنهانی جەستە بمێنێت، (واتە: لەسەر ڕواڵەتەکەی لادەچێ، بەڵام لەسەر دیوی پەنهانی دەمێنێ)، کە ئەوەش خەوە.

(دەڵێم: دەتوانین بڵێین: ئەو بەشەی کە پەیوەستە بە هۆشی مرۆڤ و ویستی مرۆڤەوە، لە کاتی خەوتن دا، ڕووح ئەو بەشە ڕادەگرێ، مرۆڤ قسە ناکات، ناخوات، ناخواتەوە، ناڕوات، دەست ناجووڵێنێ، بیرناکاتەوە، نابینێ، نابیستێ، ئەوانەی نامێنن، چونکە ئەوانە هەموویان پەیوەستن بە ویستی مرۆڤەوە، بەڵام ئەو کارانەی پەیوەست نین بە ویستی مرۆڤەوەو ناویستیین، وەک لێدانی دڵ و، کارکردنی کۆئەندامی هەناسەو، کارکردنی گورچیلەکان و، کارکردنی جگەرو پەنکریاس و، گەدەو ڕیخۆڵەکان، ئەوانە ئەگەر لە کار بکەون، مانای وایە مرۆڤ دەمرێ، ڕووح ئەوانە هەر دەهێڵێتەوە، بەڵام کردەوە ویستەنییەکان (**الأعمال الإرادیة**) ڕادەگرێ)[1].

**سێیەمیان:** تیشکی نەفس بە تەواویی لەسەر جەستە لادەچێ، کە بریتیە لە مردن، کەواتە: چەسپا کە مردن و نووستن، هەردووکیان هاوبەشن لەوەدا کە بریتین لە وەرگرتنی نەفس.

لە مردندا بە شێوەی یەکجارەکیی نەفسەکە پەیوەندیی دەپچڕێنێ لەگەڵ جەستەدا، بەڵام لە حاڵەتی نووستن دا، پەیوەندیی لەگەڵ ڕواڵەتی جەستەدا دەپچڕێ، بەڵام پەیوەندیی لەگەڵ دیوی نێوەوەو پەنهانی جەستەدا هەر دەمێنێ.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

ئێمە ئەگەر تەماشای چەند دەقێک بکەین - من پێنج دەقم هێناون - بۆمان دەردەکەوێ کە ڕووح و نەفس یەک شتن، بۆیەش تۆزێک گرنگییم بەو خاڵە داوە، چونکە زانایان زۆر مشتومڕیان کردوە، هەڵبەتە نەک هەر ئێستاش وابڵێم، بەڵکو لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)، و (لە کتێبی ژیانی گیان، یان گیانی ژیان)و لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، و لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)و، لە (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طە حاویی) دا باسم کردوە، کە ڕووح و نەفس دوو ناون بۆ یەک شت، ئنجا با تەماشای ئەو دەقانە بکەین:

**١)- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عَنْهَا، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شُقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ} (أخرجه مسلم: ٩٢٠، وأبو داود: ٣١١٨، والنسائي: ٨٢٨٥، وإبن ماجه: ١٤٥٤).**

واتە: ئوممو سەلەمە دایکی بڕواداران ﷺ، دەگێڕێتەوە: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەبوو سەلەمە وەژوورکەوت، لە حاڵێکدا کە چاوی ئەبڵەق بوو بوون، (واتە: گیانی دابوو)، پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی نووقاندن، (پێڵوە چاوەکانی خستنە سەریەک)، دوایی فەرمووی: ڕووح کە وەرگیراو کێشرا، چاو شوێنی دەکەوێ، (بۆیە چاوی ئەبڵەق بوون)، دیارە چاو تەماشای ڕووحەکە دەکات، تاکو لە حوکمی چاودایەو هەتا توانای هەیە.

لێرەدا تەماشا دەکەین پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕووح ناوی ئەو نەفسەی هێناوە، کە دەکێشرێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ﴾.

**٢)- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أَلَمْ تَرَوْا الإِنْسَانَ إِذَا مَاتَ شَخَصَ بَصَرُهُ؟ قَالُوا بَلَى، قَالَ: فَذَلِكَ حِينَ يَتْبَعُ بَصَرُهُ نَفْسَهُ} (أخرجه مسلم: ٢١٧١)،** واتە: ئایا تەماشای مرۆڤ ناکەن کاتێک چاوی ئەبڵەق دەبێ! گوتیان: با، فەرموی: ئەوە بە هۆی ئەوەوەیە کە چاوی دەخاتە شوێن نەفسەکەی.

لە دەقی پێشتر دا فەرمووی: (روح)، بەڵام لێرەدا دەفەرمویّ: (نفس)، کەواتە: نەفس و ڕووح هەریەکن.

**٣)- {إِذَا خَرَجَتْ رُوحُ الْمُؤْمِنِ، تَلَقَّاهَا مَلَكَانِ يُصْعِدَانِهَا} (أخرجه مسلم: ٢٨٧٢)** واته: کاتێک ڕووحی بڕوادار دەردەچێ، دوو فریشته وەریدەگرن و، پێشوازیی لێدەکەن و، بەرزی دەکەنەوە.

لێرەشدا بە ڕووح ناوی هێناوە.

**٤)- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الْمَيِّتُ تَحْضُرُهُ الْمَلَائِكَةُ فَإِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَالِحًا قَالُوا: اخْرُجِي أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ! كَانَتْ فِي الْجَسَدِ الطَّيِّبِ، اخْرُجِي حَمِيدَةً وَأَبْشِرِي بِرَوْحٍ وَرَيْحَانٍ وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَلَا يَزَالُ يُقَالُ لَهَا ذَلِكَ، حَتَّى تَخْرُجَ ثُمَّ يُعْرَجُ بِهَا إِلَى السَّمَاءِ فَيُفْتَحُ لَهَا} (أخرجه النسائي في الكبرى: ١١٤٤٢، وابن ماجه: ٤٢٦٢، وأحمد: ٢٥١٣٣، تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين).**

ئەم دەقەش هەر بەشێکە لەو فەرموودەیەی کە پێشتریش هێنامان و فەرموودەیەکی درێژە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: فریشتەکان ئامادە دەبن، ئەگەر ئەو پیاوە صاڵح بێ، (دیارە بۆنەکە کۆچکردنی پیاوێک بووە، ئەگەرنا بۆ ئافرەتیش هەروایە)، فریشتەکان پێی دەڵێن: ئەی نەفسی پاک و چاک! وەرە دەرێ، کە لە جەستەیەکی پاک دا بووی، دەربچۆ بە ستاییشکراویی و، موژدەت لێ بێ بە ڕەوح و ڕەیحان، (ڕەوح: دەگونجێ بە مانای دەروو لێ کرانەوە، یان بە مانای ڕەحمەت و بەزەیی خوا، بێ، ڕەیحان: واتە: بژیوێکی چاک، یاخود: بۆنی خۆش بێ)[1]، موژدەت لێ بێ: پەروەردگارت لێت ڕازییەو لێت تووڕە نیە، بەردەوام ئەو قسەیەی لەگەڵدا دەکرێ، هەتا لە جەستە دەچێتە دەر، دوایی بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

واتە: لە کاتی گیان کێشاندا، فریشتەکان ئاوا موژدەی پێ دەدەن و دڵی خۆش دەکەن.

ئنجا هەر لە دەقی هەمان فەرمایشتدا هاتوە، کە بە پێچەوانەوە: ئینسانی بێبڕواو خراپەکار، فریشتەکان تیوەی دەخوڕن و، دەڵێن: ئەی ڕووحی پیس! لە جەستەیەکی پیس داو، هەڕەشەت لێبی کە تووشی حاڵێکی خراپ دەبی، هەر ئەوەی پێ دەگوترێ: تاکو ڕووحەکەی بەرز دەکرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی خوا ﷻ دیارییکردوە.

٥)- لە فەرمایشتێکی دیکەدا کە ئەویش بەسەرهاتێکی لەسەرەو، من تەنیا جێی مەبەستم هێناوە، پوختەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دا جارێک لە سەفەرێک دا خەویان لێ دەکەوێ، بۆ نوێژی بەیانی خەبەریان نابێتەوەو، مەگەر دوای خۆرهەڵات، کە یەکێک لە هاوەڵانی داناوە خەبەریان بکاتەوە، ئنجا کە ڕووی تێدەکات دەفەرموێ: قەرار نەبوو بێدارمان بکەیەوە؟ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوەی کە ڕووحەکەی منی وەرگرتبوو و نەیناردەوە بۆ جەستەم، کە بێدار ببمەوە، هەر ئەوەبوو کە ڕووحی تۆشی وەرگرتبوو، واتە: منیش هەمان خەوم بە مل داهات، ئنجا من شوێنی مەبەستم هێناوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ ﷺ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَنَا، وَلَوْ شَاءَ لَرَدَّهَا إِلَيْنَا فِي حِينٍ غَيْرِ هَذَا)[1]. واتە: ئەی خەڵکینە! خوا ڕووحەکانی ئێمەی وەرگرتبوون و، ئەگەر ویستبای ڕووحەکانی بۆ دەگێڕاینەوە لە جگە لەم کاتەدا.

واتە: نەک دوای خۆرهەڵاتن، بەڵکو پێشتر ڕووحەکەی بۆ دەگێڕاینەوەو نوێژی بەیانییمان دەکرد، بەڵام دیارە خوای پەروەردگار ئێستا ڕووحەکەی گێڕاوەتە نێو جەستەمان، یانی: گێڕانەوەی تەواو کە ببێتە هۆی حاڵەتی بێداریی.

ئنجا لە هەندێک لەو کتێبانەدا کە ئامـاژەم پێدان، بە تایبەت: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا، باسم کردوە کە ڕووح و نەفس یەک شتن،

---

(١) أخرجه مالك في الموطأ (٢٥) فذكره، وقال الزرقاني في شرح الموطأ (٥٤/١) مرسلًا باتفاق رواة الموطأ، وجاء معناه متصلاً من وجوه صحاح ، قاله أبو عمر.

بەڵام ڕووح بە ئیعتیباری هەقیقەتە ڕووتەکەی خۆی، بە ئیعتیباری ئەوەی کە مرۆڤ بە ڕووحەوە مرۆڤە، پێی دەگوترێ: ڕووح، بەڵام بە ئیعتیباری تێکەڵ بوونی لەگەڵ جەستەداو، هەڵسانی بە چالاکییەکان و جێبەجێکردنی داخوازییە جەستەییەکان، وەک تێرکردنی غەریزەکان و هەتا دوایی، پێی دەگوترێ: نەفس، بەڵگەم چییە لەسەر ئەوە؟

بەڵگەم لەسەر ئەمە ئەوەیە: کە خوا ﷻ کاتێک باسی پێکهاتەی ئادەم دەکات، هەروەها حەوواش سەلامی خوایان لێ بێ، هەروەها باسی پێکهاتەی وەچەکەیان دەکات، هی مرۆڤەکان، تەنیا باسی دوو شتان دەکات: جەستەیەکی خاکیی، لەگەڵ ڕووحێکی خوایی، واتە: تەنیا ڕووحێک کە خوا ﷻ دەزانێ چییە؟ یان ڕووحێک کە لەسەرووی ئاستی ماددەوەیە، بۆ وێنە: با تەماشای سوورەتی (السجدة) بکەین کە چۆن خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی بۆ هەردووکیان (ئادەم و وەچەکەی)، تەنیا ئەو دوو پێکهاتەیە باس دەکات دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ﴾السجدة، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی چاک دروستکردووەو، دەستپێکی دروستکردنی مرۆڤیشی لە قوڕێوە هێناوە، (یانی: جەستەکەی)، ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ﴾السجدة، واتە: وەچەکەشی گێڕاوە لە پوختەیەک لە ئاوێکی قێزەون (کە مەبەست پێی تۆوە، تۆوی پیاو و ئافرەت کە تێکەڵ دەبێ، وەچەکەشی لەوە پەیدا کردوە).

ئنجا دوایی دێتەوە سەر باسی دروستکردنی ئادەم، هەروەک دەشگونجێ باسی تەواوکردنی دروستکرانی وەچەی ئادەم بێ: ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ ﴿٩﴾ ﴾السجدة، واتە: دوایی (خوا ﷻ جەستەی ئادەمی کە لە قوڕێ دروست کرد بوو، یان هی وەچەکەی کە لە پوختەی قوڕێ بوو)، ڕێکیخست و لە ڕووحی خۆی فووی بە بەردا کرد.

کەواتـە: وەک چـۆن جەسـتەی ئـادەم ڕاسـتەوخۆ لـە قـوڕ دروسـتکراوە، بـە هەمـان شـێوە وەچـەی ئادەمیـش ئەوانیـش جەسـتەکانیان لـە پوختەیـەک لـە ئاوێکـی قێـزەون دروسـت بـووە، پێکهاتـەی دووەمیشـیان ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ لـە ڕووحـی خـۆی، واتـە: ڕووحێـک کـە دروسـتکراوێکی تایبـەتی خۆیـەتی، فـووی بـە بـەردا کـردوە.

کەواتـە: ڕووح بـەو ئیعتیبـارەی کـە دروسـتکراوێکی تایبەتـە بـەر لـەوەی بچێتـە نێـو جەسـتەو، دوای ئـەوەی لـە جەسـتە دێتـەدەرێ، پێـی دەگوتـرێ: ڕووح، بـەڵام هەتـا لـە نێـو جەسـتەدایە، پێـی دەگوتـرێ: نەفـس، بۆیـەش خـوا ﷻ لـە یـەک شـوێنیش لـە قوڕئانـدا مـەدح و زەمـی ڕووحـی نەکـردوە، بـەڵام نەفـس لـە قوڕئـان دا هـەم زەمکـراوە، هـەم ستایشـکراوە، زەمکـراوە ئەگـەر بێبڕوابێ و، خراپـەکار بـێ و، ستایشـکراوەو مەدحکـراوە، ئەگـەر بـڕوادارو چاکـەکار بـێ، بـا تەماشـا بکەیـن:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾الشمس، کەواتە: نەفس دەگونجێ پاک و چاک بکرێ و، دەشگونجێ پیس و پۆخەڵ بکرێ، ئەگەر پاک و چاک بکرێ، سەرفرازەو، ئەگەر پیس و پۆخەڵ بکرێ، بەدبەخت و پەشێمان و بێبەش و سەربەهەشە.

٢- هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾القيامة، خوا ﷻ سوێند دەخوات بە نەفسێک کە ڕەخنەگرە، واتە: ڕەخنە لە خاوەنەکەی دەگرێ، کە بۆچی وام پێدەکەی و، ئەو کردەوە خراپانەم پێ دەکەی؟

٣- دیسان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾ ﴾یوسف، کەواتە: بە دڵنیایی نەفس زۆر فەرمان دەکات بە خراپەو، نەفس ئەگەر لێی بگەڕێی و پاک و چاکی نەکەی و، دەستکاریی نەکەی، بۆ خۆی زۆر حەز بە خراپە دەکات، بەڵام ئایا هەر وا دەبێ؟ نا، ئەگەر کاری لەسەر بکەی لەسەر خەتی ڕاست دەوەستێ و ئارام دەگرێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ

﴿ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ﴿٢٩﴾ وَادْخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾﴾ ﴿٢٧﴾ الفجر، واتە: ئەی نەفسی هێمن و داسەکناو ئۆقرە گرتوو! بۆ لای پەروەردگارت بگەڕێوە، تۆش ڕازیی و پەروەردگاریشت لێت ڕازییە، کەواتە: نەفس دەگونجێ حاڵەتی: زۆر فەرمانکەر بە خراپە (أَمَّارَة بالسوء)ی هەبێ و، هەر خەریکی فەرمان کردن بێ بە خراپەو، دەگونجێ حاڵەتی: خۆ سەرکۆنە کردن (لَوَّامَة)ی هەبێ واتە: بێدار بێتەوەو، لۆمەو سەرکۆنەی خۆی بکات لەسەر خراپەو، دەشگونجێ حاڵەتی ئارامگرتن (إطمئنان)ی هەبێ و ئۆقرە گرتوو و دامەزراو بێ لەسەر چاکەکاریی.

## ٣)- ڕووح، یان نەفس دروستکراوێکی نا ماددیی مەعنەوییە:

ماددە ئەوەیە کە ئێمە بە پێنج هەستەکان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین، دەیبینین، یان بۆنی دەکەین، یان تامی دەکەین، یان دەستی لێ دەکوتین، یان دەنگی دەبیستین، بەڵام ڕووح بە هیچ کام لەم پێنج هەستانە، مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێ، لەو ڕووەوە دەڵێین: دروستکراوێکی ناماددیی مەعنەوییە.

(القرطبي) دەربارەی ڕووح دەڵێ:

(وَالصَّحِيحُ فِيهِ أَنَّهُ جِسْمٌ لَطِيفٌ مُشَابِكٌ لِلأَجْسَامِ المَحْسُوسَةِ، يُجْذَبُ وَيُخْرَجُ، وَفِي أَكْفَانِهِ يُلَفُّ وَيُدْرَجُ، وَبِهِ إِلَى السَّمَاءِ يُعْرَجُ، لَا يَمُوتُ وَلَا يَفْنَى، وَهُوَ مِمَّا لَهُ أَوَّلٌ وَلَيْسَ لَهُ آخِرٌ، وَهُوَ بِعَيْنَيْنِ وَيَدَيْنِ، وَأَنَّهُ ذُو رِيحٍ طَيِّبَةٍ وَخَبِيثَةٍ، كَمَا فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ)[1].

دەڵێ: ڕای ڕاست لە بارەی ڕووحەوە (یان لە بارەی نەفسەوە) ئەوەیە کە جیسمێکی (ئەوان مەبەستیان لە جیسم ئەوە بووە کە شتێکی هەبوویە، بەڵام بە پێنج هەستەکان هەستی پێ ناکرێ)، پەنهان (لطيف)ی تێکەڵە، لەگەڵ ئەو جەستە بەرهەستانەداو، ڕادەکێشرێ و دەردەچێ و، لە کفنەوە دەپێچرێ و، بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان، نامرێ و لە بەین ناچێ، سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج١٥، ص٢٠٨.

نیە، ڕووح دوو چاوی هەن و دوو دەستی هەن، بۆنی خۆشی هەیە، یاخود بۆنی ناخۆشی هەیە، (بە پێی کردەوەکانی) وەک لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە ئەبوو هورەیرە خوا ﷺ هێناویەتی.

کە پێشتر ئاماژەیەکمان پێداو لە ڕوونکردنەوەی (عەقیدەی تەحاویی)دا، فەرموودەکەم بە تەفسیل هێناوە، هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا لەوێش لە بەرگی پێنج دا، هێناومانە.

باشترین بەڵگەی نەقلییش لەسەر ئەوە کە ڕووح دروستکراوێکی نابەرهەستی خاوەن شوێنەواری جۆراو جۆرە، ئەم ئایەتانەن لە سووڕەتی (الواقعة)دا، کە دەفەرمووێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: دەبووایە کاتێک دەگاتە گەروو، [چی دەگاتە گەروو؟ بە سیاق دەزانرێ کە مەبەست پێی ڕووحەو، ڕاناوی مێینەشی بۆ بەکارهێناوەو، چ بگوترێ نەفس و، چ بگوترێ ڕووح، هەردووکیان بە مێینەی مەجازیی (المؤنث المجازي) دانراون]، ئێوە لەو کاتەدا تەماشا دەکەن و ئێمە لە ئێوە لێی نزیکترین، بەڵام ئێوە نابینن، (فریشتەکانمان لێوەی نزیکترن)، ئنجا ئەگەر ئێوە ملکەچ نین بۆ خواو لەبەر دەستی خوادا نین، بۆچی نایگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن!

واتە: ئەو ڕووحە کە لە نووکی پێ تاکو دەگاتە گەروو دەکێشرێ، ئەگەر ڕاست دەکەن، مەهێڵن لە گەروو دەربچێ و جەستە بەجێ بهێڵێ و، بیگێڕنەوە بۆ نێو جەستە، کە بێگومان لێرەدا بە ڕوونیی دیارەو بە ڕاشکاویی ڕاگەیەنراوە کە ڕووح لە نێو جەستەدایەو، دەردەچێ و ئەو حاڵەتانەی هەن کە (القرطبي) باسی کردوون و لە فەرمایشتەکانیش وەریگرتوون.

کۆتا قسە لەم تەوەری سێیەمدا، ئەو قسەیەی (القرطبي)[1] دێنین لە تەفسیرەکەی دا، دەڵێ: گوێم لە (الأصمعي) بووە، گوتوویەتی: گوێم لە (معتمر) بووە کە ئەویش یەکێکە لە زانایان، گوتوویەتی: (رُوحُ الإِنْسَانِ مِثْلُ كُبَّةِ الْغَزْلِ، فَتُرْسَلُ الرُّوحُ، فَيَمْضِي، ثُمَّ تَمْضِي، ثُمَّ تُطْوَى فَتَجِيءُ فَتَدْخُلُ، فَمَعْنَى الآيَةِ أَنَّهُ يُرْسَلُ مِنَ الرُّوحِ شَيْءٌ فِي حَالِ النَّوْمِ وَمُعْظَمُهَا فِي الْبَدَنِ مُتَّصِلٌ بِمَا يَخْرُجُ مِنْهَا اتِّصَالاً خَفِيًّا، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ الْمَرْءُ جَذَبَ مُعْظَمُ رُوحِهِ مَا انْبَسَطَ مِنْهَا فَعَادَ).

ئاوا بۆمان وێنا دەکات، دەڵێ: ڕووحی مرۆڤ وەک گلۆڵەیەکی چنراو وایە، کە ڕووح هەندێکی دەنێرێ، دەڕوا دەڕوا دوایی دێتەوە نێو جەستە، مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە بەشێک لە ڕووح دەنێردرێ لە کاتی خەوتن دا، بەڵام زۆربەی هەر لە جەستەدا ماوەو، ئەوەش کە دەنێردرێ دەچێتەدەر، بەوەوە کە لە نێو جەستەدا ماوە، بە شێوەیەکی پەنهان پێکەوە پەیوەستن و، کاتێک مرۆڤ بێدار دەبێتەوە، ئەوەی کە ناردوویەتی وەک گلۆڵەیەک، جارێکی دیکە ڕایدەکێشێتەوە بۆ نێو جەستە.

ئەو ئاوا بۆمان وێنا دەکات، ئەگەرنا ڕووح حاڵەتێکی جەستەیی نیەو ماددیی نیە، بەڵام مەبەستی ئەوەیە کە لە کاتی خەوتن دا، ڕووح پەیوەندییەکی پەنهانی لەگەڵ جەستەدا هەردەمێنێ، بەڵام ئەو پەیوەندییە نیە کە ببێتە هۆی بێداریی.

## ٤)- چەند ئەدەبێکی خەوتن و لە خەو هەڵسان:

خەو (نووستن)، لە ئیسلامدا گرنگیی پێدراوە، کە مرۆڤ چۆن بخەوێ و، چۆن بچێتە سەر جێگاو، پاشان کە بێدار دەبێتەوە، چی بڵێ و چۆن بکات؟ چەند ئەدەبێکی بۆ دانراون، هەوڵ دەدەم بە پوختیی بیانهێنم، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی سێ دەقی سوننەتدا:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج١٥، ص٢١٠.

١- {عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ، ثُمَّ يَقُولُ: (أَللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا) وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ:(الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)} (أخرجه البخاري: ٦٣١٢، وَأَبو داود: ٥٠٤٩، والترمذي: ٣٤١٧، وابن حبان: ٥٥٣٢، وغيرهم).

واتــە: حوزەیفــە ﷺ، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ عــادەتی وابــوو کــە بــە شــەوێ دەچــووە ســەر جێگای بــۆ خەوتــن، دەســتی دەخســتە ژێــر ڕوومەتی، (دەســتی ڕاســتی دەخســتە ژێــر ڕوومــەتی ڕاســتی)، دوایــی دەیفەرمــوو: ئــەی خوایــە! بــە نــاوی تــۆ دەمــرم و دەژیــم، کاتــێ بێداریــش دەبوویــەوە دەیفەرمــوو: ســتاییش بــۆ ئــەو خوایــەی دوای ئــەوەی مراندبوویــنــی، زینــدووی کردینــەوەو، هــەر بــۆ لای ویــش دەگەڕێینــەوە.

٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، وَلْيُسَمِّ اللَّهَ، فَإِنَّهُ لَا يَعْلَمُ مَا خَلَفَهُ بَعْدُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ، فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَلْيَقُلْ: سُبْحَانَكَ رَبِّي، وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا.» وَقَالَ الْبُخَارِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ وَالتِّرْمِذِيُّ: (فَارْحَمْهَا) بَدَلَ (فَاغْفِرْ لَهَا) وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ» زَادَ التِّرْمِذِيُّ (وَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي فِي جَسَدِي، وَرَدَّ عَلَيَّ رُوحِي، وَأَذِنَ لِي بِذِكْرِهِ)} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٦٥٢٥، والبخاري: ٥٩٦١، ومسلم: ٢٧١٤، وأبو داود: ٥٠٥٠).

واتــە: ئەبــوو هوڕەیــڕە ﷺ، دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: هــەر کات یەکێــک لــە ئێــوە بــەلای جێگاکەیــەوە چــوو، پەنــای بــرد بــۆ جێگاکــەی بــۆ ئــەوەی بخــەوێ، بــا ئێــوی پۆشــاکەکەی بگــرێ و، بــە ســەر جێگەکەیــدا بێنــێ (جێگاکــەی خــۆی پــێ بســڕێتەوە)و، بــا نــاوی خــوا بێنــێ، چونکــە نازانــێ لــە دوای خــۆی کــە شــوێنەکەی جێهێشــتوە، چ شــتێک چۆتــە شــوێنی، (ڕەنگــە دوو پشــکێک، مارێــک چــوو بێتــە شــوێنەکەی)، هــەر کاتێــک ویســتی ڕاکشــێ، بــا لەســەر لای ڕاســتی ڕابکشــێ و بڵــێ: پاکیــی بــۆ تــۆ پــەروەردگارم، تەنیشــتی خــۆم دانــا لەســەر جێــگاو هــەر بــە هــۆی تــۆوە

تەنیشتی خۆم بەرز دەکەمەوە(و بێدار دەبم)، ئەگەر رووحەکەت وەرگرتم، لێی ببوورە، (یاخود: بەزەییت پێی دابێ) و ئەگەر ناردیشتەوە بۆ نێو جەستەکەم، بیپارێزە بەوەی بەندە چاکەکانی خۆتی پێ دەپارێزی (واتە: لە گوناهو تاوان و لادان)، (الترمذي) لە (سنن)ی خۆیدا ئەوەشی زیاد کردوە، کاتێک کە بێداریش بۆوە با بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە جەستەمدا سەلامەتی کردووم و، رووحەکەی بۆ گێراومەوەو، مۆڵەتی داوم کە یادی بکەم.

٣- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کامێک لە ئێوە کە دەچێتە سەر جێیەکەی با ئەو وشانە بڵێ، ئەگەر بمرێ لەسەر زگماکی پاک و چاک و بەندایەتیی بۆ خوا دەمرێ، ئەویش ئەوەیە کە بڵێ: {أَللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ} (أخرجه أحمد: ١٨٥٨٤، والبخاري: ٢٤٤، ومسلم: ٢٧١٠، وأبو داود: ٥٠٤٦، والترمذي: ٣٣٩٤).

واتە: ئەی خوایە! نەفسی خۆم بە تۆ سپاردو، رووی خۆم لە تۆ کردو، پشتی خۆم بە تۆ بەست و، کاری خۆم عایدی تۆ کردو، لە رووی ئارەزووەو، لە رووی سام لێکردنەوە رووم لە تۆ کرد، هیچ پەنا نیەو هیچ شوێنی دەرباز بوون نیە، لە سزای تۆ، مەگەر بۆ لای تۆ بێینەوە، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە داتبەزاندوە، بڕواشم بەو پێغەمبەرەت ﷺ کردوە کە ڕەوانەت کردوە (کە موحەممەدە ﷺ).

پێغەمبەر ﷺ کە وایفەرمووە لەبەر ئەوەیە کە ئینسان دەخەوێ، جۆرێک لە مردن و بێ ئاگایی و بێ هۆشیی بەسەر دادێ و، نازانێ چی بەسەردێ لەو خەوەیدا، خەڵکی واش هەبووە کە خەوتووە، بێدار نەبۆتەوەدو کە چاوی هەڵهێناون، ئەوە عالەمی بەرزەخە!، واتە: لە کاتی خەوتندا گیانی کێشراوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەرپەرچدانەوەو پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی بە تکاکار دانانی پەرستراوە ساختەکان، کە هیچ کارەو بێ شعووریشن! لە حاڵێکدا کە هەمەکارەی ئاسمانەکان و زەوی و خاوەنی تکا، تەنیا خوایە ﷻ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُواْ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ﴾، یان ئایا جگە لە خوا ﷻ تکا کارانێکیان گرتوون، وەک لە مانای گشتییەکەشدا باسمان کرد، ئەمە وادێتە بەرچاو و بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، کە قسەیەکی دیکە، پێش ئەم ڕستەیە هەبووەو فڕتێنراوە، واتە: ئایا لە سزای خوا بێ باکن؟ ئایا لە خوا ﷻ بێمنەتن کە نایپەرستن؟ یاخود جگە لە خوا تکا کارانێکیان بۆ خۆیان پەیدا کردوون، تکایان بۆ لە لای خوا بکەن؟ (أَمْ: لِلْإِضْرَابِ الإِنْتِقَالِيّ انْتِقَالًا مِن تَشْنِيعِ إِشْرَاكِهِمْ إِلى إِبْطَالِ مَعاذِيرِهِمْ فِي شِرْكِهِمْ)[1]، لێرەدا (أَمْ) بۆ گواستنەوەیە لە بە ناشیرین دانانی هاوبەش بۆ خوادانانیان، بۆ پووچەڵکردنەوەی بیانووەکانی هاوبەش بۆ خوادانانیان، ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ﴾، واتە: ئایا جگە لە خوا کەسانێکیان کردوون بە تکا کاری خۆیان؟.

٢)- ﴿ قُلْ أَوَلَوْ كَانُواْ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴾، بڵێ: ئایا ئەگەر هیچیان بەدەست نەبێ و نەشفامن، ئەو پەرستراوانەی کە ئێوە بەتەمان تکاتان بۆ بکەن لە لای خوا؟

---

(١) (أم) بریتیە: لە (بل أ)، کە پرسیارکردنەکەش بۆ نکوولّیلێکردن و سەرزەنشتە.

﴿وَلَا يَعۡقِلُونَ﴾، نەشفامن، شعووریشیان نەبێ، چونکە ئەوان هەر بەپێی عەقیدەی خۆشیان، پەیکەرو بتەکان نە عەقڵیان هەبووەو نە هەستیان هەبووەو، زانیویانە ئەوە تەنیا پەیکەرێکە بە تایبەتی بتپەرستەکانی قورەیش و عەرەب لەسەردەمی نەفامییدا، ئەگەرنا سەرجەم ئەوانەی دەپەرسترێن، مەرج نیە، هەموویان تەنیا پەیکەر بووبن، ئاژەڵیش پەرستراون و بە خەیاڵی خۆیان فریشتەشیان پەرستوون، شەیتانیشیان پەرستوون، مانگ و خۆریشیان پەرستوون، مرۆڤیشیان پەرستوون کە تاغووتەکانن، بەڵام بە نسبەت کە ئەوانەوە کە ئەوان پەرستوویانن، بڵێ: ئایا ئەگەر هیچیان بەدەست نەبێ و نەشفامن؟

٣)- ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ﴾، بڵێ: تکا کردن هەمووی هی خوایە.

٤)- ﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ حوکمڕانیی و خاوەندارێتیی ئاسمان و زەوی هەر هی ئەوە.

٥)- ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ دوایی هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

## چوار کورتە سەرنج

١- کە دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ﴾، ئایا جگە لە خوا تکا کارانێکیان پەیداکردووە؟ ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، باسێکی سەربەخۆمان کرد، لە بارەی شەفاعەتەوە، بۆیە لێرەدا ناچینە نێو وردەکارییەکانی و ئەوەندە دەڵێین: بە دڵنیایی، تکاکردن (شفاعة) هەیە لە لای خوا، بۆ پێغەمبەران، بۆ فریشتەکان، بۆ زانایان، بۆ شەهیدان، دەقەکانی قورئان و سوننەت ئەوە دەگەیەنن، بەڵام دیارە شەفاعەت کردن و شەفاعەت بۆ کران چەند مەرجێکی هەن:

یەکەم: دەبێ بە مۆڵەتی خوا بێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴿٢٥٥﴾ ﴾البقرة، کێیە تکا لە لای خوا بکات، مەگەر بە مۆڵەتی خوا ﷻ، کەواتە: بەبێ مۆڵەتی خوا، تکا ناکرێ بۆ کەس.

دووەم: تکاکردنیش چ هی فریشتەکان و، چ هی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، چ شەهیدان و زانایان، تەنیا تکا بۆ کەسێک دەکرێ، خوا لێی ڕازی بێ: ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾الأنبياء، واتە: تکا ناکەن مەگەر بۆ کەسێک (خوا) پەسندی بێت، (ڕازی بێت شەفاعەت و تکای بۆ بکرێ)و فریشتەکان لە سام و هەیبەتی وی (خوا) دڵ پڕ ترس و لەرزو پەرۆشن.

سێیەم: لە سوورەتی (النجم)یش لە سیاقێکدا کە باسی فریشتەکان دەکرێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾النجم، واتە: زۆر فریشتە هەن، لە ئاسمانان تکا کردنەکەیان هیچ سوود ناگەیەنێ، مەگەر دوای ئەوەی خوا مۆڵەت دەدات بۆ کەسێک کە بیەوێ و، بۆ کەسێکیش کە لێی ڕازی بێ، واتە: دەبێ خوا ﷻ بیەوێ ئەو کەسە تکا بکات و، ئەو کەسەش کە تکای بۆ دەکرێ پەسند کراو بێ.

بەو سێ مەرجەوە تکاکردن دەبێ: یەکەم: بە مۆڵەتی خوا، دووەم: کە سێک کە خوا بیەوێ تکا بکات، سێیەم: کەسێکیش کە خوا ڕازی بێت تکای بۆ بکرێ.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ﴾، ئەوە زیاتر بۆ ئەو پەیکەرو صەنەمانەیە کە پەرستوویانن، بە نسبەت ڕستەی: ﴿لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا﴾، هیچ شتێکیان بەدەست نیە، بە تەئکید جگە لە بت و صەنەمەکانیش، تاغووتەکانیش و هەموو پەرستراوەکانی دیکەش، هیچیان بەدەست نیە، هەروەها ڕستەی: ﴿وَلَا يَعْقِلُونَ﴾، ئەگەر مەبەست پێی ئەوە بێ، هیچ نافامن و نازانن، دیارە مەبەست پێی پەیکەرەکانە، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کە هەموو نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی تێناگەن و نازانن و، دەبێ خوا ئاگاداریان بکاتەوە، دیسان ئەوەش هەموو پەرستراوەکان دەگرێتەوە.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا﴾، لێرەدا: (تَقْدِيمُ الخَبَرِ الْمَجْرُورِ عَلَى الْمُبْتَدَأ لِإفَادَة الحَصر)، پێشخستنی گوزارەی ژێردارکراو (الخبر المجرور) لەسەر نیهاد (مبتدأ) مانای کورتهەڵێنان دەگەیەنێ (چونکە ڕستەکە لە ئەسڵ دا ئاوایە: (الشفاعة لله جميعاً))، واتە: تکا کردن تێکڕای هەمووی بەس هی خوایە، وشەی (جَمِيْعَاً: حَالَةٌ مِنَ الشَّفَاعَة)، (جميعاً) حاڵی (شفاعة)ە، یانی: هیچ بەشێک لە بەشەکانی شەفاعەت هەڵناوێردرێ، لەو شەفاعەتەی کە هی خوایەو، هەمووی لە دەستی خوای پەروەردگاردا کورت هەڵهاتوە.

٤- کە دەفەرموێ: ﴿لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، حوکمڕانیی و دەسەڵات لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر هی ئەوە، ئەم گشتاندنە کە خوا ﷻ تەنیا خۆی هەمەکارەی گەردوونە، بۆ ئەوەیە کە تکاکردن تەنیا بەدەست ئەوە، چونکە خاوەنی گەردوون بەس خۆیەتی، بۆیە هەر چاوەڕوانییەکتان هەبێ لە جگە لە ئەو، بە هەڵەداچوون.

﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، (ثُمَّ: للتَّرْتِيْب الرُّتْبِي)، (ثم) بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەیە، واتە: ئێستا حوکمڕانیی و دەسەڵات هەمووی هی ئەوە، دواییش هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بێبڕوایان بە ڕۆژی دوایی، هەر کات ناوی خوا بهێنرێ، دڵ و دەروونیان دەگووشرێ، کەچی باسکرانی پەرستراوانی جگە لە خوا، مایەی شادمانییانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ﴾، هەر کاتێک بە تەنیا باسی خوا ﷻ کرا، واتە: بەبێ ئەوەی پەرستراوەکانی دیکەی لەگەڵدا باس بکرێن، لەو پەرستراوانەی هاوبەش بۆ خوادانەران لاف لێدەدەن: ئەوانیش هاوبەشی خوان لە پەرستراندا، هەر کاتێ تەنیا باسی خوا کرا.

٢)- ﴿ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، دڵیان دەگووشرێ، (**الإِشْمِئْزَازُ: شِدَّةُ الكَرَاهِيَةِ وَالنُّفُور**)، (إشمئزاز) زۆر ڕق لێبوونەوەو زۆر لێ سڵەمینەوەیە، (**الإِشْمِئْزَاز: أَنْ يَمْتَلِئَ قَلْبُه غَمّاً حَتَّى يَظْهَر الإِنْقِبَاضُ فِي أَدِيْمِ وَجْهِهِ**) (إشْمِئْزَاز) ئەوەیە کە مرۆڤ دڵی پڕ بێ لە خەم، هەتاکو پێستی دەم و چاوی کە ڕێک دێ و گرژ دەبێ، پێوەی دیار بێ.

٣)- ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ ﴾، بەڵام کاتێک کە ئەوانەی دیکەی جگە لەو باس بکرێن، واتە: پەرستراوەکان کە لە خوار خواوەن، جگە لە خوا.

٤)- ﴿ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، یەکسەر ئەوان دڵخۆش و شادمان دەبن، (**الإِسْتِبْشَارُ: شِدَّةُ الفَرَحِ حَتَّى يَظْهَرَ أَثَرُ ذَلِكَ عَلَى بَشْرَةِ الوَجْهِ**)، (اسْتِبْشار): بریتیە لە زۆر دڵ خۆش بوون، هەتا شوێنەواری ئەوە لەسەر پێستی دەم و چاوی دەردەکەوێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾، یەکسەر ئەوان دەبینی دڵخۆش دەبن، بە کرداری بەردەوام (فِعْل المُضَارِع) هێناویەتی، چونکە دڵخۆشییەکەیان جار بۆ جار تازە دەبێتەوە.

لێرەدا وەک دەبینین: سێ جاران وشەی (إِذَا) بەکارهاتوە: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (إِذَا)ی یەکەم، هەروەها (إِذَا)ی دووەم، دوو (ظَرف)ن، کە مانای مەرجیان تێخراوە، یانی: بە مەرجێک خوا ﷻ بەتەنیا باس بکرێ، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، دڵیان پێی دەگووشرێ و، بە مەرجێک ئەوانەی جگە لە خوا، باس بکرێن، ئەوان شادمان و دڵخۆش دەبن، بەڵام (إِذَا)ی سێیەم: ﴿ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾، ئەم (إِذَا)یە بۆ (مُفَاجَأَة) کت و پڕە، یانی: کاتێک کە جگە لە خوا باس دەکرێ، باسی بت و صەنەمەکانیان دەکرێ، یەکسەرو بە پەلەو کت و پڕ دڵخۆشیی ڕوویان تێدەکات.

هەڵوەستەیەکی پێویست:

لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەوەبین، کە ژمارەیەکی زۆریش لەوانەی لەسەر ئیسلام حیساب دەکرێن، بەڵام شوێن ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکان دەکەون، هەمان حاڵەتی کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە کاتی خۆی هەیانبووە، هەیانە، ئەگەر باسی ئیسلام بکەی، دڵیان دەگووشرێ، یان دیاردەیەکی دینداریی و ئیسلامەتیی ببینن، دڵیان پێ دەگووشرێ، ئافرەتێک بە سەرپۆشەوە ببینن، گەنجێک بە ڕیشەوە ببینن، یان گوێیان لە بانگ بێ، یان کەسێک کە باسی خوا ﷻ بکات، دڵیان دەگووشرێ، بەڵام کاتێک باسی ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکانی خۆیان بکرێ، دڵیان فەرەحنایی بۆ دێ، یان باسی بەرپرسێکی جگە لە حیزبەکەی خۆیان بکرێ، دڵیان دەگووشرێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەهلی ئیسلام و ئیمان بێ، هەیە هەر چاوی هەڵنایەت تەماشا بکات، هەیە هەر تەحەممول ناکات گوێ لە قسەی بگرێ،

بەڵام کاتێک کە باسی بەرپرسەکانی خۆیان، یان سەرکردەکانی خۆیان دەکرێ، با هیچ پەیوەندییەکیان بە خواو پێغەمبەرەوەش ﷺ نەبێ، شادمان و دڵخۆش دەبن، کەچی خۆشیان بە مسوڵمان دەزانن! کە بە تەئکید هەر کەسێک بە خوا دڵخۆش نەبێ، بە ئەهلی خوا دڵخۆش نەبێ، بەوانەی بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن و، بە دوای ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون و، کتێبی خوایان بە دەستەوەیەو لە باوەش گرتوەو، لەسەر سەری خۆیانی دادەنێن، دەیانەوێ شەریعەتی خوا پیادە بکرێ لە ژیانی تایبەتیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی دا، هەر کەسێک دڵی بەوانەوە خۆش نەبێ، کەیفی بەوانە نەیەت، مانای وایە هەر هەمان عادەتی موشریکەکانی هەیە، چونکە کە دڵی بەوانە خۆش نابێ، بە پێچەوانەوە دڵی بە بەرپرسێکی خۆی خۆش دەبێ، کە ڕەنگە وەک کوردەواریی دەڵێن: (نیو تەنەکە شەڕاب لە گەدەیدابێ)، ئەهلی قومار بێ و، داوێن پیس بێ، ئەهلی قەتڵ بێ، حەرامخۆر بێ، کەچی دڵی بەو خۆشە، بەڵام دڵی بە مسوڵمانێکی پاک و چاک و ڕاست و ساغ و دادگەرو بە ڕەحم خۆش نیە، لەبەر ئەوەی لە حیزبەکەی خۆی نیە، ئنجا ئایا ئەوە فەرقی چییە لەگەڵ عادەتی هەمان ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرانەی، کە لەسەردەمی نەفامیدا بوون و، دژایەتیی پێغەمبەری خواو ﷺ ئایین و پەیامەکەیان کردوە، کە زانیویانە ئەگەر ئەو پەیامە خواییە، بچەسپێ و، ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەگەر ڕێبازەکەی ببێتە بەرنامەی ژیان و، پەیامی قورئان بچەسپێ، ئەو زلە زلە خۆسەپێنانەو، ئەو قۆرخکارانەو، ئەو گەندەڵکارانە بازارەکەیان لێ تێکدەچێ؟!.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە بە ناوی داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا یادی بکات و، داوای لێبکات: دادوەریی بکات لە نێوان بەندەکانیدا، بۆ ئەکلاییکردنەوەی ئەو شتانەی تێیاندا کەوتوونەتە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، بڵێ: ئەی خوایە! داهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوی.

٢)- ﴿ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، زانای پەنهان و ئاشکرا.

٣)- ﴿ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾، هەر تۆ دادوەریی دەکەی لە نێوان بەندەکانتدا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی و مشت و مڕەوە.

**لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، ئەم دەقەی سوننەت دێنین:**

**{عَنْ عائشة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَفْتَتِحُ صَلَاتَهُ: «أَللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ} (أخرجه البخاري: ٦٧٠، ومُسْلِمٌ: ٧٦٧، والترمذي: ٣٠٤٢٠، وابن ماجه: ١٣٥٧).**

واتـە: دایکمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـک بە شـەوێ هەڵدەسـتا، (واتـە: بـۆ شـەو نوێـژ)، نوێـژی دەسـت پـێ دەکـرد، (پێـش ئەوەی نوێژەکـەی دەسـت پێبـکات، یاخـود لـە نوێژەکەیـدا لـە جیـاتی دوعـای ئیسـتیفتاح) دەیفەرمـوو: ئـەی خوایـە! پـەروەردگاری جیبریـل و میکائیـل و ئیسـرافیل، پەیداکـەرو داهێنـەری ئاسـمانەکان و زەوی، زانـای پەنهـان و ئاشـکرا، هـەر تـۆ دادوەریـی دەکـەی لـە نێـوان بەندەکانتـدا، لەوەدا کە تێیـدا کەوتوونەتـە مشـتومڕو ڕاجیاییـەوە، ڕێنماییم بکـە بـۆ ئـەو هەقـەی کـە ئـەوان تێیدا کەوتوونـە ڕاجیایـی، بـە دڵنیایـی هـەر تـۆ هـەر کەسـێ بتـەوێ ڕێنمایـی دەکـەی بـۆ ڕێـی ڕاسـت.

## سێ کورتە سەرنج

١- کە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، وشەی (فَاطِر) پێشتریش باسمان کردوە بە تایبەتی لە سەرەتای سوورەتی (فَاطِر)دا، کە (فَاطِر) لە (فَطْر) هاتوەو بە مانای لەتکردنە، (فَاطِر) واتە: داهێنەرو، پەیداکەر لە نوێ، کەسێک شتێک دروست بکات کە پێشینەی نەبووبێ.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، (الغَيْبُ: مَا خَفِيَ وَغَابَ عَنْ عِلْمِ النَّاس)، (غَيْب): ئەوەیە کە پەنهانە، واتە: شێردراوەیە لە زانینی خەڵک، (الشَّهَادَةُ: ما يَعْلَمُهُ النَّاسُ مِمَّا يَدْخُلُ تَحْتَ الإِحْسَاسِ)، (شَهَادَة) واتە: بینراو، ئەوەیە کە خەڵک دەیبینێ و، بە پێنج هەستەکانیان پەی پێ دەبەن.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، ئەمە هەواڵێکە لە سەرەتای پاڕانەوەکەوە، ﴿ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ ﴾، هەرتۆ دادوەریی دەکەی لە نێوان بەندەکانتدا، ئنجا کە وشەی (أَنْتَ) پاڵوەلادراو (مُسْنَدُ إِلَيْهِ)یە، پێشخراوە، (لإِفَادَةِ الإِخْتِصَاص)، بۆ ئەوەیە کە تایبەتمەندیی بگەیەنێ، یانی: تەنیا تۆ دادوەریی دەکەی لە نێوان بەندەکانتدا، ﴿ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، (مَا: مَوْصُولَةٌ وَكَوْنُ خَبَرِ (كَانَ) مُضَارِعاً لإِفَادَة تَجدُّد الإِخْتِلَاف)، (ما) بە مانای (الذي)یە، واتە: (فِي الَّذِي كَانُوا فِيْهِ يَخْتَلِفُون)، لەوەدا کە تێیدا ڕاجیابوونە، بۆیەش گوزارەی (كان) بە کرداری بەردەوام (فعل المُضَارِع) هاتوە، چونکە ئەو ڕاجیایی و کەوتنە مشتومڕەی خەڵک، تازە دەبێتەوەو بەردەوامە.

مەسەلەی شەشەم:

بێبڕوایانی ستەمکار ئەگەر گریمان لە ڕۆژی دواییدا، پڕی زەوی و هێندەی دیکەش سامان و ماڵیان هەبێ، دەیکەنە بەلاگێڕەوەو قەرەبوویان لە سزای خراپ و سەخت و، شتانێکیان لە لایەن خواوە بۆ دەردەرکەون، کە بە خەیاڵیاندا نەهاتوون، سزای کردەوە خراپەکانیان بۆ ئاشکرا دەبێ، سزای ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، گەمارۆ و ئابلۆوقەیان دەدات:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ ﴾، ئەگەر ئەوانەی ستەمیان کردوە هەیانبووایە، هەرچی لە زەویدا هەمووی تێکڕاو، وێنەی خۆیشی لەگەڵیدا، واتە: ئەوەی لە زەویدا هەیە، لە سەروەت و سامان و هێندەی دیکەشی خرابایە گەڵ لە ڕۆژی قیامەت دا، دەیانکردە قەرەبوویان، (أي: لَوْ أن ذَلِكَ مُلْكٌ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَافْتَدَوْا بِهِ يَوْمَئِذٍ).

٢)- ﴿ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ ﴾، دەیانکردە قەرەبوویان و بەلا گێڕەوەیان، (الإفْتِدَاءُ بِالشَّيءِ: جعل فدية)، (إفتداء) یانی: کردنە بەلا گێڕەوەو قەرەبوو، یانی: شتێک ببەخشی تاکو ئەو شتەت لە کۆڵ بێتەوە کە جێگای مەترسییە، یانی: ئەگەر ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا، گریمان پڕی هەموو دنیا سەروەت و سامانیان هەبێ و هێندەی دیکەشی لەگەڵدابێ، لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووی دەکەنە بەلاگێڕو قەرەبووی خۆیان، بەس دەربازیان بێ لە سزای خوا.

٣)- ﴿ مِن سُوٓءِ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، لە ئازاری خراپ لە ڕۆژی قیامەت دا، (مِنْ)، دەگونجێ بە دوو واتایان بێ:

أ- یان بۆ (بَدَل)ە، (أي: بَدَلًا عَن سُوءِ العَذَاب)، واتە: (مِنْ) بە مانای جێدار دێ، یانی: بێتە جێگرەوەی سزای خراپ لە ڕۆژی قیامەت دا.

ب- یاخود (مِنْ) لێرەدا بە مانای (ل)ی (من أجل)ە: (لَافْتَدَوْا بِهِ لأَجْلِ العَذَابِ السَّيءِ الَّذِي شَاهَدُوهُ)، یانی: دەیانکردە بەلاگێڕی خۆیان لە پێناوی دوورخستنەوەی ئەو ئازارە خراپەدا کە بینیویانە.

٤)- ﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ﴾، لە لایەن خواوە شتێکیان بۆ دەرکەوت، کە بە خەیاڵیان دا نەدەهات.

(مَا) (موصولة)یەو، مانای شتی نەزانراو (مبهم) دەگەیەنێ، واتە: شتێکیان بۆ دەرکەوت کە حیسابیان بۆ نەکردو چاوەڕوانییان نەدەکرد، وشەی (بَدَا)، یانی: دەرکەوت (ظَهَرَ)، (وَبَدَا لَهُمْ مِنَ اللهِ مِنْ إِبْتِدَائِيَّةٌ أي: مِنْ جِهَةِ اللهِ)، لە لایەن خواوە بۆیان دەرکەوت.

﴿ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ﴾، شتێکە کە بە خەیاڵیان دا نەدەهات و چاوەڕوانییان نەدەکرد، (الإِحْتِسَابُ: مُبَالَغَةٌ فِي الحِسَابِ بِمَعْنَى الظَّن)، (إحتساب) زێدەڕۆییە لە حیساب کردن یانی: گومان دا، واتە: پێیان وانەبوو ئەوەیان بۆ بێت، کە ئێستا بۆیان دەرکەوتوە.

٥)- ﴿ وَبَدَا لَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ﴾، خراپەی ئەوەی وەدەستیان هێنا بوو، بۆیان دەرکەوت، هەڵبەتە لێرەدا شتێک قرتێنراوە، واتە: (بَدَا لَهُمْ عِقَابُ سَيِّئَاتِ مَا كَسَبُوا)، واتە: سزای کردەوە خراپەکانی کە وە دەستیان هێناون، بۆیان دەرکەوت، (سَيِّئَات) کۆی (سَيِّئَة)یە، (وَهُوَ وَصْفٌ أُضِيفَ إِلَى مَوْصُوفِهِ، وَهُوَ الْمَوْصُولُ، مَا كَسَبُوا، أَيْ: بَدَا لَهُمْ مَكْسُوبَاتُهُمُ السَّيِّئَاتِ)، وەدەستهێنراوە خراپەکانیان بۆیان دەرکەوتن، یاخود: سزای وەدەستهێنراوە

خراپەکانیان، بۆیان دەرکەوت، چونکە ﴿سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُواْ﴾، وەسفێکە پاڵدراوەتە لای وەسفکراوەکەی کە (ما)یە، واتە: (مَكْسُوبَاتهمُ السَّيِّئَات)، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُواْ﴾، (بَدَا لَهُمْ جَزَاءُ مَكْسُوبَاتِهِمُ السَّيِّئَات) واتە: سزای تۆڵەی وەدەستهێنراوە خراپەکانیان، بۆ دەرکەوت.

٦)- ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾، ئەوەی گاڵتەشیان پێدەکرد دابەزیە سەریان و دەوری دان.

(حَاقَ: أي نَزَلَ، ثَبَتَ، أَحَاطَ)، واتە: دابەزیی، چەسپا، گەمارۆیدا، واتە: سزای ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، دەوری دان، ئەگەرنا خودی گاڵتەپێکراوەکە دەوری نەداون، بەڵکو یانی: سزایەکەیان بۆ دەرکەوت، یاخود مەبەست ئەوەیە: ئەوان گاڵتەیان بە ئازارو سزای خوا کردوە، ئنجا ئەو ئازارو سزایەش دەوری داون، (أي: عَذَابُ اللهِ الْمُسْتَهْزَءُ بِهِ مِنْ قِبَلِهِم)، سزاو ئازاری خوای کە لە لایەن وانەوە گاڵتە پێکراو بوو، ئەوە دەوری دان.

(سفيان الثوري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین، واتە: شوێنکەوتەی هاوەڵان کە بە دوای ئەواندا هاتوون، لە بارەی ئەم ئایەتەوە گوتوویەتی: (وَيْلٌ لِأَهْلِ الرِّيَاءِ، وَيْلٌ لِأَهْلِ الرِّيَاءِ، هَذِهِ آيَتُهُمْ وَقِصَّتُهُمْ)[1]، واتە: سزای سەخت بۆ ڕیا بازان، سزای سەخت بۆ ڕیابازان، ئەمە ئایەتەکەیانەو، ئەمەش بەسەرهاتەکەیانە، کە دەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُواْ يَحْتَسِبُونَ﴾، چونکە بە حیسابی خۆیان: نوێژیان کردوەو، ڕۆژوویان گرتوەو مزگەوتیان دروست کردوە، چیی و چییان کردوە، وتاریان داوە، زانیارییان بڵاوکردۆتەوە، بەڵام ئەوەی پاڵی پێوەناون ئەو شتانە بکەن، ئەوە نەبووە کە خوا ﷻ لە خۆیان ڕازیی بکەن، بەڵکو بریتی بووە لە سەرنجڕاکێشانی خەڵک بەلای خۆیاندا، بۆیە لەوێ دەبنە سەپانی پووشێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٥، ص٢١١.

﴿فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾﴾ الفرقان، واتە: ڕوومانکردە ئەوەی ئەنجامیان دابوو، کردمان بە تۆزو خۆڵ و گەردێکی بڵاوبووەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بمانپارێزێ، لەو ڕۆژەدا کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن و، خوا ﷻ یارمەتییمان بدات، کاری وابکەین کە هەر نهێنیی باشمان ئاشکرا بێ، وەک لە سوورەتی (الطارق)دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾﴾ الطارق، واتە: ئەو ڕۆژە کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن، هەروەها لە سوورەتی (الحاقة)دا، دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾﴾، لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن، هیچ شتێک لە ئێوە پەنهان نابێ، هیچ شتێکی ئێوە پەنهان نابێ لە خوای پەروەردگارو لە فریشتەکان.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**لە خوا پاڕانەوەی بابای بێبڕوا لە کاتی گرفتارییداو، یاخیی و بوغڕابوونی لە کاتی هاتداو، بێ ئاگابوون لەوەی پێی تاقی دەکرێتەوە، هەروەها بێ خەبەربوونی لە مێژووی ڕابردوو کە بێبڕوایان هەروایان گوتوە، بەڵام بێ ئەوەی هیچیان لە دەست بێ، سزای خراپەکانیان چێژتوەو، دەبووایە بشزانن کە ئەوە خوایە بژێو زیادو کەم دەکات و، لەوەشدا نیشانەی زۆر هەن بۆ بڕواداران:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَـٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ﴾، هەر کات مرۆڤ زیانی تووش بوو، ئازارێکی تووش بوو، لێمان دەپاڕێتەوە، (**الإنْسَانُ: تَعْرِيفٌ للجِنْسِ، والمُرادُ جَمَاعَةٌ مِنَ النَّاسِ، وَهُمْ أَهْلُ الشِّرْكِ فَهُوَ للإسْتِغْرَاقِ العُرْفِيِّ**)، کە دەفەرموێ: (إنْسَان) ناساندنەکەی بۆ جینسە، واتە: کۆی مرۆڤ، لێرەدا مەبەست کۆمەڵە مرۆڤێکی تایبەتن، کە لە هاوبەش بۆ خوادانەرانن، مانای وایە ئەو (أل)ی بۆ جینسەو مانای (اِسْتِغْرَاق) گشتگرتن دەگەیەنێ، گشتگرتنێکی عورفییە، نەک تێکڕای مرۆڤان، چونکە مرۆڤە بڕوادارەکان وانین.

٢)- ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ﴾، دوایی هەر کات لەلایەن خۆمانەوە چاکەمان پێ بەخشی، دەڵێ: تەنیا بەهۆی زانیارییەوە پێم دراوە، ئەو چاکەو نیعمەتە.

زانایان چوار واتایان بۆ ئەوە لێکداوەتەوە:

یەکەم: (عَلَى عِلْمٍ عِنْدِي بِالْكَسْبِ)، بە هۆی ئەوەوە کە زانیومە کەسابەت بکەم، بۆیە ئەو سەروەت و سامانەم هاتۆتە دەست، ئەو نیعمەتە.

دووەم: (عَلَى عِلْمٍ مِنَ الله بِفَضْلِي)، بە هۆی زانیاریی خواوە بە من، کە من خاوەن چاکەم و شایستەی ئەوەم.

سێیەم: (بِعِلْمٍ عَلَّمَنِي الله إِيَّاه)، بە زانیارییەک کە خوا منی فێر کردوە، ئەم کەسابەتەی پێ بکەم.

چوارەم: (قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ لِي خَيْراً مِن هَذَا فِي الآخِرَة)، من دەزانم کە لەمە باشترم هەیە لە ڕۆژی دواییدا.

خوا ﷻ دەفەرموێ:

٣)- ﴿ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ ﴾، بەڵکو ئەو (چاکەو نیعمەتە کە پێی دراو)ە، تاقیکردنەوەیە.

٤)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، واتە: زۆربەیان نازانن کە بە ماڵ و سامانەکانیان و بە نیعمەتەکان تاقی دەکرێنەوەو، دەجەربێنرێن، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، (أَي: أَكْثَرَ النَّاسِ المَفْهُوم مِنَ السِّيَاقِ، وَإِنْ لَمْ يَجِر لَهُمْ ذِكْرٌ، وَالأَكْثَرُهم: أَهْلُ الكُفْرِ وَالشِّرْكِ)، یانی: زۆربەی خەڵک کە ئەوە بەپێی سیاق دەزانرێ هەرچەندە باسیشیان نەکرابێ، کە مەبەست ئەهلی کوفرو شیرکە، زۆربەی مرۆڤەکانیش لێرەدا مەبەست پێیان بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرەکانن، ئەوانە زۆربەیان نازانن، ئەگەر زانیبایان قسەی وایان نەدەکرد.

٥)- ﴿ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەم قسەیە ئەوانی پێشووشیان کردیان، ڕاناوی (ها) لە (قالها)دا، (أَي: تِلْكَ الكَلِمَة) ڕاناوەکە بۆ ئەو قسەیە دەچێتەوە: (قَدْ قَالَ تِلْكَ الكَلِمَة)، ئەو قسەیەی گوت و کرد، ﴿ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانەی کە لە پێش وانیشەوە بوون،

لە بیربڕوایان ئەوانیش خۆیان هەڵدەکێشا بە ماڵ و سامانەوەو دەیانگوت: بە شان و شەوکەتی خۆمان وەدەستمان هێناوە.

٦)- ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، بەڵام هیچ سوودی پێنەگەیاندن ئەوەی وەدەستیان هێنا، ئەگەر (مَا) لابەرە (نافية) بێ، ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم ﴾، ئەوەی وەدەستیان دەهێنا، سوودی پێ نەگەیاندن، لە کاتێکدا خوا ﷻ ویستی سزایان بدات، یاخود: (ما) بۆ پرسیارکردن (إسْتِفْهَامِيَة)ە، ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، ئنجا ئایا ئەوەی وەدەستیان هێنا، چ سوودێکی پێ گەیاندن؟ ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

٧)- ﴿ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ﴾، کردەوە خراپەکان کە وەدەستیان هێنابوون، تووشیان بوون، واتە: سزایەکەیان، (أَي: عِقَاب مَكْسُوبَاتِهِمُ السَّيِّئَاتِ)، سزای وەدەستهێنراوە خراپەکانیان بەسەرهات، تووش بوو.

٨)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ﴾، ئەوانەش کە ستەمیان کردوە لەوانە، خراپەی ئەوەی کردوویانە، تووشیان دەبێ، واتە: سزایەکەی.

یانی: لەوانەی ڕۆژگاری تۆ ئەی پێغەمبەری خاتەم! ﷺ تاکو خەڵکی دنیا بە کۆتا دێ، چونکە هەم ئەهلی مەککەو عەرەبەکانی ئەو کاتە دەگرێتەوە، کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ، هەم ئەوانی دیکەش هەموویان ئۆممەتی پێغەمبەرن و ﷺ بۆ لای هەموویان نێردراوە.

کەواتە: ئەو یاسایە گشتگیرە بۆ هەموو لایەک.

٩)- ﴿ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴾، ئەوان دەستە وسانکەریش نین، یانی: دەستەوسانکەری ئێمە نین، بەڵام بەرکاری ناوی بکەر (مَفْعُول بِهِ إِسْمُ فَاعِل)ەکە قرتێنراوە، چونکە ڕەوتەکە دەیگەیەنێ، واتە: (وَمَا هُمْ بِمُعْجِزِيْنَا)، یاخود: (وَمَا هُمْ بِمُعْجِزِيْن لَنَا) دەستەوسانکەری ئێمە نین، ئەگەر بمانەوێ سزایان بدەین لە دەستمان دەربازبن.

١٠)- ﴿ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾، ئایا نەیانزانیوە کە خوا ﷻ بژێو بۆ هەر کەسێک بیەوێ فراوان دەکات و، وەتەنگ دێنێ، واتە: زۆر دەکات و کەم دەکات، ئەم پرسیارکردنەش پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، کە بۆچی نازانن؟ نکووڵییلێکردنەکەش لە نەزانینەکەیان نیە، بەڵکو لەوەیە کە کارێکیان کردوە نەزانن، بە هۆی بێ ئیمانییەوە، ئەگەر ئیمانیان هێنابایە، دەیانزانی، ئەگەر ئینسان پەیوەندیی لەگەڵ خوادا هەبێ، لە کارەکانی خوا تێدەگات و دەستی خوا دەبینێ لە شتەکاندا، یاساکانی خوا دەبینێ، نهێنییەکانی حوکمڕانیی خوا دەبینێ، بەڵام کە خوای نەناسیی، دەیگێڕێتەوە بۆ شتی دیکە، بۆ شانس و بەخت و، ڕێکەوت و سروشت و، ئەو شتە ئەفسانەییانە.

١١)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێک بڕوابێنن.

واتە: نیشانە هەن کە دەستوەردان و دەستکاریی کردن لە گەردووندا بە گشتیی و لە ژیانی بەشەردا بە تایبەتیی، تەنیا هی خوای بەرزە، بۆیە پێویستە هەر ئەویش بپەرستن، لەو نیشانانەش ئەوەیە کە خوا ﷻ بەهێزەو، هەر کەسێکیشی بوێ، بەهێزی دەکات و، هەر کەسێکیش بیەوێ، بێهێزی دەکات، هەروەها خوا ﷻ هەر خۆی چاکە دەکات و چاکەکەی پەکی لەسەر تکاکردن و ڕەجای کەس نەکەوتوە، ئەگەر ئێمە ئێستا لە خوا دەپاڕێینەوە، خوایە! فڵان شتم دەوێ و، فڵان شتە لە زیان لا ببەو، فڵان سوودم بۆ بێنە، بەڵام خوا ﷻ ئێمەی هەموومان لە منداڵدانی دایکمان دا دروست کردوەو، هەموو ئەندامەکانی پێداوین، هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابینکردووین، بەر لەوەی هیچ داوامان لە خوا کرد بێ! پاشان خوا ﷻ بە زاتی خۆی ئەنجامدەری هەر شتێکە کە بیەوێ بیکات، ئەنجامدانی کارەکانی، پەکی لەسەر هیچ هۆکارێک نەکەوتوە، خوا هەر شتێک بیەوێ ئەنجامی دەدات، بەڵام بە دڵنیایی خوا ﷻ یاسای وایە کارەکانی خۆی لە میانی هۆکارەکاندا، لە میانی یاساکاندا جێبەجێ دەکات.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لە فەرمایشتی خوا تێبگەین و، زیاتر پێوەی پابەندبین و، ئەو ڕاستییانەی قورئان دەیانفەرموێ، زیاتر لە عەقڵ و دڵماندا بیانچەسپێنین، بۆ ئەوەی هەم ژیانی دنیامان ژیانێکی بەختەوەرانەو سەربەرزانەو، هەم لە دواڕۆژیشدا سەربەرزو سەرفرزبین و شایستەی ئەوە بین بڵێین: خوایە! بەندەی تۆ بووین و، شوێنکەوتووی پەیامبەری تۆ بووین ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان پـازدە (١٥) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٥٣ - ٦٧)، تـەوەری سـەرەکییان بـاسی گەڕانـەوەی بەنـدە لادەرو لارەکانـە بـەرەو لای خـوا ﷻو، هاندانیانـە لـە لایـەن خـوای میهرەبانـەوەو، بـاسی چۆنیەتیـی گەڕانەوەیانـە.

هەروەهـا خسـتنە ڕووی ناکامـی شـووم و پـڕ شـەرمەزاریی ئـەو مرۆڤانەیـە، کـە بـەرەو لای خـوای بەخشـندە ناگەڕێنـەوە، دوای تـاوان و لادان.

پاشـان بـاسی تەنیـا بەدیهێنەرایەتیـی و سەرپەرشـتیارێتیی خوایـە، بـۆ گـەردوون و ژیـان و مـرۆڤ.

دوایـی بـاسی یەکتایـی خوایـە لـە پەرسـتراندا، وەک ئەنجامێکـی سرووشـتیی تەنیـا بەدیهێنـەرو سەرپەرشـتیاربووونی خـوا.

لـە کۆتاییشـدا ئاماژەیەکـی گـەورەو مـەزن، بـە پایـەی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوا ﷻ کـراوە، کـە گـەردوون بەسـەرو خواریـەوە، لـە ژێـر ڕکێـف و دەسـتەڵاتی ئەودایـە.

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ
ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ
أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن
رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن
تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ
تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ
لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ

بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟
عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ
ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ
شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا
ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ
وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُوا۟
ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ
بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم! کە دژی خۆیان زێدەڕۆییان کردوە (خۆیان گوناهبار کردوە!) لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، بە دڵنیایی خوا ویکڕا لە تێکڕای گوناهان دەبووری، چونکە بێگومان تەنیا ئەو لێبوردەی بە بەزەییە ﴿٥٣﴾ هەروەها لە ناخەوە بۆ لای پەروەردگارتان بگەڕێنەوەو بۆی ملکەچ بن، بەر لەوەی (سزاو) ئازار (ی خوا)تان بۆ بێ، ئنجا پشتیوانییشتان لێ نەکرێ ﴿٥٤﴾ هەروەها شوێن باشترینی ئەو (پەیام)ە، بکەون کە لە پەروەردگارتانەوە بۆ لاتان دابەزێنراوە، بەر لەوەی (سزاو) ئازاری کت و پڕ (لە ناکاو) (ی دادگەرانەی خوا)تان بۆ بێ، لە حاڵێکدا کە ئێوە هەست ناکەن ﴿٥٥﴾ (بگەڕێنەوە بۆ لای خوا) نەوەک کەسێک بڵێ: ئەی خەفەت و پەشێمانیی بۆ من، لەسەر ئەوەی ئەو کەمتەرخەمییەم کرد لە بەرانبەر خوادا، هەروەها من لە گاڵتەکەرانیش بووم ﴿٥٦﴾ یان بڵێ: ئەگەر خوا ڕێنمایی کردبام، مسۆگەر لە پارێزکاران دەبووم

﴿٥٧﴾ یان کاتێک (سزاو) ئازار(ی خوا) دەبینێ، بڵێ: ئەگەر گەڕانەوەیەکم (بۆ دنیا) هەبێ (بگەڕێمەوە بۆ لای خواو سەرەنجام) لە چاکەکاران بم (بە ئامانج دەگەم) ﴿٥٨﴾ با (ڕاست نیە کە ڕێنمایی خوات بۆ نەهاتبێ) بە دڵنیایی ئایەتەکانمت بۆ هاتن، کەچی بە درۆت دانان و خۆت بەزلگرت و لە بێبڕوایان بووی ﴿٥٩﴾ ڕۆژی قیامەتیش ئەوانەی درۆیان بە خواوە هەڵبەستوە (گوایە هاوبەشی هەن، یان ڕۆڵەی هەن)، دەیانبینی ڕووەکانیان ڕەشهەڵگەڕاون، ئایا لە دۆزەخدا جێگا بۆ خۆ بەزلگران نیە؟! ﴿٦٠﴾ ئەوانەش کە پارێزیان کردوە، خوا بە هۆی سەرفرازییانەوە ڕزگاریان دەکات، نەخراپەیان تووش دێ و، نە پەژارەیان دەبێ ﴿٦١﴾ خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، پارێزەرو سەرپەرشتیارە بەسەر هەموو شتێکەوە ﴿٦٢﴾ کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی وین و، ئەوانەش کە بێبڕوابوون بە ئایەتەکانی خوا، هەر ئەوان زیانبارن ﴿٦٣﴾ (ئەی موحەممەد! ﷺ) بڵێ: ئەی نەفامینە! ئایا فەرمانم پێدەکەن کە جگە لە خوا بپەرستم؟ ﴿٦٤﴾ بە دڵنیاییش سرووشت بۆ لا کراوەو، بۆ لای ئەو (پێغەمبەر)انەی پێش تۆش (کە) ئەگەر هاوبەش (بۆ خوا) دابنێی، مسۆگەر کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو، بێگومان لە زیانبارانیش دەبی ﴿٦٥﴾ (هاوبەش بۆ خوا دامەنێ) بەڵکو تەنیا خوا بپەرستەو، لە سوپاسگوزارانیش بە ﴿٦٦﴾ بێبڕوایان وەک شایستەی پایە(ی بێوێنە)ی خوایە، ڕێزیان نەگرت، لە حاڵێکدا کە لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی بە چەنگییەوەیەو، ئاسمانەکانیش بە پێچراوەیی بە (دەستی) ڕاستیەوەن! (خوا) پاکەو بەرزە لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٦٧﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَسۡرَفُواْ): (السَّرَفُ: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الإنْسَانُ، وَإنْ كَانَ ذَلِكَ فِي الإنْفَاقِ أَشْهَرُ، المُسْرِفُون، المُتَجَاوِزُونَ الحَدَّ فِي أُمُورِهِم)، وشەی (سَرَفُ): بریتیە لە سنووربەزاندن لە هەر کردەوەیەکدا کە مرۆڤ دەیکات، هەرچەندە لە ماڵ خەرجکردندا باوترە، (مُسْرِفُون) واتە: ئەوانەی سنوور دەبەزێنن لە کاروباری خۆیاندا.

(لَا تَقۡنَطُواْ): واتە: نائومێد مەبن، بێ هیوا مەبن، (القُنُوطُ: اليَأْسُ مِنَ الخَيْرِ)، (قُنُوط): نائومێدبوونە لە چاکە.

(وَأَنِيبُوٓاْ): (النَّوْبُ: رُجُوعُ الشَّيءِ مَرَّةً بَعْدَ أُخْرَى، الإنَابَةُ إلى اللّهِ، الرُّجُوعِ إلى اللّهِ بِالتَّوْبَةِ وَإخْلَاصِ العَمَلِ)، وشەی (أَنِيبُوا) لە (نوب)ەوە هاتوە، (نَوب): بریتیە لە گەڕانەوە لە شتێک، جار لە دوای جار، (الإنَابَة إلى اللّه) گەڕانەوەیە بۆ لای خوا بە کردەوەو بە ساغکردنەوەی کردەوەکانەوە بۆ خوا ﷻ، کە خڵتەی شیرک و ڕیایان پێوە نەمێنێ.

(بَغۡتَةً): واتە: کت و پڕ، لە ناکاو، (البَغْتُ: مُفَاجَأَةُ الشَّيءِ مِنْ حَيْثُ لَا يُحْتَسَب)، (بَغْتَة): بریتیە لەوەی شتێک کتوپڕ بێ، بە شێوەیەک کە چاوەڕوان نەکراوبێ.

(يَٰحَسۡرَتَىٰ): واتە: هەی داخ و خەفەت بۆ من، (الحَسْرَةُ: الغَمُّ عَلَى مَا فَاتَهُ وَالنَّدَمُ عَلَيْهِ)، (حَسْرَة): بریتیە لە خەفەت خواردن لە شتێک کە لە دەست چووەو، بۆ پەشێمان بوونەوەی.

(فَرَّطتُ): (مَا فَرَّطْتُ فِي كَذَا: مَا قَصَّرْتُ)، (الإفْرَاطُ: الإسْرَافُ فِي التَّقَدُّمِ، وَالتَّفْرِيطُ: التَّقْصِيرُ فِي الفَرْطِ)، (مَا فَرَّطْتُ فِي كَذَا) واتە: کەمتەرخەمییم نەکردوە، (إفْرَاط):

بریتیە لە تێپەڕاندن لە پێشکەوتنەوەدا، بەڵام (تَفْرِيط)، کورتهێنانە لەوەدا کە مرۆڤ لە پێشەوە بێ، واتە: دواکەوتن و کەمتەرخەمیی و بە زایەدان.

(جَنۢبِ): (أَصْلُ الجَنْبِ: الجَارِحَةُ، ثُمَّ يُسْتَعَارُ لِلناحِيَةِ والجِهَةِ الَّتِي تَلِيهَا)، وشەی (جَنْب) لە ئەصڵدا بە ئەندامی لاتەنیشت دەگوترێ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ ئەو لایەی کە لەولا تەنیشتەوەیە، کەواتە: (فِي جَنْبِ الله) واتە: لە بەرانبەر خواداو، لە ئاست خوادا.

(لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ): لە گاڵتە پێکەران، (سَخِرْتُ مِنْهُ: وَاسْتَسْخَرْتُ، هَزَأْتُ وَاسْتَهْزَأْتُ)، گاڵتەم پێکرد، هەم بە (سَخِرْتُ) دێ، هەم بە (اسْتَسْخَرْتُ) کە ئەوە زێدەڕۆییە، وەک (هَزَأْتُ وَاسْتَهْزَأْتُ) هەردووکیان بە مانای گاڵتەپێکردن و گەمە پێکردنن بە شتێک.

(كَرَّةً): (الكَرُّ: العَطْفُ عَلَى الشَّيءِ بِالذَّاتِ، أو بِالفِعْلِ، وَالكَرَّةُ: الرَّجْعَةُ)، (كَرّ): بریتیە لە بادانەوە بۆ لای شتێک بە خودی خۆ، یان بە کردەوە، (كَرَّة): جارێکە لە (كَرّ)، وەک (مُرُوُر) واتە: ڕۆیشتن، بەڵام (مَرَّة) واتە: یەکجار ڕۆیشتن.

(مُّسْوَدَّةٌ): ڕەشهەڵگەڕاوان، دەگوترێ: (إسْوَدَّ وَجْهُهُ) ڕووی ڕەشهەڵگەڕا.

(بِمَفَازَتِهِمْ): (الفَوْزُ: الظَّفَرُ بِالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلاَمَة)، (فَوْز): بریتیە لە وەدەستهێنانی خێرو چاکە، وێڕای سەلامەتیی و بێ مزەڕەتیی.

(لَيَحْبَطَنَّ): (الحَبْطُ مِنَ الحَبَطِ: هُوَ أَنْ تُكْثِرَ الدَّابةُ أَكْلًا حَتَّى يَنْتَفِخَ بَطْنُهَا، وَالحَبَطُ: البُطْلاَنُ)، وشەی (حبط) لە (حَبَط)ەوە هاتوە، (حَبَط)یش ئەوەیە کە ئاژەڵێک زۆر لەوەڕ بخوات، هەتا ورگی دەئاوسێ و، تەندروستیی تێکدەچێ، ئنجا (حَبْط): بریتیە لە هەڵوەشانەوەو بەتاڵ بوونەوە.

(وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ): واتە: وەک بۆ خواش شایستەیە بە مەزنیان نەگرت، (القَدَرُ وَالتَّقْدِيرُ: تَبَيِين كَمِيَّةِ الشَّيءِ)، (قَدَرٌ تَقْدِير): بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئەندازەی شتێک.

(قَبۡضَتُهُۥ): (القَبۡض: تَنَاوُلُ الشَّيء بِجَمِيْعِ الكَفّ)، (قَبۡض): ئەوەیە شتێک بە کۆی دەست و پەنجەکان بگیرێ (قَبۡضَة) واتە: چەنگ، (وَالأرۡضُ جَمِيْعَاً قَبۡضَتُهُ)، خوا ﷻ هەموو زەوی لە چەنگ دەگرێ، وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، (أي: فِي حَوْزِهِ مِن حَيْثُ لا تَمْلِيْكَ لأحَدٍ)، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە هەموو زەوی لە ژێر کۆنترۆڵی خوادایەو، هیچ کەسی دیکە بەشی پێوە نابێت.

(مَطۡوِيَّـٰتُۢ): پێچراوە، (طَوَيتُ الشَّيء طَيَّاً، وَالطَّيُّ: رَدُّ وَلَفُّ بَعْضِ شُقَقِ الثَّوْبِ، أو الوَرَقِ عَلَى بَعْضٍ، بَعْدَ أنْ كَانَتْ مَبْسُوطَةً مُنْتَشِرَةً)، (طَيّ): بریتیە لە پێچرانەوەو هێنانەوەی هەندێک لە پۆشاک بەسەر هەندێکی دیکەدا، پۆشاک یان کاغەز کە دەپێچرێتەوەو ڕێک دەنووشترێ، دوای ئەوەی بڵاو کراوەو ڕاخراوە.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکانە، کە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾، تاکو چەند ئایەتێک، لەو بارەوە چەند شتێک باسکراون، کە ئێمە دووانیان دێنین، کە لە ڕووی سەنەددوە ڕاسترن، یاخود لە ڕاستییەوە نیزیکن:

أ)- {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: لَمَّا اجْتَمَعْنَا لِلْهِجْرَةِ اتَّعَدْتُ أَنَا وَعَيَّاشُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ وَهِشَامُ بْنُ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ، وَقُلْنَا: الْمِيعَادُ بَيْنَنَا التَّنَاضِبُ مِنْ أَضَاةِ بَنِي غِفَارٍ، فَمَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ لَمْ يَأْتِهَا فَقَدْ حُبِسَ فَلْيَمْضِ صَاحِبَاهُ، فَأَصْبَحْتُ عِنْدَهُ أَنَا وَعَيَّاشُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ، وَحُبِسَ عَنَّا هِشَامٌ وَفُتِنَ فَافْتُتِنَ، فَكُنَّا نَقُولُ بِالْمَدِينَةِ: مَا اللهُ بِقَابِلٍ مِنْ هَؤُلَاءِ تَوْبَةً، قَوْمٌ عَرَفُوا اللهَ وَآمَنُوا بِهِ، وَصَدَّقُوا رَسُولَهُ، ثُمَّ رَجَعُوا عَنْ ذَلِكَ لِبَلَاءٍ أَصَابَهُمْ مِنَ الدُّنْيَا، وَكَانُوا يَقُولُونَ لِأَنْفُسِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِمْ: ﴿قُلۡ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِ

﴿٥٣﴾ الزمر، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ الزمر، قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: فَكَتَبْتُهَا بِيَدِي كِتَابًا، ثُمَّ بَعَثْتُ بِهَا إِلَى هِشَامٍ، فَقَالَ هِشَامُ بْنُ الْعَاصِ: فَلَمَّا قَدِمَتْ عَلَيَّ، خَرَجْتُ بِهَا إِلَى ذِي طُوًى، فَجَعَلْتُ أَصْعَدُ بِهَا وَأُصَوِّبُ لِأَفْهَمَهَا، فَقُلْتُ: أَللهُمَّ فَهِّمْنِيهَا، وَعلمتُ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ فِينَا، لِمَا كُنَّا نَقُولُ فِي أَنْفُسِنَا، وَيُقَالُ فِينَا، فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ عَلَى بَعِيرِي فَلَحِقْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ}[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، دەڵێ: کاتێک کە بڕیارماندا کۆچ بکەین، (واتە: لە مەککەوە بۆ مەدینە)، من و عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعەو هیشامی کوڕی ئەلعاصی کوڕی وائیلی سەهمیی، ڕێککەوتین و گوتمان: ژوانگەمان (التَّنَاضِبُ مِنْ أَضَاةِ بَنِي غِفَار) بێ (کە شوێنێکە)، لە نێوان خۆماندا گوتمان: هەر کامێکمان نەهات، ئەوە دیارە ڕێی لێگیراوەو، با هاوەڵەکەی بڕوات، دەڵێ: من و عەییاشی کوڕی ئەبوو ڕەبیعە بەیانییمان کردەوە، بەڵام هیشام ڕێی لێگیراو، ئازاردراو هەڵگەڕایەوە، (یاخود ئەو وای لێ حاڵیی بووە کە هەڵگەڕاوەتەوە)، ئێمە لە مەدینەدا دەمانگوت: ئەوانە خوایان ناسیوەو بڕوایان بە پێغەمبەرکەی ﷺ هێناوەو، دواییش بەهۆی ناڕەحەتییەکەوە کە تووشیان بووە، هەڵگەڕاونەوە، پێمان وانیە کە پەشێمان بوونەوەیان بۆ هەبێ، هەروەها بۆ خۆشیان لە دڵی خۆیاندا هەروایان دەگوت، بەڵام خوا ﷻ دەربارەیان ئەو ئایەتانەی دابەزاندن: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴿٥٣﴾﴾ الزمر، تاکو دەگاتە: ﴿مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ الزمر، عومەر ﷺ دەڵێ: بە دەستی خۆم نووسیم و بۆ هیشامم نارد، هیشامیش دەڵێ: کاتێک ئەو نامەیەم بۆ هات، ئەو ئایەتانەی تێدابوون، لەگەڵ خۆم بردن بۆ (ذِي طُوًى) (کە شوێنێکی چۆڵ بووە، بۆ ئەوەی لەوێ بیانخوێنێتەوەو تێیانەوە ڕامێنێ)، ئیدی تەماشام کردن و تێیانەوە ڕامام، گوتم: ئەی خوایە! تێمبگەیەنە مەبەست لەم ئایەتانە

---

(١) أخرجه البيهقي في الكبرى: ١٧٧٥٦، والهيثمي في المجمع (ج٦، ص٦١) وقال: رواه البزار، ورجاله ثقات.

چیە؟ دوایی بۆم دەرکەوت کە ئەو ئایەتانە لە بارەی ئێمەوە دابەزیون، کە خۆشمان لە بارەی خۆمانەوە دەمانگوت و لە بارەشمانەوە دەگوترا (خوا لێمان نابووریّ)، ئیدی گەڕامەوەو، سواری حوشترەکەم بووم و بە پێغەمبەری خواوە ﷺ پەیوەست بووم (واتە: چووم بۆ مەدینە).

ئەم بەسەرهاتە هاتوە، بەڵام نیشکالی تێدایە، مەگەر بگوترێ: ئەم ئایەتە پێشتر لە ساڵی پێنجی پێغەمبەرایەتییدا دابەزیوە ﷺ، بەڵام عومەر ﷺ ئەو کاتە ئایەتەکەی بۆ ناردوە، ئەگەرنا پێشتر دابەزیوە.

ژمارەیەک لە هۆی هاتنە خوارەوەکانیش بەو شێوەیەن، وەک جاری دیکەش باسمانکردوە، ئایەتێک پێشتر دابەزیوە، بەڵام دوایی ڕووداوێک ڕوویداوە، یەکێک لە هاوەڵان ئەو ئایەتەی کە پێشتر دابەزیوە، چەسپاندوویەتی بەسەر ئەو ڕووداوەدا کە دواتر ڕوویداوە، ئەگەرنا مەرج نیە ئەو ئایەتە، ئەو کاتە دابەزیبێ، چونکە ئەگەر ئەو ئایەتە ئەو کاتە دابەزیبێ، دەبێ ئایەتێکی مەدینەیی بێ، وەک هەندێک لە زانایان لەبەر ئەوە وایانگوتوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئایەتەکان هەموویان پێکەوە دابەزیون، لە ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیی دا، بەڵام دوایی بەسەر ڕووداوێکدا کە لە کاتی کۆچکردنی مسوڵمانان لە مەککەوە بۆ مەدینە هاتۆتە پێش، بەسەر ئەو ڕووداوەدا چەسپاندوویانە.

ب)- (عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ قَوْمٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَتَلُوا فَأَكْثَرُوا، وَزَنَوْا فَأَكْثَرُوا، فَقَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ أَوْ بَعَثُوا إِلَيْهِ: إِنَّ مَا تَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ لَو تُخْبِرُنَا أَنَّ لَنَا تَوْبَةً؟ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ٥٣﴾) (ذَكَرَهُ الْبُخَارِيُّ بِمَعْنَاهُ).

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە، کە گوتوویەتی: کۆمەڵێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان زۆریان خەڵک کوشتبوو و، زۆریان زینا کرد بوو، بە پێغەمبەریان ﷺ

گوت، یاخود کەسێکیان نارده لای: ئەوەی تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی باشە، بەڵام ئەگەر هەواڵمان پێ بدەی، ئایا دەتوانین بگەڕێینەوەو پەشێمان بینەوە؟ خوا ﷻ لە گوناهەکانمان خۆش دەبێ؟ ئیدی خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی دابەزاندن.

کە ئەمە لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا گونجاوترە لە رووی کاتەوە، دەگونجێ هەر ئەو کاتە هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی مەککە، هەندێکیان ئەو گوناهو تاوانانەی کردوویانن، بووبێتە بەربەستێک لە بەردەمیاندا، ئیدی کە خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی دابەزاندوون، ئەو بەربەستەیان لە بەردەمدا لاچووە کە دەڵێن: خوا ﷻ لە هەموو گوناهێک دەبووریّ و، با گوناهکردنی پێشوو و لادان و تاوان نەبێتە بەرپەرچ و رێگر لە بەردەم مسوڵمان بووندا، چونکە مسوڵمانەتیی پێش خۆی دەسڕێتەوە، تەوبە پێش خۆی دەسڕێتەوە، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتووە ﷺ: {الإِسْلَامُ يَجُبُّ مَا قَبْلَهُ}[1]، واتە: ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوە، واتە: گوناهەکانی پێش خۆی، گەڕانەوەش بۆ لای خوا پێش خۆی دەسڕێتەوەو گوناهەکان لەسەر بابای بۆ لای خوا گەڕاوە، لادەبات و پاکی دەکاتەوە لێیان.

---

(١) (عَنْ عمرو بن العاص رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الإسلام يَجُبُّ مَا قَبْلَهُ») رواه أحمد والطبراني والبيهقي، جزء من قصة طويلة أحمد (١٩٨/٤، ٢٠٤، ٢٠٥)، البيهقي (١٢٣/٩)، وهو لمسلم (١١٢/١) من حديثه بلفظ: «أما علمت أن الإسلام يهدم ما كان قبله، وأن الهجرة تهدم ما كان قبلها، وأن الحج يهدم ما كان قبله».

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لێرەدا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دوای ئەو ڕاستییانەی ڕابردن لە (٥٢) ئایەتی ڕابردوودا، کە ئێمە لە چوار دەرسدا خستماننەڕوو.

ئنجا ئێستا زەمینە خۆش بووە، بۆ هەر کەسێک بیەوێ بۆ لای خوا بگەڕێتەوە، هەرچەندە ئەهلی شیرک بێ، ئەهلی کوفر بێ، هەرچەندە گوناهو تاوان و لادانی زۆر بێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ﴾، ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئەی ئەو بەندانەم! کە بەرانبەر بە خۆیان زێدەڕۆییان کردوە، واتە: ئەی ئەو بەندانەی خوا، بەڵام خوای پەروەردگار پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەسپێرێ کە هەر بە ناوی خۆیەوە بانگیان بکات، ئەی ئەو بەندانەم، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی ئەو بەندانەم! کە بەرانبەر بە خۆیان زێدەڕۆییان کردوە، بە زیانی خۆیان گوناهو تاوان و لادانیان کردوە، ﴿ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، پێتان وانەبێ، بەزەیی خوا بەشی ئێوە ناکات، بەشی داپۆشین و لابردنی گوناهو تاوانەکانتان ناکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾، ئەمە بەڵگەی ئەوەی پێشەوەیە، یاخود هۆکاری ئەو قسەی پێشەوەیە: بۆیە نائومێد مەبن، چونکە بە دڵنیایی خوا لە تێکڕای گوناهان و وێکڕا دەبووڕێ، ﴿ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾، واتە: لە تێکڕای گوناهان دەبووڕێ، ﴿ جَمِيعًا ﴾، وێکڕا، واتە: پێکەوە هەموویان، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لە ڕابردوودا باسکرا، بۆچی خوا ﷻ لە تێکڕای گوناهان و وێکڕا لە هەموویان دەبووڕێ و دەیانپۆشێ؟ چونکە بە دڵنیایی هەر ئەو زۆر لێبووردەی زۆر بە بەزەیی و میهرەبانە.

﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ ﴾، لە ناخەوەش بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان، بۆی ملکەچ بن، بۆی تەسلیم بن، ﴿ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ

﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾، بەر لەوەی سزاو ئازارتان بۆ بێ و، دواییش پشتیوانتان نەبێ و سەرنەخرێن، ﴿وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم﴾، دوای ئەوەی خوا ﷻ هانی دان کە بگەڕێنەوە بۆ لای خواو، گوناهو تاوان و لادان و زێدەڕۆیی کردنیان کە زیانی بۆ خۆیان بووە، نەبێتە ڕێگرو پەرچ لە بەردەمیاندا، کە نەتوانن بگەڕێنەوە بۆ لای خواو، دوای ئەوەی هانی دان: چ پەروەردگارو خاوەنێکی زۆر میهرەبان و بە بەزەیی و لێبوردەیان هەیە، ئەو جار چۆنیەتی گەڕانەوەکەیانی پێگوتن کە بریتیە لەوەی: لە ناخەوە بگەڕێنەوە، لە دەروونەوە بگەڕێنەوە بۆ لای خواو، بە ڕواڵەتیش ملکەچ بن، بەرلەوەی ئازارو سزایەکتان بۆ بێ، دواییش پشتیوانییتان لێ نەکرێ.

ئنجا ڕێبازی گەڕانەوەکەیان پێ دەڵێ: ﴿وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم﴾، بکەونە شوێن باشترین شتێک کە لە پەروەردگارتانە بۆتان دابەزێنراوە، کە بریتیە لە قورئان، بریتیە لە پەیام و بەرنامەی خوا، دوا پەیامی خوا کە بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد دا ﷺ ڕەوانی کردوە، دەفەرموێ: ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، بەرلەوەی ئازارو سزاتان لە ناکاو و کتوپڕ بۆ بێ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، لە حاڵێکدا کە هەستی پێ ناکەن، لە لایەکەوەو بە شێوەیەک کە ئێوە حیسابتان بۆ نەکردوەو، نەگەرتان بۆ دانەناوە، ئنجا ئەوەی بە ڕووداو دەچێ، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا خەڵکێکی بە ڕووداوی هاتووچۆ دەچێ، ئەوەی بە نەخۆشییە کتوپڕەکانی وەک جەڵتەو سەکتە، دەچێ، ئەوەی بە نەخۆشییەکانی دیکەی وەک شێرپەنجەو نەخۆشییەکانی دیکە دەچێ، بەبێ ئەوەی حیسابی بۆ کردبێ و لەبەرچاوی گرتبێ.

﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ﴾، نەبادا کەسێک لە ئەنجامی ئەوەدا کە مردنی کتوپڕی دەگاتێ، بڵێ: هەی داخ و خەفەت بۆ من، بە هۆی ئەوەوە کە لە خزمەت خواداو، لە ئاستی خوادا کەمتەرخەمیم کرد،

﴿ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾، هەروەها داخ و خەفەت و پەشیمانیی بۆ من، کە لە گاڵتەپێکەران بووم، گاڵتەم بە ئایین و پەیامی خوا دەکرد، یاخود بە شێوەیەک مامەڵەم لەگەڵدا دەکرد، وەک گاڵتەپێکردن بوو، وەک من لە کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان)دا - کە لە چاپی سێیەمیدا ناوەکەمان گۆڕیوە بۆ (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ڕێچکان) - باسمکردوە کە جاری وا هەیە ئایین بازرگانیی پێوە دەکرێ و، جاری وا هەیە گاڵتەی پێدەکرێ و دەکرێتە مەسخەرە، نەک هەر لە لایەن کەسانێکەوە کە دژو نەیارینی، بەڵکو جاری وا هەیە لە لایەن هەندێ لە شوێنکەوتووانیەوە، بە شێوەیەک مامەڵەی لەگەڵ ئایینی خوادا دەکرێ، وەک گاڵتەپێکردن وایە، بۆ وێنە: کەسێک کە باسی ئیسلام دەکات، بەڵام کردەوەکانی، شێوەی ژیانی، هەڵوێستەکانی، پێچەوانەی ئیسلامن، لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێکە لە گاڵتەکردن بە ئایین و بەرنامەی خوا.

﴿ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، هەروەها ئەوەک یەکێک، بڵێ: ئەگەر خوا ﷻ منی ڕێنمایی کردبایە، من لە پارێزکاران دەبووم، واتە: بگەڕێنەوە، ئەوەک کەسێک دوایی لەسەرە مەرگ دا، یاخود لە ڕۆژی قیامەتدا، ئاوا بڵێ.

﴿ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ ﴾، هەروەها ئەوەک کەسێک لە کاتێکدا سزاو ئازاری خوا دەبینێ، بڵێ: ﴿ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئەگەر یەکجار گەڕانەوەم بۆ هەبووایە، لە قیامەتەوە گەڕابامەوە دنیا، جارێکی دیکە تاقیکرابامەوە، ﴿ فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئنجا لە چاکەکاران دەبووم، ئەگەر وابووایە ئەو کاتە من بە ئامانج دەگەیشتم و زۆر خۆشحاڵ دەبووم، ئنجا بۆ ئەوەی ئەو قسانە نەکات و، ئەو خەیاڵ پلاوانە نەکات، ئێستا با بگەڕێتەوە، ئنجا لە وەڵامی ئەوەدا کە دەڵێ: ﴿ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى ﴾، ئەگەر خوا ﷻ منی ڕێنمایی کردبایە، ﴿ لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، ئەوە من لە پارێزکاران دەبووم، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى ﴾، ڕاست ناکەی کە

خوا ﷻ تۆی ڕێنمایی نەکردوە، با ڕێنمایی کردی، ئایەتەکانی منت بۆ هاتن، ﴿ فَكَذَّبْتَ بِهَا ﴾، تۆش بە درۆت دانان، ﴿ وَٱسْتَكْبَرْتَ ﴾، خۆشت بەزلگرت لە بەرانبەریانداو، لە بەرانبەر ئەو کەسەدا کە ئایەتەکانی بۆ خوێندیەوە، کە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ یاخود جێگران و جێنشینانی پێغەمبەری خاتەمن ﷺ لە زانایان و پێشەوایان، ﴿ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، تۆ لە بێبڕوایان بووی، یاخود تۆ لە سپڵەو نا سوپاسان بووی، کافر دەگونجێ لە (کفر)، بێبڕواییەوە هاتبێ، دەشگونجێ لە (کفران) بە واتای سپڵەیی و ناسوپاسییەوە هاتبێ.

﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا، ئەوانەی درۆیان بۆ خوا ﷻ هەڵبەستوە، گوتوویانە: هاوبەشی هەیە، ڕۆڵەی هەیە، ئەو بیرۆکە ئەفسانەییانەیان هەڵگرتوون، کە دەچنە چوارچێوەی درۆ بۆ خوا هەڵبەستن، دەیانبینی، ﴿ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾، ڕوویان ڕەشهەڵگەڕاوە، ﴿ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، ئایا لە دۆزەخدا جێگەی حەوانەوە بۆ خۆ بەزلگران نیە! واتە: دۆزەخ شوێنی حەوانەوەو تێدا پشوودانی خۆ بەزلگرانە، ئەگەر شوێنێک هەبێ ئەوان تێدا پشوو بدەن، دۆزەخە.

﴿ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ ﴾، خوا ﷻ ئەوانەی پارێزیان کردوە بە هۆی سەرفرازییانەوە دەربازیان دەکات، ﴿ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ ﴾، زیان و ناڕەحەتییان تووش نابێ، ﴿ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، خەفەت و پەژارەش داناگرن.

ئنجا ئەو خوایەی ﷻ کە دەفەرموێ: بگەڕێنەوە، بۆ لای پەشیمان ببنەوەو لەگەڵی ئاشت ببنەوە، بۆمان پێناسە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەر شتێک کە بەدیهاتبێ، خوا ﷻ هێناویەتە دی و، هەر شتێک کە بەدیبێ، خوا دەیخوڵقێنێ و پەیدای دەکات، ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴾، ئەو (خوا ﷻ)یش بەسەر هەموو شتێکەوە سەرپەرشتیارە، مشوورخۆر و پارێزەرە، ﴿ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾،

(مقالیـد) کـۆی (مقـلاد) یـان (إقلیـد)ە، بـە مانـای کلیـل، کلیلـەکانی ئاسـمانەکان و زەوی هــی ئــەون، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾، ئەوانـەش کـە بیبڕوابـوون بـە ئایەتـەکانی خـوا، هـەر ئەوانـەن زیانبـاران، دەسـخەڕۆو زیانبـارو دۆڕاوی ڕاسـتەقینە هــەر ئەوانــەن.

ئنجـا بـە پێغەمبەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴾، بڵـێ: ئایـا فەرمانـم پێدەکـەن، جگـە لـە خـوا بپەرسـتم، ئـەی نەفامەکان! (جَاهِلُون) کـۆی (جَاهِـل)ە، کەسـێکە شـتێک نەزانـێ، واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانەی خـوا ناناسـن! یـان: ئـەو کەسـانەی کـە شـارەزای پەیامـی خوانیـن، واتـە: لێـرەدا ئـەم وشـەو تەعبیـرە بەپێـی عـورف و بـاوی زمـانی عەرەبیـی، ئـەو کاتـە، بـە جنێوو قسـەی سـووک لـە قەڵـەم نـادرێ، چونکـە هەمـوو قورئـان وشـەیەکی ناشـیرینی تێدانیـە، خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرێـک ﷺ بفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ۝٤ ﴾القلـم، فەرمـانی پـێ نـاکات تەعبیـرو وشـەیەک بەکاربێنـێ، دەلالـەت لەسـەر جنێـوو مانـای ناشـیرین بـکات، چونکـە خـوا بـۆ خـۆی لـە سـوورەتی (الأنعام)دا، فەرموویـەتی: ﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرۡجِعُهُمۡ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝١٠٨ ﴾، واتـە: ئەوانـەی لـە جیـاتی خـوا ﷻ دەیانپەرسـتن، جنێویـان پێمەڵێـن، کـە سـەرەنجام ئەوانیـش قسـە بـە خـوا ﷻ بڵێـن و بـێ ئەدەبیـی بەرانبـەر بـە خـوا بکـەن، کەواتـە: لێـرەدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴾، بـە پرسـیارکردنی نکووڵیلێکەرانـە بڵـێ: ئایـا فەرمانـم پێدەکـەن، کـە جگـە لـە خـوا بپەرسـتم، ئـەی نەفامـەکان! یـانی: ئـەی نەزانـەکان و بـێ ئاگایـەکان لـە بەرنامـەی خـوا.

﴿ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ﴾، بـە دڵنیاییـی سرووشـکراوە بـۆ لای تـۆ، بـۆ لای ئەوانـەی کـە لـە پێـش تـۆش دابـوون، واتـە: بـۆ پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، چـی سرووشـکراوەو چییـان پێڕاگەیەنـراوە؟ ﴿ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ ﴾، ئەگـەر هاوبـەش دابنێـی کردەوەکـەت هەڵدەوەشـێتەوە، ﴿ وَلَتَكُونَنَّ

﴿مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، بە مسوڵگەرییش لە زیانباران دەبی، کردەوەکەت واتە: هەم ئیمان و عەقیدەکەت، هەم پەرستنەکانت، هەم تاعەت و فەرمانبەرییت، هەموو کردەوە چاکەکانت هەڵدەوەشێنەوەو، بە دڵنیایی تۆ لە زیانباران دەبی.

﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، (هاوبەش بۆ خوا دەمەنێ)، بەڵکو بەس خوا ﷻ بپەرستە و، لە سوپاسگوزاران بە بۆ خوا.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ﴾، وەک بۆ خوا ﷻ پێویست و شایستەیە، قەدری خوایان نەزانی، پێگەو پایەی بەرزی خوایان نەزانی، واتە: بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ خوادا نەکرد، کە بۆ خوا شایستەیە، مەبەست پێی ئەوەیە، قەدری خوایان نەگرت، یانی: بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ خوادا نەکرد، کە بۆ خوا ﷻ شایستەیەو، بۆ مەقامی بەرزو بێ وێنەی پێویستە.

ئنجا دوو دیمەنمان دەخاتە بەرچاو، وەک بەڵگە لەسەر پایەی بەرزو، ناوازەو، بێ وێنەی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾، ئەم (و)ە، بۆ حاڵە، یانی: لە حاڵێکدا کە زەوی لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووی لە چنگی خوادایە، (قَبْض) ئەوەیە کە ئینسان شتێک بە دەستی و بە پەنجەکانی بگرێ، ئنجا وەک دوایی باسی دەکەین -لە مەسەلە گرنگەکاندا- خوا لێرەدا دەیەوێ ئەوەمان بۆ وێنا بکات، کە ئەم زەوییەی ئێمەی لەسەری دەژین و، ئەم دنیایە تێکڕای لە بەرانبەر خواو دەسەڵاتی خوادا، وێنەی ئەوەیە کە ئێمە شتێک لە چنگ بگرین و بە دەستمانەوەبێ، ئاواش ئەم زەوییە بەدەست خوای پەروەردگارەوەیەو، لە ژێر ڕکێف و هەیمەنەو ویستی و دەسەڵات و، توانای بێ سنووری خوادایە ﷻ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە چنگ و دەست و پەنجە بۆ خوای پەروەردگار دابنرێ، هەرچەندە هەر وشەیەک خوا ﷻ بۆ خۆی بەکاری هێنابێ، ئەگەر بزانین مەبەست پێی سیفەتێکە بۆ خوا ﷻ، ئێمە لەسەر

سەری دادەنێین، وەک زانایانی پێشین گوتوویانە: (أَمِرُّوهَا كَمَا جَاءَت)، بیڕۆێنن وەک هاتوە، بەڵام دەڵێین: بە شێوەیەک کە بۆ خوا شایستەیە، بە دڵنیایی هەموو ئەو مانایانەی دێنە بیرو زەینی ئێمەوە، لە کاتێکدا وشەکانی وەک: (ید، عین، وجه، قبضة)، بەکاردێن، دەبێ بڵێین: وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، نەک بەو چەمک و واتایانەی دێنە زەینی ئێمەوە، چونکە زەینی ئێمە تەنیا دەتوانێ وێنەی دیاردە ماددییەکان بحەجمێنێ و لە خۆیدا کۆبکاتەوە، بەڵام خوا ﷻ لە دەرەوەی جیهانی ماددەیەو، جیایە لە دروستکراوەکانی لە هەموو روویەکەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێک وەک خوا ﷻ نیە، ئەو بیسەری بینەرە، نە لە زاتی داو، نە لە سیفەتیداو، نە لە کردەوەکانیدا، هیچ شتێک وەک وی نیە، کەواتە: کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ﴾، ئەمە هەمووی پێکەوە پەیوەستە، وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، قەدری خوایان نەگرت، کە هاوبەشیان بۆ داناو گوتیان: ڕۆڵەی هەیەو، بە دروستکراوەکانیان چوواندوەو، دروستکراوەکانیان هێناونە ڕێزی وی، وەک پێویست قەدری خوایان نەگرت: ﴿وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ﴾، لە حاڵێکدا کە لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی هەمووی بە چنگی خواوەیە، ﷻ بە دەستی خواوەیە، ﴿وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ﴾، ئاسمانەکانیش پێچراوەن بە دەستی ڕاستیەوە، ﴿سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ وی، لەوەی ئەوان دەیکەنە هاوبەشی، واتە: خوا زۆر پاک و بەرزە، لەو بیرۆکە پووچ و ئەفسانەییانەی کە عەقڵ و دڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان هەڵیانگرتوون، کە هەندێک لە دروستکراوەکان دێننە ڕیزی خواو، دەیانکەنە هاوبەشی خوا، چ لە بەدیهێنەرایەتییدا، چ لە پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتییدا، چ لە هەندێک لە ناوو سیفەتەکانیدا، چ لە پەرستراوێتییدا، خوا پاک و بەرزە لەوەی ئەوان دەیکەنە هاوبەشی.

کەواتـە: مەبەسـتی خـوای بێ وێنـە لـەم ئایەتـە موبارەکـەدا، ئەوەیـە کـە ڕەخنـە دەگـرێ لـە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان، کـە وەک بـۆ خـوا شایسـتەیە مەقامـی بەرزی خوایـان نەزانیـوەو، وەک بـۆ خـوا شـیاوە، مامەڵەیـان لەگـەڵ خـوادا نەکـردوە، کـە ڕۆڵـەو هاوبـەشی بـۆ پەیـدا دەکـەن، لـە حاڵێکـدا لـە ڕۆژی دوایـی دا، خـوا ﷻ ئـەم زەوییـە بـە بەرگـە هەوایـەوەو بـە بەرگـە ئاوییـەوە، وەک ئێسـتا هەیـە، ئـەم خڕۆکەی زەوییـە هەمـووی بـە دەسـتیەوە دەگـرێ، وەک چـۆن ئێمـە قەڵەمێـک، یـان شـتێکی بچـووک لـە چنـگ دەگریـن، زەوییـش لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتی خـواو هەیمەنـەو ڕکێفـی خـوادا، بـەو شـێوەیە، خـوا ﷻ لـە عەقڵـی ئێمـەی نزیـک دەخاتەوە، کـە وەک چـۆن ئێـوە شـتێک لـە چنـگ دەگـرن، خـوای زانـاو توانـاش خڕۆکـەی زەوی و دنیـا لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتیدا، بـەو شـێوەیە، ﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ﴾، ئاسـمانەکانیش (واتـە: گـەردوون هەمـووی)، هەموویـان پێچـراوەن بـە دەسـتی ڕاستییەوە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، پاکیی و بەرزیی بـۆ وی، لـەوەی دەیکەنـە هاوبـەشی، ئەگـەر وەک پێویسـت خـوا بناسـن، هاوبـەشی بۆ پەیـدا ناکـەن، بۆیـە مـن مەوسـووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)[1]، کتێبـی یەکەمیـم هەمـووی تەرخانکـردوە بـۆ (بوونناسـیی)، کـە پێـی دەگوتـرێ: {ئۆنتۆلۆجیـی - ontology - (علـم الوجـود)}[2]، بۆچـی؟ چونکـە لـە ڕاسـتییدا هەمـوو ئەوانـەی تـووشی شـیرک و لادان بـوون، لەبـەر ئەوەیـە کـە خوایـان وەک پێویسـت نەناسـیوە، هـەر بۆیـەش کـە تەماشـای قورئـانی مەککەیـی دەکەیـن، پانتاییەکـی زۆر لـە قورئـانی مەککەیـی تەرخانکـراوە بـۆ ناسـاندنی خـواو، باسـکردنی ناوو سـیفەتەکانی خـوا، بەرزیی و مەزنیـی خـوا، کـردەوەکانی خـوا، بـۆ ئـەوەی خەڵـک وەک پێویسـت خـوا بناسـێ، ئنجـا کـە چاکیـان ناسـیی، ئـەو کات بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـتیش مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـەن، هەروەهـا لـە مەوسـووعەی: (بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان

---

(١) کە لە چاپی دووەمی دا دوازدە کتێبە.

(٢) بە ناوونیشانی: (الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق)

وەحیی و واقیعدا)، لە کتێبی چوارەمدا[1] بەشێکی سەربەخۆمان تەرخانکردوە بۆ بابەتی بووناسیی، کە بەداخەوە لە کتێبەکانی عەقیدەی ئیسلامیدا، ئەو کتێبانەی کە لەبەر دەستمانن، کەمتر وابووە گرنگیی بەو بابەتە بدرێ، هەموو کتێبەکانی ئیمان و عەقیدە، ڕێک بە بڕوا بە خوابوون، ئنجا بڕوا بوون بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی خوا، دوایی بە پێغەمبەران و بە وەحیی خوا، پاشان بە ڕۆژی دوایی و بە قەدەر، دەستیان پێ کردوە، لە حاڵێکدا کە ئەگەر وەک پلە پلەیی ژیربێژیی (التدرُّج المنطقي) بێ و، ئەگەر لە ڕووی قورئانیشەوە، تەماشا بکەین، قورئان بەر لەوەی باسی پایەکانی ئیمان بکات، باسی خواناسیی کردوەو، باسی بووناسیی کردوە، ئەم گەردوونە چییە؟ کێ خاوەنیەتی؟ کێ هێناویەتە دی؟ مرۆڤ چییە؟ شوێنی لە ئیعرابی بووندا چییە؟ مرۆڤ دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ ژیانی دنیا چییە؟ ژیانی ڕۆژی دوایی چییە؟ تا کۆتایی، کە ئەو بابەتانە موفرەدەکانی بووناسیی پێک دێنن، شایانی باسیشە: وێڕای کتێبی یەکەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، کە هەموویم بۆ ئەو بابەتە تەرخانکردوە، هەروەها بەشێک لە کتێبی چوارەمی: مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی) یش دا، هەروەها لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)، دیسان باسی ئەو بابەتە گەورەو گرنگەم کردوە.

---

(١) بە ناوونیشانی: (پایەکانی بووناسیی).

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە ئەو بەندانەی، ئەو مرۆڤانەی بەرانبەر بە خوا، تووشی گوناهو لادان بوون، بانگ بکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای خواو، مژدەیان پێبدات کە لە تێکڕای گوناهانیان دەبووری، ئنجا ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی گەڕانەوە بۆ لای خوا، پاشان خستنەڕووی مەترسیی نەگەڕانەوەو، ئەو پەشێمانیی و ئاکام خراپییەی، چاوەڕێی کەسانی مکوڕ لەسەر گوناهو کوفرو خۆ بەزلگریی دەکات:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾، بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کە بەرانبەر بە خۆیان زێدەڕۆییان کردوە! (يَا عِبَادِي) خوێنراویشەتەوە: (قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِيْن)، بە بێ

(ي)، بە دڵنیاییش ئەو بەندانەی بەرانبەر بە خۆیان زێدەڕۆییان کردوەو، لە دژی خۆیان تێپەڕاندنیان کردوون، مەبەست پێیان ئەهلی شیرک و کوفرە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی دوایی دێن، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾، تا کۆتایی، ئەوە دیارە هەمووی حاڵ و باڵی مرۆڤی بێبڕواو خوا نەناسە، هەڵبەتە ئێمە دوایی کورتە باسێک لەبارەی ئایەتی ژمارە (٥٣)وە دەکەین، بۆیە ئێستا تۆزێک بەخێرایی بەسەر بڕگەکانیدا دەڕۆین.

٢)- ﴿ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾، (بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کە بەرانبەر بە خۆیان زێدەڕۆییان کردوە!) لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، (**القُنُوطُ: اليَأْسُ مِنَ الخَيْرِ**)، (**قُنُوطٌ**) و (**يَأس**) جیاوازییان ئەوەیە کە (**يَأس**) بریتیە لە نائومێدیی بەرەهایی، بەڵام (**قُنُوط**): بریتیە لە نائومێدیی لە چاکە، بەڵام (**يَأسْ**) جاری وا هەیە بریتیە لە نائومێدیی لە دەرباز بوون، لە خراپەیەک کە ڕووی تێدەکات، هەروەها بۆ نائومێدیی لە چاکەش بەکاردێ و چەمکەکەی فراوان و گشتییە.

٣)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾، (ئەمە وەک بەڵگەی ڕستەی پێشێ وایە، کە دەفەرموێ: نائومێد مەبن لە بەزەیی خوا، لەبەرچی؟) چونکە بە دڵنیایی خوا لە تێکڕای گوناهان و وێکڕا دەبووریێ، وشەی (**الذُّنُوب**) (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە کە مانای جینس دەگەیەنێ، واتە: تێکڕای گوناهان، (**جَمِيعًا**) واتە: وێکڕا، لە تێکڕای گوناهان دەبووریێ وێکڕا، نەک ئەمڕۆ لە گوناهێک ببووریێ و سبەینێ لە یەکی دیکە، بەڵکو وێکڕاو پێکەوە لە هەموو گوناهەکان دەبووریێ.

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بەدڵنیایی ئەو بەس خۆی لێبوردەی بەبەزەییە، وەک چۆن ڕستەی پێشێ کە ددفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾، هۆکارو پاساو هێنانەوە بوو، بۆ ئەوە کە نابێ لە بەزەیی خوا نائومێدبن، ئەمەش: ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا زۆر لێبوردەی میهرەبانە، ئەمەش بەڵگە هێنانەوەیە بۆ

ڕستەی پێشێ کە دەفەرموێ: لە هەموو گوناهان وێکڕاو تێکڕا دەبووریّ، چونکە هەر ئەو زۆر لێبوردەی بە بەزەییە، ئنجا لە ئایەتی دواتردا، واتە: ئایەتی (٥٤)دا، چۆنیەتی گەڕانەوە بۆ لای خوا باس دەکات:

٥)- ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ ﴾، لە ناخەوەش بگەڕێنەوە لای پەروەردگارتان، (إِنَابَة) واتە: گەڕانەوەی دوای گەڕانەوە، (التَّوْبَةُ إِلى اللهِ تَوْبَةً بَعْدَ تَوْبَة)، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی: گەڕانەوە بۆ لای خوا لە ناخەوە، کە من ئەم مانایەم پێ ڕاسترە، واتە: لە ناخەوەو لە دڵەوە بۆ لای پەروەردگارتان بگەڕێنەوە.

٦)- ﴿ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ ﴾، بۆیشی ملکەچ بن، یانی: بە ڕواڵەتیش بۆی تەسلیم و ملکەچ بن، لە دەروونەوە واز لە کوفرو شیرک بێنن، بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تەنیا خوا بە خاوەن و بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆتان بزانن، بۆیە بەس ئەویش بپەرستن، هەروەها وەک ڕواڵەت و بەرچاویش بۆی ملکەچ بن، پابەندبن بە بەرنامەو شەریعەتەکەیەوە.

٧)- ﴿ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾، بەر لەوەی سزاو ئازارتان بۆ بێ و دوایی ئێوە سەرنەخرێن و پشتیوانییتان نەکرێ، وشەی (العَذَاب) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، دیسان بۆ جینسە، واتە: بەر لەوەی سزاو ئازارێکتان بۆ بێ، بە مانای ئازارو سزاو پڕ بە پێستی ئەو پێناسەیە، یاخود (أل) بۆ (عهد)ە، یانی: بەرلەوەی سزاو ئازارەکەتان بۆبێ، واتە: ئەو سزاو ئازارەی کە پێشتر باسکراوەو دەزانن چییەو چۆنە؟.

﴿ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾، دوایی ئێوە سەرنەخرێن و، پشتیوانییتان لێ نەکرێ، (النَّصْرُ: الإِعَانَةُ عَلَى الغَلَبَة)، (نصر) یارمەتییدانە بۆ زاڵبوون، ئنجا لە ئایەتی ژمارە (٥٥)دا، بەرنامەو ڕێبازی گەڕانەوە بۆ لای خوا ڕوونکراوەتەوە.

٨)- ﴿ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم ﴾، هەروەها بکەونە شوێن باشترین شتێک کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیوە، لێرەدا: (أَحْسَنَ: إِسْمُ تَفْضِيل مُسْتَعْمَل فِي مَعْنَى (كَامِلِ الحُسْنِ)، بە دوای باشترین شتێک بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیوە، لێرەدا (أَحْسَنَ) ناوی باشتر ناوی هەڵبژاردن (إِسْم تَفْضِيل)ە، بەکارهێنراوە

بۆ مانای ئەوەی ئەوپەڕی چاکەیە، نەک چاکترە لە فڵان شت، واتە: بەراوردی پێ نەکراوە لەگەڵ شتێکی دیکەدا، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾﴾المؤمنون، یان: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾﴾التين، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا، ئەو وشەیە کە بەڕواڵەت بۆ هەڵبژاردن (مُفَاضَلَة)یە، بەڵام لە حەقیقەتدا مەبەست پێی مانای تەواوی ئەو وشەیە کە بەکارهاتوە.

٩)- ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، بەر لەوەی کتوپڕ ئازارو سزاتان بۆ بێ، لە حاڵێک دا کە هەستی پێناکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ﴾، (أل)ی سەر (العَذَاب) وەک ئەوەی پێشێ:

أ- دەگونجێ بۆ عەهد بێ: سزاو ئازارەکەتان بۆبێ، ئەوەی کە پێشتر باسکراوە.

ب- یاخود: سزاو ئازارێکتان بۆ بێ، کە مانای تەواوی سزاو ئازار هەر لەودا هاتۆتە دی، ئنجا ئەویش دیسان دەگونجێ مەبەست پێی ئازارو سزای دنیا بێ، یاخود سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی بێ، یان هەردووکیان بێ، سزاو ئازاری دنیاش، ئەو بەڵاو موسیبەتانە بن، کە بەسەر ئینساندا دێن، یاخود حاڵەتی مەرگ و گیانەڵا، یاخود دەردو نەخۆشیی، هەروەها تێشکان و ئازارو گرفتاریی، بە نسبەت ئەوانەوە کە لەسەر کوفرو شیرک بەردەوام بوون بە دەستی ئەهلی ئیسلام لە کاتی جەنگ دا، سزای دواڕۆژیش لە قۆناغی بەرزەخەوە دەست پێدەکات و تاکو لە قیامەتیش بەردەوام دەبێت.

﴿وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾، ئەم (و)ە، بۆ حاڵە، لە حاڵێکدا کە ئێوە هەست پێ ناکەن، (مِنْ غَيْرِ أَنْ تَحُسُّوا بِهِ)، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن و بزانن لە کوێوە بۆتان دێ، تاکو بتوانن خۆتانی لێ بپارێزن.

١٠)- ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ﴾، نەبادا کەسێک بڵێ: هەی داخ و خەفەتەکەم (وەرە ئێستا کاتیەتی) لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمییم کرد لە تەنیشت خوادا، لە بەرانبەر خوادا.

وشەی (أن) زانایان بە دوو واتایان لێکیان داوەتەوە:

أ- (لأَنْ لَا تَقُول نَفْسٌ)، بۆ ئەوەی نەفسێک، کەسێک نەڵێ: ئەی داخ و خەفەت بۆ من، لەسەر ئەوەی لە ئاست خواداو لە بەرانبەر خوادا، کەمتەرخەمییم کرد.

ب- یاخود: ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ ﴾، (كَرَاهَةَ أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ)، نەبادا کەسێک بڵێ، بۆ ئەوەی کەسێک نەڵێ: ئەی داخ و خەفەت بۆ من، ﴿ يَحَسْرَتَىٰ ﴾، مانایەکەی ئاوایە: (أَيَّتُهَا الحَسْرَةُ! هَذَا أَوَانُكِ فَاحْضرِي)، ئەی داخ و خەفەت! ئێستا کاتەکەی خۆتە وەرە، ئەی داخ و خەفەت بۆ من وەرە، ئێستا کاتیەتی، (حسرة)یش واتە: خەفەت و دڵتەنگیی و پەشێمانیی لەسەر شتێک کە لە دەست چووەو ناگەڕێتەوە.

﴿ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ ﴾، لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمییم کرد لە تەنیشت خوادا، (الجَنْبُ وَالجَانِب: النَّاحِيَة وَالجِهَة، وَيُسْتَعَارُ الجَنْبُ للحَقِّ وَالشَّأْنِ)، (جنب و جانب) یانی: لایەن و لا، دەشخوازرێتەوە بۆ ماف و پێگە، واتە: مافی خوام بە زایەدا، یان: لە بەرانبەر پێگەی بەرزی خوادا کەمتەرخەمییم کرد، لە ئاست خوادا کەمتەرخەم و بەزایە دەربووم.

﴿ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ ﴾، (مَا: مَصْدَرِيَّة)، مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: (عَلَى تَضْيِيْعِي وَتَفْرِيْطِي فِي جَنْبِ الله)، بە هۆی بەزایەدانم و کەمتەرخەمییمەوە لە ئاستی خوادا ﷻ.

١١)- ﴿ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾، (إنْ: مُخَفَّفَةٌ مِنَ المُثَقَّلَة)، واتە: بە دڵنیایی من لە گاڵتەکەرانیش بووم، جیاوازیی ئەم (إن)ە و، (إِن النَّافِيَة) چۆن دەزانی ئەم (إن)ە، سووککراوە (مُخَفَّفَة)یە لە قورسکراو (مُثَقَّلَة) و، بۆ تەئکید کردنەوەیە نەک بۆ لابردن؟ بەهۆی ئەو (ل)وە، ﴿ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾، ئەو (ل)ە کە دەچێتە سەر وشەی دوایی، بەوە دەزانین کە (إن)ەکەش بۆ تەئکیدەو (ل)ەمەکەش بۆ تەئکیدە، ئنجا ئەمە مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: (أَي: فَرَّطْتُ تَفْرِيْطَ السَّاخِرِ لَا تَفْرِيْط الغَافِل) واتە: من کەمتەرخەم بووم و بەزایەدەربووم، بەزایەدەرو کەمتەرخەمی گاڵتەپێکەر، نەک بێ ئاگاو نەشارەزا.

١٢)- ﴿أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ یان بڵێ: ئەگەر خوا ڕاستەڕێی کردبام بێگومان لە پارێزکاران دەبووم، ئەمەش بادەدرێتەوە، سەر ئەوەی پێشەوە، واتە: (كَرَاهَةَ أَنْ تَقُولَ)، یان: (لِأَنْ لَا تَقُولَ)، تاکو نەبادا بڵێ، یاخود: بۆ ئەوەی نەڵێ: ﴿لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي﴾، ئەگەر خوا ﷻ ڕێنمایی کردبامایە، بە دڵنیایی من لە پارێزکاران دەبووم، ئنجا ئەم ڕستەیە: ﴿لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي﴾، ئەگەر خوا ﷻ هیدایەتی دابام، دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١- (أَنْزَلَ لِي الهِدَايَةَ)، ئەگەر خوا ﷻ ڕێنمایی بۆ دابەزاندبام.

٢- ئەگەر خوا ﷻ منی ڕاستە ڕێ کردبایە، یانی: خوا هیدایەتەکەی دابەزاند بوو، بەڵام ئەگەر خوا ﷻ منی ڕستە ڕێ کردبایە، بە دڵنیایی من لە پارێزکاران دەبووم.

(التَّقْوَى هُنَا هُوَ المُتَمَنَّى)، خۆزگە پێ خواستراوەکە تەقوایە، واتە: بۆ ئەوەی نەفسێک نەڵێ، یاخود نەبادا کەسێک بڵێ: ئەگەر خوا ﷻ منی ڕاستە ڕێ کردبایە، من لە پارێزکاران دەبووم، وەڵامی (لو)یش قرتێنراوە، واتە: ئەو کاتە بە ئامانج و ئاکام دەگەیشتم و، بەختەوەر دەبووم، بۆ ئەوەی کەسێک وانەڵێ، با ئێستا بگەڕێتەوە، نەوەک لە ڕۆژی دواییدا ئەو خۆزگەو بریایانە بڵێ، کە درەختی خۆزگەو بریا بۆ کەس بەری نەگرتووەو بەریش ناگرێ.

١٣)- ﴿أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی کەسێک کاتێک کە سزاو ئازار دەبینێ، نەڵێ: ئەگەر جارێکم ببووایە (جارێک گەڕانەوە بۆ دنیا) ئنجا لە چاکەکاران بوومایە (ئاواتم دەهاتە دی).

(أل)ی سەر (العَذَاب) بۆ (عهد)ە، واتە: کەسێک کاتێک سزاو ئازارەکە دەبینێ، کە پێشتر باسکراوەو سزاو ئازاری دۆزەخە، ﴿لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً﴾، ئەگەر من جارێکم بۆ ببووایە، واتە: جارێک گەڕانەوەم ببووایە بۆ دنیا، (كَرَّةٌ: أي رَجْعَةٌ)، ﴿فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، ئنجا لە چاکەکاران بوومایە، واتە: زیاد لە پارێزکردن، لە چاکەکارانیش بوومایە، یاخود چاکەم کردبایە لە جیاتی خراپە، ئەو کاتە ئاواتی من دەهاتە دی، کە دیارە وەڵامەکە قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دیارە، خوا ﷻ دەفەرموێ:

١٤)- ﴿ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي ﴾، با بە دڵنیایی ئایەتەکانمت بۆ هاتن، (بَلَى) یانی: با، بەداخەوە هەندێک لەوانەی تەفسیری قورئانیان کردوە بە کوردیی (بَلَى)یان لەگەڵ (نَعَم)دا لێ تێکەڵ بووە، (نَعَم) بە کوردیی (بەڵێ)یە، بەڵام (بَلَى) لە کوردییدا (با)یە، ئەگەر یەکێک بە تۆ بڵێ: ئایا فلان ڕۆژە نەهاتم بۆ لات؟ ئەگەر هاتبێت دەڵێی: با ئەگەر بڵێی: بەڵێ، واتە: نەهاتووی، بەڵام کە گوتت: با، واتە: پشتگیریی دەکەی واتە: هاتووی، (بَلَى: حَرْفٌ لإبْطَالِ مَنْفِيٍّ، أو مَا فِيْهِ رَائِحَةُ النَّفْيِ لِقَصْدِ إِثْبَاتِ مَا نُفِيَ قَبْلَهُ)، (بَلَى): پیتێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی شتێکی لابراو، یاخود شتێک کە بۆنی لابردنی تێدا بێ، بە مەبەستی چەسپاندنی ئەو شتەی کە پێشتر لابراوە، واتە: ئەو مرۆڤە تاوانبارە، دەڵێ: ئەگەر خوا ﷻ ڕێنمایی کردبام، یان خوا ﷻ ڕاستە ڕێی کردبام، بە دڵنیایی لە پارێزکاران دەبووم، یان دوای ئەوەی سزا دەبینێ دەڵێ: ئەگەر گەڕانەوەیەکم بۆ هەبووایە، بێگومان لە چاکەکاران دەبووم، خوا ﷻ وەڵامی قسەی پێشێ دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي ﴾ با، ئایەتەکانی منت بۆ هاتن، ئەمە هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسەیەتی کە دەڵێ: ﴿ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي ﴾، ئەگەر خوا منی ڕێنمایی کردبایە، واتە: ڕاست ناکەی کە خۆزگە دەخوازی، ڕێنمایی خوات بۆ هاتبایە لە دنیادا، با! ئایەتەکانی منت بۆ هاتن، بەڵام:

١٥)- ﴿ فَكَذَّبۡتَ بِهَا وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بە درۆت دانان و خۆت بە زلگرت و لە بێبڕوایان بووی، یانی: بە هۆی بە درۆ دانان و خۆ بەزلگرتنەوە، شایستەی ئەوە نەبووی خوا ﷻ ڕاستە ڕێت بکات، ئەگەرنا هیدایەت و ڕێنماییەکە لەبەر دەستتدا بوو، بەڵام خوا ڕاستە ڕێی نەکردی، کەواتە: ئەوەت ڕاست نیە، کە هیدایەتت بۆ نەهاتبێ، ڕێنماییت بۆ هاتوە، ئەوەش کە خوا ﷻ ڕاستە ڕێی نەکردووی ڕاستە، بەڵام لەبەر ئەوە ڕاستە ڕێی نەکردووی، چونکە تۆ ئایەتەکانت بە درۆ دانان و خۆت لە ئاستیاندا بە زلگرت، کەواتە: خەتای خۆت بوو ڕێی ڕاستگرتنت لە خۆت گرت، بۆ خۆت پەرچ و لەمپەرت لەبەردەم ڕێی ڕاست گرتنتی خۆتدا دانا.

﴿ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ لە بێبڕوایانیش بووی، یاخود لە سپڵەو ناسپاسان بووی.

# کورتە باسێک لە بارەی ئایەتی (٥٣)ەوە
# کە ئومێد بەخشترین ئایەتە

سەرەتا دەڵێین:

لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا، لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکانی: (١٧ و ١٨)دا، باسێکی تاڕادەیەک تێروتەسەلمان لە بارەی (توبة)وە کردوە، هەروەها لە کتێبی :(گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا، کە تاکو ئێستا شەش جاران چاپ کراوە، بە درێژیی لە بارەی گەڕانەوە بۆ لای خواو، لە بارەی ئەم ئایەتی ژمارە (٥٣)وەو حەوت هەشت ئایەتەکانی دواییشی، باسێکی تێرو تەسەلمان کردوە، چونکە ئەو ئایەتانە هەموویان پێکەوە پەیوەستن، بۆیە کەسێ بیەوێ لە بارەی گەڕانەوە بۆ لای خواوە، زیاتر بەرچاو ڕوون بێ، دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی باسمان کردن، هەروەها لە هەر کام لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)[1]و، لە کتێبی (گیانی ژیان)یشدا لە بارەی گەڕانەوە بۆ لای خواوە، قسەمان کردوە.

لە دوو تەوەریش دا لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، دەدوێین:

## تەوەری یەکەم: ئومێد بەخشترین ئایەت لە قورئان دا:

ئایەتی ژمارە (٥٣) کە دەقەکەی ئەمەیە: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾الزمر، ئەم ئایەتە لە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، بە ئومێد بەخشترین ئایەت لە قورئاندا (أَرْجَى آيَةٍ فِي القُرآن) دانراوە، لەو بارەوەش زانایان زۆر

---

(١) بڕوانە: چاپی شەشەمی: ٢٠٢١ز.

قسەیان کردوە، هەڵبەتە ئایەتی ئومێد بەخش بۆ تاوانبارن و لادەران و گوناهباران زۆرن، بەڵام ئەم ئایەتە زۆربەی زانایان بە ئومێد بەخشترین و دڵخۆشکەرترین فەرمایشتی خوایان داناوە لە قورئاندا، بۆ گوناهباران و تاوانباران و، کەسانێک کە دەیانەوێ بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، لەو بارەوە گێڕدراوە (روایة)یەک هەیە، هەرچەندە سەنەدەکەی بەهێز نیە، بەڵام تیشک دەخاتە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتەو، زۆربەی تەفسیرەکانیش هێناویانە، منیش بە باشم زانی بیهێنم:

کە ئەمە دەقەکەیەتی: **[أَتَى وَحْشِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! أَتَيْتُكَ مُسْتَجِيرًا، فَأَجِرْنِي حَتَّى أَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَرَاكَ عَلَى غَيْرِ جِوَارٍ، فَأَمَّا إِذْ أَتَيْتَنِي مُسْتَجِيرًا فَأَنْتَ فِي جِوَارِي، حَتَّى تَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ» قَالَ: فَإِنِّي أَشْرَكْتُ بِاللَّهِ، وَقَتَلْتُ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ وَزَنَيْتُ، هَلْ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنِّي تَوْبَةً؟ فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَتَلَاهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَرَى شَرْطًا فَلَعَلِّي لَا أَعْمَلُ صَالِحًا، أَنَا فِي جِوَارِكَ حَتَّى أَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ. فَنَزَلَتْ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾﴾ النساء، فَدَعَا بِهِ فَتَلَا عَلَيْهِ، قَالَ: فَلَعَلِّي مِمَّنْ لَا يَشَاءُ، أَنَا فِي جِوَارِكَ حَتَّى أَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴿٥٣﴾﴾ فَقَالَ: نَعَمِ الْآنَ لَا أَرَى شَرْطًا فَأَسْلَمَ] (أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ: ٧١٤٠ ، وَذَكَرَهُ الْهَيْثَمِي فِي المجمع: ج٧، ص١٠٠ و ١٠١، وَقَالَ: رَوَاهُ الطَّبَرانِي فِي الْأَوسط وفيه (أبين بن سفين) ضَعَّفَه الذهبي).**

واتە: وەحشیی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد! هاتووم پەنام پێ بردووی، [هاتوومە پەناتەوە، لە نێو عەرەباندا عادەتێک هەبووە پێی گوتراوە: (جِوَار) پەنام بە تۆ هێناوەو پەنام بدە]، بۆ ئەوەی گوێم لە فەرمایشتی خوا بێ، [لە سوورەتی (التوبة)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ

﴿مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾﴾، واتە: ئەگەر یەکێک لە هاوبەش بۆ خوادانەران، داوای پەنای لێ کردی، پەنای بدە، تاکو گوێبیستی فەرمایشتی خوا دەبێ، دوایی بیگێڕەوە بۆ شوێنی، جێی دڵنیایی خۆی، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە نایزانن، کە لە تەفسیری سوورەتی (التوبة)دا، لەو بارەوە بە تەفسیڵ قسەمان کردوە}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من حەزم دەکرد کە بەبێ پەنادان خواستن تۆ ببینم، بەڵام ئێستا کە وەک پەنابەر هاتووی، تۆ لە پەنای منداي، (لە سێبەری ئێمەدای)، هەتاکو گوێت لە فەرمایشتی خوا دەبێ.

وەحشیی گوتی: من هاوبەشم بۆ خوا داناوەو، ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی کردوە، کوشتوومە، (بە تایبەت بکوژی حەمزەی مامی پێغەمبەر بووە ﷺ)، هەروەها زیناشم کردوە، ئایا خوا ﷻ گەڕانەوەم لێ وەردەگرێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی لە سوورەتی (الفرقان)دا کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾، تا کۆتایی، پێغەمبەر ﷺ بە سەریدا خوێندەوە، وەحشیی گوتی: مەرجێک دەبینم، ڕەنگە نەگونجێ کردەوەی باش بکەم، (چونکە دوای ئەوە دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾﴾الفرقان)، بۆیە گوتی: من هەر لە پەنای تۆدامە، هەتا گوێم لە فەرمایشتی خوا دەبێت، (واتە: تاکو ئایەتێک دەبیستم کە قەناعەتم پێ بێ کە بگەڕێمەوە).

ئنجا ئەو ئایەتەی ژمارە (٤٨)ی سوورەتی (النساء) دابەزی، کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾، {بێگومان خوا ﷻ لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ دابنرێ، بەڵام جگە لەوە لە هەر کەسێک دەبوورێ، کە بیەوێ، هەر کەسێکیش هاوبەش

بۆ خوا دابنێ، ئەوە درۆیەکی مەزنی بۆ خوا هەڵبەستوە)، پێغەمبەریش بانگی کردو ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، وەحشیی گوتی: ڕەنگە من ئەو کەسە بم، کە خوا ﷻ نایەوێ لە من خۆش بێ، بۆیە من هەر لە پەنای تۆدام، هەتا گوێم لە فەرمایشتی خوا دەبێ.

ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾الزمر، ئیدی وەحشیی گوتی: بەڵێ ئێستا هیچ مەرجێک نابینم و مسوڵمان بوو.

وەک گوتم: ئەم گێڕدراوەیە تیشکی زیاتر دەخاتە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکەو، زیاتر دەبێتە بەڵگە، کە ئەم ئایەتە موبارەکە ئومێد بەخشترین ئایەتە لە قورئاندا، بۆ کەسانێک کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ هەمووشمان پێویستییمان بە گەڕانەوە بۆ لای خوا هەیە، وەک لە کتێبی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا، باسم کردوە، کە گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ بەگشتیی سیفەتی بڕوادارانە، بەڵکو پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر گەڕاونەوە بۆ لای خوا، گەڕانەوەش بۆ لای خوا، تەنیا ئەوە نیە کە لە گوناهەوە بۆ فەرمانبەریی بگەڕێیەوە، بەڵکو گەڕانەوە بۆ لای خوا، جاری وایە لە کوفرو شیرکەوەیە بۆ ئیمان و خوا بەیەکگرتن و، جاری وایە لە ئیفاقەوەیە، ئیفاق و موخەنتەتیی بۆ مسوڵمانەتیی ساغ و ڕاست و، جاری وایە لە ئیلحادەوە هەیە بۆ خواناسیی و، جاری واش هەیە لە گوناهو تاوانەوەیە بۆ فەرمانبەریی و، جاری واش هەیە لە فەرمانبەرییەکی کەمەودیە بۆ فەرمانبەرییەکی باشترو، جاری واش هەیە، لە فەرمانبەرییەکی زۆر باشیشەوەیە، بەڵام گەڕانەوە بۆ لای خوایە، کە بڵێی: خوایە! ئەو تاعەت و فەرمانبەرییەی من ئەنجامی دەدەم، ئەگەر زۆر زۆر باشیش بێ، بەڵام شایانی تۆ نیەو، شایستەی مەقامی بەرزی تۆ نیە، کە پێغەمبەران بەو جۆرە گەڕانەوەیە بۆ لای خوا گەڕاونەوە.

**تەوەری دووەم: دە (١٠) بەڵگە لەسەر ئومێد بەخشترین بوونی ئەم ئایەتە:**

**٢)- (فخر الدين الرازي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا: (مفاتيح الغيب)[1]، کە بە (التفسير الكبير)یش ناسراوە، بە دە (١٠) بەڵگە ئەم ئایەتە شی دەکاتەوە، کە ئومێد بەخشترین ئایەتە لە قورئاندا، ئێمەش بە تەعبیرو دارشتنەوەی خۆمان و کەم و زیاد کردنەوە لێی دەخوازینەوە:**

**١- دەڵێ: (سَمَّى المُذْنِبَ بِالعَبْدِ)، ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِيَ﴾، گوناهباری بە بەندەی خۆی پێناسەی کردوە، ئنجا مادام بەندەی خۆی بێ، ئەوە مەدحە، یاخود بە لای کەمەوە ئومێد پێ بەخشینی تێدایە، کە تۆ هەر بەندەی خوای، ئەگەر گوناهباریش بی و، بگرە بێ ئیمانیش بی، هەر بەندەی خوای.**

**٢- (أَضَافَهُمْ إِلَى نَفْسِهِ)، ﴿يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ﴾، پاڵیداونە لای خۆی: بەندەکانی من، ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە کە ئەو ئایەتە جێی دڵخۆشیی و ئومێدە.**

**٣- کە فەرموویەتی: ﴿أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾، (فَسَمَّى الذَّنْبَ إِسْرَافًا)، گوناهەکەی ناو ناوە زێدەڕۆیی، ئنجا فەرمووشیەتی: (عَلَى أَنفُسِهِم) واتە: زێدەڕۆییتان کردوە لە دژی خۆتان، واتە: گوناهو تاوانەکە بە زیانی خۆتانە، ئەگەرنا هیچ زیانێکی بە خوا نەگەیاندوە.**

**٤- کە فەرموویەتی: ﴿لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾، کەواتە: بە هیوای بەزەیی خوابن، چونکە فەرموویەتی: لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، کەواتە: ئومێدەواربن بە بەزەیی خوا.**

**٥- کە فەرموویەتی: ﴿مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾، نەیفەرمووە: (مِنْ رَحْمَتِي) بەڵکو فەرموویەتی: (مِن رَحْمَةِ اللَّه)، ئنجا ڕەحمەتێک پاڵبدرێتە لای خوا، کە خوا ﷻ خاوەنی هەموو ئەو سیفەت و خەسڵەتە بەرزو پەسندانەیە، کە هیچیان سنووریان نیە، نە بەزەیی خوا ﷻ سنووری هەیە، نە لێ خۆشبوونەکەی، نە کەرەم و بەخشینی، نە حیکمەتی، هیچکام لەو سیفەتانەی خوا ﷻ سنووریان نیە.**

---

(١ ) ج: ٢٧، ص: ٥٠٤.

٦- کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ﴾، بە دڵنیایی خوا دەپۆشێ، دەبووڕێ، نەیفەرمووە: (إِنَّهُ يَغْفِرُ)، (إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ﴾، کە باسی خوا ﷻ دەکات، ناوی خوا (ٱللّه) دەهێنێ، مانای وایە خوا ﷻ بە هەموو سیفەتەکانیەوە باسی دەکرێ.

٧- کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾، واتە: لە تێکڕای گوناهان دەبووڕێ، وێکڕا، واتە: پێکەوە لە هەموو گوناهەکان دەبووڕێ، ئەگەر تەوبەیەکی ڕاست و چاک بکرێ.

٨- کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو زۆر لێبووردەیە، وەسفی خۆی کردوە بە لێبووردن و لێبوردنیشی لە خۆیدا کورت هەڵێناوە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو زۆر لێبووردەیە.

٩- هەروەها خوا عزوجل بە بەزەییش خۆی پێناسە کردوە: ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، واتە: لە گوناهەکانیش دەبووڕێ و بەزەییش دەنوێنێ.

١٠- بە شێوازی کورتهەڵێنان خۆی بە لێبووردەو بە بەزەیی پێناسە کردوە: ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە هۆی ڕاناوی جیاکردنەوە (ضَمِيْرُ الفَصْل)ەوە، جارێ بە هۆی (إِنَّ)ە، کە ئامرازی جەختکرنەوەیەو، پاشان (هُوَ) کە پێی دەگوترێ: ڕاناوی جیا کردنەوە (ضَمِيْرُ الفَصْل) واتە: بەس ئەو زۆر لێبووردەیەو، زۆریش میهرەبان و بە بەزەییە.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسەدا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ دێنین:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِهِ يَضْحَكُونَ وَيَتَحَدَّثُونَ، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَبْكَى الْقَوْمَ، وَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: يَا مُحَمَّدُ، لِمَ تُقَنِّطُ عِبَادِي؟ فَرَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: أَبْشِرُوا، وَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا} (أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٥٤، وإسناده حسن).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: ڕۆژێـک پێغەمبـەر ﷺ چـووە لای کۆمەڵێـک لـە هـاوەڵانی، لـەو کاتـەدا قسـەیان دەکـردو پێدەکەنیـن، ئەویـش فەرمـووی: سـوێند بـەو زاتـەی گیـانی منـی بـە دەستە، ئەگـەر ئـەوەی مـن دەیزانـم، ئێـوە زنیباتـان، کـەم پێدەکەنیـن و زۆر دەگریـان، دوایـی ڕۆیشـت، خەڵکەکـەی گریانـد، خـوا ﷻ سرووشی بـۆ کـرد، ئـەی موحەممـەد! بۆچـی بەنـدەکانی مـن نائومێـد دەکـەی؟ ئیـدی پێغەمبـەر گەڕایـەوە بـۆ لایـان و فەرمـووی: موژدەتـان لـێ بـێ و هەوڵبـدەن ڕێـی ئێـوە ڕاسـت بگـرن، خۆتـان نزیـک بخەنـەوە.

واتـە: ئەگـەر نەتانتوانی ڕێـک بە ڕێدا بڕۆن، خۆتـان نزیـک بخەنـەوە، ئەوەندەی بۆتـان دەگونجـێ لـە حـەقی ئێوە ڕاسـت و لـە پێکانی ئامانـج، بخەفتێن.

**مەسەلەی دووەم:**

**لـە ڕۆژی قیامەتـدا، ئەوانـەی درۆیـان بـۆ خـوا ﷻ هەڵبەسـتوە (گوتوویانـە: هاوبـەشی هـەن، یـان ڕۆڵـەی هـەن)، ڕوویـان ڕەش هەڵدەگـەڕێ و دۆزەخیـش جێگایانـە، ئەوانـەش کـە پارێزیـان کـردوە، خـوا ﷻ بەهـۆی سـەرفرازییانەوە، دەربازیـان دەکات و، هیـچ زیـان و دڵتەنگیـان تـووش نابـێ:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾، هەروەها لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، (بێگومان (و)ەکە بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، ئەم ڕستەیە دەیگێڕێتەوە بۆ یەکێک لە ڕستە پێشووەکان)، ئەوانەی درۆیان بۆ خوا ﷻ هەڵبەستوە، دەیانبینی ڕوویان ڕەشهەڵگەڕاوە، (كَذَبُوا عَلَى اللّٰه: نَسَبُوا إِلَيْهِ مَا هُوَ مُنَزَّهٌ عَنْهُ)، درۆیان بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، واتە: شتێکیان پاڵداتەوە لای خوا ﷻ، کە خوا لەوە پاک و دوورە، کە دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾، ئەمە وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (آل عمران)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەندێک ڕوو سپیی و درەوشاوە دەبن و، هەندێک ڕوو ڕەش و تڵخ دەبن، کە بە تەئکید ڕووی ئەهلی ئیمان سپیی و گەش و درەوشاوە دەبن، ڕووی ئەهلی کوفرو تاوان، ڕەش و تڵخ دەبن، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ:

٢)- ﴿ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، ئایا لە دۆزەخدا جێگای حەوانەوە بۆ خۆ بەزلگران نیە؟! ئەوانە خۆ بەزلگربوون لە بەرانبەر پەیامی خواو، لە بەرانبەر

پێغەمبەری خوادا ﷺ، بۆیە جێگەی حەوانەوەیان، ئەگەر هەبێ، شوێنێک کە تێیدا پشوو بدەن، بریتیە لە دۆزەخ، چونکە (مَثْوَى) ناوی شوێنە، (ثَوَاء) بە مانای پشوودان و ئیسراحەت کردنە، کە ئەمە بە توانجەوە خوا ﷻ دەیفەرموێ، ئەگەرنا بۆ ئەهلی دۆزەخ، پشوودان و ئیسراحەت و سرەوتن نیە.

لە بارەی خۆ بەزلگرییەوە کە سیفەتێکی زۆر خراپە، خوا ﷻ لە چەند شوێنندا لە قورئاندا بێبڕوایانی ناحەزی خۆی بەو سیفەتە دزێوە پێناسە کردوە، لەو بارەوەش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ:

[يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَمْثَالَ الذَّرِّ، فِي صُوَرِ النَّاسِ، يَعْلُوهُمْ كُلُّ شَيْءٍ مِنَ الصَّغَارِ، حَتَّى يَدْخُلُوا سِجْنًا فِي جَهَنَّمَ] (أخرجه أحمد: ٦٦٧٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن).

واتە: خۆ بەزلگرەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، وەک مێرووی گچکە کۆدەکرێنەوە، لە شێوەی مرۆڤدا، زەبوونیی و گچکەیی پێیانەوە پەیوەست دەبێ، تاکو دەخرێنە نێو زیندانێک لە دۆزەخدا.

خوا پەنامان بدات، ئنجا ئەگەر ئەوە حاڵی کەسانێکە کە درۆیان بۆ خوا هەڵبەستوەو، لە بەرانبەر پەیامی خوا ﷻ و پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆیان بە گەورە گرتوە، با بزانین ئەهلی ئیمان چۆنن؟

٣)- ﴿ وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوْا بِمَفَازَتِهِمْ ﴾، خوا ﷻ ئەوانەی پارێزیان کردوە، بەهۆی سەرفرازییانەوە، قوتاریان دەکات، (مَفَازَة) خوێندراویشەتەوە: (مَفَازَات)، (لِمَفَازَاتِهِمْ)، (المَفَازَةُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ لِلْفَوْزِ، أو إسْمٌ لِلفَلَاةِ لأَنَّهَا مَكَانُ الفَوْزِ)، (مَفَازَة) یان چاوگێکی میمییە لە وشەی (فَوْز)، (فَوْز)یش یانی: سەرفرازیی و ڕزگاربوون، دەرباز بوون، یاخود (مفازة) ناوە بۆ دەشت، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر بکەوێتە دەشت، مانای وایە دەربازی بووە، لە دەریا دەربازی بووەو، لە چیاییەک کە لێی عاسێ بووە، ئەگەر بێتە خوارێ، دەربازی بووە، خوا ﷻ ئەوانەی کە پارێزیان کردوە، بە هۆی سەرفرازییانەوە،

ئەو سەرفرازییەی کە ئەنجامی تەقواو کردەوەی باشیانە، دەربازو قوتاریان دەکات لە سزای دۆزەخ.

٤)- ﴿ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ ﴾، زیانیان تووش نابێ، ناڕەحەتییان تووش نابێ.

٥)- ﴿ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، خەفەتیش داناگرن، واتە: نە لە ڕووی جەستەییەوە زیان و ناڕەحەتییان تووش دێ، نە لە ڕووی دەروونییشەوە، خەم و پەژارە دادەگرن.

ئنجا: ﴿ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، ئەمە ڕوونکەرەوەی ڕستەی پێشتییە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ بِمَفَازَتِهِمْ ﴾، خوا ﷻ ئەوانەی پارێزیان کردوە بە هۆی سەرفرازییانەوە، دەربازیان دەکات، ئنجا ڕوونی دەکاتەوە دەربازکردنەکەی خوا ﷻ بۆ ئەوان چییە؟ ئەوەیە کە ناڕەحەتیی و زیانیان تووش نابێ، لە ڕووی جەستەییەوە، هەروەها لە ڕووی دەروونییشەوە خەم و پەژارە داناگرن.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (جَاءَ نَفيُ السُّوءِ بِالجُملَةِ الفِعلِيَّةِ، إِذْ أَهلُ النَّارِ فِي حَالَةِ مَسِّ سُوءٍ مُتَجَدِّدٍ، وَجَاءَ نَفيُ الحُزْنِ بِالجُملَةِ الإِسْمِيَّة): ﴿ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، واتە: لابردنی خراپەو زیان بە ڕستەی کرداریی هاتوە، ﴿ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ ﴾، بۆیەش بە ڕستەی کردارییە، چونکە خەڵکی نێو ئاگر هەمیشە لە حاڵەتی تازە بوونەوەی زیان و ئازارو ئەشکەنجەدان، بەڵام لابردنی خەم و خەفەت بە ڕستەی ناویی هاتوە، ﴿ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، هەروەها ئەوان پەژارە داناگرن، (وَذَلِكَ لِأَنَّ شَأْنَ الأَسْوَاءِ الجَسَدِيَّةِ تَجَدُّدُ آلَامِهَا، وَشَأْنَ الأَكْدَارِ القَلْبِيَّةِ دَوَامُ الإِحْسَاسِ بِهَا)، بەڕاستیی شیکردنەوەیەکی جوانە.

واتە: لەبەر ئەوەی ئازارە جەستەییەکان حاڵەتیان وایە، کە دووبارە دەبنەوە، بەڵام حاڵەتە دەروونییەکان، بەردەوام مرۆڤ هەستیان پێ دەکات، بۆیە پێویستی نەکردوە باسی تازە بوونەوەیان بکرێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ بەدیهێنەری هەموو شتێکەو سەرپەرشتیاریەتی و، کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەویش تەنیا بە دەست وین، ئەوانەی بێبڕواشن بە ئایەتەکانی خوا، ئەوانەن زیانباران و ڕەنجەڕۆیانی ڕاستەقینەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، واتە: هەر شتێک کە دروستکراو و وەدیهێندراو بێ، خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەیداکەریەتی، بەڵام ئەو شتانەی سیفەتی مەخلووقیان بەسەردا ناچەسپێ، پەکیان لەسەر بەدیهێنەر (خالق) نەکەوتوە، بەڵام هەر شتێک کە مەخلووق بێ و بەدیهاتبێ و بەدیهێنرابێ، بە تەئکید بەدیهێنەرەکەی و پەیداکەرەکەی خوایە ﷻ چونکە هیچ پەیدابوویەک بەبێ پەیداکەر نابێ، تەنیا خواش ﷻ توانای وەدیهێنانی شتەکانی هەیە لە نەبوونەوە.

٢)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾، ئەو (خوا ﷻ)یش بەسەر هەموو شتێکەوە سەرپەرشتیارە، (وَكِيل) لە ئەصڵدا (فَعِيل بِمَعْنَى مَفْعُول)ە، واتە: (مَوْكُول إِلَيْهِ) کار پێ سپێردراو، خوا ﷻ بەسەر هەموو شتێکەوە کار پێ سپێردراوە، واتە: چارەنووس و کاروباری هەر شتێک بە دەست خوایە ﷻ، (**الوَكِيْلُ: المُتَصَرِّفُ فِي شَيء بِدُونِ تَعْقِيْبٍ**)، (وكيل): بریتیە لە کەسێک دەستوەردان لە شتێکدا دەکات و دەستکاریی دەکات، بێ ئەوەی کەس بە دوایدا بچێ، یان کەسێک بتوانێ بڵێ: بۆچی واتکردو بۆ واتنەکرد؟!

٣)- ﴿ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی وین، بە دەست وین، (مَقَالِيْد) کۆی (إِقْلِيْد)ە، هەندێک گوتوویانە: (إِقْلِيْد)یش لە فارسییەوە

بە عەرەبیی کراوە، لە (كِلِيْد)ی فارسییەوەیە کە بە کوردییش دەڵێین: کلیل، زۆریش پێدەچێ وابێ، چونکە دوایی کە دەگەڕێین بۆ ڕیشەی (مَقَالِيْد) لە زمانی عەرەبییدا، نایبینینەوە، کەواتە: وەک چۆن (سُنْدُس، إِسْتَبْرَق، زَرَابِيّ، سَجِّيل)، ئەوانە لە ئەسڵەکە یان ڕۆمیین، یان فارسیین، ئەوانیش لەوانەیە بگەڕێنەوە بۆ کوردیی، بۆ وێنە: (زَرَابِيّ) کە کۆی (زربیّ)یە، لە ئەسڵدا لە (ژێر پێ)وە هاتوە، (سِجِّيل) کە (سنج جِلَ)ە، لە سەنگی گڵەوەیە، واتە: بەردی قوڕ، ئەوانە ئەسڵەکەیان فارسییەو فارسییش لەگەڵ کوردیی دا ڕیشەکەیان یەکە، هەروەها لەگەڵ زمانەکانی دیکەی (نوردو هیندیی)و هەموویان ڕیشەیان یەکە، کە زمانە (هیندو ئورووپییەکان)یان پێ دەڵێین، ئنجا (مَقَالِيْد) کۆی (إِقْلِيْد)ە، (إِقْلِيْد) واپێدەچێ لە کلیدی فارسییەوە هاتبێ، واتە: کلیل، کە بە (مَقَالِيْد) کۆ دەکرێتەوە، خوا ﷻ کە دەفەرموێ: کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی بە دەست وین، واتە: کلیلی خەزێنەکان و کلیلی دەروازەی نهێنییەکان، تەنیا بەدەست خوای پەروەردگارەوەن، هەڵبەتە ڕایەکی دیکەش هەیە کە وشەی (مَقَالِيْد) کۆی (إِقْلِيْد)بێ، کە لە (إِقْلِيْدِس)ەوە هاتوەو وشەیەکی ڕۆمییە، ئەویش بە مانای کلیلە.

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ خۆی بەو سێ وەسفە سەرەکییە پێناسە کرد، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، سەرپەرشتیارو کارپێ سپێردراوو پارێزەری هەموو شتێکە، کلیلی ئاسمانەکان و زەوی بەدەستە، ئنجا دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەش بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا.

٥)- ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾، ئا ئەوانەن زیانبارانی ڕاستەقینە.

کەواتە: ئەو سێ ڕستەیەی پێشێ، کە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٦٣﴾ ﴾، ئەم سێیە، هەموویان ڕێخۆشکەرن بۆ ئەوەی دوایی دێ، کە بریتیە لەوەی دەفەرموێ: ئەوانەی بێبڕوان هەر ئەوانەن زیانبار: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا، ئنجا ئایەتەکانی خواش دەگونجێ

مەبەست پێیان ئایەتە خوێنراوەکان بن، کە فەرمایشتی خوان، دەشگونجێ ئایەتە بینراوەکان بن، دیاردە سرووشتییەکان، کە خوا ﷻ دوو کتێبی خستوونە بەر دەستی بەشەر: کتێبێک کە دەخوێنرێتەوەو، ئەو کتێبەی کە دەبینرێ، ئەو کتێبەی کە دەخوێنرێ قورئانەو، ئەو کتێبەی دەبیندرێ گەردوونەو، خوا برگەکانی هەر کام لەو دوو کتێبەی ناوناون ئایەت، هەم رستەکانی قورئانی ناوناون ئایەت، هەم دیاردە سرووشتییەکانیشی ناوناون ئایەت، چونکە هەر کامیان نیشانەن و، ئێمە هەم بە رستەکانی قورئان دەزانین، کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، هەم ئەگەر تەماشای گەردوونیش بکەین، دەزانین دروستکراوی خوایە، قورئان بێژراوی خوایە، گەردوونیش دروستکراوی خوایە، ئنجا ئێمە هەم لە رێی وتە بێژراوەکانیەوە، هەم لە رێی دروستکراوەکانیەوە، خوای پەروەردگار دەناسین، کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾، راناوی (هُمْ): کە پێی دەگوترێ: راناوی جیاکردنەوە (ضَمِيرُ الفَصْل)، کورتهەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: هەر ئەوانەن زیانباران و رەنجەڕۆیانی راستەقینە، ئنجا ئەو سێ رستەی پێشێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٦٣﴾ ﴾، زەمینە خۆشکەربوون بۆ ئەوەی کە دوایی دێ، کە دەفەرموێ: ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا، ئەوانە رەنجەڕۆ و زیانبارانی راستەقینەن، دیسان ئەوەش هەمووی دەبێتەوە بە رێخۆشکردن، بۆ ئەوەی کە دوایی دێ، کە لە مەسەلەی چوارەمدا باسی دەکەین و، بریتیە لە تەنیا پەرستنی خواو هاوبەش بۆ دانەنانی.

مەسەلەی چوارەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە پرسیاری سەرزەنشتکەرانە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکات: ئایا ئەی نەفامینە! فەرمانم پێدەکەن، جگە لە خوا بپەرستم؟! دوایی پێڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەی کە سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمْ)، سرووشیان بۆ کراوە، کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێن، کردەوەکەیان هەڵدەوەشێتەوەو لە زیانباران دەبن، بۆیە پێویستە موحەممەدیش تەنیا خوا بپەرستێ و لە سوپاسگوزارانیش بێ، وەک تێکڕای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمْ):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ ﴾، بڵێ: ئایا فەرمانم پێدەکەن، جگە لە خوا بپەرستم، ئەی نەفامینە! ﴿ تَأْمُرُونِّي ﴾، هەم بەو شێوەیە خوێنراوەتەوە کە درێژ کردنەوەی قورسکراو (المَدُّ المُثَقَّل)ی پێ دەڵێن، پێنج شەش جووڵە (حركة) درێژ دەکرێتەوەو، هەم خوێنراویشەتەوە: (تَأْمُرُونِي)، هەردوو خوێندنەوەکانیش هەر یەک واتایان هەیە، ئایا فەرمانم پێدەکەن کە جگە لە خوا بپەرستم! ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلیکەرانەی سەرزەنشتکارانەیە، ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: (قُلْ) بڵێ: ئایا فەرمانم پێدەکەن جگە لە خوا بپەرستم؟ ئەمە بۆ ئەوەیە کە قسەکانی پێشێ شێوەی نادیار (غائب) بوون، خوا ﷻ ویستوویەتی ئەمجارە بیکات بە شێوەی دواندن (خِطَاب)و بەو (قُلْ)ە، ئەو شێوە قسەکردنەی پێشێ، لە حاڵەتی نادیارەوە گۆڕا بۆ حاڵەتی ڕووبەڕوو و دواندن.

﴿أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ﴾، ئـەی نەفامینـە! وشـەی (جَاهِلُوْن) كـۆی (جَاهِـل)ە، كـە لـە (جَهـل)ەوە هاتـوە، (جَهْـل) پێچەوانـەی زانیارییـە (ضِـدُّ العِلْـم)، واتـە: ئـەی ئـەو كەسانەی نازانـن، كەواتـە: وشـەی (جَاهِلون)، لێرەدا لـەم ڕەوتـەدا بـە مانـای جنێو و قسـەی پـێ گوتـن نیـە، بەڵكـو بـە مانـای بەیـانی حاڵـە، واتـە: ئـەی ئەوانـەی كـە نازانـن، قـەدری خـوا ﷻ نازانـن، پێگـەو پایـەی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوا نازانـن، بۆیـە پێـم دەڵێـن: جگـە لـە خـوا بپەرسـتم!

٢)- ﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾، بە دڵنیایی سرووش بۆ لای تۆ و بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش كراوە، ئەگەر هاوبەش دابنێی (بۆ خوا) كردەوەكەت هەڵدەوەشێتەوە.

(الوَحِـيُ: الإعْـلَامُ مِـنَ اللـهِ بِوَاسِـطَةِ مَلَـك)، واتـە: وەحیـی ئاگاداركردنەوەیـە لـە خـواوە بـە هـۆی فریشـتەیەكەوە، بـەڵام لـە ئەسـڵی زمانـدا (الوَحِـي: الـكَلَامُ الخَفِـيُّ أو الإعْـلَامُ الخَفِـيُّ)، وەحیـی قسـەیەک یاخـود ئاگاداركردنەوەیەكـی پەنهانـە، بـەڵام مانـای زاراوەیـی وەحیـی: [بریتیـە لـە نـاردنی خـوا ﷻ پەیامێكـی خـۆی بـە فریشـتەیەک دا بـۆ یەكێـک لـە پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)]، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بـە دڵنیایـی سرووش بـۆ لای تـۆ و، بـۆ لای ئەوانـەی پێـش تـۆش كـراوە: ئەگـەر هاوبـەش دابنێـی، كردەوەكـەت هەڵدەوەشـێتەوە، ئەگـەر هاوبـەش دابنێـی بـۆ خـوا ﷻ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ﴾، ئـەم (تَـاء الخِطَـاب)ی دوانـدن بـۆ هـەر كەسێكە كـە وەحیـی بـۆ نێـردراوەو، نێوەڕۆكـی ئـەو پەیامـە نێـردراوەش ئـەوە بـووە: ئەگـەر هاوبـەش بـۆ خـوا دابنێـی، كردەوەكـەت هەڵدەوەشـێتەوە.

(ل)ی سـەر وشـەی: ﴿لَئِنۡ﴾، پسـپۆڕان گوتوویانـە: (الـلَّامُ: فِي (لَـئِنْ) مُوَطِّئَـةٌ لِلقَسَـمِ المَحْـذُوفِ الدَّالَـةِ عَلَيْـهِ)، لام زەمینـە خۆشـكەرە بـۆ سـوێندێک كـە قرتێـنراوە، بـەڵام لامەكـە دەلالـەتی لەسـەر دەكات و دەیگەیەنـێ، واتـە: (وَاللـهِ لَـئِنْ أشْرَكْـتَ لَيَحْبَطَـنَّ عَمَلُـكَ)، بـە خـوا ئەگـەر هاوبـەش دابنێـی، كردەوەكـەت هەڵدەوەشـێتەوە.

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾، (ل)ی سەر (لَيَحْبَطَنَّ)، (لَامُ جَوابِ القَسَمِ، وَالحَبْطُ: البُطْلَانُ وَالدَحْضُ)، ئەو (ل)ش، لامێکە بۆ وەڵامی سوێند، (حَبْط)یش بە مانای زایەبوون و هەڵوەشانەوەو لە بەین چوونە.

٣)- ﴿وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾، بە دڵنیایی لە زیانبارانیش دەبی، ئەو لام و نوون (ل، ن)ی سەر (لَتَكُونَنَّ)ش دیسان بۆ تۆخکردنەوەو بەهێزکردنی واتایەکەن، واتە: هەم (ل)، هەم (ن) هەردووکیان جەختکەرەوە (مُؤَكِّدة)ن، یانی: بە دڵنیایی بێگومان تۆ لە زیانباران دەبی، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی.

٤)- ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، بەڵکو بەس خوا بپەرستەو لە سوپاسگوزاران بە، ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، (تَقْدِيمُ المَفْعُولِ لِإِفَادَةِ الحَصْرِ)، لە جیاتی بفەرموێ: (بَلْ فَاعْبُدِ الله)، فەرموویەتی: ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، وەک (إِيَّاكَ نَعْبُدُ)، هەر کاتێک بەرکار (مَفْعُول به) پێش کارو بکەر (فعل وفاعل)ی بکەوێ، لە زمانی عەرەبییدا هەروەک لە کوردییشدا وایە، کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، لە کوردییدا بڵێ: تۆ دەپەرستین، جیایە لەوەی بڵێی: بەس تۆ دەپەرستین، ئەو شێوازە کورت هەڵێنان دەگەیەنێ واتە: بێجگە لە تۆ ناپەرستین، بەڵام ڕستەی: (تۆ دەپەرستین)، دەگونجێ شتی دیکەشی بدەیە پاڵ، تۆ دەپەرستین و فڵان شتیش، بەڵام ئەگەر گوتت: هەر تۆ دەپەرستین، بەس تۆ دەپەرستین، تازە بوار نیە شتی دیکەی بخرێتە پاڵ.

کە دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، (بَلْ: لِإِبْطَالِ مَضْمُونِ جُمْلَةِ: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ﴾، أَيْ: بَلْ لا تُشْرِكْ، أَوْ لِإِبْطَالِ مَضْمُونِ جُمْلَةِ: ﴿أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ﴾)، واتە: ئەو ڕستەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی نێوەڕۆکی ڕستەی: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ﴾یە، کە دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، واتە: (بَلْ لَا تُشْرِكْ) بەڵکو هاوبەشی بۆ دامەنێ، یاخود بۆ هەڵوەشاندنەوەی نێوەڕۆکی ڕستەی: ﴿أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ﴾، ئایا فەرمانم پێدەکەن کە جگە لە خوا بپەرستم؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، بەڵکو بەس خوابپەرستەو هاوبەشی بۆ دامەنێ.

﴿وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، لە سوپاسگوزارانیش بە، جاری دیکەش باسمان کردوە، ئەم جۆرە دەربڕینە کە دەفەرموێ: ﴿وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، لە جیاتی بفەرموێ: (وَٱشكُر) یان بفەرموێ: (وَكُنْ شَاكِرًا)، مانایەکەی بەهێزترە، واتە: هێندە سوپاسگوزاربە، کە بچیە نێو قووڵایی سوپاسگوزارانەوە بۆ خوا.

ئەمەی لێی وەردەگیرێ: هەر کەسێک هاوبەش بۆ خوا دابنێ، بەرانبەر بە خوا سپڵەو ناسوپاس و بێ ئەمەگە، هەروەها بەندایەتیی بۆ خوا، مایەی سوپاسگوزارییە بۆ خوا، هەر بۆیەش پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، لێی دەگێڕێتەوە: هەوانە هەڵدەستا ئەوەندە هەو لوێژی دەکرد، تاکو پاژنە پێی دەقەڵشین، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ زۆر خۆت ئەزیەت دەدەی، خوا ﷻ لە هەموو شتێکت خۆش بووە، فەرمووی: {أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا}[١]، واتە: ئەدی بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم بۆ خوا، کەواتە: خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا، کاکڵی سوپاسگوزارییە بۆ خوا.

---

(١) «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى قَامَ حَتَّى تَفَطَّرَ رِجْلَاهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَتَصْنَعُ هَذَا، وَقَدْ غُفِرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ! أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»! متفق عليه، البخاري: ١١٢٧، مسلم: ٧٧٥

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**ڕەخنەگرتن لەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن و، هاوبەشی بۆ دادەنێن، کە وەک بۆ خوا شایستەیەو لێی دەوەشێتەوە، بەرزیی و ڕێزو مەزنییان بۆ خوا دانەناوە، لە حاڵێکدا لە ڕۆژی قیامەتدا زەمین چەنگێکیەتی و، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستیەوە پێچراوەو ڕێک نووشتراو دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴾، وەک بۆ مەزنیی خوا شایستەیە، ئاوا خوایان بە مەزن نەگرت.

شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (هـذا مِنْ إضَافَةِ الصِّفَةِ إلى المَوْصُوف)، ئەمە (لە جیاتی وەسفکراو پاڵبدرێتە لای سیفەت)، لێرەدا سیفەت پاڵدراوەتە لای وەسفکراو، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴾، واتە: (مَا قَدَرُوْا اللهَ قَدْرَهُ الحَقَّ)، بەو ئەندازەیەی کە بۆ خوا پێویست و شایستەیە، ڕێزی خوایان نەگرت و خوایان بە مەزن نەگرت.

٢)- ﴿ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، لە حاڵێک دا لە ڕۆژی قیامەتدا تێکڕای زەوی چەنگێکیەتی.

کە دەفەرموێ: وەک پێویست ڕێزی خوایان نەگرت و مەزنیی خوایان دەرک نەکرد، وەک بۆ پێگەی بێ وێنەی خوا شایستەیە، ئاوا هەڵسوکەوت و مامەڵەیان نەکرد، مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، ئەوانەی هاوبەشی

بۆ دادەنێن، ئەگەر خوایان وەک پێویست ناسیبایە، هاوبەشیان بۆ دانە دەنا، ئاخر دروستکراو چییە بهێنرێتە ڕیزی خوا؟ کە لە چرکەیەکدا، لە قەدەر تەمەنی گەردوون، ئەو دروستکراوە دەژی، بەڵام لە قەدەر ئەزەل و ئەبەد هەر هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ، ئنجا لە ڕووی قەبارەوەش هەر کام لە دروستکراوەکان لە چاو فراوانیی گەردوون، چ جای لە چاو بەرزیی و مەزنیی بێ سنووری خوا، لە چاو فراوانیی و زەبەلاحیی گەردوون، کە سنوورداریشە، شتێکی زۆر بچووکە، لە ڕووی تەمەنەوەو، لە ڕووی قەبارەشەوە، هەر کامێک لە دروستکراوان تەماشایان بکەی زۆر بچووکن، کەواتە: چۆن دەبێ بهێنرێنە ڕیزی خوا ﷻو، ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ خوادا دەکرێ، لەگەڵ ئەواندا بکرێ، کە پێشکەشکردنی دروشمەکانە بۆیان و، وەرگرتنی بەرنامەکانە لێیان و، وەرگرتنی بووناسیی و تێڕامان و بۆچوونەکانە لێیان! نەخێر ئەوانە دەبێ تایبەت بن بە خوای پەروەردگارەوە.

﴿وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، ئەم (و)ە، (واو الحَالِيَة)ی پێ دەڵێن، واتە: وەک شایستەیە بۆ خوا، مەزنییان دەرنەبڕیوە، لە حاڵێکدا هەموو زەوی چەنگێکییەتی لە ڕۆژی قیامەتدا، (القَبْضَةُ فِي اللُّغَة: مَا قَبَضْتَ عَلَيْهِ بِجَمِيْعِ كَفِّك)، (قَبْضَة) لە زمانی عەرەبییدا ئەوەیە کە تۆ بە چەنگت دەیگری، یانی: لەپە دەست و پێنج پەنجەکانت دەیگری.

٣)- ﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ﴾، هەروەها ئاسمانەکانیش لە ڕۆژی قیامەتدا بە دەستی ڕاستییەوە پێچراوەن، ڕێک نووشتراون.

(طَيّ): بریتییە لە پێچانەوەی شتێک، ڕێکنووشتنی شتێک دوای ئەوەی بڵاوبۆتەوە، کۆی بکەیەوە سەریەک و ڕێکیبنووشتی، ئەوە پێی دەگوترێ: (طَيّ)، کە دەفەرموێ: (بِيَمِينِهِ: ذِكْرُ اليَمِينِ لِلْمُبَالَغَةِ فِي كَمَالِ القُدْرَةِ كَمَا يَطْوِي الوَاحِدُ مِنَّا الشَّيْءَ المَقْدُورَ لَهُ، طَيَّهُ بِيَمِينِهِ)، واتە: باسی (دەستە ڕاست) بۆ خستنە ڕووی زێدەڕۆییە لە تەواویی هێزو دەستەڵات دا، وەک چۆن یەکێک لە ئێمە شتێک کە لەبەر دەستی بێ،

دەپێچێتەوە بە ئاسانیی، وەک خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ۝٤٥ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ۝٤٦ ﴾ الحاقة، ﴿ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴾، (أي: بِالْقُوَّةَ)، بەهێز، یاخود (یمین) بە (یَمِیْن)ی وی -ئەو کەسەی دەگیرێ-، مانا دەکرێ، کە دەستە ڕاستیەتی، ئنجا کەسێک دەستی ڕاستی بگیرێ، دەستەوکەری بۆ ناکرێ.

٤)- ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ وی لەوەی دەیکەنە هاوبەش، واتە: دەیکەنە هاوبەشی خوا ﷻ.

## چەند سەرنجێک لەبارەی لەچەنگ گرتنی خوا بۆ زەوی و، پێچرانەوەی ئاسمانەکان بەڕاستی

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، هەروەها: ﴿ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ﴾، هەردوو (و)ەکانی (والأرض)و (والسّموات)، (فِي مَحَلّ النّصْبِ عَلَى الحَال)، یانی: لە حاڵێکدا کە زەوی چەنگێکی خوایە لە ڕۆژی قیامەتداو، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستیەوە پێچراونەوە، پاکیی و بەرزیی بۆ وی، لەوەی دەیکەن بە هاوبەشی، لێرەدا زانایان زۆر مشت و مڕیان بووە لە بارەی ئەو دوو تەعبیرەوە، کە خوا دەفەرمووێ:

**زەوی پڕی چەنگی خوایە، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستیەوە پێچراوەن، ڕێکنووشتراون:**

**یەک:** هەندێک لە زانایان گوتوویانە: خوا ﷻ چۆنی فەرمووە، دەبێ وا بڵێین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دەڵێین خوا ﷻ، چەنگ (قَبْضَة)ەی هەیەو ڕاستە (یَمِیْن)ی هەیە، زەوی بە چنگی خۆی دەگرێ و، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی دەپێچێتەوەو ڕێکیان دەنووشتێ، دەڵێین: وەک بۆ خوا شایستەیە.

دوو: بەڵام زۆربەی ئەوانەی لێکۆڵەرەوەو ساغکەرەوەن و، دەچنە بنج و بناوانی وشەکانەوەو، چاو چڕ دادەگرن لەسەر ڕواڵەتی وشەکان و، ئێوەڕۆک و جەوهەرو چییەتیان تەماشا دەکەن، گوتوویانە: لێرەدا خوا ﷻ مەبەستی ئەوە نیە، باسی ئەوە بکات، کە سیفەتێکی هەیە بە ناوی چنگ (قَبْضَة)و، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستیەوەن و، ڕێکیان دەنووشتێ و دەیانپێچێتەوە، وەک چۆن کەسێک شتێک دەنووشتێنێتەوەو، لە بن قۆڵی ڕاستی دەنێ، بەڵکو مەبەست پێشاندانی بەرزیی و مەزنیی خوایە ﷻ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە خوا ﷻ بیەوێ باسی چنگ (قَبْضَة)ی خۆی بکات و، باسی ڕاستە (يَمِين)ی خۆی بکات، بەڵکو ئەوەش هەروەک ئەو ئایەتانەی دیکەیە، بۆ وێنە:

أ- خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ ﴿١٠﴾﴾، لێرەدا خوا ﷻ مەبەستی ئەوە نیە، باسی دەست (يَد)ی خۆی بکات، بەڵکو واتە: چاکەی خوا بەسەرچاکەی ئەوانەوەیە، یاخود: دەسەڵاتی خوا بەسەر دەسەڵاتی ئەوانەوەیە.

ب- خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴿٤٨﴾﴾الطور، مەبەستی ئەوە نیە باسی چاوەکانی خۆی بکات، بەڵکو واتە: تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای، چونکە خوا ﷻ بە تاک (مفرد) باسی (عَيْن) دەکات: ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾﴾طه.

هەروەها باسی چاوەکان (أعيُن)یش دەکات، هەروەها بە تاک (مفرد) باسی دەست (يَد) دەکات: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ الفتح: ١٠ ، هەروەها بە دووان (مثنى)ش: ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ ﴿٧٥﴾﴾ص.

دیسان بەکۆ (جمع)ش باسی دەستەکان (أيدي) دەکات: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾﴾یس، (لەوەی دەستەکانمان کردوویانە)، بەڵێ هیچ کام لەو ئایەتانە مەبەست لێیان باسکردنی سیفەتەکانی خوا نیە، بەڵکو هەق ئەوەیە کە خوا ﷻ بەپێی عەقڵمان ئێمە دەدوێنێ، ئێمە بە چاو دەبینین و، بە دەست کارەکانمان دەکەین و، شتێک زۆر بەسەریدا زاڵ بین دەڵێین: بە چنگیەوە دەگرم، بە دوو پیتکان دەیگرم، لەبەر ئەوەی ئەو

تەعبیرانە ئێمە بەکاریان دێنین و، ئێمە لەوە حاڵیی دەبین، خوای پەروەردگاریش ویستوویەتی لە میانی ئەو تەعبیرانەدا کە ئێمە بەکاریان دێنین، ئێمە حاڵیی بکات، ئەگەرنا پایەی خواو مەقامی خوا زۆر لەوە بەرزترە، کە ئەوانە باسی سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن و بێ وێنە بن.

ئنجا هەرچۆن بێ، چ ئەوانەی کە وەک بنچینەیەک دایانناوە: (أَمِرُّوهَا كَمَا جَاءَتْ) بیانڕۆێنن، وەک هاتوون، دەڵێن و، چ ئەوانەی دیکە کە لە چوار چێوەی زمانی عەرەبیی دا مانایەکی گونجاویان بۆ دادەنێن، هەموو لایەک لەسەر بە پاکگرتنی خواو بۆ چەسپاندنی ناوو سیفەتەکانی یەکدەنگن، بەڵام بە داخەوە هەندێک لەوانەی سەر بە قوتابخانەی (حَنَابِلة)ن، کە زۆر جەختیان کردۆتەوە لە سەر سیفەتە خەبەرییەکان، ئەویش لە کاردانەوەی ئەوانەدا کە خوایان لە سیفەتەکانی خۆی پەک خستوە، هەندێکجار (حَنَابِلة) سەریان کێشاوە بۆ جەستاندن و وێچواندن (تَجْسِيم وَتَشْبِيه)، وەک من لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، لە کتێبی سێیەمدا کە باسی قوتابخانە فکرییەکانی مێژووی مسوڵمانان کردوە، لەوێدا باسمان کردوە، هەر بە ئیعتیڕافی هەندێک لە زانایانی (حَنَابِلة)، خۆیان وەک (إبن الجوزي وإبن عقيل)، کە (حنابلة) زۆر تێیان پەڕاندوە لەوەدا، کە ئەو وشەو تەعبیرانەی دەلالەت دەکەن لەسەر بەرزیی و مەزنیی خوا ﷻ، ئەوان هەڵساون، ئەوانەشیان کردوونە سیفەتی خوا ﷻ، ئنجا هەیانبووە زۆریش قووڵ نەبۆتەوە لە بە پاکگرتنی خوادا، بەڵکو هەر بە ڕووکەشیی واتاکانی بۆ داناون، هەیانبووە لە بەغداد چۆتە سەر مینبەرو دانیشتوەو، گوتوویەتی: وەک چۆن من ئێستا لەسەر ئەم مینبەرە دانیشتووم، خواش ﷻ ئاوا لەسەر عەرشی خۆی دانیشتوە! کە ئەوەش جەستاندنی خوا بووەو، وێکچواندنی خوا بووە بە دروستکراوەکانی، لە حاڵێکدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ﴿١١﴾﴾الشورى، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾﴾طه، زانیاریی ئەوان دەوری خوا ﷻ نادات.

لێرەدا با ئەم فەرموودەیە بێنین:

[عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ! إِنَّ اللهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْخَلَائِقَ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَنَا الْمَلِكُ، قَالَ: فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴾] (أخرجه البخاري: ٧٤١٥، ومسلم: ٢٧٨٦، والترمذي: ٣٢٤٨، والنسائي في الكبرى: ١١٠٤٥٢، وابن حبان: ٧٣٢٦).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پیاوێک لە خاوەن کتێبان هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی بابی قاسم! بێگومان خوا ئاسمانەکان لەسەر یەک پەنجەی دادەنێ و، زەوییەکان لەسەر یەک پەنجەی دادەنێ و، درەختەکان و خۆڵەکان لەسەر پەنجەکی دیکەی دادەنێ و، هەموو دروستکراوەکانی دیکەی لەسەر یەک پەنجەی دادەنێ، دوایی دەفەرموێ: بەس من حوکمڕانم، هەر من باڵا دەستم، گوتی: بینیم پێغەمبەریش ﷺ پێکەنیی، تاکو کەڵبەکانی دەرکەوتن، (نەک ددانی پێشێی، ئەوانی دیکەشی دەرکەوتن)، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴾، وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، مەزنیی خوایان دەرک نەکرد، ڕێزی خوایان نەگرت.

زانایانی کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕوون دەکەنەوە، دوو هەڵوێستیان هەن لە بەرانبەر ئەو تەعبیرەی پێغەمبەردا، هەندێکیان گوتوویانە: پشتگیریی جوولەکەکەی کردوە، کە خوا ﷻ ئەوەندە بە دەسەڵاتە، هەموو ئاسمانەکان دەتوانێ لەسەر یەک پەنجەو، دروستکراوەکانی دیکەش لەسەر یەک پەنجەی دابنێ.

هەندێکیش گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بۆیە پێکەنیوە، پێکەنینێکی بە توانجەوە بووە، یاخود پێکەنیوە بەو واتایە پێی سەیر بووە کە جوولەکەکان، ئاوا خوا ﷻ وێنا (تصوّر) بکەن، کە خوا ﷻ پەنجەی هەیەو، ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەک

و، دروستکراوەکان لەسەر یەک پەنجەی دادەنێ، بۆیە فەرمووشیەتی: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴾، وەک بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان نەگرت، کە ئاوا خوایان ﷻ لە شێوەی مرۆڤێکدا کە پەنجەی هەن، وێنا کردوە.

ئنجا با قسەیەکی (محمد الطاهر بن عاشور) بێنین لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]:

دەڵێ: (وَالمَقْصُودُ مِنْ هَاتَيْنِ الجُمْلَتَيْنِ، تَمْثِيلُ عَظَمَةِ اللّهِ تَعالى بِحالِ مَنْ أَخَذَ الأَرْضَ فِي قَبْضَتِهِ، ومَنْ كانَتِ السَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّةً، أَفْلاكُهَا وآفَاقُهَا بِيَدِهِ، تَشْبِيهَ المَعْقُولِ بِالمُتَخَيَّلِ، وهِيَ تَمْثِيلِيَّةٌ تَنْحَلُّ أَجْزاؤُهَا إِلى اسْتِعارَتَيْنِ، وفِيهَا دَلالَةٌ عَلَى أَنَّ الأَرْضَ والسَّماواتِ باقِيَةٌ غَيْرُ مُضْمَحِلَّةٍ، ولَكِنْ نِظَامَهَا المَعْهُودَ اعْتَرَاهُ تَعْطِيلٌ).

واتە: ئەمە نواندنی مەزنیی خوای بەرزە بە حاڵی کەسێکەوە، کە زەوی بە چنگەوە دەگرێ و، ئاسمانەکانیش بە سووڕگەکانیانەوەو بە ئاسۆیەکانیانەوە بە دەستەوە دەگرێ، ئەمەش وێچواندنی شتێکی مەعقوولە بە شتێکی خەیاڵکراو، کە ئەوەش وێکچواندنێکە دەگونجێ پێکهاتەکانی بگێڕدرێنەوە بۆ دوو ئیستیعارە، ((إستعارة) خواستنەوەی شتێکە بۆ مانایەک کە لە ئەسڵدا، ئەو وشەیە ئەو مانایەی نیە)، ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە ئاسمانەکان و زەوی لە ڕۆژی دواییدا لە بەین ناچن، بەڵام سیستمی ئێستایان پەک دەخرێ و، بە جۆرێکی دیکە دروست دەکرێنەوە.

منیش دەڵێم: خوا ﷻ لە سوورەتی (إبراهيم)دا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە زەوی وەک ئێستا نامێنێ و، ئاسمانەکانیش وەک ئێستا نامێنن و، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچکەر دێنە گۆڕێ.

کەواتە: بەڵگە هێنانەوەکەی (إبن عاشور) لەسەر تێکنەچوونی ئاسمانەکان و زەوی، لە جێی خۆیدا نیەو، پێچەوانەی دەقی قورئانە.

---

(١ ) ج٢٤، ص٦٣.

(سید قطب)یش ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە (في ظِلاَل)ەکەی خۆیدا، هەروەها گەلێکی دیکەش لە زانایان، ئەوانەی لێکۆڵەرەوە بوون، هەر ئاوایان گوتوەو گوتوویانە: لێرەدا هەمووی مەبەست دەرخستنی مەزنیی خوای پەروەردگارە، نەک باسی ئەوە کە خوا زەوی لە چنگ دەگرێ و، ئاسمانەکانیش لە بن قۆڵی ڕاستیی دا دەپێچێتەوە!!

مەسەلەکە هەر ئەوەیە کە لە عەقڵی ئێمەی وەنیزیک بخات، وەک چۆن ئێمە ئەگەر شتێک بە دەستەوە بگرین و، شتێکی دیکە لە بن هەنگڵی ڕستمان بنێین، مانای وایە زۆر بەسەریدا زاڵ و باڵادەستین، دەسەڵاتی خوای پەروەردگاریش بۆ خستنە ژێر ڕکێفی خۆیەوە بۆ گەردوون بەو شێوەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان هەشـت (٨) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (الزمـر)ن، ئایەتـەکانی: (٦٨ - ٧٥)، کـە تێیانـدا بـاسی ڕۆژی دوایـی کـراوە، بـە هـەردووک قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و زینـدوو کرانـەوە (السَّـاعَة، وَالقِیَامَـة)وە، کـە لـە ئەنجامـی فـوو پێداکـردنی یەکـەم و دووەم بـە کەڕەنـا (صـور)دا، لـە لایـەن ئیسـڕافیلەوە، دێنـەدی.

هەروەهـا باسـی لێپرسـینەوەو دادوەریـی لـە نێوانـدا کـران و، هـەر کەسـە بەپێـی کـردەوەی خـۆی، سـزا یـان پاداشـت درانەوەیـان، کـراوە.

پاشـان بـاسی بـە ڕێکـرانی هـەر کام لـە: بێبڕوایـانی خـۆ بەزلگـر، پـۆل پـۆل بـەرەو دۆزەخ و، پارێـزکارانی پـاک و چـاک، پـۆل پـۆل بـەرەو بەهەشـت، کراوە، کە سـەرەنجام بێبڕوایـانی خۆبەزلگـر سەرزەنشـت دەکرێـن لـە لایـەنی فریشـتەکانەوەو، ئەوانیـش پەشـێمانیی دەکێشـن، بـەڵام پارێـزکارانی بـە مراد گەیشـتوو، سـوپاس و سـتاییشی خوای پـەروەردگار دەکـەن و لـە لایـەن فریشـتە پـاک و چاکەکانـەوەش سـتاییش دەکرێـن، خۆشـیان دوایـی زۆر سـوپاس و سـتاییشی خـوا دەکـەن، کـە بـەو مەقـام و مەنزڵگایـەی گەیانـدوون، دواییـش لـە لایـەن هـەر کام لـە فریشـتەکان و، بەهەشـتییەکان و، هـەر دروسـتکراوێکی دیکـەی خـواوە ﷻ کـە بـەس خـۆی دەزانـێ چـی و چیین! سـوپاس و سـتاییشی خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان دەکـرێ، چونکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، گوتـرا: سـتاییش بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان، ئێمـە دەزانیـن ئەهـلی بەهەشـت و فریشـتەکانن، ئەهـلی بەهەشـتیش دیـارە بـە مـرۆڤ و جنـدەوە، بـەڵام هـەر خـوا ﷻ دەزانـێ چ دروسـتکراوێکی دیکـەش هەیـە، کـە هەموویـان پێکـەوە سـوپاس و سـتاییشی خـوای پـەروەردگار دەکـەن.

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ
ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ
ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾
وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٖ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ
جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٞ مِّنكُمْ
يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ
كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئْسَ
مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ
إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا
خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ
ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ
ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها فوو بە کەڕەنادا کرا (لە ئەنجامدا) یەکسەر هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و، هەر کەس کە لە زەویدایە بیهۆش بوون (مردن)، جگە لەو کەسانەی خوا بیەوێ (بمێنن)، دوایی فووێکی دیکەی پێداکرا، یەکسەر ئەوان (کە لە ئاسمانەکان و لە زەویدان) هەڵساوە بوون دەیانڕوانی ﴿٦٨﴾ سەر زەمینیش بە ڕووناکیی پەروەردگاری ڕۆشن بۆوەو نووسراو (لیستی کردەوان)یش دانران و، پێغەمبەران و شایەدەکانیش هێنران و، بە هەق و (دادگەریی) دادوەرییان لە نێواندا کرا، لە حاڵێکدا ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێ ﴿٦٩﴾ هەر کەسێش

چی کردوە (بە گوێرەی ئەوە) سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی درایەوەو، ئەویش (واتە: خوا) زاناترە بەوەی دەیانکرد ﴿٧٠﴾ ئەوانەی بێبڕواش بوون، کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخێ بەڕێکران (پاڵ ئەستۆ دران)، هەتا کاتێک هاتنە لای، دەرگایەکانی کرانەوەو، پاسەوانەکانی دۆزەخ پێیان گوتن: ئەی بێبڕوایەکان! ئایا لە خۆتان نێردراوانێکتان نەهاتنەلا، ئایەتەکانی پەروەردگارتانیان بەسەردا دەخوێندنەوەو، لەم دیدارەی ئەمڕۆتان دەیانترساندن و وریایان دەکردنەوە؟ گوتیان: با، بەڵام وشە (بڕیار)ی ئازاردران بەسەر بێبڕوایاندا چەسپیوە ﴿٧١﴾ گوترا: بچنە دەرگاکانی دۆزەخەوە بە هەمیشەیی تێیدا دەبن، (دۆزەخ) خراپترین جێگای خۆ بەزلگرانە ﴿٧٢﴾ هەروەها ئەوانەی پارێزیشیان لە پەروەردگاریان کرد بوو، کۆمەڵ کۆمەڵ بە ڕێزو حورمەتەوە بەرەو بەهەشتێ بەڕێ کران، هەتا کاتێک هاتنە لای و دەرگایەکانی کرابوونەوەو، دەرگاوانەکانی بەهەشت پێیان گوتن: سەلامتان لەسەر بێ (ئێوە) چاک و پاک بوونەوە، بە هەمیشەیی بچنە نێوی (بچنە نێو بەهەشتەوە) ﴿٧٣﴾ ئەوانیش گوتیان: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی خۆی لەگەڵدا ڕاست بردینە سەرو، زەوی (بەهەشتی) کردە میراتمان، هەر شوێنێکی بەهەشتمان بوێ، تێیدا نیشتەجێ دەبین (ئەمەش پاداشتی کەسانێکە بۆ خوا کاریان کردوەو بەهەشت) باشترین پاداشتی کارکەرانە (بۆ خوا) ﴿٧٤﴾ فریشتەکانیش دەبینی بە دەوری عەرشەوە بازنەیان بەستوە، بە ستاییشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاک دەگرن و، بە هەق دادوەرییان لە نێواندا کراو، لە لایەن هەموو لایەکەوە گوترا: ستاییش بۆ خوا پەروەردگاری جیهانییان ﴿٧٥﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلصُّورِ): (الصُّور: قِيْلَ هُوَ مِثْلُ قَرْنٍ يُنْفَخُ فِيْهِ، فَيَجْعَلُ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى ذَلِكَ سَبَبَاً لِعَوْدِ الصُّوَرِ وَالأَرْوَاحِ إِلى أَجْسَادِهَا)، (صُور) گوتراوە: وەک قۆچ و شاخی ئاژەڵ وایە، فووی پێدا دەکرێ، خوای بەرز ئەوە دەکاتە هۆکاری گەڕانەوە ڕووحەکان بۆ نێو لاشەکان، (صُور) دەگونجێ بە کەڕەنا - وەک من وام هێناوە - هەروەها بە شەیپوور (بوقي) ئەوەی کە فووی پێدا دەکرێ، بۆ کۆکردنەوەی خەڵک، مانا بکرێ.

(فَصَعِقَ): واتە: بێهۆش بوو، یان مرد، دەڵێ: (الصَّاعِقَةُ: عَلَى ثَلاثَةِ أَوْجهٍ: ١- المَوْتُ، ٢- والعَذَابُ، ٣- والنَّار) وشەی (صَاعِقَة): بە سێ جۆر مانا کراوە، مردن و ئازاردان و ئاگر، (وَالصَّاعِقَةُ: هِيَ الصَّوْتُ الشَّدِيدُ مِنَ الجَوِّ، ثُمَّ يَكُوْنُ مِنْهَا نَارٌ أَو عَذَابٌ، أَو صَوْتٌ، وَهِيَ فِي ذَاتِهَا شَيءٌ وَاحِدٌ وَهَذِهِ الأَشْيَاءُ تَأْثِيْرَاتٌ لَهَا)، (صَاعِقَة): لە ئەصڵدا بریتیە لەو دەنگە بەهێزەی لە ئاسمانەوە دەبێ، ئنجا دوایی جاری وا هەیە بڵێسەی ئاگری لەگەڵ دەبێ، ئازاری لەگەڵ دەبێ، یاخود دەنگێکی بەهێز، کە لە خودی خۆیدا یەک شتە، بەڵام ئەو شتانەی دیکە دەرهاویشتەو شوێنەوارەکانی.

(وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ): واتە: زەوی ڕوونبۆوە، دەگوترێ: (شَرَقَتِ الشَّمْسُ، أي: طَلَعَت، وَأَشْرَقَت، أي: أَضَاءَت)، (شَرَقَتِ الشَّمْسُ) واتە: خۆرەکە هەڵات، بەڵام (أَشْرَقَتِ الأَرْضُ) واتە: ڕوون بۆوە، کەواتە: خۆر هەڵدێ، بەڵام زەوی دوای ئەوەی خۆر هەڵهاتوەو ڕۆشن بۆتەوە، ڕووناک دەبێتەوە.

(وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ): هەر کەسە بە تەواویی پاداشت، یان سزای درایەوە، دەڵێ: (تَوْفِيَةُ الشَّيءِ: بَذْلُهُ وَافِيَاً وَاسْتِيفَاؤُهُ: تَنَاوُلُهُ وَافِيَاً)، (تَوْفِيَة) بە مانای

ئەوەیە شتێک بە تەواویی بدرێ، بەڵام (إسْتِيفَاء) واتە: بە تەواویی وەربگیرێ، کەواتە: (وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ): واتە: هەر کەسێک بە تەواویی سزا، یان پاداشتی کردەوەکانی خۆی درایەوە.

(وَسِيقَ): واتە: ڕۆێنرا، پاڵپێوەنرا، بە ڕێکرا، (سَوْقُ الإِبِلِ: جَلْبُهَا وَطَرْدُهَا)، ئەوەیە کە حوشترەکان بهێنرێن و دەربکرێن بەرەو شوێنێک، (سِيْقَ: ذُهِبَ بِهِ)، واتە: بردرا بۆ ئەو شوێنە، دیارە سەوقی بێبڕوایان لە قەدەر خۆیانەو، سەوقی بەهەشتییانیش لە قەدەر خۆیانە، وەک دوایی باسی دەکەین.

(زُمَرًا): (الزُّمَرُ: جَمْعُ زُمْرَةٍ: الجَمَاعَةُ القَلِيْلَةُ)، (زُمَرٌ) کۆی (زُمْرَة)یەو بە مانای کۆمەڵێکی کەم دێ، دەڵێم: مەرج نیە کۆمەڵی کەم بێ، بەڵام هەندێک لە سەرچاوەکان وادەڵێن، دەنا (زُمْرَة) واتە: کۆمەڵێک، کەم بن یان زۆر بن.

(خَزَنَتُهَآ): (الخَزَنَةُ: جَمْعُ خَازِنٍ، أَي: حَافِظٌ، وَبَوَّاب، وحَارِس)، (خَزَنَة) کۆی (خَازِن)ە واتە: خڕکەرەوەو کۆکەرەوە، کە بە مانای پارێزەر دێ، بە مانای دەرگاوان دێ، بە مانای پاسەوانیش دێ.

(طِبۡتُمۡ): واتە: پاک و چاکبوون، (طَابَ الشَّيءُ يَطِيْبُ فَهُوَ طَيِّبٌ، وَأَصْلُ الطَّيِّبِ مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ وَالنَّفْسُ)، واتە: شتەکە پاک و چاکبوو، پاک و چاک دەبێ، چاک و چاکە، وشەی (طَيِّب) لە بنەڕەتدا شتێکە کە هەستەوەرەکان چێژی لێ ببینن و، نەفسی مرۆڤیش چێژی لێ ببینێ.

(نَتَبَوَّأُ): نیشتەجێ دەبین، دەڵێ: (بَوَّأْتُ لَهُ مَكَانَاً: سَوَّيْتُ لَهُ)، شوێنەکەم بۆ تەخت کرد، بۆم خۆشکرد، (بَوَّأْتُ الرُّمْحَ: هَيَّأْتُ لَهُ مَكَانَاً)، کەسێک کە ڕم داوێ، ئەگەر نیشانەکەی بۆ دیاریی بکاو لێی ڕاست بکات، دەڵێ: (بَوَّأْتُ الرُّمْحَ) واتە: شوێنم بۆ دیارییکرد، ئەو ئامانجەی تێی دەگرم.

(حَيۡثُ): (حَيْثُ: عِبَارَةٌ عَنْ مَكَانٍ مُبْهَمٍ، يُشْرَحُ بِالجُمْلَةِ الَّتِي بَعْدَهُ)، (حَيْثُ): شوێنێکی نادیارە، بەو ڕستەی کە لە دوایەوە دێ ڕوون دەبێتەوە، مەبەست پێی

چییە، وەک: [اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ][1]، واتە: پارێز لە خوا بکە لە هەر شوێنێک بووی.

(حَآفِّينَ): (مُطِيْفِيْنَ بِحَفَافَيْهِ، أي: جَانِبَيْهِ، «إِنَّ طَالِبَ العِلْمِ لَتَحُفُّهُ المَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا»[2])، کەواتە: (حَافِّيْن) واتە: دەورەیان داوەو بازنەیان بەستوە لە هەردوو لایەوە، لە ڕاستیدا واتە: لە چواردەوری بازنەیان بەستوە، دەگوترێ: {إِنَّ طَالِبَ العِلْمِ لَتَحُفُّهُ المَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا} وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: بابای بە دوای زانستدا ڕۆیشتوو، فریشتەکان بە باڵەکانی دەوری دەدەن، واتە: ڕێزی لێ دەگرن و بە دەوریدا دێن و دەچن، وەک چۆن پەپوولە بە دەوری چرادا دێن و دەچن، حەزیان لە ڕووناکییەکەیەتی، کەسێکیش بە دوای زانستدا بگەڕێ، فریشتەکان حەز بە دیداری دەکەن و، بە دەوریدا دێن و دەچن.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢١٣٦٢، والترمذي: ١٩٨٧، وقال: حسن صحيح، والدارمي: ٢٧٩١، والحاكم: ١٧٨، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي.

(٢) أخرجه الطبراني: ٧٣٤٧، قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح، وحسنه الألباني.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا، بـاسی ڕۆژی دوایـی دەکات، بـە هـەردوو قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و هەڵسـانەوەوە، واتـە: کۆتایـی پێهاتنـی ژیـانی مـرۆڤ لەسـەر زەوی و، پێچرانـەوەی بارگـەو بنـەی ئـەم گەردوونـە، قۆناغـی یەکـەم، قۆناغـی دووەمیـش: زینـدوو کرانـەوەی مرۆڤـەکان و، هێنرانـە پێشـی لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت بـۆ مـرۆڤ و بـۆ جنـد، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ﴾، فـوو بـە کەڕەنـادا کـرا، (صـور) واتـە: کەڕەنـا کـە لەلایـەن ئیسـڕافیلەوە (عَلَيْـهِ الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم) وەک لـە هەندێـک دەقـی سـوننەتدا هاتـوە، دوو جـاران فـووی پێـدا دەکات: جـاری یەکەمیـان دەرهاویشـتەو ئەنجامەکـەی ئەوەیـە: هـەر کـەس لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە، دەمرن: ﴿ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هەر کەسێک کـە لـە ئاسـماندا هەیـەو، هـەر کەسێک کـە لـە زەویـدا هەیـە، بیهـۆش بـوو، ئنجـا ئـەو بێهـۆش بوونـە بـەس بـە مانـای بیهـۆش بوونـە، یـان بـە مانـای مردنـە؟ هـەردوو واتایەکـە گونجـاون، ﴿ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، مەگـەر کەسێك خـوا ﷻ بیـەوێ نەمـرێ، یـان بێهـۆش نەبێ، ﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ ﴾، دوایـی فوویەکـی دیکـەی پێداکـرا بـۆ جـاری دووەم، لەلایـەن ئیسـڕافیلەوە، ﴿ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴾، یەکسـەر کتوپـڕ ئـەوان هەڵسـابوونە پـێ، دەیانـڕوانی، واتـە: مرۆڤـەکان و جنـدەکان هەموویـان زینـدوو کرانـەوەو هەڵسـێنرانەوە، بۆیـەش ئـەو قۆناغـە پێـی دەگوترێ: (قیامـة) هەڵسـانەوە.

﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾، زەوییـش بـە ڕووناکیـی پـەروەردگاری ڕوون بـۆوە، ڕۆشـن بـۆوە، ڕووناکیـی خـوا ﷻ کـە سـیفەتێکی خوایـە، وەک هەمـوو سیفەتەکانی و نازانیـن چۆنـە، نـەک ئـەو ڕووناکییـە کـە دەیبینیـن، یاخـود ڕووناکییەک کـە خـوا لـە ڕۆژی دوایـدا دەیخوڵقێنـێ و پەیـدای دەکات، کەواتـە: ﴿ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾، سـیفەتێکی تایبەتیـی خوایـەو نازانیـن چۆنە؟ یاخود دروسـتکراوێکی تایبەتیـی خوایەو،

جۆرێکـە لـە ڕووناکیـی بـۆ ئـەو ڕۆژە دروسـتی دەکات، هـەردووک واتایەکـە گونجـاون، ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَـٰبُ ﴾، کتێبیـش دانـرا، واتـە: نـووسراوەکان دانـران، کە مەبەسـت لیسـتی کـردەوەی مرۆڤەکانـن، کەواتـە: (الکتـاب)، کـە (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە، مانـای جینـس دەگەیەنـێ، واتـە: جینسـی نـووسراوەکان، کـە کـردەوەی مرۆڤەکانیـان تێـدا لیسـت کراون و نووسراونـەوەو تۆمـار کـراون، دانـدران، ﴿ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ ﴾، پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) و شـایەدەکانیش، ئەوانـەی شـایەدیی دەدەن، لـە فریشـتان و لـە غەیـری فریشـتان، هەموویـان هێـنران، ﴿ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾، دادوەرییـان لـە نێـوان دا کـرا بـە دادگەریـی و بـە هـەق، ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە ئـەوان ستەمیان لـێ ناکرێ.

﴿ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾، هـەر کەسـە بەپێـی ئـەوەی کردوویـەتی، سـزا یـان پاداشـتی درایـەوە، ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، خـواش ﷻ زاناتـرە بـەوەی دەیانکـرد، بگـرە لـە خۆشـیان پێیـان زاناتـرە، ئنجـا دوای ئـەوەی دادگایـی کـران و دادوەرییـان بـە دادگەرانـە لـە نێوانـدا کـرا، دەبنـە دوو بـەشی سـەرەکیی: بەشـێکیان بـەرەو دۆزەخ بـە ڕێ دەکرێـن، خـوا پەنامـان بـدات، بەشێکیشـیان بـەرەو بەهەشـت بـە ڕێ دەکرێـن، پێشـێ بـاسی ئەوانەیـە کـە بـەرەو دۆزەخ بـە ڕێ دەکرێـن، کـە بێبڕوایەکانـن.

﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان کۆمـەڵ کۆمەڵ، تاقـم تاقـم بـەرەو دۆزەخ بـە ڕێ کـران، بـەڵام بـە ڕێ کرانێـک کـە شایستەی خۆیانـە، واتـە: پاڵەسـتۆ دران و بـە شـێوەیەکی بـێ ڕێزانـە بـە ڕێ کـران، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾، هەتـا کاتێـک گەیشـتنە لای و هاتنـە لای، کتوپـڕ دەروازەکانی دۆزەخیـان لـێ کرانـەوە، ﴿ وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ ﴾، دەرگاوانـەکانی (دۆزەخەوانـەکان لـە فریشـتەکان) پێیـان گوتـن: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ ﴾، ئایـا لـە خۆتـان ڕەوانەکراوانێکتـان بـۆ نەهاتـن! ئـەم پرسـیارکردنە پرسـیارکردنی سەرزەنشـتکارانەی

نکوولّیلێکەرانەیـە، ﴿يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ﴾، ئایەتـەکانی پەروەردگارتانیـان بەسـەردا دەخوێندنـەوە؟ ﴿وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾، دەشـیان ترسـاندن و وریاشـیان دەکردنـەوە لـەم دیـدارەی ئەمڕۆتـان؟ ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾، گوتیـان: بـا، ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، بـەڵام وشـەی سـزا لەسـەر بێبڕوایـان پێویسـت بـوو بـوو، واتـە: ئێمـە بۆیـە هاتینـە ئێـرە لەبـەر ئـەوەی بڕیـاری خوامـان لەسـەر پێویسـت بـوو، کـە لەمیـانی وشـەکانیدا بڕیـارەکان دەردەچـن، وەک چـۆن کاتێ بڕیـار دەردەچێ بـۆ بابایەکـی تاوانبـار، کـە سـزا بـدرێ، بـە نووسـین بـۆی دەردەکـرێ، لێـرەدا مەبەسـت پێـی ئەوەیـە، بڕیاریـان لـە لایـەن خـواوە بـۆ دەرچـوو، چونکـە بێبـڕوا (کافـر) بـوون، (کافـر) لەسـەر کێـشی (فاعـل)ە، واتـە: هەقێـک کـە بۆیـان هاتبـوو، شـاردبوویانەوەو ڕەفزیـان کـرد بـوو.

﴿قِيلَ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، پێیـان گوتـرا: بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخـەوە بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، ﴿فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾، خراپتریـن جێـگاش بـۆ تێـدا حەوانـەوە دۆزەخـە، بـۆ خـۆ بەزلگـران، واتـە: ئێـوە خـۆ بەزلگربـوون لـە بەرانبـەر کتێبـەکانی خـواو پێغەمبـەرانی خـوادا ﷺ بۆیـە ڕۆژتـان ئـەم ڕۆژەیـەو بـەم مـەرەدە چـوون.

ئنجا دێتە سەر باسی کۆمەڵی دووەم:

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا﴾، هەروەها ئەوانـەی پارێزیـان لـە پەروەردگاریـان کـرد بـوو، بـەرەو بەهەشـتێ کۆمـەڵ کۆمـەڵ بـە ڕێ کـران، ئەوانیـش بـە بـە ڕێ کردنێـک کـە شایسـتەی خۆیانـە، بـە ڕێـزو حورمەتـەوە، وەک لـە سـوورەتی (مریـم)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾مریـم، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە تاوانبـاران بـەرەو دۆزەخ لـێ دەخوڕێـن بـە تینوویەتیـی (وەک چـۆن ئاژەڵـی تینـوو بـۆ سـەر ئاویـان دەبـەی، ڕەپێچەکیـان دەدەی و لێیـان دەخوڕیـی)، بـەڵام پارێـزکاران بـە

شێوەی شاندو نوێنەر (کە پێشوازیی دەکرێن) ئاوا بەرەو خوای خاوەن بەزەیی بەڕێیان دەکەین، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا ﴾، هەتا کاتێک گەیشتنە لای بەهەشت و، پێشتر دەروازەکانی کرابوونەوە، بە نسبەت دۆزەخییەکان دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا ﴾، تاکو گەیشتنە لای دۆزەخ، ئنجا دەرگاکان کتوپڕ کرانەوە، بەڵام لێرەدا بە نسبەت پارێزکاران، دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا ﴾، هەتا کاتێک گەیشتنە لای بەهەشت، پێشتریش دەروازەکان کرابوونەوە، چونکە بەهەشتییەکان کە دەچنە بەهەشت، ئەگەر پێشتر دەروازەکانیان بۆ بکرێنەوە، هەر لە دوور ڕا، بۆن و بەرامەی بەهەشتیان بۆ دێ و، دیمەنە جوانەکانی بەهەشت دەبینن و دڵخۆش دەبن، بەڵام بە نسبەت تاوانبارانەوە، وا سامی زیاترە، کە کتوپڕ دەروازەکانیان بۆ بکرێنەوەو لە ناکاو بەسەریدا بکەون، نەک لە دوور ڕا ببینن و ترسیان لێی بشکێ، چونکە کاتێک ئینسان بە شوێنێکدا دەڕوات، ئەگەر مارێک، دڕندەیەکی لێ دەرپەڕێ کتوپڕ، زۆر سامی زیاترە، وەک لەوەی لە دوور ڕا ببینێ و بە چاوی بنگێوێ، وردە وردە بۆی دەچێ و دوور بینیی خۆی وەردەگرێ، ﴿ وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾، دەرگاوانەکان بەهەشتەوانەکان، فریشتەکان، کە پاسەوانەکانی بەهەشتن، پێیان گوتن: ئاشتییتان لەسەر بێ، سەلامتان لێ بێ، ﴿ طِبۡتُمۡ ﴾، ئێوە پاک و چاک بوون، ﴿ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾، دەجا بچنە نێو بەهەشتەوە بە هەمیشەیی، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە پاک و چاکن، شایستەی چوونە بەهەشتن.

﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ ﴾، ئەوانیش گوتیان: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی لەگەڵ بردینە سەر، ﴿ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ ﴾، سەر زەمینیشی کردە میراتمان واتە: سەر زەمینی بەهەشتی دا بە ئێمە، بە ئێمەی بەخشیی، وەک چۆن میراتێک بە ئینسان دەگات، بەبێ زەحمەت، ئەو سەر زەمینەشی کردە خەڵاتی ئێمە، چونکە ئەو بەهەشتە بەڵێ ئیمانداران زەحمەتیان کێشاوە لە دنیادا، بەڵام کردەوە چاکەکانیان و زەحمەت کێشانەکەیان بایی بەهەشتەکە نیە،

بۆیـە دەفەرمـوێ: بەهەشـتی کـردە میراتمـان، ﴿ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ ﴾، ئێمـە لـە بەهەشـتدا، لـە هـەر شـوێنێک بمانـەوێ، مەنـزڵ دادەنێیـن، نیشـتەجێ دەبیـن، بەهەشـتێکی فراوانە، ﴿ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴾، باشـترین پاداشـت پاداشـتی کارکەرانـە، ئیشـکەرانە، ئەوانـەی ئیشـیان بـۆ خـوا کـردوە.

﴿ وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ ﴾، فریشـتەکانیش دەبینـی (لە ڕۆژی دواییـدا)، بازنەیـان بەسـتوە بـە دەوری عـەرش و بـارەگای خـواوە، وەک لـە سـوورەتی (الحاقـة)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ١٧ ﴾الحاقـة، فریشـتەکان بـە دەوری ئاسـمانەکانەوەن، (ئـەو گەردوونـە کـە خـوا ﷻ دووبـارە دروسـتی دەکاتـەوە لـەو ڕۆژەدا)، هەشـت عـەرشی خـوا هەڵدەگـرن، هەشـت لـە فریشـتان و لـە کۆمەڵـە فریشـتەکان، لێرەشـدا دەفەرمـوێ: فریشـتەکان دەبینـی بازنەیـان بەسـتوە، بـە دەوری عەرشـەوە، ﴿ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۖ ﴾، بـە ستاییشـکردنەوە پەروەردگاریـان بـە پـاک دەگـرن، واتـە: هـەم سـتاییشی دەکـەن و هـەم بـە پاکـی دەگـرن، هـەم بـە سیفەتە بـەرزەکانی وەسـفی دەکـەن، هـەم هەرچـی کـەم و کوڕیـی و پەڵـەو لەکەیـە، لێـی دوور دەخەنـەوە، چونکـە خـوا ﷻ وایـە، خـوا ﷻ ڕازاوەیـە بـە هەرچـی سـیفەتی بـەرزو پەسـندەو، دووریشـە لـە هەرچـی لـە کـەو کـەم و کوڕییـە، ﴿ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ ﴾، بـە هـەق و دادگەرانـەش دادوەریـان لـە نێـوان دا کـرا، واتـە: لـە نێـوان مرۆڤـەکان و لـە نێـوان جنـددا، ﴿ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، گوتـراش: سـتاییش بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان، لەلایـەن کـێ وە گوتـرا؟ لەلایـەن هەمووانـەوە گوتـرا، خـوا ﷻ بێژەرەکـەی دیاریـی نەکـردوە، بـۆ ئـەوەی بـۆ هەمـووان بچێتـەوەو هەموویـان بگرێتـەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**دوای فووی یەکەم بە کەڕەنادا، هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و لە زەویدان، بێهۆش دەبن و دەمرن، جگە لەوەی خوا بیەوێ نەمرێ، دوای فووی دووەمیش هەموویان هەڵدەستنەوەو تەماشا دەکەن، زەمینیش بە ڕووناکیی خوا ڕۆشن دەبێتەوەو، نامەکانی کردەوانیش دادەنرێن، پێغەمبەران و شایەدەکانیش دەهێنرێن، بە دادگەریی دادوەریی دەکرێ لە نێوانیاندا، هەر کەس سزاو پاداشتی تەواو و پڕ بە پێستی خۆی پێدەدرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ﴾، فوو بە کەڕەنادا کرا، پێشتر باسمان کرد (**صور**) شتێکی گەورەیە لە شێوەی قۆچ (شاخ)ی ئاژەڵ دا، لەلایەن ئیسرافیلەوە فووی پێدادەکرێ، دەنگێکی زۆر بێڕەزاو هاڕژێنێکی زۆر گەورەیە، دەبێتە هۆی ئەوەی گەردوون تێک بچێ، دوای فووی یەکەم، بۆیە دەفەرموێ:

٢)- ﴿ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هەر کەسێک کە لە ئاسمانەکاندا هەیەو، هەر کەسێک کە لە زەویدا هەیە، هەموویان بێهۆش کەوتن، یاخود هەموویان

مردن، لە سوورەتی (النمل)دا، لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە فوو بە صووردا دەکرێ، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، هەموویان ترسیان ڕێ دەنیشێ و ڕادەچڵەکن، دادەچڵەکن، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ (دانەچڵەکێ)و، هەموویان بە ملکەچیی دێن بۆ لای (خوا ﷻ)، بۆ ئەو شوێنەی خوا ﷻ بۆی دیارییکردوون).

(فَصَعِق)، (صَعْق) دەگونجێ بە مانای داچڵەکین و لە هۆش خۆ چوون بێ و، دەشگونجێ بە مانای مردن بێ.

٣)- ﴿ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، مەگەر کەسێك خوا بیەوێ، هەر کەسێک خوا بیەوێ نەمرێ، لەو ڕۆژەدا، یان دانەچڵەکێ، یاخود بێهۆش نەبێ، هەندێک گوتوویانە: زۆر لە زانایان گوتوویانە: چوار لە فریشتەکانن، کە خوا ﷻ هەڵیبواردوون لە مردن، ئەوانیش: (جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل و فریشتەی مەرگ (ملك الموت))ن، (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئەمە لە (قتادة)وە هاتوە[1].

٤)- ﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ ﴾، دوایی فووێکی دیکەی پێداکرا، بۆ جاری دووەم، فووی پێداکرا، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ ﴾، (أُخْرَى: صِفَةُ مَوْصُوفٍ مَحْذُوفٍ، أَي: نُفِخَ فِيْهِ نَفْخَةٌ أُخْرَى)، (أخرى): سیفەتی وەسفکراوێکی فڕتێنراوە، یانی: فووێکی دیکەی پێداکرا، فووی دووەم.

٥)- ﴿ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴾، یەکسەر ئەوان هەڵساو بوون، تەماشایان دەکرد.

(إذا) بۆ کت و پڕیی (مفاجأة)یە، یانی: کە فووی دووەمی پێداکرا، کت و پڕ هەڵسان، (يَنْظُرون) تەماشایان دەکرد، ئنجا (يَنْظُرون) دوو واتای هەن، یان بە مانای (يُبْصِرُون) تەماشایان دەکرد، یان بە مانای (يَنْتَظِرون) چاوەڕێیان دەکرد، کە خوا ﷻ چ بڕیارێکیان بۆ دەدات.

---

(١) زاد المسير في علم التفسير، لابن الجوزي، ص ١٠٥٥.

ئایا (هم) لە (فَإِذَا هُمْ)دا، ڕاناوەکە بۆ کێ دەچێتەوە؟ هەموویان هەڵسابوون تەماشایان دەکرد، یان چاوەڕێیان دەکرد، ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: (الخَلْقُ كُلُّهُمْ قِيَامٌ عَلَى أَرْجُلِهِمْ يَنْتَظِرُونَ مَاذَا يقَالُ لَهُمْ؟)، خەڵک هەمووی مرۆڤ و جند بە پێوە ڕاوەستاون و چاوەڕێ دەکەن، یاخود دەڕوانن: چییان پێ دەگوترێ و چییان بۆ بڕیار دەدرێ؟!.

٦)- ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾، سەر زەوییش بە ڕووناکیی پەروەردگاری ڕۆشن بۆوە، (إِشْرَاق) بە مانای ڕوونبوونەوە دێ، (شَرَقَتِ الشَّمْسُ) واتە: خۆرەکە هەڵات، بەڵام (أَشْرَقَتِ الأَرْضُ)، واتە: زەوییەکە ڕووناک بۆوە، ئنجا ئایا ڕووناکیی پەروەردگار، مەبەست پێی چییە؟ کە زەوی ڕۆشن دەبێتەوە بە ڕووناکیی پەروەردگاری، وەک لە مانای گشتییەکەیدا باسمان کرد:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ڕووناکیی خوا ﷻ بێ، کە ڕووناکیی خوا ﷻ سیفەتێکی خوایە، وەک زانیاریی خوا، دەسەڵاتی خوا، حیکمەتی خوا، ڕووناکیی خواش سیفەتێکە لە سیفەتەکان، کە بە تەئکید مەبەست پێی ڕووناکیی ماددیی نیە، کە بەرهەستەو چاو دەیبینێ، بەڵکو وەک هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوا ﷻ، ئەویش سیفەتێکی خوایە.

ب- دەشگونجێ ڕووناکیی خوا ﷻ، مەبەست پێی ڕووناکییەکی تایبەت بێ، کە لەو ڕۆژەدا بە تایبەت خوا ﷻ دروستی دەکات، بۆ ئەوەی سەر زەوی پێ ڕۆشن بکاتەوە.

ج- هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾، (نور) لێردا مەبەست پێی دادگەرییە، چونکە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە: {اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (أخرجه البخاري: ٢٤٤٧، ومسلم: ٢٥٧٩)، واتە: خۆتان لە ستەم بپارێزن، چونکە ستەم تاریکییەکانی ڕۆژی قیامەتە.

ئنجا ئەگەر ستەم تاریکیی بێ، مانای وایە دادگەریی ڕووناکییە، کەواتە: بە دادگەریی خوا، سەر زەوی ڕۆشن دەبێتەوە، لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی دادگایی و دادوەریی کرانە، لە نێوان مرۆڤ و جندداو، کەس تۆزقاڵێک زوڵمی لێ ناکرێ، دادگەریی خوا هەموو سەر زەوی و مەیدانی کۆکردنەوەی لێپرسینەوە، ڕۆشن دەکاتەوە.

٧)- ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ ﴾، كتێبیش دانرا، (أل)ی سەر (الكِتَاب) بۆ ناساندنە، ناساندنەكەش، لێرەدا مەبەست پێی:

أ- (عهد)ە، كتێبەكە دانرا، كە دەگونجێ مەبەست پێی:

١- (لوح محفوظ)بێ، ئەوەی كە خوا ﷻ هەموو زانیارییەكانی تێدا تۆمار كردوون.

٢- مەبەست پێی كتێبەكانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بن، كە بەرنامەكانی پێغەمبەرانیان تێدان، تاكو بەپێی ئەو كتێبانە لێپرسینەوە لەگەڵ هەموو ئوممەتاندا بكرێ.

٣- مەبەست پێی نامەكانی كردەوەكان بێ.

ب- (الكِتَاب) (ال)كەی بۆ تێكرا (جنس)یە:

١- جینسی لیست و نووسراوی كردەوەكانی مرۆڤەكان، دادەنرێ.

٢- نووسراوی تایبەت بە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، دادەنرێ.

٨)- ﴿ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ ﴾، پێغەمبەرانیش و شایەدەكانیش هێنران، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەوە دیارن و، شایەدەكانیش ئەو فریشتانەن كە كردەوەكانی مرۆڤەكانیان پاراستوون، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ ﴾ق، واتە: هەر كەسێک هات لێخوڕێک و شایەدێكی لەگەڵ دایە، دوو فریشتەی لەگەڵ دانە، یەكێكیان پێش خۆی دەدات و، ئەوی دیكەشیان شایەدیی لەسەر دەدات.

٩)- ﴿ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾، بە هەق دادوەرییان لە نێواندا كرا، پێشتریش گوتوومانە: وشەی هەق بە پێی ئەو سیاقانە كە تێیاندا دێ، مانایەكەی دەگۆڕێ، لێرەدا: ﴿ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە: بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا كرا، جاری وایە وشەی هەق بە مانای حیكمەتە، جاری وایە بە مانای قسەی ڕاستە، وەک: (قُلْتَ الحَقّ) تۆ ڕاستییت گوت.

١٠)- ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، ئەوان ستەمیان لێ ناكرێ، (و)ەكە بۆ حاڵە، واتە: لە حاڵێكدا كە هیچ كام لەوانە تۆزقاڵێک ستەمی لێ ناكرێ، وەک خوا ﷻ لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَـٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾یونس، واتە: خوا ﷻ هیچ تۆزێک ستەم لە کەس ناکات، بەڵام خەڵک خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن.

١١)- ﴿ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾، هەر کەسە چی کرد بوو بەپێی ئەوە، پاداشت و سزای درایەوە.

١٢)- ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، ئەو (خوا ﷻ)یش زاناترە بەوەی دەیانکرد، (وُفِّيَت: التَّوْفِيَةُ: إِعْطَاءُ الشَّيء وَافِياً لَا نَقْصَ فِيْه)، (تَوْفِيَة): بریتیە لەوەی شتێک بە تەواویی بدرێ، کەم و کورتیی تێدا نەبێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾، واتە: (جَزَاءَ مَا عَمِلَتْ)، هەر کەسە سزاو پاداشتی ئەوەی کرد بووی، بە تەواویی درایەوە.

﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، ئەو (خوا ﷻ )یش زاناترە بەوەی دەیانکرد، خۆیان ئەگەر لە بیریشیان چوو بێ، خوا ﷻ هەمووی تۆمار کردوە لە ڕێی فریشتەکانەوەو، خۆشی بە زانیاریی بێ سنووری، هەموو شتێک دەزانێ، کەواتە: (مَا عَمِلَتْ: أَي جَزَاءَ مَا عَمِلَتْ، لأَنَّ الإِنْسَانَ يُوفَى الجَزَاء لَا العَمَل)، چونکە مرۆڤ پاداشت و سزایەکەی دەدرێتەوە، نەک خودی کردەوەکان، کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، لێرەداو لە زۆر شوێنی دیکەش کە (صِيْغَة التَّفْضِيْل) دێ، خوا ﷻ زاناترە، واتە: تەواوی زانیاریی لە لایە، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە بەرانبەر بە زانیاریی خوا، زانیارییەکی دیکە هەیە، تاکو بگوترێ هی خوا زیاترە، بەڵکو یانی: خوا زانیاریی هەرە تەواوی لە لایە، لە بارەی ئەوەوە کە ئەنجامیان دەدا.

لە بارەی ئەو ڕستەیەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾.

ئەم دوو دەقە دێنین:

١)- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ، وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْبَشَرِ، فَرَفَعَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يَدَهُ فَلَطَمَهُ، فَقَالَ: أَتَقُولُ هَذَا وَفِينَا رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ فَذَكَرَ ذَلِكَ

لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: قَالَ اللَّهُ: وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ، فَلَا أَدْرِي أَرَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلِي، أَوْ كَانَ مِمَّنْ اسْتَثْنَى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ} (أخرجه البخاري: ٤٨٢٠، ومسلم: ٢١٤٨).

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا ﷺ، دەڵێ: پیاوێک لە جوولەکەکان لە بازاڕی مەدینە، گوتی: سوێند بەو کەسەی مووسای بەسەر هەموو مرۆڤاندا هەڵبژاردوە، پیاوێک لە پشتیوانەکان دەستی بەرز کردەوەو چەپەوانەیەکی لە دەم و چاویدا، گوتی: چۆن شتی وا دەڵێی لە حاڵێکدا کە پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ لە نێو ئێمەدا هەیە؟ ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدرایەوە، ئەویش فەرمووی: خوا ﷻ دەفەرموێ: (ئایەتەکەی خوێندەوە) کە فوو بە کەڕەنادا کرا، هەر کەسێک کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لە هۆش خۆی چووە، مەگەر ئەوەی خوا ﷻ بیەوێ نەمرێ، ئنجا من یەکەم کەس دەبم سەر بەرز دەکەمەوە، کە تەماشا دەکەم، ئەوە مووسا ﷺ یەکێک لە پێچکەکانی عەرشی گرتوە، نازانم ئایا لە پێش مندا سەری بەرز کردۆتەوە، یاخود لەوانەیە کە خوا ﷻ هەڵیواردوەو نەیمراندوە، (لە جیاتی ئەوەی کاتی خۆی داوایکرد خوای پەروەردگار ببینێ، ئەو برووسکە (صاعقة)یەی ئەو کاتە بۆی وەبری هی ئێستای کەوتوە).

٢)- لە نێوان دوو فوو بە کەڕەنادا کردنەکاندا، چەندە ماوە هەیە؟ لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ»، قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً، قَالَ: أَبَيْتُ، «ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ»، قَالَ: «وَلَيْسَ مِنَ الإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلاَّ يَبْلَى إِلاَّ عَظْمًا وَاحِدًا، وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} (أخرجه البخاري: ٤٨١٤ ، ومسلم: ٢٩٥٥)

واتــە: ئەبــوو هورەیــرە ﷺ، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمــووی: نێــوان دوو فــوو پێداکردنــەکان چلــە، (ئــەو هــەر ئەوەنــدەی فەرمــووە، ئنجــا ئەبــوو هورەیــرە کــە فەرموودەکــەی گێڕاوەتــەوە، هــاوەڵان لێیــان پرســی:) ئــەی ئەبــوو هورەیــرە! مەبەستی چــل ڕۆژ بــوو؟ گــوتی: ناڵێــم: ئەوەیــە، گوتیــان: چــل مانــگ؟ گــوتی: ئــەوەش ناڵێــم، گوتیــان: چــل ســاڵ؟ گــوتی: ئــەوەش ناڵێــم، (واتــە: مــن نازانــم، مەبەســت لــە قســەی پێغەمبــەر ﷺ کــە فەرموویــەتی: چــل، چییــە؟)، دوایــی خــوا لــە ســەرێوە ئاوێــک دادەبەزێنــێ مرۆڤــەکان وەک چــۆن ڕووەک و دانەوێڵــە دەڕوێ، ئــاوا دەڕوێنــەوە، مــرۆڤ هەمــوو شــتێکی لــێ دەڕزێ، جگــە لــە یــەک ئێســقان کــە پێــی دەگوتــرێ: (عَجْــبُ الذَّنَــبِ) واتــە: ئێســکی کلێنجــە، کــە مرۆڤــەکان لــە ڕۆژی قیامەتــدا لەوێــوە دروســت دەکرێنــەوە، (وەک دەنکــە تۆوەکــە).

**مەسەلەی دووەم:**

**پۆل پۆل بە ڕێ کرانی بێبڕوایان بەرەو دۆزەخ و، پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانەی فریشتە دۆزەخەوانەکان، کە ئایا پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن لە خۆتان و ئایەتەکانی خوایان بەسەردا نەخوێندنەوەو، لەم دیدارەتان نەیانترساندن و هۆشداریان پێ نەدان؟ وەڵامدانەوەی وانیش بە: با، بەڵام بڕیاری ئازاردران لەسەر بێبڕوایان چەسپاوە!:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٧١ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ۝٧٢﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون بەرەو دۆزەخ پۆل پۆل بە ڕێ کران، (زُمَرًا، أي: جَمَاعَاتٍ)، کۆمەڵ کۆمەڵ بە ڕێ کران، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، واتە: ئەوانەی هەقیان داپۆشیوەو ڕەفز کردوە.

کە دەفەرموێ: (وَسِيْقَ) بە ڕێ کران، دەڵێ: (السَّوْقُ: جَعْلُ المَاشِي مَاشِياً آخرَ يَسِيْرُ أَمَامَهُ، وَضِدَّه: القَوْد)ن، (سَوْقُ) ئەوەیە کە شتێک ناچار بکەی لە پێشتەوە بڕوات، دژی (سوق)یش (قَوْد)ە، (سَوْقُ) ئەوەیە وەپێش خۆی بدەی و تۆ لە پشتیەوە بڕۆی، (قَوْد)یش ئەوەیە کە تۆ پێشبکەوی و ئەویش لە دوای خۆتەوە ڕاکێشی[١].

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٤، ص٦٩.

بـە ڕێ کـردنی بێبڕوایـان بـەرەو دۆزەخ کۆمـەڵ کۆمـەڵ، دیـارە چۆنـە، وەک لـە سـوورەتی (مریـم)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴿٨٦﴾ ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە تاوانبـاران بـەرەو دۆزەخ بـە تینوویەتیـی (وەک چـۆن ئاژەڵێـک نـاو دەدەی بـۆ سـەر نـاو دەیبـەی)، بـە ڕێیـان دەکەیـن، بـە حاڵێکـی شـپرزو ناخـۆش!

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا ﴾، هەتا کاتێک چوون بۆ لای، (چوون بۆ لای دۆزەخ)، کتوپڕ دەروازەکانی کرانەوە.

ئەگـەر مـرۆڤ کتوپـڕ شـتێکی سـامناک ببینـێ، دایدەچڵەکێنـێ و تـرس و بیمـی دەخاتـە دڵ، کـە دەفەرمـوێ: (فُتِحَـت) خوێندراویشـەتەوە: (فُتِّحَـت)، (فُتِحَـت) واتـە: کرانـەوە، بـەڵام (فُتِّحَـت) واتـە: زۆر چـاک دەرگاکان کرانـەوە، مانایەکـەی بەهێزتـر دەکات، ئنجـا ئایـا کاتێـک بـەرەو دۆزەخ دەچـن، دۆزەخ چۆنـە؟ خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الحجـر)، لـە ئایەتـەکانی: (٤٣ و ٤٤)دا، بەیـانی کـردوە کـە دۆزەخ حـەوت دەروازەی هـەن: ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾، بـە دڵنیایـی بەڵێنگـەی هەموویـان دۆزەخـە، (ئەوانـەی کـە شـوێنی ئیبلیـس دەکـەون، تێکڕایـان، بەڵێنگەکەیـان و ژوانگەکەیـان دۆزەخە)، حـەوت دەرگای هـەن، بـۆ هـەر دەرگایـەک بەشـێکی دیاریکراویـان هەیـە، (لـە شـوێنکەوتووانی ئیبلیـس کـە لێـوەی بچنـە ژوور).

٣)- ﴿ وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ ﴾، کۆکەرەوەکانی وی (دۆزەخ) پێیان گوتن.

(خَزَنَـة) کـۆی (خَـازِن)ە، وەک (سَـدَنَة) کـۆی (سَـادِن)ە، (خَزَنَة) تاکەکـەی (خَـازِن)ە، واتە: کۆکـەرەوە، وەک (سَـدَنَة) تاکەکـەی (سَـادِن)ە، واتـە: بتـەوان، یاخـود: مەزارگـەوان، (خزنـة) کۆکـەرەوەکانی دۆزەخ، واتـە: ئەوانـەی خەڵـک لـە دۆزەخـدا کـۆ دەکەنـەوە، پێیـان گوتـن:

٤)- ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ هَٰذَا ﴾، ئایا لە خۆتان ڕەوانەکراوانێکتان بۆ نەهاتبوون؟!

٥)- ﴿ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ ﴾، کەئایەتەکانی پەروەردگارتانیان بەسەردا دەخوێندنەوە.

٦)- ﴿ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ ﴾، لە دیداری ئەمڕۆشتان دەیانترساندن و وریایان دەکردنەوە؟.

٧)- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾، گوتیان: با، (بۆمان هاتن، دانیان پێدا هێنا).

٨)- ﴿ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، بەڵام وشەی سزاو ئازار پێویست بوو لەسەر بێبڕوایان، واتە: بەڵام ئێمە خۆمان بەزلگرت و عینادییمان کرد، بۆیە بڕیاری سزا بەسەر ئێمەی بێبڕوادا چەسپی، (کافِرِیْن) ئەوانەی هەق دادەپۆشن و ڕەفزی دەکەن و قبووڵی ناکەن.

٩)- ﴿ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، گوترا: بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوە، بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا بمێننەوە.

١٠)- ﴿ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، خراپترین نشینگە نشینگەی خۆبەزلگرانە (کە دۆزەخە)، (المَثْوَى: مَكَانُ الثَّوَاءِ، وَهُوَ الإِقَامَةُ، والمَخْصُوص بِالذم مَحْذُوف: فَبِئْسَ مَثْوَى المُتَكَبِّرِيْن جَهَنَّمُ)، (مَثْوَى) بە مانای شوێنی (ثَوَاء)ە، ئەویش بە مانای نیشتەجێ بوونە، ئنجا لێرەدا ئەوەی کە تایبەتکراوە بە زەم، فڕتێندراوەو ئاوای لێ دێتەوە: (فَبِئْسَ مَثْوَى المُتَكَبِّرِيْن جَهَنَّمُ) خراپترین جێگەی تێدا نیشتەجێ بوونی خۆبەزلگران، دۆزەخە.

بە ڕێکرانی بێبڕوایان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، هاوبەش بۆ خوادانەران، مولحیدەکان، هەڵگەڕاوەکان، خاوەن کتێبەکان، هەموو ئەوانەی بێبڕوابوون کۆمەڵ کۆمەڵ، لە زۆر شوێنی قورئاندا باسکراوە:

١)- بۆ وێنە: لە سوورەتی (الملك)دا بە وشەی: (فوج) هاتوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ كُلَّمَآ أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾، هەر کاتێ کۆمەڵێک فڕێدرانە نێو دۆزەخەوە، دۆزەخەوانەکان لێیان پرسین: ئایا وریاکەرەوەتان بۆ نەهاتبوو؟.

٢)- لە سوورەتی (الأعراف)دا، بە وشەی (أمم) هاتوە: ﴿ قَالَ ٱدْخُلُواْ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ فِى ٱلنَّارِ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: خوا فەرمووی: بچنە نێو کۆمەڵانێکەوە کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕیون لە جندو مرۆڤ.

٣)- هەروەها لە سوورەتی (فصلت)دا، دیسان بە وشەی: (أمَم) هاتوە: ﴿ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: فەرمایشتیان لەسەر پێویست بوو، بڕیاریان لەسەر پێویست بوو، (کە سزابدرێن) لە نێو کۆمەڵانێکدا کە لە پێش واندا تێپەڕی بوون لە جندو مرۆڤ، بەڕاستیی هەر ئەوان زیانباربوون.

٤)- هەروەها لە سوورەتی (ص)دا بە وشەی: (فوج) هاتوە: ﴿ هَـٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ﴿٥٩﴾ ﴾ص، ئەوانە کۆمەڵێکن لەگەڵ ئێوەدا خۆ تێپەستێون بۆ نێو دۆزەخ، خۆیانی تێ دەتریجێنن.

کە دەفەرموێ: ﴿ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ رَبِّكُمْ ﴾، بە دڵنیایی مەبەست پێی فەرمایشتی خوایە کە لە کتێبەکانیدایە، دیارە ئەوانیش دان پێدادێنن، ئەوەش کە هەندێک لە توێژەرەوان گوتوویانە یانی: با ئێمە پێغەمبەرانمان بۆ هاتن و ئایەتەکانیان بەسەردا خوێندینەوەو لەم ڕۆژەیان ترساندین، بەڵام خوا ﷻ بڕیاری بۆ دابووین.

ئەوە وانیەو ئەو مانایە هەڵەیە، خوا ﷻ بڕیاری بۆ نەداون، کە بڕیاری خواو قەدەری خوا ملیان پێ بسوورێنێ بەرەو کوفرو دوایی تووشی دۆزەخ بن! یان: لەبەر ئەوەی خوا بڕیاری دۆزەخی بۆ داون، وابکەن، نا! بەڵکو لەبەر ئەوەی بێبڕوابوون، خوا ﷻ بڕیاری دۆزەخی بۆ داون، نەک لەبەر ئەوەی خوا بڕیاری بۆ داون، بێبڕوابووبن، بەڵکو چونکە بێبڕوابوون و خوا ﷻ زانیویەتی بێبڕوا دەبن، بە ویستی ئازادی خۆیان، بۆیە بڕیاری دۆزەخی بۆ داون، ئەوەتا بۆ خۆشیان دەڵێن: ﴿ وَلَـٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، (کافِرین) کۆی (کافِر)ەو، ئەویش ناوی بکەر (إسْمُ فَاعِل)ە، واتە: داپۆشەر، ڕەفزکەر، ئنجا فریشتەکانیش پێیان دەڵێن: ﴿ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، (مُتكَبِّر)یش دیسان ناوی بکەر (إسْمُ فَاعِل)ە، واتە: ئەوانەی خۆیان بەزلگرتوە، کەواتە: لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە ویستی ئازادی خۆیان بێبڕواو خۆ بەزلگر بوون، بەو مەرەدە چوون.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**بە ڕێ کرانی پارێزکاران کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو بەهەشت، دوای گەیشتنیان بە نزیکی، کرانەوەی دەروازەکانی و، سڵاولێکردنی فریشتەکان و ستایشکردنیان و فەرموولێکردنیان بۆ چوونە بەهەشت و ستایشکردنیان بۆ خوا، کە بەهەشتی پێبەخشیون، سەرەنجام بازنە بەستنی فریشتان لە دەوری عەرش و، ستایشکردن و بە پاککرتنی خواو، دادوەریی لە نێواندا کرانیان بە هەق و، گوترانی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لە لایەن هەموو لایەکەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا﴾، ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کرد بوو، کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو بەهەشتێ بە ڕێ کران، ئەمە وەک زانایان دەڵێن: بەشێوەی (مشاكلة) بۆ ئەوانیش گوتراوە: (سِیْقَ)، ئەگەرنا لە سوورەتی (مريم) دا هاتوە: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾، ئەو ڕۆژە کە تاوانباران بەرەو دۆزەخێ بە تینوویەتیی لێدەخوڕین، بەڵام پارێزکاران وەک شاندو نوێنەر بە حورمەت و ڕێزەوە بەرەو بەهەشت دەبەین.

٢)- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا﴾، هەتا کاتێک کە چوونە لای بەهەشت.

٣)- ﴿ وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾، دەروازەکانی کرابوونەوە، خوێندراویشەتەوە: (فُتِّحَت)، دەروازەکانی زۆر کرابوونەوە، واتە: پێش ئەوەی بگەنە لای، دەروازەکانی کرابوونەوە، بە پێچەوانەی دۆزەخییەکانەوە، کە دەگەنە بەردەمی دۆزەخ، دەروازەکانی دەکرێنەوە، تاکو دابچڵەکێن و بترسێن، بەڵام بەهەشتییەکان هەر لە دوور ڕا دەروازەکانیان بۆ خراونە سەر پشت، بە دڵنیاییش زیاتر ڕێزو حورمەت لێگرتن، لەوەدایە کە میوانێک دەچێ بۆ شوێنێک، پێشێ دەرگاکەی بۆ بکرێتەوە، نەک بە کوتە کوت و تەقە تەق لە دەرگا بدا، یان چەند جارێک جەرەس لێ بدات، ئنجا بە دێرو ژووانەوە، خانە خوێ دێ، یان نایەت! ئەوە جۆرێکە لە ڕێز لێنەگرتن، ڕێزلێگرتن ئەوەیە کە لە دوورەوە دەرگاکە ئاوەڵا بکرێتەوە، بۆیە لە سوورەتی (ص)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ۝٥٠ ﴾، واتە: بەهەشتانێکی جێی تێدا مانەوەی هەمیشەیی، دەرگاکانیان هەمیشە ئاوەڵاو کراوەن.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾، واتە: (حَتّى إِذَا جَاءُوهَا وَأَبْوابُهَا مُفَتَّحَةٌ)، هەتا کاتێک کە چوونە لای بەهەشت، دەرگاکانیشی کرابوونەوەو ئاوەڵا کرابوون.

٤)- ﴿ وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾، بەهەشتەوانەکان، پاسەوانەکانی بەهەشت پێیان گوتن: سەلامتان لێ بێ، ئاشتیی لەسەر ئێوە بێ و سەلامەتیی بۆ ئێوە.

٥)- ﴿ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾، ئێوە پاک و چاک بوون، (لە دنیادا خۆتان پاک و چاک کردوە، بە هۆی شوێنکەوتنی شەریعەتی خواوە، خۆتان بژار کردوە لە سیفەتە خراپەکان و، خۆتان ڕازاندۆتەوە بە سیفەتە باشەکان)، ئێستاش بە هەمیشەیی بچنە نێو بەهەشتەوە، وەک زانایان دەڵێن: (طَابَ قَلْبُكُم بِالإِيْمَانِ وَالتَّوْحِيْد، وَلِسَانُكُمْ بِذِكْرِ الله، وَجَوَارِحكُم بِالطَّاعَة)، دڵتان بە هۆی ئیمان و خوا بە یەکگرتنەوە پاک بووەو، زمانتان بە هۆی یادی خواوە پاک بووە، ئەندامەکانیشتان بە هۆی فەرمانبەریی بۆ خواوە، پاک بوون.

٦)- ﴿ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ ﴾، گوتیان: ستاییش بۆ ئەو خوایەی بەڵێنەکەی لەگەڵمان دا ڕاستکردو، زەمینی کردە میراتی ئێمە، (واتە: سەر زەمینی بەهەشت، یاخود (أرْض) بە مانای شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونە، واتە: شوێنێکی کردە میرات و بە ئێمەی بەخشیی کە تێیدا نیشتەجێ ببین).

﴿ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ ﴾، سەر زەمینیشی کردە میراتمان، (أوْرَثَنا: أعْطَانَا كَمَا تَأخُذُ المِيْرَاثَ الَّذِي لَا يُطَالِبُ بِهِ أحَدٌ، أو كَمَا يَأتِي المِيْرَاثُ أحَداً بِدُوْنِ تَعَبٍ)، بەهەشتی دا بە ئێمە وەک چۆن کەسێک میرات وەردەگرێ، دوایی کەسی دیکە داوای ئەو بەشە ناکات، لەبەر ئەوەی هەقی خۆیەتی، یاخود بۆیە وشەی (أوْرَثَنا)ی بەکارهێناوە، وەک چۆن کەسێ میرات دەگرێ، بێ ئەوەی پێوەی ماندووبێ، ئاوا لە قەدەر ئەو بەهەشتەش کردەوە باشەکانی ئێمە لە دنیادا هیچ نەبوون، ماندوو بوونیان تێدا نەبووە.

٧)- ﴿ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ﴾، ئێمە لە هەر شوێنێک بمانەوێ لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبین، (التَّبَوُّأ: السُّكْنَى وَالحُلُول، وَالمَعْنَى: يَنْتَقِلُونَ فِي الغُرَفِ وَالبَسَاتِيْنَ تَفَنُّناً فِي النِّعَم)، (تَبَوُّأ) بە مانای نیشتەجێ بوون و دامەزران و سەقامگیربوونە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لە کۆشک و باڵەخانەو باغ و بێستانەکانی بەهەشتدا، بۆ ئەملاولا دەچن، شوێنێکی دیارییکراوییان نیە، بەڵکو بە کەیفی خۆیان دێن و دەچن، هەر جارە لە شوێنێکدا نیشتەجێ دەبن، بە مەبەستی ڕابواردنی جۆراو جۆر.

٨)- ﴿ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ ﴾، باشترین پاداشت پاداشتی کارکەرانە، واتە: ئەوانەی بەگوێرەی بەرنامەی خوا کاریان کردوە بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا.

٩)- ﴿ وَتَرَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ ﴾، فریشتەکانیش دەبینی لە دەوری عەرش بازنەیان بەستوە، دەوری عەرشیان داوە.

١٠)- ﴿ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾، بە ستاییشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاک دەگرن، واتە: دەڵێن: (الحَمْدُ للهِ، سُبْحَانَ الله) یان (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) هەم بە پاکی دەگرن و هەم ستاییشی دەکەن.

١١)- ﴿ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾، بە هەق و دادگەرانەش دادوەریی کرا لە نێوان هەموو لایەکیاندا.

١٢)- ﴿ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، گوتراش: ستاییش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، واتە: لەلایەن هەموو لایەکەوە گوترا، لەلایەن فریشتەکانەوە، لەلایەن پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، بە تایبەت لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە بە گشتیی، بە مرۆڤ و جندەکانەوە.

(الزَّمَخْشَرِي) قسەیەکی جوان دەکات لەو بارەوە، کە خوای کاربەجێ بۆ هەر کام لە بەهەشتییەکان و دۆزەخییەکان، وشەی (سِيْق)ی بەکارهێناوە، هەروەها خاوەنی: (إعراب القرآن)، (محي الدين درويش)[1]، لە تەفسیرەکەی خۆیدا، هەم قسەکەی ئەو دێنێ، هەم خۆشی ڕوونکردنەوەی لەسەر دەدات، دەڵێ:

وشەی (سِيْق)، کە بۆ بەهەشتییان و دۆزەخییان بەکارهێنراوە، ئەوە کە یەک بێژە بەکاربهێنرێ بۆ دوو حاڵەتی دژ بەیەک و لێک جیا، جۆرێکە لە ڕەوانبێژیی، بەڵام بۆ هەر کامیان، بەو شێوەیەی لێی دەوەشێتەوە، چونکە بێگومان بێبڕوا دۆزەخییەکان ئەو شێوەیەی شایستەیانە، بریتیە لەوەی بە بێ ڕێزیی و توندوتیژیی وەک چۆن ئەوانەی کە یاخیی دەبن لە حوکمڕان، پاڵەستۆ دەدرێن، ئاوا بە ڕێ دەکرێن، بەڵام ئەهلی بەهەشت: بە سوارییی و بە ڕێزو حورمەتەوە، بەرەو ئەو شوێنەی کە جێگای ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارە دەبرێن، هەروەک چۆن ئاوا مامەڵە دەکرێ لەگەڵ میوانێکدا، کە بابای خانە خوێ بیەوێ ڕێزی لێ بگرێ، هەڵبەتە خوا ﷻ و، فریشتەکانی خواش، بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن لەگەڵ میوانەکانی خوادا ﷻ بەهەشتییەکانیش میوانی خوان، بەڵام ئەهلی دۆزەخ ئەوانەن کە لە خوا یاخییبوون، بۆیە وەک دیل و کەسانێکی یاخیی کە دەگیرێنەوەو دەهێنرێن بۆ سزادان، ئاوا پاڵەستۆ دەدرێن و پەلکێش دەکرێن.

---

(١) ج٨، ص٤٥١.

## چوار فەرمووده له بارەی

## بەهەشت و بەهەشتییەکانەوه

١)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {فِي الْجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ، مِنْهَا بَابٌ يُسَمَّى الرَّيَّانَ، لا يَدْخُلُهُ إِلاَّ الصَّائِمُونَ} (أَخْرَجَهُ البخاري: ٣٥٥٨، مُسْلِمٌ: ١١٥٢، عن سهل بن سعد).

واتە: بەهەشت هەشت دەروازەی هەن، دەرگایەکیان پێی دەگوترێ: (الرَّيَّان) تەنیا ئەوانەی ڕۆژوو گربوون (واتە: ڕۆژووی سونەتیان گرتوون) لەو دەرگایەوە دەچنە ژوور.

٢)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {«مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٣٤، وابو داود: ١٦٩، ١٧٠، والترمذي: ٥٥، وابن ماجه: ٤٧٠).

واتە: هیچ کام لە ئێوە نیە، دەستنوێژ بگرێ، دەستنوێژەکەی بە تەواویی بگرێ، دوایی لە کۆتایی دەستنوێژەکەی دا بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّـهِ وَرَسُولُهُ)، واتە: شایەدیی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیەو، موحەممەد ﷺ بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوایە، هەر کەسێ وابکات، هەشت دەرگاکەی بەهەشت بۆی دەکرێنەوەو، لە هەر کامێکیانەوە بیەوێ دەچێتە ژوور، (مادام خاوەنی دەستنوێژ بێ، دیارە ئەهلی نوێژو تاعەتیشە).

٣)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتی دیکەدا دەفەرموێ: {إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣١٤٩ ، ومُسْلِمٌ: ٢٢٣٤، واللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة)، واتە: یەکەمین کۆمەڵێک کە دەچنە بەهەشت، لەسەر شێوەی مانگن لە شەوی بەدردا، (شەوی چواردەو پازدە کە زۆر بە شۆقە)، ئنجا ئەوانەی دوای وان، لەسەر شێوەی ئەستێرەیەکی

گەوهەریین (زۆر بە شۆقە بە نسبەت ئێمەوە)، پڕ ڕووناکییە لە ئاسماندا، (بەو شێوەیە دەچنە نێو بەهەشتەوە).

٤)- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویّ: {يُخَلَّصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَيُحْبَسُونَ عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقْتَصُّ لِبَعْضٍ مِنْ بَعْضٍ مَظَالِمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا، أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لأَحَدُهُمْ أَهْدَى بِمَنْزِلِهِ فِي الْجَنَّةِ مِنْهُ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا} (أَخْرَجَهُ البخاري: ٢٤٤٠، وابن حبان: ٧٤٣٤، والحاكم: ٣٣٤٩، ٨٧٦٠، وأبو يعلى: ١١٨٦).

واتە: بڕواداران لە ئاگر دەرباز دەکرێن، (بەسەر پردی سەر پشتی دۆزەخدا دەپەڕنەوەو دەرباز دەبن) لە شوێنێک ڕادەگیرێن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا، هەتا هەندێک ستەم و ماف کە لە دنیادا نێوانیاندا هەبوون، تۆڵە لە هەندێکیان بۆ هەندێکیان وەردەگیرێتەوە، هەتا کاتێک کە پاککرانەوەو خاوێنکرانەوە، ئنجا مۆڵەت دەدرێ بچنە بەهەشتەوە، (دەفەرموێ:) سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، یەکێکیان شارەزاترە بە جێگاو ڕێگای خۆی لە بەهەشتدا، لە شارەزایی بە ماڵی خۆی لە دنیادا.

واتە: چۆن وەک بە ماڵی خۆی دەزانێتەوە لە دنیادا، باشتر لەوە لە بەهەشتدا بە شوێن و ماڵی خۆی دەزانێ، پێغەمبەریش ﷺ بۆیە وا دەفەرموێ، چونکە بەهەشت جیهانێکی زۆر گەورەو فراوانە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە پاکیی و چاکیی فریشتەکان پێشوازییان لێ دەکەن و، سەلامیان لێ دەکەن و، لەو کەسانەمان بگێڕێ کە دەچنە بەهەشتەکانی خوای پەروەردگارەوەو، خوای پەروەردگار لێیان ڕازیی دەبێ و، لە خزمەت پێغەمبەرانی خوا ﷺ بەندە پاک و چاکەکانی خوادا دەبن.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (الزمر) دێنین.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## دەستپێک

بەرێـــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ، ئەمـڕۆ (٨/ ربیـع الثـاني/ ١٤٤١) کۆچیـی، بەرانبـەر (٥/ ١٢ / ٢٠١٩)ی زایینـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (غافـر).

## پێناسەی سوورەتی (غافر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر نـاوی سـوورەتی (**غافـر**)ی، بـۆ بەکارهاتـوە، بـەڵام وێـڕای (**غافـر**) سـوورەتی (**المؤمنین**)یـشی، بـۆ بەکارهاتـوە، دیسـان (**حـم الـمُؤمِن**)، هەروەهـا هەندێکیـش سـوورەتی (**الطَّوْل**)یـان بـۆ بەکارهێنـاوە، بـەڵام کەمـتر، لـەو بـارەوە کـە نـاوی (**حـم المُؤمِـن**) یەکێکـە لـە نـاوەکانی ئـەم سـوورەتە، ئـەم دەقـە هاتـوە:

**{عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: مَـنْ قَـرَأَ حـم المُؤْمِـنَ إِلَى: ﴿إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣﴾غافـر، وَآيَـةَ الكُـرْسِيِّ حِـينَ يُصْبِـحُ، حُفِـظَ بِهِـمَا حَتَّـى يُـمْسِيَ، وَمَـنْ قَرَأَهُـمَا حِـينَ يُـمْسِـي حُفِـظَ بِهِـمَا حَتَّـى يُصْبِـحَ} (أخرجـه الترمـذي: ٢٨٧٩، والبيهقـي فِي شـعب الإيمـان: ٢٤٧٣، وَضَعَّفَـهُ الترمـذي بقولـه: هَـذَا حَدِيـثٌ غَرِيـبٌ، والحديـث قـد صَـحَّ فِي آيَـةَ الكُـرْسِيِّ وحدهـا مـن وجـوه).**

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازیبێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: هــەر کەسـێک (**حــم المُؤْمِــنَ**) ﴿حمٓ﴾ تاکـو ﴿إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣﴾[1]غافـر،

---

(١) ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣﴾ غافـر.

بخوێنێ، هەروەها (آيَـةَ الكُـرْسِيِّ) بخوێنــێ، ئەگــەر کاتێــک ڕۆژ دەکاتــەوە ئــەو دووانـە بخوێنێ، بـە هۆیانـەوە پارێـزراو دەبـێ تاکـو ئێـوارەو، ئەگـەر کاتێـک ئێوارەی لـێ دادێ، بیانخوێنـێ، بـە هۆیانـەوە پارێـزراو دەبـێ تاکـو بەیانیـی دەکاتـەوە.

بـەڵام هەندێـک لـە زانایـان لە بـارەی سـەنەدی ئـەم دەقـەوە مشـتومڕێکیان هەیە بـۆ وێنـە: (الترمـذي) بـە (غریـب)ی دانـاوە، کـە ئـەوەش زاراوەیەکـی فەرموودەناسـانە، بـەڵام بـە نسـبەت (آيَـةَ الكُرْسِيِّ)یـەوە، لـە چەنـد ڕێیەکـەوە چەسـپاوە کـە ڕاسـتەو فەرمایشـتی پێغەمبـەرە ﷺ.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، بـە یەکدەنگیـی هەمـوو زانایـان، ئـەم سـوورەتە وێـڕای شـەش سـوورەتی دیکـە، کـە هەموویـان بـە (حـم) دەسـت پێدەکـەن، هەموویـان مەککەییـن کـە بریتیـن: لـە (غافـر، فصلـت، الشـوری، الزخـرف، الدخـان، الجاثيـة، الأحقـاف)، کـە زانایـان وشـەی (الحواميـم) و (آل حم)یـان بـۆ ئـەم سـوورەتانە بەکارهێنـاوە، واتـە: هـەم (الحواميـم)، هـەم (آل حم)یان بـۆ ئـەم حـەوت سـوورەتە بەکارهێنـاوە، لـەو بـارەوەش چەنـد دەقێـک هاتـوون، یەکێکیـان ئەوەیـە کـە پاڵدراوەتـە لای پێغەمبـەر ﷺ و فەرموویـەتی:

١- [لِكُلِّ شَيءٍ ثَمَرَةٌ، وَإِنَّ ثَمَرَةَ القُرآنِ ذَوَاتُ حَم، هُنَّ رَوْضَاتٍ حَسَنَاتٍ مُخَصَّبَاتٍ مُتَجَاوِرَاتٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْتَعَ فِي رِيَاضِ الجَنَّةِ، فَلْيَقْرَأ الحَوَامِيمَ]، (أخرجه إبنُ الضُّرَيْسِ عن إسحاق بن عبدالله كما في «الدر المنثور» ج٧، ص ٢٦٩- ٢٧٠).

واتـە: هەمـوو شـتێک میـوەو بەرهەمـی هەیـە، میـوەو بەرهەمـی قورئانیـش ئـەو سـوورەتانەن کـە بـە (حـم) دەسـت پێدەکـەن، ئـەو حـەوت سـوورەتە چەنـد بـاغ و گوڵزارێکـی جوانـن، زۆر بەرەکەتـدارن، دراوسـێی یەکـن، (بەسـەریەکەوەن) هـەر کەسێک حـەز دەکات کـە لـە باخچـەو گوڵـزارەکانی بەهەشـتدا بێـت و بچـێ و پیاسـە

بـكات (یـان چێـژ وەربگـرێ) بـا (حَوَامِیـمَ) بخوێنـێ، واتـە: ئـەو حـەوت سـوورەتە موبارەكـە.

هەروەها لەو بارەوە ئەو دوو دەقەش هاتوون:

٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: أُنْزِلَتِ الْحَوَامِيمُ السَّبْعُ بِمَكَّةَ} (أَخْرَجَه: ابْنُ الضُّرَيْسِ، وَالنَّحَّاسُ، وَالْبَيْهَقِيُّ فِي الدَّلَائِلِ، فتح القدير: ج٤، ص٥٧٧).

واتـە: ئیبنـو عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) دەڵـێ: حـەوت (حَامِیـم)ەكان لـە مەككــە دابەزێــنراون.

٣- {عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: نَزَلَتِ الْحَوَامِيمُ جَمِيعاً بِمَكَّةَ} (وَأَخْرَجَه: ابْنُ مَرْدَوَيْهِ، وَالدَّيْلَمِيُّ، فتح القدير: ج٤، ص٥٧٧)، واتە: سەمورەی كوڕی جوندوب (ئەویش هەمان قسەكەی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس دەكات)، دەڵێ: حەوت (حَامِیم)ەكان تێكڕا لە مەككە دابەزیون.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزینی دا:

ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە لـە (مصحـف)دا ژمـارە (٤٠)ە، واتـە: (٣٩) سـوورەت لـە پێـش (غافـر)ەوە هـەن، ئەگـەر لـە (الفاتحـة)ەوە دەسـت پێبكەیـن، لـە لای ڕاستەوە، بـەڵام لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، ژمـارە (٦٠)ە، لـە دوای (الزمـر) هاتـوەو، پێـش (فصلـت)، ئنجـا سـوورەتی (غافـر) یـان (المؤمـن) یەكەمیـن سـوورەتی حـەوت سـوورەتەكانە كـە بـە (حـم) دەسـت پێـدەكات واتـە: یەكەمـی (حوامیـم)ە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

سـوورەتی (غافـر)، یـان سـوورەتی (حـم المؤمـن)، هەشـتاو پێنـج (٨٥) ئایەتـە، بـەڵام هەندێكیـش بـە: (٨٢، ٨٣، ٨٤)یـان دانـاون، بـەڵام زۆربەیان لەسـەر ئـەوە ڕێككەوتوون

کـە (٨٥) ئایەتـن، چەنـد جـاری دیکـەش باسـمانکردوە، بـەڵام هـەر بـۆ جەختکردنـەوە دەڵێـین: تاکـو کەسـێک کـە ئەم قسـەیەی گـوێ لێدەبـێ، یان ئـەوەی دەکەوێتـە بەرچاو، کـە فڵان سـوورەتە، هەندێکیـان گوتوویانـە: (٨٥) ئایەتـەو، هەندێکیان گوتوویانـە: (٨٢) ئایەتـە، ئیشـکالێکی بـۆ دروسـت نەبـێ، کەواتـە: ئەوانـەی دەڵێـن: (٨٢)یـە، مانـای وایـە سـێ ئایـەت، یـان سـێ ڕسـتەیان لـەم سـوورەتەدا بـە قورئـان دانەنـاون!! تاکـو وانەزانـێ بۆیـە دووبـارە دەکەینـەوە کـە: مەبەسـت لـە ژمـارەی ئایەتـەکان کـە کەمیـی و زۆرییـان بـۆ کـردوون، دەگەڕێتـەوە بـۆ درێژیـی و کورتیـی ڕسـتەکان، جـاری وا هەیـە هەندێکیان ڕسـتەیەکیان کـردوە بـە دوو ئایـەت و، هەندێکیـان کردوویانـە بـە ئایەتێک، ئنجـا لێرەوە ژماردنـەکانی ئایەتـەکانی قورئـان جیاوازییـان تێکەوتوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانـە، بـەڵام بـە پلـەی یەکـەم لـەم سـوورەتەدا بـاسی خـوا بـە یەکگرتـن (توحیـد اللـه)و، بـاسی ڕۆژی دوایـی کـراوە، چەنـد ئاماژەیەکیـش بـەڵام بـە کورتیـی بـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وەحیـی خـوای بـەرزی مـەزن کـە بـۆ پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نـاردوە، کـراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

**تایبەتمەندیـی یەکـەم:** ئـەم سـوورەتە یەکەمینـی (حوامیـم)ە، واتـە: یەکەمیـن سـوورەتە لـە حـەوت سـوورەتەکان کـە بـە (حـم) دەسـت پێدەکـەن.

**تایبەتمەندیـی دووەم:** تەنیـا لـەم سـوورەتەدا بـاسی ئـەوە کـراوە کـە هەڵگـرانی عـەرشی خـواو ئەوانـەی بـە دەوری عەرشـەوەن، داوای لێبـوردن بـۆ بـڕواداران دەکەن، ئەمـە لـە ئایەتـەکانی: (٧ و ٨ و ٩)دا هاتـوە.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ئەوە کراوە لەسەر زمانی کافران کە گوتوویانە: خوایە! تێمەت دوو جاران مراندووە، دوو جارانیش ژیانت پێداوین: ﴿قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾﴾غافر، لە هەموو قورئاندا ئەم تەعبیرە تەنیا لێرەدا هاتوە.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا خوا خۆی بە (رَفِيعُ الدَّرَجَات) واتە: پلەکانی بەرزن، وەسف کردوە، لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** بەرگرییکردنی پیاوێکی بڕوادار لە دارو دەستەی فیرعەون، لە مووسا ﷺ لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوەو، یەک لەسەر چواری ئەم سوورەتەی بۆ تەرخانکراوە، کە نۆزدە (١٩) ئایەتن: ئایەتەکانی: (٢٨ - ٤٦).

**تایبەتمەندیی شەشەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾﴾غافر، واتە: دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە دروسکرانی خەڵک واتە: قورسترو گەورەترو مەزنترە، بە پێودانگی مرۆڤەکان، نەگەرنا بۆ خوا قورس و ئاسان نیەو هەمووی وەک یەکە.

**تایبەتمەندیی حەوتەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا باسی لە خۆبایی بوونی هەندێک لە گەلانی پێشوو کراوە، بە زانیارییەکەیان و گوێ نەدانیان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ئەو وەحیی و پەیامەی لە خواوە بۆیان هاتوەو، بوغڕابوون بەو تۆزە زانیارییەی لە لایەن بووە.

**تایبەتمەندیی هەشتەم:** چەند وشەیەک لەم سوورەتەدا هاتوون، تایبەتن بەم سوورەتەوە:

١- وشەی: (ذي الطول) کە لە ئایەتی ژمارە (٣)دا هاتوە واتە: خاوەنی بەخششی فراوان.

٢- وشەی: (یوم التلاق) واتە: ڕۆژی دیدار، یان ڕۆژی پێکگەیشتن، لە ئایەتی ژمارە (١٥) دا هاتوە.

٣- وشەی: (یوم الآزفة) واتە: ئەو ڕۆژەی کە نیزیکە، لە ئایەتی ژمارە (١٨)دا هاتوە.

٤- وشەی: (خَائِنَةُ الأعين) واتە: ناپاکیی چاوەکان یان: چاوە ناپاکەکان، لە ئایەتی ژمارە (١٩)دا هاتوە.

٥- وشەی: (ذروني) لێمگەڕێن، وازم لێبێنن، ئەویش قسەی فیرعەونە: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ...﴿٢٦﴾﴾غافر، واتە: فیرعەونیش گوتی: لێمگەڕێن، دەستم مەگرن، با مووسا بکوژم و، با ئەویش لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە.

٦- وشەی: (یوم التناد) واتە: ڕۆژی یەکدی بانگکردن، کە لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا هاتوە.

٧- تەعبیری: (وأفوض أمري إلى الله) کاری خۆم بە خوا دەسپێرم، لە ئایەتی ژمارە (٤٤) دا هاتوە.

٨- وشەی: (تمرحون) واتە: شانازیی دەکەن، یان بە فیزو کەشخە بە ڕێدا دەڕۆن، (مرح) یش ئەنجامی (فرح)ە، واتە: زۆر دڵخۆش بوون و شادمان بوون، وا لە مرۆڤ دەکات کە بە فیزو کەشخە بەڕێدا بڕوات، کە لە ئایەتی ژمارە (٧٥)دا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:

ئەم سوورەتەمان دابەش کردوە بۆ شەش دەرس، بەم شێوەیەی خوارێ:

سەرەتا دەڵێین:

پێشتریش گوتوومانە: هەمیشە دابەشکردنی ئایەتەکانی سوورەتەکان، هەر سوورەتێک بۆ چەند دەرسێک، بە نیجتیهادو بۆچوونی خۆمە، زۆر سەرنجی

ئایەتـەکان دەدەم، کام کۆمەڵـە ئایـەت پێکـەوە پەیوەسـتن؟ چونکـە ناگونجـێ سـوورەتێکی درێـژ هەمـووی بەیەکـەوە تەفسـیر بکەیـن، مـن وام پـێ باشـە ئایەتـەکان کۆمـەڵ کۆمـەڵ بکەیـن، هـەر لـە سـەرەتای ئـەم تەفسـیرە موبارەکـەوە وامـان هێنـاوە، ئنجـا بـە بۆچـوونی خـۆم، ئـەم سـوورەتە موبارەکـەم دابـەش کـردوە بـۆ شـەش کۆمەڵـە ئایـەت، کـە زیاتـر پێکـەوە پەیوەسـتن واتـە: کردوومـە بـە شـەش دەرس:

دەرسـی یەکـەم: نـۆ (٩) ئایـەتی سـەرەتا دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١ - ٩)، کـە وەک پێشـەکیی وان بـۆ کـۆی سـوورەتی (غافـر)، ئـەو نـۆ ئایەتـە موبارەکـە هەرسێک تـەوەری ئیـمان و عەقیـدەی ئیسـلامییان گرتوونـە خۆیـان واتـە: بـاسی خـوا بەیەکگرتن و، ڕۆژی دوایـی و، پێغەمبەرایەتیـی و، وەحیـی و پەیامێـک، کـە خـوا بـۆ پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) نـاردوە.

دەرسـی دووەم: ئایەتـەکانی: (١٠ - ٢٠) دەگرێتـەوە، واتـە: یـازدە (١١) ئایەتـە، کـە لـەو یـازدە ئایەتـەدا خـوا بـاسی سـەرەنجامی شـوومی کافـران و تاوانبـاران دەکات و، کۆمەڵێـک ڕاسـتیی دیکـەی گـەورەو مەزنیـشی تێواخـن کـردوون، لـە بـارەی ناسـاندنی خـواو، سیفـەت و کـردەوە بـەرزو نـاوازەکانی بـە تایبـەت.

دەرسـی سـێیەم: ئایەتـەکانی: (٢١ - ٤٦) واتـە (٢٦) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، کـە درێژتریـن دەرسـە لـە تەفسـیری ئـەم سـوورەتەدا و، سـەرەتا لـە دوو ئایـەتی: (٢١ و ٢٢)دا ئاماژەیـەک بـە مێـژووی گـەلان کـراوە، ئەوانـەی پێغەمبـەرانی خوایـان (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بـە درۆ دانـاوەو دژایەتییـان کـردوون و بڕوایـان پـێ نەهێنـاون، کـە چـۆن خـوا سـزای داون و، سـەرەنجامێکی شـوومیان هەبـووە، دوایـی (٢٤) ئایەتەکـەی دیکـە، هەمـووی بەسـەرهاتی مووسـایە، لـە بەرانبەریـدا فیرعـەون و قـاڕوون و هامـان، ئـەوە بـە گشـتیی و بـە تایبـەت بـاسی بەرگرییکـردنی پیاوێکـی بـڕوادار لـە دارو دەستەکەی فیرعـەون، کـە ئیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوە، لـە مووسـا ﷺ، کـە یـەک لەسـەر چـواری ئـەم سـوورەتە زیاتـر دەگرێتـە خـۆی.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٤٧ - ٦٠) دەگرێتە خۆی، واتە: چواردە (١٤) ئایەت، کە تێیان دا باسی قیامەت و، خواناسیی و، چەند ڕاستییەکی گەورەو، چەند ڕێنماییەک بۆ پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ ، کراوە.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٦١ - ٧٦) دەگرێتە خۆی، واتە: شازدە (١٦) ئایەتە، کە باسی خوناسیی و، خوا بەیەکگرتن و، پاشان قیامەت و، ڕۆژی دوایی و، سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و، ئەو سزا سەختەی خوا، کە پێوەی گرفتار دەبن.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٧٧ - ٨٥) دەگرێتە خۆی، واتە: نۆ (٩) ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە، لەو نۆ ئایەتەدا خوا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات ﷺ بۆ جاری دووەم لەم سوورەتەدا، کە خۆڕاگرو پشوو درێژ بێ، پاشان ئاماژەیەک دەکات بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە بەسەرهاتی هەندێکیانی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، بەڵام هی هەندێکیانی نەگێڕاوەتەوە، پاشان باسی مێژووی ڕابردوو، ئنجا باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان کراوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان نـۆ (٩) ئایـەتی سـەرەتای (غافـر) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١ - ٩)، لـەو نـۆ ئایەتـەدا خـوا بـاسی کۆمەڵێـک بابـەتی کـردوە، بـەڵام هەمـوو ئـەو بابەتانـە لـە سـووڕگەی: ناسـاندنی خـواو، بـە یەکگرتنـی خـواو، بەندایەتیـی بـۆ کـران و پەرسـتراندیداو، سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان، ئەوانـەی کـە ملیـان نـەداوە بـۆ یەکگرتنـی خـواو، تەنیـا خـوا پەرسـتن، ئـەو سـەرەنجامە شـوومە لـە دنیـاو دواڕۆژداو، سـەرەنجامی پـڕ خێـرو خۆشـیی بـڕواداران لـە ڕۆژی دواییـداو، پاڕانـەوەی فریشـتەکانی هەڵگـری عـەرشی خـوا بۆیانـدا، دەخولێنـەوە.

ئەوانە ئەو بابەتانەن، کە لەم نۆ (٩) ئایەتە موبارەکەدا، خراونە ڕوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ
شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَٱلۡأَحۡزَابُ
مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۭ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ
بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ
رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ
وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ
جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ

﴿أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. حا میم ﴿١﴾ دابەزاندنی ئەم کتێبە لە لایەن خوای زاڵی زاناوەیە ﴿٢﴾ لێبوردەی گوناهو وەرگری تۆبە، تۆڵە توند، خاوەن بەخشش، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، گەڕانەوە تەنیا بۆ لای ویە ﴿٣﴾ تەنیا ئەوانەی بێبڕوان مشتومڕ لە دژی ئایەتەکانی خوا دەکەن، ئنجا با هاتن و چوون (و خۆ بادان)ی ئەوانەی بێبڕوان لە وڵاتان دا، فریوت نەدات (پێت وابێ هەمەکارەو هەموو شت لە دەست هاتوون!) ﴿٤﴾ لە پێش واندا گەلی نووح و کۆمەڵە (بێبڕوایە)کانی دوای وان (پەیامی خوایان) بە درۆ داناو، هەر کۆمەڵێک ویستی پێغەمبەرەکەی بگرێ و، مشتومڕی بە ناهەقیشیان کرد تاکو هەقی پێ لابەرن (پووچەڵ بیخەنە بەرچاو)، منیش گرتمن، ئایا تۆڵەکەم چۆن بوو! ﴿٥﴾ هەر بەو شێوەیەش وشە (بڕیارە)کانی پەروەردگارت لەسەر ئەوانە چەسپان کە بێبڕوابوون، کە ئەوانە هاوەڵی ئاگرن ﴿٦﴾ ئەو (فریشت) انەی عەرشیان هەڵگرتووەو، ئەوانەی بە دەوریشیەوەن، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاک دەگرن و، بڕوای پێدێنن و، داوای لێبوردنیش بۆ ئەوانە دەکەن کە بڕوایان هێناوە (دەڵێن:) پەروەردگارمان! بەزەیی و زانیارییت هەموو شتێکی گرتۆتەوە، دەجا لەوانە ببوورە کە بڕوایان هێناوەو شوێن ڕێبازەکەت کەوتوون و، لە ئازاری کڵپە (ی ئاگر) بیانپارێزە ﴿٧﴾ (هەروەها) پەروەردگارمان! بیانخە ئەو بەهەشتە هەمیشەییانەوە کە گفتت پێداون، هەروەها هەموو ئەوانەی شایستەن لە باب و دایکیان و هاوسەرانیان و وەچەکانیان، لەگەڵیان بیانخە بەهەشتەوە، بە دڵنیایی هەر تۆی زاڵی کارزان ﴿٨﴾ (پەروەردگارمان!)

لـە (سـزا) خراپەکانیـش بیانپارێـزەو، هـەر کەسـیش لـەو ڕۆژەدا لـە (سـزا) خراپـەکانی بپارێـزی، بـە دڵنیایـی بەزەیـیـت پێـدا هاتـوەو، ئـا ئـەوەش بردنـەوەو سـەرفرازیی مەزنـە ﴿٩﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ذِی ٱلطَّوْلِ): (الطَّوْلُ: خُصّ بِهِ الفَضْلُ وَالمَنُّ)، وشـەی (طَوْل): تایبەتکـراوە بـە بەخشـش و چاکـەی خـواوە، کـە لەگـەڵ بەندەکانیـدا دەیـکات، کەواتـە: (ذِي الطَّوْل) واتـە: (صَاحِبُ الفَضْل) خـاوەن بەخشـش و چاکـەی فـراوان.

(وَهَمَّتْ): (الهَمُّ: مَا هَمَمْتَ بِهِ فِي نَفْسِكَ، أَهَمَّنِي كَذَا: حَمَلَنِي عَلَى أَنْ أَهُمَّ بِهِ)، (هَمّ): بریتیـە لـەوەی لـە دڵـی خۆتـدا بڕیـاری دەدەی، دەگوتـرێ: (أَهَمَّنِي كَذَا) واتـە: ئـەو شـتە وای لێکـردم گرنگیـی پێبـدەم و خەمی لـێ بخـۆم، کەواتە: ﴿وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ﴾، هـەر کۆمەڵەیـەک لـە کۆمەڵـە کافـرەکان، بـە دڵـی داهـات و ویسـتی کـە پێغەمبەرەکـەی خـۆی بگـرێ، بـۆ سـزادان، یاخـود بـۆ کوشـتن.

(لِيُدْحِضُواْ): بـۆ ئـەوەی هەقـی پـێ لابـدەن، یـان هەقـی پـێ پووچـەڵ بخەنـە بەرچـاو، وشـەی (دَاحِضَة: أي: بَاطِلَة، زَائِلَة) کـە دەفەرمـوێ: ﴿حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾﴾الشـوری، واتـە: بەڵگەکەیـان پووچەڵـە لـە لایـەن پەروەردگاریـان، (وَأَصْلُهُ مِنْ دَحْضِ الرِّجْلِ) وشـەی (إِدْحَاض): لـە بنچینـەدا لـە (دَحَضَتِ القَدَمُ)ە واتـە: پێیەکـە خلیسـکا، (دَحْضُ الرِّجْل) لاق کـە بخلیسـکێ، وای پێدەگوتـرێ، ئنجـا (إِدْحَاض) واتـە: خلیسـکاندن و لابـردن و، پووچەڵکردنـی ئـەو شـتەی دەویسـترێ، پووچـەڵ بکـرێ.

(ٱلْعَرْشَ): تەخـت، بـارەگا، واتـە: شـوێنی حوکمڕانیـی، (العَرْشُ فِي الأَصْلِ: شَيءٌ مُسَقَّفٌ، وَمِنْهُ قِيلَ: عَرَشْتُ الكَرْمَ، وَعَرَّشْتُهُ، إِذَا جَعَلْتَ لَهُ كَهَيْئَةِ السَّقْفِ)، (عَرْش):

لـە بنچینـەدا شـتێکە سـەقف و سـەربانێکی هەبێ، کـە بـە (عُـرُوُش) کۆدەکرێتـەوە، دەگوتـرێ: (عَرَشْتُ الكَرْمَ وَعَرَّشْتُهُ) واتـە: کـە پـرم بـۆ مێوەکـە کـرد، ئەگـەر کەپرێکـی بـۆ بکـەی وەک سـەقفێک مێوەکـە بەسـەریدا بـڵاو بێتـەوە، وشـەی (عَرْش)یـش بـۆ خـوای بـەرز بەکارهاتـوە، (عَـرْشُ الرَّحْمَـن) وەک دوایـی باسـیدەکەین، کـە مەبەسـت پێـی کورسـیی و تەختـە، دیـارە بـە پێـی عەقڵـی ئێمـە ئەوانـەی حکومڕانییـان کـردوە، عـەڕش ئـەو شـوێنەیە کـە لەسـەری دانیشـتوون، کـە دیـارە کورسـیی بـەس شـوێنی تاکێکـە، بـەڵام عـەڕش کـە حوکمڕانـان لەسـەری دانیشـتوون، هـەم بەرزتـر بـووە لـە کورسـیی و پێچکـەی هەبـوون، پایـەی هەبـوون، هـەم فراوانتریـش بـووە لـە کورسـیی ئـەوە بـە نسـبەت ئـەوەوە کـە بـۆ ئێمـە زانـراوە، بـەڵام کـە بـۆ خـوای پـەروەردگار بەکاردەهێـنرێ، زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: عـەڕش مەخلووقێکـە دەوری هەمـوو گـەردوونی داوەو گەورەتریـن دروسـتکراوی خـوای بـێ وێنەیـە.

بـەڵام هەندێـک گوتوویانـە: (عـرش) ڕەمـزی حوکمڕانیـی و دەسـتەڵاتی خوایـە کـە ئـەو مانایـە بـە لەبەرچاوگرتنـی کـۆی ئایەتـەکان، بێهێـزەو دواییـش باسـی دەکەیـن.

(عَدْنٍ): (العَـدْنُ: الإِسْتِقْرَارُ والثَّبَـات)، (عـدْن) بـە مانـای نیشـتەجێبوون و چەسـپان دێ، دەگوتـرێ: (عَـدَنَ بِالمَكَانِ: اسْـتَقَرَّ) لـە شـوێنەکە چەسـپا، قـەراری گـرت.

(ٱلسَّيِّـَٔاتِ): کـۆی (السَّيِّئَة)یە، (السُّـوءُ كُلُّ مَـا يَغُـمُّ الإِنْسَـانَ مِـنَ الأُمُـورِ الدُّنْيَوِيَّـةِ وَالأُخْرَوِيَّـةِ، وَمِـنَ الأَحْـوَالِ النَّفْسِـيَّةِ وَالبَدَنِيَّـةِ وَالخَارِجِيَّـةِ، والسَّـيِّئَةُ: الفِعْلَـةُ القَبِيْحَـةُ)، (سُـوء): هـەر شـتێکە کـە مـرۆڤ خەفەتبـار بکات لـە کاروبـاری دنیایی، یـان دواڕۆژیی و، لــە حاڵەتــە دەروونییــەکان و حاڵەتــە جەســتەییەکان و حاڵەتــە دەرەکییــەکان، (سَـيئة)ش بریتیـە لـە کردەوەیەکـی ناقـۆڵا، بـەڵام بـە پێـی سـیاق دەبـێ سـەرنجی چەمـک و واتـای ئـەو وشـەیە بـدرێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، واتە: هـەر کەسـێک تـۆ بیپارێـزی لـە خراپـەکان واتـە: لـە سـزا خراپـەکان، یاخـود لـە سـزای خراپـەکان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتر باسمکرد: ئەم نۆ (٩) ئایەتە وەک پێشەکیی و دەستپێک وان، بۆ کۆی بابەتەکانی کە لەم (٨٥) ئایەتەی ئەم سوورەتەدا هاتوون، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

به ناوی خوای به بەزەیی بەخشندە.

واتە:

دەستپێکردنم به ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢- به پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣ - به تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم، نەک به شان و شەوکەت و توانای خۆم.

٤ - بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

بێگومان ئەم سوورەتە، یەکێکە لەو حەوت سوورەتانەی هەموویان بە (حَوامِیم) یان (آل حم) ناسراون، ئەم سوورەتەش یەکەمین سوورەتە لە (حَوامِیم) لە حامیمەکان.

﴿حمٓ﴾، ئەمانە دوو پیتن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، باسێکی دوورو درێژمان لە بارەی ئەو پیتە پچر پچڕانەوە کردوە، هەروەها لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتانی دیکەش، هەندێ شتی دیکەی وردو تایبەتمان باسکردوە، بۆیە لێرە ناگەڕێینەوە سەری، تەنیا ئەوەندە دەڵێین: پیتە پچڕ پچڕەکان (الحروف المقطعة) لە پێش بیست و نۆ (٢٩) سوورەتی قورئاندا

هاتـوون، واپێدەچـێ لـە هاتنیـان ئـەوە مەبەسـت بـێ: خەڵکینـە! ئـەو قورئانـەی لەبـەر دەسـتتانە! سـوورەت و ئایەتـەکانی هـەر لـەو پیتانـە پێکهاتـوون، کـە ئێـوە پێیـان دەنووسـن، ئـەو پیـت و دەنگانـەی ئێـوە قسـەیان پێدەکـەن، کـە لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هـەن، ئنجـا کـە نەتانتـوانی نـەک قورئانێکـی وەک ئـەم قورئانـەو وێنـەی ئـەم قورئانـە، بەڵکـو نەتانتـوانی وێنـەی دە (١٠) سـوورەتیشی بێنـن، بەڵکـو نەتانتـوانی وێنـەی سـوورەتێکیشی بێنـن، لـە حاڵێکـدا ئـەو پیـت و دەنگانـەی قورئانیان لێپێکهاتـوە، لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدان وەک کەرەسـتەی خـاو، کەواتـە: بزانـن: ئـەو زاتـەی لـەو کەرەسـتە خـاوەی لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هەیـە، ئـەم قورئانـەی پێکهێنـاوە، ئـەوە خـوای بـەرزە، هـەروەک چـۆن مـاددە لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هەیـە، بـەڵام خـوا ژیانـدارانی لـێ دروسـت دەکات، گـوڵ و گیـای لێ دروسـت دەکات، پـەڕەورو باڵنـدەی لـێ دروسـت دەکات، ئـاژەڵ و زینـدەوەرانی لـێ دروسـت دەکات، ئێـوەش مەگـەر خشـت و کەلوپـەلی بـێ ژیـان و تەکنۆلۆژیـای بـێ ژیـانی لـێ دروسـت بکـەن! کەواتـە: بزانـن کـە ئـەو قورئانـە لـە لایـەن خـواوە ﷻ هاتـوە.

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، دابەزانـدنی کتێـب لـە لایـەن خـوای زاڵـی زاناوەیـە، وشـەی (الكتـاب) کـە (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی جینسـی کتێبـان بـێ واتـە: دابەزانـدنی کتێبـەکان، هەمـوو کتێبـەکان لـە لایـەن خـوای کارزانەوەیـە، دەشـگونجێ ئـەم (أل)ی ناسـاندنە بـۆ (عهـد) بێ واتـە: دابەزاندنی کتێبەکـە ئـەو کتێبـەی دەزانـن و لەبـەر دەسـتتان دایـە، لـە لایـەن خـوای زاڵـی زاناوەیـە، ئنجـا خـوا ﷻ خـۆی لێرەدا بـە چەنـد سـیفەتێک پێناسـە دەکات: یەکەمیـان (ألله) خـوا، لـە لایـەن خواوەیـە ﷻ ئـەو خوایـەش ﷻ (العزيـز) واتـە: باڵادەسـت و زاڵـە، (العليـم) واتـە: هەمـوو شـتێک دەزانـێ.

ئنجـا دوایـی خـوا بـە چەنـد سـیفەتێکی دیکـەش خـۆی پێناسـە دەکات، وەک سـەرچاوەی قورئـان و دابەزێنـەری قورئـان و دەفەرمـوێ: ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ ﴾، لێبـوردە لـە گونـاح، ئـەوەش سـیفەتێکی دیکەیـەتی، کـە لـە گوناهـان دەبـوورێ، (الذنـب)

یـش دیسـان (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرەو لێـرەدا بـۆ جینسـە، یـانی: تێکـڕای گوناحـان دەبـوورێ و دەبەخشـێ، هـەر کەسـێک لێیـان بگەڕێتـەوەو، دەسـتبەرداریان بـێ و تۆبەیـان لێبـکات، ﴿ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ ﴾، هەروەهـا وەرگـری گەڕانەوەشـە، کەسـێک بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا، خـوا گەڕانـەوە، پۆزشـەکەی لێوەردەگـرێ، ﴿ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ﴾، تۆڵـە تونـدە، کەسـێک شایسـتەی سـزادان بـێ، خـوا سـزای دەدات، سـزای خـواش زۆر سـەختە، ﴿ ذِي ٱلطَّوۡلِ ﴾، هەروەهـا خـوا خـاوەن بەخشـشی فراوانـە.

ئنجـا سـیفەتێکی دیکـەی: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێک نیـە واتـە: هیـچ پەرسـتراوێک نیـە کـە شایسـتەی پەرسـتران بـێ، ئەگەرنـا پەرستراوی سـاختەو پـووچ زۆرن، بـەڵام پەرسـتراوێک کـە شایسـتەی پەرسـتران بـێ و، ئـەو پەرستشـەی بـۆی ئەنجـام دەدرێ، جێـی خـۆی بگـرێ، تەنیـا یەکێکـە کـە خوایـە، ﴿ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، سـەرەنجام و گەڕانـەوەش تەنیـا بـۆ لای ئـەوە.

کەواتـە: کـۆی ئـەو سیفەتانە کـە لێـرەدا خـوا ﷻ وەک دابەزێنـەری ئـەم کتێبـە، خۆییـان پـێ پێناسـە دەکات نـۆن: (**ألله، العزیز، العلیم، غافر الذنب، قابل التوب، شدید العقاب، ذي الطول، لا إله إلا هو، إلیه المصیر**) بـە نـۆ سـیفەت خـوا ﷻ خـۆی پێناسـە دەکات.

﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، لـە دژی ئایەتـەکانی خـوا هیـچ کەس شـەڕە قسـەو مشـتومڕ نـاکات، مەگـەر ئەوانـەی بێبـڕوان، ئـەوان لـە دژی ئایەتـەکانی خـوا دەمبەدمەو، شـەڕە قسـەو، مشـتومڕ دەکـەن، ﴿ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴾، ئنجـا بـا هاتـن و چـوونی ئـەوان، ڕۆیشـتنیان و گـەڕان و سـووڕانیان لـە وڵاتانـدا، تـۆ فریـو نـەدات، واتـە: ئـەی موحەممـەد! ﷺ یاخـود: هـەر کەسـێک کـە قورئـان دەخوێنـێ! بـە هاتـن و چـوون و خـۆ بـادان و خۆڕانـانی بێبڕوایـان لـە وڵاتانـدا، کـە دێـن و دەچـن، فریـو مەخـۆ، هەڵمەخەڵەتـێ، وا بـزانی هەمـوو شـتێکیان لـە دەسـت دێ و، هەرچـی بیانـەوێ پێیـان دەکـرێ! وەک ئێسـتا[1] زلهێنـانی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا،

---

(١) ئێستا: ٥ ڕەمەزانی ١٤٤٢ک، بەرانبەر: ٢٠٢١/٤/١٧ز یە.

خۆیان بادەدەن و خۆیان ڕادەنێن، نەخێر زۆر شتیان دەوێ، بۆیان ناکرێ و زۆر شتیان ناوێ، بەسەریان دێ، وەک (یەکێتی سۆڤیەتی) پێشوومان بینی، هەڵوەشا، هەروەها هەموو ئەو دەوڵەت و ئیمپراتۆڕانەی کە لە مێژووی بەشەردا بوو ون، وەک ئەو هەموو حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆبادەرو بە فیزو کەشخە جووڵاوانەی کە بوو ون، بە درێژایی مێژوو، هەموویان چوونە بن خاک، خوای پەروەردگار هەر کەسە لە کاتی خۆیداو، هەر وڵاتە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، لە بەینی بردوون.

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾، لە پێش واندا واتە: لە پێش بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری تۆدا، ئەی موحەممەد! ﷺ گەلی نووحیش بێبڕوابوون، هەروەها کۆمەڵەکانی کە لە دواشیان بوون، بێبڕوابوون، (أحزاب) کۆی (حزب)ە، (حزب) کۆمەڵە خەڵکێکن کە لە شتێکدا وەک یەک بن، لە ڕووی نەتەوەییەوە، لە ڕووی کارو پیشەیەکەوە، لە ڕووی دینێکەوە، لە ڕووی عادەتێکەوە، لە ڕووی خوێن و گۆشتێکەوە و لەسەر شتێک کۆ ببنەوە، پێیان دەگوترێ: (حِزْب)، ئنجا خوا دەفەرموێ: هەم گەلی نووح، هەم ئەو کۆمەڵانەی کە لە دوایان بوون، بە درۆیان دانان، چییان بە درۆ دانان؟ پەیامەکانی خواو پێغەمبەرانی خوایان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە درۆ دانان، بەڵکو هەر بەوەندەش ئیکتیفایان نەکرد، کە پەیامەکانی خواو پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، ﴿ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ﴾، هەر کامێک لەو کۆمەڵانە، ویستی پێغەمبەرەکەی بگرێ، واتە: ویستیان پێغەمبەرەکەیان بگرن بۆ کوشتن، بۆ سزادان و لە کۆڵ خۆ کردنەوە، ﴿ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ ﴾، بە ناهەقیش شەڕە قسەیان کرد، دمبەدمەی ناهەق و ناڕاستیان کرد، وتووێژیان کرد بە ناهەق، ﴿ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ ﴾، بۆ ئەوەی هەقی پێ لابەرن، هەقی پێ بخلیسکێنن و دووری بخەنەوە، پووچەڵ بیخەنە بەرچاو، ئەوان بەو شێوەیان کرد، ﴿ فَأَخَذْتُهُمْ ﴾، منیش گرتمن، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴾، (كَيْف) لە ئەسڵ دا یانی: چۆن و بۆ پرسیارکردنە، بەڵام لێرەدا

مەبەست پێی سەرسوڕماندنە (الإسْتِفْهَامُ للتعْجِيْب) پرسیارکردن بۆ سەرسوڕماندنە، سزاو تۆڵەکەم چۆن بوو! ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾، وشەی (عقاب) بە ژێر (كسرة) هاتوە، بەڵام ئەصڵی خۆی (عقابي)یەو، لەبەر لەسەر زمان سووک بوون (ي) لاچووەو، کەسرە لە شوێنی دانیشتوە، سزادانەکەی من بۆ ئەوان چۆن بوو! واتە: جێی ئەوە بووە کە خەڵک زۆری تێرامێنن و پەندی لێوەربگرێ.

﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾، واتە: هەر بەو شێوەیەش کە گەلی نووح و، ئەو حیزب و پێڕانەی کافرەکانی سزادا، هەر بەو شێوەیە فەرمایشتی پەروەردگارت، بڕیاری پەروەردگارت کە لە فەرمایشتیدا بەرجەستە بووە، چەسپا لەسەر ئەوانەی کە بێبڕوان، کە بریتی بوو لە چی؟ ﴿أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾، کە ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن: واتە: وا دەچنە نێو ئاگرەوە کە دەبنە هاوەڵی و لێی جیا نابنەوە.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەو ڕاستیانەی خستنیە ڕوو، باسی بابەتێکی دیکە دەکات، کە بریتیە لە هەڵوێستی ئەو فریشتە پاک و بۆ خوا صوڵحاوانەی، عەرشی خوایان هەڵگرتوە، هەروەها ئەوانەش کە بە دەوری عەرشەوەن، کە خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا باسی (الملائكة المقربون) (فریشتە زۆر نیزیک خراوەکان) دەکات و، وا دیارە ئەو فریشتانەن کە خوا هەڵگرتنی عەرشی پێ سپاردوون، ئەوانەش کە بە دەوری عەرشەوەن، کە بەس خوا ژمارەیان دەزانێ، ئەوەندە هەیە بۆ ڕۆژی قیامەت خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾﴾الحاقة، واتە: لەو ڕۆژەدا عەرشی پەروەردگارت (تەختی پەروەردگارت) هەشت هەڵی دەگرن، ئنجا ئایا هەشت کۆمەڵە فریشتەن، یان هەشت فریشتەن؟ هەروەها ئایا ئێستا چەند هەڵیانگرتوەو، چەند فریشتە بە دەوری عەرشی خواوەن؟ بەس خوا دەیزانێ، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ﴾، ئەوانەی عەرشیان هەڵگرتوەو، ئەوانەش کە بە دەوری عەرشەوەن، مانای وایە: ئەو فریشتانە، زۆر لە خواوە نیزیکن و، زۆر

لـە لای خـوا موعتەبـەرن، زیاتـر فریشـتە ئاسـاییەکان، ئنجا ئایا ئەوانـە چـی دەکـەن؟ ﴿ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾، بـە ستایشـکردنەوە بـۆ پەروەردگاریـان بـە پاکـی دەگـرن، ﴿ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، هەروەهـا بـڕواشی پێدێنـن، ئنجا وەک توێژەرەوانی قورئـان دەڵێن: شـتێکی زانـراوە کـە فریشـتەکان خـوا بـە پـاک دەگـرن و سـتایشی دەکـەن، لـە پێـش ئەوەشـدا شـتێکی زانـراوە، کـە بـڕوا بـە خـوا دێنـن، بـەڵام بۆچـی لێـرە خـوا ﷻ بـاسی ئیمانی فریشـتەکان دەکات؟! واتـە: ئـەی مرۆڤـەکان! ئێـوە بزانـن کـە بـە هـۆی ئیـمان هێنانـەوەو، بـە هـۆی بـە پاکگرتـن و ستاییشـکردنەوە بـۆ خـوا ﷻ، ئێـوەش دەچنـە ڕیـزی ئـەو فریشـتانەوەی عـەرشی خوایـان هەڵگرتـووەو، دەوری عـەرشی خوایـان گرتـووەو بـە دەوریـەوەن! هەروەهـا هەڵگـرانی عەرشـی خـواو دەورەدەرانی عـەرشی خـوا لـە فریشـتەکان، وێـڕای بـە پاکگرتـن و ستایشـکردن و بڕواهێنـان بـە خـوا، ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، داوای لێبوردنیـش بـۆ ئەوانـە دەکـەن کـە بڕوایـان هێنـاوە، واتـە: بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پێبهێـنرێ، داوای لێبوردنیـان بـۆ دەکـەن، ئنجـا ئایـا داوای لێبوردنەکـە چۆنـە؟

دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾، پەروەردگارمـان! بەزەیی تـۆو، زانیاریـی تـۆ، هەمـوو شـتێکی گرتۆتـەوە، واتـە: تـۆ بەزەییەکـەت گشـتگیرە بـۆ هەمـوو شـتێک و، هەمـوو شـتێکیش دەزانی، بەڵـێ زانیاریـی و بەزەیـی خـوا هەمـوو شـتێکیان گرتۆتـەوە، چونکـە هـەر شـتێک کـە پەیدابـووەو هەیـەو، بەڕێوەدەچـێ، دیـارە بـە هـۆی زانیاریـی و بەزەیـی خـواوە بەڕێـوە دەچـێ، ﴿ فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ ﴾، دەجـا لەوانـە ببـوورە، کـە گەڕاونـەوەو، شـوێن ڕێبازەکـەت کەوتـوون، ﴿ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴾، هەروەهـا چەپاڵەیـان بـدەو، بیانپارێـزە لـە ئـازاری کڵپـە، کڵپـەی ئاگـری دۆزەخ.

ئنجـا ئـەو فریشـتانەی هەڵگـرانی عـەرشی خـواو، دەورەدەرانی عـەرشی خـوا، هـەر بـەردەوام دەبـن لەسـەر پاڕانەوەیان بـۆ بڕواداران و دەڵێـن: ﴿ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ ﴾، پەروەردگارمـان! هەروەهـا بیانخـە نێـو باغە هەمیشـەییەکانی

کـە بەڵێنـت پێـداون، گفتـت پێـداون، ﴿وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی کـە شایسـتەن و چاکـن لـە بـاب و باپیرانیـان واتـە: بابیـان و دایکیـان، باپیریـان و نەنکیـان و بـەو شـێوەیە، ﴿وَأَزْوَٰجِهِمْ﴾، هەروەهـا هاوسـەرانیان، ﴿وَذُرِّيَّٰتِهِمْ﴾، دیسـان وەچەکانیـان، لـە کـوڕان و کچـان و نەوەکانیـان، هـەر کەسێک کـە شایسـتەیە، لەگەڵیـان بیخـە ئـەو بەهەشتە هەمیشـەییانەوە، کـە بەڵێنـت پێـداون، ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، بـە دڵنیایـی هـەر تـۆی زاڵـی کارزان.

﴿وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، لـە خراپەکانیـش بیانپارێـزە، کـە بـە تەئکیـد سـزای خـوا ﷻ خراپـە لـە ڕۆژی دواییـدا بـۆ بێبڕوایـان و تاوانبـاران، یاخـود: ﴿وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، واتـە: (وَقِهِـمْ عِقَـابَ السَّـيِّئَات) بیانپارێـزە لـە سـزای ئـەو خراپانـەی کردوویانـن، واتـە: بـە هـۆی خراپەکانیانـەوە کـە لـە دنیـادا کردوویانـن، سـزایان مەدە، لـە سـزای ئـەو خراپانـە بیانپارێـزەو چەپاڵەیـان بـدە، یاخـود: لـەو حاڵـە خراپانـەی کـە لـە ڕۆژی دواییـدا هـەن و بـۆ تاوانبـاران خراپـن، لـەو حاڵـە خراپانـە بیانپارێـزەو چەپاڵەیـان بـدە، ﴿وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ﴾، هـەر کەسێکیش تـۆ لـەو ڕۆژەدا چەپاڵـەی بـدەی لـە خراپـەکان، واتـە: لـە سـزا خراپـەکان، یاخـود: لـەو مەینەتیـی و خراپانـەی کـە هـەن، یـان: لـە سـزای کـردەوە خراپـەکان، ﴿فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ﴾، ئـەوە بـە دڵنیایـی تـۆ بەزەییـت پێـدا هاتۆتـەوەو ڕەحمـەتی تـۆ گرتوویەتـەوە، ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، تەنیـا ئـا ئـەوەش بردنـەوەی مەزنـەو، ئـەوەش سـەرفرازیی مەزنـە، کـە هـەر کەسێک لـەو ڕۆژەدا چەپاڵـە بـدرێ لـە سـزای خـوا، مانـای وایـە خـوای پـەروەردگار بەزەیـی پێـدا هاتۆتـەوە، چونکـە هـەر کەسـێک لـەو ڕۆژەدا نەچێتـە دۆزەخ کەواتـە: چۆتـە بەهەشـت، تەنیـا دوو شـوێنی هـەن خـوای بـەرز، بەڵـێ ئەعرافیـش هەیـە لـە نێـوان بەهەشـت و دۆزەخ دا، بـەڵام -- وەک زۆربـەی زانایـان گوتوویانـەو ئێمـەش لـە تەفسـیری سـووڕەتی (الأعـراف)دا بـە تەفصیـڵ باسـمانکردوە -- سـەرەنجام ئەهـلی ئەعرافیـش وا پێدەچـێ زیاتـر بـەرەو بەهەشـت

بچن، کەواتە: هەر کەسێک لە ڕۆژی دواییدا لە سزای خوا چەپاڵە بدرێ و بپارێزرێ و، لە مەینەتییەکانی ڕۆژی دوایی بپارێزرێ، مانای وایە نەچۆتە دۆزەخ، کەواتە: بە دڵنیایی چۆتە بەهەشت و سەرفرازو بە مراد گەیشتوویە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**قورئـان دابەزێنرانیـی خـوای زاڵـی زانـای تۆبـە وەرگـری، تۆڵـە تونـدی، خـاوەن چاکـەی فـراوانی، پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەی، تاکـە سـەرەنجام بـە دەسـتە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿حمٓ﴾، حا، میم، ئەوانە دوو پیتن، پیتی (ح) لەگەڵ پیتی (م) کە لە ڕووی تەجویدەوە دەبێ (ح)یەکە هەروەک خۆی (حا) بە دوو جووڵە (حركة) بێ، بەڵام (م) دەبێ شەش (٦) جووڵە (حركة) درێژ بکرێتەوە: (حا)، (میـیـیـیم)، پێشتر گوتمان: کە لە سەرەتای بیست و نۆ لە سوورەتەکانی قورئاندا، خوا ﷻ ئەو پیتانەی هێناون، کە پێیان دەگوترێ: پیتە لێکدابڕاوەکان، یان پیتە پچڕپچڕەکان، (الحروف المقَطَّعَة) واتە: نابێ بەسەریەکەوە بخوێنرێنەوە، لێرەدا ناگوترێ: (حم) حەم، یان بۆ (ألم) ناگوترێ: ئەلەم، بەڵکو دەبێ جیا جیا بخوێنرێنەوە، باشترین ماناش کە تاکو ئێستا ئێمە قەناعەتمان پێی هەبێ، ئەوەیە: کە خوا ﷻ لە ڕێی ئەو پەیامەوە، دەیەوێ بە مرۆڤەکان بڵێ: ئەو قورئانە کە لەبەر دەستی ئێوەدایەو، ئێوە لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، هەر لەو پیتانە کە لەبەر دەستی خۆتاندان، وەک کەرستەیەکی خاوو قسەیان پێدەکەن، لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە، بەڵام خوایەک لەو پیت و دەنگانەی کە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، ئەو فەرمایشتەی پێکهێناوەو فەرمووە، کەواتە: بزانن ئەو زاتە خوای پەروەردگارە، ئەگەرنا مرۆڤەکان دەتوانن لاسایی یەکدی بکەنەوە، بەڵام کەس ناتوانێ فەرمایشتێک کە خوا فەرموویەتی، وەک ئەو قسە بکات.

٢)- ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە لە لایەن خوای زاڵی زاناوەیە، وشەی: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، دەگونجێ: بڵێین: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، نیهاد (مُبْتَدَأ)ەو، ﴿ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، گوزارە (خَبر)یە، دەشگونجێ بە پێچەوانەوە بگوترێ: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، گوزارە (خبر)یە: (هَذَا تَنْزِيْلُ الكِتَابِ)، ئەمە دابەزاندنی کتێبەکەیە لە لایەن خوای زاڵی زاناوە، وشەی (ٱلْكِتَٰبِ)یش مادام (أل)ی ناساندنی لەسەرە، یان (أل) بۆ تێکڕا (جنس)یەو، مەبەست هەموو کتێبەکانە، واتە: هەرچی کتێبێک کە دابەزێنراوە لە ئاسمانەوە، هەمووی لە لایەن خوای زاڵی زاناوەیە، یاخود (أل)ی (عهد)ەو، مەبەست پێی ئەوەیە: دابەزاندنی کتێبەکە، ئەو کتێبەی کە مەعهوودەو زاندراوەو ناسراوە، لە لاتان کە قورئانە، لە لایەن خوای زاڵی زاناوەیە.

کەواتە: ئەم قورئانە سیفەتەکانی خوای ﷻ لە خۆیدا دەرەوشاندوونەوە، ئەم قورئانە هەم عەزیزە، وەک خوا ﷻ خۆی وا وەسفکردوە، هەم کتێبێکی عەلیمە، هەروەها کتێبێکی حەکیمەو کتێبێکی کەریمە، چونکە سیفەتەکانی خوا لە قورئاندا دەدرەوشێنەوە، ئنجا خوا ﷻ لەسەر پێناسەکردنی خۆی زیاتر بەردەوام دەبێ، تاکو بزانرێ ئەو قورئانە لە لایەن کێوە هاتوە؟

٣)- ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ ﴾، لێبوردەی گوناح، ئەمە تەماع وەبەرنانە بۆ بێبڕوایەکان، بێبڕوا سەرپێچییکەرەکان، کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ لە گوناحتان دەبوورێ.

٤)- ﴿ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ ﴾، هەروەها تۆبە وەرگرە، گەڕانەوە قبووڵ دەکات و وەردەگرێ، (التَّوْبُ: مَصْدَرُ تَابَ، أو جَمْعُ تَوْبَة مِثْلُ دَوْمَة: جَمْعُ دَوْم، عَزْمَة: جَمْعُ عَزْم)، واتە: (عَزْم، عَزْمَة)، (دَوْم، دَوْمَة)، (تَوْب، تَوْبَة)، کەواتە: ﴿ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ ﴾، (ٱلتَّوْبِ) یان چاوگە، واتە: خوا وەرگری گەڕانەوەیە، یان: (التوب) کۆی (توبة)یە، یانی: خوا وەرگری گەڕانەوەکانە، خوا هەر کەسێ بۆ لای بگەڕێتەوەو، گەڕانەوەکەی لێوەردەگرێ و قبووڵی دەکات.

٥)- ﴿ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ﴾، تۆڵەو سزایەکەی توندە، (الشَّدِيدُ: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالْفِعْلِ مُضَافَةٌ إلى فَاعِلِهَا)، (شَدِيد): سیفەتێ چوێنراوە بە کردارەوەو، پاڵدراوەتە لای بکەرەکەی، کە وشەی (عقاب)ە، ﴿ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ﴾، تۆڵە توندە.

٦)- ﴿ ذِى ٱلطَّوْلِ ﴾، خاوەن بەخششی فراوانە، یان: خاوەن تواناو دەستەڵاتی فراوانە.

(ذي) واتە: (صاحب)، (الطَّوْلُ: سَعَةُ الفَضْلِ، وَسَعَةُ المَالِ، وَيُطْلَقُ عَلَى القُدْرَةِ، أي: ذِي المَنِّ)، ﴿ ذِى ٱلطَّوْلِ ﴾، (طَوْل) هەم بە فراوانیی لە بەخششداو، فراوانیی لە ماڵ و سامان داو، فراوانیی لە دەستەڵاتدا، دەگوترێ: لێرەدا: ﴿ ذِى ٱلطَّوْلِ ﴾، زیاتر وا پێدەچێ یانی: خاوەن بەخششی فراوانە، یان: خاوەن دەستەڵاتی فراوانە.

٧)- ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە.

٨)- ﴿ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجام تەنیا بۆ لای ئەوە، ئەصڵی خۆی ئاوایە: (المَصِيرُ إليه)، گەڕانەوە بۆ لای ویە، بەڵام: ﴿ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾، ئەمە کە (الجّار والمجرور) پێشخراون، بۆ گرنگیی پێدانە واتە: گەڕانەوە تەنیا بۆ لای ئەوە.

لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکانەوە (أبو نُعَيم)[1]، بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە:

عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازیبێ) برادەرێکی هەبووە خەڵکی شام بووە، پیاوێکی ئازاو جەربەزە بووە، وەختێک هەواڵێکی پێدەگات کە ملی داوەتە مەیخۆریی، (مرۆڤیش کە ملی دایە مەیخۆریی، مانای وایە ڕووی لە گوناهو تاوان کردوەو، پشتی لە تاعەت و خواپەرستیی کردوە)، عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) کە ئەو کاتە خەلیفەی مسوڵمانان دەبێ، نامەیەکی بۆ دەنێرێ دەڵێ: لە بەندەی خواوە عومەری کوڕی خەتتاب بۆ فلانکەس! یەکسەر ئەم ئایەتانەی بۆ دەنووسێ: ﴿ حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ۝٣ ﴾و، بۆی دەخاتە نامەیەکەوەو بۆی دەنێرێ.

عومەر خوا لێی ڕازیبێ ئەو کەسەی کە نامەکەی پێیدا دەنێرێ دەڵێ: کاتێک زانیت سەرخۆشیی بەریداوەو لەسەر حاڵە، ئەو کاتە نامەکەی وێبدە، نەک لە

---

(١) حلية الأولياء: ج٤، ص٩٧.

کاتی سەرخۆشیی دا بێ، کابرا (ئەو کابرایە دوایی گێڕاویەتەوە)، گوتوویەتی: کە نامەکەی عومەرم پێگەیشت (خوا لێی ڕازی بێ) تێینەگەیشتم، هەر تەماشام دەکردو لێی حاڵیی نەدەبووم، دوایی چوومە دەشتێک هەر تەماشام کردو لێی وردبوومەوەو لێی وردبوومەوە، هەتا خوا ﷻ دڵمی بۆی پشکواند [چونکە ئینسان وەختێک بە گوناهو تاواندا دەچێتە خوار، عەقڵ و دڵیشی باش کار ناکات و پەردەی گوناهان عەقڵ و دڵی دادەپۆشێ، بۆیە گوتوویەتی: چوومە دەشتێک، دەبێ لە خوا پاڕابێتەوە: خوایە! لێم حاڵیبکە داخۆ ئەم ئایەتانە -- زانیویەتی ئایەتەکانی خوای پەروەردگارن -- مەبەست لێیان چییە؟] ئەوجار تێیان گەیشتم و وازم لە شەڕاب خۆریی هێنا، عومەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)یش هەواڵەکەی پێدەگاتەوە، دوایی عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ: {هَكَذَا فَاصْنَعُوا، إِذَا رَأَيْتُمْ أَخَاكُمْ زَلَّ زَلَّةً، فَسَدِّدُوهُ وَوَفِّقُوهُ، وَادْعُوا اللَّهَ لَهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِ، وَلَا تَكُونُوا أَعْوَانًا لِلشَّيْطَانِ عَلَيْهِ}.

واتە: هەر کاتێک برایەکتان بینی خلیسکاوە، ئاوا بکەن، ڕاستی بکەنەوەو، بۆی لە خوا بپاڕێنەوە، کە خوا لێی خۆش بێ و هاوکارانی شەیتان نەبن لە دژی برایەکەتان، (کە زەم و سەرزەنشتی بکەن و، پشتگوێی بخەن و وازی لێبێنن، شەیتان زیاتر زەفەری پێبەرێ).

## کورتە باسێک

## نۆ لە هۆیەکانی لێخۆشبوونی خوا لە مرۆڤ

لێرەدا بە پێویستی دەزانم لەم کورتە باسەدا ئاماژە بکەم، بە نۆ لە هۆیەکانی لێخۆشبوونی خوا لە مرۆڤ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ ﴾، لێبوردەی گوناح، (غافر) لەسەر کێشی (فاعل)ەو ناوی بکەر (إسم فاعل)ە، واتە: لێبوردە، (الذنب)یش (أل)ی (ناساندن)ی لەسەرە واتە: هەر جۆرە گوناحێک، کەواتە: خوا ﷻ لە هەموو جۆرە گوناهێک دەبوورێ، بەڵام ئایا هەر لە کۆترەو لە خۆڕا، یاخود بە پێی بەرنامەو سیستم (نظام)ێک کە دایناوە؟

لە ڕاستییدا دەبێ هۆکارەکانی لێبوردنی گوناح، ئینسان لە خۆیدا بیانهێنێتە دی، ئەوجار شایستەی ئەوە دەبێ کە خوا لە گوناهی ببوورێ، ئنجا من نۆ هۆکارم کەوتوونە بەرچاو، لەو شتانەی دەبنە مایەی ئەوە کە خوا لە گوناهی مرۆڤ ببوورێ:

١)- تەوبە کردن: خوا لە سوورەتی (التحريم)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە گەڕانەوەیەکی ساغ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، نیزیکە خراپەکانتان لێ بسڕێتەوەو بتانخاتە بەهەشتەکانەوە، لەو ڕۆژەدا کە خوا پێغەمبەرو ﷺ ئەو (ئیماندار)انەی لەگەڵیدان، زەبوونیان ناکات.

کەواتە: یەکەمین هۆکار بۆ ئەوەی خوا لە گوناحی مرۆڤ ببوورێ بریتیە: لە گەڕانەوە، بەڵام گەڕانەوەیەکی ساغ، (نَّصُوحًا) واتە: تەوبەیەک کە ساغ و پاک و بێ خڵتەو ڕاستەقینە بێ.

٢)- ئیمان و کردەوەی چاک: خوا لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، بڕوایان بەوە هێناوە کە دابەزێنراوەتە سەر موحەممەد ﷺ کە هەق و ڕاستەو لە پەروەردگاریانەوەیە، (خوا) خراپەکانیان لێ دەسڕێتەوەو، حاڵ و باڵیشیان باش دەکات.

٣)- پارێزکاریی: خوا لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر پارێز لە خوا بکەن، خوا جیاکەرەوەتان پێ دەبەخشێ، (جیاکەرەوە لە نێوان هەق و ناهەق، حەڵاڵ و حەرام، چاک و خراپ، ڕاست و چەوتدا) و خراپەکانتان لێ دەسڕێتەوەو، لێشتان دەبووریٚ، خوا خاوەنی بەخششی مەزنە.

٤)- کۆچکردن لە پێناوی خواو، جەنگکردن لە پێناوی خوادا: وەک خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ ﴿١٩٥﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە کۆچیان کردوە لە پێناوی منداو، لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەرنران و ئازاردراون و، جەنگیان کردوەو، کوژراون، ئەوانە بە دڵنیایی من خراپەکانیان لێ دەسڕمەوە.

٥)- ماڵ بەخشین بە شێوەی پەنهان: وەک لە سوورەتی (البقرة)دا خوای بەخشندە، ددەفەرموێ: ﴿ إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ وَإِن تُخۡفُوهَا وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمۡۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٧١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ماڵ بەخشینەکانتان ئاشکرا بکەن، ئەوە باشترین

شتە، (بەڵام لە شوێن و کاتی خۆیدا، لە کاتێکدا کە ئەو ماڵ بەخشینە واجبە، بۆ ئەوەی بزانرێ تۆ ئەو واجبە جێبەجێ دەکەی، یاخود لە کاتێکدا بەو ماڵ بەخشینە ببیە سەر مەشق بۆ خەڵکێکی دیکە، تاکو تەماشات بکەن، وا باشە دەریخەی لەو کاتەدا)، بەڵام ئەگەر پەنهانی بکەن و، بیدەن بە هەژاران، ئەوە بۆ ئێوە باشترەو، خوا خراپەکانیشتان لێ دەسڕێتەوەو، خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە.

کەواتە: مەسەلەی بەخشینی ماڵ، ئایا بە پەنهانیی بێ، یان بە ئاشکرا؟ بە پێی حاڵەکان دەگۆڕێ، نەک هەر یەک حاڵەتی هەبێ، بۆیە خوای پەروەردگار هەردوو حاڵەکانی وا باسکردوون کە هەردووکیان زۆر باشن، بەڵام هەر کامێکیان بۆ شوێنی خۆی، کە ئێمە لە سووڕەتی (البقرة)دا بە تەفصیل لەو بارەوە باسمانکردوە، دوایی لە نامیلکەکەیەکیشدا (چۆنیەتی ماڵ بەخشین) چاپکراوە.

٦)- **قەرزی چاک، واتە: ماڵ پێدان بە کەسێک بەبێ بەرانبەر:** وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ﴿١٧﴾ ﴾التغابن، واتە: ئەگەر قەرزی باش لەگەڵ خوادا بکەن، (واتە: هاوکاریی خەڵک بکەن، بەبێ بەرانبەر، ئنجا چ دوایی وەریبگرنەوە، دوای ئەوەی هاوکارییتان کرد بە قەرز پێدان، لێی وەربگرنەوە، بەڵام بەبێ زیادە، یاخود هەر پێی ببەخشن، ئەوە قەرزێکەو لەگەڵ خوادا کردووتە)، بە دڵنیایی خوا پاداشتەکەتان بۆ چەند قات دەکاتەوەو لێشتان دەبووری.

٧)- **خۆ دوورگرتن لە گوناهە گەورەکان:** وەک لە سووڕەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خۆتان لەو گوناهە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراون، بپارێزن، خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، (گوناهەکانی دیکە، کە لە گوناهە گەورەکان نین، ڕاستەوخۆ لێتان دەسڕینەوە، ئەگەر خۆتان لە گوناهە گەورەکان بپارێزن) و دەشتانخەینە نشینگەیەکی هەرە باشەوە.

**٨)- داوای لێبوردنکردن لە خوا:** وەک خوا لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێک خراپەکەیەک بکات، یاخود ستەم لە خۆی بکات، (خراپەیەک بکات لەگەڵ خەڵکدا، یان ستەم لە خۆی بکات، لە نێوان خۆی و خوادا)، دوایی داوای لێبوردن لە خوا بکات، دەبینێ خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

**٩)- داوای لێبوردن کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران:** وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ ﴾، واتە: ئەوانە کاتێک کە ستەمیان لە خۆیان دەکرد، ئەگەر هاتبان بۆ لات، (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ) و داوای لێبوردنیان لە خوا کردبایەو، پێغەمبەر ﷺ داوای لێبوردنی بۆ کردبان، خوایان دەبینی: زۆر تۆبە وەرگرەو، زۆریش میهرەبان و بە بەزەییە.

ئنجا ئێستا پێغەمبەر ﷺ لە ژیان دا نەماوە، بچینە خزمەتی، بەڵام با لە خزمەت ڕێبازەکەی دابین، مانای وایە لە خزمەت ئەو داین و، بە دڵنیایی بە ئەندازەی ئەوە کە بۆ خوا سوڵحاو دەبین و لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەبین، بە ئەندازەی ئەوە کە پابەندی ڕێبازەکەی دەبین و لە خزمەتیدا دەبین، شایستەی ئەوەش دەبین کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبوردنمان بۆ لە خوا بکات.

ئەمە نۆ هۆکار کە دەگونجێ هی دیکەش باسبکرێن، بەڵام من ئەو نۆیەم کەوتوونە بەرچاو، لە هۆکارەکانی ئەوە، کە خوا چۆن لە مرۆڤ دەبووریّ و، چۆن گوناهەکانی لێ دەسڕێتەوە؟.

ئنجا با جارێکی دیکەش تەماشای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە بکەینەوە:

﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ
شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ۝٣﴾:

وەک دەبینین: دابەزێنەری قورئان ﷻ بە نۆ سیفەت پێناسە کراوە، هەڵبەتە لێرەو، لە زۆر جێگای دیکەی قورئاندا، کاتێک خوا باسی دابەزاندنی قورئان دەکات، باسی خۆی دەکات بە کۆمەڵێک لەو سیفەتە بەرزو بێ وێنانەی هەیەتی، تاکو بزانین: ئەو قورئانە لە کوێوە هاتووەو، سەرچاوەکەی کێیەو، خاوەنی چ سیفەتێکە، ئەو پەروەردگارەی ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، کە بە تەئکید هەر بێژەرێک سیفەتەکانی لە بێژراوەکەیدا ڕەنگ دەدەنەوە، سیفەتەکانی خواش لە قورئاندا ڕەنگیان داوەتەوە، بۆیە هەندێک لە زانایانی پێشینان گوتوویانە: (**لَقَدْ تَجَلَّى اللهُ لِلنَّاسِ فِي كِتَابِهِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُون**)، واتە: خوا لە کتێبەکەیدا بۆ خەڵک دەرەوشاوەتەوە، ئەگەر بزانن، ئەو نۆ سیفەتەش کە خوا ﷻ وەک دابەزێنەری قورئان لێرەدا خۆییان پێ دەناسێنێ، ئەمانەن:

١- ﴿ٱللَّهِ﴾: واتە: خوا، کە دابەزێنەری کتێبەکەیە.

٢- ﴿ٱلۡعَزِيزِ﴾: واتە: زاڵ.

٣- ﴿ٱلۡعَلِيمِ﴾: واتە: زانا.

٤- ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ﴾: واتە: لێبوردە لە گوناح.

٥- ﴿وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ﴾: واتە: تۆبە وەرگر.

٦- ﴿شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ﴾: واتە: تۆڵە توند.

٧- ﴿ذِي ٱلطَّوۡلِ﴾: واتە: خاوەن بەخششی فراوان.

٨- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾: واتە: بێجگە لەو، هیچ پەرستراوێک نیەو تاکە پەرستراوە.

٩- ﴿إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾: واتە: سەرەنجام گەڕانەوە بۆ لای ویە.

**مەسەلەی دووەم:**

**جگە لە بێبڕوایان هیچ کەس شەڕە قسە دژی ئایەتەکانی خوا ناکات، بەڵام نابێ بە خۆ بادانیان فریو بخۆن، ئەی بڕوادارینە! چونکە لە پێش وانیشدا گەلی نووح و، گەلە کافرەکانی دوای وانیش، پەیامی خوایان و پێغەمبەرانی خوایان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە درۆ دانان و، ویستیان پەلاماری پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بدەن و، هەوڵی پووچەڵ خستنە بەرچاوی هەقیاندا، بەڵام سەرەنجام خوا سزای سەختی دان و، بڕیاری سزادانی خواش لەسەر هەموو بێبڕوایان چەسپاوە، کە دەبێ هاوەڵی ئاگربن، واتە: بچنە نێو ئاگری دۆزەخەوەو، ببنە هاودەم و هاوڕازی و لێی نەیەنە دەرو لێی جیانەبنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۭ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، جگە لەوانەی بێبڕوا بوون، هیچکەس مشتومڕو شەڕە قسە ناکات لە دژی ئایەتەکانی خوا.

زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (مَا يُخَاصِمُ فِي حُجَجِ اللَّهِ وَأَدِلَّتِهِ عَلَى وَحْدَانِيَّتِهِ بِالإِنْكَارِ لَهَا، إِلَّا الَّذِينَ جَحَدُوا تَوْحِيدَهُ)، واتە: مشتومڕو، شەڕەقسەو، دمبەدمە، لە دژی ئایەتەکانی خوا ناکات، لە دژی بەڵگەکانی یەکتایی خوا، بەوە کە نکووڵییان لێبکات و قبووڵییان نەکات، بێجگە لەوانەی نکووڵیی دەکەن لە بەیەکگرتنی.

وشەی (ءَايَٰتِ) لە قورئاندا بە چەند واتایەک هاتووەو، پێشتریش چەند جارێک باسمانکردوە:

(آیـــــــات):

أ- هەم بە مانای ڕستەکانی فەرمایشتی خوا دێن.

ب- هەم بە مانای موعجیزەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دێن.

ج- هەم بە مانای دیاردە سروشتییەکان دێن، دیاردەو دیمەنەکانی گەردوون و دەوروبەر.

د- هەم بە مانای ئەو بەڵاو مەینەتییانەی کە خوا بەسەر گەلە کافرەکانی هێناون، هەموویان بە (ءَايَـٰتِ) ناوبراون، بەڵام بە پێی سیاق دیاریی دەکرێ مەبەست لە (ءَايَـٰتِ) چییە؟ لێرەدا بێگومان مەبەست پێی ڕستەکانی فەرمایشتی خوایە.

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، جگـە لەوانـەی بێبـڕوان، واتـە: بێبـڕوان بـە خـوا ﷻ، کەسێک کـە بـڕوای بـە خـوا نیـە، ئنجـا ئایەتـەکانی ڕەفـز دەکات و گوێیـان بـۆ ناگـرێ.

٢)- ﴿فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾، (فَلَا يَغْرُرْكَ) خوێنراویشتەوە: (فَلَا يَغُرَّكَ)، با فریوت نەداو هەڵتنەخەڵەتێنێ هاتن و چوونی وان لە وڵاتاندا، واتە: (فَلَا يَخْدَعْكَ يَا مُحَمَّدُ تَصَرُّفُهُمْ فِي الْبِلَادِ وَبَقَاؤُهُمْ وَمَكْثُهُمْ فِيهَا، فَتَحْسَبُ أَنَّهُمْ أُمْهِلُوا فَإِنَّمَا أَمْهَلْنَاهُمْ، لِيَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ)، واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ هەڵمەخەڵەتێ و فریو مەخۆ، بەوە کە بێبڕوایان دەستڕۆیشتوون لە وڵاتانداو ماونەوەو تێیدا بەردەوامن، پێت وابێ کە ئەوە مۆڵەت دراون و وازیان لێهێنراوە، نەخێر، بەڵام بۆیە مۆڵەتمان داون تاکو بڕیار دەگاتە کاتی خۆی.

واتـە: تاکـو بەپێـی ئـەو سیسـتەمەی خـوا دایناوە ﷻ، هـەر کەسـە بگاتـە ئـەو مەودایـەی کـە بـۆی دیارییکـراوە، ئەگەرنـا ئـەوە نیـە کـە خـوا ﷻ وازی لێهێنابـن و پشـتگوێی خسـتبن.

ئنجـا خـوا ﷻ وەک بەڵگـە هێنانـەوەو سـەلماندنی ئـەو ڕاسـتییەی باسـیکرد، کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾، [بـا هاتـن و چـوونی ئـەوان بـە وڵاتاندا (بـە دەڤـەرەکان دا) فریـوت نـەدا]، وەک بەڵگـە لەسـەر ئیسـپاتی ئـەو ڕاسـتییە کـە خـوا لێیـان نەگـەڕاوەو وازی لێنەهێنـاون، دەفەرمـوێ:

٣)- ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ ﴾، لە پێش واندا گەلی نووح بە درۆیان دانا، واتە: (كَذَّبَتْ كِتَابَ الله)، یان (كَذَّبَتْ رَسُولَ اللهِ نُوحاً)، گەلی نووح كتێبی خوایان بە درۆ دانا، یان پێغەمبەری خوایان بە درۆ دانا.

٤)- ﴿ وَالْأَحْزَابُ مِنْ بَعْدِهِمْ ﴾، هەروەها كۆمەڵەكان لە دوای گەلی نووحیش، ئەوانیش بە هەمان شێوە پێغەمبەرانی خوایان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و، پەیامەكانی خوایان بە درۆ دانان، (الأَحْزَاب: الأُمَمُ المُتَحَزِّبَةُ ضِدَّ الأَنْبِيَاء) واتە: ئەو كۆمەڵانەی كە یەكیان گرتبوو لە دژی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، وشەی (حِزْب: وَهُوَ اسْمٌ لِلْجَمَاعَةِ الَّذِينَ هُمْ سَوَاءٌ فِي شَأْنٍ: مِن اعْتِقَادٍ أَوْ عَمَلٍ أَوْ عَادَةٍ)، (حِزْب): بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێك كە یەكن، یەكسانن لە شتێكدا، بۆ وێنە لە عەقیدەدا، لە بیرو بۆچووندا، لە كردەوەیەكدا، لە پیشەیەكدا، لە كارێكدا، ئەوانە پێیان دەگوترێ: (حِزب) واتە: كۆمەڵە خەڵكێكی یەكگرتوو لەسەر شتێك.

٥)- ﴿ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ﴾، هەر كۆمەڵێك لەو (كۆمەڵە كافر) انە نیازیان بوو لە دژی پێغەمبەرەكەیان كە بیگرن، واتە: بیگرن تاكو بیكوژن، یان سزای بدەن، (الهَمّ: العَزْمُ)، (هَمّ) بریتیە: لە عەزم جەزمكردن بۆ بڕیاردان لە دڵدا، كە دیارە ئەم (هَمّ)ە، نازانرێ چییە؟ بەڵام بە تەعبیری دوایی دەزانرێ: ﴿ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ﴾، كەواتە: ئەوەی بە دڵیاندا هاتوە، ئەوە بووە كە بیگرن، گرتنەكەش بۆ ئەوە بووە سجنی بكەن، یاخود ئەشكەنجەی بدەن، یاخود بیكوژن.

٦)- ﴿ وَجَادَلُوا بِالْبَاطِلِ ﴾، هەروەها بە ناهەق موناقەشەو مشتومڕیان كرد.

٧)- ﴿ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ ﴾، بۆ ئەوەی هەقی پێ پووچەڵ بكەنەوە، هەقی پێ بپووچێننەوە، هەندێك لە زانایان ناوایان لێكداوەتەوە (أَنَّهُمْ زَوَّرُوا الْبَاطِلَ فِي صُورَةِ الْحَقِّ، وَرَوَّجُوهُ بِالسَّفْسَطَةِ فِي صُورَةِ الْحُجَّةِ)، واتە: ئەو بیرۆكە ناهەقەی لە لایانبووە، لە شێوەی هەقدا ڕایان نواندوەو ڕازاندوویانەتەوە بە سەفسەتەو قسەی بۆش لە شێوەی بەڵگەدا، تاكو هەقی پێ بپووچێننەوە، (إِدْحَاض) واتە: لابردن و بە مانای دوورخستنەوەش دێ و، لە ئەسڵدا لە (دَحْض)ەوە هاتوە، واتە: خلیسكان.

٨)- ﴿ فَأَخَذْتُهُمْ ﴾، بەڵام سەرەنجام گرتمن، (الأَخْذُ: يُسْتَعْمَلُ مَجَازاً فِي التَّصَرُّفِ فِي الشَّيْءِ بِالْقَتْلِ وَالتَّعْذِيْبِ)، وشەی (أَخْذُ) بەکارهێنراوە لێرەدا بۆ تەصەڕروف کردن لە شتێکدا بە کوشتن و ئەشکەنجەدان و ئازاردان.

٩)- ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴾، ئنجا ئایا سزای من چۆن بوو؟ (كَيْفَ) بۆ پرسیارکردنە، بەڵام: (الإِسْتِفْهَامُ مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعْجِيْبِ)، پرسیار کردن بۆ سەرسوڕماندنە، واتە: سزادانەکەی من چۆن بوو! زۆر جێی سەرسوڕمان بوو!

( عقابِ) لە ئەسڵدا (عقابي) یەو (ي) کە قرتێنراوە.

١٠)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، هەر بەو شێوەیە فەرموودەی پەروەردگارت چەسپاوە لەسەر ئەوانەی بێبڕوان، واتە: وەک چۆن بێبڕوایانی پێشوو بەو شێوەیە سزادران، بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر، بە هەمان شێوەش هەموو ئەوانەی بێبڕوان لە سەردەمی تۆدا، ئەی موحەممەد ﷺ! لە دوای تۆش دیسان بڕیاری خوا بۆ ئەوانیش هەر لە بۆسەدایەو، بەسەر وانیشدا دەچەسپێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: (أَيْ: مِثْلُ ذَٰلِكَ الحَقِّ حَقَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ)، واتە: بەو شێوە چەسپانە، سەرسوڕهێنەرە، فەرمایشتی پەروەردگارت، یانی: بڕیاری پەروەردگارت چەسپا.

وشەی: ﴿ كَلِمَتُ رَبِّكَ ﴾، خوێنراویشتەوە: (كَلِمَاتُ رَبِّكَ)، وشەکانی پەروەردگارت.

١١)- ﴿ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، کە ئەوانە دەبنە هاوەڵی ئاگر.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- بۆیە بڕیاری پەروەردگارتیان لەسەر چەسپی، چونکە خاوەنی یاخود هاوەڵی ئاگرن.

ب- بڕیاری پەروەردگارتیان لەسەر چەسپی، وشەی پەروەردگارتیان لەسەر چەسپی، تاکو ببنە هاوەڵی ئاگر.

ئەگەر یەکەمیان بێ، واتە: بەهۆی بێبڕواییەکەیانەوە بڕیاری پەروەردگارتیان لەسەر چەسپی، ئەگەر مانای دووەمیان بێ، واتە: بڕیاری پەروەردگارتیان لەسەر چەسپی، تاکو ببنە هاوەڵی ئاگر، ڕەفیقی دۆزەخ، بەڵام بێگومان بەهۆی بێبڕواییەکەیانەوە.

وشەی: ﴿ وَجَٰدَلُوا۟ ﴾، (جدل) کە لەم سوورەتە موبارەکەدا پێنج جاران دووبارە بۆتەوە، با بزانین وشەی (جدال) مانای چییە؟ (**الْجِدَالُ: الْمُفَاوَضَةُ عَلَى سَبِيلِ الْمُنَازَعَةِ وَالْمُغَالَبَةِ، وَأَصْلُهُ مِنْ جَدَلْتُ الْحَبْلَ، إِذَا أَحْكَمْتُ فَتْلَهُ، فَكَأَنَّ الْمُتَجَادِلَيْنِ يَفْتِلُ كُلُّ وَاحِدٍ الْآخَرَ عَلَى رَأْيِهِ، وَقِيلَ: الْأَصْلُ فِي الْجِدَالِ الصِّرَاعُ وَإِسْقَاطُ الْإِنْسَانِ صَاحِبَهُ عَلَى الْجَدَالَةِ، وَهِيَ الْأَرْضُ الصُّلْبَةُ**).

(**راغب الأصفهاني**) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی[1]دا دەڵێ: وشەی (**الْجِدَال**) بریتییە: لە قسە لەگەڵ یەکدی دا کردن بە شێوەی ناکۆکیی و مشتومڕ دەمەقاڵێ، ئەصڵەکەشی لە (**جَدَلْتُ الْحَبْلَ**)وە هاتوە، واتە: پەتەکەم هۆنیەوە، وەک ئەوەی هەردوو لایەنی کە پێکەوە شەڕە قسە دەکەن، هەر کامێکیان بیەوێ ئەوی دیکە لە ڕای خۆی بادات و بۆ لای خۆی بیهێنێ، هەندێکیش گوتوویانە: (**جِدَال**) واتە: (**صِرَاع**) زۆران گرتن، کە هەر کامێک لە دوو کەسەکان بیەوێ هاوەڵەکەی خۆی بخاتە سەر زەوی و، ئەویش (**الْجَدَالَةِ**)ی پێ دەڵێن، (**الْجَدَالَةِ**) زەوی سەخت و چڕ.

وەک گوتمان: وشەی (جدال) لەم سوورەتە موبارەکەدا پێنج جاران هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٤ و ٥ و ٣٥ و ٥٦ و ٦٩)دا هاتوە، شایانی باسە: سێ وشە لە قورئاندا هاتوون، مانایان لێک نیزیکە: (**جدال، مراء، مخاصمة**):

١- (جدال) واتە: شەڕە قسەو مشت و مڕ.

٢- (مراء) کە بە: (یمارون ویمترون) هاتوە، لەگەڵ (جدال)دا جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە (مِراء)، ئەوەیە: کەسێک شەڕە قسە لە بارەی شتێکەوە بکات کە لێی دوولە.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص١٩٠.

٣- (مخاصمة)ش بە (خصام وخصم) هاتوە: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾﴾ (مُخَاصَمَة)ش ئەوەیە کە دوو لا، دوو کەس هەر کەسە یەخەی ئەویدیکە بگرێ، (خُصْم) واتە: یەخە.

وشەی (جِدَال) لە قورئاندا کەم وایە بۆ چاکە هاتبێ، بە زۆریی بۆ حاڵەتێک هاتوە کە کەسێک هەق ڕەت بکاتەوە، بە ناهەق قسە بکات و بیەوێ هەقی پێ بپووچێنێتەوە، بۆیە بە زۆریی (جِدَال) لە قورئاندا زەم کراوە، بۆیەش خوا فەرمانی کردوە کە کاتێ (جِدَال)مان کرد، بە باشترین شێوە بیکەین: ﴿وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴿١٢٥﴾﴾النحل، واتە: بە باشترین شێوە شەڕە قسەیان لەگەڵ بکە، ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ ﴿٤٦﴾﴾العنكبوت، واتە: شەڕە قسە لەگەڵ خاوەن کتێبەکان دا مەکەن، مەگەر بە باشترین شێوە، جگە لەوانەیان کە ستەمیان کردوە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**فریشتە هەڵگرەکانی عەرش و دەورەدەرەکانیشی بە پاکگرتنەوە ستاییشی دەکەن و، بڕوای پێ دێنن و داوای لێبوردن لە خوا دەکەن بۆ بڕوادارانی ڕێبازی خوا گرتوو و، داوای لێدەکەن کە خۆیان و باب و دایک و هاوسەرو وەچە شایستەکانیان بخاتە بەهەشتەوە، لە مەینەتییەکانی ڕۆژی دوایی چەپاڵەیان بدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە دوازدە بڕگەدا:**

**١)-** ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾، ئەوانەی کە عەرش هەڵدەگرن و ئەوانەش کە بە دەوریەوەن، بە ستاییشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاک دەگرن.

وەک لە سوورەتی (الحاقة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ ﴾الحاقة، واتە: فریشتەکان بە دەوری ئاسمانەکانەوەن، لەو ڕۆژەشدا عەرشی پەروەردگارت هەشت هەڵیدەگرن.

**٢)-** ﴿ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، هەروەها بڕواشی پێ دێنن، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئەمە -- وەک پێشتریش ئاماژەم پێکرد -- بۆ هەڵنان و هاندانی مرۆڤەکانە کە ئیمان شتێکی

زۆر گەورەیە، ئەوەتا ئەو فریشتە زۆر لەو نیزیکانەی کە عەرشی خوایان هەڵگرتووە، ئەوانەی کە بە دەوری عەرشەوەن، دەوری عەرشیان داوە، ئەوانەش ئەهلی ئیمانن، بەڵام لێرەدا بە پێویستم زانی ئاماژە بکەم بەوە کە (**فخر الدين الرازي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، قسەیەک لە زەمەخشەریی خاوەنی تەفسیری (**الكشاف**)ەوە دێنێ و پشتگیریی دەکات و پێی سەرسام (**مُعْجَبْ**)ە، ئەویش ئەوەیە کە لێرە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، فریشتەکان بڕوا بە خوا دێنن، ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە خوا لەسەر عەرش نیە، ئەگەرنا ئەگەر خوا لەسەر عەرش باو، فریشتەکان بینیبایان، ئازایەتیی نەبوو ئیمانی پێبێنن!!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەو قسەیەی (**فخر الدين الرازي**) کە پشتگیریی ڕایەکەی زەمەخشەریی دەکات، نەڕایەکەی زەمەخشەریی ڕاستەو، نە پشتگیرییەکەی (**فخرالدين الرازي**)یش، بۆچی؟

چونکە ئیمان بەس ئەوە نیە کە ئایا شتێک دەبینی، یان نابینی؟ بەڵکو ئیمان بریتیە: لە بە ڕاست دانان (تصديق) بەڵام وێڕای ئەوەش: دانپێداهێنانی بە زمان و، بە دڵ و دەروون پەسندکردن و، جێ بەجێکردن و بە قسەکردن، هەموو ئەوانە دەگرێتە نێو خۆی، کەواتە: ئیمان هێنانی فریشتەکان بە خوا ﷻ، بەس ئەوە نیە ئیمان بە بوونەکەی بێنن، وەک بەدیهێنەر، بەڵکو بۆی تەسلیمن و، خۆشیان دەوێ و ئەوپەڕی خۆشویستنیان بۆی هەیەو، ملکەچییان بۆی هەیە، فەرمانبەریی، ئیمان هەموو ئەوانە دەگرێتە نێو خۆی، ئنجا ئەوە نابێتە بەڵگەش لەسەر ئەوە کە لەبەر ئەوەی خوا فەرموویەتی: ئیمان بە خوا دێنن، کەواتە: خوا لەسەر عەرش نیە! خوا لەسەر عەرشە، بەڵام بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، نەک بەو شێوەیە کە ئێمە لێی حاڵیین و، ئیمان هێنانی فریشتانیش بە خوا ﷻ مانای وانیە کە نایبینن، بەڵکو فریشتەکان خواش دەبینن، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، واپێدەچێ فریشتەکان خوا ببینن و،

---

(١) التفسير الكبير: ج٢٧، ص٣١-٣٠.

ئەهـلی بەهەشـتیش لـە بەهەشـتدا خـوای پـەروەردگار دەبینـن و، هاوکاتیـش بینینـی خـوا ﷻ لەگـەڵ بڕواپێهێنانیـدا دژ ناوەسـتێ.

٣)- ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾، فریشتەکانی هەڵگری عەرش و، دەوروەدەرانی عەرش داوای لێبوردن (لە خوا) دەکەن بۆ بڕواداران، وەک لە سوورەتی (محمد) دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۝١٩﴾، واتە: داوای لێبوردن بۆ گوناهی خۆت و بۆ بڕوادارانی پیاوو ئافرەت بکە، لێرەش ئەو فریشتانە داوای لێبوردن بۆ ئەوانە دەکەن کە بڕوایان هێناوە، دەڵێن: چی؟

٤)- ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾، پەروەردگارمان! بەزەیی و زانیاریی تۆ هەموو شتێکی گرتۆتەوە، واتە: هەر شتێک کە هەیە بە هۆی بەزەیی تۆوە هەیەو، هەر شتێک کە هەیە زانیاریی تۆ دەوری داوە.

٥)- ﴿فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ﴾، ئنجا لەوانە ببوورە کە گەڕاونەوەو شوێن ڕێبازەکەت کەوتوون، گەڕاونەوە، یانی: گەڕاونەوە بۆ لای خواو، شوێن ڕێبازەکەت کەوتوون یانی: فەرمانبەرو ملکەچن، بۆ ئایین و بەرنامەی تۆ.

٦)- ﴿وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾، هەروەها لە سزاو ئازاری کڵپەی دۆزەخ بیانپارێزە، (الجَحِيمُ: شِدَّةُ النَّارِ المُتَأَجِّجَة)، ئاگر کە بڵێسە دەداو بڵێسە سەوزەکەی و کڵپەکەی پێی دەگوترێ: (الجَحِيمُ) لە ئازاری کڵپەی دۆزەخ بیانپارێزە.

٧)- ﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُمْ﴾، پەروەردگارمان! هەروەها بیانخە نێو ئەو بەهەشتە هەمیشەییانەوە، کە بەڵێنت پێداون.

٨)- ﴿وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ﴾، هەروەها هەر کەسێک کە شایستەیە لە باب و باپیرانیان (واتە: دایک و نەنکیشیان) و لە هاوسەرانیان و لە وەچەکانیشیان.

ئەمە لە سوورەتەکانی: (الطور) و (الرعد)یش دا هاتوە:

أ- لە سوورەتی (الطور)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍۚ كُلُّ ٱمْرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو وەچەکەشیان بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون، وەچەکانیان بەوان دەگەیەنین و، هیچ لە کردەوەکەشیان کەم ناکەینەوە (کە بیخەینە سەر هی وەچەکەیان، تاکو وەچەکانیان بگەنە ئاستی ئەوانە، ئەگەر ئاستی ئەوان لە بەهەشتدا بەرزتر بێ، جاری واش هەیە ئاستی ئەو وەچەو ڕۆڵەیە بەرزترە لە هی باب و دایکیان و، ئەمان دەبرێن بۆ لای ئەوان)، هەر مرۆڤە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی.

ب- لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: چەند بەهەشتێکی هەمیشەیی دەیانچنەتێ، هەر کەسێک کە شایستە بێ لە باب و باپیرانیان (باب و دایک و باپیرو ئەنک و هتد) و لە هاوسەرانیان و، لە ڕۆڵەکانیان.

کەواتە: لە سێ شوێنی قورئاندا هاتوە، کە خوا ﷻ ئەهلی ئیمان بنەچەکەکان (أصول) و لقەکان (فروع) یان پێکەوە کۆ دەکاتەوە، بەڵام هەر کەسە بە شێوەی خۆی و، گرنگ ئەوەیە لێک نیزیک دەبن و، بە دەم یەکەوە دەبن.

٩)- ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارمان! هەر تۆی زاڵی کارزان.

١٠)- ﴿ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، هەروەها لە خراپەکان بیانپارێزە، واتە:

أ- بیانپارێزە لە دنیادا لە هەر شتێک کە بۆوان خراپە.

ب- یاخود بیانپارێزە لە مەینەتییەکانی ڕۆژی دوایی، کە خراپن.

ج- یاخود بیانپارێزە لە سزای خراپەکان کە لە دنیادا کردوویانن.

(أي: قِهِمْ مَايَسُوؤهم) هەر شتێک بۆ وان خراپە، چەپاڵەیان بدە، ئەوەی بۆ وانیش خراپە، ئەوەیە کە سزای خراپەکانیان بدرێ، یاخود ئەو مەینەتییە خراپانەی لە ڕۆژی دواییدا هەن، پێیانەوە گرفتاربن، خوایە! لەوە بیانپارێزە.

١١)- ﴿ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ ﴾، هەر کەسێکیش لەو ڕۆژەدا تۆ لە خراپەکان بیپارێزیّ و، چەپاڵەی بدەی، بە دڵنیایی بەزەییت پێیداهاتوەو، بەزەییت لەگەڵ نواندوە، واتە: هەر کەسێک لە سزای خراپەکان، یاخود: لە مەینەتییە خراپەکانی ئەو ڕۆژە بیپارێزی، یاخود هەر کەسێک لە گوناح و خراپەو تاوانەکانی دنیا بیپارێزی، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا دووچاری سزا نەبێ، ئەوە تۆ بەزەییت پێیدا هاتوە.

١٢)- ﴿ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، تەنیا ئا ئەوەش سەرکەوتن و بردنەوەی مەزنە، واتە: ئەو پارێزرانە لە گوناهو تاوانەکانی دنیادا، یاخود: لە سزای گوناهو تاوانەکان لە ڕۆژی دواییدا، یاخود: لە مەینەتیی و ناڕەحەتییەکانیی ڕۆژی دوایی، ئا ئەو پارێزرانە، سەرکەوتنی مەزنە.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری، ئێمەش لە ڕیزی ئەو پارێزراوە بە مرادو ئاکام گەیشتووانەدا حیساب بکات.

## کورتە باسێک لە بارەی (عرش)ەوە

لە بارەی عەرشی خواوە ﷻ زانایان بە گشتیی دوو ڕایان هەن:

**ڕای یەکەم:** کە ڕای زۆربەی زانایانەو بەهێزترە، بەندەش هەر ئەو ڕایەی پێ پەسندە، ئەوەیە: عەرش دروستکراوێکی مەزنی خوایە، لە سەرووی دروستکراوەکانیەوەیە.

**ڕای دووەم:** هی هەندێک لە زانایانە دەڵێن: (عەرش) وشەیەکە خوا بەکاری هێناوە، وەک ڕەمزو هێما بۆ حکومڕانیی و دەسەڵات و باڵادەستیی خۆی، بەسەر بوون و گەردووندا.

بەڵام ئەو ڕایەی گوتمان ڕای زۆرینەی زانایانە، دەتوانین بە کۆمەڵێک بەڵگەی بەهێز پشگیریی بکەین و، بیسەلمێنین کە هەر ئەو ڕایە ڕاستە:

**بەڵگەی یەکەم:** خوا ﷻ لە حەوت سووڕەت لە قورئاندا واتە: لە حەوت ئایەتاندا کە هەر کام لەو ئایەتانە لە سووڕەتێکدایە، لە قورئاندا، باسی چوونە سەر عەرشی خۆی کردوە: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾، کە شوێنەکان بە پێی ڕیزبەندیی سووڕەتەکانی قورئان کە لە (مصحف)دا هاتوون، بەو شێوەیەن:

١- دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف.

٢- دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٣﴾﴾ یونس.

٣- دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٢﴾﴾ الرعد.

٤- دەفەرموێ: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ طه.

٥- دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ﴾ الفرقان.

٦- دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ﴾ السجدة.

٧- دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ﴾ الحديد.

هەڵبەتە ڕاستییەک لە یەک ئایەتیشدا هاتبێ، لە یەک سوورەتی قورئانیشدا، بەڵکو لە یەک ڕستەشیدا، بەسە کە ئەو ڕاستییە بسەلمێنرێ، بەڵام ئەوە کە خوا ﷻ عەرشێکی هەیەو، ئیستیوای کردوە بۆ سەر ئەو عەرشە، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، لە حەوت شوێنی قورئاندا هاتوە.

بەڵگەی دووەم: خوا ﷻ لە سوورەتی (هود)دا باسی ئەوە دەکات، کە بەر لەوەی خوا ئاسمانەکان و زەوی بخوڵقێنێ، عەرشی خوا لەسەر ئاو بووە، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴾.

کەواتە: وەک چۆن ئاو دروستکراوێکی خوایە، عەرشیش دروستکراوێکی خوایەو، بەرلەوەی خوا ئاسمانەکان و زەوی بخوڵقێنێ، عەرشی خوا لەسەر ئاو بووە.

بەڵگەی سێیەم: خوا ﷻ لە سوورەتی (الحاقة)دا باسی ئەوە دەکات، لە ڕۆژی دواییدا هەشت لە دروستکراوانی خوا عەرشی خوا هەڵدەگرن، واتە: هەشت فریشتە، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴾، واتە: فریشتەکان بە قەراغی ئاسمانەکانەوەن، (قەراغی گەردوونەوەو)،

لەو ڕۆژەدا عەرشی پەروەردگارت هەشت (واتە: هەشت فریشتە) هەڵیدەگرن، هەر لەم سوورەتی (غافر)دا، کە ئێستا خەریکی تەفسیر کردنی، خوا دەفەرمووێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی عەرشیان هەڵگرتووە، ئەوانەش کە بە دەوری عەرشەوەن، پەروەردگاریان بە پاک دەگرن و، ستایشی دەکەن و، بڕوای پێدێنن و، داوای لێبووردن بۆ بڕواداران دەکەن.

**بەڵگەی چوارەم:** خوا ﷻ لە کۆتایی سوورەتی (الزمر)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کردوە، دەفەرمووێ: ﴿ وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۚ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾، (دیارە باس باسی ڕۆژی دواییە) واتە: فریشتەکانیش دەبینی دەوری عەرشیان داوە، (لە دەوری عەرش دەسووڕێن) پەروەردگاریان بە ستایشکردنەوە بە پاک دەگرن.

ئنجا ئەمانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە عەرش دروستکراوێکەو، فریشتەکان هەڵیدەگرن و، فریشتەکان بە دەوریەوەن و، پێش ئەوەی خوا گەردوون بخوڵقێنێ، عەرش لەسەر ئاو بووە، ئەوانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە عەرش مەخلووقێکەو، ئەوە نیە کە ڕەمزو هێما بێ بۆ دەسەڵات و هەیمەنەی خوا ﷻ بەسەر دروستکراوەکانی دا.

**بەڵگەی پێنجەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: {**إِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ، فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ**}[1]، واتە: ئەگەر داواتان لە خوا کرد، فیردەوسی لێ داوا بکەن، چونکە نێوەڕاستی بەهەشتەو، بەرزترین شوێنی بەهەشتەو، لە سەرووی فیردەوسەوە:

---

(١) حديث أبي هريرة: أخرجه أحمد: ٨٤٠٠، والبخاري : ٦٩٨٧، مطولًا، ومن حديث معاذ: أخرجه ابن ماجه: ٤٣٣١، ومن حديث عبادة بن الصامت: أخرجه الحاكم برقم ٢٦٩، وأخرجه أيضًا: الترمذي: ٢٥٣١.

عـەرشی خـوای خـاوەن بەزەییـەو، لە فیردەوسـەوە ڕووبـارەکانی بەهەشـت هەڵدەقوڵن و دێنـە خـوار.

کەواتـە: وەک چـۆن بەهەشـت شـوێنێکەو دروسـتکراوێکە، عەرشـیش کـە لەسـەرووی بەهەشـتەوە، بـە تایبـەت لەسـەرووی فیردەوسـەوەیە، کـە بەرزتریـن شـوێنی بەهەشـتە، ئەویـش بـە هەمـان شـێوە دروسـتکراوێکی مـەزنی خوایـە ﷻ.

بەڵگـەی شەشـەم: فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ کـە دەفەرمـوێ: {أُذِنَ لِي أَنْ أُحَـدِّثَ، عَـنْ مَلَـكٍ مِـنَ الْمَلَائِكَـةِ مِـنْ حَمَلَـةِ الْعَـرْشِ، مَـا بَـيْنَ شَـحْمَةِ أُذُنِـهِ إِلَى عَاتِقِـهِ، مَسِـيرَةُ سَـبْعِمِائَةِ عَـامٍ}[1].

پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: مۆڵەتـم دراوە لـە بـارەی فریشـتەیەک لـە فریشـتەکانی خـواوە، کـە هەڵگـری عەرشـن، بدوێـم، کـە لـە نێـوان نەرمـەی گوێـدا تاکـو مـلی، حەوتسـەد (٧٠٠) سـاڵ ڕێیـە.

واتـە یەکجـار زۆر زەبـەلاح و گەورەیـە، ئـەو فریشـتەیەی کـە یەکێکـە لـە فریشـتەکانی هەڵگـرانی عـەرشی خـوای پـەروەردگار.

وشـەی (عَـرْش) پێشـتریش باسـمانکرد، (العَـرْشُ: سَرِيْـر المَلِـك) تەختـی حوکمڕانـە، کاتی خـۆی عـادەت وابـووەو، وەک ئێسـتا نەبـووە کـە هەموویـان لەسـەر کورسـیی وەک یـەک دابنیشـن، بەڵکـو حوکمـڕان لەسـەر تەختێـک دانیشـتوەو ئـەو تەختـە چـوار پایـەی هەبـوون، یـان زیاتـر، چـوار لاقـی هەبـوون یاخـود زیاتـرو بەرزتـر بـووە لـە ئاسـتی مەجلیـس، ئـەو کەسـەی کـە حوکمـڕان بـووە لەسـەر ئـەو تەختـە دانیشـتوە، فەرقـی بەینـی عـەرش، یاخـود تەختـی حوکمـڕان و کورسـیی ئەوەیـە، کـە

---

(١) أخرجـه أبـو داود: ٤٧٢٧، وأخرجـه أيضـاً: ابـنُ أبي حاتـم كـما في تفسـير ابـن كثـير ج٤، ص٤١٥، قـال ابـن كثـير: هـذا إسـناد جيـد رجالـه كلهم ثقـات، وأبـو الشـيخ: ٤٧٦، قـال الحافـظ في الفتـح ج٨، ص٦٦٥: إسـناده عـلى شرط الصحيـح، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني في «الصحيحـة: ١٥١.

کورسی تەنیا شوێنی کەسێکە، بەڵام تەخت (عرش) شوێنی زیاتر لە کەسێک دەبێ و، شوێنی ڕاکشانیش دەبێ و، بەرزتریشە لە ئاستی کۆڕ (مجلس)ەکە.

کاتێ خۆی عەرشی مرۆڤەکان کە حوکمڕان بوون، بەو شێوەیە بووە، خواش ﷻ ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، ئایا خوا چۆن ئێمە حاڵیی بکات؟ دیارە دەبێ هەر بەو تەعبیرو وشانەی کە ئێمە بەکاریان دێنین ئێمە بدوێنێ، بەڵام وەختێک سیفەتەکانی خواو کردەوەکانی خوا باس دەکرێن، با بخرێنە نێو دووتوێی ئەو وشەو تەعبیرانەشەوە کە ئێمە تێیان دەگەین، بەڵام نێوەڕۆک و مانایەکەیان، بێگومان بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، هەر بۆیە زانایان هەموویان لەسەرئەوە ڕێککەوتوون، کە وەختێک وشەیەک بۆ خوا بەکاردێ لە قورئاندا، بۆ تێگەیاندنی ئێمە، نابێ واتایەکەی بەو شێوەیە لێکبدرێتەوە کە ئێمە لێی تێدەگەین، بۆ وێنە: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ الرحمن، یان، ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾﴾ الفتح، یان هەموو ئەو وشانە، بۆ وێنە: کە باسی زانیاریی خوا دەکەن، زانیاریی خوا وەک هی ئێمە نیە، زانیاریی ئێمە لە ئەنجامی بەکارهێنانی پێنج هەستەکان و، بیرکردنەوەو لێکدان و کۆکردنەوەوە، بۆمان دروست دەبێ و لە مێشکماندا خەزن دەبێ، بەڵام زانیاریی خوا، جۆرێکی دیکەیە، هەروەها دیتنی خواو، بیستنی خواو، هەموو سیفەتەکانی خوا بەو شێوەیەن، کە بۆ خوا شایستەیە، بە هیچ جۆرێک نابێ ئێمە قیاسی سیفەتەکانی خوا بکەین ﷻ بۆ سەر خۆمان، ئەگەر نا تووشی وێکچواندن (تشبیه) دەبین، هەروەک نابێ بە بەڵگەی، یان بە بیانووی ئەوەی سیفەتەکانی خوا، وەک هی ئێمە نین، سیفەتەکان لە خوا دابڕنین، ئەگەرنا تووشی پەکخستن (تعطیل) دەبین، بۆیە زانایانی پێشین گوتوویانە: (إثْبَاتٌ مَعَ تَنْزِيهٍ، وَتَنْزِيهٌ بِلَا تَعْطِيلٍ)، چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خوا، لەگەڵ بە پاکگرتنی خوا، (کە وەک دروستکراوانی بچێ) و، بە پاکگرتنی خوا لەگەڵ چەسپاندنی سیفەتەکانی دا، بەبێ پەکخستنی خوا، لە سیفەتەکانی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١٠ - ٢٠) واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تەوەری سەرەکییان باسی بێبڕوایانەو، سەرچەنگ دان و سەرزەنشتکرنیانەو، پەشێمانیی کێشان و دان بە تاوانی خۆداهێنان و، پۆزش هێنانەوەی بێ سوودیانەو، ڕاگەیاندنی خوای دادگەرە بۆ ئەو ڕاستییە، کە ئەو چۆرتمەی بێبڕوایان تووشی بوون و، ئەو دەردەی پێوەی گرفتار بوون، کردەی دەستی خۆیانەو، تازەش کاتی تاقیکرانەوە تێپەڕیوەو، ئێستا قۆناغێکی دیکە هاتۆتە پێش و، خوای کاربەجێ بڕیاری داوەو بڕاوەتەوە.

بەڵام وێڕای ئەوە، چەند سیفەت و کردەوەیەکی دیکەی خوای بەرزی بێ وێنەش خراونەڕوو، هەروەها ئاماژەیەکیش بۆ ڕۆژی دوایی و، شپرزەیی بێبڕوایان لەو ڕۆژەدا، کراوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ
إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ
فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ
وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُواْ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ
ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ
﴿١٣﴾ فَٱدْعُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو
ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم
بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ
كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ

ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ
﴿١٨﴾ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ
يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی (لە ڕۆژی دوایی دا) ئەوانەی بێبڕوان بانگ دەکرێن: بێگومان تووڕەیی و بێزاریی خوا لە تووڕەییتان لە خۆتان و بێزارییتان لە خۆتان گەورەتر بوو، لە کاتێک دا بانگهێشتی بڕواهێنان دەکران، کەچی بێبڕوا دەبوون (و نکووڵییتان دەکرد) ﴿١٠﴾ (بێبڕوایەکان) گوتیان: پەروەردگارمان! دوو جاران مراندتین و دوو کەڕەتانیش ژیاندتین، (ئێستاش) دانمان بە گوناهەکانمان داهێنا، ئنجا ئایا هیچ ڕێی دەرچوونمان هەیە (لە ئاگری دۆزەخ)؟! ﴿١١﴾ (پێیان دەگوترێ: نەخێر هیچ ڕێی دەربازبوونتان نیە) ئەو (سزایە)ەشتان بە هۆی ئەوەوەیە کە (لە دنیادا) ئەگەر بە تەنیا بانگی خوا کرابایە، بێبڕوا دەبوون، بەڵام ئەگەر هاوبەشی بۆ دانرابایە، بڕواتان (پێ) دەهێنا، ئێستاش بڕیار تەنیا هی خوای بەرزی گەورەیە ﴿١٢﴾ (خوا) ئەو کەسەیە کە نیشانەکانیتان پیشان دەدات و لە ئاسمانەوە بژیوتان بۆ دادەبەزێنێ و، تەنیا کەسێکیش کە (لە ناخەوە بۆ لای خوا) دەگەڕێتەوە، پەند وەردەگرێ و بیردەکاتەوە ﴿١٣﴾ دەجا بە ملکەچیی ساغکردنەوەوە لە خوا بپاڕێنەوە، هەرچەندە بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێ ﴿١٤﴾ (خوا) پلەکانی بڵندن، خاوەنی عەرشە، ڕووح (وەحیی) لە فەرمانی خۆیەوە دەنێرێتە سەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، تاکو (خەڵک) لە ڕۆژی دیدار بترسێنن ﴿١٥﴾ ئەو ڕۆژە کە (مرۆڤەکان) دێنە گۆڕێ، هیچ شتێکیان لە خوا پەنهان نابێ (دەگوترێ:) ئەمڕۆ حوکم و دەستەڵات هی کێیە؟ هی خوای

تاکی ملپێکەچکەرە ﴿١٦﴾ ئەمڕۆ هەر کەسە بەپێی ئەوەی وەدەستیهێناوە، سزاو پاداشت دەدرێتەوە، ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمێک نیە، بە دڵنیایی خوا لێپرسینەوەی خێرایە ﴿١٧﴾ هەروەها لە ڕۆژی (ڕووداوی) نیزیککەوتوو بیانترسێنە لە کاتێکدا کە دڵەکان دەگەنە گەرووان، قوتدەرەوەن (بۆ تووڕەیی و خەفەتێک کە دەرووی داگرتوون) ستەمکاران هیچ دۆست و نیزیک و تکاکارێکی بە قسەکراوو قسە لێوەرگیراویانیان نیە ﴿١٨﴾ (خوا) ناپاکیی (ڕوانینی) چاوەکان و ئەوەی سینەکانیان دەیشارنەوە، دەیزانێ ﴿١٩﴾ بەس خواش بە هەق دادوەریی دەکات و، ئەوانەی جگە لەوی لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ بڕیاریان بە دەست نیە، بێگومان خوا بەس خۆی بیسەری بینەرە ﴿٢٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَمَقْتُ ٱللَّهِ): واتە: بە دڵنیایی تووڕەیی خوا، بێزاریی خوا، (المَقْتُ: البُغْضُ الشَّدِيْدُ لِمَنْ تَرَاهُ تَعَاطَى القَبِيْحَ)، (مَقْت): بریتیە لە ڕق لێبوونەوەی زۆر بۆ کەسێک کە دەیبینی کارێکی ناقۆڵا دەکات، یان قسەیەکی ناقۆڵا دەکات، (مَقِيْت، مَمْقُوت) کەسێکە کە بوغزێنراوەو، ڕق و بێزاریی زۆری بەرانبەرەکەی ئاڕاستە کراوە.

(يُنِيبُ): (الإِنَابَةُ إِلى اللهِ تَعَالَى: الرُّجُوعُ إِلَيْهِ بِالتَّوْبَةِ وَالإِخْلَاص)، (إِنَابَة): بۆ لای خوای بەرز گەڕانەوەیە بۆ لای، بە پەشێمان بوونەوەو بادانەوە بە دڵسۆزیی.

(ٱلتَّلَاقِ): ڕۆژی دیدار، یان ڕۆژی پێکگەیشتن، یەکێکیشە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە: (يَوْمَ التَّلَاقِ: وَتَخْصِيْصُهُ بِذَلِكَ لِالْتِقَاءِ مَنْ تَقَدَّمَ، وَمَنْ تَأَخَّرَ، وَالتِقَاءِ أَهْلِ السَّمَاءِ، وَالأَرْض، ومُلَاقَاةِ كُلُّ أَحَدٍ بِعَمَلِهِ)، (يَوْمَ التَّلاق): یان ڕۆژی دیدار، ڕۆژی پێکگەیشتن، بۆیە تایبەتکراوە بۆی، چونکە ئەوانەی پێشێ کە

ڕابردوون و تێپەڕیون، لەگەڵ ئەوانەی دوایی هاتوون، هەموویان پێکدەگەنەوە، هەروەها خەڵکی ئاسمان و زەوی پێکدەگەن، هەروەها هەر کەسەو بە کردەوەکەی خۆی دەگات.

(بَـٰرِزُونَ): واتە: ئاشکران، هاتوونە گۆڕێ، (وَاضِحَةٌ ظَوَاهِرُهُم وَبَوَاطِنُهُم) هەم ڕواڵەتەکانیان، هەم دەروونەکانیان ئاشکراو بەرچاون.

(ٱلْـَٔازِفَةِ): ئەویش یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، (آزِفَةِ) واتە: نیزیک، (أزِفَ الأَمْرُ: أي قَرُبَ)، نیزیک کەوتەوە، (الآزِفَةُ: اسْمُ فَاعِلٍ مُشْتَقٌّ مِنْ فِعْلِ أَزِفَ الأَمْرُ، إِذَا قَرُبَ، فَالآزِفَةُ صِفَةٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوفٍ تَقْدِيرُهُ: السَّاعَةُ الآزِفَةُ، أَوِ القِيَامَةُ الآزِفَةُ)، وشەی (آزِفَةِ): ناوی بکەرە داتاشراوە لە کرداری (أزِفَ الأَمْرُ إذا قَرُبَ) کارەکە نیزیک کەوتەوە، (آزِفَةِ) سیفەتە بۆ ناوەڵناوێکی فڕتێنراو، وەک: (الساعة الآزِفَةِ) واتە: ئاخیر زەمانی نیزیک بووەوە، یاخود (القِيَامَةُ الآزِفَةُ) ڕۆژی دوایی، یان هەڵسانەوەی نیزیک بۆوە.

(ٱلْحَنَاجِرِ): (جَمْعُ حُنْجَرَةٍ: الحُلْقُومُ)، (حَنَاجِر) کۆی (حُنْجُرَةٍ)یە، ئەویش بە (حُلْقُوم) گەروو، قوڕقوڕاگە دەگوترێ.

(كَـٰظِمِينَ): (الكَاظِمُ: اسْمُ فَاعِلٍ، مِنْ كَظَمَ كُظُومًا، إِذَا حَبَسَ نَفَسَهُ، وكَظَمَ شَيْئًا: سَدَّ مَجْرَاهُ أي: كَاظِمِينَهَا، أَيْ: كَاظِمِينَ حَنَاجِرَهُمْ إِشْفَاقًا مِنْ أَنْ تَخْرُجَ مِنْهَا قُلُوبُهُمْ مِنْ شِدَّةِ الإِضْطِرَابِ)، (كَظْم): بە مانای حەپسکردن و ڕاگرتن و کپکردنەوە دێ، (وَالكَاظِمِينَ الغَيْظ) ئەوانەی تووڕەیی و پەستیی خۆیان قووتدەدەنەوەو ناهێڵن بێتە دەرێ، (وكَظَمَ شَيْئًا) واتە: ڕێی لێگرت کە بێتە دەرێ، بۆ نموونە: ئەگەر کەسێک سەری مەشکەیەک کوندەیەک ببەستێ بۆ ئەوەی ئاوەکەی لێ نەڕژێ، یان شیرەکە، یان دۆیەکە، هەرچی تێیدایە، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: (كَاظِمِينَ: أَيْ كَاظِمِينَ حَنَاجِرَهُمْ) ئەوانە قوڕگی خۆیان توند گرتوە، نەوەک دڵیان لەبەر زۆر لێدان بە قوڕگیاندا بێتە دەرێ.

هەڵبەتە دڵ جێی نابێتەوە بە قورگدا بێتەدەر، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە دڵیان ئەوەندە دێت و دەچێ، دەبێ ئاگایان لە خۆیان بێ نەبادا دڵیان بەرەو لای قورگیان بێت.

(خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ): واتە: چاوە ناپاکەکان، یاخود ناپاکیی چاوەکان، هەردوو مانای هاتوون، (وَحَقِيقَةُ الخِيَانَةِ: عَمَلُ مَنِ اؤْتُمِنَ عَلَى شَيْءٍ بِضِدِّ مَا اؤْتُمِنَ لِأَجْلِهِ، بِدُونِ عِلْمِ صَاحِبِ الْأَمَانَةِ)، واتە: چییەتی خیانەت ئەوەیە: کە کەسێک سپاردەیەکی پێ سپێردراوە، بە پێچەوانەوەو دژی ئەوەی پێی سپێردراوە ڕەفتار دەکات، بەبێ زانیاریی خاوەن سپاردەکە، واتە: دەستکاریی ئەو ئەمانەتە بکات و زایەی بکات و نەیپارێزێ، ئەوە پێی دەگوترێ: خیانەت، لێرەدا کە دەفەرموێ: (خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ)، دوو واتایان بۆ لێکداوەتەوە: (أي: خِيَانَةُ النَّظَرِ)، یان (الأَعْيُن الخَائِنَة)، یان بە مانای خیانەتی چاوەکانە، ناپاکیی چاوەکان، یاخود بە مانای چاوە ناپاکەکانە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم یازدە ئایەتەدا، بە زۆریی باسی بێبڕوایان دەکات: پەشێمانییان و، مەینەتییان و، ئەو سزایەی کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیان دەکات، کە چەند نارەحەت دەبن، لەمیانی ئەوەشدا خوا ﷻ چەند سیفەت و چەند کردەوەیەکی بەرزی بێ وێنەی خۆی دەخاتەڕوو، تاکو بێبڕوایی بێبڕوایەکان ناقۆڵاتر دەربکەوێ، کە ئەوانە بێبڕوابوون بەرانبەر بە خوایەکی خاوەن ئەو سیفەتانەو، خاوەنی ئەو کردەوانەو، خاوەنی ئەو پایە بڵندو بەرزانە ﷻ، کە هەر شایستەی خۆینی، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوۡنَ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون واتە: بێبڕوابوون بە خواو بە فریشتەکانی و بە ڕۆژی دوایی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویست بوو بڕوایان پێبێنن،

بێبڕوابـوون، ئەوانـەی بێبڕوابـوون بانـگ دەکرێـن، بـە دڵنیایـی لێرەدا مەبەسـت پێـی ڕۆژی دوایـیـە، کـە لـە ڕۆژی دوایـی دا بانـگ دەکرێـن، لـە لایـەن فریشـتەکانیەوە بانـگ دەکرێـن، ئەگەرنـا شایسـتەیی ئەوەیـان نیـە خـوا بانگیـان بـکات و بیاندوێنـێ، وەک لـە چەنـد شـوێناندا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ ﴿١٤٨﴾ ﴾الأعراف، واتـە: خـوا نـە دەیاندوێنـێ و نـە پـاک و چاکیـان دەکات، بەڵکـو فریشـتەکان بانگیـان دەکـەن، بانگکـردنی فریشـتەکانیش ئاشـکرایە سـڵاو دەکـەن لـە ئەهـلی ئیـمان، بـە نەرمیـی و ڕێـزو بـە ڕووی خـۆش و بـە وشـەو تەعبیـری جـوان، بـەڵام کـە بانگـی بێبڕوایـان دەکـەن، بـە شـێوەیەک بانگیـان دەکـەن، شایسـتەی ئەوانـە، بانگیـان دەکـەن دەڵێـن: ﴿ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾، تووڕەیـی و بێزاریـی خـوا گەورەتـر بـوو لـە تووڕەیـی خۆتـان، لـە خۆتـان، واتـە: ئێسـتا کـە لـە خۆتـان تـووڕەن و لـە خۆتـان بێـزارن، کاتێ خـۆی کـە لـە دنیـادا بێبـڕوا دەبـوون، ئـەو کاتـە تووڕەیـی خـوا، لـەو تووڕەیـی ئێسـتاتان لـە خۆتـان، گەورەتـر بـوو، ﴿ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴾، یـاد بکەنـەوە کاتێـک کـە بانگدەکـران بـۆ ئیـمان و بڕواهێنـان، کەچـی ئێـوە بێبـڕوا دەبـوون.

دەشـگونجێ ئەمـە مانایەکـەی ئاوابـێ: تووڕەیـی و بێزاریـی خـوا ئێسـتا لـە بەرانبـەر ئێـوەدا، گەورەتـرە لـە تووڕەیـی خۆتـان لـە خۆتـان، یـاد بکەنـەوە کاتێـک کە بانگدەکـران بـۆ ئیـمان، بـەڵام ئێـوە بێبـڕوا دەبـوون، کەواتـە: ئـەم (إِذْ)ە دەگونجـێ بـۆ یادکردنەوەبـێ، دەشـگونجێ مەبەسـت ئەوەبـێ ئـەو کاتـە تووڕەیـی خـوا لـە تووڕەیـی ئێـوە زیاتربـوو، کـە بانگدەکـران بـۆ ئیـمان، بـەڵام ئێـوە بێبـڕوا دەبـوون، ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾، گوتیـان: پەروەردگارمـان! دوو جـاران مراندتیـن و دوو جارانیـش ژیاندتیـن، ﴿ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا ﴾، ئێسـتا ئێمـە دانمـان بـە گوناهـەکانی خۆمـان دا هێنـا، ﴿ فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴾، ئایـا بـۆ دەرچـوون هیـچ ڕێ هـەن؟ بـۆ دەرچـوون لـە سـزای تـۆ، لـەو ئاگـری دۆزەخـە؟

لەو بارەوە کە گوتوویانە: دووجاران مراندتین و دوو جاران ژیاندتین، هەرچەندە دوایی وردتر قسەی لێدەکەین، بەڵام ئەو مانایە زیاتر پەسندەو وێدەچێ، کە مەبەست لە مراندنی یەکەم، ئەوە بووە کە ژیانیان نەبووەو خوا ژیانی پێ بەخشیون، مراندنی دووەمیش ئەوەبووە، کە دوای ئەوەی ژیانیان هەبووە، ژیانی لێوەرگرتوونەوەو ڕووحی کێشاون، ئەوەش دووەم مردن، کەواتە: پێشێ مردووبوون و خوا زیندووی کردوون و ژیانی پێداون، ئنجا دوای ئەوەی خاوەن ژیانبوون، مراندوونی، ئەوەش دووەم مردن.

بە نسبەت دوو ژیانەکانیشەوە: جاری یەکەم: مردووبوون و خوا ژیانی پێداون، ئەوە جاری یەکەم، جاری دووەم: کە مردوون دوای ئەوەی خاوەن ژیان بوون، جارێکی دیکە خوا زیندووی کردوونەوە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەوەش دوو ژیان، ﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ ﴾، پێیان دەگوترێ: ئەوەتان بە هۆی ئەوەوەیە کە کاتێک بە تەنیا بانگی خوا دەکرا، بە تەنیا پاڕانەوە دەکرا لە خوا، ئێوە بێبڕوا دەبوون، ﴿ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ ﴾، بەڵام ئەگەر هاوبەشی بۆ دانرابایە، بڕواتان دەهێنا، ﴿ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴾، بڕیارو دادوەریی هی خوای بەرزی گەورەیە، واتە: کەسی دیکە لە ڕۆژی دواییدا، خاوەن بڕیارو حوکم نیە، وەک دنیا نیە خوا ﷻ بۆ تاقیکردنەوە دەستی مرۆڤەکانی ئاوەڵا کردبێ، داخۆ چی دەکەن و چۆن دەکەن؟ لەوێ حوکم و بڕیار تەنیا هی خوایە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات، کە دەفەرموێ: نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات، کەواتە: ئەو نیشانان (آیات)ە، لێرەدا مەبەست پێیان ڕستەکانی قورئان نیە، ڕستەکانی قورئان بەسەردا دەخوێنرێنەوەو دەبیسترێن، بەڵام ئەو نیشانانەی کە خوا پیشانی ئێمەی داون و وایکردوە ئێمە بیانبینین، مەبەست پێیان موعجیزەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، یاخود دیاردەو دیمەنەکانی گەردوون،

﴿ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ﴾، لەسەرێوەش بژیوتان بۆ دادەبەزێنێ، ئەو بژیوەش کە لە سەرێوە دادەبەزێ، وەک زۆرجاری دیکە باسمانکردوە: دەگونجێ پێش هەموو شتێ مەبەست پێی تیشکی خۆرو، تیشکەکانی دیکەی ئەستێرەکان بێ و، ڕووناکیی مانگ بێ لە شەوگاردا، هەروەها دەگونجێ مەبەست پێی ئەو ئاوەبێ کە لەسەرەوە دادەبەزێ، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزەو ئاوونگ و شەونم، ئەوە وەک بژیوی ماددیی.

دەشگونجێ مەبەست لە بژیوی مەعنەویی ئەو وەحیی و پەیامەی خوا بێ کە دادەبەزێ، ﴿ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴾، تەنیا کەسێک کە بگەڕێتەوە لە ناخەوە بۆ لای خوا، پەند وەردەگرێ و بیر دەکاتەوە.

﴿ فَٱدْعُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، دەجا ئێوە لە خوا بپاڕێنەوە، ملکەچیی خۆتانی بۆ ساغ و بێ خەوش بکەن، واتە: کاتێک کە لە خوا دەپاڕێنەوە، با هیچ شتی دیکە لە زەینتان دا نەبێ و، بە تەمای هیچ شتی هیچ کەسی دیکە مەبن، ملکەچیی خۆتان و بەندایەتیی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، ﴿ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، هەرچەندە ئەوانەش کە بێبڕوان پێی قەڵس و تووڕە بن، گوێ مەدەنە قەڵسیی و تووڕەیی ئەوان، پاڕانەوەی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوەو پاڕانەوەش بریتیە لە گەورەترین و گرنگترینی بەشی پەرستن و بەندایەتیی، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةَ} (أخرجه أبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٣٢٤٧، وقال: هذا حديث حسن صحيح، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، واتە: پاڕانەوە بریتیە لە پەرستن.

ئنجا خوا ﷻ بە چەند وەسفێکی دیکە خۆی دەناسێنێ و دەفەرموێ: ﴿ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ﴾، (خوا) پلەکانی بەرزن، پایەکانی بڵندو بالان، ﴿ ذُو ٱلْعَرْشِ ﴾، خاوەنی عەرش و تەختی حکومڕانییە، بە شێوەیەک کە بۆ خوا شایستەیە، ﴿ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، ڕووح فڕێدەدا لە فەرمانی خۆیەوە بۆ

سەر هەر کەس بیەوێ لە بەندکانی، بە دڵنیایی مەبەست لە ڕووح وەحیی و پەیامی پێغەمبەرایەتییە، ﴿لِيُنذِرَ يَوۡمَ ٱلتَّلَاقِ﴾، تاکو خەڵک بترسێنێ و وریا بکاتەوە لە ڕۆژی دیدار، لە ڕۆژی پێکگەیشتنەکان، کە ئەهلی ئاسمان و زەوی پێک دەگەن، مرۆڤ بە کردەوەکانی خۆی دەگات، مرۆڤ بە خوای پەروەردگار دەگات، بە فریشتەکان دەگات، هەروەها ڕووح و جەستە پێک دەگەنەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی پێکگەیشتنەکانە، ﴿يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَۖ﴾، ئەو ڕۆژە هەموویان هاتوونە گۆڕێ، بەرچاون و دیارن، واتە: نەک هەر ڕواڵەتیان بەڵکو دەروونیشیان دیارەو هاتۆتە گۆڕێ، ﴿لَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنۡهُمۡ شَيۡءٞۚ﴾، هیچ شتێکیان لە خوا شێردراوەو پەنهان نیە، وەک لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩﴾ الطارق، ئەو ڕۆژە کە نهێنییەکان دەردەکەون، ئەوانەی لە سینەکاندا شێردراونەوە، یان دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ۝١٨﴾ الحاقة، ئەو ڕۆژە ڕادەنوێنرێن، هیچ شتێکتان پەنهان نابێ، هیچ شتێک لە ئێوە پەنهان نابێ، کە نەیبینن، هەروەها هیچ شتێکی ئێوە پەنهان نابێ لە خوا و لە فریشتەکان، کە نەبینرێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ﴾، ئەمڕۆ حکومڕانیی و دەسەڵات هی کێیە؟ ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾، هی خوای تاکی ملپێکەچکەرە، لەو ڕۆژەدا حوکم و دەسەڵات بەس هی خوایە ﷻ.

﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ﴾، خوا دەفەرموێ: ئەمڕۆ هەر کەسە بە پێی ئەوەی کردوویەتی، سزاو پاداشت دەدرێتەوە، ﴿لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ﴾، ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمێک نیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾، بە دڵنیایی خوا لێپرسینەوەی خێرایە، ئەم تەعبیرە لە قورئان دا زۆر هاتوە لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر بیهێنێتە بەرچاوی خۆی، هەشت ملیار بەشەر ئێستا لەسەر زەوی هەن، پێشتر چەند ملیار ڕۆیشتوون، چەند ملیاری دیکەش بەدوایاندا دێن، هەموو ئەوانە کۆدەبنەوە بە تەنکید لێپرسینەوەیان کاتی دەوێ، بۆیە هەمیشە خوا دەفەرموێ: لێپرسینەوەی خوا خێرایە، لێپرسینەوەی خوا لە جۆری ئەو حیساب و

وردەکاریيانە نیە کە بە کۆمپیوتەرەکانی ئێستا دەکرێن، بە زەبەلاحترین کۆمپیوتەر کە هەیە، کە لە چرکەیەکدا هەزاران هاوکێشەی ماتماتیکیی لێکدەداتەوە، نا، لێپرسینەوەی خوا خێرایە، شایستەی خوایە، مرۆڤ بتوانێ کۆمپیوتەرێکی وا دروست بکات، کە لە چرکەیەکدا چەندان حیساب و کیتاب بکات، دەبێ خوا ﷻ چۆنی بکات!

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ ﴾، هەروەها بیانترسێنە لەو ڕۆژەی نیزیکە (ٱلْءَازِفَةِ) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (وأنذِرْهُمْ يَوْمَ القِيَامَة الأزِفَة)، لە قیامەتی نیزیککەوتوو بیانترسێنە، یان (السَّاعَة الأزِفَة)، ئاخیر زەمانی نیزیککەوتوو، (الأزِفَة) واتە: نیزیک کەوتوو، لە (أزِفَ)وە هاتووە واتە: (قَرُب)، ﴿ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ ﴾، کاتێک کە دڵەکان لە لای گەروەانن، ئینسان کاتێک ترس و حەژمەت و سام و هەیبەتێکی زۆری لێبنیشێ، دڵی زۆر جووڵە جووڵ دەکات، ئەوانەش دڵیان هێندە دێت و دەچێ، خەریکە دەگاتە گەروو، ﴿ كَٰظِمِينَ ﴾، ئەوانە تووڕەیی و ترس و خەفەت و مەینەتیی خۆیان کپکردۆتەوە، یاخود: دڵەکانی خۆیان کپ دەکەنەوە، وەک چۆن سەری تووڕەکەیەک، مەشکەیەک، کوندەیەک بە بەن و دەزوو توند دەکرێ، بۆ ئەوەی ئەو شلەمەنییەی تێیاندایە، نەڕژێ، ئەوانەش گەرووی خۆیان کپکردووەو گرتووە، تاکو دڵیان نەیەتە دەرێ، ﴿ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾، ستەمکاران هیچ دۆستێکی نیزیکیان نیە، هەروەها هیچ تکا کارێک کە بە قسەی بکرێ و فەرمانبەریی بکرێ، چنگیان ناکەوێ، ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾، خوا ناپاکیی چاوەکان دەزانێ، یاخود چاوە ناپاکەکان دەزانێ، ﴿ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾، هەروەها ئەوەش کە سینەکان پەنهانی دەکەن، ئەوەش دەزانێ.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا بە هەق دادوەریی دەکات، ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ ﴾، بەڵام ئەوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، یان جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ بڕیار نادەن

و هیچ شتێکیان بە دەست نیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا خۆی بیسەری بینەرە، بۆ خۆی هەموو شتێک دەبیستێ و هەموو شتێکیش دەبینێ، بڕیاریش تەنیا بڕیاری خوایە، کەواتە: خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە باش ئامادە بکەن کە خوا قازیی و دادوەرە، هەموو شتێکیشی بیستوەو، هەموو شتێکیشی بینیوەو، ئاگای لە هەموو شتێکە: ئەوەی سینەکان دەیشارنەوەو، ئەوەی چاوەکان بە سیلەی چاو ئەنجامیانداوە، لە موخەننەتیی و ناپاکیی، هەمووی دەزانێ، خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە باش ئامادە بکەن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بانگکرانی کافران کە تووڕەیی و بێزاریی خوا لە بەرانبەرتاندا، لە هی خۆتان زیاتر بوو، کاتێک کە بۆ ئیمان بانگدەکران، ئێوەش نکوولّییتان دەکردو، دان بە تاوانی خۆیاندا هێنانیان و، ڕوونکردنەوەی خوا ﷻ بۆ هۆکاری ئەو حاڵە خراپەیان، کە ئەهلی شیرک و کوفر بوون و، بەهۆی ئەوەوە تووشی ئەو ئازارو مەینەتییە بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُواْ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِيِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، به دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون، بانگ دەکرێن تووڕەیی خوا (بەرانبەرتان) لە تووڕەیی خۆتان بەرانبەر بە خۆتان گەورەترە، وەک چۆن (آمَنُوا) بەرکار (مَفْعُولٌ بِهِ)کەی هەمیشە قرتێنراوە لە قورئاندا، بە هەمان شێوە (كَفَرُواْ)ش دیسان بە زۆریی وایە کە بەرکارەکەی دەقرتێنرێ، واتە: (كَفَرُوا بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ والقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ ...) واتە: بێبڕوابوون بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویست بووە بڕوایان پێبێنن، ئەوانەی بێبڕوابوون،

وشەی (كَفَرُواْ)ش لە (كُفْر)ەوە هاتوە، (كُفْر) واتە: (سَتْر)، (كَافِر) واتە: داپۆشەر، ئەو کەسەی هەقی پێدەگاو دایدەپۆشێ، وەک جاری دیکەش گوتوومانە، کەواتە: کەسێک پەیامی خوای بەڕاستیی پێنەگەیبێ و ڕەفزی نەکردبێ، بە کافر لە قەڵەم نادرێ، بۆیە وشەی نا مسوڵمانان کافریش دەگرێتەوە، کافرەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، ئەوانەی هەقیان پێکەیشتوەو ڕەتیان کردۆتەوە، هەروەها غەیری کافریش دەگرێتەوە، کەسێک کە پەیامی خوای پێنەگەیشتوە، کە دەگونجێ وشەی (فَتْرِي)ی بۆ بەکاربهێنرێ، واتە: ئەوانەی لە کات و شوێنێکدا ژیاون، پەیام و بانگەوازی خواو پێغەمبەرانی خوایان پێنەگەیشتوە، بەڵێ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هاتوەو پەیامەکەی پەیامێکی جیهانییە، بەڵام بۆ کەسێک کە پێی نەگەیشتبێ، وەک پێغەمبەر ﷺی بۆ نەهاتبێ وایە، خوای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾، واتە: ئێمە سزادەرنین تاکو پێغەمبەر نەنێرین، نە لە دنیادا خوا گەلەکان سزا دەدات و، نە لە ڕۆژی دواییشدا سزایان دەدات، لە دنیادا سزایان نادات، لەسەر ئەوەی بڕوایان بە پێغەمبەرێک نەهێناوە کە نایناسن و پەیامەکەییان پێنەگەشتوەو، لە دواڕۆژیشدا سزایان نادات، لەسەر شتێک کە نەیانزانیوەو، لەسەر شوێن نەکەوتنی پەیام و بەرنامەیەک کە پێیان نەگەیشتوەو لێی حاڵیی نەبوون، یاخود پێیان گەیشتوە، بەڵام بە هەڵگێڕدراوەیی و بە سەرەوبنیی پێیان گەیشتوە، یاخود بە شێوێنراویی پێیان گەیشتوە، ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون واتە: هەقیان پێگەیشتوەو بێبڕوابوون و ڕەفزیان کردوە.

﴿يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، بانگدەکرێن: بە دڵنیایی تووڕەیی خوا، لە ڕقلێبوونەوەی خۆتان لێتان گەورەترە.

(المَقْتُ: أَشَدُّ البُغْضِ) واتە: ڕق لێ هەڵسانێکی زۆر، ڕق لێبوونەوەیەکی زۆر، واتە: ڕق لێبوونەوەی خوا ﷻ بۆ ئێوە گەورەترە لە ڕق لێبوونەوەی خۆتان لە خۆتان، ئنجا ئایا ئەوان چۆن ڕقیان لە خۆیان دەبێتەوە؟:

**یەکەم:** لە ڕۆژی دواییدا کە تەماشا دەکەن تووشی ئەو چارەنووسە تاڵ و ناخۆشە دێن، ڕقیان لە خۆیان هەڵدەستێ، بۆچی وایانکرد؟.

**دووەم:** (**لأنَّهُمْ فَعَلُوا لأنْفُسِهِمْ مَا يُشْبِهُ المَقْتَ، إذْ حَرَمُوهَا مِنَ الإيمَانِ**)، چونکە ئەوان کارێکیان بە خۆیان کردوە، وەک زۆر ڕقیان لە خۆیان بووبێتەوە، کە خۆیان بێبەش کردوە لە ئیمان و هیدایەت، واتە: کارێکیان بە خۆتان کردوە، شێوەی ئەوە بووە کە ڕقیان لە خۆیان هەڵسێ.

ڕقلێبوونەوەی خوا لە ئێوە، گەورەترە لە ڕق بوونەوەی خۆتان لە خۆتان، بۆچی؟

**٢)- ﴿إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ﴾**، کاتێک کە بانگ دەکران بۆ ئیمان بەڵام بێبڕوادەبوون، (**إذْ: ظَرْفٌ للزَّمَانِ المَاضِي**)، (**إذْ**): دیارە زەڕفە بۆ کاتی تێپەڕیو، کاتێک کە بانگدەکران لە لایەن کێوە؟ لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئیمان بانگدەکران، ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- یاد بکەنەوە کە ئەمڕۆتان بەرهەمی ئەو کاتەتانە.

ب- تووڕەیی خوا لەو کاتەدا کە بانگدەکران بۆ ئیمان و بێبڕوا دەبوون، گەورەتر بوو لە تووڕەیی خۆتان و بێزاریی خۆتان لە ئێستاتاندا لە خۆتان.

(**الطبري**) لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: (**لَمَقْتُ اللهِ إِيَّاكُمْ أَيُّهَا الْقَوْمُ فِي الدُّنْيَا، إِذْ تُدْعَوْنَ فِيهَا لِلْإِيمَانِ بِاللهِ، فَتَكْفُرُونَ، أَكْبَرُ مِنْ مَقْتِكُمْ الْيَوْمَ أَنْفُسَكُمْ لِمَا حَلَّ بِكُمْ مِنْ سَخَطِ اللهِ عَلَيْكُمْ**)، واتە: تووڕەیی خوا ئەی خەڵکینە! لە دنیادا بەرانبەر بە ئێوە، لە کاتێکدا کە بانگدەکران بۆ ئیمان بە خوا، ئێوەش بێبڕوا دەبوون، گەورەتر بوو لە تووڕەیی خۆتان ئەمڕۆ لە خۆتان، بە هۆی ئەوەوە کە تووڕەیی خواتان دابەزیوەتە سەر.

---

(١) جامع البيان: ج٢٤، ص٤٤.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يُنَادَوْنَ ﴾، واتـە: ئەوانـەی بێبڕوابـوون، خـوا ڕقـی لێیـان هەڵدەستێ، بانگدەکرێـن: تووڕەیـی خـوا بەرانبەرتـان، گەورەتـرە لـە تووڕەیـی خۆتان بەرانبـەر بـە خۆتـان.

٣)- ﴿ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! دوو جاران مراندتین و دوو جارانیش ژیاندتین، ئەمە زانایان زۆریان قسە لێکردوە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە کە مردنی یەکەم پێش ئەوەی دروستبکرێ و، مردنی دووەم بریتیە لەو مردنەی لە ژیانی دنیادا بەسەریان دێ و، ڕووحیان لە جەستەیان جیا دەبێتەوە.

هەروەهـا ژیـانی یەکـەم، بریتیـە لـەوەی دوای ئـەوەی دروسـتدەکرێن، ڕووح دەخرێتـە بـەر جەسـتەیان و، ژیـانی دووەمیـش ڕۆژی دواییـە کـە زینـدوو دەکرێنـەوە، ئائـەوە ڕایەکـە، هیـچ گـرێ و گۆڵـی تێـدا نیـە.

بـەڵام هەندێـک لـە سـەر لێشـێواوان ئەوەیـان کردۆتـە بەڵگـە لەسـەر دۆنـە دۆن (تناسـخ الأرواح) کـە ئـەوە قسـەو بیرۆکەیەکـی ئەفسـانەییە، لـە هیندسـتان و لـە ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا هەیـە، بـەڵام هیـچ بنەمایەکـی نیـەو، لـە ڕاسـتییدا هەمـوو مرۆڤێـک ڕووحێکـی تایبـەتی خـۆی هەیـە، خـوا بـە بـەر جەسـتەکەیدا دەکات، دوایـی لـە جەسـتەکەی دەری دێنـێ و، دەبێتـە هـۆی مـردنی و، لـە ڕۆژی دواییـدا خـوا ئـەو ڕووحـە لەگـەڵ ئـەو جەسـتەیە پێکـەوە جـووت دەکاتـەوە، بـەو شـێوەیەی کـە بـەس خـوا خـۆی دەزانـێ چۆنـە؟

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾، هـەر کام لـە (ٱثۡنَتَيۡنِ): (صِفَـةٌ لِمَفْعُـولٍ مَحْـذُوفٍ) واتـە: (رَبَّنَـا أَمَتَّنَـا مَوْتَتَـيْنِ اثْنَتَـيْنِ، وَأَحَيَيْتَنَـا حَيَاتَـيْنِ اثْنَتَـيْنِ)، واتـە: خوایـە دوو مـردن مراندتیـن و دوو ژیـان ژیاندتیـن.

بەڵگـەش لەسـەر ئـەوە کـە مەبەسـت لـە مـردن ئـەو حاڵەتـە بـووە، کـە ژیانیـان نەبـووە، ئەوەیـە کـە خـوا لە سـوورەتی (البقـرة)دا فەرموویـەتی: ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتـە: چۆن

بێبڕوا دەبن بە خوا لە حاڵێکدا کە ئێوە مردوو بوون، ژیانی پێدان، (ژیانتان نەبوو ژیانی پێدان)، دوایی دەتانمرێنێ، دواییش جارێکی دیکە ژیانتان پێدەدات و زیندووتان دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا، چەمک و واتای ئایەتەکەی سووڕەتی (البقرة)، لەگەڵ چەمک و واتای ئەم ئایەتەی سووڕەتی (غافر)دا یەکن، جا بێبڕوایان دەڵێن:

٤)- ﴿ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا ﴾، ئێستا دانمان بە گوناحەکانی خۆمان دا هێنا، بۆمان دەرکەوت کە هەڵەبووین، پێی لێدەنێین.

٥)- ﴿ فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ﴾، ئنجا ئایا هیچ ڕێگەیەک هەیە بۆ دەرچوون و دەربازبوون؟ (الإستِفهامُ مُستَعمَلٌ فِي الإستِعطَافِ) لێرەدا پرسیارکردنەکە بۆ پەرۆش و بەزەیی جووڵاندنی لایەنی بەرانبەرە، واتە: ئایا ناگونجێ پەروەردگارمان بەزەییمان لەگەڵدا بنوێنێ و لەم حاڵە دەرباز بین، هیچ ڕێیەک نیە؟ وشەی (سَبِيلٖ): واتە: ڕێگا، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ئەو ئامرازەی کە شتێک کە ئارەزوو دەکرێ و ئارەزوو کراوە، پێی وە دەستبهێنرێ.

٦)- ﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ ﴾، (پێیان دەگوترێ:) ئا ئەم حاڵەتان بەهۆی ئەوەوەیە کە کاتێک خوا بە تەنیا بانگکرابایە، پاڕانەوەی لێکرابایە، ئێوە بێبڕوا دەبوون، ئەگەر خوا بە تەنیا پەرسترابایە بەبێ هاوبەش بۆ دانان، ئێوە بێبڕوا دەبوون.

٧)- ﴿ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْ ﴾، بەڵام ئەگەر هاوبەشی بۆ دانرابایە، ئێوە بڕواتان دەهێنا.

٨)- ﴿ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴾، ئێستاش بڕیار هی خوای بەرزی گەورەیە.

لێرەدا کە ئەوان پرسیار دەکەن، خوا ﷻ وەڵامیان ناداتەوەو، لە جیاتی وەڵام، ئەو حاڵەتەی تووشی بوون، هۆکارەکەی دەخاتە ڕوو، هۆکاری ئەوە، کە چوونە نێو ئەو سزایە چییە؟ ئەوە بوو کە سەریان بۆ کوفرو شیرک دەخوراو، کەیفیان بە ئیمان و خوا بەیەکگرتن نەدەهات.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴾، لێـرەدا مەبەسـت کـورت هەڵهێنـانی بڕیـارو حوکمڕانییـە لـە خـوای بـەرزدا، واتـە: حوکـم تەنیـا هـی ئـەوە، کاتێ خـۆی (خـوارِج) یەکێـک لـەو ئایەتانـەی کـە بەڵگەیـان پێهێناونـەوە، لەسـەرئەوە کـە دەبێـت بڕیـار ڕاسـتەوخۆ خـوا بیـدات و، مـرۆڤ بـۆی نیـە بڕیـار بـدات لـە بەرانبـەر (علي بـن أبي طالـب)دا (خـوا لێـی ڕازی بـێ) ئـەم ئایەتـە بـووە، بۆیـە عـەلی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) لـە وەڵامیانـدا گـوتی: (كَلِمَـةُ حَـقٍّ يُـرَادُ بِهَـا بَاطِـلٌ)، واتـە: ئەمـە قسـەیەکی هەقـە (کـە حوکـم تەنیـا هـی خـوای بـەرزی گەورەیە)، بـەڵام مەبەسـتێکی ناهەقـی لـە پشـتەوەیە، ئـەوان مەبەسـتیان ئەوەبـوو، کـە عـەلی (خـوا لێـی ڕازیبـێ) وەک حوکمڕانێـک بـۆی نیـە هیـچ بڕیارێـک دەربـکات، مەگـەر دەقێکـی ئایەتـی بەدەسـتەوەبێ، عـەلی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گـوتی: بەڵـێ حوکـم حوکمـی خوایـە، بـەڵام حوکمـی خـوا دەبـێ بـە دەسـت مرۆڤەکانـەوە بـێ، کات و شـوێن و، ژینگـەی گونجـاوی بـۆ بڕەخسـێنن و تێیـدا جێبەجێـی بکـەن.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنەڕووی چەند کردەوەو سیفەتێکی بێ وێنەی خواو، فەرمانکردن بە پەرستنی بە ساغیی و، باسێکی ڕۆژی قیامەت کە لەو ڕۆژەدا، هەر کەسە سزاو پاداشتی پڕ بە پێست وەردەگرێتەوەو، هیچ کەس هیچ ئەندازەیەک ستەمی لێناکرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَـٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَـٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ ﴾، ئەو (خوا) کەسێکە نیشانەکانی خۆیتان پێشاندەدات، بۆیە بە کرداری ئێستا (مُضارِع) هێناویەتی، چونکە خوا بەردەوام نیشانەکانی خۆی پێشانی ئێمە دەدا، بە دڵنیایی مەبەست لە (ءَايَـٰتِهِۦ)، یان موعجیزەکانی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، یاخود دیارەدەو دیمەنە سەرنجڕاکێشەکانی دەوروبەرو بوونەوەرن.

٢)- ﴿ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ﴾، لەسەرێوەش بژیوتان بۆ دادەبەزێنێ، ﴿ لَكُم ﴾، پێشخراوە بۆ ئەوەی چاکەکردنی خوا لەگەڵ مرۆڤەکاندا، زیاتر دەربخرێ ﴿ وَيُنَزِّلُ لَكُم ﴾، دادەبەزێنێ بۆ ئێوە ﴿ رِزْقًا ﴾، بژیو، کە بەزانراو (لكرة) هاتوە، واتە: بژیوێکی گەورەو گرنگ، ئەو بژیوەش زۆر شت دەگرێتەوە، ئەوەی تاکو ئێستا بۆ ئێمە دەرکەوتوە:

١- تیشکی خۆرە.

٢- ڕووناکی مانگە.

٣- تیشکەکانی دیکەن.

٤- دابەزێنرانی ئاوە بە شێوەی بەفرو باران و تەرزەو شەونم و ئاوونگ.

بەس خواش ﷻ خۆی دەزانێ چیدیکەمان بۆ دادەبەزێنێ و، چیدیکەی دابەزاندووەو بۆتە هۆی بەڕێوەچوونی ژیانی ئێمە لەسەر زەوی، کە هەتا زانیاری پتر بەرەو پێشەوە بچێ، نیعمەتەکانی خوا زیاتر دەردەکەون و پەردەیان لەسەر لادەچێ.

٣)- ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾، مەگەر کەسێک لە ناخەوە بەرەو خوا بگەڕێتەوە، ئەگەرنا بیرناکاتەوەو پەند وەرناگرێ، (التَّذَكُّرُ): یانی: بیرهاتنەوەیە، پەند وەرگرتن، زانین و تێگەیشتن، هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە، کەسێک لە ناخەوە بۆ لای خوا نەگەڕێتەوە، کاتێک سەرنجی نیعمەتەکانی خوا دەدات، سەرنجی دیاردەو دیمەنەکانی گەردوون دەدات، دەستی خوایان لە پشتەوە نابینێ، وەک چۆن کەسێک ئەگەر بە چاوی ڕووت، تەماشای دڵۆپە ئاوێک بکات، بەس دڵۆپێک ئاو دەبینێ، بەڵام ئەگەر بە میکرۆسکۆبێک تەماشای بکات، دنیایەک لە دورستکراوانی خوا لەو دڵۆپە ئاوەدا دەبینێ، هەروەها خانەیەکی جەستەی مرۆڤ، کە بە چاوی تەنیا تەماشای دەکەی، هەر نابینرێ، بەڵام کاتێک بە میکرۆسکۆب تەماشای دەکەی، هەر کام لە خانەکانی جەستەی مرۆڤ جیهانێکی سەربەخۆیە، ئنجا بە هەمان شێوەش ئەگەر ئینسان بە چاوی ئیمان تەماشای خۆی و، تەماشای دەوروبەرو بوونەوەر بکات، بە جۆرێکی دیکە خۆی و، بوونەوەرو دەوروبەری دێتە بەرچاو، کاتێک کە نیعمەتەکانی خوا بە چاوی ئیمانەوە تەماشا بکرێن، بە جۆرێکی دیکە مرۆڤ دەیانبینێ.

٤)- ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾، دە جا لە خوا بپاڕێنەوە، بە گەردەنکەچیی بۆ ساغکەرەوانەوە.

(ٱلدِّینَ) لێرەدا بە مانای تاعەت و فەرمانبەرییە، واتە: کاتێک لە خوا دەپاڕێنەوە، گەردنکەچیی خۆشتان بۆ خوا ساغ بکەنەوەو، چاوەڕوانییتان لە هیچ شتێکی دیکەو، لە هیچ کەسێکی دیکە نەبێت.

٥)- ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، هەرچەندە بێبڕوایەکانیش پێیان ناخۆشبێ، لەبەر ئەوەی ئەوان (بێبڕوایان) دەسەڵاتداربوون ئەو کاتە، واتە: با ئەوانیش پێیان ناخۆش بێ و پێی ناڕەحەت بن، بەڵام ئێوە کە لە خوا دەپاڕێنەوە، پاڕانەوەی خۆتان و بەندایەتیی و ملکەچیی خۆتان، بۆ خوا ساغ بکەنەوە، خڵتەی شیرکی تێکەڵ مەکەن.

ئنجا خوا ﷻ بەردەوام دەبێ لەسەر خستنەرووی چەند سیفەتێکی دیکەی و، چەند کردەوەیەکی دیکەی:

٦)- ﴿رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ﴾، پلەکانی بەرزن، پایەکانی (خوا ﷻ) بڵندن، وشەی (ٱلدَّرَجَٰتِ): کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە (عِوَضٌ عَنْ الْمُضَافِ إِلِيهِ: أَي رَفِيْعَةٌ دَرَجَاتُه)، (أل) قەرەبوو پاڵوەلادراوە، یانی: پلەکانی خوا بەرزن.

وشەی (رَفِيْع): (صِفَة مُشَبَّهَة بالفعل)، سیفەتێکە دەشوبهێتە کردارەوەو کاری کردار دەکات، یاخود: (رَفِيْع الدَّرَجَات: أَي كَثِيْرُ رَفْعِ الدَّرَجَات لِمَنْ يَشَاء)، خوا زۆر پلان بەرز دەکاتەوە بۆ هەر کەسێک بیەوێ.

٧)- ﴿ذُو ٱلۡعَرۡشِ﴾، خاوەنی عەرشە، یانی: خاوەنی تەختی حوکمڕانییە، وەک پێشتریش باسمانکرد: عەرش مەخلووقێکی خوایە لەسەرووی هەموو دروستکراوەکانەوەو، دەوری هەموو دروستکراوەکانی داوەو، ئەوپەڕی پەسندو ئەوپەڕی مەزنە، وەک خۆی دەفەرموێ: ﴿رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾المؤمنون، ﴿رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾﴾التوبة.

٨)- ﴿يُلۡقِي ٱلرُّوحَ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ﴾، ڕووح فڕێدەدا (دەنێرێ) بۆ سەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، وشەی (ٱلرُّوحَ): هەم لێرە، هەم لە زۆر شوێنی دیکەش بە مانای وەحیی هاتوە، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الشوری)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴿٥٢﴾ ﴾الشورى، هەر بەو شێوەیە ڕووحێکمان لە کاری خۆمانەوە بۆ تۆ نارد، بێگومان مەبەست لە ڕووح پەیامی خواو وەحیی خوایە، کە بۆ پێغەمبەرانی ناردوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام).

کە دەفەرموێ: ﴿ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، وشەی (مِنْ) دەگونجێ بۆ دەستپێک بێ (مِنْ إبْتِدَائِيَة)، یاخود بۆ بەشێک بێ (أو لِلتَّبْعِيض)، کەواتە: ﴿ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ ﴾، واتە: لە دەستپێکەوە بە فەرمانی خۆی، خوا ڕووحەکە دەنێرێ، یاخود: ئەوەی بە فەرمانی خۆی دەینێرێ، کە پەیامێکە خوا بۆ هەر کام لە پێغەمبەرانی ناردوە، ئەوە بەشێک بووە لە ئایینەکەی، ئنجا بۆچی دەینێرێ؟

٩)- ﴿ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴾، تاکو خەڵک بترسێنێ و وریا بکاتەوە لە ڕۆژی پێککەیشتنەکان، ئەو ڕۆژەی تێیدا: ڕووحەکان بە جەستەکان دەگەنەوە، مرۆڤ بە کردەوەی خۆی دەگاتەوە، ئەهلی ئاسمان بە ئەهلی زەوی دەگەن، مرۆڤ و فریشتەکان پێکدەگەن، بەندەکان بە دیداری خوا دەگەن، ڕۆژی پێککەیشتنە، بە مانای فراوانی پێککەیشتن، وشەی (يُلْقِى): یانی: فڕێدەدات (الإِلْقَاءُ: رَمِي الشَّيءِ مِنَ اليَدِ إلى الأرْضِ)، (إلقَاء): بریتیە لەوەی شتێک کە بە دەستتەوەیە، فڕێبدەیە سەر زەوی، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ بەخشین و پێدان.

١٠)- ﴿ يَوْمَ هُم بَـٰرِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ﴾، ئەمە پێناسەی (يَوْمُ التَّلَاق)ە، ڕۆژی پێککەیشتنەکان ئەو ڕۆژەیە کە ئەوان ئاشکران و هاتوونە گۆڕێ، هیچ شتێکیان لە خوا پەنهان و شێردراوە نیە.

ئەم ڕستەیەش تەفسیرو ڕوونکردنەوەی وشەی (بَـٰرِزُونَ)ە، واتە: دێنە گۆڕێ، بە جۆرێک کە هیچ شتێکیان لە خوا پەنهان و شێردراوە نیە، نە لە ڕووی جەستەییەوە، نە ڕووی کردەوەکانەوە، کە بە ئەندامەکانی جەستە کردوویانن و تەعبیرەکانی زمانیان، نە لە ڕووی نیازو مەبەستەکانیانەوە، کە لە دڵ و دەروونیاندا پەنهانیان کردوون.

١١)- ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمڕۆ حوکمڕانیی، دەسەڵات هی کێیە؟ ئەمە: (مَقُول لِقَولٍ مَحْذُوفٍ) گوتراوی قسەیەکە، قرتێنراوە واتە: (يُقَالُ لِمَنِ المُلْكُ اليَوْم)، دەگوترێ: ئەمڕۆ حوکمڕانیی هی کێیە؟ (ٱلْيَوْمَ) لە ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ﴾دا، (أل)کەی کە بۆ ناساندنە، مەبەست پێی ئەمڕۆژەیە کە ئێستا ئامادەیە.

١٢)- ﴿لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾، (وەڵام دەدرێتەوە کە ئەمڕۆ حوکمڕانیی) تەنیا هی خوای تاکی ملپێکەچکەرە.

١٣)- ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ﴾، ئەمڕۆ هەر کەسە بە پێی ئەوەی کردوویەتی، سزاو پاداشت دەدرێتەوە، وشەی (جَزَاء) لە زمانی عەرەبییدا هەم بۆ سزا (عِقَاب) بەکاردێ، هەم بۆ پاداشت (ثَوَاب)، لە زمانی کوردییدا تاکو ئێستا وشەیەکم پێ شک نایەت پڕ بە پێستی مانای (جَزَاء) بێ، ئەگەر (ثَوَاب) بێ دەڵێین: پاداشت و ئەگەر (عِقَاب) بێ دەڵێین: سزا، بەڵام وشەیەکمان نیە وەک (جَزَاء)، مانایەکی گشتگیری هەبێ بۆ سزاو پاداشت.

ئەمڕۆ هەر کەسە بە پێی ئەوەی کردوویەتی، بەرانبەرەکەی دەدرێتەوە، سزایە یان پاداشتە، واتە: سزایەک، یان پاداشتێکی پڕ بە پێستی کردەوەکەی خۆی دەدرێتەوە.

١٤)- ﴿لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمێک نیە، (لَا) لێرەدا کە (ظُلْمَ)ی پێ (منصوب) کراوە، بۆ لابردنی تێکڕا (نفي الجنس)یە، یانی: هیچ جۆرە ستەمێک ئەمڕۆ لە ئارادا نیە، نە کەم، نە زۆر، وەک لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ (٤٠)﴾، واتە: بە قەدەر گرانایی گەردێک ستەم لە کەس ناکات.

١٥)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾، بە دڵنیایی خوا لێپرسینەوەی خێرایە، پێشتریش باسمکرد، کە ئەم تەعبیرە لە قوڕئان دا زۆر هاتوە، لە سوورەتی (النور)دا هاتووەو لە ژمارەیەک لە سوورەتەکان دا، ئەم تەعبیرە هاتووەو، نەمبینیوە توێژەرەوانی قوڕئان هەڵوەستەیان لە بەرانبەر ئەم تەعبیرەدا کردبێ، بەڵام من وایتێدەگەم: خوا ﷻ

بۆیە زۆری بەکارهێناوە: (خوا لێپرسینەوەی خێرایە) بۆ لابردنی ئیشکالێک و، وەڵامی پرسیارێک کە: ئایا خوا ﷻ چۆن لە ڕۆژی دواییدا، ئەو هەموو ملیار ملیار مرۆڤانە هەروەها جندیش، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، ئەوەی کە شایستەی سزابێ سز دەدرێ و ئەوەی شایستەی پاداشت بێ، پاداشتی دەدرێتەوە، دەبێ چەندی پێ بچێ؟

ئنجا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارو لابردنی ئەو ئیشکالە، خوا ﷻ ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾، بە دڵنیایی خوا لێپرسینەوەی خێرایە، ئێستا بەشەر توانیویەتی کۆمپیوتەر دروست بکات و ئامێری وا دروست بکات، بۆ وێنە: کەسێک بە سەفەر دەچێ بۆ وڵاتێک، ئەگەر بیانەوێ لەو وڵاتە کونیەی ئەو کەسە دەربێنن، چەند سەفەری کردوون؟ بۆ کوێ و کوێ؟ چی کردوەو چۆنی کردوە؟ دەگونجێ هەمووی بە یەک دوگمە بێتە بەرچاو: تۆ فڵانکەسی و ئەوەندە سەفەرت کردوون، ئاوات کردوەو ئاوا چووی و ئاوا بووی، ئنجا ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بە چەند چرکەیەک دەست بە دوگمەیەک دابنێ، هەموو نهێنییەکان و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤێک بخاتەڕوو، دەبێ خوا ﷻ چەند بە خێرایی ئەو پرۆسەی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دانەوەیە ئەنجام بدات! واتە: ئەی مرۆڤەکان! خوا ﷻ لێپرسینەوەی وەک هی ئێوە نیە، چونکە ئەگەر وابێ، ملیۆنان ساڵی پێدەچێت، هەتا لێپرسینەوەی ئەو هەموو خەڵکە تەواو دەبێ.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**ترساندنی بەندەکان بە تایبەت بێبڕوایان لە ڕۆژی قیامەت، کە زۆر نیزیکەو، کاتێک دێ بێبڕوایان لە ترسان دڵیان دێتە لای گەروویان، خواش ﷻ خیانەتی چاوان و نهێنیی دڵان دەزانێ و، بڕیاری دادوەریش تەنیا هی خوایە، ئەوانی دیکەش هیچیان لە دەست نایەت:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ ﴾، بیانترسێنەو، وریایان بکەوە، بەرانبەر بە ڕۆژی نیزیک، (يَوْمَ) واتە: ڕۆژ، (ٱلْءَازِفَةِ) واتە: وەنیزیک کەوتوو، (ٱلْءَازِفَةِ) لە (أَزِفَ)وە هاتوە، واتە: (قَرُبَ) نیزیک کەوتۆتەوە، (ٱلْءَازِفَةِ) واتە: شتێک کە نیزیکە، کە (ٱلْءَازِفَةِ) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (**وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ السَّاعَةِ الأَزِفَة**)، یان (**القِيَامَةِ الأَزِفَة**)، ئاخیر زەمانی نیزیک، یاخود قیامەت و هەڵسانەوەی وەنیزیک کەوتوو، (**وَأَنْذِرْهُم: الإِنْذَار: إِعْلَامٌ مَعَ تَحْذِيْرٍ وَتَخْوِيْفٍ**) واتە: (**إنذار**) ئاگادارکردنەوەیە لە گەڵ ترساندن و هۆشداریی پێداندا، (**أَزِفَة**)ش ناوی بکەر (**إسْم فاعل**)ەو، بە مێیینە هاتوە، داتاشراوە لە کرداری (**أَزِفَ الأَمْرُ، أي قَرُبَ**)، یانی: کارەکە نیزیک بۆوە.

٢)- ﴿ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ ﴾، کاتێک کە دڵەکان لە لای گەرووەکانن، (**إِذْ: بَدَلٌ مِنْ يَوْم: إِسْمُ زَمَانٍ، وَمَنْصُوبٌ عَلَى المَفْعُول بِه، مُضَاف إلى جُمْلَة**: ﴿ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ ﴾)، واتە: (**إذ**) لە جێی (**يوم**) دانیشتوەو دەبێتە زەرف بۆ کات، (**منصوب**)ە لەسەر حاڵەتی بەرکار (**مفعُول بِه**) کە پاڵدراوەتە لای وشەی: ﴿ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ ﴾، لە لای گەرووەکان.

٣)- ﴿كَٰظِمِينَ﴾، کپکەرەوەن، ئەمە حاڵەو کۆی (کَاظِم)ە، واتە: کپکەرەوە، واتە: ئەوانە گەروویان توند گرتوەو کپیان کردۆتەوە، تاکو دڵیان کە لە حاڵەتی لێدانێکی زۆر بە قوەت دایە، لە ڕێی گەروویانەوە نەیەتە دەرێ، واتە: (كَاظِمِيْنَ لِحَنَاجِرِهِمْ) یان (كَاظِمِيْنَهَا) واتە: ئەوان گەروویانیان کپکردوەو گرتوویانە، تاکو دڵیان لێوەی نەیەتە دەرێ.

٤)- ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾، ستەمکاران هیچ دۆست و نیزیکێکیان نیەو، هیچ تکاکارێکیش کە بە قسەی بکرێ، نیانە، (شَفِيعٍ)، واتە: تکاکار، (يُطَاعُ)، واتە: بە قسەکراو، (حَمِيمٍ)یش واتە: دۆست و نیزیک.

٥)- ﴿يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ﴾، (خوا) ناپاکیی چاوەکان دەزانێ، ئەوەی سینەکانیش پەنهانیان کردوە، هەر دەیزانێ، خیانەتی چاوەکان یانی: کەسێک لە دنیادا بە تیلە چاوێک، بە سیلە چاوێک، بە برۆ هەڵتەکاندنێک، ئاماژەیەکی خراپی کردوە، یاخود ڕوانینێکی حەرامی کردوە، یان بە چاوی سیخوڕیی کرد بێ، یان هەڕەشەی کردبێ، یان بە جۆرێکی خراپ سەرنجی کەسێکی دابێ، خوای پەروەردگار خیانەت و ناپاکیی ئەو چاوە دەزانێ، ﴿وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ﴾، نەک هەر هی چاوەکان، بەڵکو ئەوەش کە سینەکانیش پەنهانیان کردوە، ئەوەش دەزانێ.

وشەی (خائنة) لە: ﴿خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ﴾، دوو حاڵەتی هەن:

أ- بە مانای خیانەتەو، چاوگەو پاڵدراوەتە لای بکەرەکەی، وەک (العَافِيَة) کە بۆ (مُعَافَاة) بەکاردێ و (الكَاذِبَة) بۆ (الكَذِب) بەکاردێ، کەواتە: ﴿خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ﴾، واتە: ناپاکیی چاوەکان (خِيَانَةُ الأَعْيُنِ).

ب- یاخود: ﴿خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ﴾، ناوی بکەر (إسم فاعل)ەو سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، کە وشەی (ٱلْأَعْيُنِ): دەلالەتی لەسەر دەکات (أي: نَظْرَةُ الأَعْيُنِ الخَائِنَة)، واتە: ڕوانینی چاوە ناپاکەکان.

لێرەدا ئەم دەقە بێنین باشە، کە چەمک و واتای ناپاکیی چاوەکان، یان چاوە ناپاکەکانمان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوە:

{عَنْ سَعْدٍ رضي الله عنه، قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ، اخْتَبَأَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ عِنْدَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَجَاءَ بِهِ حَتَّى أَوْقَفَهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فقال: يَا رَسُولَ اللهِ! بَايِعْ عَبْدَ اللهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَنَظَرَ إِلَيْهِ ثَلَاثًا كُلُّ ذَلِكَ يَأْبَى، فَبَايَعَهُ بَعْدَ ثَلَاثٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: «أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ يَقُومُ إِلَى هَذَا، حَيْثُ رَآنِي كَفَفْتُ يَدِي عَنْ بَيْعَتِهِ، فَيَقْتُلَهُ»؟ فَقَالُوا: مَا نَدْرِي يَا رَسُولَ اللهِ مَا فِي نَفْسِكَ، أَلَا أَوْمَأْتَ إِلَيْنَا بِعَيْنِكَ، قَالَ: «إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ أَنْ تَكُونَ لَهُ خَائِنَةُ الْأَعْيُنِ»} (أخرجه أبو داود: ٢٦٨٣، والنسائي في الكبرى: ٣٥٣٠، وأبو يعلى: ٧٥٧، وصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: سەعد (خوا لێی ڕازیبێ) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا خۆی لە لای عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) پەنهان کردبوو، ئەویش هێنای بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە بەردەمیدا وەستاندی، (کە پەنای بدات هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! پەیمانی لێوەربگرە، (پێغەمبەر) سەری بەرز کردەوە سێ جاران تەماشای کردو، ئامادە نەبوو پەیمانی لێوەربگری، پاش ئەو سێ جارە، پەیمانی لێوەرگرت، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە هاوەڵانی کردو فەرمووی: ئایا پیاوێکی ئازاو سەر ڕاستتان تێدا نەبوو، هەڵسێ بۆ ئەمە، دوای ئەوەی منی بینی دەستم گرتەوە (لەوەی پەیمانی لێوەربگرم)، بیکوشتایە! گوتیان: نەمانزانی ئەی پێغەمبەری خوا! چ لە ناختدا هەیە، هەر ئاماژەیەکت بۆ کردباین بە چاوت، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بێگومان ناگونجێ و شایستە نیە بۆ هیچ پێغەمبەرێک، ناپاکیی چاوی هەبێ (نابێت نیگایەکی هەبێ ناپاکیی تێدابێ، با بەرانبەر بە کەسێکی شایستەش بێ).

٦)- ﴿وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ﴾، خواش ﷻ بە هەق دادوەریی دەکات، دادگەرانە دادوەریی دەکات.

٧)- ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ﴾، ئەوانەش کە جگە لەو لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ بڕیارێک نادەن.

خوێنراویشـەتەوە: (تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ)، بـە شێوەی دوێـنران (خطاب)و، (يَدْعُون)ش بـە شێوەی نادیار (غیاب)، کـە ئێوە لـە جیاتی خـوا لێیان دەپاڕێنەوە.

﴿لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ﴾، هیـچ بڕیارێـک نـادەن، هیـچ شـتێکیان لـە بڕیـار بـە دەسـت نیـە، واتـە: لـەو ڕۆژەدا بڕیـار تەنیا بڕیـاری خوایـە، حوکـم تەنیـا حوکمـی خوایـەو تەنیـا خـوا دادوەرو بڕیـاردەرە.

٨)- ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەویش بیسەری بینەرە.

ئەمـە هیـچ گومـانی تێدانیـە، بـۆ ئەوەیـە کـە مرۆڤـەکان خۆیـان ئامـادە بکـەن، بزانـن دەچنـەوە بـەردەم کـێ و، وریـا بـن لـە ژیـانی دنیایـە چـۆن دەگوزەرێنـن!

با سەرنجێکی وشەی ﴿كَٰظِمِينَ﴾، بدەینەوە:

وشـەی: ﴿كَٰظِمِينَ﴾، کـۆی (كَاظِمْ)ە، ئەویـش لـە (كَظْـم)ەوە هاتـوە، (الكَظْـمُ: سَـدُّ مَجْرَى شَيءٍ)، (كَظْـم): بریتیـە لـە گرتنـی دەرگای شـتێک، ڕێـگای شـتێک بگیـرێ کـە لێـوەی نەجوولـێ، یـان دەرنەچـێ، لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿كَٰظِمِينَ﴾، (كظـم) یـان بـە حاڵـەتی (لازم) هاتـوە، یـان بـە (متعـدّي)، ئەگـەر بـە (لازم) بـێ، ئـەو کاتـە پێویسـتیی بـە بـەرکار نابـێ: ﴿كَٰظِمِينَ﴾، واتـە: کپکـەرەوەن، ئەگـەر بـە تێپەڕکـەر (مُتعـدِّي) بـێ و بـەرکار (مفعـول بـە) بخـوازێ، (أي كَاظِمِيْنَ حَنَاجِرَهُـمْ إِشْـفَاقاً مِـنْ أَنْ تَخْـرُجَ مِنْهَـا قُلُوبُهُـمْ)، ئـەو کاتـە: ﴿كَٰظِمِينَ﴾، یـانی: (كَاظِمِيْنَهَـا)، کپکـەرەوەن بۆیـان، واتـە: قوڕقوڕاگـەکانی خۆیـان، گرتـوون، لـە تـرسی ئـەوە کـە دڵیـان لێوەیـان دەربچـێ.

لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە کـە بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، بـە شـێوەیەک ئـەم ژیـانی دنیایەمـان بگوزەرێنیـن، کـە شایسـتەی پایـەو مەقامـی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوای بـێ، کـە خـاوەنی ئـەو هەمـوو سیفەتە بـەرزو ئـەو هەمـوو کردەوانەیـەو، خـاوەنی ئـەو هەمـوو چاکـەو نیعمەتانەیـە لـە ژیانمانـداو

بــە دیهێنــەرو پــەروەردگارو مشــوورخۆرو هەمــەکارەی کــەون و کائیناتــە، خــوا یارمەتییــمان بــدات کــە ژیانەکەمــان ژیانێکــی پــاک و چــاک بــێ، بــە شــێوەیەک بــێ کــە لــە ڕۆژی قیامەتــدا دەهێنرێینــە گــۆڕێ، هیــچ شــتێکمان نەبــێ پێــی عەیبــدار بیــن، خــوا بمانپارێــزێ لــەوەی نیەتێکــمان هەبــێ، قســەیەکمان هەبــێ، هەڵســوکەوتێکمان هەبــێ، کــە لــە ڕۆژی قیامەتــدا ئابڕوومــان پێــوەی بچــێ.

خــوا بــە لوتــف و کەرەمــی خــۆی دەروونیشــمان جــوان بــکات، دەریشــمان جــوان بــکات، وەک پێغەمبــەر ﷺ هــەر جارێــک تەماشــای ئاوێنــەی دەکــرد، دەیفەرمــوو: **(اللَّهُـمَّ كَمَا أَحْسَـنْتَ خَلْقِـي، فَحَسِّـنْ خُلُقِـي) (أخرجـه أحمـد: ٢٤٤٣٧، عَـنِ ابْـنِ مَسْـعُودٍ رضي اللـه عنـه، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده حسـن).**

واتــە: خوایــە! وەک چــۆن جەســتەت جــوان کردووم، ڕەوشتیشــم جوان بکــە، ئێمەش لــە خــوا دەپارێینــەوە: خوایــە! یارمەتییــمان بــدە، هــەم کــردەوە ڕواڵەتییەکانمــان چــاک و جــوان و پەســندو شــەرعیی بــن، هــەم کــردەوە پەنهانەکانیشــمان، کــە گرنگــترن لــە کــردەوە ڕواڵــەت و بەرچــاوەکان، نیــازەکانی نێــو دڵــمان، خولیایــەکانی نێــو مێشــکمان، ئــەو کردەوانــە کــە بــە پەنهانیــی دەیانکەیــن، ئــەو نیــازو مەبەســتانە کــە لــە دڵمانــدا هــەن، خوایــە ئەوانەمــان پــاک و جــوان و چــاک بــن، بــۆ ئــەوەی لــە ڕۆژی دوایــی دا ڕۆژێــک کــە نهێنییــەکان ئاشــکرا دەبــن و، دەهێنرێنــە گــۆڕێ، عەیبــدارو شــەرمەزار نەبیــن.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان بیست و شەش (٢٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٢١ - ٤٦)، لە بیست و شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ سەرەتا ئاماژەیەک بە مێژووی گەلانی لە خوا یاخیی و ملهوڕ دەکات، کە لە پێش ئوممەتی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەددا ﷺ ڕابردوون و، زۆریش خاوەن تواناو هێز بوون، بەڵام کاتێک کە بەڵای خواو سزای خوایان بۆ هاتوە، بەهۆی ملهوڕیی و یاخیبوونیانەوە، ئەو تواناو هێزەیان دادی نەداون.

دوایی پێنج ئایەت ئایەتەکانی: (٢٣ - ٢٧) بۆ بەسەرهاتی مووسا ﷺ، لە بەرانبەریشیدا فیرعەون و هامان و قارون، تەرخانکراون.

دوایش نۆزدە (١٩) ئایەتەکەی کە دەمێننەوە، ئایەتەکانی: (٢٨ - ٤٦) هەموویان بۆ بەسەرهاتی پیاوێکی بڕواداری ئیمانی خۆ پەنهانکەر لە دارو دەستەی فیرعەون، تەرخانکراون: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ﴾!

کە ئەو پیاوە لە کاتێکی زۆر ناسک و دژواردا ڕادەپەڕێ و بەرگرییەکی جوامێرانەی سەخت لە مووسا ﷺ دەکات، لە بەرانبەر فیرعەون و دارو دەستەکەی و هەڕەشەو گوڕەشەکانیانداو، لە هەموو قورئاندا، ئیرە تاکە شوێنە کە ئەو بەسەرهاتەی تێدا هاتوەو، شایانی باسە: ئەو پیاوە بڕوادارەش لە بەرگرییکردنەکەیدا گەلێک ئامۆژگاریی گەورەو گرنگ و ڕاستی مەزن دەخاتەڕوو، دوو جاریش فیرعەون دێتە قسە لە مەیدانی بەرگرییکردنەکەی ویداو، فیرعەون وەک قسە بڕین قسەی پێ دەبڕێ، بەڵام سەرەنجام خوا ﷻ ئەو پیاوە لە ئازارو هەڕەشەو گوڕەشەی فیرعەون و دارودەستەکەی چەپاڵە دەدات و دەیپارێزێ، ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەکات، خوای میهرەبانیش ئەو لە بەڵاو سزای ئەوان دەپارێزێ.

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟
هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ
مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ
إِنَّهُۥ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ
﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم
بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ۚ
وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ
وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾
وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ
﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ
رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن
يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ
﴿٢٨﴾ يَـٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَـٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن
جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ
ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَـٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ
وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَـٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ
يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ
هَادٍ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم
بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ
مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ
كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ
مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَـٰبَ ﴿٣٦﴾

أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ
لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾
وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا
هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً
فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ
فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾ وَيَٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ
إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا
لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ
لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ
أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ
ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ
سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟
ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون سەرنج بدەن! سەرەنجامی ئەوانە چۆن بوو، کە لە پێش ئەواندا بوون، لە حاڵێکدا کە هێزو توانایان لەوان سەختترو شوێنەوارەکانیان (لە هی ئەوان) دیارترن، کەچی خوا بەهۆی گوناهەکانیانەوە گرتنی (و سزای دان)و، هیچ پارێزەرێکیشیان لە (سزای) خوا نەبوو ﴿٢١﴾ ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە پێغەمبەرانیان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، بەڵام ئەوان بێبڕوابوون (پێیان)، ئیدی خواش گرتنی (و سزای دان)، بە دڵنیایی ئەو بەهێزەو تۆڵەی سەخت و توندە ﴿٢٢﴾ بێگومان مووساشمان بە نیشانەکانمانەوە، هەروەها بە بەڵگەیەکی ڕوونەوە ڕەوانکرد ﴿٢٣﴾ بۆ لای فیرعەون و هامان و قارون کەچی گوتیان: جادووگەرێکی درۆزنە! ﴿٢٤﴾ ئنجا کاتێک (مووسا) لە لایەن ئێمەوە هەقی بۆ بردن، گوتیان: ئەوانەی بڕوایان لەگەڵی هێناوە، کوڕەکانیان بکوژن و، ئافرەتەکانیشیان زیندوو بهێڵنەوە! پیلان و نەخشەی بێبڕوایانیش هەر لە ونبوون (و سەر بە فەتارەت چوون) دایە ﴿٢٥﴾ فیرعەونیش گوتی: لێم گەڕێن با مووسا بکوژم و با ئەویش لە پەروەردگاری وەپاڕێ، چونکە من دەترسم ئایین و بەرنامەکەتان بگۆڕێ، یان خراپەو ئاشووب لە زەوی (میسر)دا پەیدابکات ﴿٢٦﴾ مووساش گوتی: من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم و، پەروەردگاری ئێوەش لە هەر خۆبەزلگرێک کە بڕوای بە ڕۆژی لێپرسینەوە نیە ﴿٢٧﴾ پیاوێکی بڕواداریش لە شوێنکەوتووان (و دەستەو دارە)ی فیرعەون کە بڕوایەکەی خۆی دەشاردەوە گوتی: ئایا پیاوێک دەکوژن (تەنیا) لەبەر ئەوەی دەڵێ: پەروەردگارم خوایەو، بە دڵنیایی لە پەروەردگاریشیەوە بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێناون؟! ئنجا (گریمان) ئەگەر درۆش بکات، درۆیەکەی زیانی بۆ خۆیەتی و، ئەگەر ڕاستیش بکات (لانی کەم) هەندێک لەوەی بەڵێنتان پێدەدا (هەڕەشەتان پێی لێتان دەکات) بەسەرتان

دێ! بێگومـان خـوا هـەر کەسـێکی زێدەڕۆییکاریـی درۆزن، ڕاسـتە ڕێ نـاکات ﴿٢٨﴾ ئـەی خەڵکەکـەم! ئەمڕۆ حوکمڕانیـی و باڵادەسـتییتان لـە زەویـدا هەیـە (پێـی لـە خۆتـان بایـی مەبـن) ئایـا کـێ (لـە بەرانبـەر) سزاو تۆڵـەی خـوادا، پشـتمان دەگـرێ و دەربازمـان دەکات، ئەگـەر بۆمـان هـات؟! فیرعـەون گـوتی: تەنیـا ئەوەتـان پێشـان دەدەم کـە خـۆم دەیزانـم (ڕاسـت و دروسـتە)و بـۆ جگـە لەسـەر ڕاسـتییش ڕێنماییتان ناکـەم ﴿٢٩﴾ ئـەو کەسـەش کـە بـڕوای هێنابـوو گـوتی: ئـەی خەڵکەکـەم! مـن مەترسـییم لێتـان هەیـە (ڕۆژێکتـان بەسـەربێ) ﴿٣٠﴾ وێنـەی ڕۆژی (تێـدا فەوتێـنران) ی کۆمـەڵ و تاقمـە (کافـرە)کان وێنـەی عـادەتی (خـوا لـە فەوتانـدنی) خەڵکـی نـووح و (گەلـی) عـادو (گەلـی) سـەموودو، ئەوانـەی دوای وانیـش،، خـواش نایـەوێ سـتەم لـە بەنـدەکانی بـکات ﴿٣١﴾ هەروەهـا ئـەی خەڵکەکـەم! مـن لـە ڕۆژی یەکـدی بانگکـردن (لـە قیامەتـدا) ترسـم لێتـان هەیـە ﴿٣٢﴾ ڕۆژێـک کـە بـە پشـتتێکردنەوە هەڵدێـن، هیـچ پارێزەرێکتـان لـە (سزای) خـوا نابـێ و، هـەر کەسـێکیش خـوا گومـڕای بـکات، هیـچ کـەس ڕاسـتەڕێکاری نابـێ ﴿٣٣﴾ بێگومـان پێشـتریش یوسـووف بەڵگە ڕۆشـنەکانی بـۆ هێنـان، کەچـی هـەر لـە دوو دڵیـی دابـوون، لـە بـارەی ئـەو (پەیـام)ەوە کـە بـۆی هێنابـوون، هەتـا کاتێـک مـرد، گوتیـان: خـوا لـە دوای وی هیـچ ڕەوانەکراوێـک نانێـرێ، بـەو جـۆرە خـوا هـەر کەسـێک زێدەڕۆییکاریـی دوودڵ بـێ، گومـڕای دەکات ﴿٣٤﴾ ئەوانـەی بەبـێ بەڵگەیـەک کـە (لـە لایـەن خـواوە) بۆیـان هاتبـێ، شەڕەقسـە لـە دژی ئایەتـەکانی خـوا دەکـەن، ئـەوە مایـەی تووڕەیـی و بێزارییـە لـە لای خـواو، لـە لای ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، بـەو شـێوەیە خـوا هـەر دڵێکـی خۆبەزلگـری خۆسەپێن مـۆر دەکات ﴿٣٥﴾ فیرعەونیـش گـوتی: ئـەی هامـان! خانووێکـی بـەرزم بـۆ دروسـت بکـە، بەڵکـو (بەهۆیـەوە) بگەمـە ڕێیـەکان ﴿٣٦﴾ ڕێیـەکانی ئاسـمانەکان و، تەماشـای پەرسـتراوی مووسـا بکـەم، هەرچەنـدە پێشـم وایـە درۆکارە! (پەرستراوەکەی بـوونی نیـە) بـەو شـێوەیەش فیرعـەون کـردەوە خراپەکـەی خـۆی بـۆ ڕازێنرابـۆوەو، لـە ڕێ (ی ڕاسـتی خـوا) لادرابـوو، فێـڵ و پیـلانی فیرعەونیـش هـەر لـە نابوودیـی

دابـوو (٣٧) ئـەو کەسـەش کـە بـڕوای هێنابـوو گـوتی: ئـەی خەڵکەکـەم! شـوێنم بکـەون بـەرەو ڕێـی سـەر ڕاستیی ڕێنماییتـان دەکـەم (٣٨) ئـەی خەڵکەکـەم! ئـەم ژیـانی دنیایـە تەنیـا ڕابواردنێکـی کاتییـەو، (ژیـانی) کۆتایـی مەنزڵـگای سـەقامگیریی و نیشـتەجێ بوونـە (٣٩) هـەر کەسـێکیش خراپەیـەک بـکات، بـە جگـە لـە وێنـەی خـۆی سـزانادرێ و، هـەر کەسـێکیش بڕواداربـێ لـە نێـر یـان مـێ و کـردەوەی چـاک بـکات، ئەوانـە دەچنـە بەهەشـتەوەو بەبـێ ئەژمـار تێیـدا بژێویـان دەدرێتـێ (٤٠) هەروەهـا ئـەی خەڵکەکـەم! ئـەوە چیمـە مـن بانگتـان دەکـەم بـۆ ڕزگاریـی و، ئێوەش بـەرەو ئاگـر (ی دۆزەخ) بانگهێشـتم دەکـەن؟! (٤١) بانگهێشـتم دەکـەن کـە بێبـڕوا بـم بـە خـواو، شـتێک بکەمـە هاوبەشی خـوا کـە زانیارییـم پێـی نیـە (بـوونی نیـە)، لـە حاڵێکـدا منیـش بـەرەو لای (خـوای) زاڵـی لێبـوردە بانگتـان دەکـەم!! (٤٢) مسـۆگەر ئـەوەی ئێـوە منـی بـۆ لا بانـگ دەکـەن لـە دنیـاو دوارۆژدا، هیـچ پاڕانەوەیەکـی نیـە (کـە وەڵامـی بداتـەوە)و، بـە دڵنیاییـش گەڕانەوەمـان تەنیـا بـۆ لای خوایـەو، بێگومانیـش زێدەڕۆییـکاران هـاوەڵانی ئاگـر(ی دۆزەخ)ن (٤٣) لەمـەودوا ئـەوەی پێتـان دەڵێـم یـادی دەکەنـەوەو، منیـش کاری خـۆم حەواڵـەی خـوا دەکـەم، بێگومـان خـوا بینـەری (حـاڵ و باڵـی) بەندەکانـە (٤٤) ئیـدی خـوا لـە پیلانـە خراپەکانیـان پاراسـتی و، ئـازاری هـەرە خراپیـش دەوری فیرعـەون و شـوێنکەوتووانیدا (٤٥) (ئـەو سـزا سـەختەش وێـڕای خنکێـنران لـە دەریـادا بریتیـە لـە) ئاگـر، بەیانیـان و ئێـواران لەسـەری ڕادەنوێـنرن و، ئـەو ڕۆژەش کـە کاتی قیامـەت دێ (دەگوتـرێ) فیرعـەون و داروودەسـتەکەی بخەنـە (نێـو) توندتریـن سـزاو ئـازارەوە (٤٦)].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ضَلَـٰلٍ ): (أي: ضِيَاعٌ، ضَلَّ: فُقِدَ وَضَاعَ)، زایە بوو، یانی: فێڵ و پیلانی بێبڕوایان فەوتاوەو بێئاکامە، چونکە (ضَلَّ)، واتە: نەما، ون بوو، بزر بوو.

(ذَرُونِيٓ ): (أي: دَعُونِي) واتە: لێمگەڕێن، وازم لێبێنن، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (الذاریات)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ ﴾، ( مَا تَذَرُ) (أي: مَا تَدَعُ)، واتە: هیچ شتێکی بەجێ نەدەهێشت کە نەیکاتە خۆڵەمێش.

(مُسۡرِفٌ ): واتە: زێدەڕۆییکار، تێپەڕێنەر، (السَّرَفُ: تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الإِنْسَانُ، وَإِنْ كَانَ فِي الإِنْفَاقِ أَشْهَر)، (سَرَف): بریتییە لە سنوور بەزاندن لە هەر کارێکدا کە مرۆڤ دەیکات، هەرچەندە ئەوە لە ماڵ خەرجکردندا باوترە.

(ٱلرَّشَادِ ): (الرَّشْدُ وَالرُّشْدُ: خِلَافُ الغَيِّ)، (رَشَدو، رُشدو، رَشَاد) پێچەوانەی (غَيٌّ) ین، واتە: بێمرادیی کە بەرهەمی گومڕاییە، هەروەک (رُشْدُو، رَشَد) سەر ڕاستیی، بەرهەمی ڕێی ڕاستگرتنە، بەرهەمی هیدایەتە.

(ٱلتَّنَادِ ): (التَّنَادِي: اليَوْمُ الَّذِي يَتَنَادَى فِيهِ النَّاس)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە تێیدا خەڵک بانگی یەکدی دەکەن.

(عَاصِمٍ): (أي: المَانِعُ وَالحَافِظُ)، واتە: پارێزەرو بەرگرییکەر.

(مُّرۡتَابٌ ): لە (رَيْب)ەوە هاتووە، (أي: شَدِيدُ الرَّيْبِ وَالشَّكِّ)، واتە: زۆر بە خەستیی کەسێک دوو دڵ بێ لە بارەی شتێکەوە.

(صَرۡحًا ): (الصَّرْحُ: بَيْتٌ عَالٍ مُزَوَّقٌ، سُمِّيَ بِذَلِكَ اعْتِبَارًا لِكَوْنِهِ صَرْحاً مِنَ الشَّوْبِ، أي: خَالِصاً)، واتە: (صَرْح)، خانوویەکی بەرزە کە ڕازێنرابێتەوە، یان سواغ کرابێ،

بۆیەش بەو شێوەیە ناونراوە بە ئیعتیباری ئەوە کە دیوارەکانی سواغ کراون و هیچ خلّتەی پێوە نیە، گەچکارییە، لەبغە هەرچی هەیە.

(ٱلۡأَسۡبَٰبَ): (جَمعُ سَبَب: الحَبْلُ الَّذِي يُصْعَدُ بِهِ النَّخْل)، (أسْبَاب) کۆی (سَبَب)ە، کە لە ئەصڵدا ئەو پەتە بووە پێی سەرکەوتوون بۆ دارخورما، بۆ ئەوەی متوربەی بکەن، یاخود بۆ ئەوەی بیچنن، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر هۆکارێک کە پێی دەگەی بە شتێک، پاشان خوازراویشتەوە بۆ ڕێگا، ڕێگایەک کە ئینسان پێی بە ئامانجی دەگات.

(فَأَطَّلِعَ): تەماشا بکەم، (طَلَعَ عَلَيْنَا فُلَانٌ، وَاطَّلَعَ: شَاهَدَ وَنَظَرَ)، فلانکەس تەماشای کردو ڕوانی، لە زمانی عەرەبییدا دەڵێن: (طَلَعَ وَاطَّلَعَ) هەردووکیان بە مانای: تەماشای کردوو ڕوانیی، دێن.

(تَبَابٖ): (التَّبَابُ: الخُسْرَانُ وَالهَلَاكُ، قَالَ تَعَالَى: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾ المسد)، (تَبَاب): بریتیە لە زیانباریی و فەوتان، وەک خوا ﷻ لە سووڕەتی (المسدُ)دا دەفەرموێ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾ المسد، هەردووک دەستی (أبو لهب) لە بەین بچن و لە بەینیش چوون.

(لَا جَرَمَ): یان وشەیەکی لێکدراوە لە (لَا)و (جَرَم)، (لَا) واتە: نەخێر، (جَرَم) واتە: بە مانای بڕین (قَطْع) دێ، یاخود هەمووی یەک وشەیە، بە مانای بێگومان، بە دڵنیایی، یاخود (لَا) بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەیەکە کە پێشتر کراوە واتە: وانیە وەک ئێوە دەڵێن، (جَرَم) واتە: بە دڵنیایی و بە هەڵبڕینەوە.

(مَرَدَّنَآ): واتە: (مُنْقَلَبَنَا وَمَرْجِعَنَا)، واتە: شوێن و کاتی بۆ لا گەڕانەوەمان، ئەو کات و شوێنەی بۆی دەچینەوە.

(فَسَتَذۡكُرُونَ): واتە: وەبیرتان دێتەوە، (مُشْتَق مِنَ الذُّكْرِ وَهُوَ ضِدُّ النُّسْيَانِ)، لە وشەی (ذُكْر)ەوە داتاشراوە، واتە: لە بیربوون کە دژی لە بیر چوونەوەیە،

نەک لە (ذِکر)ەوە داتاشرابێ، بەڵکو لە (ذُکْر)ەوەیە، (ذُکْر) واتە: لە بیربوونی شتێک، بەڵام (ذِکر) واتە: باسکردنی شتێک و (ذُکر) پێچەوانەی (نِسْیَان)ە، واتە: لە بیرچوونەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ﴾، واتە: ئەوەی پێتان دەڵێم، کاتێک دێ بیرتان دێتەوە.

(وَأُفَوِّضُ): (أي: أُسَلِّمُ)، کاری خۆم دەسپێرم: ﴿ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، دەڵێ: کاری خۆم بە خوا دەسپێرم و حەواڵەی وی دەکەم.

(يُعْرَضُونَ): ڕادەنوێنرێن، (العَرْضُ: إِظْهَارُ شَيْءٍ لِمَنْ يَرَاهُ لِتَرْغِيبٍ أو تَحْذِيرٍ)، (عَرْض): بریتیە لە دەرخستنی شتێک بۆ کەسێک کە ببینێ، چ بۆ ئارەزوومەند کردنی، چ بۆ لێترساندنی، (مَعْرَض): پێشانگا، ئەو شوێنەیە کە شتی لێ ڕادەنوێنرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک لە پێناسەی دەرسەکەشدا باسمانکرد: سەرەتا خوا ﷻ بە گشتیی سەرنجی مرۆڤەکان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، مێژووی گەلانی لە خوا یاخیی، مێژووی گەلانی سەر بە فەتارەت چوو، بە هۆی یاخیی بوون و، ملهوڕییانەوە بەرانبەر بە خوا.

دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هەمزە (أَوَلَمْ)، بۆ پرسیارکردنە، پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنە، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ واتە: دەبوو ڕۆیشتبانایە، ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێش ئەوان چۆن بوو، ئایا بەزەویدا نەڕۆیشتوون و مێژوویان نەپشکنیوە؟ ئەو ڕۆیشتنەش دەگونجێ مەبەست پێی ڕۆیشتنی جەستەیی (السَّیر الجسدي) بێ، واتە، بڕۆن بە شوێنەوارەکاندا بگەڕێن، گەشت و گەڕان بکەن، شوێنەوارەکان سەرنج بدەن، دەشگونجێ مەبەست ڕۆیشتنی مەعنەویی (السَّیر المعنوي) بێ، واتە: بە بیرلێکردنەوەو موتاڵاکردن و، بە هێنانە بەر ئاوێنەی خەیاڵی مێژووی

گـەلانی ڕابـردوو، کـە سـەرەنجامیان چـۆن بـوو؟ ﴿كَانُوٓاْ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾، کـە ئـەوان لـەوان بەهێزتـر بـوون، ﴿وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، شوێنەوارەکانیشـیان سـەختتر بـوون و، بەرچاوتـر بـوون، لـە زەویـدا، ئـەوان لـەوان، واتـە: ڕابـردووەکان لـەو بێبڕوایانـەی ڕۆژگاری تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ، هەروەهـا ڕۆژگاری دوای تـۆش، لـە زۆرێکیـان بەهێزتـر بـوون لـە ڕووی هێـزی ماددیـی و هێـزی بەشـەرییەوە، ﴿وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، هەروەهـاش شوێنەوارەکانیشـیان بەرچاوتـرن و زیاتـرن، ئێسـتاش لەگـەڵ دابـێ هەرەمـەکانی فیرعەونـەکان، خانووبـەرەکانی شـوێنی عـادو سـەموود، هەروەهـا هەیکەلـەکانی (بـووذا) کـە کاتێ خـۆی لـە ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیادا هەبـوون و، ئێسـتاش هـەر هـەن و گەلێـک لـە شـوێنەوارەکانی دیکـەش، وەک دوایـی بـاس دەکەیـن، گەلـە پێشـووەکان شـوێنەواری وایـان بەجێهێشـتوون، مرۆڤـەکانی ئێسـتا ناتوانـن وەک ئـەو شـوێنەوارانە دروسـت بکـەن، ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾، خـوا بەهـۆی گوناهەکانیانـەوە گرتنـی، سـزای دان، ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ﴾، هیـچ پارێزەرێکیشـیان نەبـوو لـە سـزای خـوا، واتـە: هیـچ کەسـێک نەبـوو بیانپارێـزێ لـە سـزای خـوا، کاتێـک بۆیـان هـات بـە هـۆی تـاوان و خراپەکانیانـەوە، بـەڵام ئایا خـوا ﷻ بۆچـی گرتنـی؟ هەڵبەتـە پێشـێش ئامـاژەی پێکـردوە، بـەڵام لێـرەدا زیاتـر ڕوونی دەکاتـەوە، ئەگەرنـا پێشـێش دەفەرمـوێ: ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾، خـوا بەهـۆی گوناحەکانیانـەوە گرتـوونی، خـوا لـە گۆتـرە کـەس سـزا نـادات و ئەوپـەڕی دادگەریـی و میهرەبانیـی هەیـە، سیفەتە بـەرزەکانی هەموویـان لـەو پەڕیـدان.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، ئـەوەش بـە هـۆی ئەوەوە بـوو کـە پێغەمبەرەکانیـان (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ دەهێنـان، بەڵگـە ڕۆشـن و ڕوون و بـێ چەنـدو چوونەکانیـان بـۆ دەهێنـان، بـۆ ئیسـپات و سـەلماندنی ئـەوە، کـە لـە لایـەن خـواوە ڕەوانکـراون و ئـەو پەیامـەی پێیانـە، پەیامـی خوایـەو قسـەی گیرفـانی خۆیـان نیـە، ﴿فَكَفَرُواْ﴾، کەچـی ئـەوان بێبڕوابـوون، بێبڕوابـوون بـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، هەروەهـا بـەو پەیامـەش کـە

پێغەمبەران (عَلَیْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە خواوە پێیانـدا نێردراوە، پێی بێبڕوابوون و دایانپۆشیی و ڕەتیانکـردەوە، ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، خـواش گرتنـی، سـزای دان، ﴿ إِنَّهُۥ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، بەدڵنیایی خوا بەهێزەو، تۆڵەو سزاشی توندە، (ٱلْعِقَابِ)، واتە: سزادان، سزا هەر سزای خوایە، وەک لە سوورەتی (الفجر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ ﴾الفجر، واتە: لەو ڕۆژەدا هیچ کەس وەک خوا سزا نادات و، هیچ کەسیش وەک خوا کەلەپچە ناکات، دەست و پێ و گەردنی تاوانباران ناخاتە زنجیرو کۆت و پێوەندەوە.

ئەمە هەمووی زەمینە خۆشکردن و ڕێ خۆشکردن بوو، بۆ بەسەرهاتی مووسا، کە لێرەدا تەنیا باسی مووسا کراوە، باسی هاروونی برای (عَلَیْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نەکراوە، ئەگەرنا هەر بەیەکەوە چوون، کە مووسا داوای لە خوا کردوە، هاروونیش بکاتە وەزیر لەگەڵیدا، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (مریم) دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾، کەواتە: هاروون لەسەر داوا و تەکلیفی مووسا، خوا ﷻ کردوویەتی بە پێغەمبەر، مووسا زۆر پایە بەرز بووە، وەک لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾الأحزاب، (وجیە) واتە: خاوەن پێگەو خاوەن ڕوو، بەڵێ مووسا پایەیەکی بەرزی هەبووە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر ئەویش و لەسەر پێغەمبەری خاتەمیش و ﷺ لەسەر هەموو پێغەمبەرانیش بێ.

لێرەدا تەنیا باسی مووسا کراوەو لەگەڵ شوێنی دیکەشدا، هەرچەندە هاروونیشی لەگەڵدابووە، بەڵام خوا ﷻ بۆ کورتکردنەوە، ئەوەی کە لە شوێنەکانی دیکە باسیکردوە، جاری وا هەیە کە لە شوێنێک دەیهێنێ، باسی ناکاتەوە، ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، بە دڵنیایی

مووسـامان بـە نیشـانەکانەوەو، بـە بەڵگەیەکـی ڕوون و ئاشـکراوە، نـارد، یاخـود، ﴿بِـَٔايَـٰتِنَا﴾، (آيات) جاری وا هەیـە مەبەسـت پێیـان فەرمایشـتی خوایـە، بـەڵام لێرەدا مەبەسـت پێیـان موعجیـزەکانی مووسـان ﷺ، جاری واشـە (آيات) مەبەسـت پێیان دیاردەو دیمەنـەکانی دەوروبـەرو بوونـەوەرن، ئـەو شـتانەی خـوا خوڵقانـدوونی، ئـەوەش بـە پێـی سـیاق دیاریـی دەکـرێ، کامیـان مەبەسـتە؟ لێـرەدا دەگونجـێ هـەم مەبەسـت پێیـان فەرمایشـتی خـوا بـێ، ئایەتـە خوێـنراوەکان، دەشـگونجێ مەبەسـت پێیان موعجیـزەکان بـن کـە بـە مووسـا ﷺ دراون، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ ﴿١٠١﴾﴾الإسراء، واتـە: نـۆ نیشـانەی ڕۆشـنمان بـە مووسـا دابـوون، نـۆ موعجیـزە، ﴿وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ﴾، دەگونجـێ مەبەسـت ئـەو شـێوە وتووێـژە لۆژیکیـی و بەهێـزەی مووسـا ﷺ بـێ، کـە فیرعـەونی پـێ دوانـدوەو بۆڕیـداوەو بێدەنگـی کـردوە، خـوا ﷻ مووسـای بـە نیشـانەکان و بـە بەڵگەیەکـی ڕوون و ئاشـکراوە بـۆ کوێـی نـارد؟

﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾، ناردمـان بـۆ لای فیرعـەون و هامـان و قـاڕوون (ئـەو سـێ کوچکە شـوومە)، هـەر یەکسـەر گوتیان: ئـەوە جادووگەرێکـی درۆزنـە، ئەصڵەکـە فیرعـەون بـووە، هامـان وەزیـری بـووەو قاڕوونیـش بابایەکـی سـەرمایەداربووە، لـە پەنـای فیرعەونـدا پێگەیشـتوە، جـاری وایـە خـوا ﷻ هەرسـێکیان پێکـەوە دێنـێ، وەک ئێرەو جـاری وا هەیـە دووانیـان دێنـێ، بـۆ وێنـە بـاسی: فیرعـەون و قـاڕوون دەکات، یـان هـەر بـاسی فیرعـەون و هامـان دەکات، وەک لـە سـووڕەتی (القصص)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾﴾القصص، چونکـە ئەسڵەکە فیرعـەون بـووەو هامانیـش وەزیـری بـووە، قاڕوونیـش کـە لـە ئەصڵـدا لـە گـەلی مووسـا بـووە: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴿٧٦﴾﴾القصص، واتـە: قـاڕوون لـە گـەلی مووسـا بـووە، لێیـان هەڵگەڕایـەوە، بەهـۆی ئـەو تەمـاع و سـەروەت و سـامانەوە کـە چـاوی تێبڕیبـووەو، وەدەسـتی دەهێنـا لـە پەنـای حوکمـی فیرعەونـدا، لـە خەڵکەکـەی خـۆی

هەڵگەڕابـوّوە، ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا ﴾، کاتێـک مووسـا هەقـی لـە لایـەن ئێمـەوە بـۆ بـردن، ﴿ قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ﴾، (فیرعـەون و هامـان و قـارون) گوتیـان: کـوڕەکانی ئەوانـەی بڕوایـان لەگەڵیـدا هێنـاوە، بیانکـوژن، ﴿ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ﴾، ئافرەتەکانیشـیان بـە زیندوویـی بهێڵنـەوە، ﴿ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾، پیلان و فێڵـی بێبڕواکانیش هـەر لـە گومڕایـی و بـێ ئاکامییدایـە.

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ ﴾، فیرعەونیـش گـوتی: لێمگەڕێـن بـا مووسـا بکـوژم.

وەک خەڵـک دەسـتی گرتبـێ، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا نەوێـراوە دەسـتی بـۆ بـەرێ، کەچـی وای خـۆ پێشـانداوەو خـۆی ڕاپسـکاندوە، کـە دەتوانـێ مووسـا بکـوژێ، ئـەو هەڵویسـتەشی بـۆ خـۆ نـازا پێشـاندان و فریـودانی خەڵکەکـە بـووە، تاکـو خەڵـک وا نەزانـێ: فیرعـەون لـە بەرانبـەر مووسـادا ﷺ بـێ دەسـتەڵاتە!

دوایـی دەڵـێ: ﴿ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ﴾، لێمگەڕێـن بـا مووسـا بکـوژم، ئنجـا بـا ئەویـش لـە پـەروەردگاری بپاڕێتـەوە، بزانـم ئـەو پـەروەردگارەی ئـەو پێـی دەخـوڕێ و دەڵـێ: مـن نوێنـەری ئـەوم، چـی بـۆ دەکات؟ ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾، فیرعـەون دوو پاسـاوان دێنێتـەوە بـۆ کوشـتنی مووسـاو، ئـەو هەڕەشـەیەی کـە لـە مووسـای دەکات: مـن دەترسـێم ئایینەکەتـان بگـۆڕێ، یاخـود خراپەکاریـی و ئاشـووب لـە زەویـدا بـڵاو بکاتـەوە: واتـە: دەترسێم دینتـان تێکبـدات، یـان ژینتـان تێکبـدات، ئنجـا هـەر فیرعەونێـک ئێسـتاش کـە هەڕەشـە دەکات، لەوانـەی کـە وەک مووسـا پەیامـی هـەق دەگەیەنـن، ناڵـێ فڵانکـەس ئینسـانێکی باشـەو دەیکـوژم، هـەر دەڵـێ: دەترسـێم دینتـان تێکبـدات، یـان ژینتـان تێکبـدات، حەتمـەن دەبـێ تۆمەتێکـی خراپـی بـۆ بـکات، بـۆ چەواشـەکردنی خەڵکەکـە.

﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾، واتـە: مووسـاش ﷺ (لـە بەرانبـەر ئـەو هەڕەشـەیەی فیرعەونـدا) گـوتی: مـن پەنادەگـرم بـە پـەروەردگاری خـۆم و پـەروەردگاری ئێـوەش، لـە هـەر خـۆ بەزلگرێـک کـە بـڕوای بـە ڕۆژی لێپرسـینەوە نیـە، کەواتـە: ئـەو فیرعەونـە پـەروەردگارو خاوەنتـان نیـە، مشـوورخۆرتان نیـە، بەڵکـو پەروەردگارێـک هەیـە، هـی منیشـەو هـی ئێوەشـە، فیرعەونیـش هیـچ نیـە، مـن پەنـا بـەو دەگـرم، لـە خراپـەی هـەر خۆبەزلگرێـک کـە بـڕوای بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، کـە مەبەسـت پێـی فیرعەونـە.

ئنجـا دەسـت دەکات بـە باسـکردنی بەرگرییکـردنی ئـەو پیـاوە بـڕوادارەی دارو دەسـتەی فیرعـەون، شـوێنکەوتەی فیرعـەون، کـە تاکـو ئێسـتا نیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوەو هەسـتیان پـێ نەکـردوە، وا پێدەچـێ زۆر نیزیـک بووبـێ لـە فیرعـەون، ئەگەرنـا چـۆن لـە کـۆڕو مەجلیـسی فیرعەونـدا دەبێـت، چـۆن فیرعـەون ڕێـی دەدا ئـەو هەمـوو قسـانە بـکات! ئنجـا ئێمـە لێـرە بـە خێرایـی بەسـەریدا دەڕۆیـن، چونکـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا، توێژینـەوەی زۆر لەسـەر بڕگـەکانی دەکەیـن.

﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ﴾ پیاوێکـی بـڕوادار لـە دارو دەسـتەی فیرعـەون، کـە بڕوایەکـەی خـۆی دەشـاردەوە، گـوتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ﴾، ئایـا پیاوێـک هـەر لەسـەر ئـەوە دەکـوژن کـە بڵـێ پـەروەردگارم خوایـە! ﴿وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە بەڵگـە ڕۆشـنەکانیشی لـە پەروەردگاریـەوە بـۆ هێنـاون، ﴿وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ﴾، ئنجـا ئەگـەر (گریمـان) درۆش بـکات، درۆیەکـەی زیـانی بـۆ خـۆی هەیـە، ﴿وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ﴾، ئەگـەر ڕاسـتگۆش بـێ، بـە لای کەمـەوە هەندێـک لـەوەی کـە گفتتـان پێـدەدا و هەڕەشـەتان پـێ لێـدەکات، تووشـتان دەبـێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾، بـە دڵـنیایی خـوا کەسـێک زێدەڕۆییکارێکـی زۆر درۆزن بـێ، ڕاسـتە ڕێـی نـاکات.

کـە ئەمـە دەبەرڕاهاویشـتنەو پلارێکـە لـە فیرعـەونی دەگـرێ، چونکـە هەمـوو کـەس دەزانـێ: مووسـا ﵇ نـە زێدەڕۆییـکارەو نـە درۆزنیشـە، بـەڵام جـارێ لـەو سـەرەتایەوە بـە ڕوونیـی نایڵـێ، تاکـو فیرعـەون ئیسـتیفزاز نـەکات و، نەیورووژێنـێ و، سـەرەنجام قسـەی پـێ نەبـڕێ، ﴿ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئـەی خەڵکەکـەم! ئەمـڕۆ ئێـوە حوکمڕانییتـان بـە دەسـتەوەیە، دەسـەڵاتتان هەیـە لـە زەویـدا، بـە ئاشـکرا، یاخـود: دیـارە کـە ئێـوە زاڵـن لـە زەوییـداو حوکمڕانییتـان بەدەسـتەوەیە، ﴿ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ﴾، ئنجـا ئایـا کـێ لـە سـزای خـوا دەمانپارێـزێ، ئەگـەر بۆمـان هـات؟ واتـە: بەڵـێ: حوکمڕانـن و دەسـتەڵاتتان هەیـەو بـاڵا دەسـتن، بـەڵام ئەگـەر خـوا سـزای دایـن، کـێ لـەو سـزایەی خـوا دەمانپارێـزێ؟ ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ ﴾، فیرعـەون (قسـەی پـێ بـڕی) گـوتی: هـەر ئەوەتـان پـێ دەڵێـم کـە بـۆ خـۆم دەیبینـم، ﴿ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، ئـەوەی منیـش ئێـوەی بـۆ ڕێنمایـی دەکـەم هـەر ڕێـی ڕاسـتە، ڕێـی سـەر ڕاسـتیی و بـە ئامانـج گەیشـتنە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾، ئەو کەسەی بـڕوای هێنابـوو گـوتی: ئـەی خەڵکەکـەم! مـن مەترسـیی وێنـەی ڕۆژی حیزبەکانـم لێتـان هەیـە، (ئـەو کۆمەڵانـەی کـە یاخیبـوون لـە پێغەمبـەرانی خـوا (عَلَيۡهِم الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم)و خـوا سـزای دان)، ئنجـا نموونـە دێنێتـەوە، ﴿ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴾، وەک عـادەتی گـەلی نـووح، هەروەهـا عـادو سـەموود، گـەلی نـووح نووحیـان بـە پێغەمبـەر ﵇ بـۆ ڕەوانەکرابـوو، عادیـش هـوود ﵇، سـەموودیش ساڵـح ﵇، ﴿ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی دوای وانیـش، ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴾، خـواش سـتەمی نـاوێ بـۆ بەنـدەکانی، کـە ئەوانـەی لـە بەیـن بـردوون بـۆ خۆیـان، سـتەمیان لـە خۆیـان کـردوەو، دژی پێغەمبـەران (عَلَيۡهِم الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم)، دژی پەیامـەکانی خوابـوون.

﴿ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴾، هەروەها ئـەی خەڵکەکـەم! مـن لـە ڕۆژی یەکـدی بانگکردنـێ مەترسـیم لێتـان هەیـە، واتـە: ڕۆژی قیامـەت کـە خەڵـک یەکـدی بانـگ دەکات، بـاب بانگـی ڕۆڵـە دەکات، ڕۆڵـە بانگـی بـاب و دایکـی دەکات، ئـەو بانگـی وی دەکات، یاخـود فریشـتەکان بانـگ دەکـەن، ﴿ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖ ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە بـە پشـتتێکردنەوە ڕادەکـەن، لـە لایـەن خـواوەش هیـچ پارێزەرێکتـان نیـە، واتـە: هیـچ کەسـێکتان نیـە لـە سـزای خـوا بتانپارێـزێ، ﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴾، هـەر کەسـێک خـواش ڕێـی لـێ تێکبـدات، (چونکـە شایسـتەی ئەوەیـە)، هیـچ ڕێنماییکارێکـی نابـێ.

ئنجـا وەبیریـان دێنێتـەوە کـە پێشـتریش یوسـوف ﷺ وەک پێغەمبەرێـک بـۆ لایـان چـووە، ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێشـتریش یوسـوف بەڵگـە ڕۆشـنەکانی بـۆ هێنـان، ﴿ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ﴾، بـەڵام ئێـوە بـەردەوام هـەر لـە دوو دڵیـی دابـوون، لـە بـارەی ئـەو (پەیام)ەوە کـە بـۆی هێنابوون، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗا ﴾، هەتـا کاتێـک کـە مـرد، گوتتـان: لـە دوای وی خـوا هیـچ ڕەوانەکراوێـک نانێـرێ، واتـە: ئەگـەر گریـمان یوسـوفیش ڕەوانەکـراوی خوابووبـێ، لـە مـەودوا ئـەوە کۆتایـی هـات، دەشـگونجێ ئـەوە توانـج بووبـێ واتـە: لـە مـەودوا کەسـی دیکـە نایـەت بڵـێ: مـن پێغەمبـەرم، ﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ ﴾، هـەر بـەو شـێوەیە خـوا هـەر کەسـێک زێدەڕۆیـیکاری دوو دڵ بـێ، گومـڕای دەکات و، سـەری لـێ تێکـدەدات، لەبـەر ئـەوەی لـە هـەق ناخەفتـێ و بـۆی ناگـەڕێ و سـۆراغی نـاکات.

﴿ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ ﴾، ئەوانـەی شـەڕە قسـە دەکـەن لـە بـارەی ئایەتـەکانی خـواوە، بەبـێ ئـەوەی بەڵگەیەکیـان لـە خـواوە بـۆ هاتبـێ، بەبـێ ئـەوەی بەڵگەیەکـی ڕۆشـنیان بـە دەسـتەوە بـێ، ئەوانـە: ﴿ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، شـەڕە قسـە کردنـە لـە دژی ئایەتـەکانی خـوا، گەورەتریـن هـۆکاری بوغزێنراوییـە لـە لای خـواو، لـە لای ئەوانـەش کـە بڕوایـان

هێناوە، ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾، ئاوا بەو شێوەیە، خوا مۆر بەسەر هەر دڵێکی خۆ بەزلگری خەڵک تێشکێن و خۆسەپێنەوە دەنێ، دڵی مۆر دەکات.

دووبارە فیرعەون دێتەوە قسە: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ﴾، فیرعەون گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە، بینایەکی بەرزم بۆ دروست بکە، بەڵکو بچمە سەری و لەوێوە بکەمە ڕێیەکان، ﴿أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾، ڕێیەکانی ئاسمانەکان، لەوێوە تەماشای پەرستراوی مووسا بکەم، ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا﴾، پێشم وایە درۆکەرە، واتە: ئەو پەرستراوەی مووسا دەڵێ هەیەو ئەو ناردوویەتی، ڕاست نیەو بوونی نیە.

﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ﴾، بەو شێوەیە کردەوە خراپەکەی فیرعەون، بۆی ڕازێنرابۆوە، ﴿وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ﴾، لە ڕێی ڕاستیش لادرابوو، ویستی ئازادی خۆی لەدەست دابوو، ڕێشمەی کەوتبووە دەستی شەیتان، ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾، پیلان و نەخشەی فیرعەونیش، تەنیا لە فەوتان و سەر بە فەتارەت چوون دابوو.

کەواتە: ئەو قسەیەی کردوویەتی، فێڵێک بووە بۆ چەواشەکردنی خەڵک، نەک بەڕاستیی مەبەستی بووبێ کۆشکێکی بۆ دروست بکەن، ئەویش بچێتە سەرێ و لەوێوە تەماشا بکات: داخۆ خوا ﷻ لە کوێیە؟ بەڵکو بۆ چەواشەکاریی خەڵک بووە، بۆیە خوا ناوی لێناوە (کید) پیلان و فێڵ، وەک دوایی زیاتر باسی دەکەین.

دووبارە بروادارەکە دێتەوە قسە: ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾، ئەو کەسەی بڕوای هێنابوو گوتی: ئەی خەڵکەکەم! شوێنم بکەون بەرەو ڕاستە ڕێ، بەرەو سەر ڕاستیی، ڕێنماییتان دەکەم، ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ﴾، ئەی خەڵکەکەم! ئەم ژیانی دنیایە ڕابواردنێکی کەمە، ﴿وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾، بێگومان مەنزڵگای کۆتایی شوێنی

تێدا نیشتەجێبوون و سەقامگیربوونە، ﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ﴾، هەر کەسێک خراپە بکات، تەنیا بە ئەندازەی خۆی سزای دەدرێ، ﴿ وَمَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾، هەر کەسێکیش چاکە بکات، لە نێر یان مێ و بڕواداریش بێ، ﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشت، بەبێ ئەژمار بژێویان دەدرێتێ، واتە: بۆیان ناژمێردرێ هێندە زۆرە، ﴿ وَيَـٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، هەروەها ئەی خەڵکەکەم! ئەوە چیمە من ئێوە بەرەو ڕزگاریی بانگ دەکەم، کەچی ئێوە من بەرەو ئاگر بانگ دەکەن؟ ﴿ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ ﴾، بانگم دەکەن کە بێبڕوابم بە خوا، ﴿ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، هەروەها شتێک بکەمە هاوبەشی کە زانیاریم پێی نیە، واتە: بوونی نیە، بۆیە زانیاریم پێی نیە، ﴿ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّـٰرِ ﴾، لە حاڵێکدا کە منیش بانگتان دەکەم بەرەو لای خوای زاڵی زۆر لێبووردە.

﴿ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، بە دڵنیایی بێگومان ئەوەی ئێوە منی بۆ لا بانگ دەکەن، هیچ بانگهێشتێکی نیە، نە لە دنیاو نە لە دواڕۆژدا (کە وەڵامی بداتەوە)، واتە: هەرچەندە خەڵک بانگیان بکات، ئەو پەرستراوە ساختانە وەڵامی بانگکراوەکان نادەنەوەو لە فریایان نایەن، ﴿ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، بێگومان گەڕانەوەشمان تەنیا بۆ لای خوایە، ﴿ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، مسوگەر زێدەڕۆییکارانیش (ئەوانەی تێدەپەڕێنن) هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن، ﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ﴾، بە دڵنیایی وەبیرتان دێتەوە، ئەوەی ئێستا پێتان دەڵێم، کاتێک دێ بیرتان دێتەوە، بەڵام دادتان نادات، ﴿ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، کاری خۆشم حەواڵەی خوا دەکەم (چونکە هەڕەشەیان لێکردوە)، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەری بەندەکانیەتی، دەزانێ حاڵ و باڵی من چۆنەو من بێ دەستەڵاتم، کاری خۆم حەواڵەی خوا دەکەم.

﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴾، خـواش پاراسـتی لـە خراپـەی ئـەو پیلانـەی دەیانگێـڕا، لـە سـزادانی ئـەوان و لـە خراپـەی نەخشـەو پیلانەکانیـان پاراسـتی، ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، سـزایەکی خراپیـش دەوری دارو دەسـتەی فیرعەونیـدا، کـە بریتـی بـوو لـەوەی لـە دەریـای سـووردا خنـکان، ئـەوە لـە دنیـادا، ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾، لـە جیهـان و قۆناغـی بەرزەخیشـدا: ئاگرێـک کـە بەیانیـان و ئێـواران لەسـەری ڕادەنوێترێـن، ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾، قۆناغـی سـێیەمیش کـە کاتەکـە (سـاعة) دێ (ڕۆژی دوایـی)، لەوێـش سـزایان هەیـەو دەگوتـرێ: ﴿ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾، دارو دەسـتەی فیرعـەون بخەنـە نێـو سـەختترین سـزاوە، کەواتـە سـێ سـزان:

أ- خنکێنران لە دەریای سووردا.

ب- لە جیهانی بەرزەخدا بەیانیان و ئێواران دەسوتێنرێن.

ج- لە ڕۆژی دواییشدا سەختترین سزا چاوەڕێیان دەکات.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**سەرنجڕاکێشانی خوا ﷻ بۆ مرۆڤەکان بەرەو مێژوو و تێوەڕامانی سەرەنجامی شوومی گەلانی سەرکێشی ڕابردوو، کە خوای دادگەر بەهۆی گوناهەکانیانەوە سزای داون، هەرچەندە زۆریش بەهێزتربوون و، پاشماوەو شوێنەوارەکانیان دیارترن، بەلام بەهۆی ئەوەوە کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نەهێناوەو، پەیامی خوایان کە پێیاندا ڕەوانە کراوە، قبووڵیان نەکردوە، هەرچەندە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەڵگەو موعجیزەی ڕۆشنیشیان بۆ ئیسپاتی داوای خۆیان پێ بوون، خوا سزای داون:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢٢﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ ئەم پرسیارە دەگونجێ پرسیارکردنی نکووڵیلێکردن بێ، واتە: بۆچی بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ دەبوو بە زەویدا بڕۆن، دەشگونجێ پرسیارکردنی چەسپاندن بێ، واتە: بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن، ئنجا بە زەویی دا ڕۆیشتنەکەش، دوو واتای هەن:

أ- ڕۆیشتنی کردەیی بە جەستە، کە مرۆڤ سەفەر بکات و بڕواو، بێ و بچێ و، تەماشای شوێنەوارەکان بکات.

ب- ڕۆیشتنی مەعنەویی، واتە: کتێب بخوێننەوە، بپرسن، سەرنج بدەن، ڕابمێنن، مێژوو بێننە بەر ئاوێنەی خەیاڵی خۆتان، بە زەویدا بڕۆن، چ ڕۆیشتنی جەستەیی، چ ڕۆیشتنی فیکریی.

٢)- ﴿فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبْلِهِمْ﴾، تەماشا بکەن! سەرەنجامی ئەوانەی لە پێش واندابوون، چۆن بوو؟ (مِن قَبْلِهِمْ) خوێنراویشتەوە: (مِنْ قَبْلِكُمْ) بە شێوەی دواندن (خِطَاب)، ئەوی دیکەش بە شێوەی نادیار (غائب)، هەردووکیشیان یەک واتایان هەیە.

٣)- ﴿كَانُواْ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ئەوان هێزیان زیاتر بوو و، شوێنەواریشیان بەهێزتربوو لە زەویدا، وشەی (آثَار: جَمْعُ أَثَرٍ، وَهُوَ شَكْلٌ يَرْسُمُهُ فِعْلُ شَيْءٍ آخَر)، (آثَار) کۆی (أَثَر)ە کە بریتیە لە وێنەیەک کە کردەوەی شتێکی دیکە بەجێیدەهێڵێ، بۆ وێنە: کەسێک بە ڕێیەکدا دەڕواو شوێن پێیەکان (آثَارُ الأَقْدَام)ی دەردەچن، هەروەها کەسێک پردێکی دروستکردوە، کەسێک مزگەوتێکی دروستکردوە، کەسێک قەڵایەکی دروستکردوە، لە دوای خۆی دەمێنێتەوە، بە کوردیی دەڵێین: شوێنەوار، ئێستا زانستێکی تایبەت هەیە بە ناوی (عِلْمُ الآثَار) شوێنەوارناسیی (ئارکیۆلۆژیی)، لە شوێنەوارە کۆنەکان دەکۆڵێتەوە، کە گەلانی ڕابردوو بە جێیان هێشتوون، کە دەفەرموێ: ﴿كَانُواْ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ڕاناوی (هُمْ)، (ضَمِيرُ الفَصْلِ، وَهُوَ هُنَا لِمُجَرَّدِ التَّأْكِيْد)، ڕاناوی جیاکردنەوەیەو تەنیا بۆ جەختکردنەوەیە، دەشگونجێ بۆ کورت هەڵهێنان بێ، جاری وایە ڕاناوی (فَصْل) (هُمْ ، هُوَ) بۆ کورتهەڵێنانە، بەڵام لێرەدا مەبەست کورتهەڵێنان نیە، چونکە مەبەست ئەوە نیە کە بەهێزییەکەی ئەوان، لەواندا کورتهەڵبهێنرێ، واتە: هەر ئەوان لە هەموو کەس بەهێزتر بووبن، بەڵکو مەبەست، تەنیا جەختکردنەوەیە کە ئەوانە بەهێزبوون، نەک تەنیا ئەوان بەهێزبووبن و، تەنیا ئەوانیش شوێنەواریان بووبێ،

خەڵکی دیکەش شوێنەواریان بووە، بەڵام ئەوان هێزیشیان زۆربووەو، شوێنەوارەکانیشیان لە هی کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ زیاتر بوون.

٤)- ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ﴾، خوا بە هۆی گوناهەکانیەوە گرتنی و سزای دان، ﴿ كَانُوٓاْ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، وشەی (ٱلْأَرْضِ)، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ناساندنەکە بۆ (عهد)ە، واتە: سەر زەمینەکەی خۆیان، سەرزەمینی خەڵکەکەی خۆیان، سەرزەمینە ناسراوەکە.

٥)- ﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾، لە لایەن خواوەش هیچ پارێزەرێکیان نەبوو.

﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، (مِن)ی یەکەم بۆ دەستپێکردنە (مِنْ إبْتِدَائِيَة)یە، واتە: لە لایەن خواوە، ﴿ مِن وَاقٍ ﴾، ئەم (مِن)ی دووەم، بۆ جەختکردنەوەیە، هیچ جۆرە پارێزەرێکیان نەبوون، نە کەم نە زۆر، واتە: لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچ شتێک نەیپاراستن، هیچ پارێزەرێک نەیتوانی چەپاڵەیان بداو، لە بن باڵی خۆیان بگرێ و بیانپارێزێ، ئنجا دووبارە خوا ﷻ هۆکاری ئەوە کە بۆچی فەوتاندوونی؟ ڕوون دەکاتەوە، هەرچەندە پێشتریش هەر ئاماژەی فەرمووە کە دەفەرموێ: ﴿ بِذُنُوبِهِمْ ﴾، دەفەرموێ:

٦)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوە، کە پێغەمبەرەکانیان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، ئەوانیش بێبڕوابوون.

ئەمە ڕوونکەرەوەی گوناهەکانیانە کە پێشی دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ﴾، بەهۆی گوناهەکانیانەوە گرتنی، بەڵام نازانین گوناهەکانیان چی بوون؟ بەڵام لە ئایەتی دواتردا ڕوونی دەکاتەوە: ( ذَٰلِكَ ) واتە: ئەو سزادانەی خواو ئەو گرتنەی خوا بە هۆی ئەوە بووە: ﴿ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، کە ئەوان پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانیان بۆ دەهێنان، بۆ سەلماندنی ڕاستیی خۆیان.

﴿فَكَفَرُواْ﴾، بەڵام ئەوان بێبڕوابوون، بەچی بێبڕوابوون؟ هەم بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بێبڕوابوون، هەم بە بەڵگە ڕۆشنەکان کە هێنایانن، هەم بە پەیامی خوا کە خوا پێیدا ناردبوون.

٧)- ﴿فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ﴾، خواش گرتنی، کەواتە: سزادانی بۆیان لە گۆترە نەبووەو بێ هۆکار نەبووە، ئەو گوناهانەش کە خوا بە هۆیانەوە سزای داون، لەوەدا بەرجەستە بوون، کە بێبڕوابوون بە بەڵگە ڕۆشنەکانی پێغەمبەران و، بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) خۆیان، کە خۆشیان لە زاتی خۆیاندا بەڵگەی ڕۆشن بوون و، بەو پەیمەش کە خوا پێیدا ناردوون و، بەو خوایەش کە ناردوونی ﷻ کە خواش (جَلَّ شَأْنُهُ) تێکڕی گەردوون و هەموو شتێک بەڵگەو شایەدیەتی، وەک گوتراوە:

(وفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيَةٌ ... تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ)

کەچی ئەوان هەموو ئەو بەڵگە ڕۆشنانەیان ڕەفز کردوون، گوێیان نە بۆ بانگکردنی زگماک و ناخی خۆیان گرتوە، نە بۆ عەقڵ، نە بۆ نەقڵیش کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە خواوە پەیامیان بۆ هێناون، بۆیە خو سزای داون.

٨)- ﴿إِنَّهُۥ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾، بە دڵنیایی خوا بەهێزەو، سزاشی توندە.

## سەرنجدان لە چەند شوێنەوارێکی گەلە پێشووەکان

کە دەفەرموێ: ﴿كَانُوٓاْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، دەتوانین وەک نموونە: باسی هەندێک لەو شوێنەوارانە بکەین، کە ئێستاش هەن:

١- هەڕەمەکان (أَهْرَام)، هەندێکیش بە (الأَهْرَامَات)یان کۆ دەکەنەوە:

أ/ هەڕەمەکانی میسر کە ئێستاش هەن، لە شوێنێکی بیابان دروستکراون، کە هەمووی لەو هیچ بەردو شاخ و چیای لێ نیە، کەچی هەر بەردێک لەو بەردانەی کە ئەو هەڕەمانەیان لێ دروسکراون، نیزیکەی پێنج تەنە، واتە: پێنج هەزار کیلۆ قورسە، وەک بلۆک کە چل (٤٠) چل کیلۆ قورسە، یان کەمتر، ئێستا بلۆکی بۆش کەمتریش قورسە، ئنجا ئەوان هەڵساون لەو بەردە گەورانە ئەو هەڕەمەیان دروستکردوە، کە هەر کام لەو بەردانە پێنج تەن قورسە، نەک چل کیلۆ، بەڵکو (٥٠٠٠) پێنج هەزار کیلۆ! ئایا چۆن ئەو بەردانە خراونە سەریەک و، بە چ شتێک بردوویاننە سەریەک و، ئاوا دایانناون بە ڕیز؟!

ب/ هەوای نێوان بەردەکان بەتاڵکراوە، بەجۆرێک کە بەردەکان پێکەوە نووساون و پێکەوە لکاون، وەک هەر لە ئەسڵدا پێکەوەبووبن، هەردوو شتێک کە لە پەنای یەک دادەنرێن، ئەگەر بۆشایی نێوانیان نەهێڵدرێ، پێکەوە چەسپ دەبن.

ج/ لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵدا، تەنیا لە یەک ڕۆژدا، تیشکی خۆر دەچێتە نێو ئەو هەڕەمە، ئەویش ئەو ڕۆژەیە کە ئەو فیرعەونە، ئەو هەڕەمەی بۆ کراوەتە گۆڕو تێیدا نێژراوە، واتە: لە نێو هەموو ڕۆژەکانی ساڵ دا، تیشکی خۆر لە ڕۆژێکدا، بە جۆرێک دەسووڕێ کە بێتە نێو هەڕەمەکان، ئەویش ئەو ڕۆژەیە کە ئەو فیرعەونە تێیدا مردوە، ئەوە وردەکارییە! کە پێموایە بە زەحمەت مرۆڤ دەتوانێ ئێستا شتێکی وا دروست بکات.

٢- مۆمیاکردن (التَّحْنِيط): کە هەندێک لە فیرعەونەکان چوار هەزار (٤٠٠٠) ساڵ، پێنج هەزار (٥٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بەڵکو ڕەنگە هەیانبێ زیاتریش، مۆمیا کراون، جاری وا بووە خواردنەکانیشیان و کەلوپەلەکانیشیان هەر مۆمیاکردوون و، ئەوانیش ماون وەک خۆیان، کە ئێستا لە مۆزەخانەکاندا هەن و پێشان دەدرێن، مۆمیاکردنیش ئەوەیە کە جەستەی مرۆڤێک بە جۆرێک لێبکەی و ماددەیەکی تێبکەی، بمێنێتەوەو نەگۆڕێ.

٣)- شوێنەواری (الأنْبَاط): کە لە وڵاتی ئوردنەو، شارێکیان بە تەواویی لە چیادا داتاشیوە، شارێکی شەش پاڵوویە، بە شێوەیەکی ئەندازەیی زۆر ورد، ئێستاش خەڵک دەچێت تەماشای دەکات.

٤)- شوێنەوارێکی دیکە لە (بَعْلَبَك) هەیە، شەش بەردیان لەسەریەک داناون، هەر کام لەو بەردانە کێشەکەی دوو سەد (٢٠٠) تەنە، واتە: دوو سەد هەزار (٢٠٠٠٠٠) کیلۆ، کە پێم وانیە ئێستا بەشەر هیچ بلدۆزەر و ڕافیعەیەکی وای هەبێ، بتوانێ دوو سەد تەنی پێ بەرزبکاتەوە[1].

٥)- خۆشم لە شاری (أصفهان) چەند شوێنەوارێکم دیون، یەکێکیان باس دەکەم، هەڵبەتە لە زۆر لە شارەکانی دنیادا شوێنەواری سەرسوڕهێنەر هەن، بەڵام لە شاری ئەسفەهانی ئێران مزگەوتێکی لێیە، لە حەوشەی مزگەوتەکەدا شوێنێکی بازنەیی هەیە، بە قەدەر بێژینگێکە، ئەگەر لەوێ بوەستی و قسە بکەی، لە هەموو مزگەوتەکەدا دەنگ دەداتەوە، وەک دەنگ گەورەکەر (مکبِّرة)ە، بەڵام لەوێ لابچۆ و یەک پێ لەوێ دوور بکەوەوە، دەنگەکە ئاساییە، کەچی لەوێ بوەستە، وەک (مكبِّرة) دەنگ دەداتەوە کە ئەوەش شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە.

لێرەوە دەمەوێ بگەم بە ئەنجامێک، کەواتە: هێشتنەوەی شوێنەوارەکان لە ئامانجەکانی شەریعەتە، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە کاتی خۆی تاڵیبان لە ئەفغانستان پەیکەرەکانی (بووذا)یان فەوتاندن، کە ئەوە جگە لە خراپەکردن

---

(١ ) تفسير النابلسي: ج٨، ص١٣٦.

لەگەڵ دەوری دوو ملیار بەشەر، کە (بوودا) بە شێوەیەک لە شێوەکان بە پیرۆز دەزانن، هیچ سوودێکی نەبوو، خوای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٨﴾﴾الأنعام، ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، قسەیان پێ مەڵێن، نەبادا ئەوانیش سنوور شکێنانە بە بێ زانیاریی قسە بە خوا بڵێن، ئنجا ئەگەر قسە پێ گوتن قەدەغە بێ، تێکشکاندن و تێکدان بە تەئکید قەدەغەترە، هەروەها (داعش) یش زۆر دژی شوێنەواران بوون، شوێنەوارەکانیش وە نەبێ فەوتاندبایان ئەوەی زانیبایان پارە دەکات، دەیانفرۆشت و بازرگانییان دەکرد!! هەندێ خەڵکی ئاو تەبیعەت وشک و ناحاڵیی هەیە، پێی وایە لەبەر ئەوەی بۆ وێنە: هەرەمەکان هی فیرعەونەکان بوون، یان فلان شوێن، هی گەلی عادو سەموود بووە، کە کافر بوون، یان فلان شوێن دەریاچەی مردوو هی گەلی لووط بووە، نابێ بمێنن، نەخێر! خوای پەروەردگار بۆ خۆی فەرموویەتی و فەرمانمان پێدەکات: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ﴾، ئنجا چۆن بزانین شوێنەواریان زیاتر بوون، ئەگەر شوێنەوارەکان نەمێنن؟ کەواتە: هێشتنەوەی شوێنەواری پێشینان و پارێزگاریی لێکردنیان، لە ئامانجەکانی شەریعەتەو، تەماشاکردنی شوێنەوارەکانیش جێبەجێکردنی فەرمانی خوای پەروەردگارە کە دەفەرموێ: بە زەویدا بڕۆن و شوێنەوارەکان ببینن.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕەوانەکرانی مووسا ﷺ بە نیشانەکان و بە بەڵگەوە، بۆ لای فیرعەون و هامان و قارون، لە کاردانەوەدا بڕیاردانی فیرعەون و داروودەستەکەی بۆ کوشتنی نێرەوەزەکانی بەنوو ئیسرائیل و، هێشتنەوەی ئافرەتەکان و، هەڕەشەکردنی فیرعەون بە کوشتنی مووسا ﷺ بە بیانووی تێکدانی ئایین و ئاشووب نانەوە لە وڵات داو، پەناگرتنی مووسا ﷺ بە پەروەردگاری لە هەر خۆبەزلگرێکی بێبڕوا بە ڕۆژی لێپرسینەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ۖ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٢٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سیزدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە مووسامان ڕەوانکرد بە نیشانەکانمانەوەو، بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراشەوە، کە دەفەرموێ: ئایەتەکانمان بە مووسادا ناردن، (آيات) کۆی (آيَة)یە، واتە: نیشانە (عَلامَة)، زۆرجار گوتوومانە بەپێی سیاق مانایەکەی دیارییدەکرێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا بە مانای نیشانە (علامة) دێ و دەتوانین بڵێین:

**(آيات) لە بەکارهێنانی قورئان دا، بە چوار واتایان هاتوون:**

**یەک: دیاردە گەردوونییەکان: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ﴿١٢﴾﴾ الإسراء، خۆرو مانگمان کردوون بە دوو ئایەت، دوو نیشانە.**

دوو: ڕستەكانی فەرمایشتی خوا: ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ﴿٥٨﴾ ﴾مريم.

سێ: موعجیزەكانی پێغەمبەران: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء.

چوار: هەروەها ئەو بەڵایانەش كە خوا گەلە یاخییە پێشووەكانی پێ فەوتاندوون، هەندێ جار ئەوانیش بە ئایەت ناوبراون، بەڵام بەپێی سیاق دەزانرێ كامیان مەبەستە.

لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، ئایەت هەم دەگونجێ مەبەست پێی ئەو فەرمایشتانە بێ كە خوا ناردوونی بۆ مووسا، بۆی وەحیی كردوون، هەم دەشگونجێ مەبەست پێی نۆ موعجیزەكەی بن، وەک لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾.

بەڵام: (سُلطَانٍ مُّبِين) دەگونجێ مەبەست ئەو شێوە وتوێژو قسەكردنەی مووسا ﷺ بێ لەگەڵ فیرعەوندا، كە زۆر ڕوون و ئاشكرا بووە، دەشگونجێ مەبەست پێی كۆی نۆ ئایەتەكەو حاڵ و باڵی مووسا بێ، كە خۆی لە خۆیدا نیشانەو بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرا بووە، لەسەر ڕاستیی مووسا ﷺ.

هەندێكیش گوتوویانە: (سُلطَانٍ مُّبِين)، مەبەست پێی گۆچانەكەیەتی، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست زیاتر ئەو شێوە وتووێژو ئاخاوتنە بێ كە مووسا لەگەڵ فیرعەوندا، كردوویەتی و بەڵگەكانی زۆر ڕوون و ئاشكرابوون، بۆ وێنە: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾طه، (فیرعەون) گوتی: ئەی مووسا! پەروەردگارتان كێیە (هی تۆو هاڕوون)؟ گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە كە بوونی بە هەر شتێكداوە، دوایی ڕێنماییشی كردوە، كە ئەوە بەڵگەیەكی زۆر زۆر بەهێزە لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خوا، چونكە هەموو شتێک بوونی پێدراوە، دواییش ڕێكخراوەو ڕێنمایی كراوە، كە ئەوە ئاماژەیە بە هەردوو یاسای عەقڵیی: هۆكاریی و، ڕێک و پێكیی (السَّببيَّة وَالنِّظَام).

خوا ﷻ مووسای نارد بە نیشانەكانەوەو، بە بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكراوە:

٢)- ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ ﴾، بۆ لای فیرعەون و هامان و قارِوون، پێشتریش باسمانکرد، ئەسڵەکە فیرعەون بووە، بەڵام هامان وەزیری بووە، یان ڕاوێژکاری بووە، قارِوونیش بابایەکی هەڵگەڕاوە بووە لە گەلی بەنوو ئیسرائیل: ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴿٧٦﴾ ﴾القصص، بەهۆی ئەو سەروەت و سامانەوە کە بە حەرامیی بەسەریەکەوەی ناوە، وەک چۆن ئێستا هەندێک لەو دەوڵەمەندە مشەخۆرانەی کە لە پەنای دەستەڵاتدارە حیساب بۆ خواو خەڵک نەکەرەکاندا، دەوڵەمەند دەبن و دەبنە ملیاردێر، ئێستاش هەر وایەو، کاتی خۆی قارِوونیش لە پەنای فیرعەوندا بۆتە سەروەتمەندو، ساماندار، ئەگەرنا قارِوون لە ئەصڵدا لە قیبتییەکان نەبووە.

ئـەو سـێ کوچکـە شـوومەش: فیرعـەون و هامـان و قـارِوون، لـە قورئانـدا زۆر باسـکراون، لەبەرئـەوەی فیرعـەون، ڕەمـزو هێـمای خـۆ سـەپاندنی سیاسـییەو، هامـان ڕەمـزو هێـمای هەڵخەڵەتانـدن و چەواشـەکاریی ڕاگەیاندنـەو، قارِوونیـش ڕەمـزی چەوسـاندنەوەی ئابوورییـە، کەواتـە: فیرعـەون بەرجەسـتەکەرو ڕەمـزی زوڵمـی سیاسـییەو، قـارِوون بەرجەسـتەکەرو ڕەمـزی چەوسـاندنەوەی ئابوریـیـەو، هامانیـش ڕەمـزی چەواشـەکاریی ڕاگەیاندنـە.

٣)- ﴿ فَقَالُوا۟ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴾، (یەکسەر کە مووسا چوو بۆ لایان) گوتیان: ئەوە جادووگەرێکی درۆزنە.

٤)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا ﴾، کاتێک هەقی لە لایەن ئێمەوە بۆ بردن.

٥)- ﴿ قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ﴾، گوتیان: کوڕانی ئەوانەی کە بڕوایان لەگەڵدا هێناوە، بیانکوژن.

٦)- ﴿ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ﴾، ئافرەتەکانیشیان بهێڵنەوە لە ژیاندا.

٧)- ﴿ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾، بەڵام فێڵی بێبڕوایان هەر فەوتاو و ونبوویە، بێ بەرهەمە، واتە: فێڵەکەیان ئامانجەکەی نەپێکاوە، کە بریتی بوو: لەوەی

مووسا ﷺ لەبەین بەرن و پەیامەکەی خەفە بکەن، ئنجا مادام ئامانجەکەیان نەهاتۆتە دی، بەڵێ خەڵکیان ئەزیەتداوەو، توانییان نێرینەکانی بەنوو ئیسرائیل سەر ببڕن و نافرەتەکان بهێڵنەوە، بەڵام مەبەستیان ئەوەبوو کە مووسا ﷺ ئامانجەکەی نەپێکێ و، نەتوانێ گەلەکەی دەرباز بکات لە ژێر چنگی فیرعەون، کەچی ئەو فێڵ و پیلانەیان بێ ئاکام بوو و، مووساش ئامانجەکەی خۆی هێنایە دی.

ئێمە بەسەرهاتی مووساو فیرعەونمان لە سوورەتی (الأعراف)و، لە سوورەتی (القصص)دا بە درێژی باسکردوە، هەروەها لە هەر کام لە سوورەتەکانی (یونس) و (طه)و (الشعراء)و (النمل)یشدا تارادەیەک قسەمان لەبارەوە کردوە، بۆیە لێرە هەروا بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین و ناچینە نێو وردەکارییەکانەوە.

٨)- ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ﴾، فیرعەون گوتی: لێمگەڕێن با مووسا بکوژم، (ذَرُونِيٓ) واتە: (خَلُّونِي) یان (دَعُونِي) یان (أتركُونِي) لێمگەڕێن، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خەڵکێک دەستیان گرتبێ و نەیهێڵن، مووسا بکوژێ، بێگومان کەس دەستی فیرعەونی نەگرتوەو، کەسیش دەستی فیرعەونی بۆ نەگیراوە، بەڵام وەک چۆن کەسێک لە بەرانبەر کەسێکدا هەڕەشە دەکات و، خۆی ڕادەپسکێنێ و دەڵێ: مەمگرن، هەرچەندە هیچی پێ لەگەڵ ناکرێ و، دەیەوێ بەرانبەرەکەی بترسێنێ، یان خەڵک وا چەواشە بکات کە لە بەرانبەریدا دەستە پاچەو، بێ دەستەڵات نیە، ئەگەر بێت و نەیگرن، وادەکات کە وابچێ!.

٩)- ﴿وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓ﴾، با ئەویش لە پەروەردگاری وەپاڕێ، ئەم (ل)ەی (وَلۡيَدۡعُ) (لَامُ الأمْر)ە، بۆ فەرمانکردنە، کە لێرەدا بەکارهێنراوە لە یەکسان کردن و گرنگیی پێنەدان دا، واتە: لێمگەڕێن با بیکوژم، ئنجا با ئەویش یەکسەر لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە، تاکو خوا ئەو پەروەردگارەی مووسا دەیپەرستێ و، دەیەوێ ئێمەش هەر ئەو بپەرستین و، من ناپەرستێ وەک پەروەردگاری ئێوە، بزانین داخۆ چی بۆ دەکات؟ ئنجا دوایی فیرعەون پاساوی هەڵوێستەکەی خۆی دەداتەوە، کە بۆچی دەیەوێ مووسا بکوژێ؟ بۆچی دەیەوێ دەستی بە خوێنی مووسا سوور بێ؟

١٠)- ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ﴾، من دەترسێم ئایین و بەرنامەكەتان بگۆڕێ.

١١)- ﴿أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ﴾، یان: لە زەویدا (واتە: سەر زەوی میسردا) ناشووب و ئاژاوە دەربخات و بەرپا بكات، (أل)ی (ٱلۡأَرۡضِ) بۆ ناساندن (تعريف)ەو ناساندنەكەش بۆ (عهد)ە واتە: دەترسێم كە لەسەر زەمینەكەدا كە سەر زەمینی میسرە، ناشووب و ئاژاوە بەرپا بكات، كە دەڵێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ﴾، (الخَوْف هُنَا: الإِشْفَاق) واتە: من مەترسییم هەیەو پەرۆشی ئێوەمە كە دینەكەتان لێ تێكبدات، ئەگەرنا ترس (خوف) لێرەدا بە مانای ترسی ڕاستەقینە نیە، واتە: من پەرۆشی ئێوەمە كە ئایینەكەتان لێ تێكبدات، یاخود ژینتان تێكبدات، (تَبْدِيْل)یش كە دەفەرموێ: ﴿أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ﴾، (تَعْوِيْضُ الشَّيءِ بِغَيْرِهِ) ئەوەیە كە شتێك لابەری و شتێكی دیكە لە جێی دابنێی، قەرەبوویەكی دیكەی لە جێ دابنێی.

وشەی: ﴿أَوۡ أَن يُظۡهِرَ﴾، خوێنراویشەتەوە: (أَو أَنْ يَظْهَرَ) كە ئەو كاتە دەبێ ئاوابێ، (أَو أَنْ يَظْهَرَ فِي الأَرْضِ الفَسَادُ)، یاخود خراپەو ناشووب لە زەویدا دەربكەوێ، بەهۆی ئەو ئایینەوە كە مووسا ﷺ هێناویەتی، كەواتە: فیرعەون دوو پاساو دێنێتەوە بۆ كوشتنی مووسا:

یەكەم: كە پەرۆشی خەڵكەكەیەتی دینەكەیان لێ تێكبچێ و، بە دینێكی دیكە بگۆڕرێ، دینەكەشیان بریتیی بووە لە فیرعەون پەرستیی!

دووەم: یاخود ژینەكەیان تێكبدات و ناشووب و ئاژاوەو خراپەی تێدا پەیدا بكات، لەسەر زەوی، ژینەكەشیان بریتی بووە لە كۆیلایەتیی.

ئنجا هەموو فیرعەونەكانی سەر زەوی لە ڕابردووداو ئێستاو لە داهاتووشدا، كاتێك دەیانەوێ سزای ئەوانە بدەن و پەلاماری ئەوانە بدەن، كە بانگی هەق لە خواوە بە گوێی خەڵكدا دەدەن، هەڕەشەكەی خۆیان و زەبر و زەنگەكەی خۆیان هەر بەوە پاساو دەدەنەوە كە خەڵكینە! ئێمە پەرۆشی دینی ئێوەمانەو پەرۆشی ژینی ئێوەمانە! كە لەڕاستییدا ئەو خەڵكەی لە بن دەستی فیرعەونەكان دایە، نە دینی

هەیـەو، نـە ژینـی هەیـە، ئایینیـان نیـە بـە مانـا بـاوو عورفییەکـەی کـە خـوا بپەرسـتن، چونکـە دەبـێ فیرعـەون بپەرسـتن، نەژینیشـیان هەیـە، چونکـە ژینیـان کۆیلایەتییـە، دینیشـیان بـت پەرستیی و فیرعـەون پەرستیی و شـت پەرستییە، بـەڵام فیرعـەون داڵێ: مـن مووسـا دەکـوژم لەبـەر ئـەوەی پەیامـی هەقـی بـۆ هێنـاون و، هاتـوە ئێـوە ڕزگارو دەربـاز بـکات لـە ژێـر چەکمـەو پۆسـتاڵی مـن! ناچـێ نـاوا بڵـێ، هـەر دەڵـێ: بۆیـە مووسـا دەکـوژم، چونکـە ئەگـەر بانگەوازەکـەی ئەو سـەر بگـرێ، دینەکەشـتان تێکدەچێ و ژینەکەشـتان تێکدەچـێ، بـۆ ئـەوەی خەڵکـی لـە دژ بورووژێنـێ!

ئنجـا ئـەوە عـادەتی هەمـوو فیرعەونەکانـە، ئێسـتاش تەماشـا بکـە، بەڵـێ جـار جـار خەڵکێکـی مسـوڵمان، ئەوانـەی کار بـۆ ئیسـلام دەکـەن، تێدەپەڕێنـن و کـورتی دێنـن و، هەڵـەو پەڵەیـان هەیـە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا هەمـوو ئەوانـەی دەیانـەوێ خەڵـک بێننـەوە بـۆ بـاوەڕی ئیسـلام، هیـچ کامیـان نایـەوێ دینـی خەڵـک تێکبـدات و، ژینـی خەڵـک تێکبـدات، بەڵکـو ئەوانـەی دیـن و ژینـی خەڵکیـان تێکـداوە، ئـەو حوکمڕانـە خۆسـەپێنانەن کـە خەڵـک بـە کۆیلـەی خۆیـان دەزانـن، بـەڵام ئـەو کەسـەی دەڵـێ: وەرن خەڵکینـە! بـا هەموومـان بەنـدەی خوابیـن و پێکـەوە بـراو تەبـا بیـن، ئایـا ژیـن بۆچـی بـەوە تێکدەچـێ! هەروەهـا ئـەوە دینـی ڕاسـتەقینەیە کـە هەموومـان خواپەرسـت بیـن و، هەموومـان بەنـدەی خـوا بیـن، پێکـەوە بـراو تەبـا بیـن.

١٢)- ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ ﴾، مووساش گوتی: من پەنادەگرم بە پەروەردگاری خۆم و پەروەرگاری ئێوەش، لە هەر خۆ بەزلگرێک.

١٣)- ﴿ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴾، کە بڕوای بە ڕۆژی لێپرسینەوە نیە، کەواتە: خۆ بەزلگرییەکەی هەڵقوڵاوی بێ ئیمانییەکەیەتی، لەبەر ئەوەی بڕوای بە ڕۆژی لێپرسینەوە نیە، بڕوای بەو ڕۆژە نیە، کە بچێتەوە خزمەت خواو خوا لێی بپرسێتەوە، ئنجا یان بڕوای بە خواش هەر نیە، یان بەس بڕوای بە ڕۆژی دوایی و، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نیە، بۆیە خۆ بە زلگرن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەرگرییکردنێکی جوامێرانەو مەردانەی پیاوێکی بڕواداری ئیمانی خۆشێرەوە، لە مووسا، (بەرگرییکردنی لە مووسا ﷺ)، کە چۆن پیاوێک دەکوژن هەر لەبەرئەوەی خوا بە پەروەردگاری خۆی دەزانێ! بەڵگە ڕۆشنەکانیشی بۆ هێناون؟ هەروەها ئامۆژگاریی کردنی خەڵکەکەی، کە بە باڵادەستییان بوغڕا نەبن و، لە کەوڵی خۆیان دەرنەچن، بەڵام قسە پێبڕینی فیرعەون، فیرعەون قسەی پێدەبڕێ و دەشڵێ: جگە لە قسەی خۆی بواری هیچ کەسی دیکە نادات و، هەرچی ئەویش دەیڵێ، هەمووی هەر سەر ڕاستییەو، هەمووی هەر مایەی بە مراد گەیشتن و بە ئامانج گەیشتنە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَـٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَـٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ﴾، پیاوێکی بڕوادار لە شوێنکەوتووانی فیرعەون، دەستەو دایەرەی فیرعەون، کە بڕوایەکەی خۆی دەشاردەوە واتە: تەقییەی دەکرد، کە ئەمە یەکێکە لە بەڵگەکانی تەقییە، لە شوێنی خۆیدا.

ئنجا ئایا ئەو پیاوە بڕوادارەی لە دەست و دایەرەی فیرعەون، کە ئیمانەکەی خۆی دەشاردەوە، کێ بووە؟ هەندێک گوتوویانە: ناوی (حَزْقِيل) بووە، هەندێک

گوتوویانـە: نـاوی (حَبِیْـب) بـووە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا هیـچ بەڵگەیەکـی دڵنیاکـەر لـەو بـارەوە نیـە، شـایانی باسـە: کـە ئـەم بەسـەرهاتە لـە (پەیـمانی کـۆن)دا نەهاتـوە.

لێرە خوا ﷻ بە چوار سیفەتان، ئەو پیاوە پێناسە دەکات:

﴿رَجُلٌ مُّؤۡمِنٌ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ﴾:

١- پیاو بووەو ئافرەت نەبووە.

٢- بڕوادار بووە.

٣- لە دەستەو دایەرەی فیرعەون و شوێنکەوتووانی فیرعەون بووە.

٤- ئیمانەکەی خۆیشی پەنهان کردوەو، تاکو ئەو کاتە نەیانزانیوە، بڕوادارە، بەڵام وەک گوتراوە: «تیغی ڕەسەن خۆی لە کالاندا ڕاناگرێ»، لە کاتێکدا ئەوان خەریکن مووسا بکوژن، ئەگەر ئێستا ئیمانەکەی خۆی ئاشکرا نەکات و، کارێکی خێری کە لە دەست دێت بەرگرییەک کە دەیتوانێ لە مووسای نەکات، ئەدی کەی ئیمانەکەی خۆی ئاشکرا دەکات؟ دوای کوشتنی مووسا ﷺ گریمان، ئەگەر هەڕەشەکەی فیرعەون سەری گرتبایە، چی دەکرێ؟ تۆممەت ئەگەر ئیمانی نەما، وەک جەستەیە کە سەری نامێنێ و هیچی پێناکرێ! بۆیە دێتە قسە دەڵێ:

٢)- ﴿أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ﴾، ئایا پیاوێک دەکوژن هەر لەبەر ئەوەی دەڵێ: پەروەردگارم خوایە! ﴿أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ﴾، واتە: (لأَنْ يَقُوْل) بەهۆی ئەوەوە کە دەڵێ: پەروەردگارم خوایە، هەر لەسەر ئەوە دەیکوژن! واتە: تەنیا خوا پەروەردگارە، ئایا لەسەر ئەو قسە هەقە دەیکوژن؟ کارەکەتان زۆر کارێکی بێ جێیە، چونکە پرسیارکردنەکەی کە دەڵێ: ﴿أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ﴾، پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: شتێکی زۆر بێ جێ دەکەن، ڕەخنەیان لێ دەگرێ.

٣)- ﴿وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡ﴾، بەڵگە ڕۆشنەکانیشی لە پەروەردگاریەوە بۆ هێناون، (البَيِّنَات) کۆی (بيِّنة)یە، واتە: بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، کە مەبەست پێی

نۆ موعجیزەکانن: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو تاخاوتن و وتوێژە بێ، کە مووسا ﷺ زۆر بە بەڵگەی بەهێزەوە لەگەڵ فیرعەوندا قسەی کردوە.

٤)- ﴿ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ﴾، ئەگەر (گریمان) درۆکاریش بێ، زیانی درۆیەکەی بۆ خۆیەتی.

ئەو پیاوە بڕواداره دێنێ بۆیان شیدەکاتەوەو دەڵێ: ئەگەر مووسا ﷺ هەر لەبەر ئەوەی دەڵێ: پەروەردگارم خوایە، بیکوژن، لە حاڵێک کە بەڵگە ڕۆشنەکانیشی بۆ هێناون، حاڵی لە دوو ئەگەر بەدەر نیە:

أ- ئەگەر درۆ بکات، ئەوە درۆیەکەی بە زیانی خۆی تەواو دەبێ، واتە: ئەگەر درۆ بکات دوایی درۆیەکەی لێ کەشف دەبێ، مەیدانی درۆ کورتە، لێی گەڕێن و مۆڵەتی بدەن، بزانین داخۆ چی دەڵێ؟

٥)- ﴿ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ﴾،

ب- ئەگەر ڕاستگۆش بێ (درۆکەر نەبێ، بەڵکو ڕاست بێ و ڕاست بکات)، بەلای کەمەوە هەندێک لەوەی کە گفتتان پێدەداو، هەڕەشەتان پێی لێدەکات، تووشتان دێ، ئەگەر هەمووشتان تووش نەیەت، هەندێکتان تووش دێ، واتە: لە سەرەتاوە هەندێکی دەبینن، ئەگەر هەمووشی نەبینن، یانی: ئەگەر درۆ بکات، ئەوە هیچ زیانێکتان پێ ناگات و هەر بۆ خۆی زیانبار دەبێ، ئەگەر ڕاستیش بکات، ئێوە زیانێکی زۆر گەورە دەکەن، ئەگەر ڕاست بکات، پێغەمبەری خوا بێ، کە دەڵێ: ئەگەر بڕوا نەهێنن، خوا تووشی بەڵاتان دەکات، ئەگەر بەڵایەکە کە هەڕەشەتان پێ لێدەکات، هەموویشی نەبینن، بە لای کەمەوە سەرەتایەکەی دەبینن بۆیەش دەفەرموێ: هەندێکی (بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ) لەبەر ئەوە نیە لە گوماندابێ لە مووسا ﷺ، بەڵام ئەو هەڕەشەیەی کە مووسا کردوویەتی لە فیرعەون و دارو دەستەکەی، هەموو هەڕەشەکەیان نەبینیوە، بەڵکو سەرەتایەکەیان بینیوە، کە خنکانە لە دەریای سووردا، دواییش لە جیهانی بەرزەخدا سزا دەدرێن و، دوایی لە قیامەتیش هەر سزا دەدرێن، بۆیە فەرموویەتی: هەندێکی.

هەڵبەتە بۆیەش هەردوو ئەگەرەکەی هێناون، (درۆ بکات، یان ڕاست بکات) تاکو گومانی ئەوەی پێ نەبەن کە بڕوای هێناوە، چونکە جارێ نایەوێ بە بڕوادار دەربکەوێ، جارێ دەیەوێ بڵێ: منیش هەر لە خۆتانم، چونکە ئیمانەکەی شاردۆتەوە، منیش هەر لە خۆتانم، بەڵام وەرن با بە ئینصافەوە تەماشا بکەین، ئەو کابرایە دەڵێ: من نوێنەری خوام، ئنجا ئایا بەس لەبەر ئەوەی دەڵێ: پەروەردگارم خوایە، دەیکوژن؟ واتە: لەسەر ئازادی بیروڕا دەیکوژن؟ پاشان چەندان بەڵگەشی بۆ هێناون، دواییش حاڵی لە دوو ئەگەران بەدەر نیە، یان ڕاست دەکات، یان درۆ دەکات، ئەگەر درۆ بکات، خۆی زیانبارەو، ئەگەر ڕاستیش بکات، زۆر خەتەرە، ئەگەر قسەکانی ڕاست بن، ئێوە زەرەرێکی گەورە دەکەن کەواتە: مەیکوژن و لێی گەڕێن، مەبەستی ئەوە بووە.

٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا ڕێنمایی کەسێک ناکات، یاخود کەسێک ڕاستە ڕێ ناکات، کە زێدەڕۆییکاری زۆر درۆزن بێت، ئەم قسەیەش دوو ڕووی هەن، واتە: ئەگەر مووسا بڵێ: نوێنەرو پێغەمبەری خوام و ئەویش نەبێ، مانای وایە زۆر درۆزنەو، زۆری تێپەڕاندوە، خواش ڕاستە ڕێی ناکات، قسەکەی ئەو ڕووەی هەیە، هەروەها ئەو ڕووەشی هەیە کە: ئەی فیرعەون! تۆ کە هەر لە خۆڕا خەڵکی بکوژی، لەسەر ئەوەی دەڵێ: پەروەردگارم خوایە، ئنجا بە درۆی دابنێی، مانای وایە: زۆر زێدەڕۆییکاری و زۆریش درۆزنی، خواش ڕاستەڕێت ناکات، قسەکەی هەردووک ڕووی هەن.

٧)- ﴿ يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەی خەڵکەکەم! ئەمڕۆ ئێوە حوکمڕانییتان هەیەو دەسترۆیشتوون لە زەویداو باڵا دەستن، بەڵام بەوە بوغڕا مەبن و لە خۆتان بایی مەبن.

٨)- ﴿ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ﴾، ئایا کێ لە سزای خوا دەربازمان دەکات، ئەگەر سزای خوامان بۆ هات؟ کە دەفەرموێ: ﴿ يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ ﴾، (يَنْصُرُنَا)

مانای (يُنقِذُنَا)، (دەربازمان دەكات، قوتارمان دەكات)ی خراوەتە تێو، چونكە بە پیتی (مِنْ) بەركاری خواستوە، ئایا كێ دەربازمان دەكات لە سزای خوا، لە تۆڵەی خوا؟.

٩)- ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾، فیرعەون (قسەی پێبڕی) گوتی: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم: كە خۆم بەڕاستی دەزانم، هەرچی كە منیش ئێوەی بۆ ڕێنمایی دەكەم هەر سەر ڕاستییەو بە ئاكام و مراد گەیشتنە، ﴿مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ﴾، (مَا أَجْعَلُكُمْ رَائِينَ إِلَّا مَا أَرَاهُ لِنَفْسِي، أَيْ: مَا أُشِيرُ عَلَيْكُمْ بِأَنْ تَعْتَقِدُوا إِلَّا مَا أَعْتَقِدُهُ)، واتە: واتان لێناكەم ببینن، جگە لەوەی كە خۆم بۆ خۆمی دەبینم، واتە: هیچ شتێكتان پێ ناڵێم كە بڕوای پێبێنن، جگە لەوەی كە من بڕوام پێیەتی.

ئا ئەوە لۆژیكی فیرعەونانەیە! كە دەبێ تەنیا وەک من بیر بكەنەوە، ئەوەی من بە چاكی دەزانم، ئێوەش ئەوە بە چاک بزانن، من چی دەبینم، ئێوەش هەر ئەوە ببینن، هەرچیش دەیڵێم، هەمووی ڕاستە، نەیگوتوە: دەگونجێ ڕاست بێ، دەگونجێ بیپێكم یان نەیپێكم، نا، هەرچی من دەیڵێم: هەمووی ڕاستەو هەمووی ئەوپەڕی سەر ڕاستیی تێدایە!!

كە دیارە ئەمە قسە پێبڕینی فیرعەونە بەو پیاوە بڕوادارە، بە بەڵگەی ئەوە كە بە (و)ی بادانەوە (عطف) بانەدراوەتەوەو یەكسەر: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ﴾، بەڵام ئەگەر فیرعەون لە نۆرەی خۆیدا قسەی كردبایە، خوا دەیفەرموو: (وَقَالَ فِرْعَوْن)، بەڵام لێرەدا دەڵێ: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ﴾، واتە: لە نێو قسەكانی ئەودا، قسەكەی كردوە.

لە كۆتایی ئەم مەسەلەیەدا، با ئەو دەقە بێنین:

{عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: قِيلَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَخْبِرْنَا بِأَشَدِّ شَيْءٍ صَنَعَهُ الْمُشْرِكُونَ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ، إِذْ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ، فَأَخَذَ بِمَنْكِبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَلَوَى ثَوْبَهُ فِي عُنُقِهِ فَخَنَقَهُ خَنْقًا شَدِيدًا، فَأَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ بِمَنْكِبَيْهِ، وَدَفَعَهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: ﴿أَتَقْتُلُونَ

رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾) (أخرجه البُخاري: ٤٨١٥).

واتـە: عـورووەی کـوڕی زوبەیـر دەڵـێ: بـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـری کـوڕی عـاص (خـوا لـە هەموویـان ڕازیبـێ) گوتـرا: هەواڵـمان پێبـدە بـە سـەختترین شـت کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان بـە پێغەمبـەری خۆیـان کردبـێ ﷺ لـە مەککـە، قورسـترین شـت چـی بـوو؟ گـوتی: ڕۆژێـک پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە حەوشـەی کەعبـەدا (لـە پەنـای کەعبـەدا) نوێـژی دەکـرد، عوقبـەی کـوڕی موعەیـط هـات شـانی پێغەمبـەری گـرت ﷺ و عەبایەکـەی کـە لەسـەری بـوو، زۆر لـە مـلی تونـد کـردو بـە توندیـی پشـووی پـێ تەنـگ کـرد، ئەبـوو بەکریـش لـەوێ بـوو (خـوا لێـی ڕازی بـێ) هـات هـەردوو شـانی عوقبـەی گرتـن و پاڵـی پێوەنـاو لـە پێغەمبـەری دوور خسـتەوە ﷺ، ئنجـا گـوتی: ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾، ئایـا پیاوێـک دەکـوژن هـەر لەبـەر ئـەوەی دەڵـێ: پـەروەردگارم خوایـە؟

بۆیـە لـە هەندێـک شـوێنەواراندا هاتـوە، گوتـراوە: ئەبووبەکـر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) لـە چەنـدان پیـاوی وەک ئـەو پیـاوە بـڕوادارە، کـە ئیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوە، پلەکـەی گەورەتـرە، ئـەو ئیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوەو بـەس قسـەی کـردوە، بـەڵام ئەبـوو بەکـر بـە کـردەوە چـووە کابـرای پـاڵ پێوەنـاوەو ئیمانەکـەی خـۆشی نەشـاردۆتەوە، هەمـوو کـەس دەزانـێ، کـە ئەبـوو بەکـری صیدیـق هاوەڵێـک و بڕوادارێکـی زۆر دڵسـۆز بـووە لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا ﷺ .

**مەسەلەی چوارەم:**

**هۆشـداریی دانی پیـاوە بڕوادارەکـە بـە گەلەکـەی، بـەوە کـە مەترسـیی هەمـان چارەنـووسی شـوومی گەلـەکانی نـووح و گـەلی عـادو گـەلی سـەموودو .. هتـد، هەروەهـا مەترسـیی ڕۆژی یەکـدی بانگکـردنی مرۆڤـەکانی، لێیـان هەیـە کـە ڕۆژی قیامەتـە:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ ﴾، ئەو کەسەی بڕوای هێنابوو گوتی: هەر لەسەر بەرگرییکردنەکەی لە مووسا ﷺ بەردەوام دەبێ و، کە فیرعەونیش قسەی پێ دەبڕێ: ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، وەک پێشێ باسمانکرد، ئەو پیاوە بڕوادارە ئاوڕ لە قسەکەی فیرعەون ناداتەوەو، گوێی پێنادات، قسەی لەسەر بکات، بەڵکو وەک ئەو قسەیە هەر نەکرابێ، لەسەر قسەی خۆی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

٢)- ﴿ يَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴾، ئەی گەلەکەم! ئەی خەڵکەکەم! من مەترسیی وێنەی ڕۆژی کۆمەڵەکانم لێتان هەیە، واتە: ڕۆژێک کە پێڕو تاقمە کافرەکان تێیدا فەوتاون، وێنەی ڕۆژێکی ئاوا بۆ ئێوە پێشبینیی دەکەم، مەترسییم هەیە هەمان بەڵا کە تووشی گەلە پێشووەکان و گەلە فەوتاوە سەر بە فەتارەت چووەکان بووە، گەلە یاخیی و هەڵگەڕاوەکان لە خوا ﷻو، لە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)

و پەیامەکانی خوا، دەترسێم هەمان بەڵاتان بەسەر بێ، لەبەر ئەوەی هەمان هەڵوێستی ئەوان دەنوێنن.

(يَوْمَ الأَحْزَابِ: جِنْسُ اليَوْمَ الَّذِي هَلَكَ فِيْهِ الفِئَاتُ الكَافِرَةُ)، واتە: (يَوْمِ الأَحْزَاب) مەبەست پێی کۆی ئەو ڕۆژانەیە کە کۆمەڵەکانی کافران تێیاندا فەوتاون، دوایی چەند وێنەیەک دێنێتەوە، لەو گەلە فەوتاوانە.

٣)- ﴿ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ﴾، وەک عادەتی گەلی نووح و، عادو، سەموود، (الدَّأْبُ: العَادَةُ وَالعَمَلُ الَّذِي يَدْأَبُ عَلَيْهِ عَامِلُهُ)، (دَأب) نەرێتێک و کردەوەیەکە، بکەرەکەی لە سەری بەردەوام دەبێت، واتە: وەک نەرێتی گەلی نووح کە بێبڕوابوون بە نووح ﷺو، گەلی عاد، کە بێبڕوابوون بە هوود ﷺو، گەلی سەموود، کە بێبڕوابوون بە صالیح ﷺ.

٤)- ﴿ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ ﴾، هەروەها گەلانی دیکە دوای ئەوان، کە بێبڕوابوون بە پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، عادەت و نەرێتی ئەوان چۆن بوو؟ ئەوەبوو کە سەر کەش و ملهوڕ و یاخیبوون، سەرەنجام تووشی سزادران بوون، من مەترسیی ئەوەم هەیە، ئێوەش لەسەر هەمان ڕێچکەو نەرێتی ئەوان بڕۆن و، هەمان سزاو بەڵاشتان بە ملدابێ، کە بە ملی ئەواندا هاتوە.

٥)- ﴿ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴾، بە دڵنیایی خواش هیچ جۆرە ستەمێکی بۆ بەندەکانی ناوێ، بەڵکو بە دادگەریی بێ سنووری خۆی ﷻ، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، کەواتە: ئەوانەی بەو شێوەیە سزادراون و سەریان بە فەتارەت چووە، خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ۝٧٠ ﴾التوبة، واتە: خوا ستەمی لێنەدەکردن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴾، (قَصِرَ نَفِي إِرَادَةِ الظُّلْمِ عَلَى اللهِ)، (خوا ﷻ هیچ جۆرە ستەمێک لە بەندەکانی ناکات)، لێرەدا لابردنی ویستنی

ستەم لە خوادا کورت هەڵێنراوە، واتە: بەس خوایە کە هیچ جۆرە ستەمێکی بۆ بەندەکانی ناوێ، ئنجا ئەگەر نەیەوێ، دیارە ناشیکات.

ئنجا دووبارەی دەکاتەوە:

٦)- دووبارەی دەکاتەوە: ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ﴾، هەروەها ئەی خەڵکەکەم! من مەترسیی ڕۆژی یەکدی بانگکردنم لێتان هەیە، (يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ)، خوێنراویشەتەوە: (يَوْمَ التَّنَادِي)، بە (ي)ش خوێنراوەتەوەو بە ژێر (كسرة)یش خوێنراوەتەوە، جێی سەرنج ئەوەیە کە لێرەدا ئەو پیاوە بڕوادارە چەند جارێک (وَيَٰقَوۡمِ)ی دووبارە دەکاتەوە، ئەی گەلەکەم، ئەی خەڵکەکەم، ئەی کۆمەڵەکەم، واتە، منیش یەکێکم لە خۆتان، بەرژەوەندیی ئێوە هی منیشە، زیان و خراپەی ئێوە هی منیشە، کە دەفەرموێ: من مەترسیی ڕۆژی یەکدی بانگکردنم لێتان هەیە، یەکێک لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی: (يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ)، یان (يَوْمَ التَّنَادِي)یە، ڕۆژی یەکدی بانگکردن، لەبەر ئەوەی تێیدا خەڵک بانگی یەکدی دەکات و فریشتەکان بانگی مرۆڤەکان دەکەن، ئنجا ئەهلی بەهەشت بانگی ئەهلی دۆزەخ دەکەن، ئەهلی دۆزەخ بانگی ئەهلی بەهەشت دەکەن، ئەهلی ئەعراف قسە لەگەڵ هەردووک لایاندا دەکەن، ڕۆژێکە زۆر یەکدی بانگکردنی تێدا هەیە، بۆیەش یەکێکە لە ناوەکانی، ئنجا کە لێرە دەفەرموێ: من لە ڕۆژی یەکدی بانگکردن مەترسییم لێتان هەیە کەواتە: ئێوە ئێستا وەڵامی بانگکردنی من بدەنەوە، نەوەک ڕۆژی یەکدی بانگکردن پەشێمان ببنەوە.

٧)- ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ﴾، ئەو ڕۆژەی بە پشتتێکردنەوە ڕادەکەن، (تُوَلُّونَ) ڕادەکەن، (مُدۡبِرِينَ) پشتتێکردنانە، پشت هەڵکردنانە، یان: هەردووکیان یەک واتان، بۆیە گوتراوە: (مُدْبِرِيْنَ: حَالٌ مُؤَكِّدَةٌ لِعَامِلِهَا)، ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ﴾، ڕا دەکەن، ڕوو وەردەگێڕن لە حاڵێکدا کە پشتتان کردۆتە ئەوەی لێی ڕادەکەن، واتە: لێی ڕادەکەن بە پشتتێکردنەوە، یاخود: (أَي: تُعْرِضُونَ وَتَهْرُبُونَ مِنْ دُونِ التِفَاتٍ بَلْ قَهْقَرِيّاً)، ئەوەش واتایەکی دیکەیە: کاتێک مەترسییەکی گەورەت ڕووبەڕوو دەبێ، کە تۆ بەرەو ڕووی دەچی و ئەو مەترسییە بەرەو ڕووت دێ، ئەگەر زۆر بە پەلە ڕابکەی ناوڕ نادەیەوە، پشت بکەیە مەترسییەکە

ئنجا ڕابکەی، بەڵکو هەر پاشەو پاش دەکشێیەوە، ئەوە پێی دەگوترێ: (**الرُّجُوعُ قَهْقَرِيّاً**) واتە: کاتێک پاشەو پاش بکشێتەوە، نەک ڕوو وەرسووڕێنێ، پشت بکاتە مەترسییەکە، ئنجا ڕابکات، بەڵکو هەر ڕێک دەکشێتەوە لە شوێنی خۆیەوە پاشەو پاش.

٨)- ﴿مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾، لەو ڕۆژەدا لە لایەن خواوە، هیچ پارێزەرێکتان نیە، یاخود هیچ پارێزەرێکتان نیە لە سزای خوا، ﴿مِّنَ اللَّهِ﴾، واتە: (**مِنْ عِقَابِ اللهِ مِنْ عَاصِمٍ**)، (**العَاصِمُ: المَانِعُ وَالحَافِظُ**)، دیارە: ﴿مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ﴾، (مِّنَ)ی یەکەم پێی دەگوترێ: (مِّنَ)ی دەستپێک، (**مِنْ الإبْتِدَائِيَة**)، واتە: لە بەرانبەر سزای خوادا نیتانە: ﴿مِنْ عَاصِمٍ﴾، هیچ جۆرە پارێزەرێک (مِنْ)ی دووەم زیادکراوە بۆ جەخت کردنەوەی لابردن (**مَزِيْدَةٌ لِتَأْكِيدِ النَّفْيِ**) واتە: هیچ جۆرە پارێزەرێک نە کەم نە زۆر چنگتان ناکەوێ، کە سزاو جەزرەبەی خوای پەروەردگارتان لێ دوربخاتەوەو بتانپارێزێ.

٩)- ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾، هەر کەسێکیش خوا سەرگەردان و گومڕای بکات، هیچ جۆرە ڕێنماییکارێکی نیە.

﴿فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾، ﴿مِنْ هَادٍ﴾، دیسان ئەم (مِنْ)ە، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، ئەگەرنا دەیتوانی بفەرموێ: (**مَا لَهُ هَادٍ**)، بەڵام ﴿فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾، واتە: هیچ جۆرە ڕێنماییکارێکی نیە، هەر لە سەرەتای ڕێنماییکارییەوە تاکو کۆتایی.

لێرە دیارە چەند قسەیەک کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، قرتێنراون، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾، (**أي: هَذَا إِرْشَادٌ لَكُمْ، فَإِنْ هَدَاكُمُ اللهُ، عَمِلْتُمْ بِهِ، وَإِنْ أَعْرَضْتُمْ عَنْهُ، فَذَلِكَ لِأَنَّ اللهَ أَضَلَّكُم، وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ**)، واتە: ئەمە ڕێنمایی خوایە، ئنجا ئەگەر خوا ڕاستە ڕێی کردن بۆ ڕێنمایی خۆی و، خستنیە سەر ئەو ڕاستە ڕێیە کە پێشانتان دەدات، ئێوەش کارتان پێی کرد، (ئەوە خۆشبەختن)، بەڵام ئەگەر پشتتان تێکرد، ئەوە بە هۆی ئەوەوەیە خوا گومڕای کردوون، کەسێکیش خوا گومڕای بکات، کەس ناتوانێ ڕێنمایی بکات.

هەڵبەتە وەک جاری دیکەش گوتوومانە: خوا ﷻ نە لە گۆترە کەس گومڕا دەکات، نە لە گۆترەش کەس دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، بێگومان خوا ڕێنمایی مرۆڤەکان هەمووان دەکات، بەڵام ئەوانەی ڕێنمایی خوا وەرناگرن، خۆیان دەبنە هۆی سەرگەردانییان، بەڵام بۆیە خوا ﷻ پاڵیدەداتە لای خۆی، چونکە بە پێی سیستمێک کە خوا دایناوە، ئەو پرۆسەیە دێتە دی.

پاشان کەسێکیش کە ڕێنمایی خوا قبووڵ دەکات و وەریدەگرێ، ئەوە مانای وایە ڕاستە ڕێ دەبێ، دیارە ئەویش هەر بە ویستی ڕەهای خوایە، بەڵام ئەو مرۆڤە خۆی ماناو ڕێنمایی خوای هەڵبژاردوە، هەر بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾﴾إبراهيم، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، ئەدی کێ هیدایەت دەدات؟ لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾﴾الرعد، کەسێک کە لە ناخەوە بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، خوا ئەوانە ڕاستەڕێ دەکات، ئەگەرنا وەک ڕێنمایی گشتیی، خوا ڕێنمایی هەموویانی کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ ﴿١٧﴾﴾فصلت، واتە: ئێمە ڕێنمایی گەلی سەموودمان کرد بوو: ﴿فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴿١٧﴾﴾فصلت، بەڵام کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، مانای وایە خوا ڕێنمایەکەی بۆ هەمووان خستۆتە ڕوو، بەڵام ڕاستەڕێ کردنەکە، تایبەتە بەوانەوە کە ڕێنماییەکەی خوا وەردەگرن، ئەوەی ڕێنمایی خوا وەرنەگرێ و قبووڵی نەکات و، ڕەتی بکاتەوە، دیارە سەرگەردان و گومڕا دەبێ، بە پێی سیستمێک کە خوا دایناوە، لە ژیانی بەشەردا.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**بیرخستنەوەیان لە لایەن پیاوە بڕوادارەکەوە، کە پێشتریش یوسوف ﷺیان وەک پێغەمبەر بۆ لا هاتوە، بەڵام هەر لەبارەیەوە دوو دڵ بوون، دوای مردنیشی پێیان وابووە هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن و، سەرزەنشتکردنی کەسانی شەڕەقسەکەر دژی ئایەتەکانی خوا، کە خوا دڵیان مۆر دەکات و، لێیان تووڕەو پەستە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە دە برگەدا:**

١)- ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، بە دڵنیایی یوسوفیش پێشتر بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان، ڕاستە مانایەکەی ئاوایە: یوسوف بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە هاتە لاتان، بەڵام مەبەست ئەوەیە یوسوف بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان.

بۆچی دەفەرموێ: (وَلَقَدْ)؟ دیارە (و)ەکە بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی ئەم قسەیە بۆ سەر قسەکانی پێشێ، بەڵام (لَقَدْ) بۆ جەختکردنەوەیە، چونکە هەم (ل)ەکە (ل)ی سوێند پێ خواردنەو، هەم (قَدْ)یش بۆ ساغکردنەوەو دڵنیاکردنەوەیە، لەبەر ئەوەی ئەوان مەزەندەی بە درۆدانیان لێکراوەو، وا پێدەچێ بڕوایان بە یوسوف ﷺ نەبوو بێ، بەڵێ: لە ڕووی کاروباری دنیاییەوە لە تواناکانی زۆر بەهرەمەندبوون، بە تایبەت لە ڕووی ئابوورییەوە، بەڵام وا پێدەچێ وەک

پێغەمبەری خوا بڕوایان پێ نەبووبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، پێشتر یوسوف ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێناون.

٢)- ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ﴾، کەچی ئێوە هەر لە دوو دڵییدابوون بەرانبەر بەوەی بۆی هێنا بوون، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە یوسوفیان وەک پێغەمبەری خوا قبووڵ نەکردوە، مەگەر کەمێکیان.

دیارە یوسوف ﷺ، وەک هەموو پێغەمبەرانی خوا بەڵگە ڕۆشنەکانی هێناون، بەرنامەو ڕێبازێکی ڕۆشن و گەش و سپیی پێبووە، وەک لەو بارەوە ئەم فەرموودەیە هاتوە: {**عَنِ الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ رضي الله عنه: قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاء لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ، وَمَنْ يَعِشْ مِنكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِمَا عَرَفْتُمْ مِنْ سُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ**} (**أخرجه أحمد: ١٧١٨٢، وابن ماجه: ٤٣، والحاكم: ٣٣١**).

واتە: عیرباضی کوڕی سارییە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من ئێوەم لەسەر ڕێیەکی سپیی و ڕوون بەجێهێشتوە، شەوەکەیشی وەک ڕۆژەکەی وایە، لە دوای من مەگەر کەسێک فەوتاو بێ، ئەگەرنا لێی لانادات، هەر کەسێک لە ئێوە بژی (تەمەنی هەبێ لە دوای من) ڕاجیایی و کێشەو مشت و مڕی زۆر دەبینێ، بەڵام ئێوە ئەو ڕێبازەی من کە ناسیوتانە بیگرن و، ڕێبازی جێنشینە سەر ڕاستە هیدایەتدراوەکانم بگرن.

هەڵبەتە مەبەست لە ڕێباز (سنة) لێرەدا وەک زۆرجاری دیکە گوتوومانە: واتە: بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ نەک بەو چەمک و واتایە کە سوننەت یانی: ئەو شتانە ئەگەر مرۆڤ بیانکات، خێری دەکات و پاداشتی هەیەو ئەگەر نەیانکات، خێرێکی لە دەست چووە! لێرەدا ڕێباز، هەروەها لە هەموو قورئانیشدا کە خوا باسی (سنة)و (سنن) دەکات هەر بە مانای یاساکانی خوا، ڕێبازی خوا،

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ وشەی (سنة)ی بە مانای ڕێبازی خۆی بەکارهێناوە، کە هەناوو هەوێن و جەوهەری ڕێبازی پێغەمبەریش ﷺ کتێبی خوایە.

٣)- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ﴾، هەتا کاتێک کە یوسوف مرد، کۆچی دوایی کرد.

٤)- ﴿قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾، گوتتان: لە دوای وی خـوا هیچ ڕەوانەکراوێک نانێرێ، هیچ پێغەمبەرێک نانێرێ، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- یان مەبەستیان ئەوە بووە کە تازە لە دوای یوسوف، خوا هیچ پێغەمبەرێک نانێرێ.

ب- یان مەبەستیان ئەوە بووە کە یوسوفیش هەر پێغەمبەر نەبووە، واتە: بە توانجەوە گوتوویانە: لەمەودوا کەسی دیکە نایەت بڵێت پێغەمبەرم، ئەگەرنا بڕوایان نەبووە کە یوسوف پێغەمبەرەو خوا ناردوویەتی، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە کە هیچ ڕێی تێناچێ لە داهاتوودا پێغەمبەرێک بێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەویان بە پێغەمبەر دانابێ، واتە: نە ئەویش پێغەمبەرەو نە کەسێکی دیکەش دێ، بە ناوونیشانی پێغەمبەر خۆی بە ئێمە بناسێنێ.

٥)- ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾، هەر بەو شێوە خوا هەر کەسێک زێدەڕۆییکاری، دڵ پڕ لە گومان بێ، گومڕای دەکات.

خوا ئەوانە گومڕا دەکات، کە زێدەڕۆییکار بن و دڵ پڕ لە گومان بن بەرانبەر بە پەیامی خواو بەرانبەر بە خوا ﷻ، ئەوانە شەیتان زەفەریان پێدەبات، لە ڕێی گوناهو تاوان و لادانەکانی مرۆڤەوە، شەیتان زەفەر بە مرۆڤ دەبات، دڵ و دەروونی داگیر دەکات و، پڕی دەکات لە گومان و دوو دڵیی.

کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾، بەو شێوەیە خوا کەسێک کە زێدەڕۆییکاری دڵ لە پڕ لە گومان و دوو دڵ بێ، گومڕای دەکات، لەگەڵ ئەوەی دوایی دێ، تا کۆتایی ئەم ئایەتانە، دەگونجێ هەمووی قسەی پیاوە بڕوادارەکە بێ، دەشگونجێ فەرمایشتی خوای بەرز بێ،

نێواخنی کردوە، لەگەڵ قسەی ئەو پیاوە بڕوادارەدا، چونکە دوایی بەردەوام دەبێ دەفەرموێ:

٦)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی مشتومڕ و شەڕە قسە دەکەن، لە دژی ئایەتەکانی خوا.

٧)- ﴿ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ﴾، بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز کە بۆیان هاتبێ، واتە: بەبێ بەڵگەیەکی نەقڵیی، بەبێ بەڵگەیەک کە لە خواوە هاتبێ، لە دژی ئایەتەکانی خوا قسە دەکەن، ئەوانەی بەو شێوەیەن:

٨)- ﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەوە زۆر بوغزێنراوە لەلای خواو لەلای ئەوانەی بڕوایان هێناوە (كَبُرَ: مِثْلُ سَاءَ وَبِئْسَ، مَقْتاً تَمييز، أي: كَبُرَ مَقْتُ جِدَالِهِمْ)، (كَبُرَ) وەک (ساء) و (بئس)وایەو (مقتاً) تەمیزە، یانی: بوغزێنراویی شەڕە قسەکەیان زۆر زلە.

واتە: شەڕە قسە کردنەکەیان زۆر بوغزێنراوە لە لایەن خوا، لە لایەن ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، واتە: بوغزێنراوییەکەی زۆر گەورەیەو خوا زۆر ڕقی لێ هەڵدەستێ، لەو شەڕە قسەو دم بە دمەیان لە دژی ئایەتەکانی خوا، بەبێ ئەوەی شەڕە قسەکەیان پشت ئەستووربێ بە بەڵگەیەک کە لە خواوە بۆیان هاتبێ، (المَقْتُ: أَشَدُّ الغَضَبِ، وَهُوَ كِنايةٌ عن شِدَّةِ العِقَابِ)، (مَقْت) واتە: زۆر تووڕە بوون، زۆر ڕق لێ هەڵسان، کە لێرەدا کینایەیە لە سزای سەخت، کە دەفەرموێ: ﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، واتە: ئەو شەڕە قسەیان لە دژی ئایەتەکانی خوا، هۆکاری سزایەکی زۆر سەختە لە لایەن خواوە ﷻ، هەروەک هۆکاری ڕق لێبوونەوەیەکی زۆر گەورەیە لە لایەن بڕوادارانەوە.

٩)- ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾، بەو شێوەیە خوا مۆر بەسەر هەر دڵێکی خۆ بەزلگری خۆسەپێنی خەڵک تێکشکێنەرەوە دەنێ.

﴿ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (عَلَى كُلِّ قَلْبٍ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ)، بەسەر هەر دڵێک کە خۆبەزلگرەو، تێکشکێنەرە.

چونکـە دڵەکـە خـۆ بەزلگرییەکـەی تێدایـە، دڵەکـە نیـەتی تێکشـکاندن و خـۆ سـەپاندنەکەی تێدایـە، بـەڵام لـە خـۆ بەزلگرتنەکـەدا لەسـەر جەسـتە دەردەکـەوێ و، تێکشـکاندنی خەڵـک و خۆسـەپاندن بەسەریانیشـدا، دیسـان لەسـەر جەسـتە دەردەکـەوێ، بـەڵام سـەرچاوەکەی دڵـە، بۆیـە خـوا ﷻ نـاوا هـەر دڵێکـی بـەو شـێوەیەبێ و خـۆ بەزلگریـی و خۆسـەپێنی تێدابـێ، مـۆری پێوەدەنـێ کـە هیدایـەتی نەچێتـە نێـو.

دەڵـێ: (الجَبَّـارُ: مُبَالَغَـةٌ فِي الجَـبْرِ، وَهُـوَ الإِكْـرَاهُ فَالْجَبَّـارُ: المُكْـرِهُ النَّـاسَ عَـلَى عَمَـلِ مَـا لَا يُحِبُّونَـهُ)، (جَبَّـار) زێدەڕۆییـە لـە (جَـبر)، ئەویـش بریتیـە لـە زۆر لێکـردن و سـەپاندن، کەواتـە: (جَبَّـار) ئەوەیـە خەڵـک ناچـار بـکات لەسـەر کردەوەیـەک کـە حـەزی لێناکـەن و پێیـان ناخۆشـە.

لەو بارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە:

{عَـنْ عَبْـدِ اللـهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ رضي اللـه عنـه، عَـنِ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: «لاَ يَدْخُـلُ الْجَنَّـةَ مَـنْ كَانَ فِي قَلْبِـهِ مِثْقَـالُ ذَرَّةٍ مِـنْ كِـبْرٍ»، قَـالَ رَجُـلٌ: إِنَّ الرَّجُـلَ يُحِـبُّ أَنْ يَكُـونَ ثَوْبُـهُ حَسَـنًا وَنَعْلُـهُ حَسَـنًا؟ قَـالَ: «إِنَّ اللـهَ جَمِيـلٌ يُحِـبُّ الْجَـمَالَ، الْكِـبْرُ بَطَـرُ الْحَـقِّ وَغَمْـطُ النَّـاسِ»} (أخرجـه مسـلم: ٩١، والترمـذي: ١٩٩٩).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازیبـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: کەسـێک گرانایـی گەردێـک خـۆ بەزلگریـی لـە دڵـدا هەبـێ، ناچێتـە بەهەشـت، پیاوێـک گـوتی: پیـاو هەیـە پێـی خۆشـە پۆشـاکەکەی جـوان بـێ و پێڵاوەکـەی جـوان بـێ؟ (پێغەمبـەر ﷺ) فەرمـووی: خـوا جوانـەو جوانییـشی خـۆش دەوێ، خـۆ بەزلگریـی بریتیـە لـە ڕەتکردنـەوەی هـەق و، بـە کـەم تەماشـاکردنی خەڵـک.

**مەسەلەی شەشەم:**

**فەرمانکردنی فیرعەون بە هامان کە بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکات، تاکو لێیەوە بگاتە ڕێیەکانی ئاسمان و، لەوێوە تەماشای پەرستراوی مووسا ﷺ بکات، سەرەتاش گومانی خستۆتە سەر بوونی پەرستراوی مووسا ﷺ، کە ئەوەش ڕازێنرانەوەی کردەوەی خراپی فیرعەون بووە بۆی و، پیلانەکەیشی بێ ئاکام بووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ
٣٦ أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ
زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ
٣٧﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە هەشت بڕگەدا:**

**١)- ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا﴾، فیرعەون گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، هامان کە وەک لێرەو، لە شوێنەکانی دیکەشدا دەردەکەوێ، وا پێدەچێ وەزیرێک بووبێ لەبەر دەستی فیرعەونداو، کەسێک بووبێ کارەکانی فیرعەونی ڕاپەڕاندبن و، سەرپەرشتیی کارەکانی بۆ کرد بێ، ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ﴾، فیرعەون نازناوی پادشایەتیی میسرە لە سەردەمێکدا، ئنجا ئایا ئەم فیرعەونە ناوی کەسیی خۆی چی بووە؟ هەندێک دەڵێن: ناوی (خۆفۆ) بووە، هەندێک گوتویانە: ناوی (ڕەعەمسیس) بووە، گرنگ ئەوەیە فیرعەون نازناوی پادشایەتیی بووە، هەروەها هامانیش ئایا ناوی شەخسیی کەسەکە بووە، ناوی تایبەتیی خۆی بووە، یاخود ناوی پۆستەکەی بووە؟ وەک سەرۆک وەزیران، یان وەزیر؟ دیار نیە، گرنگ ئەوەیە فیرعەون فەرمان بە هامان دەکات و دەڵێ:**

﴿ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا﴾، کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، (الصَّرْحُ: القَصْرُ العَالِي المَشِيْد)، (صَرْح) بریتیە لە کۆشکێکی بەرزی سواغدراو، یاخود گەچکاریی کراو و لووس.

٢)- ﴿لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ﴾، بەڵکو بگەمە هۆکارەکان، یان بگەمە ڕێیەکان، یان بگەمە دەروازەکان، کام دەروازانە؟ لە ئایەتی دواییدا باس دەکات.

٣)- ﴿أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾، بگەمە دەروازەکانی ئاسمانەکان، یان ڕێیەکانی ئاسمانەکان، بۆچی بگاتە ئەوێ؟

٤)- ﴿فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾، ئنجا لە وێوە تەماشای پەرستراوی مووسا بکەم، ﴿فَأَطَّلِعَ﴾، خوێنراویشەتەوە: (فَأَطَّلِعُ) بە سەر (فتحة) یان بە بۆر (ضمة) هەردووکیان هاتوون، واتە: کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، کە بیچمە سەرێ، لەوێوە بگەمە دەروازەکانی ئاسمانەکان، یاخود ڕێگەکانی ئاسمانەکان، ئنجا لەوێوە تەماشای پەرستراوی مووسا ﵇ بکەم، بزانم لە کوێیە؟

٥)- ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗا﴾، من بە درۆکاریشی دەزانم، واتە: پێموایە مووسا ڕاست ناکات و درۆ دەکات، کە دەڵێ: پەرستراوێکم هەیە لەسەرەوەی تێکڕای دروستکراوەکانیەتی.

ئنجا کە فیرعەون دەڵێ: (کە خوا لەسەر زمانی وی کە گێڕاویەتەوە)، ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗا﴾، (الظَّنُّ: بِمَعْنَى اليَقِيْن أو الظَنّ)، لێرەدا وشەی (ظَن) دەگونجێ بە مانای دڵنیایی بێ واتە: من دڵنیام درۆ دەکات، یاخود: بە مانای گومان بێ واتە: گومانم هەیە لە قسەکەیدا، چونکە وشەی (ظَنّ) وەک پێشتریش گوتوومانە: بە پێی ئەو سیاقانە کە تێیاندا دێ، مانایەکەی دیاریدەکرێ، جاری وایە بە مانای زانیارییەو، جاری وایە بە مانای دڵنیاییەو، جاری واشە بە مانای گومانێکی زاڵە، خوا دەفەرموێ:

٦)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە، کردەوە خراپەکەی فیرعەون بۆ فیرعەون ڕازێنرابۆوە، بۆ دژایەتییکردنی مووسا ، کە دەست بۆ هەموو پچکان بەرێ و، هەموو پیلان و فێڵێک ڕەچاو بکات.

٧)- ﴿ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، بەو شێوەیەش لەڕێ لادرا، (صُدَّ) خوێنراویشەتەوە: (وَصَدَّ عَنِ السَّبيل)، ئەگەر (صُدَّ)بێ، یانی: لادرا لە ڕێ، بەڵام ئەگەر (صَدَّ) بێ یانی: خەڵکی لە ڕێ لادا، یاخود خۆی لادەربوو لە ڕێ، چونکە وشەی (صَدَّ) هەم مانای (لازم)ی هاتوە، کە بەرکار (مفعول به) نەخوازێ، (صَدَّ عَنِ السَّبِيْل، أي انْحَرَفَ عَنِ السَّبِيْل)، واتە: خۆی لە ڕێ لایدا، هەم مانای (متعدي)یش هاتوە، کە بەرکار بخوازێ (صَدَّ عَنِ السَبِيْل: أي صَدَّ غَيْرَهُ عَنِ السَّبِيْل)، وشەی (ٱلسَّبِيلِ)یش کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عهد)ە واتە: خەڵکی یان خۆی، لە ڕاستە شەقامی خوا ، ئەو ڕێیە کە زانراوە، لادا.

٨)- ﴿ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴾، پیلان و نەخشەی فیرعەونیش تەنیا لە زایەبوون و سەر بە فەتارەت چوون دابوو، (تَبَاب: أي هَلَاك) لە بەین چوون، وەک لە سووڕەتی (هود)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: هەر سەر بە فەتارەت چوونیان بۆ زیادکردن، یان لە سووڕەتی (المسد)دا دەفەرموێ: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ ﴾، واتە: هەردوو دەستی ئەبوو لەهەب لە بەین بچن و، لە بەینیش چوو.

لێرە بەو شێوەیە خوا ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوەو، لە سووڕەتی (القصص)دا هەمان بەسەرهات هاتوە، بەڵام بە تەعبیرێکی دیکە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: فیرعەون گوتی: ئەی پیاو ماقووڵان! (ئەی کۆڕو مەجلیسی ڕاوێژکاران، یان بڕیار بە دەستان!)، جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شک نایەت، (واتە: بەس خۆم پەرستراوتانم)، ئنجا ئەی

هامان! ئاگرم بۆ بدە بەر قوڕێ، (خشتی سوورم بۆ دروست بکە)، دەیتوانی بڵێ: (إصْنَعْ لِيَ اللَّبِنْ) واتە: خشتی سوورم بۆ دروست بکە، بەڵام بۆچی خوا لەسەر زمانی فیرعەون، دەفەرمووێ: ﴿ فَأَوْقِدْ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّي صَرْحًا ﴾؟ ئاگرم بۆ بدە بەر قووڕو، کۆشکێکم بۆ دروست بکە؟ تاکو بزانرێ کە خشتی سوور وا دروست دەبێ کە لە کوورەدا بسووتێنرێ، ئنجا ئەو خشتە سوور دەبێتەوەو دوایی ئاو کاری تێناکات، واتە: چۆنیەتی دروستکردنی خشت، لەم ئایەتە موبارەکەدا هەیە.

ئەوەش بۆچی؟ ﴿ لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، بەڵکو لە سەر ئەو کۆشکەوە بڕوانمە پەرستراوی مووساو، پێشم وایە لە درۆزنانە، واتە: پێموانیە ڕاست بکات، پەرستراوی مووسا لەسەرەوەی دروستکراوانیشەوە هە بێ.

ئەم ئایەتانە ئەوەی کە لێرەدا لە سوورەتی (غافر)دا هاتووەو، ئەوەی لە سوورەتی (القصص)یشدا هاتووە، لێیان وەردەگیرێ کە فیرعەون مولحید بووبێ و بڕوای بە خوای پەروەردگار نەبووبێ، ئنجا گوتوویەتی: خوا لەسەر زەوی دیار نیە، کەواتە: با تەماشای ئاسمانێ بکەم، هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە، با تەماشای بکەم، پێشم وایە لەوێش هەر نیەو مووسا درۆ دەکات، حاشای مووسا الْعَلِيْلا.

## پرسیارێک و وەڵامەکەی

لێرەدا پرسیارێک دەکەین: ئایا فیرعەون بە جیددیی فەرمانی کردوە کە ئەو کۆشکەی بۆ دروست بکرێ؟ یاخود هەر سەفسەتەو چاو بەستەکێی کردوە؟

پاشان ئەگەر بە جیددییشی بووبێ، ئایا بینایەکەی بۆ دروستکراوە، یان نەخێر؟

لە وەڵام دا دەڵێین:

هەموو ئەگەرەکان هەن، دەگونجێ بە جیددیی بوویێ، بۆ چەواشەکردنی خەڵک، کۆشکیشی بۆ دروستکرابێ، دەشگونجێ نەخێر هەر سەفسەتەو چاو بەستەکێیەک بووبێ لە خەڵک، کە ئەگەر بێت و کۆشکێکیشم بۆ دروستکەن و بچمە سەریشی و، تەماشاش بکەم، هیچ لە ئارادا نیە.

بەڵام من وای تێدەگەم، کە ئەوە هەمووی چەواشەکاریی بووەو، نە فیرعەون بە جیددیی بووە کە هامان کۆشکی بۆ دروست بکات و، نە کۆشکەکەشی بۆ دروستکراوەو، نەچۆتە سەریشی و تەماشاشی کردوە، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ ﴿٣٧﴾﴾غافر، واتە: پیلانی فیرعەون هەر لە زایەبوون و لەسەر بە فەتارەت چوون و لە دۆڕاندابوو، کەواتە: ئەوە هەمووی چەواشەکاریی بووە، پیلانێک بووە بۆ کڵاو لەسەرنانی خەڵک، کە دوایی بڵێن: فیرعەون چی بکات تاکو ئەو پەروەردگارو پەرستراوەی کە مووسا دەڵێ: ئەو ناردوومی بە پەیامەوە، بڕوای پێبێنێ، فیرعەون چی بکات بیدۆزێتەوە؟ ئەوەتا بە تەمابوو کۆشکیش دروستبکات و بچێتە سەر کۆشکەکەش، بەڵام ئەگەر چووبایە سەریشی و هەڵیشکشیبایە، خوای هەر نەدەبینی، کەواتە: دیارە ئەو پەرستراوەی مووسا

ﷺو ئەو پەروەردگارەی مووسا ئیددیعا دەکات ناردوویەتی و پەیامی پێدا ناردوە، بوونی نیە! پێموایە ئەو ڕستەیەی دوایی، ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوەو ئەوە دەسەلمێنێ، کە هەموو هەوڵەکەی فیرعەون و قسەکانی هەموویان چەواشەکاریی بووەو، مەبەستی ئەوە بووە بڵێ: ئەو پەروەردگارو پەرستراوەی مووسا ﷺ لەسەر زەوی نیە، ئەوەتا وەرن بگەڕێن داخۆ دەیبینن؟ نەخێر، کەواتە: دەبێ لە ئاسمان بێ، ئنجا ئەگەر کۆشکێکیشم بۆ دروست بکەن و بچمە سەریشی و لەوێش تەماشا بکەم، هەر دیار نیە، کەواتە: بوونی نیە.

بەڵام (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا[1] ئەو مانایە پەسند دەکات، کە کۆشکێکیان بۆ دروستکردوە، ئنجا هەندێک گوتوویانە: چۆتە سەر کۆشکەکەش و لەوێوە تەماشای کردوە، دەڵێ: (لأنهُ ذَهَبَتْ نَفَقَتُهُ الَّتِي أَنْفَقَهَا عَلَى الصَّرْحِ بَاطِلًا)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾، پیلانی فیرعەون هەر لە زیانباریی و لە فەوتاندابوو، طەبەریی دەڵێ: چونکە ئەو مەسرەفەی کە کردبووی لە دروستکردنی کۆشکەکەدا، مەسرەفەکەی چۆ خۆڕایی و هیچی دەستگیر نەبوو.

بەڵام ئەو مانایەی ئێمە هەڵمان بژارد بەهێزترە، چونکە بەپێی لێکدانەوەی (الطبري) مەبەست لە: ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾، ئەوەیە کە مەسرەفەکەی چۆوە هیچێ و زەرەری ماڵ خەرجکردنەکەی لێکەوت! بەڵام ئەو مانایە بەهێز نیەو وا باشترە بگوترێ: کۆی قسەکانی فیرعەون خوای پەروەردگار بە پیلانی داناوەو، کۆی پیلانەکەشی بێ ئاکام و بێ ئەنجام بووە، چونکە ئەو ویستی بە خەڵک بسەلمێنێ، لەبەر ئەوەی خوا بەرهەست نیە، کەواتە: بوونی نیە، بەڵام بوونی خوا ﷻ لە زگماک (فطرة)ی مرۆڤەکانداو لە عەقڵیان دایەو، ئیمان بە بوونی خوا، شتێکی ڕیشەدارو ڕۆچوویە، بۆیە ئەوە وای نەکرد، کە خەڵک ئەوە بە بەڵگە لە فیرعەون بسەلمێنێ، گوایە خوای پەروەردگار بوونی نیە، لەبەر ئەوەی بەرهەست نیە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٤، ص٦٤.

(محمد الطاهر بن عاشور)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (أَرَادَ بِهِ إِيهَامَ قَوْمِهِ كَذِبَ مُوسَى ﷺ)، واتە: بەو قسانە فیرعەون ویستی خەڵکەکەی وا حاڵیی بکات، وایان ئیحسا‌ل بکات: کە مووسا ﷺ ڕاست ناکات، بۆیە ئەو قسانەی کردوون، ئەگەرنا نە ئەوە بووە کۆشک دروست بکرێ و، نە ئەوەش بووە فیرعەون بچێتە سەری و، لەوێوە تەماشا بکات.

---

(١) التحرير والتنوير، ج٢٤، ص١٤٨.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**دووبـارە قسـەکردنەوەی پیـاوە بڕوادارەکـە لەگـەڵ خەڵکەکەیـدا، کـە شـوێنی بکـەون بـە ڕێـی ڕاسـتداو، ژیـانی دنیـا گوزەرانێکـی زوو تێپـەڕەو، دواڕۆژ مەنزڵـگای سـەقامگیر بوونـەو، ڕوونکردنـەوەی سـەرەنجامی خراپـەکاران و چاکـەکاران:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ ﴾، ئەو کەسەی بڕوای هێنابوو (ئەو پیاوە بڕوای هێنابوو)، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! شوێنم بکەون.

هەمـوو جـارێ کـە دەفەرمـوێ: (ئـەو پیـاوەی بـڕوای هێنابـوو گـوتی:) واتـە: بـا بزانـرێ کـە زەقتریـن سـیفەت لـەو پیـاوەدا ئیمانەکـەی بـوو، لـە ڕاسـتییدا بڕوایەکـەی بـووە کـە ئـەو هەمـوو غیـرەت و ئازایەتیـی و بوێرییـەی پێـداوە، کـە ڕووبـەڕووی فیرعـەون و دەسـتەو دایەرەکـەی و سـوپاو هێزەکـەی ببێتـەوە، بێمنەتانـە ئـەو بەرگرییـە بـکات، لـە مووسـا ﷺو لـەو پەیامـەی کـە خـوا بـە مووسـادا ناردوویـەتی،

﴿ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ ﴾، ئـەی خەڵکـەکەم، ئـەی گەلەکـەم! شـوێنم بکـەون پەیڕەوییم لێبکـەن، لێـرەدا بـە یەکجاریـی ئـەو پیـاوە بـڕوادارە فـووی پێـدا دەکات و بـە ئاشـکرا جـاڕ دەدات، ڕایدەگەیەنـێ کـە ئـەو مووسـا بـە ڕاسـت دەزانـێ و، بـڕوای پێیـەتی، بانگـی خەڵکەکـەش دەکات دەڵـێ: شـوێنم بکـەون بـا هەمووـمـان بـە دوای مووسـاو پەیامەکـەی بکەویـن.

٢)- ﴿ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، (شوێنم بکەون) ڕێنماییتان دەکەم بەرەو ڕێی سەر ڕاستیی، (سَبِيلَ ) واتە: ڕێ، (ٱلرَّشَادِ) واتە: سەر ڕاستیی و بە مراد گەیشتن.

٣)- ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٌ ﴾، ئەی خەڵکەکەم! بە دڵنیایی ئەم ژیانی دنیایە ڕابواردنێکی کەمە، (مَتَاع: أي: تَمْتِيعٌ قَلِيل، مَا يُنْتَفَعُ بِهِ انْتِفَاعاً مُؤَقَّتاً)، (مَتَاع): واتە: گوزەرانێکی کەم، ڕابواردنێکی کەم، شتێک کە ماوەیەکی کەم بەهرەی لێ وەردەگیرێ، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٌ ﴾، ئەمە بۆ کورت هەڵێنانە واتە: ئەم ژیانە دنیایە تەنیا ڕابواردنێک و گوزەرانێکی کەمە.

٤)- ﴿ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴾، مەنزڵگای کۆتاییش هەر ئەوێیە مەنزڵگای تێدا نیشتەجێبوون، مەنزڵگای کۆتایی کە لە کۆتایی دا دێ، لە کۆتایی ئەم ژیانە دنیاییەوە دێ، هەر ئەوێیە مەنزڵگای تێدا نیشتەجێبوون، (هِيَ: ضَمِيرُ الفَصْلِ)، واتە: (هِيَ) ڕاناوی لێک جیاکردنەوەیە بۆ کورت هەڵهێنان، یانی: هەر ئەوێیە مەنزڵگای تێدا نیشتەجێبوون، (القَرَار: الدَّوَامُ فِي المَكَان)، (قَرَار): واتە: بەردەوام بوون لە شوێنێک، واتە: هەر ئەوێیە ئەو نشینگەیە کە خەڵک تێیدا سەقامگیر دەبێ و ناجووڵێ، بەڵام ئێرە ژیانێکی کاتیی و زوو تێپەڕەو بەسەر دەچێ.

٥)- ﴿ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، هەر کەسێک خراپەیەک بکات، تەنیا بە ئەندازەی خراپەکە سزای دەدرێتەوە.

﴿فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- کەسێک خراپە بکات، هەروەک خراپە سزای دەدرێ و، لە بەرانبەر خراپەکردنەکەیدا پاداشتی نادرێتەوە، وەک چاکە مامەڵە لە خراپەکەیدا ناکرێ.

ب- یاخود: ﴿ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، هەر کەسێک خراپە بکات، تەنیا بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ، زیاد لە خراپەکەی خۆی سزا نادرێ، ﴿إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، واتە: تەنیا بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ، یاخود: ﴿إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، واتە:

وەک خراپە مامەڵەی لەگەڵ دادەکرێ و سزا دەدرێ، نەک لە بەرانبەر خراپەکەیدا، پاداشت بدرێتەوە!

٦)- ﴿ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ ﴾، هەر کەسێکیش کردەوەی باش بکات لە نێرو مێ و برواداریش بێ.

٧)- ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە، (يَدْخُلُونَ) خوێنراویشەتەوە: (يُدْخَلُونَ)، واتە: دەخرێنە بەهەشتەوە.

٨)- ﴿ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾، لەوێدا بژێویان دەدرێتێ بەبێ نەژمار، واتە: بۆیان ناژمێردرێ هێندە زۆرە، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ ﴾، بۆ کۆیە، بەڵام (مَنْ) لە: ﴿ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾دا، هەم بۆ تاک، هەم بۆ دووان، هەم بۆ کۆش بەکاردێ، بۆیە پێشێ وەک تاک باس دەکرێ، بەڵام دوایی کردوویەتی بە کۆ.

لەو بارەوە کە ژیانی دنیا ڕابواردنێکی کەمە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرو رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَلَيْسَ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا شَيْءٌ أَفْضَلَ مِنْ الْمَرْأَةِ الصَّالِحَةِ} (أخرجه ابن ماجه: ١٨٥٥، وصححه الألباني).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژیانی دنیا ڕابواردنێکی کەمەو، هیچ شتێک لە ڕابواردنەکەی ژیانی دنیا، باشتر نیە لە ئافرەتی چاک.

**مەسەلەی هەشتەم:**

**زیاتر خستنە ڕووی بەرنامەی خوا لە لایەن پیاوە بڕوادارەکەوە، کە مایەی ڕزگارییەو، کوفرو شیرکیش هۆکاری چوونە دۆزەخن و، باسی ئەوە کە جگە لە خوا لە دنیاو قیامەتدا، هیچ کارەیەو سەرەنجام تەنیا بۆ لای خوایەو، لە داهاتووشدا ڕاستییەکانی وەحیی کە ئەو پیاوە بڕوادارە پێیان ڕادەگەیەنێ، دەردەکەون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، (جارێکی دیکە بانگیان دەکاتەوە)، ئەی خەڵکەکەم، ئەی گەلەکەم! ئەوە چیمە! بانگتان دەکەم بۆ ڕزگاریی و ئێوەش بەرەو ئاگر (ی دۆزەخ) بانگم دەکەن!! (مَا لِيَ)، ئەوە من چیمە! (مَا: اسْمُ اسْتِفْهَامٍ مُبْتَدَأٌ وَلِي: خَبَرُهُ، وَالإِسْتِفْهَامُ تَعْجِيبِيّ، وَهَذَا التَّرْكِيبُ كَتَرْكِيبِ: هَلْ لَكَ)، ﴿مَا لِيَ﴾، ئەوە چیمە؟ (مَا) ناوی پرسیارکردنەو نیهاد (مُبْتَدَأ)ە، (لِي): دەبێتە گوزارە (خَبَر)و، پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی سەرسوڕماندنە، (ئەوە چیمە! بۆچی و چۆن دەبێ وابێ؟!)، ئەم پێکهاتەیەش وەک پێکهاتەی (هل لك)یە، ئایا ئامادەی؟

﴿أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ﴾، من ئێوە بانگ دەکەم بۆ سەرفرازیی، بۆ ڕزگاریی، بۆ دەربازبوون، لە دنیادا لە کۆیلایەتیی بۆ مرۆڤەکان، لە دڵەڕاوکەو

دوو دڵیی، لە بێبڕوایی، لە سەرگەردانیی و هەڵوەدایی، لە بێ ئاكامیی، لە دواڕۆژیشدا لە تووڕەیی و سزای خوا، لە دۆزەخی خوا، بانگتان دەكەم بۆ ڕزگاریی، بە مانای وشە لە دنیاو دواڕۆژدا.

﴿وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، كەچی ئێوە بانگم دەكەن بەرەو ئاگری دۆزەخ، بەڵكو هەر لە دنیاش دا كە بە ئاگری ستەمكاران بسووتێم و بمكەنە خۆڵەمێش و قەرەبرووتێك بوونم نەبێ، كەسایەتیيم وردو خاش بكەن، ببمە سووتەمەنی بۆ ئەوان، لە دواڕۆژیشدا بە ئاگری تووڕەیی و تۆڵەی دادگەرانەی خوا بسووتێم، وشەی (إلى) هەردووكیان لە هەردووك ڕستەی: ﴿أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ دا، (إلى: حَرْفٌ لِلإِنْتِهَاء إلى غَايَة)، (إلى): پیتێكە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك بە كاردەهێنرێ، دەگوترێ: (سَافَرْتُ مِنْ السُّلَيْمَانِيَة إلى أرْبِيْل أو إلى دهُوك)، كەواتە: لە سولەیمانییەوە سەفەرەكە چووەو، كۆتایی ئامانجەكە لە هەولێر یان لە دهۆك بووە.

٢)- ﴿تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ﴾، بانگم دەكەن كە بە خوا بێبڕوابم، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، دوایی شیدەكاتەوەو ڕوونی دەكاتەوەو دەڵێ: ئێوە بانگم دەكەن تاكو من بێبڕوابم بە خوا، (ل)ی ﴿لِأَكْفُرَ﴾، (لَامٌ للتَّعْلِيل)، ﴿تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ﴾، بانگم دەكەن بۆچی؟ بۆ ئەوەی بە خوا بێبڕوابم.

٣)- ﴿وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ﴾، هەروەها شتێك بكەم بە هاوبەشی كە من زانیاریيم لە بارەیەوە نیە، واتە: بوونی نیە، (أي: هُوَ مَنْفِيُّ الوُجُودِ فَلَا يَتَعَلَّق بِهِ عِلْمٌ)، لە قورئان دا ئەم تەعبیرە زۆر هاتوە، ﴿مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ﴾، واتە: زانیاریيم لە بارەیەوە نیە، یانی: نیە، چونكە شتێك هەبێ، دەبێ زانراوبێ و بزانرێ، زانیاریی پێوەی پەیوەست بێ.

٤)- ﴿وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ﴾، منیش ئێوە بانگ دەكەم بۆ لای زاڵی لێبوردە، (كە خوایە ﷻ)، لێرەدا چوار جار وشەی (إلى) هاتوە، یەكجاریش (ل) هاتوە:

أ- ﴿أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ﴾.

ب- ﴿وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾، ﴿تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ﴾، ئەوە (ل)یە لێرە هاتوە.

ج- ﴿وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ﴾.

د- ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ﴾.

٥)- ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوەی ئێوە منی بۆ لا بانگ دەکەن، (لَاجَرَمَ: أي قَطعَاً، لَابُدّ، لَا شَكّ)، واتە: بە دڵنیایی، بێگومان، کە هەندێک لە زانایان ناوایان لێکداوەتەوە: (لا): (للنَّفِي لِشَيءٍ سَابِق)، (لا) بۆ لابردنی شتێکی پێشوویە، واتە: وانیە وەک ئێوە دەڵێن، (جَرَم): (قَطْعَاً وَثَابِتَاً) واتە: بە هەڵبڕاویی و بە چەسپاویی، دەشگونجێ (لَاجَرَم) هەمووی یەک وشە بێ، نەک بگوترێ: (لا) بۆ واتایەکەو (جرم)یش بۆ واتایەکە، بەڵکو (لَاجَرَم) هەمووی یەک وشەیە، واتە: بە دڵنیایی، بێگومان، ئەوەی کە ئێوە منی بۆ لا بانگ دەکەن.

٦)- ﴿لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾، هیچ بانگەوازێکی نیە نە لە دنیاداو، نە لە دواڕۆژدا، بانگەوازێکی نیە، دوو مانای هەن:

أ)- واتە: (لَا تَدْعُو أحَداً لِعِبَادَةِ نَفْسِهَا) یانی: ئەو شتانەی ئێوە منیان بۆ لا بانگ دەکەن، هیچ بانگەوازیان نیە، واتە: کەس بانگ ناکەن بۆ پەرستنی خۆیان، صەنەم و پەیکەرەکان، کوا کێ بانگ دەکەن! مانگ و خۆرو ئەستێرەکان و، ئەو شتانەی جگە لە خوا دەپەرسترێن لە بێژیانەکان، کوا کێ بانگ دەکەن؟!

ب)- واتە: (لَا اسْتِجَابَةَ لَهُ بِاسْتِعْمَالِ أحَدِ المُتَضَايِفَيْنِ بَدل الآخَر)، یانی: هیچ وەڵامدانەوەکیان نیە، بۆ ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە، نە لە دنیاو، نە لە دواڕۆژدا، (دَعْوَةُ) بە مانای بانگهێشتە، بەڵام لێرەدا دوو شت کە پاڵدەدرێنە لای یەکدی (الإسْتِجَابَة، الدَعْوَةُ)، یەکیان لە جیاتی ئەوی دیکە بەکارهاتوە، لێرەدا (دعوة) لە جیاتی (إسْتِجَابَة) بەکارهاتوە، ئنجا ئەگەر وابێ، ئەو کاتە: ﴿لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ﴾، (لَيْسَ لَهُ اسْتِجَابَةٌ إلى دعوة)، هەر بانگکرانێک کە بانگدەکرێن،

هیچ وەڵامدانەوەیەکی نیە، ئنجا ئەو کاتە بە مەرج ناگیرێ کە ئەو پەرستراوانە، مەبەست پێیان ئەو شتانە بن کە لە ماددەی بێ ژیان دروست دەکرێن، بەڵکو ئەگەر مرۆڤیش بن و شەیتانیش بن و جنەیش بن و، هەر شتێک بن، وەڵامی پەرستراوەکانی خۆیان نادەنەوە، نە لە دنیا، نە لە دوارۆژداو، داواکارییەکانی ئەوانیان پێ جێبەجێ ناکرێن، ئەو چاوەڕوانییەی کە لێیانیان هەیە، چاوەڕوانییەکە لە شوێنی خۆیدا نیە.

٧)- ﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾، بە دڵنیاییش گێڕانەوەمان بۆ لای خوایەو، زێدەڕۆییکارانیش هاوەڵانی ئاگرن.

(مَرَدّ) دەگونجێ بە مانای (مرجع ومصير) شوێنی بۆ لا گەڕانەوە بێ، ﴿وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾، زێدەڕۆییکارانیش هاوەڵانی ئاگرن، واتە: ئەوانەی تێیان پەڕاندوە لە کوفرو ستەم و خراپەو تاواندا، لە کۆتایی دا ئەو پیاوە بڕوادارە، پێیان دەڵێ:

٨)- ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ﴾، لەمەودوا ئەوەی ئێستا پێتان دەڵێم، وە بیرتان دێتەوە، (سَتَذْكُرُونَ: مُشْتَقٌّ مِنَ «الذُّكْر» وَهُوَ ضِدُّ النِّسْيَان)، (ذُكْر) پێچەوانەی (نِسْيَان)ە، (ذُكْر) واتە: لە بیربوون، (نِسْيَان) واتە: لە بیرچوون، بەڵام (ذِكْر) واتە: باسکردن، پێچەوانەی باسکردنیش بریتیە لە باسنەکردن و پشتگوێ خستن، لێرەدا (ذُكْر): (سَتَذْكُرُونَ)ی، لێ داتاشراوە.

٩)- ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، کاری خۆیشم بە خوا دەسپێرم، (أُفَوِّضُ: أَرُدُّ وَأُحِيْلُ) کاری خۆم حەواڵەی خوا دەکەم، کاری خۆم واتە: سەرەنجامی ئەو بەرگرییکردنە، یاخود کاری خۆم واتە: حاڵ و باڵی خۆم سەرەنجامم چیم لێدێ؟ بە خوای دەسپێرم.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەری بەندەکانیەتی، واتە: بەردەوام دەیانبینێ و، ئاگای لێیانەو، لە ژێر چاودێریی ئەودان.

ئنجا پێش ئەوەی بێینە سەر مەسەلەی نۆیەم و کۆتایی، دەڵێین : لە کۆی ئەو ئایەتانەدا دەردەکەوێ، کە دەبێ ئەو پیاوە بڕوادارە، پیاوێکی دەسترۆیشتوو

و قسە ڕۆیشتوو و خاوەن پێگەو پایەی گرنگ بووبێ، لە دارو دەستەی فیرعەون، ئنجا ئایا کوڕی بووە، برای بووە، خزمێکی نیزیکی بووە، کەسێکی زۆر جێی ئیعتیمادو پشت پێ بەستنی بووە؟ گرنگ ئەوەیە کەسێک بووە توانیویەتی قسەی خۆی بکات، زۆر دلێرانەو، کەسێک بووەو بە ئاسانیی زەفەری پێنە بردرێ و، کەسێک بووە فیرعەون نەتوانێ نەیهێڵێ قسە بکات و قسەی[1] پێببڕێ، یاخود ئەوانەی دەوروبەری فیرعەون بێن یەخەی پێبگرن.

---

(١) قسە پێبڕینی یەکجاریی، کە نەهێڵێ قسەکانی تەواو بکات

**مەسەلەی نۆیەم و كۆتایی:**

**پاراستنی خوا بۆ ئەو پیاوە بڕواداره لە پیلانی فیرعەون و دەستەو دارەكەی و، گەمارۆدانی سزا بۆ فیرعەونییەكان، لە قۆناغی بەرزەخیشدا ڕانوێنرانیان لەسەر ئاگر بەیانیان و ئێواران و، لە قیامەتیشدا خستنیانە نێو سەختترین سزاوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

**١)- ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴾، خواش لە خراپەكانی ئەو پیلانەی گێڕایان پاراستی.**

**دوای ئەوەی گوتی: كاری خۆم حەوالەی خوا دەكەم و خۆم بە خوا دەسپێرم، بەڕاستیی هەر كەسێك خۆی بە خوا بسپێرێ، خوا زایەی ناكات، ئاگای لێی دەبێ و مشووری لێی دەخواو سەرپەرشتیی دەكات، یەكسەر بەدوای ئەوەدا دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ ﴾، ئەم (ف)یە كە لەسەر: ﴿ فَوَقَىٰهُ ﴾یە، وا پێدەچێ (فَاء التَّعْقِيب) بێ، واتە: یەكسەر دوای ئەوە خوا پاراستی لە خراپەكانی پیلانی وان، ئەو پیلانەی دەیانگێڕا.**

**٢)- ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴾، شوێنكەوتوانی فیرعەون، دەستەودایەرەی فیرعەونیش، سزایەكی خراپ دەوری دان، گەمارۆی دان.**

**كە دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴾، (مَا: مَصْدَرِيَّة) (مَا): بۆ چاوگە، واتە: (سَيِّئَاتُ مَكْرِهِمْ، وَالإِضَافَةُ بَيَانِيَةٌ وَهِيَ هُنَا فِي قُوَّة إِضَافَة الصِّفَة إِلَى المَوْصُوف)، كە دەفەرموێ: ﴿ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴾، واتە: (سَيِّئَات**

مَكْرِهِمْ)، ئنجا لێرەدا ئەم پاڵدانەی (سَيِّئَاتِ) بۆ لای (مَا مَكَرُواْ) پاڵدانە بۆ ڕوونكردنەوە، كە لێرەدا لە هێزی ئەوەدایە، سیفەتێك پاڵبدرێتە لای وەسفكراوێك.

﴿ وَحَاقَ بِئَالِ فِرْعَوْنَ ﴾، (حَاقَ: أي نَزَلَ أو أحَاطَ)، (حَاقَ): هەم بە مانای دەورەدان و گەمارۆدان دێ، هەم بە مانای هاتنە سەرو دابەزین، دێ، واتە: دابەزیە سەر دارو دەستەی فیرعەون خراپترین سزا، یاخود خراپترین سزا دەوری دان.

(الطبري) لە تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەكەدا دەڵێ: (فَدَفَعَ اللهُ عَنْ هَذَا الْمُؤْمِنِ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ، بِإِيمَانِهِ وَتَصْدِيقِ رَسُولِهِ مُوسَى، مَكْرُوهَ مَا كَانَ فِرْعَوْنُ يَنَالُ بِهِ أَهْلَ الْخِلَافِ عَلَيْهِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْبَلَاءِ، فَنَجَّاهُ مِنْهُ)[1].

واتە: خوا ﷻ لەو بڕوادارەی نێو دارودەستەی فیرعەونی دوور خستەوە، بە هۆی ئیمانەكەی و بەڕاستدانانی پێغەمبەرەكەیەوە، كە مووسایە، زیان و خراپەی ئەوە كە فیرعەون هەر كەسێك لە دژی جووڵابایەوەو سەرپێچیی لێكردبایە، سزای دەدا، خوا ئەوی لەو ئازارو ئەشكەنجەیە دەرباز كرد.

چونكە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: دوایی فیرعەون بە شێوەیەكی زۆر خراپ، ئەو پیاوە بڕوادارەی كوشتوە، ئنجا ئەگەر وابێ كە خوا دەفەرموێ: خوا پاراستی لە خراپەی پیلانی ئەوان، مەبەست ئەوەیە كە دەربازی كردوەو پاراستوویەتی لەوەی هەڵیگێڕنەوە، یان تەنازولیان بۆ بكات و دەستبەرداری ئایین و بەرنامەكەی ببێ.

بەڵام وەك (الطبري) گوتوویەتی و ڕواڵەتی ئایەتەكانیش دەیگەیەنێ، خوا ﷻ وەك چۆن ئیمانەكەی پاراستوەو ڕووحەكەی پاراستوە، جەستەكەشی پاراستبێ و زەفەریان پێ نەبردبێ، هەڵبەتە ئەگەر جەستەكەی چەند ڕۆژێكی دیكەش ژیا

---

(١) جامع البيان، ج٢٤، ص٦٨.

بێ، ماوەیەکی دیکەش ژیا بێ، بەڵام خوا ﷻ ئیمانەکەی سەلامەت کردبێ، مانای وایە هەر پارێزراو بووە، هەروەها ئەگەر ئەو چەند ڕۆژە، یان ئەو چەند ساڵەی دیکەش نەژیا بێ و، لەبەینیان بردبێ و سزایان دابێ، دیسان هەر پارێزراو بووە، مادام دەستبەرداری ئایین و عەقیدەکەی نەبووەو، پاشەکشەی نەکردوە.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، ئەمە دوو واتای لێوەردەگیرێن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی خنکێنرانی، فیرعەون و سوپایەکەی بێ لە دەریای سووردا.

ب- دەشگونجێ مەبەست سزادرانیان و سووتێنرانیان بێ لە جیهانی بەرزەخ دا.

٣)- ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾، ئاگر، بەیانیان و ئێواران لەسەری ڕادەنوێنرێن، واتە: دوای خنکێنرانیان، لە جیهانی بەرزەخیشدا، بەسووتێنران بەئاگر سزا دەدرێن، لەبەر ئەوەی سزای بەرزەخ یەکسەر دوای مردن دەست پێدەکات، بۆیە یەکسەر دواوەو بەبێ عەتفکردنەوەو بادانەوە باسی سزای بەرزەخ دەکات، هەروەک لە سوورەتی (نوح)یشدا خوا ﷻ شێوەی ئەوە بۆ گەلی نووح باس دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: بە هۆی خراپەکانیانەوە خنکێنران، نغرۆکران لە تۆفان دا، یەکسەر بە دوای ئەوەشدا خرانە نێو ئاگرەوەو، جگە لە خواش هیچ پشتیوان و هاوکارانێکیان دەست نەکەوتن، ئەمە لە سوورەتی (نوح)دا هاتوە، کەواتە: لەوێشدا یەکسەر خرانە نێو ئاگرەکەیان، دوای خنکێنرانیان، بە (فَاء التَّعْقِيْب) هاتوە، واتە: یەکسەر بەدوای خنکێنرانیاندا، خرانە نێو ئاگریشەوە، کە بە دڵنیایی مەبەست پێی ئەو ئاگرەیە، کە لە قۆناغی بەرزەخدا پێی سزا دەدرێن، چونکە دوایی لێرەش دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە ئاخیر زەمان (ٱلسَّاعَةُ) دێ، (فەرمان دەکرێ:) دارو دەستەی ففیرعەون بخەنە سەختترین ئازارو ئەشکەنجەوە.

(ٱلسَّاعَةُ ) لـە قورئانـدا بـە زۆریـی بـە مانـای ئاخیـر زەمـان دێ، ئـەو کاتـەی کـە ئـەم ژیانـە دنیایـەی تێـدا کۆتـا دێ، بـەڵام لـە هەندێـک شـوێندا (ٱلسَّاعَةُ ) بـە مانـای ڕۆژی دوایـی دێ، یاخـود بـە مانـای (قِيَامَـة) دێ، ئنجـا لێـرە بـە دڵنیایـی بـە مانـای (قِيَامَـة)ە، چونکــە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾، ئـەو ڕۆژەش کـە (ٱلسَّاعَةُ ) ڕاسـت دەبێتـەوە، واتـە: قۆناغـی دووەمـی ڕۆژی دوایـی دێ، کـە بریتیـە لـە زیندووکرانــەوەو لێپرسرانــەوە.

﴿ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾، فەرمـان دەکـرێ کـە فیرعــەون و شـوێنکەوتووانی بخەنـە نێـو سـەخترین سـزاوە، خوێنراویشـتەوە: (أَدْخُلُـوا آلَ فِرْعَـوْنَ أَشَـدَّ العَـذَاب)، واتـە: ئـەی شـیوێنکەوتووانی فیرعـەون، نیزیـکانی فیرعـەون! بچنـە نێـو سـەخترین سـزاوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾، یەکێـک لـە زانایـان ئـاوا مانـای کـردوون: دەڵـێ: (هُـوَ إِغْرَاقُهُـمْ فِي البَحْـرِ، الأَحْمَـرُ ثُـمَّ عَـذَاب الـبَرْزَخِ رَأْسَـاً، ثُـمَّ يَـوْمَ القِيَامَـة)، واتـە: سـێ جـۆرە سـزا بـۆ فیرعـەون و شـوێنکەوتووانی هـەن: خنکێنرانیـان لـە دەریـای سـووردا، ئنجـا یەکسـەر سـووتێنرانیان لـە قۆناغـی بەرزەخـدا بـە ئاگـر، دوای ئـەوەی قۆناغـی بەرزەخیـش بەسـەردەچێ، یەکسـەر چوونـە نێـو سـەخترین سـزاوە، لـە قیامەتـدا.

کەواتـە: ئـەوەی لـە قۆناغـی بەرزەخدایـە، لـە چاو ئـەوەی لـە قیامەتدایە، سـووکە، چونکـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾، ئـەو ڕۆژەی کـە قیامـەت دێ، بیانخەنە نێـو سـەخترین سـزاوە، کەواتـە: لـە قۆناغـی بەرزەخـدا سـزایەکەیان هەیـەو، هـەر دەسـووتێنرێن و، تەنیا بەیانیـان و ئێوارانـە، بـەڵام لـە ڕۆژی دوایـی دا بـەس بەیانیـان و ئێـواران نیـە، بەڵکـو سـزایەکەیان بەردەوامـەو نەپسـاوەیە.

(الطبري) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] ئـەم دەقـەی هێنـاوە: (عَـنِ السُّـدِّيِّ، قَـالَ: «بَلَغَنِـي أَنَّ أَرْوَاحَ قَـوْمِ فِرْعَـوْنَ فِي أَجْـوَافِ طَـيْرٍ سُـودٍ تُعْـرَضُ عَـلَى النَّـارِ غُـدُوًّا وَعَشِـيًّا، حَتَّـى تَقُـومُ السَّـاعَةُ»).

لـە سـوددیی گێڕدراوەتـەوە، گوتوویـەتی: پێمگەیشـتوە کـە ڕووحـەکانی گـەلی فیرعـەون لـە نێـو کەلـەشی باڵنـدانی ڕەش دان، بەیانیـان و ئێـواران ڕادەنوێنرێـن لەسـەر ئاگـر، تاکـو ئاخیـر زەمـان دێ، یاخـود تاکـو قیامـەت دێ.

کە گوتمان: ﴿ أَدْخِلُوٓاْ ﴾، خوێنراوەتەوەش: (أُدخُلوا):

أ)- ئنجا ئەگەر (أَدْخِلوا) بێ: (أَدْخِلُوا أَيُّهَا الْمَلَائِكَةُ! آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ)، واتە: ئەی فریشتەکان! فیرعەون و دارو دەستەکەی بخەنە نێو سەختترین سزاوە.

ب)- بەڵام ئەگەر (أُدْخُلُوا) بێ: (أُدْخُلُوا يَا آلَ فِرْعَوْنَ! أَشَدَّ الْعَذَابِ) واتە: ئەی فیرعەون و دارو دەستەکەی! بچنە نێو سەختترین سزاوە.

شـایانی باسـە: ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (المؤمنـون)دا لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـە موبارەکـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ۝١٠٠ ﴾، لـە پشـتیانەوە پەردەیـەک هەیـە تاکـو ئـەو ڕۆژەی کـە تێیـدا زینـدوو دەکرێنـەوە، لـەوێ باسـێکمانکرد لـە بـارەی قۆناغـی بەرزەخـەوە، باسـێکی مەیلـەو تێروتەسـەل لـە قـەدەر فەبـارەی ئـەم تەفسـیرەو، لێـرەدا دووبـارەی ناکەینـەوە، بـەڵام ئـەم فەرموودەیـە دێنیـن، کـە لەوێـش هێناومانـە:

{إِنَّ أَحَدَكُمْ، إِذَا مَـاتَ، عُـرِضَ عَلَيْـهِ مَقْعَـدُهُ بِالْغَـدَاةِ وَالْعَـشِيِّ، إِنْ كَانَ مِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ، فَمِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ، وَإِنْ كَانَ مِـنْ أَهْـلِ النَّـارِ فمـن أهـل النـار، فَيُقَـالُ: هـذَا مَقْعَـدُكَ حَتَّـى يَبْعَثَـكَ اللـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ} (أخرجـه البخـاري: ١٣٧٩، ومسـلم: ٢٨٦٦، والترمـذي: ١٠٧٢، والنسـائي في الكـبرى: ١١٤٦٣، وابـن ماجـه: ٤٢٧٠ عَـنِ ابْـنِ عُمَـرَ رضي اللـه عنهـما).

---

(١) جامع البيان: ج٢٤، ص ٤٠٣-٣٠٤.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: یەکێک لە ئێوە کە مرد، شوێنی نشینگەکەی (ئەو شوێنەی تێدا نیشتەجێ دەبێ) بەیانیان و ئێواران پیشانی دەدرێ، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێ، ئەوە شوێنی ئەهلی بەهەشتی پیشان دەدرێ، ئەگەر لە خاوەنانی ئاگریش بێ، شوێنی خاوەنانی ئاگری پیشان دەدرێ و، پێی دەگوترێ: ئەمە شوێنەکەتە تاکو خوا ڕۆژی قیامەت زیندووت دەکاتەوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: پیشانی دەدرێ، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە بەس پیشانی بدرێ، دەشگونجێ مەبەست چوونە دۆزەخ بێ، بەڵام زیاتر بەیانیان و ئێواران هەست بە سزایەکە بکات، یاخود هەست بە نیعمەت و خۆشییەکە بکات، بەڵام لە قیامەتدا بەردەوامە، بەیانیان و ئێواران و لە هەموو کاتەکاندا، ئەو سزایە بۆ دۆزەخییەکان هەیەو، ئەو نیعمەت و خۆشییەش بۆ بەهەشتییەکان هەیە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە لە دنیادا لە بەهەشتی ئیماندابین و، لە قۆناغی بەرزەخدا لە نێو نازو نیعمەتی خوادا بین و، لە ڕۆژی دواییشدا هەر لە بەهەشتەکانی خوادا بین، لە خزمەت پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ چونکە کەسێک لە دنیادا نەچووبێتە بەهەشتی ئیمان و بۆ خوا صوڵحانەوە، بە دڵنیایی لە بەرزەخیشدا، چاوی بەو بەهەشتە ناکەوێ و، لە ڕۆژی دواییشدا چاوی پێیناکەوێ.

بەڕێــــــــزان!

ژیان لە سایەی ئیماندا ژیانێکی پڕ چێژو لەززەتە، هەرچەندە مرۆڤ لە زینداندا بێ، ڕاکردوو و هەڵاتوو بێ، هەژار و نەدار و قەرزدار بێ، نەخۆش و دەردەدار بێ، بەڵام بە هۆی ئیمانەکەیەوە، هەست بە ئۆخژن و ئارامیی و دڵنیایی دەکات، بەڵام کە ئیمانی نەبوو، ئەگەر لە کۆشکێکدا بێ خشتێکی زێڕو خشتێکی زیو بێ، کە شتی وا هەرگیز لە دنیادا نەبووە، یان وەک کوردەواریی

دەڵێن: (سەری لە پڵاوو گۆشت بکێرێ)، بایی فلسێکە مادام لە دەروونەوە خۆشحاڵ نەبێ، ئیمانە کە ڕووحی ئینسان شاد دەکات، دڵی ئینسان خۆش دەکات، پەیوەندیی لەگەڵ خوایە، کە مرۆڤ شادمان و بەختەوەر دەکات، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨ ﴾الرعد، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو دڵیان بە یادی خوا ئارام دەگرێ، ئەها (ئاگاداربن!) هەر بەیادی خوا دڵان ئارام دەگرن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە دڵیان بە یادی خوا، بە هۆی ئیمان و بەهۆی پەیوەندییەوە لەگەڵ خواداو، بە هۆی بەندایەتییەوە بۆ خوا ئارامگرتوو، داسەکناو و ئۆخژن بۆ هاتوە.

## کورتە باسێک

## لێزانیی و حیکمەتی پیاوە بڕوادارە بەرگرییکارەکە لە مووسا

ئـەو پیـاوە بـڕوادارە کـە ئیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوە، بـە پێـی ئایەتەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ﴿٢٨﴾ ﴾، پیاوێکـی بـڕوادار لـە ئالی فیرعـەون [(آل) واتـە: دارو دەسـتە، نیزیکان و شـوێنکەوتووانی فیرعـەون]، کـە ئیمانەکـەی خـۆی شـاردۆتەوە، گـوتی، بـە پێی ئەم ڕسـتە قورئانییـەی ئەم ئایەتـە موبارەکـە، ئـەو پیـاوە پیاوێکـی دەسترۆیشـتوو بـووە لـە نێـو دەسـتەو دایـەرەی فیرعەونـدا، ئەگەرنا کابرایەکـی دیکـەی غـەوارە، یاخـود کـە ئـەو پێگـەو پلەیـەی نەبێ، نـە دەتوانـێ بێتـە کـۆڕو مەجلیـسی فیرعـەون و، نـە دەشـتوانێ بـەو شـێوەیە قسـە بـکات، ئنجـا بـا سـەرنج بدەیـن، ئـەو پیـاوە چەنـد حەکیـم و لێـزان بـووە:

١)- یەک لە حیکمەت و لێزانییەکانی ئەوەیە، کە دەڵێ: ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴿٢٨﴾ ﴾؟، بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە: ئایا هەر لەبەر ئەوە پیاوێک دەکوژن، کە دەڵێ: پەروەردگارم خوایە؟! واتە: پەروەردگاربوونی خوا ﷻ شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، هی ئەوە نیە خەڵکی لەسەر بکوژرێ، چونکە ئەوە داخوازی عەقڵە، داخوازی زگماکە، داخوازی زانستە، داخوازی واقیعە، کەواتە: نەدەبوو لەسەر ئەو قسە هەقە، ئەو پیاوە بکوژن، لێرەدا جارێ ئەو پیاوە بڕوادارە زۆر خۆی دەرناخات، بەس ئەوەندە دەڵێ: نابێ مرۆڤ لەسەر ئەوە بکوژرێ، کە دان بە پەروەردگارێتیی خوادا دێنێ بۆ خۆی.

٢)- دەڵێ: ﴿ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾، لە پەروەردگارتانەوە بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێناون، واتە: ئەو مووسایە ﷺ شایستەی کوشتن نیە چونکە: یەکەم: کە دەڵێ: پەروەردگارم خوایە، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویست و ئاشکرایە، دووەم: لەبەرئەوەی بەڵگەشی لە پەروەردگارەوە بۆ هێناون، بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێناون و بەبێ بەڵگە قسە ناکات.

٣)- دەڵێ: ﴿ وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَـٰدِقًا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡ ﴾، واتە: مووسا حاڵی لە دوو ئەگەر بەدەر نیە:

أ- یان ئەوەتا درۆ دەکات، ئەو کاتە زیانی درۆیەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوەو مەیدانی درۆیە کورتە.

ب- یاخود ڕاستگۆیە، ئەو کاتە ئەگەر هەمووشی نەبێ، هەندێک لەوەی هەڕەشەی پێتان لێ دەکات، تووشتان دێ، چونکە هەندێکی بەسەر جیلی یەکەمیان دێ و جیلەکانی دیکەی دوایی ئەوە نابینن، ئەگەر تەنیا مەبەست سزای دنیایی بێ، یاخود: ئەوەی مووسا هەڕەشەتان پێ لێدەکات، هەم سزای دنیاییە، هەم سزای ڕۆژی دواییە، سزای دنیاییتان هەر لە دنیادا دەیبینن و پێتان دەگات، ئەوەی ڕۆژی دواییش دوایی پێتان دەگات، بۆیە دەڵێ: هەندێک لەوەی کە بەڵێنتان پێدەدات واتە: هەڕەشەتان پێ لێدەکات، تووشتان دێ.

٤)- دەڵێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴾، بەدڵنیایی خوا ڕێنمایی کەسێک کە زێدەڕۆییکاری زۆر درۆزن بێ، ڕێنمایی ناکات.

ئەم قسەیە وەک تیغێکی دوو دەم وایە، واتە: ئەگەر گریمان مووسا پێغەمبەر نەبێ و بڵێ: پێغەمبەرم، ئەوە زۆر زێدەڕۆییکارەو، ئەگەر نوێنەری خوا نەبێ، بڵێ: نوێنەری خوام و خوا ناردوومی، مانای وایە زۆر درۆزنە، چونکە گەورەترین درۆ ئەوەیە ئینسان بە ناوی خواوە بیکات، بەڵام ئەو زیاتر مەبەستی پێ ئەوە بووە: کەسێک بڕوا بە پێغەمبەری نەهێنێ لە کاتێکدا کە بەڵگە گەلی لە خواوە هێناون، بەڵگە ڕۆشنەکان، مانای وایە زێدەڕۆییکارەو، کەسێک بڕوا بە پێغەمبەری خوا نەهێنێ و ڕەتی بکاتەوەو هەڕەشەی کوشتنی لێبکات، مانای وایە زۆریش درۆزنە، کە مەبەستی پێ فیرعەونە، واتە: قسەکەی بە هەردوو دیواندا دەگونجێ تەفسیر بکرێ، چونکە نایەوێ هەر لەو سەرەتاوە ناسنامەی خۆی کەشف بکات، بۆ ئەوەی ڕێی قسەکانی و ڕێی بەرگرییکردنەکەی لێ نەگیرێ.

٥)- چەند جارێک بە: ﴿ يَٰقَوۡمِ ﴾ دەیاندوێنێ، ئەی گەلەکەم! واتە: منیش یەکێکم لە خۆتان و، پیاوێکی غەوارەو بێگانە نیم پێتان، بەرژەوەندیی من بەرژەوەندیی ئێوەشەو، زیانی ئێوە زیانی منیشە.

٦)- واقیعی ئێستایان بەراورد دەکات، لەگەڵ هاتنی بەڵای خوادا: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەی گەلەکەم! ئەمڕۆ ئێوە حوکمڕانییتان هەیەو باڵادەستن لە زەویدا: ﴿ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ﴾، بەڵام کێ لە سزای خوا دەربازمان دەکات ئەگەر بۆمان هات؟ واتە: بەوەندە دەسەڵات و توانایەی هەتانە، بوغرا مەبن و لە خۆبایی مەبن، چونکە ئەگەر سزای خوامان بۆ هات، هیچ کەس ناتوانێ سەرمان بخات، خۆیشی لەگەڵ واندا حیساب دەکات.

٧)- دوای ئەوەی فیرعەون قسەی پێدەبڕێ، چونکە: ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا: ڕستە ئەگەر بە (ف) یان (و) یان (ثم) بانەدرێتەوە، مانای وایە هەر یەک قسەیە، کەواتە: قسەکەی فیرعەون بۆتە نێواخنی قسەی ئەو و قسەی پێبڕیوە، ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، فیرعەون گوتی: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە خۆم دەیبینم و هەرچی من دەیڵێم ڕاستەو، تەنیا بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییتان دەکەم.

ئنجا حیکمەتی ئەو پیاوە بڕوادارەش ئەوەیە کە هیچ تەعلیق لەسەر قسەکەی فیرعەون نادات، وەک ئەو قسەیە هەر نەکرابێ، چونکە قسەیەکی پووچ و بۆشەو خۆی بەسەرەوە نابات، خۆی پێیەوە سەرقاڵ ناکات، یەکسەر ئەو قسەی دیکەی بەدوادا دێنێ:

٨)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾، ئەوەی بڕوای هێنابوو گوتی: ئەی گەلەکەم! من مەترسیی ڕۆژی حیزبەکانم لێتان هەیە، واتە: مەترسیی ڕۆژانێک کە کۆمەڵە کافرەکان تێیان دا فەوتێنراون، ئنجا چەند نموونەیەکیان دەخاتە بەرچاو: ﴿ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا

لِّلْعِبَادِ ﴾، وەک عادەتی گەلی نووح و، (گەلی) عادو، (گەلی) سەموودو، ئەوانەی دوای وانیش، خواش ستەمی بۆ بەندەکان ناوێ، لێرەدا ئەو پیاوە بڕوادارە سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، کە ئێوە تاکە گەلێک نین و تاکە کۆمەڵگایەک نین، پێغەمبەرێکتان لە خواوە بۆ هاتبێ، بەڵکو گەلی نووحیش خوا نووحی بۆ ناردن و، گەلی عادیش خوا هوودی بۆ ناردن، گەلی سەموودیش خوا صاڵحی بۆ ناردن و، ئەوانەی دوای وانیش، بەڵام تەماشا بکەن سەرەنجامیان چۆن بوو، بۆ هەر کامێک لەوانە ڕۆژێک و کاتێک هەبوو تێیدا سزا بدرێن، لەبەر ئەوەی بە دەم بانگەوازی خواوە نەچوون، کەواتە: ئێوەش هەوڵبدەن بە مەرەدی ئەوان نەچن و پەند لەوان وەربگرن، ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴾، بە دڵنیایی خوا ستەمی ناوێ بۆ بەندەکانی، نایەوێ ستەمیان لێ بکات.

٩)- ئنجا لە دنیاوە دەیانبات بۆ قیامەت: ﴿ وَيَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴾ ئەی گەلەکەم! من مەترسیی ڕۆژی یەکدی بانگکردنم لێتان هەیە، ئەو ڕۆژەی خەڵک دەیکاتە بانگە بانگ، (التنادي) یانی: یەکدی بانگکردن، فریشتە مرۆڤان بانگ دەکەن، مرۆڤەکان هێندێکیان هێندێکیان بانگ دەکەن، مرۆڤەکان لە فریشتەکان دەپاڕێنەوە کە داوایان بۆ لە خوا بکەن، دەبێتە ڕۆژی یەکدی بانگکردن بە گشتیی، ﴿ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ﴾، ئنجا سروشتی ئەو ڕۆژەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە: ئەو ڕۆژەی پشت هەڵدەکەن، ڕادەکەن (لە سزای خوا)، بەڵام هیچ پارێزەرێکتان نیە لە سزای خوا، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾، هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات، هیچ ڕێنماییکارێکی نیە.

١٠)- ئنجا نموونەیەکیان هەر لە ژیانی خۆیاندا بۆ دێنێتەوە، کە ڕەوانەکرانی یوسوفە ﷺ بۆ لایان: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾، بە دڵنیایی پێشتریش یوسوف بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ هێنان، کەچی ئێوە لە بارەی ئەوەوە کە هێنابووی لە خواوە، هەر لە دوو دڵییدابوون، هەتا کاتێک کە مرد، گوتتان: لە دوای وی خوا هیچ پێغەمبەرێک ڕەوان ناکات، (واتە:

کەسی دیکە نایەت بڵێ: من پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوام، مانای وانیە کە بڕوایان بەوە بووە کە یوسوف پێغەمبەری خوایە واتە: کەسی دیکە نایێ ئەو ئیددیعایە بکات)، ﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾، خوا ئاوا بەو شێوەیە هەر کەسێک زێدەڕۆییکاری دڵ پڕ لە گومان بێ، گومڕای دەکات.

ئنجا ئەمە یان فەرمایشتی خوای پەروەردگارە، یان هەر قسەی خۆیەتی، کە پێناسەی ئەوانە دەکات: ﴿ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ﴾، ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا، بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ، ﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەو موناقەشەو شەڕەقسەیە بەبێ بەڵگە لە خواوە، مایەی گەورەترین ڕق و بوغزە لە لایەن خواوەو لە لایەن بڕوادارنەوە، ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾، هەر بەو شێوەیە خوا مۆر بەسەر هەر دڵێکی خۆ بەزلگری خۆسەپێنی خەڵک تێکشکێنەرەوە دەنێ.

دووبارە فیرعەون دێتەوە قسەوە: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴾، فیرعەونیش گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە (بینایەکی بەرز)، بەڵکو لەوێوە بگەمە ڕێبازەکان، ﴿ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ ﴾، دەروازەو ڕێبازەکانی ئاسمان تاکو لەوێوە تەماشای پەرستراوی مووسا بکەم، ﴿ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ﴾، من پێشم وایە مووسا درۆ دەکات، واتە: ڕاست ناکات پەرستراوی وی لە ئاسمانیش نیە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴾، بەو شێوەیە کردەوە خراپەکەی فیرعەون بۆ فیرعەون ڕازێنرابۆوەو لە ڕێ لادراو، پیلان و نەخشەی فیرعەونیش تەنیا لەسەر بە فەتارەت چووندابوو، کەواتە: ئەم قسەیەی فیرعەون کە بە هامان دەڵێ: کۆشکێکم بۆ دروست بکە، هەر فێڵێک بووە لە خەڵکەکەی کردوە، فێڵەکەش ئەوە بووە کە فیرعەون بە زمانی حاڵ بە خەڵکەکەی گوتوە: ئەو کەسەی مووسا دەڵێ: پەروەردگارمەو منی ناردوە،

هەر دەبێ لە شوێنێك هەبێ، باشە ئەوە لەسەر زەوی دیار نیە، دەبا ئاسمانی بۆ بپشکنین داخۆ لەوێ هەیە؟ ناشتوانین ئاسمان بپشکنین، کەواتە: هیچ بەڵگەیەک نیە لەسەر ئەوەی پەرستراوەکەی مووسا، پەروەردگارەکەی مووسا، بوونی هەبێ؟! ویستوویەتی ئاوا بەو شێوەیە خەڵکەکە چەواشە بکات.

١١)- دیسان ئەو پیاوە بڕوادارە خۆی بەسەر ئەو قسەی فیرعەونیشەوە نابات، چونکە دەزانێ قسەیەکی چەواشەکارانەیە، بەڵکو لەسەر قسەی خۆی بەردەوام دەبێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾، ئەمجارە ئەم پیاوە بڕوادارە، زیاتر پەردە لەسەر کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆی لادەدات و زیاتر خۆی دەناسێنێ: ئەوەی بڕوای هێناوە گوتی: ئەی خەڵکەکەم! شوێنم بکەون بەرەو ڕاستە ڕێ، بەرەو سەر ڕاستیی ڕێنماییتان دەکەم.

١٢)- ﴿ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴾، کە دەزانێ ئەو خەڵکە بە هۆی ژیانی دنیاوە، فیرعەونەکان باریان لێدەنێن و هەڵیان دەخەڵەتێنن، فیرعەونەکان دەستەمۆیان دەکەن، بۆیە دەیەوێ ژیانی دنیایان وەک خۆی پێ بناسێنێ، دەڵێ: ئەی گەلەکەم! ئەم ژیانە دنیایە تەنیا ڕابواردنێکی کاتییەو مەنزڵگای کۆتایی شوێنی تێدا نیشتەجێبوون و مانەوەیە، کەواتە: بەو تۆزە دنیایە کە بە دەستی فیرعەونەوەیە، خۆتان بێبەش مەکەن لەو مەنزڵگای کۆتاییە، ئەم ژیانی دنیایە هەرچۆن بێ دەبڕێتەوە.

١٣)- ئنجا هانیاندەدات بۆ ئەوەی خۆیان لە کردەوەی خراپ بپارێزن و، کردەوەی چاک بکەن: ﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ﴾، هەر کەسێک کردەوەیەکی خراپ بکات، تەنیا بە ئەندازەی خراپەکەی سزای دەدرێتەوە، ﴿ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾، بەڵام هەر کەسێک کردەوەی باش بکات، لە نێر یان لە مێ و، بڕواداریش بێ، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە، بەبێ ئەژمار بژێویان دەدرێتێ، واتە: بۆیان ناژمێردرێ هێندە زۆرە.

١٤)- ئنجا شێوەی دواندنەكەی توندتر دەكات لە خەڵكەكە، واتە: لە قیبتییەكان، گەلی فیرعەون: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، ئەی گەلەكەم! ئەوە چیمە (زۆر جێی سەرسوڕمانە) كە من بانگتان دەكەم بۆ سەرفرازیی و دەربازبوون و، ئێوەش من بانگ دەكەن بۆ ئاگر، واتە: من بانگتان دەكەم بۆ ئیمان هێنان بە مووساو پەیامەكەی وی، كە ڕێی دەربازبوونە، ئێوەش من بانگ دەكەن بۆ كۆیلایەتیی بۆ فیرعەون، كە ئەوە ڕێی چوونە نێو ئاگرە.

١٥)- ئنجا زیاتر پەردە لەسەر پەیامەكەی خۆی لادەدات: ﴿ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴾، ئێوە من بانگ دەكەن كە بێبڕوابم بە خواو، شتێكی بكەمە هاوبەش، كە زانیارییم لە بارەیەوە نیە، هاوبەشی خوا بێ، (كە بریتیە: لە فیرعەون)، منیش بانگتان دەكەم بۆ لای خوای باڵا دەستی لێبوردە.

یانی: باڵا دەست بەسەر فیرعەونیشداو، لێبوردەیە بۆ ئێوەش ئەگەر بگەڕێنەوە.

١٦)- دوایی دەڵێ: ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، هیچ گومانی تێدانیە ئەوەی ئێوە منی بۆ لای بانگ دەكەن، نە لە دنیاداو نە لە دواڕۆژدا، هیچ بانگكردنی نیە، واتە: بانگی بەندەكان و مرۆڤەكان ناكات، بیپەرستن، چونكە شایستەی پەرستران نیە، یاخود: هیچ وەڵامێكی نیە بۆ هیچ پاڕانەوەیەك، هەرچەندە پەرستەرەكان لێیان بپاڕێنەوە، بەڵام هیچ وەڵامیان نیە نە لەدنیادا، نە لە دواڕۆژیشداو لە فریایان نایەن، ﴿ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، بە دڵنیایی گێڕانەوەمان، شوێنی گەڕانەوەمان تەنیا بۆ لای خوایە، ﴿ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، زێدەڕۆییكارەكانیش هاوەڵانی ئاگرن.

١٧)- لە كۆتایی دا دەڵێ: ﴿ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡ ﴾، لەمەودوا دێتەوە بیرتان، ئەوەتان بەبیردێتەوە كە من ئێستا پێتان دەڵێم، واتە: ڕۆژێك دێ ئەو قسانەی

من دێننەوە بیر خۆتان و پەشێمان دەبنەوە لەسەر ئەوەی بە قسەی منتان نەکردوە، ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، کاری خۆشم بە خوا دەسپێرم، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەری بەندەکانیەتی، مسۆگەریش خوا ﷻ دەربازی کردوە لە فیرعەون و دارو دەستەکەی وەک فەرموویەتی: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾.

ئەمە کورتە باسێک بوو، لە بارەی ئەو حیکمەت و لێزانییەی ئەو پیاوە بڕوادارە بەکاری هێناوە لە حاڵەتی بەرگریکردنی لە مووسادا ؑ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی حیکمەت و لێزانی بە هەموو لایەکمان ببەخشێ لە کاتی قسەکردنماندا، بە تایبەت لە کاتی خەڵک بانگ کردنماندا بۆ لای خوا ﷻ.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان چـوارده (١٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٤٧ - ٦٠)، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم چـوارده ئایەتـە، بـاسی (ڕۆژی دوایی)یـە.

ئنجـا بـاسی خواناسـیی و بەڵگـەکانی خواناسـیی، لـە میـانی پێشـاندانی نیعمـەت و چاکـەکانی خـوا لـە ژیـانی مرۆڤـدا.

دوایی باسی ئیمان بە خوا ﷻ، باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی.

لە نێواخنـی ئەوەشـدا، چەنـد ڕاسـتییەکی گـەورەو گرنگـی جـۆراو جـۆر، ئاوێتـەی ئـەو تەوەرانـە کـراون، وێـڕای چەنـد ڕێنماییەکـی گرنـگ بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺو، بـۆ بڕوادارانـی شـوێنکەوتووی.

﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا
كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ
ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓاْ
أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ بَلَىٰ قَالُواْ فَٱدْعُواْ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ
ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ
ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدًى
وَذِكْرَىٰ لِأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ
وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ

ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَـٰلِغِيهِ
فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا يَسْتَوِى
ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ قَلِيلًا مَّا
تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَـَٔاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا
يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ
عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها یاد بکەوە (ئەی موحەممەد! ﷺ) کاتێک (بێبڕوایەکان) لە نێو ئاگر (ی دۆزەخ)دا مشتومڕو دمبەدمە دەکەن، ئنجا بێهێزەکان بەوانەی خۆیان بەزلگرتوە دەڵێن: ئێمە (لە دنیادا) شوێنکەتووتان بووین، ئایا (ئێستا) ئێوە بەشێک لە ئاگرمان لە کۆڵ دەکەنەوە (لێ دوور دەخەنەوە)؟ ﴿٤٧﴾ ئەوانەی خۆیان بەزلگرتوە گوتیان: ئێمە هەموومان تێیداین، بێگومان خوا دادوەریی لە نێوان بەندەکاندا کرد (بڕیاری لە بارەوەدان) ﴿٤٨﴾ هەروەها ئەوانەی لە ئاگر (ی دۆزەخ)دان بە دۆزەخەوانەکان (ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن) یان گوت: (بۆمان) لە پەروەردگارتان وەپاڕێن یەک ڕۆژ ئازارمان لەسەر سووک بکات! ﴿٤٩﴾ (دۆزەخەوانەکان) گوتیان: ئایا پێغەمبەرانتان بەڵگە ڕۆشەکانیان بۆ نەهێنان؟ گوتیان: با، فریشتەکان گوتیان: دەجا (خۆتان) بپاڕێنەوەو پاڕانەوەی بێبڕوایانیش بەس زایە بوویە (و هیچ ئەنجامێکی نیە) ﴿٥٠﴾ بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە، سەردەخەین لە ژیانی دنیاداو لە دوارۆژیشدا، کە شایەدەکان هەڵدەستن (بۆ شایەدیی دان) ﴿٥١﴾

ئەو ڕۆژە کە ستەمکاران پۆزشەکەیان سوودیان پێناگەیەنێ و نەفرینیان لێیەو، خراپترین مەنزڵگایان جێیە ﴿٥٢﴾ بێگومان ڕێنماییمان بە مووسا داو، کتێبەکە (تەورات)یشمان کردە میراتی گەلی بەنی ئیسرائیل ﴿٥٣﴾ ڕێنمایی و بیرخەرەوە بوو بۆ خاوەن عەقڵان ﴿٥٤﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) خۆت ڕابگرە بێگومان بەڵێنگەی خوا هەق (و ڕاست)ەو، داوای لێبوردن لە خوا بکە بۆ گوناهت و، بە ستاییشکردنەوە لە ئێواران و بەیانیاندا پەروەرەدگارت بە پاک بگرە ﴿٥٥﴾ بێگومان ئەوانەی بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان لە (خواوە) بۆ بێ، مشتومڕ (و شەڕە قسە) لە بارەی ئایەتەکانی خواوە دەکەن، تەنیا (بەهۆی ئەوەوەیە) خۆ بەزلگرییەک کە پێی ناگەن، لە سینەکانیان دایە، دەجا پەنا بە خوا بگرە، مسۆگەر ئەو بیسەری بینەرە ﴿٥٦﴾ بە دڵنیایی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکرنی خەڵک گەورەترە، بەڵام زۆربەی خەڵک نازانن ﴿٥٧﴾ کوێرو بینەریش یەکسان نین، هەروەها ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان دەکەن و، خراپەکاریش وەک یەک نین، بە کەمیی بیردەکەنەوە (و پەند وەردەگرن) ﴿٥٨﴾ بێگومان کاتەکە(ی هاتنی ڕۆژی دوایی) هەردێ، بەڵام زۆربەی خەڵک بڕواناهێنن ﴿٥٩﴾ پەروەردگاریشتان فەرمووی: لێم وەپاڕێن (مسۆگەر) وەڵامتان دەدەمەوە، بەدڵنیایی ئەوانەی لە بەرانبەر پەرستنمدا خۆیان بە زلدەگرن، بە زەبوونیی دەچنە نێو دۆزەخەوە ﴿٦٠﴾.

## ڕوونکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ): لە نێو ئاگری دۆزەخدا مشتومڕ دەکەن، شەڕە قسە دەکەن (المُحَاجَّةُ: أنْ يَطْلُبَ كُلُّ وَاحِدٍ أنْ يَرُدَّ الآخَرَ عَنْ حُجَّتِهِ وَمَحَجَّتِهِ)، (مَحَاجَّة) لەوەیە کە دوو لایەنی دژ بەیەک، پێچەوانەی یەک، هەر کامێکیان بیەوێ بەرانبەرەکەی لە بەڵگەکەی لابدا، یاخود لە ڕێیەکەی لابدا.

(مُّغْنُونَ عَنَّا): دەگوترێ: (أَغْنَى عَنْهُ كَذَا: إذَا كَفَاهُ، وَأغْنَانِي كَذَا: كَفَانِي وَغَنِيَ فِي مَكَانِ كَذَا: إذَا طَالَ فِيهِ مَقَامُهُ مُسْتَغْنِياً بِهِ عَنْ غَيْرِهِ)، ﴿مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ ئایا بەشێک پشکێک لە ئاگرمان لێ لە کۆڵ دەکەنەوە، لێ دوور دەخەنەوە؟ دەگوترێ: (أَغْنَى عَنْهُ كَذَا) واتە: ئەو شتەی لە کۆڵکردەوە، (أَغْنَانِي كَذَا) واتە: ئەو شتە بەسم بوو، بێ نیازی کردم، (غَنِيَ فِي مَكَانِ كَذَا) واتە: زۆر لەوێدا مایەوە، کە بە هۆی ئەو شوێنەوە بێنیازبوو لە شوێنێکی دیکە.

(مَعْذِرَتُهُمْ): (العُذْرُ: تَحَرِّي الإنْسَانِ مَا يَمْحُو بِهِ ذُنُوبَهُ)، (عُذْر): بریتیە لە خەفتانی مرۆڤ لە شتێک کە گوناحەکە خۆی پێ بسڕێتەوە.

(دَاخِرِينَ): (جَمْعُ دَاخِرٍ وَهُوَ الذَّلِيلُ)، (دَاخِرِين) کۆی (دَاخِر)ەو بە مانای زەبوون، ملکەچ، ڕیسوا، سەرشۆڕ دێ، کەواتە: (دَاخِرِين) بە سەرشۆڕیی و زەبوونیی، بە ملکەچیی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای بەرزی مەزن ﷻ لەم چواردە ئایەتەدا، سەرەتا بۆمان باسی سەرەنجام و ئاکامی شوومی بێبڕوایان دەکات، بە هەردوو جۆری: خۆبەزلگران کە سەرکردەیان بوون و، بێهێزەکان کە شوێنکەوتوو لاساییکەرەوەی ئەوان بوون، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ ﴾، یاد بکەوە ئەی موحەممەد ﷺ! و ئەی هەر کەسێک کە قورئان دەخوێنێ! چی یاد بکاتەوە؟ ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ ﴾، ئەو کاتە کە لە نێو ئاگردا شەڕە قسە دەکەن، دم بە دمەو مشتومڕ دەکەن، هەر کامێکیان بەڵگەی خۆی دێنێتەوە، ﴿ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ ﴾، بێهێزەکان بەوانەی کە خۆیان بەزلگرتوە دەڵێن: ﴿ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا ﴾، ئێمە پێشتر شوێنکەوتووی ئێوە بووین، بە دوای ئێوەدا هاتین، ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾، ئنجا ئایا ئێوە بەشێک لە ئاگرمان لە کۆڵ دەکەنەوە، لێمان دوور دەخەنەوە؟ دەگونجێ بە جیددییان بووبێ، لە دنیادا هێندە خۆیان پێ هیچ و پووچ و شوێنکەوتەی داماو و زەلیل بووەو، هەر چاوەڕوانییان لەو خۆ بەزلگرانە هەبووە، وایانزانیوە لە ڕۆژی دواییش دا، شتێکیان بە دەستە، بۆیە ئەو داوایەیان لێکردوون، دەشگونجێ ئەوە بە توانج و بە تەوسەوەبێ، واتە: ئێوە کە ئێمەتان بەو دەردە برد، ئایا ئێستا هیچتان پێدەکرێ بۆ ئێمە؟

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ ﴾، ئەوانەی خۆبەزلگربوون گوتیان: ئێمە هەموومان لێرەداین، هەمووومان تێیداین لە ئاگری دۆزەخداین، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾، بە دڵنیایی خوا دادوەریی کردوە لە نێوان بەندەکانداو، بڕیاری داوە، واتە: خوا ﷻ ئێوەش و ئێمەشی هێناوەتە ئێرە، کەواتە: ئێستا ئێوە گلەیی لە ئێمە مەکەن، چونکە بڕیاری خوا، حوکمی خوا

دادگەرانەیە، کەواتە: گلەیی لە ئێمە مەکەن، کە لە دنیادا شوێنکەوتوومان بوون، ئێستا شتێکتان بۆ بکەین، هیچمان پێناکرێ، بەڵام ئێوەش ستەمتان لێنەکراوە، چونکە بە بڕیاری خوا لێرەن، کەواتە: ئێوەش سزای کردەوەی خۆتان دەچێژن، ئەوە نابێتە بیانوو پاساو، کە لە دنیادا ئێمە هەڵمان خەڵەتاندوون و شوێنی ئێمە کەوتوون!

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ﴾، ئەوانەش کە لە نێو ئاگردان بە دۆزەخەوانەکانیان گوت: (خَزَنَة) کۆی (خازِن)ە، واتە: کۆکەرەوە، ئەوانەی خەڵک لە دۆزەخدا کۆ دەکەنەوە، کەواتە: دۆزەخەوان، ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ ﴾، ئەوانەی لە ئاگردان، واتە: هەم خۆ بەزلگرەکان و هەم شوێنکەوتووەکانیان، هەم بێهێزو دەست و پێوەندەکان و، هەم ئەوانەی شوێنیان کەوتوون، هەموویان وێکڕا بە دۆزەخەوانەکان دەڵێن: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾، لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، یەک ڕۆژ لە سزای ئاگری دۆزەخمان لەسەر سووک بکات، هەر یەک ڕۆژ سزامان لەسەر هەڵگرێ.

﴿ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ﴾، فریشتەکان، دۆزەخەوانەکان پێیان دەڵێن: ئایا پێغەمبەرانتان بەڵگە ئاشکرایەکانیان بۆ نەهێنان؟ ﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ ﴾، گوتیان: با، بەڵگە ئاشکرایەکانیان بۆ هێناین لەسەر ڕاستییەتیی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و، پەرستراوێتیی خواو، لەسەر ڕاستییەتیی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و ڕاستییەتیی ئایین و بەرنامەیەک کە خوا بە پێغەمبەراندا (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوویەتی، دانی پێدا دێنن، ﴿ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ﴾، فریشتەکان پێیان گوتن: کەواتە: خۆتان بپاڕێنەوەو داوا بکەن، ئێمە داوای بێ جێ ناکەین، فریشتەکان داوایەک ناکەن جێگا نەگرێ، وەک گوتراوە: (قسە بکە جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەر بگرێ)، فریشتەکان لەوە عاقڵترن و لەوە بۆ خوا صوڵحاوترن، داوایەک لە خوا بکەن، بزانن وەرناگیرێ،

﴿ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴾، هـەر لـە سـەرەتاوەش پێیـان دەڵێـن: پاڕانـەوەی بێبڕوایـان هـەر لـە ونبـوون و زایەبـوون دایـە، واتـە: هەرچەنـد بپاڕێنـەوە، جـێ ناگـرێ و بـێ سـوودە.

ئنجـا خـوا ﷻ وەک ڕاسـتیەکی گـەورەو گرنـگ لـە ژیـانی بەشـەردا، بـە جەختکردنـەوەوە ڕایدەگەیەنـێ و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە پێغەمبەرانمـان (عَلَيْهِـم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەوانـەش کـە بڕوایـان هێنـاوە، سـەردەخەین و پشـتیان دەگریـن لـە ژیـانی دنیـاداو، لـەو ڕۆژەشـدا کـە شـایەدەکان ڕاسـت دەبنـەوە، شـایەدەکان ڕاسـت دەبنـەوە بـۆ شـایەدیی دان، کێـن شـایەدەکان؟ فریشـتەکانن، پێغەمبەرانـن (عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، شـەهیدانن، زانایانـن، بـۆ خـوا صوڵحاوانـن، هـەر کەسـە بەپێـی خـۆی، ئەوانـە هەڵدەسـتێ شـایەدیی دەدەن لەسـەر خەڵـک، کەسـێک ئایینـی خـوای پـەروەردگاری بـە خەڵکێـک ڕاگەیاندبـێ، دەبێتـە شـایەد بـە سـەریانەوە، پێغەمبـەران شـایەدن (عَلَيْهِـم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، فریشـتەکان شـایەدن کـە دەڵێـن: ئێمـە ئاگەداریـن خـوا پێغەمبـەرانی بـۆ نـاردن، هەروەهـا زانایـان و پێشـەوایان، هەروەهـا شـەهیدان، هـەر کەسـە لـە قـەدەر خـۆی دەبێتـە شـایەد، ﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡ ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە ستەمکاران پۆزشـەکەیان، داوای لێبوردنەکەیـان سـوودیان پێناگەیەنـێ، ﴿ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾، نەفریـن بـۆ ئـەوان هەیـەو خراپتریـن مەنزڵـگاش بـۆ ئـەوان هەیـە، کـە دۆزەخـە.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـێکی دی: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە ڕێنماییـمان بـە مووسـاداو، کتێبکـمان کـردە میـراتی وەچـەی بەنـوو ئیسـرائیل (نەتـەوەی جوولەکـە، کـە گـەلی مووسـا بـوون ؑ)، ﴿ هُدٗى وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، ڕێنمایـی و بیرخـەرەوە بـوو بـۆ خـاوەن عەقـڵان، هەڵبەتـە ئـەم ئایەتانـە هەموویـان پێکـەوە پەیوەسـتن، واتـە: موحەممەدیـش ﷺ کـە بـە هیدایـەتی خـواوەو، بـە کتێبـی خـواوە بۆتـان هاتـوە،

بیدعـەت و داهێنراوێـک نیـە، بـێ پێشـینە بووبـێ، بەڵکـو ئەوەتـا مووسـا ﷺ کـە زۆر نـاوداره‌و گـەلی جوولەکـە کـە زۆر نـاودارن و لەگەڵتـان هـەن، بـە تایبـەت لـە نێـو دورگـەی عەرەبیـی دا، کتێبەکـەشی کـە تەوراتـە، زۆر نـاوداره، خـوا لـە گـەلانی پێشێنـدا پێغەمبـەرانی هـەر نـاردوون، بـۆ وێنـە مووسـا ﷺ کـە زۆر زەقـەو، بـۆ گـەلی جوولەکـە نێـردراوەو خـوا تـەوراتی پێـداوە.

ئنجـا بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، خۆڕاگربە، بـە دڵنیایـی بەڵێنـی خـوا ڕاسـتە، دێتـە دی و چەسـپاوە:

أ- بەڵێنی خوا کە دەفەرموێ: سەرت دەخەم.

ب- بەڵێنی خوا کە دەفەرموێ: ڕۆژی دوایی دێ، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دێ، ئەو بەڵێنە ڕاستە.

﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴾، داوای لێبوردنیـش بـۆ گوناهەکـەت بکـە، داوای لێبـوردن لـە خـوا بکـە لـە شـتێک، کـە بـۆ تـۆ بـە گونـاح لـە قەڵـەم دەدرێ، ئەویـش ئەوەیـە پێغەمبـەر ﷺ لـە بۆچوونێکیـدا نەیپێکابـێ، کۆششـێکی کردبـێ و هەقـی تێـدا نەپێکابـێ، یـان پێـش ئـەوەی وەحیـی لـە بـارەی پرسـێکەوە بۆبـێ، ڕایەکـی بـوو بـێ، ڕایەکـەی ڕاسـت دەرنەچووبـێ، کـە ئـەوە بـە گونـاح لـە قەڵـەم نـادرێ بـۆ ئێمـەو مانـان، بـەڵام بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بـە کـەم و کوڕیـی لـە قەڵـەم دراوە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: داوای لێبـوردن بـۆ گوناهەکـەت بکـە، وریابـە! گوناهـی پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ و پێغەمبـەران بـە گشـتیی، بـەو واتایـە نیـە کـە شـتێک زانیبیـان گوناهـەو کردبێتیـان، پێغەمبـەران لـەوە پارێـزراو بـوون، بـەڵام جـاری وا هەیـە شـتێک وایانزانیـوە وا باشـەو کردوویانـە، یـان گوتوویانـە، دواییـش خـوای پـەروەردگار بـۆی ڕاسـتکردوونەوە کـە نەخێـر وا بـاش نیـەو نەتانپێـکاوە، ﴿ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴾، هەروەهـا بـە ستاییشـکردنی پەروەردگارتـەوە بـە پاکـی بگـرە، واتـە: هـەم خـوا بـە پـاک بگـرە، هـەم

ستایشی بکە، هەم بڵێ: (سُبْحَانَ اللە) هەم بڵێ: (الحَمْدُللە)، خوا بە پاک بگرە لە هەر لەکەو کەم و کوڕییەک و، ستاییشی بکە بە هەموو سیفەتێکی بەرزو جوان و بە هەموو خەسڵەتێکی ئەوپەڕی بەرزو پەسند، کە بەس شایستەی خوان، ﴿ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَـٰرِ ﴾، لە تێواران و بەیانیاندا، کە دوو کاتی زۆر دڵ بزوێنن، تێوارە ڕەمزی کۆتایی هاتنی ژیانی دنیایەو، بەیانیان ڕەمزی دەستپێکردنی ژیانی دنیایە، دوو کاتی زۆر دڵ بزوێنن، بۆیە لە قورئاندا زۆر باسیان کراوە.

ئنجا دێتە سەر مەسەلەیەکی دیکە کە هەر پەیوەستە بە ڕەوتی ئەو ئایەتانەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی مشت و مڕو شەڕە قسە دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا، بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ، واتە: بێ ئەوەی موناقەشەو توێژەکەیان پشت ئەستوور بێ بە بەڵگەیەکی لە خواوە هاتوو، بەڵگەیەکی نەقلیی، ﴿ إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ ﴾، واتە: (مَا فِي صُدُورِهِم إلاّ الكِبْر) لە سینەکانیاندا تەنیا خۆ بەزلگریی هەیە، ﴿ مَّا هُم بِبَـٰلِغِيهِ ﴾، ناشگەن بەو خۆ بەزلگرییە، واتە: ئەوانە بۆیە ملکەچ ناکەن بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو بۆ پەیامەکەی، لەبەر ئەوەی چاویان لە باڵا دەستییەو، چاویان لە خۆ سەپاندن و خۆڕانانە بەسەر خەڵکدا، ئەوەیە وایان لێدەکات کە ملکەچیی نەکەن بۆ ئایەتەکانی خواو، شەڕەقسە بکەن لە دژی ئایەتەکانی خواو، پابەندی پەیامی خواو بەرنامەی خوا نەبن، چونکە بەزم و بازاڕێک کە سازیان کردوەو، خۆ بەزلگریی و خۆ سەپاندنێک کە چاویان لێیەتی، ئەوەیان لێ تێکدەچێ، کە ئەوەش هەر پێی ناگەن واتە: با چەند ڕۆژێکی دنیاش بگوزەرێنن، بەڵام سەرەنجام بێ ناکام دەبن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَّا هُم بِبَـٰلِغِيهِ ﴾.

﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾، ئنجا تۆ پەنا بە خوا بگرە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر بیسەرە، زۆریش بینەرە، هەموو دەنگ و هەست و خوستێک دەبیستێ و، هەموو جموجۆڵ و شتێکیش دەبینێ.

﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ ﴾، بە دڵنیایی دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، گەورەترە لە دروستکرانی خەڵک، واتە: ئەوە کە خوا گەردوونی هێناوەتە دی، بە لای ئێوەوە قورسترە لەوەی مرۆڤێک بهێنێتە دی، یاخود: ئەوە کە خوا گەردوونی هێناوەتە دی، گەورەترە لەوەی مرۆڤێک دوای ئەوەی دەمرێ، زیندووی بکاتەوەو دروستی بکاتەوە، واتە: دروستکردنی گەردوون لە دروستکرانی مرۆڤان گەورەترە، قورسترو سەختترە، بە پێوانەو کێشانەی ئێوە، ئەگەرنا بۆ خوای پەروەردگار قورس و سووک نیە، هەمووی وەک یەکە، یاخود دروستکرانی گەردوون و ئاسمانەکان و زەوی، بەسەرو خواری ئەو بەدیهێنراوانەوە قورسترەو گەورەترە لە زیندووکردنەوەی خەڵک، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، زۆربەی خەڵکی نازانن سیفەتەکانی خوا سنوورێکیان نیەو ڕەهان، خوا هەموو شتێک دەزانێ، هەموو شتێک دەتوانێ، خوا ﷻ هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾یس، واتە: فەرمانی خوا ئەگەر ویستی شتێک بێنێتە دی، بەس پێی بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ، ﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ﴾، کوێرو بینەر وەک یەک نین، یەکسان نین، هەروەها ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون و، خراپەکار یەکسان نین، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴾، بە کەمیی بیر دەکەنەوەو پەند وەردەگرن، ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا ﴾، (ساعة) واتە: کاتی کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە، یاخود کاتی زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوەی مرۆڤەکان و جندیش، بە مسۆگەریی هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، واتە: دوو دڵیی هەڵناگرێ، ئەگەر بە چاوی عەقڵ تێبفکرن، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵک بڕواناهێنن، بەڵام بۆچی خەڵک بێبڕوایە؟ لەبەر ئەوەی نایانەوێ بڕوابێنن، ئەگەرنا پەکیان نەکەوتوە لەسەر بەڵگە، لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوەوە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾، پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپارێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە، بە دەنگتانەوە دێم، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە بەرانبەر بەندایەتیی کردندا بۆ من، خۆیان بەزلدەگرن، ﴿ سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾، بە سەرشۆڕیی و زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە، ئەوانەی لە دنیادا لە بەرانبەر خوادا خۆیان بەزلدەگرن، خوا لە ڕۆژی دواییدا زەبوون و سەرشۆڕو زەلیلیان دەکات، چونکە لە دنیا خوا تۆی هێناوەتە دی و دەتژیەنێ و، ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی بۆ ڕەخساندووی، کەچی لە بەرانبەر خواو بەدیهێنەرو خاوەنی خۆت دا، خۆت بەزلبگری، شایستەی ئەوەی کە سزا بدرێی، ئەو کەسەش کە لە بەرانبەر خوادا خۆی بەزلدەگرێ، تەماشای دەکەین لە بەرانبەر مەخلووقێکدا خۆی بە کەم دەگرێ، ئەو خوایە ﷻ بەرزو مەزن و میهرەبان و کارزانە، لە بەرانبەریدا خۆی بەزلدەگرێ، کەچی لە بەرانبەر دروستکراوێکدا، یان لە بەرانبەر تەماعێکداو ترسێکداو ئارەزوویەک دا، خۆی بچووک دەنوێنێ، مرۆڤی ئاوا، شایستەی ئەوەیە خوا بە زەبوونیی و سەر شۆڕیی و داماویی، بیخاتە دۆزەخەوە.

خوا پەنامان بدات لەوەی لە دنیادا خۆمان بە زلبگرین لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ خواداو، سەرەنجام لە دواڕۆژدا بە زەبوونیی و داماویی، بچینە نێو دۆزەخەوە، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لە دنیادا بەهۆی بەندایەتییەوە بۆ خۆی، عیززەت و بەرزییمان بۆ بڕەخسێنێ، تاکو لە ڕۆژی دواییشدا سەر بەرزانە بچینە بەهەشتەکانی خواوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**شەڕەقسەو دەمەقاڵەی بێبڕوایان لە دۆزەخداو، داواکردنی بێهێزەکان لە خۆبەزلگرو خۆسەپێنەکان، کە بەشێک لە سزای ئاگریان لە کۆڵ بکەنەوەو، لێیان دووربخەنەوەو، وەڵامدانەوەی ئەوانیش بەوە کە: بڕیاری خوا دراوەو، کۆتایی بە هەموو شتێک هاتوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي ٱلنَّارِ ﴾، یاد بکەوە! ئەو کاتەی لە نێو ئاگردا مشت و مڕو شەڕە قسە دەکەن، واتە: ئەوانەی بێبڕوان، کە شایستەی ئەوە بوون بچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، لەوێدا شەڕەقسەو مشتومڕ دەکەن. (**التَّحَاجُّ: الإِحْتِجَاجُ مِنْ جَانِبَيْنِ فَأَكْثَرَ**)، (**تحاجّ**): بریتیە لە بەڵگە هێنانەوە لە لایەن دوو لاوە، یاخود زیاتر، بۆ یەکدی، هەر لایەک بەڵگە بۆ وی دیکە بهێنێتەوە، بۆ سەلماندنی ڕاستیی قسەی خۆی و، بە هەڵەداچوونی لایەنی بەرانبەری، لێرەش وەک زۆربەی شوێنەکانی دیکەی قورئان، وشەی (**إِذْ**) کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ ﴾، (**إِذْ: مَعْمُولٌ «لاذْكُرْ» مَحْذُوفٌ عَطْفاً عَلَى جُمْلَةِ: وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الآزِفَةِ**)، ئەوە ڕای یەکێک لە توێژەرەوانی قورئانە، کە (**إِذْ**) بەرکاری

(أذكر)ەو بادراوەتەوە سەر ڕستەی (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الأَزِفَةِ)، دەشگونجێ یەكی دیكە بڵێ: نەخێر بەڵكو بادراوەتەوە سەر ڕستەیەكی دیكە، نەك هێندە دوور ڕۆیشتبێتەوە بۆ سەرەتا.

كە دەفەرموێ: (وَإِذْ) واتە: (وَاذْكُرْ إِذْ يتحاجُّون في النار) یاد بكەوە! كاتێك كە لە نێو ئاگردا، شەڕەقسەو مشتومڕ دەكەن.

٢)- ﴿ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ ﴾، بێهێزەكان بەوانەی خۆیان بەزلگرتوە دەڵێن، ئایا بێهێزەكان مەبەست پێیان كێیەو، ئەوانەی خۆیان بە زلگرتوە، مەبەست پێیان كێیە؟ (الضُّعَفَاءُ: عَامَّةُ النَّاسِ الَّذِيْنَ لَا تَصَرُّفَ لَهُمْ فِي أُمُورِ الأُمَّةِ)، باشتر وایە بگوترێ: (لَا تَصَرُّفَ لَهُمْ فِي أُمُورِهِمْ)، (ضُعَفَاء) خەڵك بە گشتیی ئەوانەن كە دەستەوەردان و دەستەڵاتیان نیە بەسەر كاروباری كۆمەڵگادا، یان بەسەر كاروباری خۆیانداو كاریان بە دەست خەڵكی دیكەوەیە، (الَّذِيْنَ اسْتَكْبَرُوا)، ئەوانەی خۆیان بە زلگرتوە، ئەوانەن كەخۆسەپێنن و بە ناهەق خۆیان كردوە بە حوكمڕانی خەڵك، ئەگەرنا كۆمەڵگا دەبێ حوكمڕان و مشوورخۆری هەر هەبن، بەڵام ئەگەر بە ناهەق بێ و بە ناشایستەیی بێ، یان بە شێوازی ناشەرعییانە بێ، وەك حوكمی میراتیی و بنەماڵەیی، یان حوكمی خۆسەپاندن، یان بە تەزویرو فرت و فێڵ، ئەوە بێگومان ئەو كاتە حاڵەتی (إِسْتِكْبَار) ڕوودەدات، واتە: خۆ بەزلگریی و خۆ سەپاندن، خۆ لە خەڵك بە گەورە گرتن، ئەوانەی كە بێهێزن بەوانەی خۆیان بەزلگرتوە، دەڵێن:

٣)- ﴿ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا ﴾، ئێمە پێشتر شوێنكەوتەی ئێوە بووین، (التَّبَعُ: إِسْمٌ لِمَنْ يَتْبَعُ غَيْرَهُ، وَيَسْتَوِي فِيْهِ الوَاحِدُ وَالجَمْعُ)، (تَبَع): ناوە بۆ هەر كەسێك بە دوای جگە لە خۆی بكەوێ، تاك و كۆ تێیدا یەكسانن، دەگوترێ: (هَذَا رَجُلٌ تَبَعٌ لِفُلَان) هەروەها دەگوترێ: (هَؤُلَاءِ تَبَعٌ لِفُلَان) بەڵام ئەگەر بویسترێ هەر بە تاك بزانرێ، دەگوترێ: (هَذَا تَابِعٌ لِفُلَان).

٤)- ﴿ فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾، ئایا ئێوە پشكێك، بەشێك لە ئاگرمان لێ دووردەخەنەوە، لە كۆڵ دەكەنەوە؟ ﴿ فَهَلۡ أَنتُم ﴾، (هَلْ) بۆ پرسیاركردنە،

(وَالإِسْتِفْهَامُ مُسْتَعْمَلٌ فِي الْحَثِّ وَاللَّوْمِ عَلَى خِذْلَانِهِمْ وَتَرْكِ الإِهْتِمَامِ بِهِمْ)، پرسیارکردن لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ هاندان و سەرزەنشتکردن، لەسەر ئەوەی پشتیان بەرداون و پشتگوێیان خستوون.

کـۆی ئـەو ڕسـتەیەش: ﴿فَيَقُولُ الضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ﴾، ئەمـە هەمـووی دوو واتایـان هەڵدەگـرێ:

أ)- کە بەڕاستیی داوایان کردبێ لە خۆ بەزلگرو خۆسەپێنەکان، واتە: بێهێزو شوێنکەوتووەکان، پێیان وابووبێ، کە وەک چۆن لە دنیادا ئەوانە دەسترۆیشتوو و شت لە دەستهاتوو بوون، لەوێش هەروا بن! دەشگونجێ خەڵکی هێندە سیفەت کۆیلەو، سیفەت نزم و خۆ پێ هیچ هەبێ، لە قیامەتیش ئەو قەناعەتە پووچەی کە لە دنیادا هەیەتی، لە بەرانبەر حوکمڕانە خۆسەپێنەکاندا، لە قیامەتیشدا لە کۆڵی نەبێتەوەو لەوێش هەر پێی وابێ: ئەو حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ بەزلگرانە دەستیان دەڕوات!

ب)- ئەو ڕۆژە ڕۆژی دەرکەوتنی ڕاستییەکانەو، هەموو کەس لە هەموو شتێک حاڵیی دەبێ، بەڵام ئەوە گاڵتە پێکردنی بێهێزەکانە، بە خۆسەپێنەکان و خۆ بەزلگرەکان، کە ئێوە هیچتان بە دەست نیە، ئایا دەتوانن تۆزێک لە سزامان لێ دووربخەنەوەو تۆزێک لە ئاگرو ئازارمان لە کۆڵ بکەنەوە؟! واتە: هیچتان لە دەست نایەت، کەواتە: لە دنیاشدا بە ناهەق خۆتان بەسەر ئێمەدا سەپاند بوو، فەرز کردبوو، وشەی: (مُغْنُون: إِسْمُ فَاعِلٍ مِنْ أَغْنَى غَنَاءً: أَيْ فَائِدَةً وَإِجْزَاءً)، (مُغْنُون): ناوی بکەرە لە (أَغْنَى)وە هاتوە، (أَغْنَى غَنَاءً) واتە: سوودی گەیاند، یاخود کەلێنێکی گرت، یان شتێکی لە کۆڵ کەسێک کردەوە، ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا﴾، وشەی: (أَغْنَاهُ) واتە: بێ نیازیکرد، بەڵام کە لێرەدا بەرکاری خواستوە کە (نصيباً)ە، (فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا نَصِيْبَاً)، لەبەر ئەوەیە کە مانای (دَافِعُونَ وَرَادُّون)ی خراوەتە نێو، واتە: ئایا ئێوە لە کۆڵمان دەکەنەوە، لێمان بەرپەرچدەدەنەوە بەشێک لە سزای ئاگر؟

٥)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ ﴾، ئەوانەی خۆیان بەزلگرتبوو، گوتیان: ئێمە هەمووومان لێرەداین، ئێمە هەمووومان تێیداین، واتە: لە نێو ئاگرداین، ئاگری دۆزەخ.

٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴾، بە دڵنیایی خوا دادوەریی کردوە لە نێوان بەندەکاندا، بڕیاری کۆتایی بۆ هەر کامێکیان داوە، ئەمەش دوو واتایان هەڵدەگرێ:

أ/ لە وەڵامی سەرزەنشتکردنی بێهێزەکاندا، ئەو خۆ بەزلگرانە دان بە هەڵەو لادان و تاوانی خۆیان دا دێنن، کە ڕاست دەکەن، سەرزەنشتەکەتان لە جێی خۆیەتی، ئێستا هەمووومان لە نێو ئاگرداین، ئەوەی کە لە دنیادا پێمان دەگوتن: قیامەت نیەو، سزاو پاداشت نیەو پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ڕاست ناکەن، ئێمە درۆمان لەگەڵ ئێوەدا کردبوو و بە هەڵەدا چوو بووین، درۆ لەگەڵداکردنەکەشیان، یان هەر بە ڕاستیی قەناعەتیان وابووە کە ڕۆژی سزاو پاداشت نیە، هێندە گومانیان بەرانبەر بە خوا خراپ بووە، یاخود بۆ چەواشەکردنی خەڵکەکە بووە، بۆ ئەوەی خەڵکەکە باری زوڵمی ئەوان هەر لەسەر پشتیان بێ، بۆیە ئیخفالیان کردوون، کە قیامەت نیەو سزاو پاداشت نیە، ژیان هەر ژیانی دنیایە، بۆ ئەوەی ملکەچ بکەن، گوتوویانە: ژیانێکی دیکەتان لێ هەڵناکەوێ.

ب/ وەڵامی داواکارییەکەیانە، ئەویش ئەوەیە: کە ئێوە داوامان لێدەکەن ئێمە پشک و بەشێک لە ئاگرتان لە کۆڵ بکەینەوە، ئەوە خۆتان دەبینن ئێمەش وەک ئێوە لە نێو ئاگرداین، کەواتە: چۆن ئومێدی ئەوەتان هەیە و تەماعی ئەوەتان هەیە، سوودێکتان پێبگەیەنین؟ ئێمەش وەک ئێوە لێرەداین و هیچمان بۆ ئێوە پێناکرێ.

کە دەڵێن: ﴿ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ ﴾، دەڵێ: (كُلٌّ: مُبْتَدَأٌ مَرْفُوعٌ، وَفِيهَا خَبَرٌ، وَالجُمْلَةُ كُلُّهَا خَبَرٌ لِـ «إِنَّا»، وَتَنْوِينُ «كُلّ» عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إِلَيْهِ: إِنَّا كُلُّنَا فِي النَّارِ)، (كُلّ) دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ) کە مەرفووعە، (فِيهَا) دەبێتە گوزارە (خَبَر) و لە شوێنی (رفع) دایەو، ڕستەکە هەمووی واتە: ﴿ كُلّٞ فِيهَآ ﴾، دەبێتە گوزارە بۆ (إِنَّا)، (إِنَّا)ش دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ) و ﴿ كُلّٞ فِيهَآ ﴾، هەمووی دەبێتە گوزارە (خَبَر) بۆ

(إنَّا)، تەنوینی سەر (كُلٌّ) ﴿إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ﴾، قەرەبووی پاڵوەلا دراو (مضَافِ إليهِ) یە، واتە: (إنَّا كُلُّنَا فِيهَا) ئێمە هەر کامێکمان لە نێو ئەو ئاگرەداین.

شایانی باسە: ئێمە لە سووڕەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (٣٨ و ٣٩)دا، باسێکی تایبەتمان لەو بارەوە کردوە، لە بارەی مشتومڕی نێوان شوێنکەوتووان، یاخود بێهێزەکان، هەڵخەڵەتێنراوە ڕێشمەی خۆ بە دەست ستەمکار دەرەوەکان و، ستەمکارە خۆ سەپێنەکان، هەروەها لە سووڕەتی (سبأ)یشدا ئایەتەکانی: (٣١، ٣٢، ٣٣)دا لەوێش دووبارە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، چونکە بەڕاستیی ئەو بابەتە دەهێنێ هەڵوەستەی زۆری لە بەرانبەردا بکرێ، چونکە هەموو ئەوانەی شایستەی چوونە دۆزەخ دەبن، دەبنەوە بە دوو بەش:

أ- کەمینەیەکی خۆسەپێنی بە زەبرو زۆر.

ب- زۆرینەیەکی هەڵخەڵەتێنراوی چاولێکەری لاساییکەرەوە، کە بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری خەڵک وا دەزانن ئەوە هەر ستەمکارانن، سزا دەدرێن و بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێن، بەڵام ستەملێکراوان و چەوسێنراوان و بێهێزەکان، کە دەکەونە شوێن ستەمکارەکان و دەبنە سووتەمەنی بۆیان، پێیان وایە وەک بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن، بەڵام خوا ﷻ هەم لێرەو، هەم لە ئایەتی (٣٨و ٣٩)ی سووڕەتی (الأعراف) داو، هەم لە ئایەتەکانی سووڕەتی (سبأ)دا، کە قسەمان لە بارەوە کردوون، لە باسێکی تایبەتدا، زۆر بە ڕوونیی نوختە دەخاتە سەر پیت، کە وەک چۆن حوکمڕانە، خۆبەزلگرو، دەستڕۆیشتووە خۆسەپێنەکان، شایستەی سزادرانن، بە هەمان شێوە شوێنکەوتووە لاساییکەرەوەکانیش شایستەی سزادرانن و، سزایان لە هی ئەوان کەمتر نیە لەو ڕووەوە کە هەموویان دژی پەیامی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بوون، یەکێکیان لە پێشەوەو بووەو ئەوی دیکە لە دواوە بووە، ئەگەر ئەوەی دواوە نەبووایە، ئەوەی پێشەوەش کاری بۆ نەدەکرا، وەک گوتراوە: (سەگ بە قوەتی کلکی ئێسک دەکرۆژێ)، ئەو سەرکردەو حوکمڕانە خۆسەپێنانەش، ئەگەر خەڵک نەبێتە دەست و پێوەندیان و

خەڵک بۆیان نەبێتە کەری باربردن و بارەکە خۆیان نەیخەنە سەر پشتیان، بێگومان حوکمڕانییەکەیان بۆ ناکرێ، بۆیە لە سوورەتی (الأعراف)دا دوای ئەوەی شوێنکەوتووە هەڵخەڵەتێنراوەکان داوا دەکەن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٣٨﴾﴾الأعراف، پەروەردگارمان! ئەوانە گومڕایان کردین، با سزای وان چەند بەرانبەر لە ئاگر، خوا وەڵام دەداتەوە: ﴿قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾، (خوا) فەرمووی: هی هەر کامێکتان چەند قاتە، بەڵام نازانن، هی ستەمکارو خۆسەپێنەکان لەبەر ئەوەی خۆشیان بە ڕێی چەوتدا ڕۆیشتوون و خەڵکیشیان دوای خۆیان داوە، هی هەڵخەڵەتێنراوە شوێنکەوتووەکانیش، لەبەر ئەوەی خۆشیان لایانداوەو، بوونە داردەستی حوکمڕانە خۆسەپێنەکانیش.

**مەسەلەی دووەم:**

**داواکردنی دۆزەخییەکان لە فریشتە دۆزەخەوانەکان، کە بۆیان لە خوا بپاڕێنەوەو، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ، ئازاریان لەسەر سووک بکات، وەڵامدانەوەی فریشتە دۆزەخەوانەکانیش بە شێوەیەکی سەرزەنشتکارانە کە پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێناون، بۆیە ئەوان ئامادە نین داوا بکەن و با خۆیان بپاڕێنەوە، هەرچەند پاڕانەوەکەشیان بێ سوودەو کەڵک ناگرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾، **ئەوانەی لە نێو ئاگردان بە دۆزەخەوانەکانیان گوت: لە پەروەردگارتان وەپاڕێن، یەک ڕۆژ ئازارمان لەسەر سووک بکات.**

ئەوانەی لە نێو ئاگردان، واتە: هەم بێهێزەکان، هەم خۆبەزلگرەکان، هەم سەرکردەو دەمڕاستەکان و، هەم شوێنکەوتووە لاسایکراوەکانیان، هەموویان، داوایان کرد لە دۆزەخەوانەکان، (خَازِن) کەسێکە شتێک لە شوێنێکدا کۆ دەکاتەوە و خڕ دەکاتەوە، (**وَالخَزَنَـةُ: جَمْـعُ خَـازِنٍ، وَهُـوَ الْحَافِـظُ لِـمَا فِي الْمَـكَانِ مِنْ مَـالٍ أَو عُـرضٍ**)، (خَزَنَةَ) کۆی (خَازِن) ئەویش بریتیە: لە پارێزەری ئەو ماڵ و سامانەی، یاخود ئەو کەل و پەلەی کە لە شوێنێک دانراوە، هەرچەندە (راغب) دەڵێ: پارێزەر، بەڵام من پێموایە (خازن) یانی: کۆکەرەوە، (خَـازِن) کەسێکە شتێک کۆ دەکاتەوە لە شوێنێک و دەشیپارێزێ.

دوای ئـەوە بێهێـزەکان نائومێـد بـوون لـەوەی خـۆ بەزلگـرەکان سـزای ئاگریـان لەسـەر سـووک بکـەن، ئنجـا لـە فریشـتەکان، لـە دۆزەخەوانـەکان دەپاڕێنـەوە، کـە داوایـان بـۆ لـە پەروەردگاریـان بکـەن، هـەر تۆزێـک ئەگـەر ماوەیەکـی کەمیـش بـێ، سـزایان لەسـەر سـووک بـکات.

﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ ﴾، لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە.

﴿ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾، یـەک ڕۆژ لـە ئازارمـان لەسـەر سـووک بکات، دیـارە یـەک ڕۆژ مەبەسـت پێـی کاتێکـی کەمـە، واتـە: ئەگـەر ماوەیەکـی کەمیـش بێ، یـا سـزا و ئازارمـان لەسـەر سـووک بـکات، کـە گوتوویانـە: ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ ﴾، پاڵـدانی وشـەی (رَبّ) بـۆ لای ڕانـاوی (كُمْ): ﴿ رَبَّكُمۡ ﴾، ئەمـە هاندانـە بـۆ پاڕانـەوە، واتـە: لەبـەر ئـەوەی ئێـوە لـە پەروەردگارتانـەوە نیزیکـن و بـۆ خـوا صوڵحـاو بـوون، داوای ئێـوە لـەلای خـوا دەگیرێتـەوە، داوامـان لـە پەروەردگارتـان بـۆ بکـەن، ماوەیەکـی کەمیـش بـێ لـە ئـازار لەسـەرمان سـووک بـکات، کـە گوتوویانـە: ﴿ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾، (يُخَفِّفْ: مَجْزُومٌ بِتَقْدِيرِ «ل» أَيْ: لِيُخَفِّفْ)، (يخفّفْ) مەجزوومـە، زەنـەدارە بـە ئەندازەگیریـی کـردنی (ل) یـانی: (لِيُخَفِّفْ) بـا لەسـەرمان سـووک بـکات.

٢)- ﴿ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، دۆزەخـــەوانـــەکان (ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن) پێیان گوتن: ئایا پێشتر (لە دنیادا) پێغەمبەرانتان، بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ نەهێنان؟! (الْبَيِّنَاتُ: الْحُجَجُ الْوَاضِحَةُ وَالدَّعَوَاتُ الصَّرِيحَةُ إِلَى اتِّبَاعِ الْهُدَى)، ئایا پێغەمبەرانتان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە لە لایەن خواوە بۆتان ڕەوان کرابوون، بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ نەهێنان! پەیامی ڕۆشن و ڕوونیان بۆ نەهێنان تاکو بەڕێی ڕاستدا بڕۆن، تووشی تێرە نەیەن، بەڵکو بچنە بەهەشت؟!.

٣)- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾، گوتیان: با، (بَلَى: إِيجَابٌ فِي جَوابِ النَّفْيِ)، ئەگەر لێرەدا بگوترێ: بەڵێ (نَعَم) یانی: بۆمان نەهاتوە، بەڵام کە دەڵێن: (بَلَى) لە کوردییدا دەبێتە با، کە لە هەندێک لە تەفسیرە کوردییەکاندا بینیومە لە مانای (بَلَى)دا نووسیویانە: بەڵێ، کە ئەوە هەڵەیەو (بەڵێ) مانای (نَعَم)ە، بەڵام (بَلَى) دەبێ بە (با) تەفسیر بکرێ، چونکە ئەوان کە دەڵێن: ئایا

پێغەمبەرانتان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ نەهێنان؟ ئەگەر بگوترێ: (نَعَم) واتە: نەیانهێناون! کەواتە: ئەگەر بویسترێ بگوترێ: هێناویانن، دەبێ بگوترێ: (بَلَى)، (بَلَى: إِيْجَابٌ فِي جَوابِ النَفي)، (بَلَى) وەڵامێکی ئەرێنییە بۆ شتێک کە پێشتر لابراوە، واتە: با، بۆیەش باسم کرد، چونکە لە هەندێ لە تەفسیرە کوردییەکاندا جیاوازییان نەخستووەتە نێوان (نَعَم) و (بَلَى)، ئنجا بەڕاستیی تەفسیرکردنی قورئان زۆری دەوێ، بە تایبەت کە لە عەرەبییەوە بیکەی بە کوردیی، یان بە هەر زمانێکی دیکە، دەبێ لە هەردووک زمانەکاندا شارەزابی.

٤)- ﴿قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟﴾، (فریشتەکان) پێیان گوتن: دەجا بپاڕێنەوە، واتە: ئێمە ناپاڕێینەوە، مادام پێغەمبەرانتان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێناون و، بەڵگەیان لەسەر تەواو کردوون و هەموو شتیان پێ ڕاگەیاندوون، ئێوەش بە قسەتان نەکردوون، ئێمە داوایەک ناکەین جێنەگرێ، وەک گوتراوە: (قسە بکە جێبگرێ، ڕێ بە بێوە سەر بگرێ)، فریشتەکان لەوە عاقڵترن و لەوە پاکترن، داوایەک لە خوا بکەن، بزانن وەڵام نادرێتەوەو جێ ناگرێ.

٥)- ﴿وَمَا دُعَـٰٓؤُا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ﴾، پاڕانەوەی بێبڕوایانیش هەر لە فەوتان و لە بزربوون دایە، واتە: وەک چۆن ئێوە کاتی خۆی، خۆتان پشتتان لە پێغەمبەران کرد، وەک چۆن خۆتان ئەو ئەرکەتان بە ئەستۆوە گرت، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بکەن و لەگەڵ پەیامەکانی خوادا بکەن، ئەمڕۆش هەر خۆتان مشووری خۆتان بخۆن، کە لە ژیانی دنیادا بە شێوەی چەوت لەگەڵ پەیامەکانی خواو لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) مامەڵەتان کردوە، ئەمڕۆش هەر خۆتان، خۆتان لە دەرەنجامی ئەو هەڵسوکەوت و هەڵوێستە چەوتە دەرباز بکەن، خۆتان ئەوەتان بەسەر خۆتان هێناوە، وەک پەندێکی عەرەبی دەڵێ: (يَدَاكَ أوكَتَا وَفُوكَ نَفَخْ)[1]، بە دەستی خۆت گرێتداوەو بە زاری خۆت فووت تێکردوە، ئێستاش چۆن خۆت دەرباز دەکەی بیکە!

---

(١) مانای دەقاو دەق: دوو دەستەکانت گرێیان داوەو زارت فووی کردوە.

ئەم پەندەش لە بەسەرهاتێکەوە گوتراوە، کورتەکەی ئەوەیە:

کابرایەك کە ویستویەتی لە ڕووبارێك بپەڕێتەوە و ئامادە نەبووە کرێی پەڕینەوەکە بداتە بەلەمێك و مەلەشی نەزانیوە، خۆی هەڵداوەتە سەر کوندەیەکی فوودراو، ئنجا لە نێوەڕاستی ڕووباردا کوندەکەی کون بووە یان زارەکەی بۆتەوەو، کاتێك هاواری کردوە دەربازی بکەن . ئاوایان پێگوتوە!

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی خوا بۆ ئەو ڕاستییە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)و بڕواداران لە دنیاو دواڕۆژدا سەر دەخات و پشتیان دەگرێ، لەو ڕۆژەشدا پاساو پۆزش هێنانەوەی ستەمکاران دادیان نادات، نموونەیەکی زۆر زەقی سەرخستنی خواش بۆ پێغەمبەران و بڕواداران ،مووساو ﷺ گەلەکەی (بەنوو ئیسرائیل)ن، بۆیە هەر لەو ڕەوتەدا باسی ئەوانیش دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاوَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴾، خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) و ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بڕوایان هێناوە لە خزمەت پێغەمبەرانداو شوێنکەوتوویان بوون) لە ژیانی دنیادا سەریان دەخەین و هەروەها لەو ڕۆژەشدا کە شایەدەکان هەڵدەستن. (الْأَشْهَادُ: جَمْعُ شَاهِدٌ)، (قِيَام) بریتیە لە وەستان لە مەیدانێکدا، ئێمە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) و بڕواداران، هەم لە ژیانی دنیادا سەردەخەین، هەم لەو ڕۆژەشدا کە شایەدەکان هەڵدەستن بۆ شایەدیی دان.

(النَّصْرُ وَالنُّصْرَةُ: العَوْنُ، وَالتَّنَاصُرُ: التَّعَاوُن) (نَصْرٌ و نُصْرَةٌ) بە مانای یارمەتییدانە، (تَنَاصُر)یش هاوکاریی یەکدی کردنە.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە، ئەو ڕۆژە کە شایەدەکان تێیدا ڕاست دەبنەوەو هەڵدەستن بۆ شایەدیی دان، چ ڕۆژێکەو چی تێدا دەگوزەرێ؟ دەفەرموێ:

٢)- ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ﴾، ئەو رۆژە کە پۆزش هێنانەوەی ستەمکاران بە کەڵکیان نایەت و دادیان نادات، سوودیان پێناگەیەنێ.

وشەی (لَا يَنفَعُ ) خوێنراویشەتەوە: (لَا تَنْفَع)، چونکە هەردووک حاڵەتی نێرینە (مذکر)و مێینە (مؤنث)ی تێدا دروستن.

(المَعْذِرَةُ: إِسْمُ مَصْدَر اعْتَذَر)، (مَعْذِرَة) ناوی چاوگە بۆ (اعْتَذَر)ە.

٣)- ﴿ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾، هەروەها نەفرینیان لێیەو خراپترین مەنزڵگایان جێیە، (لَعْنَة) دوور خستنەوەیە لە بەزەیی خوا، ئەوانە دوورخستنەوەیان بۆ هەیە لە بەزەیی خواو، مەنزڵگایەکی خراپیشیان هەیە، (اللَّعْنَةُ: الطَّرْدُ وَالإِبْعَادُ)، (سُوْءُ الدَّارُ: أَسْوَءُ مَنْزِل)، (لَعْنَة): بریتیە لە دەرکردن و دوورخستنەوە، (سُوْء الدَّارُ) واتە: خراپترین جێگا و ڕێگا و شوێنی تێدا نیشتەجێبوون.

ئنجا خوا ﷻ وەک بەڵگەیەک، لەسەر ئەوە کە پشتگیریی پێغەمبەرانی خۆی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەکات و، بڕوادارانێک کە لەگەڵیاندان، باسی مووسا ؑو گەلی بەنوو ئیسرائیل دەکات، کە بڕوایان بە مووسا هێنا:

٤)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ڕێنماییمان بە مووسادا.

٥)- ﴿ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، کتێبیشمان کردە میراتی بەنوو ئیسرائیل، کە گەلی مووسا بوون و بڕوایان پێی هێنابوو.

٦)- ﴿ هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، ئەو کتێبە ڕێنمایی و بیرخەرەوە بوو بۆ خاوەن عەقڵان، کەواتە: میسداقی سەرخستنی خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و بۆ بڕوادارانێک کە لەگەڵ پێغەمبەراندان، هەم لە دنیاو، هەم لە دوا ڕۆژیشدا، مووسا ؑ ڕێنمایی پێدراو و، بەنوو ئیسرائیلی کتێبی خوا بە میراتگرتوون.

بێگومان ڕێنماییەکەی خواش هەر لە دوو توێی کتێبەکەدا بوو، بەڵام خوا ﷻ جگە لە کتێبەکە (تەورات)یش بێگومان شتی دیکەشی بە مووسادا بوو، وەک

ڕێنمایی، بەڵام هەمووی تایبەت بووە بە مووساوە ﷺ بۆ وێنە: خوا فەرمایشتی لەگەڵدا کردووەو هێندێک شتی تایبەتی پێگوتوە، کە چۆن متمانە بکات و لەگەڵ بەنوو ئیسرائیلدا چی بکات و چۆن بکات؟ مەرج نیە ئەو سروش (وحي)ەی خوا بۆ مووسای ناردوە، هەمووی لە دوو توێی تەورات دابوویێ، بەڵام بەنوو ئیسرائیل ئەو کتێبەیان کرا بە میرات و پێیان درا، وەک چۆن میرات دەگاتە دەستی کەسێک بەبێ پێوە ماندووبوون، ئەوانەش ئەو کتێب و بەرنامەیەی خوایان پێگەیشت، تەوراتیش بە مانای شەریعەت دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ (ٱلْكِتَٰبَ) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ناساندنەکە بۆ (عهد)ە واتە: کتێبەکەمان بە بەنوو ئیسرائیل دا، ئەو کتێبەی دیارەو زانراوە، کە بریتیە لە تەورات.

## کورتە باسێک دەربارەی سەرخستنی خوا بۆ پێغەمبەر و بڕواداران

لێرەدا لەسێ بڕگەدا کورتە باسێکی ئاماژە ئاسا دەکەین لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە ژیانی دنیاشدا سەردەخەین و، لە دوارۆژیشدا کە شایەدەکان هەڵدەستن و ڕاست دەبنەوە بۆ شایەدیی دان.

١- یەکێک بۆی هەیە بپرسێ: هەندێک لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کوژراون و هەندێکیان دەرکراون و هەندێکیان گیراون، ئنجا کوا خوا ﷻ چۆنی سەرخستوون؟ هەروەها هەندێک لە بڕواداران لە بەین براون و کوژراون؟!

لەو بارەوە (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، هەندێ قسە دەکات، پێم خۆش بوو وەک وەڵام و ڕوونکردنەوەی ئەو پرسیارو ئیشکالە، قسانەکانی بێنم، بە تۆزێک شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی خۆشمەوە:

(الطبري) گوتوویەتی: (كَيْفَ قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾غافر، وَقَدْ عَلِمْنَا أَنَّ مِنْهُمْ مَنْ قَتَلَهُ أَعْدَاؤُهُ، وَمَثَّلُوا بِهِ، كَشَعْيَاءِ وَيَحْيَى بْنِ زَكَرِيَّا وَأَشْبَاهِهِمَا، وَمِنْهُمْ مَنْ هَمَّ بِقَتْلِهِ قَوْمُهُ، كَإِبْرَاهِيمَ وَعِيسَى؟!

**الجـــواب:**

أ- إِظْفَارُ اللهِ إِيَّاهُمْ ظَاهِراً مِثْلَ دَاوُد وَسُلَيْمَان وَمُحَمَّد (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

ب- إِنْتِقَامُ اللهِ مِمَّنْ حَادَّهُمْ وَشَاقَّهُمْ وإِنْجَاءُ الرُّسُلِ وَأَتْبَاعِهِمْ.

---

(١ ) جامع البيان: ج٢٤، ص٦٩-٧٠.

ج- إنْتِقَامُ اللهِ مِنْهُمْ بَعْدَ وَفَاةِ الرُّسُلِ كَمَا فَعَلَ بِقَتْلِهِ إِشْعِيَاء وَيَحَيِ (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ).

د- الإِخْبَارُ عَنِ الجَمِيعِ وَالمَقْصُود بِهِ بَعْضُهُمْ وَهُوَ مُحَمَّد ﷺ).

واتە: چۆن خوای بەرز فەرموویەتی: ئێمە پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ) و ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە ژیانی دنیادا سەر دەخەین و لەو ڕۆژەشدا کە شایەدەکان هەڵدەستن، دەشزانین کە هەیانبووە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ) دوژمنەکانی کوشتوویانەو، جەستەشیان شێواندوە، وەک شوعەیاء (لە پەیمانی کۆندا نووسراوە ئیشعیاء)، هەروەها یەحیای کوڕی زەکەریا و هاو وێنەکانیان، هەشیانبووە کە گەلەکەی ویستوویانە بیکوژن، وەک: ئیبراهیم و عیسا (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ)؟!

(پێشەوا (طبري) ئاوا چوار وەڵامان دەداتەوە:)

أ- مەبەست لەسەر خستنی خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ) و بۆ بڕواداران، ئەوەیە کە خوا بە ڕواڵەت سەری خستوون بەسەر دوژمنانیاندا، هەروەک چۆن داوودو سولەیمان (علیها السلام) کە حوکمڕانیش بوون و پێغەمبەریش بوون، هەروەها موحەممەد ﷺ کە خوا پێی چەسپاند لە زەویداو دەستڕۆیشتووی کرد، ئنجا مەبەست پێی ئەوانە.

ب- خوا ﷻ تۆڵەی لەوانە ستاندۆتەوە کە دژایەتییان کردوون، پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ) دەرباز کردوون، ئەوەنەبووە کە سەریان بخات، بەو واتایە کە بەسەر دوژمنەکاندا سەرکەون، بەڵکو خوا پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمْ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامْ) دەربازکردوون و گەلە کافرەکانیشی فەوتاندوون، کە بە زۆریی ئەم حاڵەتە ڕوویداوە، ئەمە هەم بۆ گەلی هوود، کە خوا هوودو ئەوانەی لە گەڵی بوون، دەربازی کردن و گەلی عادی فەوتاند، هەروەها صاڵیح و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەربازی کردن و، گەلی سەموودی فەوتاند، هەروەها لووط و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەربازی کردن و گەلەکەی فەوتاند، هەروەها شوعەیب و ئەوانەی لە گەڵی بوون و بڕوایان پێهێنابوو، دەربازی کردن و گەلی

مەدیەن و (أصحاب الأيكة)ی فەوتاندن، هەروەها مووسای دەرباز کرد لەگەڵ گەلەکەی و فیرعەون و سوپایەکەی فەوتاند.

ج- حاڵەتی سێیەم ئەوەیە کە خوا لە دوای کۆچی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تۆڵەی ستاندۆتەوە لە دوژمنەکانیان، وەک بکوژەکانی (إِشْعِيَاء و يَحْيَى)ی سزادا.

د)- ئەوانە خوا بە گشتیی هەواڵی لە بارەیانەوە داوە، بەڵام مەبەست پێی یەکێکیانە کە موحەممەدە ﷺ.

بەڵام لە ڕاستییدا واباشە، هەر چوار وەڵامەکان بە یەکەوە بێن، ئنجا دابەش دەبن بەسەر حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی پشتگرتن و، یارمەتییدان و، سەرخستنی خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە هەر کامێکیانی بە شێوەیەک لە شێوەکان کە (الطبري) باسیکردوە، سەرخستوون.

٢- لەوبارەوە ئەم دوو فەرموودەیەش دێنین:

١)- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: [مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَرُدَّ عَنْهُ نَارَ جَهَنَّمَ» ثُمَّ تَلَا: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾] (أخرجه أحمد: ٢٧٥٨٣، والترمذي: ١٩٣١، وإبن أبي الدنيا في الصمت: ٢٥٠، وصحَّحَهُ الألباني)

واتە: هەر کەسێک بەرگریی بکات لە کەرامەت و سومعەی برای مسوڵمانی (دیارە خوشکی مسوڵمانیشی هەر بە هەمان شێوەیە) خوای زاڵی پایەدار لەسەر خۆی پێویستکردوە، ئاگری دۆزەخی لێ دوور بخاتەوە، (لە ڕۆژی دواییدا)، دوایی ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾.

٢)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [مَنْ حَمَى مُؤْمِنًا مِنْ مُنَافِقٍ يَغْتَابُهُ بَعَثَ اللهُ مَلَكًا يَحْمِي لَحْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، وَمَنْ قَفَّى مُسْلِمًا بِشَيْءٍ يُرِيدُ شَيْنَهُ بِهِ، حَبَسَهُ اللهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ] (أخرجه أحمد: ١٥٦٨٧، وأبو داود: ٤٨٨٣، وابن أبي الدنيا: ٢٤٨، والطبراني في الكبير: ٤٣٣، وحسنه الألباني في صحيح سنن أبي داود).

واتــە: هــەر کەســێک بڕوادارێــک لــە مونافیقێــک بپارێــزێ کــە غەیبــەتی دەکات، خــوا ڕۆژی دوایــی فریشــتەیەک دەنێــرێ کــە لــە ئاگــر بیپارێــزێ و، هــەر کەســێک بــاسی مســوڵمانێک بــکات بــە شــێوەیەک کــە بیــەوێ ناشــیرینی بــکات، خــوا لەســەر پشــتی دۆزەخ ڕایدەگــرێ، هەتــا لــەوەی گوتوویــەتی: خــۆی دەربــاز دەکات.

واتــە: داخــۆ چ بەڵگەیەکــی بەدەســتەوە بــووە، یــان هــەروا بــۆ شــکاندنی بــووە، بــە هــەواو ئــارەزووی نەفســی بــووە؟ ئــەو کاتــەش تــووشی ســزای دەبێــت.

٣- کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾، وەک گوتمــان: (أَشۡهَاد) کــۆی (شَــاهِد)ە، واتــە: شــایەدیدەر، گەواهییــدەر، ئنجــا ئایــا ئــەو شــایەدانە کێــن کــە شــایەدیی دەدەن؟

زانایان گوتوویانە:

١- پێش هەموو کەس فریشتەکانن کە شایەدیی دەدەن.

٢- دوایی پێغەمبەرانن شایەدیی لەسەر ئوممەتەکانیان دەدەن.

٣- دوایی بڕوادارانن لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ کە شایەدیی دەدەن لەسەر ئوممەتەکانی دیکە و دەبنە شایەدو بەڵگەی پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە پێغەمبەران پەیامی خوایان پێگەیاندوون، بەو گەل و نەتەوانە، کاتێک نکووڵیی دەکەن، ئنجا کاتێك خوا لە ئوممەتی موحەممەد دەپرسێ: بەڵگەتان چییە؟ دەڵێن: بەڵگەمان قورئانە، خوا لە دوا کتێبی خۆیدا، ئێمەی ئاگادارکردۆتەوە کە پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە ڕوونیی پەیامی خوایان گەیاندوە بە کۆمەڵگاکانیان.

٤- لەوانەی کە شایەدیی دەدەن ئەندامەکانی جەستەن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢٤﴾النور، واتە: ئەو ڕۆژە کە زمانیان و دەستیان و لاقیان شایەدییان لەسەر دەدەن، بۆ ئەوەی دەیانکرد.

٥- زانایانی ڕەسەن و شەهیدان و بڕوادارانی بۆ خوا صوڵحاون.

**مەسەلەی چوارەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە خۆڕاگر بێ و دڵنیا بێ، بەڵێنی خوا ڕاستەو سەرگەرمی یادی خوا بێ و بشزانێ کە ئەوانەی بەبێ بەڵگە مشتومڕو شەڕە قسە لە دژی ئایەتەکانی خوا دەکەن، خۆ بەزلگرییەک لە سینەیان دا هەیە، پێی ناگەن و بێمراد دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

**١)- ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ﴾، ئنجا خۆت ڕابگرە بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە.**

دوێندراو (مُخاطب)، پێغەمبەری خاتەمە ﷺ: خۆت ڕابگرە بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، واتە: چەسپاوەو دێتە دی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَاصْبِرْ ﴾، واتە: خۆت ڕابگرەو، دڵنیابە کە ئێمە سەرخەری تۆین و سەرخەری بڕوادارانێکیشین کە لە خزمەت تۆدان، بۆیە تۆ لەسەر ئەوەی تووشت دێ، خۆڕاگربە، چونکە مسۆگەر سەرکەوتن هی تۆو هی بڕوادارانێکی شوێنکەوتووتە.

**٢)- ﴿ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ﴾، بۆ گوناهیشت داوای لێبوردن (لە خوا) بکە،** پێشتریش باسمانکردوە کە مەبەست لە گوناهی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئەو چەمک و واتایەی نیە کە ئێمە بۆ گوناح بەکاری دێنین: گوناح ئەوەیە شتێک بزانی خوا پێی ناخۆشەو بیکەی، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئەوەندە پابەندبوون بە نیمانی خۆیانەوەو، ئەوەندە نیمان لە دڵیاندا چەسپاو بووە، هەرگیز شتێک زانیبیان خوا پێی

ناخۆشە، نەیانکردوەو توخنی نەکەوتوون، بەڵکو گوناهی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) مەبەست پێی ئەوەیە کە ئیجتیهادو بۆچوونێکیان نەپێکابێ، یان شتێک وایانزانیبێ بەرژەوەندیی تێدایە، بەڵام بەرژەوەندیی تێدا نەبووبێ، یان خوا ﷻ شتێکی پێ چاک بوو بێ و، ئەوان شتێکی دیکەیان هەڵبژاردبێ، وایانزانیبێ باشە، واتە: لە بۆچوون و کۆششکردنەکەیاندا نەیانپێکابێ، یان بڕیارێکیان دابێ، پێش ئەوەی خوا ﷻ سروشیان بۆ بکات و بڕیارەکە پێویستیی بە ڕاستکردنەوە بووبێ.

٣)- ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾، بە ستاییشکردنی پەروەردگارتەوە بە پاکی بگرە، ئێواران و بەیانیان. (العَشِي: آخِرُ النَّهَارِ إِلى ابْتِدَاءِ ظُلْمَةِ اللَّيل)، (عشيٌّ) کۆتایی ڕۆژگارە تاکو سەرەتای تاریکایی شەو، (والإبْكَارُ: إِسْمٌ لِبُكْرَةِ النَّهَارِ كَالإصْبَاحِ إِسْمٌ للصَّبَاح)، (إبْكَارُ)یش ناوە بۆ سەرەتای ڕۆژ، هەروەک چۆن وشەی (إصْبَاح) ناوە بۆ (صَبَاح)، بەیانی، بەرەبەیان.

٤)- ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی مشتومڕو شەڕە قسە دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا، ئەو مشتومڕو شەڕەقسەشیان پشت ئەستوور نیە بە بەڵگەیەکی ڕوون، کە بۆیان هاتبێ، واتە: لە خواوە بۆیان هاتبێ، واتە: موناقەشە دەکەن، شەڕە قسە دەکەن بەبێ بەڵگەیەکی نەقلّیی، بەبێ بەڵگەیەکی وەحیی، کە لە خواوە هەیانبێ لەسەر ئەو قسەیەی دەیکەن، ئا ئەوانە:

٥)- ﴿إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ﴾، (إنْ) لێرەدا (إنْ النَّافِيَة)یە، واتە: (مَا فِي صُدُورِهِمْ إلاّ كِبْرٌ)، تەنیا خۆبەزلگریی لە سینەکانیاندا هەیە، کە پێی ناگەن، بەو خۆ بەزلگرییە ناگەن، (الْكِبْرُ هُوَ: إِدْرَاكُ الْإِنْسَانِ خَوَاطِرَ تُشْعِرُهُ بِأَنَّهُ أَعْظَمُ مِنْ غَيْرِهِ، فَلَا يَرْضَى بِمُسَاوَاتِهِ بَلْهَ مُتَابَعَتِهِ!)، (كِبْر): بریتیە لەوە کە مرۆڤ هێندە خولیای هەبن خولیاکانی وای بخەنە دڵ کە گەورەترو مەزنترە لە غەیری خۆی، بۆیە ڕازیی نەبێ لەگەڵیشیدا یەکسان بێ، چ جای شوێنکەوتووی بێ.

ئەوانەی دژی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بوون، خۆبەزلگرییەکیان لە سینەدا هەبوو، ڕێی لێدەگرتن شوێن پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکەون، شوێن ئەو

پەیامە بکەون کە خوا بەودا ناردوویەتی، وەک لە سوورەتی (ص)دا گوتوویانە: ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَا ﴿٨﴾ ﴾! واتە: ئایا لەنێو ئێمەدا بیرخەرەوە بۆ سەر ئەو دابەزێنراوە! هەروەها: گوتیان: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾الزخرف، دەبووایە ئەم قورئانە دابەزیبایە سەر یەکێک لە دوو پیاوە مەزنەکەی دوو شارەکە، واتە: مەککە، یان تائیف، دیارە مەزنیی (عظمة) لە لای ئەوان، ئەوە بووە کە مرۆڤ سەروەت و سامانی هەبێ، دەسەڵاتی هەبێ، قەرەباڵغیی بە دەورەوە بێ، بەڵام مەزنیی لە لای خوا ﷻ جۆرێکی دیکەیە، ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە عەقڵێکی چاک، سرووشتێکی پاک، مەعدەنێکی ساغ، ڕەوشتێکی بەرز، جەوهەرو ماهیەتێکی باشی هەبێ، چونکە زۆر کەس دەتوانێ بە شێوازی ناشەرعیی سەروەت و سامان و دەسەڵات پەیدابکات، بەڵام جەوهەرێکی پاک و، ڕووحێکی چاک و، ڕەوشتێکی بەرزو، عەقڵێکی تەواو و، دڵ و دەروونێکی ڕازاوە، بە ڕەوشتە بەها بەرزەکان، بۆ هەموو کەس دەستەبەرو مسۆگەر نابێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ ﴾، (أي: مَا هُمْ بِبالِغِي مُقْتَضى تَكَبُّرِهِم)، واتە: ناگەن بەوەی کە خۆبەزلگرییەکەیان دەیخوازێ، خۆ بەزلگرییەکەیان وایدەخواست، ئەو پەیامەی خوا هی ئەوانبێ، یاخود خەڵک بەدوای وان بکەوێ، لەو ڕێیە ناهەقەوە کە پێیدا دەڕۆن.

هەندێکیش گوتوویانە: (كِبْر) لێرەدا بە مانای ئیرەیی (حَسَد)ە، بەڵام (كِبْر) وا ڕاسترە هەر لەسەر مانای ڕواڵەتی خۆی بێ، کە بریتیە لە: (التَّطَلُّعُ للجَاهِ وَالرِّئَاسَةِ بِغَيْرِ الحَقِّ)، هەبوونی کەڵکەڵەی سەرۆکایەتیی و حوکمڕانیی لە کەللەدا، بە ناهەق و بەبێ شایستەیی.

٦)- ﴿ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾، دەجا تۆ پەنا بە خوا بگرە، بێگومان هەر ئەوە بیسەری بینەرە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ ﴾، (حُذِفَ

مُتَعَلَّقُ اسْتَعِذْ، لِقَصْدِ تَعْمِيْمِ الإسْتِعَاذَةِ مِنْ كُلِّ مَا يُخَافُ)، ئەوەی (استعذ) پێوەی پەیوەستە فڕێنراوە، (نەیفەرمووە: (فاسْتَعِذْ بِالله) پەنا بە خوا بگرە لە چی؟) تاکو ماناکەی گشتیی بێ و، پەنا بە خوا گرتنەکە هەرشتێک بگرێتەوە کە جێگای مەترسیی بێت، واتە: پەنا بە خوا بگرە لە هەر شتێک کە جێگای مەترسییە، هەر شتێک کە پێت وایە زیانێک لەو شتەوە بە تۆ دەگات، پەنای لێ بە خوا بگرە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خـوا ﷻ رایدەگەیەنـێ کـە دروسـتکردنی گـەردوون لـە دروسـتکردنی خەڵـک گەورتـرو قورسـترەو، بـڕواداران کـردار چاکـی بینـەرو، بێبڕوایـانی کوێـرو کوتـری خراپـەکار یەکسـان نیـن و، بـە سـزاو پاداشـتی پـڕ بـە پێسـت گەیشـتنی هەمـوو لایـەک، گومـانی تێدانیـەو، پەروەردگاریـش فەرمـانی کـردوە کـە مرۆڤـەکان لێـی وەپاڕێـن و بـە مسـۆگەری وەڵامیشـیان دەداتـەوە، خۆبەزلگرانیـش لـە بەرانبـەر پەرسـتنی خـوادا، بـە زەبوونیـی دەچنـە دۆزەخـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ ﴾، بە دڵنیایی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی (گەردوون بەسەرو خواریەوە) لە دروستکردنی خەڵکی گەورەترە.

ئەمە بە دوو واتایان دێ:

**یەکەم:** (إِبْدَاعُ اللهِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ أَعْظَمُ مِنْ إِبْدَاعِ النَّاسِ مِنْ لَا شَيء)، پەیداکردن و داهێنانی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی، لە پەیداکردن و داهێنانی خەڵک لە هیچ، گەورەترە، واتە: دروستکردنی گەردوون گەورەترە لە دروستکردنی مرۆڤان.

دووەم: (خَلْقُ اللهِ الكَوْن أعْظَمُ مِنْ إعَادَةِ خَلْقِ النَّاسِ أحْيَاءً)، دروستکردنی خوا بۆ گەردوون مەزنترە لە دووبارە دروستکردنەوەی خەڵک و زیندووکردنەوەیان دوای ئەوەی دەمرن.

٢)- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: ئەو ڕاستییە نازانن کە ئەو گەردوونەی خوا، ئەو موڵکەی خوا چەند فراوانە، چەند زەبەلاحە، ئەگەر زانیبایان خوا چی خوڵقاندوە، شارەزاییان بە موڵکی فراوانی خواو زانیاریی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، قەناعەتی پێدەهێنان کە دەتوانێ دوای مردنیان زیندوویان بکاتەوە.

٣)- ﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾، کوێرو بینەر یەکسان نین، مەبەست لە کوێر بێبڕوایەو، مەبەست لە بینەر بڕوادارە.

٤)- ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ﴾، هەروەها ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون و، خراپەکاریش.

واتە: چاکەکار لەگەڵ خراپەکاردا یەکسان نین و وەک یەک نین، کەواتە: دەبێ ڕۆژی دوایی هەبێ، دەبێ ڕۆژی گەیشتن بە سزاو پاداشتی مرۆڤەکان هەبێ.

٥)- ﴿قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾، بە کەمیی بیر دەکەنەوەو پەند وەردەگرن، خوێنراویشەتەوە: (تَذَّكَّرُوْن)، بە کەمیی پەند وەردەگرن، یان: بە کەمیی ڕاستییەکان دێننەوە بیرخۆتان.

کە دەفەرموێ: دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکردنی خەڵک گەورەترە، چ مەبەست پێی هێنانەدییان بێ، چ مەبەست دووبارە کردنەوەیان و زیندووکردنەوەیان بێ، (بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن)، هەروەها کە دەفەرموێ: کوێرو بینەر وەک یەک نین و، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، لەگەڵ خراپەکاردا وەک یەک نین، ئەمە هەمووی بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر هەبوونی سزاو پاداشت و، هەبوونی ڕۆژی دوایی، بۆیە دوایی یەکسەر دەفەرموێ:

٦)- ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا﴾، کاتی دیاریکراو (ی ئاخیر زەمان یان قیامەت) هاتوویە هیچ دوو دڵی تێدا نیە.

(ٱلسَّاعَةَ)، ئەو کاتەی کە ئەم گەردوونەی تێدا بە کۆتا دێ، ئاخیر زەمان، یاخود: (ٱلسَّاعَةَ)، مەبەست پێی کاتی زیندووکرانەوەی مرۆڤەکانە، قیامەت و هەڵسانەوەیان زیندووکرانەوەیان، دێ، هیچ دوو دڵی تێدانیە، کە دەفەرموێ: هیچ دوو دڵی تێدانیە یانی: شایستە نیە کە کەس تێیدا دوو دڵ بێ و تێیدا لە گوماندابێ، ئەگەرنا خەڵک هەیە بڕوای پێی نیە، بەڵام واتە: شایستەی دوو دڵی نیە، ئەگەر ئینسان بە عەقڵ تەماشا بکاو، تەماشای گەردوون بکات و، تەماشای خۆی بکات و، تەماشای پەیامەکانی خوا بکات، دڵنیایی بۆ دروست دەبێت، کە ناگونجێ هیچ دوو دڵییەک لە بارەی هاتنی ڕۆژی دواییەوە هەبێ.

٧)- ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕواناهێنن، ئەم بەڵامە [بەڵام لە عەرەبییدا (لكن)ی (إِسْتِدْرَاك)ە] بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە بۆچی زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن؟ لەبەر ئەوەی نایانەوێ بڕوابهێنن، ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، زۆربەی خەڵک نایانەوێ بڕوابهێنن، ئەگەرنا پەکیان لەسەر بەڵگەو دەلیل نەکەوتوە، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ سێ بەڵگەی هێناونەوە، لەسەر هەبوونی ڕۆژی دوایی و، هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت:

١- دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکرانی خەڵک گەورەترە.

٢- بڕوادارو بێبڕوا وەک یەک نین، وەک چۆن بینەرو کوێر وەک یەک نین.

٣- ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، لەگەڵ کەسێک کە بێبڕوایەو خراپەکارە، وەک یەک نین.

کەواتە: پێویستە گەردوون و ژیانی مرۆڤ، ئامانجدار بێ و حیکمەتی لە پشتەوە بێ و، بەبێ هەبوونی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتیش، ئەو حیکمەت و ئامانجە نایەتە دی.

٨)- ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ ﴾، پەروەدگارتان فەرموویەتی: لێم وەپاڕێن، داوام لێ بکەن، وەڵامتان دەدەمەوە.

لەو بارەوە ئەم لە فەرمایشتە هەیە: [عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر] (أخرجه أحمد: ١٨٣٧٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، والترمذي: ٣٣٧٢، وأبو داود: ١٤٧٩، وإبن ماجه: ٣٨٢٨، والبخاري في الأدب المفرد: ٧١٤، واللفظ لأحمد).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاڕانەوە بریتییە لە خواپەرستیی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر.

٩)- ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي لَكُمْ سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە بەرانبەر پەرستنی مندا خۆیان بە زل دەگرن، بێگومان بەزەبوونیی و داماویی دەچنە نێو دۆزەخەوە. (سَيَدْخُلُونَ) دەچن، خوێنراویشەتەوە: (سَيُدْخَلونَ جهنَّم داخِرِين) دەخرێنە دۆزەخەوە بە زەبوونیی و سەر شۆڕیی، (دَاخِرِينَ) کۆی (دَاخِر)ە، واتە: داماوو زەبوون و تێکشکاو، ئنجا کۆی ئەوەی ڕابرد یانی: مادام ڕۆژی دوایی دێ، هیچ جێی دوو دڵیی نیە کەواتە: خوا بەیەکبگرن و تەنیا خوا بپەرستن ﷻ، تەنیا لەو بپاڕێنەوە، هەروەها تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بکەن، شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (٥٥ و ٥٦)دا، باسێکی تایبەتمان لە بارەی پاڕانەوەوە کردوە، لەوێ وردەکاریی زۆرمان باسکردوە و، لێرە بە پێویستیی نازانین دووبارەی بکەینەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان شـازدە (١٦) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٦١ - ٧٦)، تـەوەری سـەرەکییان بـاسی خواناسـییە، بـە تێکهەڵکێـش لەگـەڵ بـاسی قیامـەت و ڕۆژی دوایـی و، سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان لـەو ڕۆژەدا، لـە بـواری خواناسـییش دا، بـاسی ژمارەیەکـی بەرچـاو لـە چاکـەو نیعمەتـەکانی خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا کـراوە، وەک:

دیـاردەی شـەوگارو ڕۆژگار، کـردنی زەوی بـە نشـینگەیەکی ئـارام و گێـڕانی ئاسـمان بەسـەربان و، چـاک وێنەکێشـانی مرۆڤـان و، پێدانیـان لـە بژیـوە خـۆش و بـە سـوودەکان..

هەروەهـا دروسـتکردنی مرۆڤـان - وەک جەسـتەکەیان و سـەرەتا جەسـتەی بابیـان ئـادەم - لـە خـاک و، دواتـر هێنانـە دی وەچـەی ئـادەم بـە چەنـدان قۆناغـی یـەک لـە دوای یـەک: نوتفـە، خوێنپـارە، منـداڵ، گەنـج، پیـر...

وێـڕای ڕوونکردنـەوەی هـۆکاری ئـەو سـەرەنجامە شـوومەیان، کـە بێبڕوایـی و خـۆ بەزلگریـی و فیـزو کەشـخەکردن بـووە لـە زەوی داو، خۆڕانـان و خۆسـەپاندن بـۆ بەسـەر بەنـدەکانی خـوادا.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ
ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ
ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا

وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ
ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا
هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ
أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ
طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن
قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا
قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ
يَعۡلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي
ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ
ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم
بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ
جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خوا کەسێکە شەوگاری بۆ والێکردوون کە پشووی تێدا بدەن و ڕۆژگاریشی (بۆ ڕووناک کردوون و) گێڕاوە بە بینەر، بە دڵنیایی خوا خاوەن چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاریی (بۆ خوا) ناکەن (٦١) ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، جگە لەو هیچ پەرستراوێک (ی ڕاست) نیە، کەواتە: بەرەو کوێ لادەدرێن! (٦٢) ئەوانەی نکووڵیی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن، بەو شێوەیە لادەدرێن! (کە زۆر سەرسوڕهێنەرە!) (٦٣) خوا کەسێکە، زەوی بۆ گێڕاون بە نشینگەو، ئاسمانیش بەسەربان و، وێنەی کێشاون و وێنەکانتانی باش کێشاون و، لە بژیوە خۆش و چاکەکانی بۆ ڕەخساندوون، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانەو بەرزو بەپێزە، خوای پەروەردگاری جیهانییان (٦٤) ئەو (خوا) زیندوویە، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، دەجا بە ملکەچیی ساغکردنەوەوە لێی وەپاڕێن، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان (٦٥) بڵێ: من قەدەغەکراوم، دوای ئەوە بەڵگە ڕۆشنەکانم لە پەروەردگارمەوە بۆ هاتوون، ئەوانە بپەرستم کە جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هەروەها فەرمانم پێکراوە کە بۆ پەروەردگاری جیهانییان ملکەچ بکەم (٦٦) (خوا) ئەو کەسەیە کە (سەرەتا) لە گڵ دروستی کردوون، دوایی لە نوتفە، دوایی لە خوێنپارە، دوایی بە منداڵ (لە سکی دایکتان) دەرتان دێنێ، (دوایی گەشەتان پێدەدات) تاکو بتانگەیەنێتە ئەوپەڕی هێزو پێزتان، دوایی (دەتانژێنێ) تاکو دەبنە بە ساڵداچوو، هەشتانە پێشتر دەمرێترێ و (دەتانژێنێ) تاکو دەگەنە کاتێ ناوبراو (نەوەمان بۆ ڕوونکردنەوە) بەڵکو تێبگەن (٦٧) ئەو (خوا) کەسێکە دەژیەنێ و دەمرێنێ، ئنجا هەر کات بڕیاری کارێکی دا، تەنیا پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ (٦٨) ئایا ئەوانەت نەدیون کە لە بارەی ئایەتەکانمانەوە مشتومڕ دەکەن،

بەرەو کوێ لادەدرێن! ﴿٦٩﴾ ئەوانەی کتێب (ی خوا) بە درۆ دادەنێن، هەروەها ئەوەی پێغەمبەرانی خۆمانمان پێ ڕەوانەکردوە، لەمەودوا دەزانن (چ سەرەنجامێکی شوومیان هەیە!) ﴿٧٠﴾ کاتێک کۆت و زنجیرەکان لە گەردنەکانیاندا دەبن و ڕادەکێشرێن ﴿٧١﴾ (بە نێو) ئاوی گەرم و داغدا، دوایی لە ئاگردا دادەگیرسێنرێن ﴿٧٢﴾ دوایی پێیان گوترا: کوا ئەوەی دەتانکردە هاوبەش ﴿٧٣﴾ (ئەوەی) جگە لە خوا (دەتانپەرست)؟! گوتیان: لێمان ونبوون، بەڵکو پێشتر لە هیچ شتێک نەدەپاڕاینەوە، بەو شێوەیە خوا بێبڕوایان گومڕا دەکات ﴿٧٤﴾ ئەم (سزاو سەرەنجامە شووم)ەتان (ئەی بێبڕوایەکان!) بە هۆی ئەوەوەیە کە لەسەر زەوی بە ناهەق شادمان دەبوون و، بە هۆی ئەوەوەیە کە فیزو کەشخەتان دەکرد ﴿٧٥﴾ بچنە دەروازەکانی دۆزەخەوە بە هەمیشەیی تێیاندا دەبن (دۆزەخیش) خراپترین پشووگای خۆبەزلگرانە ﴿٧٦﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) خۆت ڕابگرە، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاست و چەسپاوە، ئنجا ئەگەر هەندێک لەوەی گفتیان پێدەدەین، پێشانت بدەین، یان بتمرێنین، تەنیا بۆ لای ئێمە دەگێردرێنەوە.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**تُؤْفَكُونَ**): (**أي: تُصْرَفُون**) لادەدرێن، (**الإفكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ**)، (**إفك**): بریتیە لە هەرشتێک کە لەو ڕووە ڕاست و هەقەی کە دەبوو لەسەری بێ، لادرابێ، ڕووی پێکرابێتە شتێکی دیکە، یاخود بە جۆرێکی دیکەی لێکرابێ کە ناهەقە.

(**يَجْحَدُونَ**): نکووڵییدەکەن، (**الجَحْدُ: نَفيُ مَا فِي القَلْبِ إثْبَاتُهُ، وَإثْبَاتُ مَا فِي القَلْبِ نَفيه**)، (**جَحْد**): بریتیە لەوەی شتێک لە دڵدا چەسپاوە، تۆ لایبەری، یاخود شتێک لە دڵدا لابراوە، تۆ بیچەسپێنی، واتە: وا پێشان بدەی کە بڕوات پێیەتی و بڕوات پێ نەبێ، یان وا پێشاندەی کە بڕوات پێی نیەو، بڕواشت پێی هەبێ.

(**قَرَارًا**): (**قَرَّ فِي مَكَانِهِ، يَقَرُّ قَرَارَاً: أي ثَبَتَ ثُبُوتَاً جَامِدَاً وَأَصْلُهُ مِنَ القُرِّ وَهُوَ البَرْد**)، (**قَرَّ فِي مَكَانِه**) واتە: لە شوێنی خۆی چەسپا، (**يَقَرُّ قَرَارَاً**) واتە: دەچەسپێ، چەسپان، (**أي: ثَبَتَ ثُبُوتَاً جَامِدَاً**) شتێک کە لە شوێنێک بچەسپێ و نەجووڵێ، لە ڕیشەشدا لە (**قُرّ**)ەوە هاتوە، یانی: ساردیی، لەبەر ئەوەی سەرماو ساردیی و بەستن، هۆکاری نەجووڵانەو، گەرمیی هۆکاری جووڵانە.

(**بِنَاءً**): (**البِنَاءُ: إسْمُ لِمَا يُبْنِى بِنَاءً**)، (**بِنَاء**) ناوە بۆ هەر شتێک کە دروست بکرێ، دەشگونجێ بە مانای سەربانیش بێ.

(**فَتَبَارَكَ**): واتە: بەرزو بە پێزە، (**البَرَكَةُ: ثُبُوتُ الخَيْرِ الإلَهِي فِي الشَّيء، وَالمُبَارَكَةُ مَا فِيهِ ذَلِكَ الخَيْرُ، وَتَبَارَكَ: كَثُرَ خَيْرُهُ**)، (**بَرَكَة**): بریتیە لە چەسپانی پێزی خوایی لە شتێکدا، (**مُبَارَكَة**) ئەو شتەیە کە ئەو خێرو هێزو پێزی تێدابێ، (**وَتَبَارَكَ**) واتە: خێری زۆرەو بەپێزە.

(أَشُدَّكُمْ): (أَشُد) یان کۆی (شِدَّة)ەیە، یاخود هەر ناوە، (أَشُدّ) بە مانای ئەوپەڕی تواناو تاقەت و هێزو پێزە.

(ٱلْأَغْلَٰلُ): کۆی (غُلّ)ە، (الغُلّ: مُخْتَصٌ لِمَا يُقَيَّدُ بِهِ فَتُجْعَلُ الأَعْضَاءُ فِي وَسْطِهِ)، (غُلّ): شتێکە کە ئەندامێک دەخرێتە نێو قەدی، بە کوردیی کۆت پێی دەڵێن، کە زیاتر لە گەردن دەکرێ، هەندێک زاناش (غُلّ)یان بۆ کەلەپچەی دەست و پێش بەکارهێناون.

(وَٱلسَّلَٰسِلُ): (تَسَلْسَلَ الشَّيءُ: اضْطَرَبَ)، (سَلَاسِل) کۆی (سِلْسِلَة)یە واتە: زنجیر، (تَسَلْسَلَ) واتە: ئەو شتە جووڵا، یاخود بە دوای یەکداهات.

(يُسْحَبُونَ): واتە: ڕادەکێشرێن، (السَّحْبُ: الجَرُّ كَسَحْبِ الذَّيلِ)، (سَحْب) بریتیە لە ڕاکێشان وەک چۆن شتێک کلکی ڕادەکێشێ.

(يُسْجَرُونَ): واتە: دادەگیرسێترێن، (السَّجْرُ: تَهْيِيجُ النَّارِ، سَجَرْتُ التَّنُّورَ)، (سَجْر): بریتیە لە داگیرساندنی ئاگر، خۆشکردنی ئاگر، دەگوترێ: تەندوورەکەم گڕدا، دامگیرساند.

(ٱلْحَمِيمِ): (أي: المَاءُ الشَّدِيدُ الحَرَارَةِ)، (حَمِيم): ئاوێکە زۆر گەرم بێ، واتە: ئاوێکی گەرم و داغ و کوڵیو.

(تَفْرَحُونَ): (الفَرَحُ: إنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَةٍ، وَأَكْثَرُ مَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي اللَّذَّاتِ البَدَنِيَّةِ والدُّنْيَوِيَّةِ)، (فَرَح): بریتیە لە سینە گوشادبوون بە چێژێکی بەپەلە، کە بە زۆریی لە بارەی چێژە جەستەییەکان و چێژە دنیاییەکانەوە، ئەم وشە بەکاردێ.

بەڵام وەک پێشتریش گوتوومە: (فَرَح) بریتیە لە ئەوپەڕی دڵخۆشیی، هەربۆیە خوا ﷻ (فَرَح)ی لە هەموو شوێنەکاندا سەرکۆنەو زەمکردوە، مەگەر لە شتێکدا کە بهێنێ و، شایستەی بێ، وەک دەفەرموێ: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾﴾ یونس، واتە: بڵێ با بە بەخششی خواو

بە بەزەیی خوا، هەر بەوە زۆر دڵخۆش بن، واتە: بە شتی دیکە زۆر دڵخۆش نەبن.

هەروەها لە بارەی سەرکەوتنی مسوڵمانانەوە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ۝٤ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ۝٥﴾ الروم، واتە: ئەو ڕۆژە بڕواداران زۆر دڵخۆش دەبن بە سەرخستنی خواو یارمەتییدانی خوا بۆیان، کەواتە: (فَرَح) واتە: (أَشَدُّ السُّرُور) زۆر دڵخۆش بوون.

(تَمْرَحُونَ ): (المَرَحُ: شِدَّةُ الفَرَحِ وَالتَّوَسُّعُ فِيْهِ: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۝١٨﴾ وَمَرْحَى: كَلِمَةُ التَعَجُّبِ)، (مَرَح): بریتیە لە زۆر دڵخۆش بوون و فراوانیی کردن لە دڵخۆشییدا، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۝١٨﴾ لقمان، واتە: زۆر بە دڵخۆشیی بە زەویدا مەڕۆ، (مَرْحَى): وشەیەکە بۆ سەرسوڕمان.

بەڵام وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، لە ڕاستییدا (تَمْرَحُونَ ) واتە: دەرکەوتنی ئەو شادمانییەو خۆشحاڵییە زۆرە بە شتی دنیایی، لە جەستەی مرۆڤدا، لە هەڵسوکەوتەکانیدا، فیزو کەشخەکردن، خۆ بادان و، خۆڕانان، (مَرَح) ئەوەیە.

(مَثْوَى ): (ثَوَى بِالمَكَانِ: أَقَامَ وَاسْتَقَرَّ، وَالمَثْوَى: المُسْتَقَرُّ)، (ثَوَى بِالمَكَانِ) واتە: لە شوێنەکە جێگیربوو، نیشتەجێ بوو، (مَثْوَى ) واتە: نشینگە، ئەو شوێنەی مرۆڤ تێیدا نیشتەجێ دەبێ و قەرار دەگرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم شـازدە (١٦) ئایەتـەدا، جارێکـی دیکـە کۆمەڵـێ لـە چاکـەو نیعمەتـەکانی خـۆی دەخاتـەڕوو، هەروەهـا لەمیـانی خسـتنەڕووی ئـەو چاکـەو نیعمەتانـەی خۆیـدا، زیاتـر پەروەردگارێتیـی خـۆی و پەرستراوێتـیی خـۆی بـۆ ئێمـە دەخاتـەڕوو، کـە هـەر ئـەو شایسـتەی ئەوەیـە بـە پـەروەدگارو پەرسـتراو بگیـرێ و بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ.

دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ ﴾، خـوا ئـەو کەسـەیە شـەوگاری بـۆ واڵێکـردوون کـە تێیـدا پشـوو بـدەن، ئـارام بگـرن و بخـەون، ﴿ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾، ڕۆژگاریـشی بـۆ کـردوون بـە بینـەر، دیـارە ڕۆژگار خـۆی نابینـێ، مرۆڤـەکان تێیـدا دەبینـن، بـەڵام بـۆ زێدەڕۆییکـردن لـەوەدا کـە ڕۆژگار زۆر ڕووناکـە، وەک خـۆی ببینـێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا خـاوەن بەخششـە، خـاوەن چاکەیـە بەسـەر خەڵکـەوە، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی سوپاسـگوزاریی ناکـەن.

﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾، ئا ئەو خوایەتـان پەروەردگارتانـە، بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێکە، جگـە لـەو هیچ پەرسـتراوێک نیـە، بـەرەو کـوێ لادەدرێـن؟ واتـە: بۆچـی جگـە لـەو دەپەرسـتن، لـە حاڵێکـدا هـەر ئـەو خوایەتـان پـەروەردگارو خـاوەن و ژیێنـەرو مرێنـەرو بەخێوکەرتانـەو، هـەر ئـەو بەدیهێنـەرو پەیداکـەرو داهێنەرتانـەو، هـەر ئەویـش پەرسـتراوە بەهـەق و، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێکی دی نیـە، کەواتـە: بۆچـی لادەدرێـن و بـەو لاو لادا دەڕۆن؟ ﴿ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾، هـەر بـەو شـێوە لادانـەی ئێـوە لادەدەن ئـەی بێبڕوایـەکان! ئەوانـەش کـە لـە ڕابـردوودا نکووڵییـان لـە ئایەتـەکانی خـوا دەکـرد، هـەر ئـاوا لادەدران.

ئنجا جارێکی دیکەش خوا ﷻ هەندێک لە چاکەو نیعمەتەکانی دیکەی خۆی دەخاتەڕوو: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا ﴾، خوا ئەو کەسەیە زەوی بۆ کردوون بە نشینگە، واتە: وای بۆ لێکردوون کە سەقامگیربێ و جووڵە جووڵ نەکات، هەرچەندە زەوی هەم بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، هەم بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، هەم لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا جووڵەی دیکەی هەیە، هەم لەگەڵ کەهکەشاندا جووڵەی دیکەی هەیە، بەڵام ئێمە هەستی پێناکەین، خوا ئەو کەسەیە زەوی بۆ سەقامگیر کردوون، بۆی والێکردوون وا هەست بکەن کە ناجووڵێ، ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً ﴾، ئاسمانیشی بۆ کردوون بە خانوویەک، یان: بۆی بەرزکردوونەوە، یاخود: بۆی کردوون بەسەربان، ﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾، هەروەها خوا وێنەی ئێوەی کێشاوەو وێنەکانتانیشی جوان کێشاون، ئەگەر ئینسان تەماشای دەم و چاوی مرۆڤ بکات و تەماشای جەستەو پێکهاتەکەی بکات، ئەوەی خوا دروستی کردوە، لەوە باشتر وێنا (تصوّر) ناکرێ و، مەزەندە ناکرێ، ﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾، هەروەها خوا لە بژێوە پاک و چاکەکان بەشی ئێوەی داوە.

زانایان گوتوویانە: (ٱلطَّيِّبَٰتِ) مەرج نیە تەنیا بۆ خواردن و خواردنەوە بێ، بەرگ و پۆشاک دەگرێتەوە، بۆن دەگرێتەوە، کەلوپەلەکان دەگرێتەوە، هەموو ئەو شتانەی بۆ مرۆڤ ڕەخسێنراون و مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ لە ژیانی دنیایدا، هەموویان دەگرێتەوە، ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بەرزو بەپێزە خوای پەروەردگاری جیهانییان.

﴿ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئەو زیندوویە (خاوەنی ژیانی ڕاستەقینەیە)، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، ئنجا بەس لەو بپاڕێنەوە، گەردنکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنەوە، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ستاییش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾، [دوێنراو (مخاطب) پێغەمبەری خاتەمە]، ئەی موحەممەد! بفەرموو: من قەدەغە کراوم، ئەوانە بپەرستم کە ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، یان: جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، ﴿لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي﴾، دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانم لە پەروەردگارمەوە بۆ هاتن، ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، فەرمانیشم پێکراوە ملکەچ بکەم بۆ پەروەردگاری جیهانییان.

ملکەچکردنەکەش لە شوێنکەوتنی کتێبی خواداو پەیام و بەرنامەی خوادا، بەرجەستە دەبێ.

ئنجا جارێکی دیکە خوا ﷻ باسی هەندێکی دیکە لە نیعمەتەکانی خۆی و چاکەکانی خۆی لە ژیانی بەشەردا دەکات:

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە ئێوەی لە گڵ دروستکردوە، واتە: سەرەتای دروستبوونتان لە گڵەوەیە، ئنجا ئەگەر مەبەست پێی ئادەم بێ، ئەوە دیارە جەستەی ئادەم ڕاستەوخۆ لە خاک دروست بووەو، ئەگەر مەبەست پێی ئێمەش بێ، ئێمەش هەرچەندە لە نوتفە دروست دەبین، بەڵام ئەو نوتفەیە لە خوێن و، خوێنیش لە خواردنی هەرسکراو و، خواردنی هەرسکراویش لەو خواردن و خۆراکانە کە لە زەوی پەیدادەبن، بۆیە ئەصڵی ئێمەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ زەوی، ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾، دوایی لە نوتفە (تۆویلکە)، کە بریتیە لە زیندەوەرێکی بچووک، کە لە ئەنجامی یەکگرتنی حەیمەنێکی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەتدا دروست دەبێ، وەک لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (المؤمنون)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لەو بارەوە کردوە، ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾، دوایی لە خوێنپارەیەک، واتە: لە زیندەوەرێکی بچووک کە خۆی بە دیواری منداڵدانەدا هەڵدەواسێ، وەک زەروویەک، ﴿ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾، دوایی دەبنە منداڵ و لە سکی دایکتان دەرتان دێنێ، ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾، دوایی

(خوا دەتانژیەنێ) تاکو دەگەنە ئەوپەڕی تواناتان، قۆناغی گەنجێتیی و تین و تاقەت، ﴿ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا﴾، دوایی تەمەنتان پێدەدات تاکو پیر دەبن و، دەکەونەوە تەمەنەوەو بە ساڵدا دەچن، ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾، هەشتانە پێش ئەوە دەمرێنرێ، واتە: ناگاتە تەمەنی پیریی و بە گەنجیی، یان بە منداڵیی دەمرێ، ﴿وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى﴾، (هەروەها خوا تەمەنتان پێدەدا) تاکو دەگەنە کاتی دیاریکراو، کاتی ناوبراو، کە کاتی مردنتانە، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، (ئەوەشی بۆ ڕوونکردنەوە) بەڵکو بفامن و، تێبگەن کە ئێوە لە کوێوە هاتوون و بەس خوایە ﷻ سەرپەرشتیارو پەروەردگارتان.

﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە دەژیەنێ و دەمرێنێ، واتە: ژیان دەبەخشێ و ژیانیش وەردەگرێتەوە و دەمرێنێ، ﴿فَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾، هەرکاتێ فەرمانێکیدا، بڕیارێکی دەرکرد، بەس پێی دەفەرمویێ: ببە، یەکسەر دەبێ، ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ﴾، سەرنجی ئەوانە نادەی کە شەڕە قسە دەکەن لە بارەی ئایەتەکانی خواوەو، دژایەتیی ئایەتەکانی خوا دەکەن، ﴿أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ﴾، بۆ کوێ لادەدرێن و ڕوویان پێوەردەگێڕدرێ، ﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە کتێب نەکردوە، کتێبیان بەدرۆ داناوە، واتە: هەموو کتێبەکانی خوا، یاخود کتێبەکە، ئەگەر (أل)ەکە بۆ (عهد) بێ واتە: کتێبە زانراو و ناسراوەکە، کە قورئانە، بە درۆیان داناوە، ﴿وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا﴾، هەروەها ئەوەیان بە درۆ داناوە کە پێغەمبەرانی خۆمان پێ ڕەوانە کردوون، ئەو پەیام و وەحییە، ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾، لە مەودوا دەزانن، واتە: دەزانن چییان بەسەردێ، لە ئەنجامی ئەو بەدرۆدانانەی پەیامی خوادا.

﴿إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ﴾، ئەو کاتەی کۆتەکان دەخرێنە گەردنیانەوە، ﴿وَالسَّلَاسِلُ﴾، هەروەها زنجیرەکانیش دەخرێنە دەست و پێیانەوە، یاخود بە زنجیریش ڕادەکێشرێن، ﴿يُسْحَبُونَ فِي الْحَمِيمِ﴾، بە نێو ناوی داغ و کوڵاودا

ڕادەکێشرێـن، ﴿ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾، دوایـی لـە نێـو ئاگـردا، ئاگریـان دەدرێتـە بـەرو دەسـووتێنرێن.

﴿ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾، دوایـی پێیـان گوتـرا: کـوا ئـەوەی لـە جیاتی خـوا دەتانکـردە هاوبـەش؟ واتـە: دەتانکـردە هاوبـەشی خـوا لـە پەرستراندا، ﴿ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا ﴾، گوتیـان: لێـمان ونبـوون، ﴿ بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا مِن قَبْلُ شَيْئًا ﴾، بەڵکـو پێشـتر ئێمـە لـە هیـچ شـتێک نەپاڕاوینـەوە، نکووڵیـی دەکـەن کـە غەیـری خوایـان پەرسـتبێ، یاخـود ئەوەی کـە پەرسـتوومانە هیچ نەبـوو، ﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ ﴾، ئـاواش خـوا بێبڕوایـان گومـڕا دەکاو سـەر لێ دەشـێوێنێ، لـە ئەنجامی ئـەوەدا کـە هیدایـەتی خـوا ڕەفـز دەکـەن، خـوا ﷻ وایـان لێـدەکات، بـەڕێ نەزانـن.

﴿ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ﴾، ئـەو سـەرەنجامە شـوومەتان بـە هـۆی ئەوەوەیـە، کـە ئێـوە بـە ناهـەق زۆر دڵخـۆش دەبـوون لـە زەویـدا، ﴿ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴾، بـە هـۆی ئەوەشـەوەیە کـە فیـزو کەشـخەتان دەکـردو، خۆتـان ڕادەنـا، بـە ناهـەق، ﴿ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ﴾، ئێسـتا بچنـە نێـو دەروازەکانی دۆزەخـەوە، بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، ﴿ فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، خراپتریـن سـەرەنجام سـەرەنجامی خـۆ بەزلگرانـە، خراپتریـن نشـینگە نشـینگەی خۆبەزلگرانـە کـە دۆزەخـە، خـوا پەنامـان بـدات لـەو سـیفەتە خراپانـەی تـووشی دۆزەخـمان دەکـەن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ناساندنی خوا ﷻ لە میانی ڕەخساندنی شەوگارو ڕۆژگاردا، بۆ پشوو تیدا دان و، جموجۆڵ و کارو کاسبیی و، بەدیهێنەرایەتیی خوا ﷻ و تەنیا پەرستراوێتیی، بەڵام لادران و نکووڵییکردنی بێبڕوایان لە ڕاستە شەقامی: تەنیا خوا بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراو، دانان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ ﴾، خوا ئەو کەسەیە، ئەو زاتەیە کە شەوگاری بۆ وا لێکردوون پشووی تێدا بدەن، یاخود بۆی گێڕاون بە کاتی پشوو تێدادان و ئیسڕاحەت تێداکردن.

٢)- ﴿ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾، ڕۆژگاریشی بۆ بینەر کردوون، بۆ کردوون بە بینەر، (**لِتَسْكُنُوا فِيهِ: سَكَنَ فِيهِ: عَكْسُ تَحَرَّكَ**)، (سكن) پێچەوانەی (جووڵا)یە، ئۆقرەی تێدا بگرن، ئارامی تێدا بگرن، تێیدا پشوو بدەن و لە جموجۆڵ بکەون، ﴿ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾، (**جَعَلَ النَّهَارَ مُبْصِراً، أُسْنِدَ الْإِبْصَارُ إِلَى ذَاتِ النَّهَارِ عَلَى طَرِيقَةِ الْمَجَازِ الْعَقْلِيِّ، وَإِنَّمَا الْمُبْصِرُونَ النَّاسُ فِي النَّهَارِ**)، وشەی (**إِبْصَارِ**): بینین، پاڵدراوەتە لای ڕۆژگار (**نَهَارَ**) لەسەر

ڕێبازی مەجازی عەقڵیی، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ئەوانەی لە ڕۆژێدا دەبینن، خەڵکن، نەک ڕۆژەکە خۆی ببینێ، بەڵام واتە: ڕۆژەکە ئەوەندە ڕووناکە، وەک لە زاتی خۆیدا بینەربێ وایە، خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی شەوگارو ڕۆژگاری کردوەو، هەمیشە لە قورئاندا شەوگار بۆ ئیسراحەت و خەوتن و پشوو تێدان و، ڕۆژگار بۆ جموجۆڵ و کارو کاسبیی، باسکراون، بێگومان شەوگارو ڕۆژگاریش هەر بەو شێوەیەن.

هەڵبەتە کەسی واش هەیە وەک هەڵاواردن لەو بنچینە گشتییە، لە شەوێدا کار دەکات و جموجۆڵ دەکات وەک کاروانچییەکان، یان هەندێ نیش و کار هەن، کە بە شەوێ دەکرێن و بە ڕۆژێ خەڵکەکە پشوودەدا، بەڵام بە زۆریی وایە، هەموو خەڵکی دنیاو، بە درێژایی مێژوو، ڕۆژگار کە ڕووناکە بەکارهێنراوە بۆ کارو کەسابەت و جموجۆڵ و، شەوگاریش کە تاریکە، بەکارهێنراوەو بەهەرەی لێوەرگیراوە بۆ ئیسراحەت و خەوتن و پشوو تێدادان.

٣)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، بە دڵنیایی خوا خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، ﴿لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، واتە: (لَهُ الفَضْلُ)، چونکە (ذو) بە مانای (صاحب)ە، خوا خاوەن چاکەیە، خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا وشەی: ﴿لَذُو فَضۡلٍ﴾ی بەکارهێناوە، چونکە وشەی (ذُو) دەلالەت لەسەر ڕێزو پێگەی ئەو شتە دەکات، کە پاڵیدەدرێتە لا.

٤)- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاریی ناکەن، کەواتە: کەمێکیان سوپاسگوزارن، وەک لە سووڕی (سبأ)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ۝١٣﴾، واتە: کەمێک لە بەندەکانم سوپاسگوزارن، پێشتریش چەند جارێک باسی ئەوەمان کردوە، کە سوپاسکردنی خوا ﷻ و سوپاسگوزاریی ئەنجام دان، پەیوەندیی بە عەقڵ و دڵ و دەروونی مرۆڤەوە هەیە، هەروەها بە زمانی و بە ئەندامەکانیشیەوە، مرۆڤ دەبێ:

أ- بە عەقڵ و دڵ و دەروون، ئەو چاکەو نیعمەتە لە خوا بزانێ.

ب- بە زمان دانی پێدابێنێ.

ج- بە ئەندامەکانیش ئەو نیعمەت و چاکەیەی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنێ، بە شێوەیەک بەکاری بێنێ کە مایەی ڕازییکردنی خوا ﷻ بێ، لە ڕابردوودا زۆرجار باسی ئەوەمان کردوە، بۆیە لێرەدا هەر بەو ئاماژە کورتە لێی دەگەڕێین.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ:

٥)- ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾، ئا ئەو خوایەتان ﷻ پەروەردگارتانە.

٦)- ﴿ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

٧)- ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە.

٨)- ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾، کەواتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟ وشەی (أَنَّى: اسْمُ اسْتِفْهَامٍ عَنِ الْكَيْفِيَّةِ، وَأَصْلُهُ اسْتِفْهَامٌ عَنِ الْمَكَانِ)، واتە: (أنَّى): لە ئەصڵدا ناوی پرسیارکردنە بۆ چۆنیەتیی، ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾، واتە: چۆن لادەدرێن؟ ئنجا لێرەدا پرسیارکردنەکە لە بارەی چۆنیەتییەوەیە، واتە: چۆن لادەدرێن، بە چ بەڵگەیەک و بە چ پاساوو بیانووێک؟ مادام خوا ﷻ پەروەردگارو بەدیهێنەرو تاکە پەرستراوی شایستە بێ، ئەدی بۆچی لادەدرێن و شتەکانی دیکە دەکەن بە هاوبەشی خواو، لەگەڵ خوادا دەیانپەرستن؟

کەواتە: لێرەدا خوای بەرزی مەزن کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بە چوار شتان، لە بارەی ئەو ناوی ئاماژە (ذلكم)وە، هەواڵ دەدات:

١- خوا (ألله) ﷻ وشەی (ألله) ناوی تایبەتی (عَلَم)ی خوای پەروەردگارە، واتە: ئا ئەوەتان خوایە.

٢- پەروەردگارتانە.

٣- بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

٤- جگە لەویش هیچ پەرستراوێک نیە، شایستەی پەرستران بێ، ئایا چۆن لەو خوا پەروەردگارەتان کە تاکە بەدیهێنەرو تاکە پەرستراوە، لا دەدرێن، کە جگە لەوی بکەنە پەرستراوی خۆتان، یان لە پەرستنی خوادا بەشداری بکەن، یان لە یەکێ لە سیفەتەکانی خوادا بەشداری بکەن، شتێک لە بەدیهێنانی پاڵدەنەلا، یان شتێک لە بژیو پێدانی پاڵدەنەلا، یاخود شتێک لە پەروەردگارێتیی پاڵدەنەلا، یان یەکێک لە ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاری پاڵدەنەلا؟! ئەوە هەمووی شیرکە، وەک چۆن ئەگەر جگە لەو بپەرستی لە بەشێک لە بەشەکانی پەرستن و، لە شتێک لە شتەکانی پەرستندا، شیرکە، بە هەمان شێوەش ئەگەر بەشێک لە: بەدیهێنەرایەتیی، پەروەردگارێتیی، خاوەندارێتیی، ناو و سیفەتەکانی خواش پاڵدەنە لای غەیری خوا، ئەویش هەر شیرکە.

٩)- ﴿ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی نکووڵییان لە ئایەتەکانی خوا دەکرد، لادەدران، (كَذَلِكَ (يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟..)، أَيْ مِثْلُ إِفْكِكُمْ يُؤْفَكُونَ، وَيَكُونُ التَّشْبِيهُ مُبَالَغَةً فِي أَنَّ إِفْكَهُمْ بَلَغَ فِي كُنْهِ الْإِفْكِ النِّهَايَةَ، بِحَيْثُ لَوْ أَرَادَ الْمُقَرِّبُ أَنْ يُقَرِّبَهُ لِلسَّامِعِينَ بِشَبِيهٍ لَهُ، لَمْ يَجِدْ شَبِيهًا لَهُ أَوْضَحَ مِنْهُ!)، لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەم تەعبیرە هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾، هەر بەو شێوە لادرانە، ئەوانەی نکووڵیی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن، لا دەدرێن، واتە: وەک لادرانی ئێوە لا دەدرێن، ئەمەش وێچواندنەو زێدەڕۆییکردنە لەوەدا کە لادرانەکەیان لە جەوهەرو چییەتی خۆیدا، گەیشتۆتە ئەوپەڕی، بە شێوەیەک ئەگەر کەسێک بیەوێ وێنەی ئەوە بۆ بیسەران بێنێتەوە لە خۆی باشتر، (واتە: لە خودی ئەو شتە باشتر) چنگی ناکەوێ بیکاتە وێچوێنراو.

یانی: لێرەدا لادرانی ئەوان، کراوەتە چوێنراو (مُشَبَّه) بەلادانەکەیان، چونکە شتێکی دیکە لەو لادانە ڕوونتر نیە، تاکو ئەو لادانەی پێ بچوێنرێ.

وشەی (جُحُود): ئەوەیە ئینسان نکووڵیی بکات لە شتێک کە هەیە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (جُحُود) بریتیە: لەوەی نکووڵیی بکەی لە شتێک کە هەیە

لـە دڵـدا، بڵێـی نیـە، یاخـود شـتێک کـە نەبێ، بڵێـی هەیـە، نکووڵییکـردن و دان بـە هەقـدا نەهێنـان، ئنجـا دان بـە هەقـدا نەهێنـان، چ بـەو شـێوەیە بـێ کـە شـتەکە هەبێـت و بڵێـی نیـە، یاخـود نەبێـت و بڵێـی هەیـە، ئەمـە وا لـە مـرۆڤ دەکات لـە ڕاسـتیی تێنـەگات، ئـەو ڕاسـتییەی نکووڵیـی لێـدەکات، بـە بـاری ئەرێنیـی، یـان نەرێنییـدا، وای لێـدەکات، لێـی نامـۆ بـێ و لێـی تێنـەگات.

**مەسەلەی دووەم:**

**ناساندنی خوا ﷻ لەمیانی گێڕانی زەویدا بە نشینگەو، ئاسمان بە خانوو (یاخود: سەربان) و جوان وێنەکێشانی مرۆڤان و، ڕەخساندنی بژیوە پاک و چاکەکان و، جەختکردنەوەی زیندوویەتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻ، پاشان فەرمانکردن بە تەنیا پەرستنی خوا بە ساغیی و بەبێ خڵتەو، ستایشکردنی و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای هاتنی بەڵگە ڕۆشنەکانی پەروەردگاری، پەرستنی جگە لە خوای لێ قەدەغە کراوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦٥﴾ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِنْ رَبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە سەرزەوی بۆ گێڕاون بە نشینگە، وشەی (القَرَارُ: أي مُسْتَقَرّاً ومَكَانَ اسْتِقْرَارٍ)، واتە: نشینگە، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون و سەقامگیربوون، [(أو قراراً) أي (قَارَّةً)]، واتە: زەوی بۆ والێکردوون کە چەسپاو بێ و بەم لاو لادا نەچێ و نەجووڵێ، زۆر جارانیش باسمانکردوە، کە زەوی چەند جۆرە جووڵەیەکی هەن، بەڵام ئێمە هەستیان پیناکەین تەگەرنا:

١- زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە خولەکێکدا.

٢- بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، واتە: شەست (٦٠) هێندەی خولانەوەی دەوری خۆی خێراتر.

٣- هەروەها لەگەڵ خۆرو کۆمەڵەی خۆریشدا جارێکی دیکە بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا دەخولێتەوە.

٤- لەگەڵ داڵی ڕاوەستاویشدا بە نێو چەقی کەهکەشاندا دەخولێتەوە.

٥- لەگەڵ کەهکەشانیش دا بە شوێنێکی دیکەدا دەخولێتەوە، بە لای کەمەوە زەوی پێنج جۆرە سووڕانەوەی هەن، بەڵام ئێمە هەستیان پێناکەین، خوای کارزان وای هەڵخستوە ئێمە هەست بە جووڵەکانی نەکەین، ئنجا زەوی لە ڕاستییدا هەم نشینگەیە شوێنی تێدا سەقامگیر بوون و نیشتەجێبوونەو، هەم چەسپاوە، بە نسبەت ئێمەوە چەسپاوو نەجووڵاویشە.

٢)- ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾، { دیسان خوا ئەو زاتەیە کە} ئاسمانی بۆ کردوون بە خانوو، (بِنَآءً) بە دوو مانا هاتوە:

أ- (مَا يُرْفَعُ سُمْكُهُ فِي الأَرْضِ) ئەوەیە کە ئەستوورییەکەی بەرز دەکرێتەوە لەسەر زەوی، واتە: خانوو، بینا.

ب- هەروەها بە سەربانیش دەگوترێ.

٣)- ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾، هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی وێنەکێشاوەو باش وێنەکانی کێشاون، (أَيْ: أَوْجَدَ صُورَةَ الإِنْسَانِ فَجَاءَتْ حَسَنَةً)، وێنەی مرۆڤی کێشاوەو وێنەکەشی جوان کێشاوە، مرۆڤ ئەگەر تەماشای خۆی بکات خۆی بەراورد بکات لەگەڵ ژیاندارانی دیکەداو، لەگەڵ دروستکراوەکانی دیکەدا، بۆی دەردەکەوێ، ئەوەی خوا فەرموویەتی سەدا سەد وایە، هەروەها خوا لە سوورەتی (التين) دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤﴾، واتە: مرۆڤمان لە باشترین شێوەو دیمەن و پێکهاتەی دەروونیی و ڕواڵەتییدا دروستکردوە.

٤)- ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾، لە ڕۆزییە پاک و چاکەکان بەشی داون، زۆر لە زانایان گوتوویانە: (ٱلطَّيِّبَٰتِ)، خواردن و خواردنەوە خۆش و بە تامەکان، بەڵام بێگومان وشەی

(ٱلطَّيِّبَٰتِ) وەک چۆن خواردن و خواردنەوەکان دەگرێتەوە، بەرگ و پۆشاکەکانیش دەگرێتەوەو، هەموو ئەو کەل و پەل و شتانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ لە ژیانی دنیادا بەکاریان دێنێ، ئەو شتانەی سوود بەخشن و ژیانی مرۆڤیان پێ بەڕێوەدەچێ، ئنجا خواردن و خواردنەوەیە، بەرگ و پۆشاکە، قاپ و قاچاغە، ئاژەڵە کە کاتی خۆی سواریان بوون و بارو سواریان پێکردوون، هەروەها هۆکارەکانی دیکەی گواستنەوە، لە هەواو لە دەریاو لە وشکانیی داو، هەموو ئەو شتانەی دیکە، کە مرۆڤ پێویستیی پێیانە بۆ ژیانی دنیا، هەموویان دەگرێتەوە.

٥)- ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە.

٦)- ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، بەرزو بەپێزە بەردەوام و خاوەن بەرەکەتە خوای پەروەردگاری جیهانییان، وشەی (تَبَارَكَ: مُشْتَقٌّ مِنَ الْبَرَكَةُ، وَالْبَرَكَةُ: اسْمٌ يَدُلُّ عَلَى تَزَايُدِ الْخَيْرِ)، وشەی (تَبَارَكَ) لەسەر کێشی (تَفَاعَلَ)ەو، لە وشەی (بَرَكَة)ەوە داتاشراوە، (بَرَكَة)ش بریتیە: لە ناوێک کە خێرو پیت و پێزی زۆر دەگەیەنێ، واتە: بەرزو بە پێزو خاوەن چاکەو بەرەکەتە خوای پەروەردگاری جیهانییان.

٧)- ﴿هُوَ ٱلْحَيُّ﴾، ئەو زیندوویە، دیارە خاوەن ژیان بوونی خوا ﷻ و، زیندوو بوونی خوا ﷻ، چەمک و واتایەکەی تایبەتە وەک سەرجەم سیفەتەکانی دیکەی خوا، زانایان دەڵێن: (الْحَيَاةُ: هِيَ صِفَةٌ وُجُودِيَّةٌ تُصَحِّحُ لِمَنْ قَامَتْ بِهِ الْإِدْرَاكَ وَالْإِرَادَةَ وَالْفِعْلَ)، واتە: (حَيَاة) سیفەتێکی بوونییە هەر کەسێک تێیدابێ، زانین و، ویستن و، کارکردنی بۆ دەڕەخسێنێ، واتە: خوا ﷻ کە خۆی بە (ٱلْحَيُّ)، خاوەن ژیان وەسف دەکات، بە تەئکید وەک چۆن سیفەتەکانی خوا ﷻ هەموویان بەو شێوەیەن کە بۆ خوا شایستەن، نەک پێوانە (قیاس) بکرێن بۆ سەر سیفەتی دروستکراوەکان، بە هەمان شێوە سیفەتی ژیانیشی هەروایە.

٨)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمە ئەنجامگیرییەکە لەوەی پێشەوە دەکرێ، واتە: مادام خوا ﷻ ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی بۆ ئێوە

ڕەخساندوون، چ ئەوانەی پێشێ باسمانکردن: شەوگارو ڕۆژگار، چ ئەوانەی ئێستا باسمانکردن: زەوی بۆ کردوون بە نشینگەیەکی چەسپاوو، ئاسمانی بۆ کردوون بە خانوو و سەربان و، بە باشترین شێوە وێنەی ئێوەی کێشاوەو، لە هەموو ئەو شتانەی پاک و چاکن و ژیانتان پێویستیی پێیانە، بەشی داون، کەواتە: جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمە ئەنجامگیرییەکە لە هەموو ئەوانەی پێشەوە دەکرێ.

٩)- ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ﴾، دەجا لێی بپاڕێنەوە، ملکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنەوە، پێشتریش هێنامان کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ) (أخرجه أبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٣٢٤٧، وقال: هذا حديث حسن صحيح، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، واتە: پاڕانەوە بریتیە لە پەرستن. کە دەفەرموێ: (مُخۡلِصِينَ)، (الإِخْلَاصُ: الإِفْرَادُ وَتَصْفِيَةُ الشَّيْءِ مِمَّا يُنَافِيهِ أَوْ يُفْسِدُهُ)، (إخلاص) بریتیە لە تاککردنەوەو ساغکردنەوەی شتێک لەو شتانەی کە کەوتوونەتێی و لەگەڵیدا دژن، یاخود تێکی دەدەن.

١٠)- ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، ئەم: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ڕستەیەکی دەستپێکردنە (جُمْلَةٌ إِسْتِئْنَافِيةٌ) بۆ ستاییشکردن و مەدحکردنی خوا ﷻ، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووە، واتە: لەسەر زمانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ خوا فەرموویەتی، یاخود چاوگێکە هێندراوە لە جیاتی کردارەکەی، چونکە (ٱلۡحَمۡدُ) چاوگ (مَصْدَر)ەو، مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: (أي: إحْمَدُوا الله رَبَّ العَالَمِيْنَ) ستایشی خوای پەروەردگاری جیهانییان بکەن.

١١)- ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، {خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات:} بفەرموو: من لێم قەدەغە کراوە، ئەو شتانەی ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، بیانپەرستم و بەندایەتییان بۆ بکەم، (تَدۡعُونَ ) یانی: (تَسْأَلُونَ) داوایان لێدەکەن لە جگە لە خوا، یاخود یانی: (تَعْبُدُونَ) دەپەرستن، چونکە (دُعَاء) هەم بە مانای عیبادەت دێ، هەم بە مانای داواکردن دێ، واتە: ئەو شتانەی ئێوە لە جیاتی خوایان شتیان لێ داوا دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە، من لێم قەددغە کراوە، ئەوانە بپەرستم، یاخود ئەو شتانەی ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، من لێم قەدەغە کراوە بیانپەرستم.

١٢)- ﴿ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي ﴾، دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانم لە پەروەردگارمەوە بۆ هاتوون، پیتی (مِن) لە (مِن رَّبِّي)دا بۆ دەستپێکردنە ( ابْتِدَائِيَّةٌ) یانی: لە دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکان لە لایەن پەروەردگارمەوە بۆم هاتوون، ئەوەم لێ قەدەغە کراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە پێش هاتنی وەحیی و پەیامی خوا، مرۆڤەکان مولزەم نین بە ئەنجامدانی ئەو شتانەی لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازاندرێن، بەڵکو هەندێک لە زانایان دەڵێن: مرۆڤ مولزەم نیە بە هیچ شتێکەوە، لە ئەمرو نەهی و حەڕام و حەڵاڵ، بەڵام ڕەنگە ڕای ڕاستتر ئەوە بێ، کە مرۆڤ مولزەم نیە بە ئەنجامدانی ئەو کارانەوە، کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، نەک بە گشتیی مولزەم و ئەرکدار (مكلّف) نەبێ بە هیچ شتێکەوە، هەرچەندە عەقڵی ساغ و زگماکی پاکیش بیگەیەنن، بەڵام بێگومان سزاو پاداشتی قیامەت، پەیوەستن بە هاتنی وەحییەوە.

١٣)- ﴿ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، هەروەها فەرمانم پێکراوە ملکەچ بم بۆ پەروەرگاری جیهانییان، (الإِسْلَامُ: الإِنْقِيَادُ بِالْقَوْلِ وَالْعَمَلِ، وَفِعْلُهُ مُتَعَدٍّ، فَنُزِّلَ مَنْزِلَةَ اللَّازِمِ، فَأَصْلُهُ: أَسْلَمَ نَفْسَهُ أَوْ ذَاتَهُ أَوْ وَجْهَهُ لِلّٰهِ)، وشەی (إسلام) واتە: ملکەچیی بە قسەو بە کردەوە، ئنجا وشەی (أَسْلَمَ) کە کرداری ئیسلامەو ئیسلام بۆ خۆی چاوگە، لە ئەصڵدا بەرکارخواز (متعدّي)ە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرکارەکەی زۆر بەکارهێنراوە، بۆیە (أَسْلَمَ) وەک کردارێکی (لازم) مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، (أَسْلَمَ) واتە: ملکەچ بوو، یانی: خۆی تەسلیمی خوا کرد، یاخود زاتی خۆی تەسلیمی خوا کرد، یاخود ڕووی خۆی تەسلیمی خوا کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەکارهێنراوە، ئێستا زۆر کەس زەینی بەلای بەرکار (مفعول بە)ەکەیدا هەر ناچێ و، وەک کردارێکی (لازم) مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، وەک لە بارەی ئیبراهیم ﷺەوە لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾، واتە: کاتێک پەروەردگاری پێی فەرموو: ملکەچ بە، ئەویش گوتی: ملکەچ بووم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، بەڵام ئەسڵی واتایەکەی یانی: سپاردم بە خوای پەروەردگاری جیهانییان، واتە: ژیانی خۆی ملکەچکردو تەسلیمی شەریعەتی خوای پەروەردگاری کرد.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ناساندنی خوا لەمیانی دروستکرنی مرۆڤاندا، لە حەوت قۆناغی سەرەکییداو، لە میانی ژیاندن و مراندنداو، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە خوا هەرچی بوێ، یەکسەر دەیکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟ شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِی يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾، ئەو (خوا) ئەو زاتەیە، کە ئێوەی لە گڵ هێناوەتە دی، پێشتریش گوتمان: ئەمە دوو مانایان هەڵدەگرێ:**

**أ- یان مەبەست ئادەم و حەووان (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کە ڕاستەوخۆ لە خاکی زەوی دروستبوون.**

**ب- یاخود مەبەست ئەوەیە ئەو نوتفەیەی کە وەچەی ئادەم و حەووای لێ دروست دەبێ، نێرو مێیەکانی کە لە ئادەم و حەوواوە هاتوون و لێیان وەپاشکەوتوون، ئەو نوتفەیە لە خوێنەوە دێ، خوێنیش خواردنی هەرسکراوە، خواردنە هەرسکراوەکەش، ئەو خواردن و خواردنەوەیە کە لە زەوی پەیدادەبێ کەواتە: نوتفە و تۆوەکەش کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ، دەگەڕێتەوە بۆ زەوی، بەڵام بە چەند قۆناغێک.**

**٢)- ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾، دوایی لە تۆوێک، ئەگەر ئەوەی پێشێیان مەبەست پێی ئادەم بێ واتە: خوا ئادەمی ڕاستەوخۆ لە خاک دروستکردوە، دواییش وەچەکەی لە نوتفە، بەڵام ئەگەر ئەوەی پێشێشیان مەبەست پێی وەچەی ئادەم بێ، واتە: سەرەتایەکەتان**

لە خاکەو دوایی دەبن بە نوتفە، کە بریتیە: لەو زیندەوەرەی لە ئەنجامی پێکگەیشتنی زیندەوەری تۆو پیاو (حیمن) و، هێلکۆڵە (بویضة)ی ئافرەت، ئەو دوو زیندەوەرە یەک دەگرن، کە هەردووکیان ژیانیان تێدایە، یەکدەگرن و زیندەوەرێکی سێیەم پێک دێنن، کە پێی دەگوترێ: نوتفە.

٣)- ﴿ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ﴾، دوایی لە خوێنپارەیەک، واتە: دوایی ئەو تۆویلکە بچووکە، گەشە دەکات لە نێو منداڵدانی ئافرەتداو، دەبێتە خوێنپارەیەک و وەک زەروویەک خۆی بە دیواری منداڵدان هەڵدەواسێ.

٤)- ﴿ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ﴾، دوایی بە شێوەی منداڵ دەرتاندێنێ، لێرەدا خوا ﷻ قۆناغەکانی دیکەی باس نەکردوون، قۆناغی زارجوو (مُضغَة)و، دوایی بوون بە ئێسقان، دوایی ئێسقانەکان بە گۆشت دادەپۆشرێن، وەک لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا خوا ﷻ قۆناغەکانی وردتر باسکردوون و، لە سوورەتی (الحج)دا قۆناغەکانی وردتر باسکردوون، بەڵام لێرە یەکسەر دوای نوتفە، باسی (عَلَقَةٍ) دەکا، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ﴾، دوایی بە شێوەی منداڵ دەرتان دێنێ، وشەی (طفل) بۆ یەک و دووان و بۆ کۆ (جمع)و بۆ مێینەو نێرینەش، بەکاردێ، ﴿ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ﴾، دوایی ئێوە لە شێوەی منداڵدا دەردێنێ، لە سکی دایکتان، لە منداڵدانی دایکتان.

٥)- ﴿ ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ﴾، دوایی دەتانژیەنێ تاکو دەگەنە قۆناغی ئەوپەڕی تواناو هێزتان، (أَشُدّ) کۆی (شِدَّة)یە، یاخود هەر (أَشُدّ) بۆ خۆی واتە: قۆناغی تین و تاقەت، دەڵێ: (أَشُدّ جَمْعُ شِدَّة، أو اسْمٌ للحَالَةِ الَّتي يَبْلُغُ فِيهَا الإنْسَان أَوْجَ قُوَّتُه)، (أَشُدّ) کۆی (شِدَّة)یە، یاخود (أَشُدّ) کۆ نیە بۆ (شِدة)، بەڵکو ناوە بۆ ئەو حاڵەتەی مرۆڤ تێیدا دەگاتە لووتکەی تین و تاقەتی، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: لە نێوان هەژدە ساڵ تاکو سی (١٨ - ٣٠) ساڵە، بەڵام لەوانەیە بۆ کچان کەمتریش بێ و ڕەنگە لە دوازدە، سێزدە ساڵ، تاکو بیست و ئەوەندە ساڵە بێ، کچ زووتر پێدەگەن، دوایش زووتر لە ڕووی وەچە خستنەوەوە، لێ دەکەون.

٦)- ﴿ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا﴾، دوایی خوا تەمەندارتان دەكات، تاكو دەبنە بە ساڵداچوو، پیر دەبن، (شُيُوخ: جَمْعُ شَيْخ)، (شیوخ) كۆی (شیخ)ە، ئەویش زۆربەی زانایان دەڵێن: لە پەنجا (٥٠) ساڵیی تاكو هەشتا (٨٠) ساڵیی، بەڵكو تاكو سەدو زیاتریش دەخایەنێ.

٧)- ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾، هەشتانە پێش ئەوە، [پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی پیریەتیی، یان كامڵ بوون] دەمرێنرێ، واتە: پێش ئەو قۆناغانەی باسكراون، دەمرێ و گیانی دەكێشرێ.

٨)- ﴿وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بگەنە كاتێكی دیاریكراو، ناوبراو، ئەو كاتەی خوا ﷻ بۆی دیاریكردوون، تەمەن بكەن.

٩)- ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، [خوا ئەوەی بۆ ڕوونكردوونەوە]، تاكو بفامن، (أَيْ: مِنْ جُمْلَةِ مَا أَرَادَهُ اللهُ مِنْ خَلْقِ الإِنْسَانِ عَلَى الحَالَةِ المُبَيَّنَةِ، أَنْ تَكُونَ فِي تِلْكَ الخِلْقَةِ دَلَالَةٌ لِآحَادِهِ عَلَى وُجُودِ هَذَا الخَالِقِ)، بۆیە خوا ﷻ ئێوەی مرۆڤی بەو شێوەیە كە باسكرا، هێناوەتەدی بە چەند قۆناغێك، تاكو ئەو شێوەیە تاكەكانی مرۆڤان بیكەنە بەڵگە لەسەر ئەوە كە بەدیهێنەرێك ئەوانی بەدیهێناوە، لە كوێڕا بۆ كوێی هێناون؟ لە نوتفەیەكی نەبینراوەوە بۆ مرۆڤێكی تێرو تەواو! ئنجا ئەو كەسەی بەو قۆناغانەدا تێیپەڕاندوە، پەروەردگارێك و خاوەنێكە، قۆناغ بە قۆناغ سیستمی بۆ داناوە، دوایی دەفەرموێ:

١٠)- ﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾، ئەو (خوا) ئەو كەسەیە دەژیەنێ و دەمرێنێ، (يُحْيِي: يُوجِدُ المَخْلُوقَ حَيًّا)، (یحیي) لێرەدا بە مانای زیندووكردنەوە نیە، واتە: ئەو دروستكراوە بە زیندوویەتیی و بە ژیانەوە پەیدا دەكات، (وَيُمِيتُ) لێرەدا یانی: ژیانی لێ وەردەگرێتەوە، (يُعْدِمُ الحَيَاةَ عَنِ الَّذِي كَانَ حَيًّا)، ئەوەی ژیاندارو زیندوو بووە، ژیانی لێ وەردەگرێتەوەو دەیمرێنێ.

١١)- ﴿فَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا﴾، هەر كاتێك فەرمانێكیدا، بڕیارێكیدا، یان: كارێكی ویست.

١٢)- ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، تەنیا پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ، وشەی (فَيَكُونُ) بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە:

أ- ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ.

ب- (كُنْ فَيَكُونَ) پێی دەفەرموێ: ببە یەکسەر پەیدا دەبێ.

ئەم تەعبیرە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە: لە کۆتایی سووڕەتی (یس)دا هاتودو، لێرەدا هاتوەو، لە سووڕەتی (النحل)دا هاتوە، لە چەند شوێنێکدا هاتوە: ﴿كُن فَيَكُونُ﴾، ئنجا ئایا ئەم تەعبیرە چی دەگەیەنێ؟

(محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)[1]دا، دەڵێ: (**كُنْ تَمْثِيلٌ لِتَعَلُّقِ الْقُدْرَةِ بِالْمَقْدُورِ بِلَا تَأْخِيرٍ وَلَا عُدَّةٍ، وَلَا مُعَانَاةٍ، وَعِلَاجٍ، بِحَالِ من يريد إِذْنَ غَيْرِهِ بِعَمَلٍ، فَلَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يُوَجِّهَ إِلَيْهِ أَمْرًا، فَإِنَّ صُدُورَ الْقَوْلِ عَنِ الْقَائِلِ أَسْرَعُ أَعْمَالِ الْإِنْسَانِ وَأَيْسَرُ**).

ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی جوانە بۆ چەمک و واتای ئەو ڕستە موبارەکە: ﴿كُن فَيَكُونُ﴾.

واتە: وشەی (كُنْ) وێناکردنی پەیوەستنی دەستەڵاتی خوایە، بەو شتەوە کە دەویستڕێ بهێنرێتە دی، بێ دواکەوتن و، بێ ئەوەی پێویستیی بە کەل و پەل بێ و، بێ ئەوەی پێوەی ماندوو بێ و هیچ ئەرکی پێوە بکێشێ، ئەو حاڵەتە وێناکراوەو چوێنراوە بە حاڵی کەسێکەوە، کە تەنیا مۆڵەتی کەسێکی دەوێ بۆ ئەنجامدانی کارێک، ئەویش تەنیا ئەوەیە فەرمانی پێدەکات، چونکە دەرچوونی قسە لە بێژەر، لە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ خێراترو ئاسانتریشە.

بۆ وێنە: تۆ دەتەوێ کەسێ بنێری بۆ شوێنێک پێی دەڵێی: بڕۆ، لەبەر ئەوەی ئەوە بۆ ئێمە، کە ئێمە لێی حاڵیی دەبین، ئاسانترین کارە، بۆیە خوا

---

(١) ج٢٤، ص١٩٩.

ﷻ ویستوویەتی بۆ ئێمەی وێنا بکات، کە وەک چۆن ئێمە بە ئاسانترین شێوە، دەتوانین بە قسە فەرمانێک بکەین، پەروەردگاریش بە ئاسانترین شێوەو بە جۆرێک کە لە عەقڵ و خەیاڵی ئێمەدا، وەک پێویست ناحەجمێ و جێی نابێتەوە، هەر شتێکی بوێ، ئەنجامی دەدات.

**مەسەلەی چوارەم:**

**خستنەڕووی چەند دیمەنێکی سامناک لە چۆنیەتیی سزادرانی، مشتومڕکەرانی بە درۆ دانەری پەیام و کتێبەکانی خوا ﷻ، کە کۆت و زنجیر دەکرێن و بە نێو ئاوی کوڵاودا پەلکێش دەکرێن و گڕ[1] دەدرێن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُو مِن قَبْلُ شَيْئًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە لە دژی ئایەتەکانی خوا شەڕە قسەو مشتومڕ دەکەن! ( أَلَمْ تَرَ ) ئەمە پرسیارکردنە بۆ چەسپاندن (الإستفهام للتقرير) یانی: سەرنج بدە! ئەوانەی شەڕە قسەو دەمەقاڵێ دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا.

٢)- ﴿ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴾، چۆن لادەدرێن؟ یاخود: بەرەو کوێ لادەدرێن؟ کە بە دڵنیایی ئەمە بۆ سەرسوڕماندنە، واتە: سەرت لێیان سوڕبمێنێ کە لە دژی ئایەتەکانی خوا شەڕە قسە دەکەن، ئایەتەکانی خواش هێندە ڕۆشنن، هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێکی ساغ و سەلیم دەیانبینێ، کەچی ئەوانە نکۆڵییان لێدەکەن و شەڕە قسەیان لە دژ دەکەن!

---

(١) گڕدەدرێن: دادەگیرسێن، ئاگریان تێبەردەدرێ: دەسووتێنرێن.

ئایا کێن ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا؟

٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە کتێب، (أل)ی سەر (الكِتَاب) بۆ ناساندنە لێرەدا، مەبەست ناساندنی (عهد)ه، واتە: ئەوانەی بڕوا بە کتێبەکە ناکەن، کە مەبەست پێی قورئانە، یاخود (أل) بۆ ناساندنە و مەبەست پێی جینسە واتە: بڕوا بە هەرچی کتێبی خوایە نایکەن، کە من مانای دووەمیانم پێ ڕاستترە، چونکە لەگەڵ ڕستەی دواییدا چاکتر دەگونجێ، کە دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ﴾، هەروەها ئەوانەی بێبڕوان بەوەی پێغەمبەرانی خۆمانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) پێ ڕەوانە کردوون، کەواتە: ئەوانە بڕوایان بە هیچ کام لە پەیامەکانی خوا نیەو، بە هیچ کام لە کتێبەکانی خوا نیەو، بە هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نیە.

دەشگونجێ: ﴿ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ﴾، ڕوونکردنەوە بێ بۆ (الكِتَاب) بڕوایان بە کتێبەکان نیە، ئەوانەی پێغەمبەرانی خۆمانمان پێ ڕەوانە کردوون، دەشگونجێ باسی کتێبەکان، لە ئایەتی پێشێ دا ڕابردبێ، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ﴾، یانی: وەک چۆن بڕوایان بە هیچ کام لە کتێبەکانی خوا نیە، بڕواشیان بە ئەو پەیام و وەحییەش نیە، کە خوا جگە لە کتێبان بۆ پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوە، چونکە خوای بەرز، وەک چۆن کتێبی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوون، وەحیی و پەیامی دیکەشی بۆ ناردوون.

٥)- ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لە مەودواش دەزانن، بێگومان لێرەدا (يَعْلَمُون) بەرکارەکەی قرتێنراوە، لەمەودوا دەزانن، چی دەزانن؟ سزایەکەیان دەزانن، یاخود ئەوەی کە بە درۆیان داناوە، دەزانن چەند هەقە، (فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حَقَّانِيَّةَ مَا كَذَّبوا بِه)، لەمەودوا ڕاستیی ئەوەی بەدرۆیان داناوە، دەزانن.

یان: (فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ عَذَابَهُم)، لەمەودوا سزایەکەیان دەزانن، ئنجا دوایی ڕوونی دەکاتەوە، سزایەکەیان چۆنە؟.

٦)- ﴿ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ ﴾، لە كاتێكدا كە كۆتەكان دەخرێنە گەردنیانەوەو زنجیرەكانیش.

(سلاسِل) كۆی (سِلْسِلَة)یە، واتە: زنجیر، یانی: هەروەها زنجیرەكانیشیان لێ دەئاڵێنرێن، یاخود: بە زنجیرەكان ڕادەكێشرێن، یاخود: زنجیرەكان دەخرێنە دەست و پێیانەوەو پێیان كەلەپچە دەكرێن، وشەی (إذْ)یش بۆ ڕابردوویە، بەڵام لێرەدا بۆ داهاتوو بەكارهێنراوە، بە نیشانەی ئەوە كە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ ﴾، لە مەودوا دەزانن، ئەگەرنا (إذْ) لە ئەصڵدا بۆ ڕابردوویە ﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ ﴿٧﴾ ﴾النمل، واتە: یاد بكەوە كاتێك مووسا گوتی، یانی: لە ڕابردوودا، بەڵام لێرەدا بە بەڵگەی (سوف) كە لە پێشیەوە هاتوە: ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ ﴾، لەمەودوا دەزانن لە كاتێكدا كۆتەكان دەخرێنە گەردنیانەوە، هەروەها زنجیرەكان، دەزانین بۆ داهاتوویە.

٧)- ﴿ يُسْحَبُونَ فِى ٱلْحَمِيمِ ﴾، ڕادەكێشرێن بە نێو ئاوی داغ و كوڵیودا، (الحَمِيْم: أَشَدُّ الحَرِّ)، (حميم) هەر شتێكە ئەوپەڕی گەرم و داغ بێ، ئنجا ئاوی كوڵیوە، ئاگری داغە، پشكۆیە، پێیدا ڕادەكێشرێن.

٨)- ﴿ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾، دوایی لە نێو ئاگردا دادەگیرسێنرێن، گڕدەدرێن، (وَالسَّجْرُ: مَلْءُ التَّنُّورِ بِالْوَقُودِ لِتَقْوِيَةِ النَّارِ فِيهِ)، (السَّجْرُ): بریتیە لەوەی تەندوور پڕ بكرێ لە ئاگر بۆ ئەوەی ئاگرەكە چاكتر بەهێز بێ، ئەو ئاگرەی كە تێیدایە، پێشتریش باسمانكردوە: (أغْلَال) كۆی (غُلّ)ە، ئەویش یان بازنەیەكی ئاسنە، یاخود بازنەیەكی چەرمی مەحكەمە، دەوری گەردنی مرۆڤ دەدات.

٩)- ﴿ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، دوایی پێیان گوترا: كوا ئەوەی دەتانكردە هاوبەش لە جیاتی خوا؟ واتە: هاوبەشی پەرسترانیتان دەكردو، جگە لە خوا دەتانپەرستی، (ثُمَّ: لِلتَّرْتِيبِ الرُّتْبِيّ)، (ثم) بۆ ڕیزبەندیی پلەو پایەیە، واتە: دوای ئەو سزایە، ئنجا لێیان دەپرسرێ: كوا ئەوەی جگە لە خوا دەتانكردە هاوبەشی؟

١٠)- ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾، گوتیان: لێمان ون بوون، دیارنین، بێ سەرو شوێنن، (أَيْنَ) لە کوێن؟ بۆ پرسیارکردنە لە بارەی شتێک، کە شوێنەکەی نەزانراوبێ، ئەوان وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: لێمان ون بوون، (ضَلَّ) واتە: (ضَاعَ) زایە بوو، (فُقِد) فەوتا.

١١)- ﴿بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُواْ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا﴾، بەڵکو ئێمە پێشتر لە هیچ شتێک نەدەپاڕاینەوە، هیچ شتێکمان نەدەپەرست، ئەمە لێرەدا دوو واتای هەن:

أ- یان مەبەستیان ئەوەیە: ئێمە شتێکمان نەدەپەرست، سوودێکمان پێبگەیەنێ، یەکێک لە زانایان گوتوویەتی: (فَنَفْيُ دُعَاءِ شَيْءٍ هُنَا، رَاجِعٌ إِلَى نَفْيِ دُعَاءِ شَيْءٍ يُعْتَدُّ بِهِ)، کە دەڵێن: لە هیچ شتێک نەدەپاڕاینەوە واتە: لە شتێک نەدەپاڕاینەوە کە سوودی هەبێ، وەک لە زمانی عەرەبییدا هاتوە: (حَسِبْتُ أَنَّ فُلَانًا شَيْءٌ، فَإِذَا هُوَ لَيْسَ بِشَيْءٍ)، وامزانی فلانکەس شتە، کەچی شتێک نەبوو، هیچ دەرچوو، بەڵکو لە کوردەوارییدا تەعبیری دیکەش بەکاردێنن، کە ڕەنگە لەگەڵ تەفسیری قورئاندا گونجاو نەبێ، هەروەها پێغەمبەر ﷺ وەک دایکمان عائیشە دەڵێ: {سَأَلَ نَاسٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِشَيْءٍ} (أخرجه البخاري: ٥٧٦٢)، واتە: خەڵک پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی کاهینەکان، فاڵچییەکان، فەرمووی: ئەوان هیچ شتێک نین.

ب- یاخود هەر ئەوەیە ئەوانە کە دەڵێن: ﴿بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُواْ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا﴾، نکووڵیی دەکەن لەوەی شتێکیان پەرستبێ و دەڵێن: هیچمان نەپەرستوەو، درۆ دەکەن.

١٢)- ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، هەر بەو شێوەیە خوا بێبڕوایان گومڕا دەکات، واتە: بەو شێوەیە کە دەبێ هەر وێنە بە خۆی بهێنرێتەوەو، هەر بە خۆی بچوێنرێ، ئاوا خوا بێبڕوایان گومڕاو سەرگەردان دەکات، وەک پێشتریش گوتمان: ﴿كَذَٰلِكَ﴾، بەو شێوەیە، واتە: ئەگەر بویسترێ گومڕاکردنی خوا بۆ کافران، بچوێنرێ بە شتێک، هیچ شتێک لە خودی خۆی باشتر نیە وێچوێنراو (مُشَبَّه به)ی بێ.

١٣)- ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾، ئەوەتان بە هۆی ئەوەوەیە کە ئێوە لە زەویدا بە ناهەق، شادمانیی و زۆر خۆشحاڵییتان دەردەبڕی، (مَا) لە (بما كنتم)دا

بۆ چاوگە، واتە: (ذَلِكُمْ بِفَرِحِكُمْ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الحَقِّ)، ئا ئەوەتان بە هۆی زۆر خۆشحاڵییتانەوە بوو لە زەویدا، بە ناهەق، هەروەها کە دەفەرموێ:

١٤)- ﴿ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴾، هەروەها بەهۆی ئەوەوە کە فیزو کەشخەییتان دەکرد.

واتــە: (بِمَرَحِكُمْ) (مـا) لـە هـەردوو ڕستەکەدا بـۆ چاوگـە، واتـە: ئـەوە بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە ئێـوە بـە ناهـەق لـە زەویـدا زۆر دڵخـۆش دەبـوون و، بـە ناهـەق لـە زەویـدا زۆر فیـزو کەشـخەتان دەکـرد، چونکـە (الفَـرَحُ: أَشَـدُّ الـسُّرُورِ وَرِضَى الإِنْسَـانِ عَلَى أَحْوَالِـهِ)، (فـرح): بریتیـە لـە ئەوپـەڕی دڵخۆشـیی و ڕازیبـوونی ئینسـان لـە حاڵ و وەزعـی خـۆی، (وَالمَـرَحُ: مَـا يَظْهَـرُ عَـلَى الإِنْسَـانِ الفَـارِحِ مِـنَ الحَـرَكَاتِ فِي مَشْـيِهِ، وَنَظَـرِهِ وَمُعَامَلَتِـهِ مَـعَ النَّـاسِ، وَكَلَامِـهِ، وَتَكَـبُّرِهِ فَهُـوَ هَيْئَـةٌ ظَاهِرِيَّـةٌ).

(مَـرَحُ): بریتیــە لــەوەی لەســەر مــرۆڤ دەردەکــەوێ، لــە جموجــۆڵ و ئــەو حاڵەتانـەی دەبینرێـن، لـە شـێوەی ڕۆیشـتن و ڕوانینـی و هەڵـس و کـەوتی لەگـەڵ خەڵـک داو شـێوەی قسـەکردنی، چونکـە هەندێـک لـە توێـژەرەوان گوتوویانـە: (فَرَح) واتــە: دڵخۆشــیی، (مَـرَح) واتــە: ئەوپــەڕی دڵخۆشــیی، بــەڵام لــە ڕاســتییدا وانیــە، (فَرَح) هــەر خــۆی واتــە: ئەوپـەڕی دڵخۆشـیی و شـادمان بـوون و، لـە قورئانـدا زەم و سەرزەنشـتکراوە، کـە مـرۆڤ بێجگـە لـە بەخشـش و بەزەیـی خـوا، بـە هیـچ شـتی دیکـە ئەوپـەڕی دڵخۆشـیی هەبـێ، بـەڵام (مَـرَح): بریتیـە لـەو حاڵەتـەی لەسـەر مـرۆڤ دەدردەکـەوێ، لـە ئەنجامـی زۆر دڵخـۆش بوونـی بـە دنیـادا.

١٥)- ﴿ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بچنە نێو دەروازەو دەرگاکانی دۆزەخەوە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، لە دۆزەخدا.

١٦)- ﴿ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، خراپترین شوێنی تێدا مانەوەی خۆ بەزلگران (دۆزەخە).

(أيْ: فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ جَهَنَّمُ)، خراپترین جێگای تێدامانەوەی خۆ بەزلکران، بریتیە لە دۆزەخ، خوا پەنامان بدات، چونکە وشەی (مَثْوَى) (أي مَكَانُ الثَّوَاءِ) شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون، شوێنی تێدامانەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ خۆیان لە هەموو ئەو سیفەتانە دوور دەگرن، کە سەرەنجامیان بە دۆزەخ و تووڕەیی و گلەیی خو دەگەیەنن و، بەو سیفەتانە ڕازاوەمان بکات، کە مایەی ڕازیبوونی خوان و، سەرەنجامیشمان بە بەهەشتی ڕازاوە لە لای خوا دەگەیەنن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان نـۆ (٩) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (غافـر)، ئایەتـەکانی: (٧٧ - ٨٥) دەگرێتـە خـۆی، خـوا ﷻ کۆمەڵێـک ڕاسـتیی جـۆراو جۆریـان تێـدا دەخاتـەڕوو:

١)- فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ بە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی.

٢)- باسی نێردرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَامُ) چ بەسەرهاتەکانیان گێڕرابنەوە، چ نەگێڕرابنەوە، واتە: مەرج نیە تەنیا خوا ئەو پێغەمبەرانەی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَامُ) نارد بن، کە باسی کردوون لە قورئانداو بەسەرهاتەکانیانی بە کورتیی، یان بە درێژیی باسکردوون.

٣)- باسی ئەوە کە موعجیزەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَامُ) بە مۆڵەتی خوان و هیچ پێغەمبەرێک (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَامُ) بەڵگەو موعجیزەیەک کە هێناویەتی، بۆ خۆی دیاریی نەکردوە.

٤)- باسی نیعمەتی ئاژەڵەکان، کە خوا بۆ مرۆڤی ڕەخساندوون، هەم بۆ دابینکردنی خواردن و خۆراک و پێداویستییەکانی دیکەیان و، هەم کە بۆ بارو سوارو گواستنەوە بەکاریان دێنن.

٥)- سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤان بۆ مێژووی گەلانی بە درۆدانەری پەیامەکانی خوا، کە تووشی ئازارو مەینەتیی بوون هەر لە دنیادا، دیارە سزای دواڕۆژیش چاوەڕێیان دەکات.

٦)- باسی بوغڕابوونی بێبڕوایان بە تۆزە زانیارییەک کە هەیانبووەو، بۆتە هۆی ئەوەی گوێ نەگرن بۆ پەیام و بانگەوازی پێغەمبەران و، سەرەنجام تووشی سزاو مەینەتیی دنیا بوون و، تووشی جەزرەبەی دواڕۆژیش دەبن.

٧)- پەشێمان بوونەوەی بێبڕوایانی بەدرۆ دانەری پەیامەکانی خوا لە کاتی هاتنی بەڵای خوادا، بەڵام بێ سوود بوونی پەشێمانیی و بێ سوود بوونی بڕواهێنانیان، لە کاتێکدا کە کاتی بڕواهێنان نەبووە.

﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا
يُرۡجَعُونَ ﴿٧٧﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّن
لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُ
ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلۡحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمَ
لِتَرۡكَبُواْ مِنۡهَا وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبۡلُغُواْ عَلَيۡهَا
حَاجَةٗ فِي صُدُورِكُمۡ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ
فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ وَأَشَدَّ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَآ أَغۡنَىٰ
عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم
مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ
وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ
سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{دەجا (ئەی موحەممەد! ﷺ) خۆت ڕابگرە، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاست و چەسپاوە، ئنجا ئەگەر هەندێک لەوەی بەڵێنیان پێدەدەین، پێشانت بدەین (لە سزاو جەزرەبە)، یان (بەرلەوە) بتمرێنین، تەنیا بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە ﴿٧٧﴾ بە دڵنیایی لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ناردوون، هەیانە لە (بەسەرهاتی) وی بۆمان گێڕاویەوەو، هەشیانە بۆمان نەگێڕاویەوەو، هیچ پێغەمبەرێکیش بە مۆڵەتی خوا نەبێ، بۆی نەبووە هیچ نیشانە (موعجیزە)یەک بهێنێ و، هەر کات فەرمانی خواش هات، بە هەق و دادگەرانە دادوەریی دەکرێ و، ڕێی ناهەق گرانیش لەو

کاتـەدا زیانبارده‌بـن ﴿٧٨﴾ خـوا ئـەو کەسـەیە کـە ئاژەڵـەکانی بـۆ ڕەخسـاندوون، تاکـو سـواری هەندێکیـان بـن و، لە (گۆشـت و بەرهەم)ی هەندێکیان بخـۆن ﴿٧٩﴾ هەروەها سـوودگەلی زۆرتـان تێیانـدا هـەن و (خـوا ئاژەڵـی بـۆ ڕەخسـاندوون) تاکـو بـە هـۆی بەکارهێنانیانـەوە (بـۆ بارو سـوار) بگەنـە ئامانجێـک کـە لـە سینەکانتاندایەو، لەسـەر پشـتی ئەونیـش و کەشـتییەکانیش هەڵدەگیرێـن ﴿٨٠﴾ خـواش نیشـانەکانیتان پیشـان دەدات، ئنجـا ئایـا نکوولّیـی لـە کام لـە نیشـانەکانی خـوا دەکـەن؟ ﴿٨١﴾ ئایـا (ئەوانـە) بـە زەویـدا نەڕۆیشـتوون، ئنجـا سـەرنج بـدەن: سـەرەنجامی ئەوانـەی پێـش وان چـۆن بـوو؟ ئـەوان لەوانـە(ی ڕۆژگاری تـۆ) زیاتـر بـوون و، هێـزو شوێنەوارەکانیشـیان لـە زەویـدا سـەختترو بەرچاوتـر بـوون، بـەڵام (کاتێـک سـزای خوایـان بـۆ هـات) ئـەوەی وەدەسـتیان هێنابـوو، هیـچ سـوودی پـێ نەگەیانـدن (و لـە بـەڵای خـوا دەربـازی نەکـردن) ﴿٨٢﴾ ئنجـا کاتێـک پێغەمبەرەکانیـان بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ هێنـان، بـەو ئەنـدازە (کەمـە) زانیارییـەی لەلایـان بـوو، زۆر دڵخـۆش (و بوغرا)بوون و، (سـەرەنجام سـزای) ئـەوەی کـە گاڵتەیـان پێدەکـرد، گەمـارۆی دان ﴿٨٣﴾ ئنجـا کاتێـک سـزاو بـەڵای سـەختی ئێمەیـان دی، گوتیـان: بـە تەنیـا بڕوامـان بـە خـوا هێنـاو، بێبڕوایـن بـەوەی پێشـتر بـە هۆیـەوە هاوبەشـدانەر بوویـن (بـۆ خـوا) ﴿٨٤﴾ بـەڵام بەپێـی یاسـای خـوا کـە لـە (ژیـان و گـوزەرانی) بەندەکانیـدا تێپەڕیـوە، بڕوایەکەیـان دوای ئـەوەی سـزای (سـەختی) ئێمەیـان بینـی، نەگونجـا هیـچ سـوودیان پێبگەیەنـێ و، لـەو کاتـەدا بێبڕوایـان زیانبـارو دەسـخەڕۆ بـوون ﴿٨٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ): واتە: بەسەرماندا خوێندوویەوە، بۆمان گێراویەوە، (القَصَصُ: تَتَبُّعُ الأَثَرِ، وَالقَصَصُ: الأَثَر، وَالأَخْبَارُ المُتَتَبَّعَة)، (قَصّ): بریتیە لە شوێن شوێنەوارکەوتن، (قَصَص) بە شوێنەوار دەگوترێ، هەروەها (قَصَص) بەو هەواڵانە دەگوترێ، کە سۆراغ دەکرێن.

(ٱلۡمُبۡطِلُونَ): (المُبْطِلُون: أَي الَّذِيْنَ يُبْطِلُونَ الحَقَّ) ئەوانەی دەیانەوێ هەق پووچەڵ بکەنەوە، یاخود هەق بپووچێننەوە، لابەرن، (البَاطِلُ: مَا لَا ثُبَاتَ لَهُ، وَلَا حَقِيقَةَ لَهُ عِنْدَ الفَحْص)، (بَاطِل) شتێکە کە چەسپاو نیە، نێوەڕۆکێکی نیە، دوای ئەوەی دەیپشکنی، هیچی لەبارانەدا نیە، (مُبْطِل)یش کەسێکە هەڵگری ناهەق (بَاطِل)ە.

(فَرِحُواْ): (الفَرَحُ: اِنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَة، وَالفَرَحُ: أَشَدُّ السُّرُور)، (فَرَح): بریتیە لە سینە گوشادبوون بە هۆی چێژێکی بە پەلەی دنیاوە، چێژێکی دنیایی ماددیی، هەروەها وشەی (فَرَح) بە ئەوپەڕی دڵخۆشیی دەگوترێ.

(وَحَاقَ بِهِم): دەوری دان، یاخود: دابەزیە سەریان.

(بَأۡسَنَا): (البُؤْسُ وَالبَأْسَاءُ وَالبَأْسُ: الشِّدَّةُ وَالمَكْرُوه)، (بُؤس، وَبَأْسَاء، وَبَأْس): هەرسێکیان بە مانای سەختیی و شتی ناخۆش و نەویستراو دێن.

(سُنَّتَ ٱللَّهِ): یاسای خوا، یان: ڕێبازی خوا لە شێوەی مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا.

(خَلَتۡ): (أَيْ: مَضَتْ)، واتە: تێپەڕی، دەگوترێ: (خَلَى الزَّمَانُ، أَي: قَضَى وَذَهَب) کاتەکە تێپەڕی و ڕۆیی، بەسەرچوو.

(هُنَالِكَ ): (أي في ذَلِكَ الوَقْتُ)، (هُنَالِك): لە ئەصڵدا بە مانای ئەو شوێنەیە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ کات، لەو کاتەدا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەی (غافر)دا، وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەشدا باسمانکرد، چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگ دەخاتەڕوو:

سەرەتا ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، ئەمە جاری دووەمە لەم سوورەتەدا دووبارە دەبێتەوە، کە خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، خۆڕاگربێ، (الصَّبْرُ: هُوَ حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا تَكْرَه)، (صبر) بریتییە لە ڕاگرتنی نەفس، لەسەر شتێک کە پێی ناخۆشە، ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، خۆت ڕابگرە، لە بەرانبەر قسەو قاڵی ئەواندا، لە بەرانبەر پڕوپاگەندەیانداو، لە بەرانبەر ئازارو ناڕەحەتییەکانیاندا پاشەکشە مەکە، دەست بەو هەقەی خۆتەوە بگرە کە خوا بۆی ناردوی، ﴿ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، چەسپاوە، ئەو بەڵێنەی خوا داویەتی کە تۆ سەردەخات، بڕواداران سەردەخات لە دنیاو لە دواڕۆژدا، وەک فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ٥١ ﴾غافر، بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە، لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژەدا کە شایەدەکانیش ڕاست دەبنەوە (بۆ شایەدیی دان) سەریان دەخەین، ئەو بەڵێنەی خوا ڕاستە.

هەروەها بەڵێنی خوا کە ڕۆژی دوایی دێ، سزاو پاداشت بەسەر خراپەکاران و چاکەکاراندا دەچەسپێ، ڕاستە، هەروەها بەڵێنی خوا، کە بە درۆدانەرانی پەیامەکانی خوا، سزا دەدات لە دنیادا سزایان دەدات و ڕیسوا دەبن، ئەگەر

گریمان سزای ماددیی بەرجەستەشیان بە ملدا نەیەت، سەرەنجام هەر ڕەنجەڕۆ و دەسخەڕۆ دەبن، لە دواڕۆژیشدا سزای سەخت چاوەڕێیان دەکات، ئەو بەڵێنانە هەموویان ڕاستن، ﴿ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر هەندێک لەوەی بەڵێنی بەواندا پێدەدەین (هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین)، هەندێکیت پێشان بدەین، ﴿ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾، یاخود بتمرێنین، (پێش ئەوەی سزای ئێمە بۆ ئەوان ببینی)، واتە: پێش ئەوەی بەشێک لە سزادانی ئێمە بۆ ئەوان ببینی، کە لە دنیادایە، ﴿ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾، لە هەردوو حاڵاندا: ئەوانە بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە، کەواتە: تۆ خۆڕاگربەو دەربەست مەبە، چونکە سەرەنجام دێنەوە بۆ لای ئێمە، چ بەشێک لەو سزایەی کە بۆ وانمان داناوە، لە دنیادا ببینی، چ سزایەکە نەبینی، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ دواتر سزای خوای بینی بۆ کافرەکانی مەککە، بۆ زلە زلە ملهوڕەکان، کە لە جەنگی بەدردا حەفتا یان لێ کوژراو حەفتایان لێ بە دیل گیراو لووتیان شکا، بەڵایەکیان بەسەرهات زۆر بەڵایەکی بێڕەزاو گەورە، وەک خوا ﷻ ناوی لە جەنگی بەدر ناوە: (**يوم الفرقان**) ڕۆژی لێک جیاکردنەوەی هەق و ناهەق.

ئنجا دوای ئەو دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ، بە جۆرێکی دیکەش دڵی دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوان کردوون، تۆ تاکە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوا نی، کە دوژمن و ناحەزەکانی خوا بە درۆت دادەنێن، تووشی ئازارو ناڕەحەتییت دەکەن، لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانی دیکەمان ڕەوان کردوون، ﴿ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴾، هەیانە بەسەرهاتەکەیمان بۆ گێڕاویەوەو هەشیانە بەسەرهاتەکەیمان بۆ نەگێڕاویەوە، ئەوەی خوا ﷻ بە پێویستی زانیبێ و حیکمەتی خوای کارزان خواستبێتی، بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بڕوادارانی شوێنکەوتووی تاکو ڕۆژی دوایی، گێڕاوەتەوە، چ بە درێژیی بەسەرهاتەکەی گێڕابێتەوە، وەک بەسەرهاتەکانی: ئادەم و نووح و هوودو صاڵح

و شـوعەیب و ئیبراهیـم و لـووط و یوسـوف و مووسـاو داوودو سـولەیمان و عیسـا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، چ بـە کورتیـی بەسـەرهاتەکەیانی گێڕابێتـەوە، وەک: یونـوس و ئیسـحاق و ئەیـووب و یەعقـووب و زەکەریـاو یەحیـا، چ ئامـاژەی بـە ناوەکانیـان کردبـێ، وەک: ئیدریـس و ئیسـماعیل و ئەلیەسـع و ذی الکیفـل، کـە خوا تەنیـا بەوەندە ئیکتیفـای کـردوە، نـاوی هێنـاون و بـە چەنـد سـیفەتێکی کـەم پێناسـەی کـردوون.

﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، هیــچ پێغەمبەرێــک بــۆی نەبــووە نیشــانەیەک بێنــێ، مەگــەر بــە مۆڵــەتی خــوا، واتــە: موعجیــزەکانی کــە بـە پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) دراون، وەک نیشـانەی ڕاسـتیی ئـەوان، هەمـووی بـە مۆڵـەتی خـوا بـووە، ئەمـە وەڵامـی ئـەو قسـەیانە، کـە کافـرەکان هەمیشـە پێغەمبـەری خاتەمیـان ﷺ هەڵدەپێچـاو تەنگەتاویـان دەکـرد دەیانگـوت: ﴿ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾الأنبيـاء، واتـە: بـا نیشـانەیەکمان بـۆ بێنـێ، وەک چـۆن پێغەمبـەرانی پێشـێ (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) ڕەوانکـراون، واتـە: ئـەو جـۆرە موعجیـزەو بەڵگانـەی پێغەمبـەرانی پێشـوو پێیـان بـوون، بـا ئەویـش ئەوەمـان بـۆ بێنـێ، بـەڵام کافـرەکانی پێشـێ وەنەبـێ زۆر بڕوایـان بـە موعجیـزەی پێغەمبـەرانی پێشـوو کردبـێ، تاکـو خـوای مـەزن ئـەو ئەزموونـە بـۆ پێغەمبـەری خاتەمیـش ﷺ و بـۆ ئـەو خەڵکـەش کـە بـۆ لایـان ڕەوانکـراوە، دووبـارەی بکاتـەوە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ ﴾الإسراء، واتـە: ئێمـە پێشـتر حوشـترێکماندا بـە صاڵح وەک نیشـانەیەکی پێبینـەر، بـەڵام ئـەوان بـە درۆیـان دانـا، ئنجـا خـوا ﷻ موعجیـزەو بەڵگـەکان کـە دەیانـدا بـە پێغەمبـەران بـۆ سـەلماندنی ڕاسـتیەتیی خۆیـان، زانیاریـی و کارزانیـی بـێ سـنووری خـوا دیاریـی دەکات، دەبـێ چ موعجیـزەو بەڵگەیـەک بێت؟ بـۆ هـەر کام لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) بەپێـی پێویسـتیی خەڵکـی سـەردەمی ئـەو پێغەمبـەرەی موعجیزەکـەی پێـدراوە، بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممەدیـش ﷺ کـە خـوا ﷻ پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ بـۆ تێکـڕای بەشـەری بـە درێژایـی زەمـان

و بە پانایی زەمین ناردوە، موعجیزەیەکی بۆ ناردوە کە لە خودی خۆیدا بەرنامەکەشیەتی، ئنجا ئەگەر موعجیزەیەکی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بووایە، لەگەڵ کۆچی دوایی خۆی دا، موعجیزەو نیشانەکەشی کۆتایی پێدەهات، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ هەموو بەشەر، هەتا مرۆڤێک لەسەر زەوی مابێ، دەبێ موعجیزەو بەڵگەکەشی بمێنێتەوە کە هەر خودی بەرنامەکەشیەتی، کە قورئانە، هەر بۆیە لە سوورەتی (العنکبوت) دا، خوا ﷻ لە وەڵامی کافرەکاندا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: دەیانگوت: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەی دابەزنە سەری (خوا دەفەرموێ:) بڵێ: نیشانەکان تەنیا لە لای خواوەن، من تەنیا هۆشیارکەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە، کە ئێمە کتێبێکمان دابەزاندۆتە سەر تۆ بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، لەوەدا بەزەیی و بیرخەرەوە هەیە بۆ کۆمەڵێک بڕوابێنن.

یانی: ئەگەر بڕوابێنن، ئەوە قورئان بەسە، ئەگەر بڕواش نەهێنن شتی دیکەش هەبێ هەر بڕواناهێنن.

﴿ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا کاتێک فەرمانی خوا هات (فەرمانی خوا هات بە تێکدانی ژیانی دنیا، بە ئاخیر زەمان، یاخود فەرمانی خوا هات، دوای دنیا تێکچوون، بە زیندووکرانەوەی مرۆڤەکان)، ﴿ قُضِىَ بِٱلْحَقِّ ﴾، لەو کاتەدا بە هەق دادوەریی لە نێوان خەڵک دا دەکرێ، ﴿ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾، لەو کاتەش دا ئەوانەی هەڵگری بیرۆکە پووچەکان بوون، شوێنکەوتووی بەرنامە پووچەکان بوون، زیانبار بوون.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُواْ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾، جارێکی دیکە خوا ﷻ هەندێک لە نیعمەت و چاکەکانی خۆی دەخاتە بەرچاوی مرۆڤەکان،

دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کە ئاژەڵەکانی بۆ گێڕاون و وایلێکردوون کە بتوانن سواریان بن و بچنە سەر پشتیان، هەندێکیشیان لێیان بخۆن، واتە: هەندێکیان بۆ بارو سوار بەکاربێنن و، هەندێکیشیان بۆ لێ خواردن، ئنجا ئەوانەی بۆ بارو سوار بەکاردەهێندرێن، ئەگەر ئاژەڵ (أنعام) چەمکەکەی فراوان تەماشا بکەین، ئەو کاتە وڵاخە بەرزەو، کەرو، ئێسترو فیل و... هەموویان دەگرێتەوە، ئەگەر تەنیا ئەو چوار جۆرە ئاژەڵەش مەبەست بێ، کە لە سوورەتی (الأنعام)دا، خوا ﷻ ناوی هێناون کە: حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزن، ئەوە بە تەئکید حوشتر بە پلەی یەکەم و ڕەشە وڵاخیش: گاو مانگاو گامێش و کەڵ بە پلەیەکی کەمتر، بۆ بارو سواریش بەکاردێن، بەڵام دیارە ئاژەڵی ورد: مەڕو بزن، تەنیا بۆ گۆشتەکەیان بەکاردێن، هەڵبەتە حوشترو ڕەشە وڵاخیش بۆ گۆشتەکەشیان بەکاردێن، بەڵام وێڕای ئەوە، بۆ بارو سواریش بەکاردێن، ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ ﴾، هەروەها بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا، زۆر سوودو کەڵکی دیکەش هەن، ﴿ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی لەسەر پشتی ئەو وڵاخانە بگەنە هەندێک کارو پێویستیی و، هەندێک ئامانج کە لە سینەتاندا هەن و ناتوانن بیانگەنێ، ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾، هەروەها لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵانەو، لەسەر پشتی کەشتیانیش خۆتان و کەلوپەلتان هەڵدەگیرێن، ﴿ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، ئەو (خوا)یش نیشانەکانی خۆی پیشانی ئێوە دەدا، ﴿ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵیی لە کام لە نیشانەکانی خوا دەکەن؟!

ئەوانە هەموویان نیشانەکانی خوان: خۆتان، ئاسمان و زەوی، ئەو هەموو نیعمەتانەی دیکەی خوا پێیداون: شەوگار، ڕۆژگار، جۆرەکانی ئاژەڵ، جۆرەکانی ڕووەک، دانەوێڵە بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئەوانە هەموویان نیشانەکانی خواو نیعمەتەکانی خوان، ئایا نکووڵیی لە کام لە نیشانەو لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا دەکەن؟ واتە: هیچ کام لە نیشانەکانی خوا هی ئەوە نین، ئێوە نکووڵییان لێ بکەن و پێیان بێبڕوابن.

ئنجا خوا ﷻ جارێكی دیكە سەرنجیان بۆ مێژوو ڕادەكێشێ و دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ بە زەویدا ڕۆیشتن، وەک جاری دیكەش باسمانكردوە دەگونجێ ڕۆینی (سیر)ی فیكریی بێ، دەشگونجێ ڕۆینی (سیر)ی جەستەیی بێ، ڕۆیشتنی جەستەیی ئەوەیە كە مرۆڤ بە كردەوە بڕوات، ئنجا بە وڵاخە، بە ترومبێلە، بە فڕۆكەیە، بە پێیانە، بە هەر شێوەک لە شێوەكان بە كردەوە بڕوات و شوێنەوارەكان ببینێ و بە زەویدا بگەڕێ، ڕۆیشتنی مەعنەویی و فیكرییش ئەوەیە كە ئینسان لەبەر خۆیەوە ڕابمێنێ، یاخود كتێب بخوێنێتەوەو تەماشای سەرچاوە مێژوویییەكان بكات و، سەرنجی بەسەرهات و چارەنووسی گەلانی پێشوو بدات، ﴿ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئنجا سەرنج بدەن: سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟ ﴿ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ ﴾، ئەوان زیاتر بوون لەوان، واتە: گەلە پێشووەكان لەوانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ ژمارەیان زیاتر بوو، ﴿ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ ﴾، هەروەها هێزیشیان سەختتربوو و، شوێنەوارەكانیشیان بەرچاوتر بوون، ئەوەتا شوێنەوارەكانیان دەبینی وەک لە ئایەتەكانی پێشووتردا باسمانكرد: شوێنەواری فیرعەونەكان، هەڕەمەكان لە میسر، شوێنەوارەكانی گەلی عاد، گەلی سەموود، گەلی لووط، ئەوە شوێنەوارەكانی دیكەی گەلانی دیكە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە میزۆپۆتامیا، لە شام، لە شوێنەكانی دیكە، شوێنەواری وایان بەجێهێشتوون كە مرۆڤ لە بەرانبەریان دا سەراسیمە دەبێ، وەک پێشتر باسمانكرد لە بەعلەبەک چەند بەردێک لەسەریەک دانراون، هەر كامێكیان قورساییەكەی دوو سەد تەنە، دوو سەد هەزار كیلۆ!! ئێستا مرۆڤ هیچ ئامرازێكی وای نیە، كێشێكی دوو سەد تەنی پێ بەرز بكاتەوە، دەبێ ئەوانە چۆنیان ئەو بەردانە خستبنە سەریەک؟! ﴿ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، كەچی ئەو گەلە پێشووانە هەرچەندە ژمارەشیان زیاتر بوو، هێزو شوێنەواریشیان بەهێزترو سەختتر بوون، بەڵام ئەوەی كە وەدەستیان هێنابوو، هیچ سوودی پێنەگەیاندن لە كاتێكدا بەڵای

خـوا هـات، واتـە: دەربـازی نەکـردن و قوتـاری نەکـردن لـە بـەڵاو سـزای خـوا، ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، ئنجـا کاتێـک پێغەمبەرەکانیـان بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ هێنـان، ﴿ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، زۆر دڵخـۆش و بوغرابـوون بـەوەی کەلـە لایـان بـوو لـە زانیاریـی، واتـە: ئـەو تـۆزە زانیارییـەی لـە لایـەن بـوو، کردیانـە بەدیـل و جێگـرەوە بـۆ وەحیـی و پەیامـی خـوا ﷻ، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، سـەرەنجام ئـەوەی گاڵتەیـان پێدەکـرد، گاڵتـەپێکراوەکە، یاخـود سـزای گاڵتەپێکراوەکـە، گەمـارۆی دان و دەوری دان.

هەندێـک لـە توێـژەرەوانی قورئـان گوتوویانـە: لێـرەدا مەبەسـت پێـی هەندێـک لـە فەیلەسـووفەکانە کـە پێغەمبـەران بـە بەڵگـەوە هاتـوون بـۆ لای گریـک و یۆنانـەکان، ئەوانیـش بـە حیسـاب خۆیـان بـە حەکیـم و فەیلەسـووف زانیـوەو گوتوویانـە: ئـەوەی لـە لای ئێمەیـە، لـە فەلسـەفە و زانیاریـی، باشـترەو ئێمـە هـەر بـەدوای زانیاریـی خۆمان دەکەویـن و، خۆیـان بێنیـاز پێشـانداوە بەرانبـەر بـەو زانیاریـی و هیدایەتـەی خـوا بـە پێغەمبەرانـدا ناردوویـەتی، کـە هەمـوو فەلسـەفەی یۆنـان و غەیـری یۆنان کـۆ بکەیەوە، لـە چـاو ئـەو هیدایـەت و پەیامـەی خـوا ناردوویـەتی، لوێچێکـە لـە تەغارێـک و مسـتێکە لـە جەواڵێـک، پاشـان فەلسـەفەو حیکمـەتی مرۆڤـەکان بـە دوور لـە هیدایـەتی خـوا، پـڕە لـە هەڵـەو پەڵـە، پـڕە لـە خڵتـە، وەک لـە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیـمان و پووچەڵیـی ئیلحـاد لەبـەر ڕۆشـنایی زگـماک و عەقـڵ و زانسـت و وەحییدا)، بـە تەفصیل باسـمکردوە، هەروەهـا لـە مەوسـووعەی: (بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان وەحیـی و واقیعـدا) لـە کتێبـی سـێیەم و پێنجەمـدا، کـە بـاسی فەلسـەفەو فەیلەسـووفەکانم کـردوە، خسـتوومەتە ڕوو کـە: کەلەپـووری فەلسـەفە لـە مێـژووی بەشـەردا، بـە بـەراورد لەگـەڵ هیدایـەتی خـوادا، پەیامێـک کـە خـوا بـە پێغەمبەرانـدا ناردوویەتی، شـتێکی زۆر بچـووک و نابووتـە، هەڵـەو پەڵـەی زۆریـشی تێدایـە.

﴿ فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ ﴾، ئنجـا کاتێـک بـەڵاو سـزای ئێمەیـان بینـی (بُؤْسٌ وَبَأْسَاءُ وَبَأْسٌ) هـەر سـێکیان بـە مانـای: سـزاو بـەڵاو شـتێکی

ناخۆشویستراو و سەخت دێن، کاتێک سزای سەختی ئێمەیان بینی، گوتیان: بڕوامان تەنیا بە خوا هێنا، ﴿وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ﴾، بەوە بێبڕواین کە پێشتر پێی بوو بووینە هاوبەشدانەر، واتە: ئێستا بێبڕواین بەوەی پێشتر بەهۆیەوە بوو بووینە هاوبەش بۆ خوادانەر، ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا﴾، بەڵام ئیمانەکەیان دوای ئەوەی سزای ئێمەیان بینی، سوودی پێنەگەیاندن، چونکە ئیمان کاتێک سوودی دەبێت، ئازایەتیی مرۆڤی تێدابێ، بەڵام وەختێک بەڵاو سزای خوا بێ، یان لە کاتێکدا مرۆڤ دەگاتە گیانەڵا، یان کاتێ ئاخیر زەمان دێ، کە بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەرمان یەکێک لە دە (١٠) نیشانە گەورەکان، ئەوەیە کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ و، ئەو کاتە کە خەڵک ئەوە دەبینێ، هەموویان بڕوا دێنن، بەڵام ئەو کاتە ئیمان بێ سوود دەبێت، چونکە هەموو کەس دەزانێ کە ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێدێ، هەروەها هەر کەسێک کە دەکەوێتە حاڵی خۆی و، دەزانێ کە تازە ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوە، لەو کاتەدا ئیمان هێنان سوودی نابێ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ اللهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ} (أخرجه أحمد: ٦٤٠٨، والترمذي: ٣٥٣٧، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٤٢٥٣، وابن حبان: ٦٢٨، والحاكم:م ٧٦٥٩، وقال: صحيح الإسناد عَنِ ابْنِ عُمَرَ).

واتە: خوا گەڕانەوەی بەندە قبووڵ دەکات، مادام ڕووحی نەگەیبێتە گەرووی.

وەک چۆن ئینسان بە ناو غەرِ غەرە دەکات و لە قووڕگی وەردەدات، کاتێک ڕووح لە نووکی پێیەوە دێت و لە سینگ کۆ دەبێتەوەو دەگاتە لای گەروو، لەو کاتەدا ئەو کەسە لە مردنی دڵنیا دەبێ و، ڕەنگە فریشتەکانیش ببینێ، بۆیە بڕواهێنان لەو حاڵەتەدا، سوود ناگەیەنێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا﴾، بڕوا هێنانەکەیان سوودی پێنەگەیاندن لە کاتێکدا سزای ئێمەیان بینی، ئەمە هەم بۆ حاڵەتی سەرەمەرگیش ڕاستەو، هەم بۆ ئەو گەلانەش کە سزادراون و، هەم بۆ ئاخیر زەمانیش، ﴿سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي

﴿قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ﴾، ئەوەش یاسای خوایە کە ڕابردووە لە بەندەکانیدا، واتە: خوا بە پێی ئەو یاساو ڕێیازە مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا کردوە، کە هەتا توانایان هەیەو هەتا ویستیان ئازادەو، هەتا بۆ ئەوان بە ئازادیی لە قەڵەم دەدرێ، ئەگەر ئیمان بێنن ئیمانەکەیان لێوەردەگیرێ، بەڵام کە کەوتنە حاڵەتی ناچاریی، ئیمانەکەیان سوودیان پێناگەیەنێ، یاسای خوای کاربەجێ و دادگەر و بووە لە ژینی بەشەردا، کە ڕابردوە، ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، لەو کاتەشدا بێبڕوایەکان زیانبار بوون، پێشتریش هەر زیانبار بوو بوون، بەڵام لەوکاتەدا بۆیان دەرکەوت، کە دەسخەرۆ زیانبارو ڕەنجەڕۆی ڕاستەقینە تەنیا ئەوانن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە خۆڕاگربێ و، دڵنیابێ بەڵێنی خوا ڕاستەو، ئاماژەکردن بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی بەشێک لە پێغەمبەران و، نەگێڕانەوەی بەسەرهاتی بەشێکیان، کە هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا، بەبێ مۆڵەتی خوا، هیچ بەڵگەیەکی وەک موعجیزە بۆ سەلماندنی ڕاستیی خۆی نەهێناوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ﴾، واتە: دەجا خۆڕاگربە (مادام حاڵ بەو شێوەیە کە باسکرا)، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە.

بەڵێنی خواش یانی:

أ- بەڵێنی خوا بەسەرخستنی تۆو، شوێنکەوتووانت.

ب- بەڵێنی خوا بە سزادانی بێبڕوایەکان.

ج- بەڵێنی خوا بە هاتنی ڕۆژی دوایی، هەموو ئەو بەڵێنانەی خوا ڕاستن.

٢)- ﴿ فَـإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر هەندێک لەوەی کە گفتیان پێدەدەین، پێشانت بدەین، واتە: هەندێک لەوەی هەڕەشەی پێ لە کافرەکان دەکەین، پێشانی تۆی بدەین و لە دنیادا سزایان بدەین.

٣)- ﴿ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾، یاخود بەرلەوەی پێشانت بدەین، بتمرێنین و تۆ سزادانەکەیان نەبینی.

٤)- ﴿ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾، بە دڵنیایی هەر بۆ لای ئێمە دەگێردرێنەوە، لە سوورەتی (یونس)دا، ئەم ئایەتە موبارەکە بەم شێوەیە هاتووە: ﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر هەندێ لەوەی بەڵێنیان پێدەدەین، پێشانت بدەین، یاخود بەرلەوە بتمرێنین، گەڕانەوەو سەرەنجامیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە، دواییش خوا چاودێرە بەسەر ئەوەوە کە دەیانکرد، لەوێ خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بەو شێوەیە هێناوە، چونکە لە هەر جێیە ڕەوت (سیاق) ەکە جۆرێک دەخوازێ.

گرنــگ ئــەو ڕاســتییەیە: خــوا پێغەمبــەری خاتەمــی ﷺ ئاگادارکردۆتــەوە، کــە دەگونجێ هەندێـک لـەو سـزایەی هەڕەشـەی پێ لـە کافـرەکان دەکات، پێشـانی بدات و دەشـگونجێ پێشـانی نـەدات، ئنجـا ئەوەبـوو کـە دواتـر پێشـانیدا، لـە جەنگـەکانی بـەدر، خەنـدەک و حونەیـن و ئازادکـردنی مەککـەو ... هەمـوو جەنگانـەدا، خـوا ﷻ زەبرێکـی باشـی لـە کافرەکانـداو، لووتیـان شـکاو، بەشـێک لـەوەی خـوا هەڕەشـەی پـێ لێدەکـردن، پێشـانی دان.

٥)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانیکمان ڕەوانکردوون، ژمارەی پێغەمبەرانی ناوبراو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە قورئاندا بە موحەممەدەوە ﷺ بیست و پێنج کەسن، کە لە سوورەتی (الأنعام)دا ناوی هەژدەیان هاتووەو لە هەندێ شوێنان ناوی پازدەیان و، لە جێی دیکەدا ناوی دوازدەیان هاتووەو کەمترو زیاتر، گرنگ ئەوەیە هەموو ئەوانەی ناویان هاتوە لە پێغەمبەران، ژمارەیان

بیست و پێنجە، خوا دەفەرموێ: لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانێکمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ) ڕەوانکردوە.

٦)- ﴿ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ ﴾، ئنجا هەیانە بەسەرهاتەکەیمان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە.

٧)- ﴿ وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَ ﴾، هەشیانە بەسەرهاتەکەیمان بۆ تۆ نەگێڕاوەتەوە، ئەوانەش کە خوا بەسەرهاتەکانیانی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ گێڕاوەتەوە، هەیانە بەسەرهاتەکەیانی بە درێژیی گێڕاوەتەوەو، لە چەند شوێنێک لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بەپێی داخوازیی ئەو حاڵەتانەی پێغەمبەری خواو ﷺ بڕواداران پێیاندا تێپەڕیون، هەروەها بەپێی داخوازیی مێژووی بەشەر، کە ئەو ڕاستییانە دووبارە دەبنەوە، بە تایبەت بەسەرهاتی ئیبڕاهیم ﷺ و بەسەرهاتی مووسا ﷺ و هاڕوونی برای ﷺ، لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیاندا، هەروەها بەسەرهاتی نووح و هوودو صاڵح و شوعەیب و لووط و عیسا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ)، هەشیانە بەسەرهاتەکەی بە کورتیی هاتوەو، هەشیانە تەنیا ناوی هێنراوە لە قورئانداو، ئاماژە کراوە بە ژمارەیەکی کەم لە سیفەتە بەرزەکانی.

لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ، کە بەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر، دروست نیە هیچ کەس بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابنرێ، بۆیە لە هەندێک ڕیوایەتاندا، هەندێ کەس بە پێغەمبەر لە قەڵەم دراون، من نەمهێنان، لەبەر ئەوەی لەسەر سەنەدی ڕیوایەتەکان مشتومڕ هەیە، بەڵام ئەگەر بە سەنەدێکی ڕاست و دروست و جێی دڵنیایی، پێغەمبەری خوا باسی یەکێک لە پێغەمبەرانی کردبێ و ناوی هێنابێ، دەڵێین: ئەویش پێغەمبەری خوایە، بەڵام بەبێ بەڵگەی دڵنیاکەر، دروست نیە هەر لە خۆوە بڵێین: فڵانکەس کە ناوی لە قورئان دا هاتوە، پێغەمبەری خوایە، بۆ وێنە: لە بارەی لوقمانەوە قسە کراوە، بەڵام خوا ﷻ باسی لوقمانی نەکردوە وەک پێغەمبەر، بەڵکو وەک لە تەفسیری سوورەتی (لقمان)دا باسمانکرد، تەنیا باسی ئەوە کراوە کە خوا حیکمەتی پێداوە، حیکمەتیش واتە: لێزانیی و دانایی و کارامەیی و پێغەمبەران و غەیری وان تێیدا بەشدارن.

٨)- ﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نیە نیشانەیەک بێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، کەواتە: کافرەکان کە تۆ هەڵدەپێچن و تەنگەتاوت دەکەن موعجیزەیەکیان تاکو بۆ بێنی، شتێکی بێ جێت لێ داوا دەکەن، چونکە تەنیا بە مۆڵەتی خوا پێغەمبەران موعجیزەو بەڵگەیان هێناون، خوای بەرزیش ئەو بەڵگەو موعجیزەیەی بە تۆی داوە کە قورئانە، کافییە بۆ کەسانێک بیانەوێ بڕوابێنن، کەواتە: ئەوان داوایەکەیان داوایەکی بێجێیە کە هەڵتدەپێچن: تۆش موعجیزەو بەڵگەیەکی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوویان بۆ بێنی!

٩)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئنجا هەر کاتێ فەرمانی خوا هات، بە هەق و دادگەریی دادوەریی کرا، واتە: فەرمانی خوا هات بە سەرخستنی پێغەمبەرو هاوەڵانی، یاخود: فەرمانی خوا هات بە هاتنی مردنیان، یان: فەرمانی خوا هات بە کۆتایی پێهێنانی ژیانی دنیاو هاتنی ئاخیر زەمان، یاخود: فەرمانی خوا هات بەوە کە خوا ﷻ مۆڵەت بدات بە پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانەکان جەنگ بکەن و ڕووبەڕوو ببنەوە لەگەڵ بێبڕواکاندا، ﴿ قُضِيَ بِٱلْحَقِّ ﴾، لەو کاتەدا بە هەق دادوەریی دەکرێ لە نێوان ئەهلی ئیمان و ئەهلی کوفردا، یاخود: بەگشتیی و لە هەر بارێکەوە خوا بڕیارو حوکمی ڕاست و هەق دەدات.

١١)- ﴿ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾، لەو کاتەشدا ئەوانەی لەسەر بە تاڵ و ناهەقن زیانبار دەبن، (هُنَالِكَ) ناوی ئاماژەیە بۆ شوێن، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ کات، واتە: لەو کاتەدا ئەوانەی کە دەیانەوێ هەق لابەرن، [(المُبْطِلون)، (مَنْ يُرِيدُون إِبْطَالَ الحَق) ئەوانەی دەیانەوێ هەق بپووچێننەوەو هەق لابەرن]، ئەوانە زیانبار دەبن، ئەمە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە دوایی لە جەنگی بەدردا دەرکەوت، کە خوا ناوی لێناوە: (يَوْمُ الفُرْقَان)، (يَوْم التقى الجَمْعَان)، دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ، لەوێ زیانباریی کافران بە تەواویی ئاشکرا دەبێ و دەردەکەوێ، بەڵام بێگومان لە دنیاشدا جاروبار زیانباریی کافران دەردەکەوێ، هەر نەبێ هیچ بێبڕوایەک نیە، کە لە سەرەمەرگدا زیانباریی و دەستخەڕۆیی خۆی بۆ مەعلووم نەبێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی ڕەخساندنی ئاژەڵەکان لە لایەن خواوە، بۆ بارو سواری مرۆڤەکان و، لێخواردنیان و، سوودگەلی دیکەی زۆر، بە تایبەت سەفەرو گەشت پێکردنیان، بە جۆرێک کە هیچ عاقڵێک ناتوانێ نکووڵیی لە چاکەکانی خوا بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە ئاژەڵەکانی بۆ گێڕاون، بۆ ڕەخساندوون، تاکو لێیان سواریان بن و، هەشیانە لێیان بخۆن.

﴿ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾، یانی: هەیانە بۆ سواریی، بۆ بارو سوار بەکاریان دێنن، هەشیانە بۆ لێخواردنیان، واتە: هەیانە زیاتر بۆ بارو سوار بەکاردێ، بۆ وێنە: حوشتر ئەگەر مەبەست لە ئاژەڵەکان (أنعام) چوار جۆرەکە بێ: حوشترو ڕەشە وڵاخ (گاو مانگاو کەڵ و گامێش)، هەروەها مەڕو بزن، بەڵام ئەگەر (أنعام) مەبەست پێی کۆی ئەو ئاژەڵانە بێ، ئەو چوار پێیانە بێ، کە خوا بۆ مرۆڤی ڕەخساندوون، کە ئەو کاتە فیل و کەرگەدەن و وڵاخی یەک سم واتە: ئەسپ و ماین و ئێسترو کەرو ئەوانەش دەگرنەوە، ئەو کاتە ئەوانەی بۆ بارو سوار بەکاردێن، دیارە ئێسترو ئەسپ و ماین و کەرن، لە وڵاتانی ئێمەدا زیاتر ئەوانە باون، لە هەندێ شوێندا فیل بەکار دێنن، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لە ئەفریقیا، ڕەنگە جۆرە ئاژەڵی دیکەش بەکاربێنن، لە هەندێ شوێنیش گاو مانگاش بەکاردێنن جگە لە حوشتر، بۆ بارو سوار.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ ﴾، دەڵـێ: (الْجَعْـلُ: الْوَضْـعُ وَالتَّمْكِينُ وَالتَّهْيِئَـةُ، فَيُحْمَـلُ فِي كُلِّ مَقَـامٍ عَـلَى مَـا يُنَاسِـبُهُ)، (جَعْـل) بریتیـە لـە دانـانی شتێک و چەسپاندنی و ئامادەکردنی، ئنجا لـە هـەر شوێنە بـە پێـی گونجـانی لەگـەڵ ئـەو ڕەوت و شـوێنەدا، مانـا دەکـرێ، بـە کوردیـی وشـەی (جَعَلَ) واتـە: گێـڕای، یـان کـردی، یـان وایلێکـرد.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا ﴾، (مِـنْ: للتَّبْعِيـض)، (مـن) بـۆ هەندێکـە، هەردووکیـان: ﴿ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا ﴾، و ﴿ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾، کـە هەیانـە بـۆ سـواریی بـەکاری دەهێنـن، هەشـیانە لێـی دەخـۆن، چ لـە گۆشـتەکەی بخـۆن، چ لـە بەرهەمەکـەی لـە سـپییە مەنییەکـەی بخـۆن، کـە لـە شـیرو ماسـت و کەشـک و فـرۆو دۆو کـەرەو پەنیـرو ژاژو... هتـددا بەرجەسـتە دەبـێ.

لێـرەدا خـوا ﷻ کـە ئـەو چاکانـەی خـۆی دەخاتـە بەرچـاوی خەڵـک، بـۆ ئەوەیـە کـە لـە خـوا بـە یەککرتـن نیزیکیـان بخاتـەوە، خـوای پـەروەردگار دەیـەوێ لـە ڕێـی خستنەڕووی چاکـەو نیعمەتەکانیـەوە، خـۆی بـە مرۆڤـەکان بناسـێنێ و، خۆییـان لـەلا خۆشەویسـت بـکات، کـە ئەگـەر لەبـەر زاتی خۆیـشی خۆشـیان نـەوێ -- کـە ئـەوە خۆشویسـتنی ڕاسـتەقینەیە بـۆ خـوا ﷻ، کـە لەبـەر زاتی خـۆی و لەبـەر سـیفەتە بـەرزەکانی و، لەبـەر ئـەوەی بەدیهێنەرمانـە، پەروەردگارمانـە، زاتێکـی خاوەنی هەمـوو سـیفەتی جەمـاڵ و جـەلال و کەمالـە، هەمـوو سـیفەتەکانی سـام و هەیبـەت و دەسترۆیشـتوویی و، تێـرو تەواویـی، دەبـێ لەبـەر ئـەوە خـوای پـەروەردگار خـۆش بویسـترێ -- بـەڵام ئاسـتێکی نزمتریـش هەیـە، ئەویـش ئەوەیـە کـە لەبـەر نیعمـەت و چاکـەکانی خۆشبویسـترێ، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾الرحمـن، واتـە: ئایـا پاداشـتی چاکـە هـەر چاکـە کـردن نیـە؟ کـە خـوا چاکـەی لەگـەڵ تـۆدا کـردوە، تـۆش دەبـێ بـە چاکـە وەڵامـی ئـەو چاکەیـەی خـوا بدەیـەوە، بەندایەتیـی بـۆ بکـەی و بیپەرسـتی و بـۆی وەفاداربـی.

٢)- ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ ﴾، هەروەها بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا، سوود گەلی زۆر هەن.

ئـاژەڵان چ بـە چەمكـە چوارییەكـەی: حوشـترو ڕەشـە وڵاخ و مـەڕو بـزن، چ بـە چەمكـە گشـتییەكەی: هەرچـی چـوار پێیـە بیگرێتـەوە، چ گۆشـتیان بخـورێ، چ نەخـورێ، بـەڵام ئـەو چوارانـە گۆشـتیان دەخـورێ، (مَنَافِعُ)، كـۆی (مَنْفَعَة)یـە، واتـە: سـوود، كەڵـك، بەرژەوەندیـی.

٣)- ﴿ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ ﴾، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو وڵاخانەوەش (بە هۆی سواربوونیان و بارلێنانیانەوە)، بگەنە ئامانجێك كە لە سینەكانتاندا هەیە، یان ئامانجێك بهێننە دی كە لە سینەكانتاندا هەیەو دەتانەوێ، ئەم (ل)ە، ﴿ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا ﴾، لامی هۆكار دۆزیی (تعليل)ە، هەروەها (ل)ەكەی پێشێ: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ ﴾، هەر بۆ (تعليل)ە، (أي لأجْلِكُم) لە پێناوی ئێوەدا.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ ﴾، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ: ئـەو نیـازو مەبەسـتەی لـە سـینەكانیان دا هەیـە، پاڵیـان پێوەدەنـێ بەرەو ئـەو ئامانجـە بچـن، كـە ئامانجەكـەش دوورەو بـە پێیـان ناتوانـن بیگەنـێ و، دەبـێ بـە وڵاخ و لەسـەر پشـتی ئـەو ئاژەڵانـە پێـی بگـەن.

٤)- ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾، هەروەها لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵانە (هەندێكیان)و، لەسەر پشتی كەشتییەكانیش هەڵدەگیرێن، كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾، بۆیە لێرەدا لەگەڵ وڵاخان دا باسی كەشتییانیش كراوە، چونكە خاڵی هاوبەشیان بارو سوار پێكردن و گەشت و گەڕانە پێیان.

ئنجا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَلَيْهَا ﴾، دەیتـوانی بفەرمـوێ: (وَعَلَيْهَا وَالفُلْكِ) لەسـەر پشـتی ئـەوان و بەهـۆی كەشتییانیشـەوە، بـەڵام بۆیـە (عـلى) دووبـارە بۆتـەوە، چونكـە لـە ڕاسـتییدا بـە ئامانـج گیـراو، لێـرەدا بـاسی كەشـتییەكانە، ئەگەرنـا پێشـتر بـاسی ئـاژەڵان كرابـوو.

٥) ﴿ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، هەروەها (خوا) نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات، لێرەدا خوا ﷻ کە نیعمەت و چاکەکانی خۆی دەخاتەڕوو، مەبەست پێی ئەوەیە:

أ- ئەوانە هەم چاکەی خوان.

ب- هەم بەڵگەشن لەسەر مشوورخۆریی خوای پەروەردگارو پەروەردگارێتیی خوا.

ج- هەم بەڵگەشن لەسەر ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بکرێ و بپەرسترێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾، نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات، کە بریتین لەو نیعمەتانەی باسکران، واتە: لە یەک کاتدا هەم نیشانەن لەسەر پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی خواو، هەم چاکەو نیعمەتیشن لە خواوەو، هەم بەڵگەی تاکێتیی خواشن لە پەرستراوی دا.

٦)- ﴿فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾ ئنجا ئایا کام لە نیشانەکانی خوا نکووڵیی لێدەکەن؟ (أَيّ: اسْمُ اسْتِفْهَامٍ يُطْلَبُ بِهِ تَمْيِيزُ شَيْءٍ عَنْ مُشَارِكِهِ فِيمَا يُضَافُ إِلَيْهِ)، وشەی (أيّ) ناوی پرسیار کردنە، مەبەست پێی جیاکردنەوەی شتێکە لە هاوبەشەکەی، لەوەد کە پاڵدەدرێتە لای، بۆ وێنە دەڵێی: (أَيُّهُمَا) یان (أَيُّهُمْ) کام لەو دووانە، یان کام لەو کۆمەڵە، بۆ پرسیارکردنە لە بارەی شتێکەوە، کە لەگەڵ شتێکی دیکە، یان لەگەڵ کۆمەڵە شتێکدا ئاوێتەیە، بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**سەرنجڕاکێشان بۆ مێژووی گەلانی پێشوو، کە هەرچەندە ژمارەیان زیاترو، بەهێزو پێزتریش بوون و شوێنەوارەکانیشیان بەرچاوتر بوون، بەڵام ئەوە هیچ بە کەڵکیان نەهات و لە فریایان نەهات، کاتێک بەڵای خوایان بۆ هات، بەوەندە زانیارییە کەمەش کە لەلایان بوو، لە بەرانبەر وەحیی و پەیامی خوادا بوغرابوون، لە خۆبایی بوون و لە کەوڵی خۆیان دەرچوون، سەرەنجام: سزای خوایان گرتنی و پەشێمانیشیان و ئیمان هێنانیشیان هیچ سوودی نەبوو، سەرەنجام دەستخەڕۆو زیانبار بوون:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ ﴾، ئنجا ئایا بە زەویدا نەڕۆیون؟ ئەمە جاری دووەمە لەم سوورەتەدا خوا ﷻ ئەو تەعبیرە بەکاردەهێنێ، جاری یەکەمیان فەرمووی: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ﴾، بەڵام لێرە دەفەرمووێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ ﴾، لە جیاتی (و) بە (ف) هێناویەتی، ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ کە هەم

لێرەداو هەم لە ئایەتی ژمارە (٢١)دا، پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: دەبووایە بە زەویدا بڕۆن.

هەڵبەتە لێرەدا کە خوا نکووڵیی دەکات لەوەی بۆچی بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ مەبەست ڕۆیشتنی بەڕامانەوەیە، ڕۆیشتنی بە تێفکرین و سەرنجدانەوە، ئەگەرنا هەر بە زەویدا بڕۆی و بڵێی: خوا فەرمانی پێکردوە بەبێ ئامانج، ئەوە هیچ نیە، نەخێر، چونکە ئەوە بەپێی سیاق دەیزانین و، سەربارەش خوای کاربەجێ لێرەش و، لە ئایەتی ژمارە (٢١)دا هەر ئاماژەی پێکردوە: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا ...﴾. کەواتە: ئامانج و حیکمەت لە بەڕێدا ڕۆیشتنەکە: ڕامان و ڕوانین و تێفکرینە، نەک بەس ڕۆیشتن و هیچی دیکە!!.

٢)- ﴿فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، واتە: ئنجا (لە میانی ڕۆیشتنەکەیان دا) سەرنج بدەن و ڕامێنن: سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟! (ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون! سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟!)، پێشتریش باسمانکردوە ڕۆیشتن بە زەویداو سەفەرکردن، دوو واتای هەن:

یەک: سەفەرکردنی جەستەیی: کە مرۆڤ بە جەستە بە زەویدا بڕواو، شوێنەواری گەلە پێشووەکان سەرنج بدات، شوێنەواری گەلی عاد لە نیوە دوورگەی عەرەبیی دا، هی گەلی سەموود لە ناوچەی حیجردا، هی گەلی لووط لە فەلەستین، هی گەلی مەدیەن لە ئوردن و شام، هی گەلی فیرعەون لە میسر هەرەمەکانیان، هی گەلانی دیکەی نێوان دوو ڕووبارەکان میزۆپۆتامیا، هەروەها لە شوێنەکانی دیکەی دنیادا، مرۆڤ بە جەستە بچێ سەرنج بداو لە شوێنەوارەکانیانەوە ڕامێنێ.

دوو: سەفەرکردنی مەعنەویی: کە مرۆڤ تەماشای مێژوو بکات، هەر لە شوێنی خۆیەوە کتێبەکانی مێژوو بخوێنێتەوە، یاخود لە ڕێی مۆزەخانەکانەوە، ئێستا بەهۆی مۆزەخانەکانەوە کە شوێنەواری گەلە پێشووەکانیان تێدا هەڵگیراون، زۆر سەفەرو بارو سوار لە کۆڵ مرۆڤ کراونەوە، مرۆڤ دەتوانێ لە مۆزەخانەکاندا، تەماشای زۆر لە شوێنەواری گەلە پێشووەکان بکات.

٣)- ﴿كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ﴾، ئەوانی پێش وان لەوان (لە دوێندراوەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ) ژمارەیان زیاتر بوو.

٤)- ﴿وَأَشَدَّ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، هێزیشیان توندتر بوو و، شوێنەوارەکانیشیان توندترو سەختترو بەرچاوتربوون.

٥)- ﴿فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾، بەڵام ئەوەی کە وەدەستیان دەهێنا، هیچ سوودی پێنەگەیاندن، ئەوەی کە وەدەستیان هێنا، لە هێزو پێزو لە سوپاو سامان و دەستڕۆیشتوویی، ئەمە ئەگەر (مَا) بۆ لابردن (نفي) بێ، دەشگونجێ (مَا) بۆ پرسیار کردن (مَا الإِسْتِفْهَامِيَّة)بێ واتە: ﴿فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾؟ ئایا ئەوەی کە وەدەستیان دەهێنا، چ سوودێکی هەبوو، چ کەڵکێکی پێگەیاندن، چ دادێکی دان؟ لە کاتێکدا کە بەڵای خوایان بۆ هات، ئایا ژمارەو هێزو تواناو دەستڕۆیشتوویەتییەکەیان فوتاری کردن لە سزاو تۆڵەی خوا؟ بە تەئکید نەخێر.

٦)- ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ﴾، کاتێک پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، زۆر دڵخۆش بوون بەوەی لە لایان بوو لە زانیاریی، یانی: بەو ئەندازە زانیارییەی دەیانزانی زۆر دڵخۆش بوون و، پێی لە کەوڵی خۆیان دەرچوون، پێیان وابوو زانیاریی هەر ئەوەیە لە لای ئەوانەو، پێیان وابووە بێ نیازن لە هەر جۆرە زانیارییەکی دیکە، تەنانەت ئەگەر هی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بێ و لە خواوەش هێنابیان، کە بێگومان ئەو زانیارییەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە خواوە دەیهێنن، زانیارییەکی بێ خەڵەتیە، زانیارییەکی سەدا سەد ڕاستە، بەڵام ئەوەی مرۆڤ خۆی وەدەستی دەهێنێ لە ڕێی پێنج هەستەکانیەوەو، لە ڕێی بیرکردنەوەی خۆیەوە، شتێکی ڕێژەییەو، کەم و زۆر هەڵەو پەڵەو کەم و کوڕیی و خەڵەتو خاڵی تاوێتە دەبێ.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی: کاتێک پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەڵگە ڕۆشنەکانیان

بـۆ هێنـان، ﴿ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، زۆر دڵخـۆش و شـادمان بـوون، بـەو کەمـە زانیارییـەی لـە لایـان بـوو، ئنجـا کـە زۆر پێـی دڵخـۆش بوونـە، مانـای وایـە زانیارییەکـەی خۆیانیـان پـێ زۆر چـاک و گـەورەو گرنـگ بـووەو، پێیـان وابـووە پێویـستییان بـە هیچـی دیکـە نیـە، پسپۆڕان گوتوویانـە: (الفَرَحُ: مَكْنِيٌّ بِهِ آثَارُه، وَهِيَ الإِزْدِهَاء)، کـە دەفەرمـوێ: زۆر ڵخـۆش بـوون بـەو زانیارییـەی لەلایـان بوو، مەبەسـت پێـی شـوێنەوارەکەیەتی کـە بریتیـە: لـە لەکەوڵـی خـۆ دەرچـوون و بوغرابـوون، چەنـد جارێکـی دیکـەش باسـمانکردوە کـە (فَرَحْ) واتـە: (أَشَدُّ السُّرُور) ئەوپـەڕی دڵخۆشـیی، هـەر بۆیـە خـوا ﷻ (فَرَح)ی بـە سـیفەتێکی خـراپ دانـاوە، مەگـەر پەیوەسـت بـێ بـە بەزەیـی خـواو، بـە پاداشـتی خـواوەو، بـە هاتنـە دی بەڵێنـی خـواوە، لـە سـوورەتی (یونـس)دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: پێیـان بڵـێ: بـا بـە بەخشـشی خـواو بەزەیـی (خـوا) بـەس بـەوە زۆر دڵخـۆش بـن، بـا تەنیـا بـەوە زۆر دڵخـۆش بـن، ئەوپـەڕی دڵخۆشـییان بـا تەنیـا بـە بەخشـشی خـواو بەزەیـی خوابـێ.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (الـروم)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ ﴾، واتـە: لـەو ڕۆژەدا بـڕواداران بـە یارمەتیـی خـواو سەرخسـتنی خـوا، زۆر دڵخـۆش دەبـن.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (القصـص)دا گـەلی قـارون بـە قـارون دەڵێـن: ﴿ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتـە: زۆر دڵخۆشـمەبە، خـوا زۆر دڵخۆشـانی خۆشـناوێن، واتـە: زۆر دڵخۆشـان بـە ماڵـی دنیـاو سـامان، ئەگەرنـا مـرۆڤ ئەگـەر زۆر دڵخـۆش بـێ بـە چاکـەی خـواو بەخشـشی خـواو بـە بەزەیـی خـواو بـە هاتنـەدی بەڵێنـی خـوا، ئـەوە هـەر زۆریـش پەسـندە، نـەک خـراپ نیـە، بۆیـە دەبـێ وردبیـن لـە سـەرنجدانی چەمـک و واتـای وشـەکانی قورئـان: لـە شـوێنێکدا خـوا ﷻ وشـەی (فَرَحْ) زەم دەکات، ئەگـەر پەیوەسـت بـێ بـە دنیـاوەو بـە مـاڵ و سـامانەوە، یـان بـە

تـۆزە زانیارییەکـەوە کـە بیکەیـە جێگـرەوە بـۆ وەحیـی و پەیامـی خـوا، کەچـی لـە شـوێنێکی دیکـەدا خـوای پـەروەردگار فەرمـان دەکات بـە (فَرَحْ) ئەویـش ئەوەیـە کـە پەیوەسـت بـێ بـە بەخشـشی خـواو بەزەیـی خـواوە، هەروەهـا مەدحـی بـڕواداران دەکات کـە دڵخۆشـن بـە هاتنـە دی بەڵێنـی خـوا، کـە بریتیـە لـە سەرخسـتنی بۆیان.

## قسەیەکی کورت لەبارەی فەلسەفە و بووناسییەوە

هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: دوای ئـەوەی پێغەمبەرانیـان (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ هێنـان، بـەو ئەنـدازە زانیاریـیـەی لەلایـان بـوو، زۆر دڵخـۆش بـوون، دەڵێـن: مەبەسـت پێی فەیلەسـووفەکانی یۆنانـە، دوای ئـەوەی بـاس و خواسـتی پێغەمبەرانیـان -ئنجـا ئەگـەر عیسـا بـووە، ئەگـەر پێغەمبـەرانی پێـش عیسـا بـوون- بیسـتوە گوتوویانـە: ئێمـەش زانیارییـمان لـە لایـەو، پێویسـتییمان بـەو زانیارییـە نیـە کـە ئـەو پێغەمبەرانـە هێناویانـە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار بەگشـتیی فەرموویـەتی و تایبـەتی نەکـردوە بـە کات و شـوێنێکەوە.

ئنجـا بێگومـان زۆرجـاران ئـەو زانیاریـیـە عەقڵییانـە کـە مـرۆڤ پێیـان دەگات، ئەگـەر لـە خـۆی وریـا نەبـێ، پێیـان لـە خـۆی بایـی دەبـێ، پێیـان لـە کەوڵـی خـۆی دەردەچـێ، لـە حاڵێکیشـدا کـە زانیاریـی عەقڵیـی، بـە تایبـەت (فەلسـەفە) کـە بەرهەمـی فیکـری بەشـەرە، لـە ئەنجامـی تێوەڕامـانی دا بـۆ بـوون، کـە باشـترین پێناسـەی فەلسـەفە ئەوەیـە:

[فەلسـەفە بەرهەمـی فیکـری بەشـەرە لـە ئەنجامـی تێوەڕامانـی دا بـۆ خـۆی و بـۆ دەوروبـەرو بـۆ گـەردوون دا پەیـدا بـووە و، هەوڵـدانی مرۆڤـە بۆ بووناسـیی، ناسـینی: خـۆی و خـواو گـەردوون].

ئنجـا ئەو فەلسـەفەیە خڵتەو خاڵـی زۆری تێدایە، وەک ئێمە هەم لە مەوسـووعەی: (بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان وەحیـی و واقیعـدا) لـە بەرگـی سـێیەم (تەوژمـە فیکرییـەکانی مێـژووی مسـوڵمانان)، لەوێـدا باسـمانکردوە، هەروەهـا لە مەوسـووعەی: (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، بـە درێژیـی لـە بـارەی فەلسـەفەو فەیلەسـووفەکانەوە قسـەمان

کـردوە، چ فەیلەسـووفەکانی یۆنـان و گریـک، چ فەیلەسـووفەکانی میزۆپۆتۆمیـا، چ ئەوانـەی شـام، چ ئەوانـەی میسـر، چ ئەوانـەی ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیاو ئێـران، زیاتـر لـە بـواری خواناسـیی و دینداریـدا باسـمان کـردوە، کـە تـووشی هەڵـەو پەڵـەی زۆر سـەیرو سـەمەرە بـوون و، لـەو بـوارەدا ئـەو فەیلەسـووفانە، سـەد خۆزگەیـان بـە خەڵکـی عـەوام، کـە هـەر لـە ڕێـی ئـەو زگماک و عەقڵـە پاکـەوەی خـوا بـە هەمـوو مرۆڤـەکانی داوە، باشـتر پەییـان بـە بـوونی خـوای پـەروەردگار بـردوە، بـە سـیفەتەکانی خـو، بـە پێویسـتیی بەندایەتییکـردن بـۆ خـوا، هـەر بۆیـە دەڵێـم: عەقڵ ئەگـەر مرۆڤ لێـی وریـا نەبـێ، دەبێتـە هـۆی سـەرگەردانیی ئینسـان، لـە ڕاسـتییدا ئەگـەر عـەقڵ و هـۆشی مـرۆڤ بـەس بووایـە بـۆ ڕێـگا دیتنـەوە، خـوا ﷻ پێغەمبـەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) نەدەنـاردن، هـەروەک لـە سـووڕەتی (النساء)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾، واتـە: پێغەمبەرانێکـی دڵخۆشـکەرو ترسـێنەر، تاکـو خەڵـک لـە دوای هاتنـی پێغەمبـەران، بەڵگـەی نەبـێ لەسـەر خـوا، کەواتـە: ئەگـەر پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) خـو ﷻ ڕەوانی نەکردبانایـە، خەڵـک بەڵگـەو بیانـووی دەبـوو، مانـای وایـە عەقڵـی مـرۆڤ بـەس نیـە، بـۆ ئـەوەی ڕێـی پـێ دەربـکاو وەڵامـی پرسـیارە وجوودیـیەکانی پێبزانـێ، کـە بریتیـن لـە:

١- من کێم؟

٢- لە کوێوە هاتووم؟

٣- بۆچی هاتووم؟

٤- کێ منی هێناوەتە دی؟

٥- ئەم گەردوونە چییە؟

٦- لە کوێوە هاتوە؟

٧- بۆ کوێ دەچێ؟

٨- سەرەنجامی چۆن دەبێ؟

٩- پێویستە مرۆڤ چۆن بژی؟

ئەو پرسیارە فەلسەفی و وجوودییانە، تەنیا لە گرەوی وەحیی خوی پەروەردگاردایە، کە وەڵامی ڕاست و دروستیان لە بەرانبەردا دابنێ، ئەگەرنا فەلسەفە هەمووی بریتی بووە لە هەوڵی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارنەو، دواییش بە دەستی خاڵیی گەڕاوەتەوە. وەک لەو سەرچاوانەدا کە ئاماژەمان پێدان باسمان کردوە، زۆرجار تێفکرین و تێڕوانینیان بۆ خوا ﷻ زۆر کرچ و کاڵ و منداڵانەو دواکەوتووانە بووە.

٧)- ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، [ئەوانەی بەوەندە زانیارییەی لەلایان بوون، بوغڕاو لە خۆبایی بوون و گوێیان نەدەدا بە پەیامی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)]، سەرەنجام ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، گەمارۆی دان، یاخود دابەزیە سەریان، ئنجا ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد: ﴿ مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوەبێ: ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، دەوری دان، کە بریتی بوو لە سزاو بەڵای خوا، (وَحَاقَ بِهِمْ الَّذِي كَانُوْا بِهِ يَسْتَهْزِؤن)، ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، کە هاتنی بەڵاو سزای خوایەو، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) گەلەکانیان پێی ترساندوون، کە هەر لە دنیادا سزای خواتان بۆ دێ و، لە دواڕۆژیش دا سزای خوا چاوەڕێتان دەکات، ئەگەر بە دەنگ بانگەوازی خوای پەروەردگارەوە نەچن و، ئەو حیکمەتە لە ژیانتاندا نەهێننە دی، کە خوا ئێوەی بۆ خوڵقاندوە.

ب- دەشگونجێ: ﴿ مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ (ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد) بەڵایەکە نەبێ، بەڵکو پەیامی خوابێ، یانی: سزای ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد کە پەیامی خوایە، دەوری دان: (وَحَاقَ بِهِمْ أي: عِقَابُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤن)، (حَاقَ) هەم بە مانای دەورەدان و گەمارۆدان دێ.

(حاق)ش بە مانای دابەزین و هاتنەسەر دێ.

٨)- ﴿ فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا ﴾، کاتێک بەڵای ئێمەیان بینی، سزای ئێمەیان بینی.

٩)- ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ ﴾، گوتیان: تەنیا بڕوامان بە خوا هەیە، واتە: بڕوامان هێنا کە تەنیا خوا هەقە، چونکە تاکە بەدیهێنەرو تاکە پەروەردگارو مشوورخۆرە، بەس ئەویش بە پەرستراوی خۆمان دەزانین.

١٠)- ﴿ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ ﴾، بێبڕواین بەوەی پێشتر بە هۆیەوە هاوبەش بۆ خوادانەر بووین، یاخود: ئێستا بێبڕواین بەوەی کە دەمانکردنە هاوبەشی خوا لە پەرستراندا، یانی: حاشایان کرد لە پەرستراوەکانی خۆیان.

١١)- ﴿ فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا ﴾، بەڵام نەدەگونجا بڕواهێنانیان سوودیان پێ بگەیەنێ، کاتێک بەڵای ئێمەیان بینی.

﴿ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا ﴾، دوای دیتنی ئازارو سزای ئێمە، واتە: ئەو بڕواپێهێنان و بەڕاست دانانەی پەیامی خوا، دوای ئەوەی سزای خوایان بینی، سوودی پێ نەگەیاندن، چونکە ئیمان هێنان کاتێک سوودی هەیەو، پاداشتی هەیە، کە بۆ مرۆڤ ئازایەتیی بێ، ئیمان بێنێ، ئێستا بۆ هیچ کەس هیچ ئازایەتیی نیە بڕوا بە خۆر بێنێ، یان بە مانگ بێنێ، بەڵام ئەوە ئازایەتییە تۆ سزاو بەڵای خواو، پاداشتی خوا، نەبینی و بڕوای پێبێنی، بۆیە لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ... ۝٣ ﴾، واتە: ئەلیف لام میم، ئەو کتێبە هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، ئەوانەی بڕوا دێنن بە پەنهان...

١٢)- ﴿ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ ﴾، (ئەمە) یاسای خوایە کە تێپەڕیوە لە بەندەکانیدا، (أي سَنَّ اللهُ سُنَّةَ)، خوا یاسایەکی داناوەو تێپەڕیوە، بۆیە (سُنَّةَ)، (منصوب)ە (أي سَنَّ اللهُ سُنَّةً) خوا یاسایەکی داناوە، (قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ) کە تێپەڕیوە لە بەندەکانیدا، واتە: هەر بەو یاسایە خوا مامەڵەی لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، کە ئەگەر پێش ئەوەی بەڵایان بۆ بێ بڕوابێنن، لێیان وەردەگیرێ، بەڵام دوای هاتنی بەڵاو سزای خواو، دوای ئەوەی بە چاوی سەر شتەکە دەبینن، ئەو کاتە ئیمان هێنان ئازایەتیی نیە، بۆیەش لێیان وەرناگیرێ.

١٣)- ﴿ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، لەو کاتەشدا ئەوانەی بێبڕوابوون زیانبار بوون، وشەی (ٱلۡكَٰفِرُونَ) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، دەگونجێ مەبەست پێی (عهد) بێ، واتە: بێبڕوایەکان کە پێشتر باسیان کراوە، لەو کاتەدا زیانبار بوون، دەشگونجێ (أل)ی ناساندنەکە بۆ تێکڕا (جینس) بێ، یانی: تێکڕای کافرانێک کە بەو شێوەیە بوون تێکڕایان زیانباربوون، (هُنَالِكَ) ناوی ئاماژەیە بۆ شوێن، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ کات، یانی: لەو کاتەدا، لەو حاڵەتەدا، ئەوانەی بێبڕوابوون، زیانباربوون.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (غافر) دێنین و، دەڵێین: خوایە!

بەبەزەیی و بەخشش بێ سنووری خۆت، بەهۆی هەرچی باشتر کارلێك لەگەڵ قورئانەدا، بەو خەسڵەتە بەرزانەمان برازێنەوە کە شایستەیی بەسەرداباریینی پیت وپێز و بەخششی تۆمان تێدا پەیدا بکەن .

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت

أستغفرك وأتوب أليك

# ناوەڕۆک

## تەفسیری سورەتی الزمـــر

## تەفسيرى سورەتى غـافـــر